سەرجەمی بەرهەمی

# حوسێن حوزنی

کۆکردنەوە و لەچاپدانی:

دەزگای ئاراس

بەسەرپەرشتی:

د. کوردستانی موکریانی

هێنانە سەر ڕێنووسی نوێی کوردی:

مەحموود زامدار

پێداچوونەوەی:

عەبدوڵڵا زەنگەنە فەخرەدین ئامێدیان

## بەرگی دووەم

ناوی کتێب: سەرجەمی بەرهەمی حوسێن حوزنی - بەرگی دووەم
کۆکردنەوە و لەچاپدانی: دەزگای ئاراس
بەسەرپەرشتی: د. کوردستانی موکریانی
هێنانە سەر ڕێنووسی نوێی کوردی: مەحموود زامدار
پێداچوونەوەی: عەبدوڵڵا زەنگەنە + فەخرەدین ئامێدیان
بڵاوکراوەی ئاراس- ژمارە: ٥٥٨
دەرهێنانی هونەریی ناوەوە: ئاراس ئەکرەم
پیت لێدان: نسار عەبدوڵڵا
سەرپەرشتیی چاپ: ئاوڕەحمانی حاجی مەحموود
چاپی یەکەم، هەولێر- ٢٠٠٧
لە کتێبخانەی گشتیی هەولێر ژمارە (٣٨٤)ی ساڵی ٢٠٠٧ی دراوەتێ

مێژووی

# میرانی سۆران


کردەوەی

**داماو (حوسێن حوزنی) موکریانی**





چاپی دووەم

چاپخانەی کوردستان

هەولێر

٢٥٧٤ کوردی (١٩٦٢)

# مێژووی

# میرانی سوران

کردەوەی

داماو ( حسین حزنی ) موکریانی



﴿ چاپی دووەمین ﴾

چاپخانەی کوردستان

هەولێر

٢٥٧٤ کوردی ( ١٩٦٢ )

# پێشەکی

مێژووی میرانی سۆران کە یادگاری مێژوو نووسی بەناوبانگ و گەورەوگران، داماو (حوسێن حوزنی) موکریانی برامەو لە ١٩٣٥ لە ڕواندزێ لە چاپخانەی خۆماندا چاپکرابوو، لە ڕووی ئەوەوە کە نزیکەی بیست ساڵێکەی هیچی نەماوەو داخوازیش زۆرە، بەپێویستم زانی کە بۆ سوودی گەل و نیشتیمان جارێکی تریش بەچاپی بگەیەنمەوەو سوپاسی مامۆستا محەمەد مەولوودی دەکەم کە بەرگێکی لە مێژووی میرانی سۆرانەکەی خۆی دامێ کە لە ڕووی ویەوە دووبارە چاپکرایەوە.

هەرچتێکی کە چاپی نوێ کرێتەوە پێویستە تا هەر ئەندازەیەکی کە لەتوانادا بێ، پۆخت ترو ڕێک و پێکتر بکرێت. لەو ڕووەوە منیش لاپەڕەی ١٠٠، ١٠١، ١٠٢، ١٠٣، ١٠٤، ١٠٥، ١٠٦، ١٠٧، ١٠٨، ١٠٩و لاپەڕە ١٢١یش لە دێڕی حەوتەوە تا خوارێ و ١٢٢، ١٢٣، ١٢٤م بە چەند وێنەیەکەوە خستوونەتە سەری. داخەکەم زۆرترینی ئەو ئاگادارییانەی کە لە مەودوا پەیدا و دەستکەوتوون بۆیە گەلێکیان لە شوێنی تایبەتی خۆیان دانەندان، چونکوو کە ئەوانم دەستکەوتن چاپی دووەمی مێژووی میرانی سۆران دووبەشی پتر چاپکرابوو؛ لێم ببوورن.

لە چاپی یەکەمیندا لە داوێنی لاپەرە ٦٩دا چەند دێڕێک پەڕیوە. هەوڵمدا کە لە چاپی دووەمیدا ئەو کەم وکووڕیەی نەمێنێ. داخەکەم دەستنووسەکەی برام نەدۆزبیەوە.

ئەوا دووجارە ئێمە ئەرک و ڕەنج بەچاپی مێژووی میرانی سۆرانەوە دەکێشین. دەزانن کە پاداشت و خەڵات و بەراتی یەحیابەگ و لەعلی خانی دایکی ئیسماعیل بەگ بۆ ئێمە چی بوو؟

کە ئینگلیزان لە ساڵی ١٩٤٧دا داماوی برامیان دەرماندا و کرد، ئەوانیش خانووەکەی ئێمە کە لە ڕواندزێ بۆ خۆمان و چاپخانەکەمان دروست کردبوو و ٣٠٠ دیناری تێچوو بوو و ئەوسا لە ڕواندزێدا یەکەمین خانوو بوو، لێیان داگیرکردین و بەهەڕەشەی کوژتن و برین بە ١٠٠٠ دیناران لە دەستیان دەرهێنام.

گ. موکریانی

# پێشەنگی میرانی سۆران

دەمویست بەدوورودرێژی مێژووی میرانی سۆران و ڕواندز لە چاپ بدەم و بەگەلێک وێنەی کێو و شار و قەڵا و کۆنگرە و پردەکان و ئاساری سۆران بیرازێنمەوە، بەڵام هەرچەندە تەقەلام دا بۆم ڕێک نەکەوت. هێندێک چت بوونە بەرهەڵست، لەبەرئەوە پێم نەکرا درێژە بەمێژووی بنەماڵەی گەورەی کوردی سۆران بدەم کە لە هەموو لاپەڕەیەکی دێریک (مێژوو)یاندا هەزاران سەربەرزی و گەردنفیرازی کوردی تێدایە و شایانی هەموو سپاسێک و پێداهەڵگوتنێکن. تنۆکی ڕەش و ڕەخنە لەسەر هیچ لاپەڕەیەکیاندا پەیدا نابێ و یەکسەرە بەئازادی و ئارەزوویکی خاوێنەوە، بەبێ دەسیسە فەرمانڕەواییان کردووە.

نەشیام کەمێک سەربهوردی ئەم خاکە پیرۆزە و ڕەنگینە بنووسم، بەم نامیلکە کورتە بڕیمەوە. ئومێد دەکەم ڕۆژێک بێ، بەدرێژی پەرتووکێکی زۆر گەورە بەناوی «ڕواندز»ەوە چاپ بکرێ، چونکو شایانی سپاسە.

لە زانا و گەورەکانی کورد دەپاڕێمەوە ئەم نامیلکە بچووکەم بەدڵێکی خاوێنەوە پەسند بفەرموون و لە کەموکورتی و خواروخێچی ببوورن و بمبەخشن.

داماو (حوسێن حوزنی) موکریانی

## بەندی یێکەمین

### میرانی سۆران لە کەلۆسەوە هەتا میر عەلی بەگ

یێکەمین پیاوێکی کە بنەماڵەی میرانی سۆرانی دامەزراند «کەلۆس» ناو، گەورەییێکی کورد بوو. کەلۆس لەنێو عەشیرەت و نیشتمانی خۆی وەدەرکەوت و لە دیێ هەودیانێدا کە ئەمڕۆکەش ئەو دێیە هەر هەیە و دوو سەعاتێک لە باکووری ڕواندز بەربە ڕۆژئاوا هەڵکەوتووە و ماوە. لەودەمەدا لەسەر ناحیەی «ئاوان» بووە کە ئەمڕۆ «دۆڵکە و دۆڵەمەڕ»ی پێدەڵێن.

کەلۆس لە هەودیان بەشوانی دەژیا مەڕ و بزنی دەلەوەڕاند. کە مرد ٣ کوڕی ناوداری بەجێمان: عیسا، شێخ وەیس، ئیبراهیم. عیسا ناوبانگی پیاوەتی و بەخشش و زرنگی بڵاوببووەوە، هەموو کەس خۆشیان دەویست. لە شوانی هەرچییەکی دەست بکەوتایە بەسەر کوڕوکاڵی ئاواییدا بەخشی دەکرد؛ بەوە لاو و کوڕە ئازاکانی هەودیان لە دەوری کۆببوونەوە، سەرنزمی و گەردنکەچی بەخشش و پیاوەتی وی بوون و لە فەرمانی دەرنەدەچوون.

وا هەڵکەوت لەودەمانەدا دوژمنێکی گەورە لینگی دا سەر فەرمانڕەوای ئەو خاکە. عیسا هاودەنگەکانی خۆی کۆکردنەوە و چوونە سەر ئەو دوژمنە. لەو چوونەدا بەعیسایان گوت «میر». کە گەیشتنە باڵەکان خەڵکەکە لە ئازایی و ڕەشیدی عیسا وردبوونەوە و بەجارێکی کەوتنە ژێر فەرمانییەوە و بەمیری خۆیان هەڵبژارد و ئەمارەتیان بۆ دامەزراند و لینگیان دا سەر قەڵای ئاوان. ئەوانەی لە قەڵادا بوون قەڵابەندیان کردن. عیسا قەڵای وەتەنگ هێنا و بەشەڕ و کوژتار قەڵای گرت.

شەرەفنامە دەڵێ: «چونکە عیسا لەسەر بەردی سوور ڕاوەستا و بەبەردی سوور قەڵای گرت، بۆیێ ئەوانەیان ناونا سۆران و ئەو عەشیرەتە بەسۆران ناوبانگی دەرکرد».

بەڵام وابزانم ئەو نێوە زۆر لە مێژە. لە چاخی حکوومەتی نێیریی و تێکلات پەلای سەردا هەر هەبووە و ناوی پایتەختەکەی نێیری شاری «سوور» بوو کە «تێکلات پەلای سەر» ڕووخاندی و ١٢ شازادەی نێیری بەدیل گرتن. «أبن الأثیر» لە «الکامل»دا لە

میللەتی تیرەڕاهی دواوە کە لە خاکی سۆرانەوە شۆرش و فیتنەیان خستە خاکی جزیرە و زاخۆوە. لەم نامیلکە بچووکەدا بەدرێژی ناگونجێ کە بتوانم لێی بدوێم، بەڵام سۆران زۆر لە مێژتر هەبووە.

لە دوای ئەوە کە عیسا قەڵای ئاوانی گرت، کاروباری بەرزبوو؛ ڕۆژ بەڕۆژ سەرکەوت و هێزی پتربوو، بەئازایی و ڕەشیدی هەموو خاکی سۆرانی خستە دەست و بەسەریدا زاڵ بوو. شاری هەریری کردە پایتەخت و بەفەرمانڕەوایی ڕایبوارد، تا مرد.

## شا عەلی بەگ کوڕی (میر عیسا)

کە بابی مرد لەسەر تەختی فەرمانڕەوایی دانیشت و بەحوکمڕانی سۆران و کامەرانی و ئازادی بەسەری برد. کە مرد چوار کوڕی لە پاش بەجێما: عیسا، میر بوداغ، میر حوسێن، میر سەیدێ. لە پێش مەرگی خۆیدا خاکەکەی بەسەریاندا بەش کرد بوو، هەریەک بەبەشی خۆی قایل بوو و خۆیان لە بەشی برای دیکە نەدەگەیاند. هەریر کە پایتەختی بوو. دایە عیسای کوڕە گەورەی خۆی.

## میر عیسا کوڕی شاعەلی بەگ

کە بابی چوو، بەکۆمەکی برا و گەورەکانی سۆران بوو بەمیری سۆران و لە تەک براکانیدا زۆر بەخۆشی دەژیا و بەچاکی ڕایاندەبوارد. لە دوای چەند ساڵێک لەگەڵ پیربوداغی فەرمانڕەوای بابان شەڕی کرد و لە مەیداندا کوژرا. هەروەکو لە مێژووی حوکمدارانی باباندا بەدرێژی لێی دواین، هەریر و خاکی سۆران پشێو بوون و زۆر خراپ تێکچوون.

## پیر بوداغ کوڕی شا عەلی بەیگ

لەسەر خاکی خۆی دانیشتبوو، کە بابی مرد چووە سەر ناحیەی سوماقلق (سماقولی) کە لە دەست نیلحاسیانی قزلباشاندا بوو؛ گرتی و خستیە سەر خاکی خۆی. زۆر چاک فەرمانڕەوایی کرد و لەگەڵ خەڵکی بەخۆشی ڕایبوارد، هەتا چەند ساڵێک بەو دەستوورە ژیا، لە پاشان بەئامرزشی یەزدان شادبوو. کە مرد ٢ کوڕی بەجێهێشت: میر سەیفەدین و میر حوسێن.

## میر سەیفەدین کوڕی پیربوداغ

لە دوای بابی لەسەر خاکی میراتی دامەزرا و بەفەرمانڕەوایی ڕایبوارد. بەڵام زۆر نەژیا و مرد.

## میر حوسێن کوڕی پیربوداغ

له دوای مردنی برای لەسەر کورسی فەرمانڕەوایی سۆران دانیشت. بەڵام ئەویش زۆر خۆشیی له فەرمانڕەوایی نەچێژت و ڕاگیراو نەبوو. کە مرد ٧ کوڕی له پاش بەجێمان. میر سەیفەدین -کە کوڕی گەورەی بو- له جێگای دانیشت و ناحیەی سماقوڵی خستە ژێر دەستییەوە. هەروەکو له هاتوودا بەدرێژی لێی دەدوێین.

## میر سەیدیٚ

میر سەیدیٚ کوڕە بچووکی شا عەلی بوو. لەنێو هەموو کوردستاندا بەبەخشندەیی و ئازایی ناوبانگی کردبوو؛ بەزرنگی و ڕەشیدی هەڵیدابوو. له دوای مردنی بابی له «شەقاباد» (شەقڵاوە) فەرمانڕەواییدە کرد. بۆ تۆڵە ئەستاندنەوەی میر عیسا له پیربوداقی بابان تەقەلای دا و کەوتە بزووتنەوە. بەشەڕ و کوژتار پێشی پێگرت و پیربوداقی کوژت. خاکی برای کە هەریر بوو خستیەوە ژێردەستی خۆی. بەکەمە چاخێک خاک و شار و قەڵای هەریر و مووسڵ و کەرکوک و دەوروپشتیانی بەجارێک گرت و خستیەوە ژێر فەرمانی خۆی و بوو بەفەرمانڕەوایێکی ئازاد و سەربەخۆی ئەو خاکە.

میر سەیدیٚ کە هەموو خاکی بێژراوی گرتن و تەپڵی ئیستقلالی سۆرانی لێدا، بەکەیف و شادمانی و خۆشی گەلێک ساڵان فەرمانڕەوایی کرد. کە مرد میر عیزەدین شێر و میر سلێمان و میر سەیفەدین ناو ٣ کوڕی له دواماوە. میر سەیفەدین بەجوانەمەرگی مرد. میر عیزەدین شێر له چاخی بابیدا لەسەر خاکی هەریر فەرمانڕەوایی کرد.

ساڵی ٩٤١هـ سوڵتان سلێمانی قانوونی ڕۆم له تەورێزەوە بەزستان شپرزە ببوو خۆی گەیاندە سۆران. بەپەرێشانی گەیشتە هەولێر. زستانەکەی لەویٚ ڕابوارد. له بەهاردا بەرِق هەستاوی، میر عیزەدین شێری خنکاند و خاکی هەولێر و هەمووی دا حوسێن بەگی داسنی کە میرزادەیەکی یەزیدی بوو و هەموو خاکی سۆرانی له هەولێر گرێدا.

کە عیزەدین شێر کوژرا، میر سلێمانی براشی مردو ٣ کوڕی له دوا بەجێما: قوڵی بەگ، میر عیسا، میر سەیفەدین. بەڵام له خاکی سۆران بەجارێک ئەو بنەماڵە دەرچوو کەوتە دەست بیانی و داسنییانەوە.

## میر سەیفەدین کوڕی میر حوسێن کوڕی پیربۆداغ

لە ڕابردوودا گوتمان: کە خاکی «سماقولّی» خستە دەست. لە دوای ئەوە کە سلەیمانی قانوونی خاکی سۆرانی دا بەمیر حوسێنی داسنی، چەند جاران لە نێوانی میر سەیفەدین و ئەودا شەڕ و کوژتار کرا. لە دوامیندا میر سەیفەدین نەشیا خۆی ڕاگرێ، هەڵات و پەنای بردە بەر بێگەبێکی ئەردەڵان کە یارمەتی بکات؛ ئەویش لە ترسی سولّتانی ڕۆم ڕووی نەدایێ.

میر سەیفەدین بەناچاری و نائومێدی گەڕاوە خاکی سۆران و دەستەپیاوێکی شەڕکەر و ئازای پێکەوەنا و بەپەنهانی لەگەڵ هەموو خەلّکی سۆراندا گفتوگۆ و پەیمانی کرد و ڕێککەوت و بۆ لابردنی ئەو داسنییانە بوونە یەک دڵ و یەک قسە و هەوادار. میر سەیفەدین بەو هێزەی کە هەیبوو هەلّمەتی بردە سەر هەولێر.

میر حوسێن کە لەوە ئاگادار بوو بەلەز گەیشتە هەولێر. هەردوو لا بەگژ یەکتریدا چوون و کوژتارێکی قورسیان لێک کرد. میر حوسێن تەنگەتاو بوو و هەڵات. لەو شەڕەدا ٥٠٠ کەس کوردی داسنی کوژران و ماڵ و چەک و پێویستییەکی قورس کەوتە دەست میر سەیفەدین.

لە دوای ئەوە میر سەیفەدین بەزۆری شیری تیژی خۆی، هەموو خاکی سۆرانی گرتەوە، بەئازادی و سەربەخۆیی فەرمانڕەوایی سۆرانی دامەزراندەوە.

میر حوسێن ئەگەرچی چەند جاران لەشکری بردە سەری، هەر بەشکاوی و پەرێشانی دەگەڕاوە. لە هەموو شەڕەکاندا باوی میر سەیفەدین بوو.

کە دەنگی شکانی میر حوسێن گەیشتە سولّتانی ڕۆم، خواستییە ئەستەمبووڵ و دەستبەجێ لەوێ خنکاندرا. سولّتانی ڕۆم فەرمانی دا بەهەموو میر و فەرمانڕەواکانی کوردستان کە گەلە کۆمەگی لە میر سەیفەدین بکەن و بچنە سەری و بەسزای بگەیێنن.

گەورە و ئومەرایانی کورد هەر چەندە تەقەلایان دا و چوونە سەری هەر بەشکاوی گەڕانەوە. چەند جاران گەلەکۆمەگیان لێ کرد، دەرەقەتی نەهاتن. بەبێ گەیشتنە دلّخواز و ئارەزووی ڕۆمییان دەشکاندران. لە هەموو شەڕ و کوژتارەکانی میر سەیفەدین و میرانی کوردستاندا، هەر میر سەیفەدین سەر دەکەوت و بەسەریاندا زاڵ دەبوو، ئەوجا بەبێ بەرهەلّست و ڕەنج و بەفەرمانڕەوایی ڕایبوارد و دامەزراوە (شەرەفنامە).

میر سەیفەدین کە بەئازادی لەسەر فەرمانڕەوای خۆی ڕاگیراو بوو، یووسف بەگی

برادۆست کە بە«غازی قڕان» ناوبانگی کرد بوو، بەفڕوفێڵ کەوتە بن چنگییەوە و خەڵەتاندی و فریوی دا کە بڕواتە ئەستەمبووڵ. لە پاش گەلێک دەسایس هەڵیگرت و بردی. ئەگەرچی هیچ تەنگی و بێ دەسەڵاتی میر سەیفەدینی ناچار نەکرد بوو کە پەنا بۆ سوڵتانی ڕۆم ببا، بەڵام فریودانی غازی قڕان لە خشتەی بردە دەرەوە؛ دەنا چەند جاران لەشکری ڕۆم و میر و بەگ و فەرمانڕەوای کورد بەلەشکری کوردستانەوە چوونە سەری و پێی نەوێران، لە دوامیندا بەدوو قسەی یووسف بەگ فریوی خوارد و چوو و بەدەستی خۆی خۆی بردە پێش قەنارە و مەرگ.

میر سەیفەدین کە گەیشتە ئەستەمبووڵ سوڵتانی ڕۆم، سلێمانی قانوونی دەستبەجێ و بەبێ پرسیار و لێکۆڵینەوە گرتی و خنکاندی و بەداریدا کرد، لە بری خەڵات پەت لە مل و بەسێدارەدا هەڵواسرا (شەرەفنامە).

دیسان خاکی سۆران تووشی شپرزەیی بۆوە و دووچار بەنەبوون و وێرانی کراوە، لە دوای ئەو سەرکەوتنە، ژێر کەوت و چوو.

## قولی بەگ کوڕی سلێمان بەگ کوڕی میر سێدی بەگ

کە داسنیی بەسەر خاکی سۆراندا زاڵبوون، قولی بەگ دەستی لە نیشتمان بەردا و پەنای بردە بەر شا تەهماسبی سەفەوی.

لە خەڵکی سۆران دەستەپیاوێک کۆبوونەوە و بەپەنهانی پیاویان ناردە کن قولی بەگ و بۆ گەڕانەوەی خاکی خۆی هانیان دا و نەوازش و دڵخۆشییان داوە و گێڕایانەوە خاکی سۆران. بۆ حکوومەتی عوسمانی قاقەزیان نووسی کە خاکی سۆرانیان بداتەوە. سوڵتانی ڕۆم باوەڕی پێ نەهات، بەڵام لە خاکی بەسرە شاری سەماوەی پێدا. قولی بەگ چوو لەسەری دانیشت.

کە میر سەیفەدین و میر حوسێنی داسنی کوژران، سوڵتان حوسێنی ئامێدی لە تەک سوڵتانی ڕۆم موخابەرەی کرد و بۆ قولی بەگ خواهێشتمەندی نواند کە خاکی سۆرانی بدەنەوە. لەلایەن سوڵتانی ڕۆمەوە خاکی هەریری پێ دراوە.

قولی بەگ نزیکەی ٢٠ ساڵان لەو خاکەدا فەرمانڕەوایی کرد. کە مرد دوو کوڕی لە دوا بەجێما: سلێمان بەگ - بوداغ بەگ.

قولی بەگ پیاوێکی زرنگ و تێگەیشتوو و دەگەڵ خەڵکی سۆران زۆر بەمیهرەبانی بوو. شاری شەقڵاوەی کردە کوێستان و ڕازاندییەوە، بەهاوین دەچووە ئەوێ.

## میر بوداغ کوڕی قولی بەگ

کە قولّی بەگ مرد، میر بوداغ لە جێگای وی دانیشت و لەسەر شەقلاوە ئالای سەر بەخۆی هەلّدا. بەلاّم پیاوە دووڕوو و دووزمانەکان کەوتنە نێوانی هەردوو برایانەوە و پشێویان تێخستن. لە زبانەوە کار کەوتە شیر و خەنجەرەوە و کوشتارێکی قورسیان لێک کرد. میر بوداغ نەشیا لە پێش سلەیمان بەگ ڕاوەستێ، هەلاّت و پەنای بردە بەر سولّتان حوسێنی فەرمانڕەوای ئامێدی. چەند ڕۆژێک لە ئاکرێ چاوەنوڕی یارمەتی بوو، لەوێ دانیشت. مەرگ گەیشتە سەری و لە ئارەزووی خست و نەیهێشت بگاتە دلّخوازی و لە ئاکرێدا ناژترا.

## سلێمان بەگ کوڕی قولّی بەگ

لە دوای بابی بوو بەفەرمانڕەوای سۆران و لە هەریر دانیشت. کە میر بوداغی برای هەلاّت، خاکی ئەویشی خستە دەست خۆی و لەشکرێکی کۆکردەوە و لەبەر دوژمنایەتی پێشوو چووە سەر کوردی زەرزا.

ئەو لەشکرە ١٣ هەزار شەڕکەر بوو کە بردیە سەریان. لە دوای شەڕ و کوژتار، پایتەختی زەرزا کە شنۆ بوو گرتی. ٥٠ کەسی گەورە و سەرۆکانی بەدیل ناردە هەریر و ٥٠٠ کەسی زەرزای کوژتن. مالّ و مندالّ و خێزانی ناردنە هەریر. ئەوانەی لە شیری میر سلێمان ڕزگار بوون، هەلاّتن و پەنایان بردە لای سولّتان مورادی عوسمانی.

سولّتان ویستی کە تۆلّە لە میر سلێمان بکاتەوە، بەلاّم بۆی نەکراو لە دەستی نەهات.

میر سلەیمان کە زەرزای سەر نەرم کرد، بەو هێزەوە لینگی دا سەر قزلّباشان و تالاّنی کردن و گەلێکیشی لێ بەدیل گرتن. ئەو تالاّن و دیلەی بەدیاری بۆ سولّتان موراد بەرێ کردە ئەستەمبولّ. بەوە لە تەک ڕۆما بناغەی ئاشتی و دۆستایەتی دامەزراند.

لە دوای ئەوە چووە سەر قوباد بەگی ئامۆزای، کە لە لایەن خۆیەوە لەسەر «تەرک» داندرابوو، لەگەلّ سەرکێشی و ڕوو لە میر سلێمان وەرگەڕاندن خەریک بوو، بزۆزی دەکرد و تەمای فەرمانڕەوایی لەسەردا بوو. سالّی ٩٩٤ھ لەشکری ئاژۆتە سەر قوباد بەگ و کوشتاری لێکرد و نزیکەی ١٤ کەسی لە خزمانی قوباد بەگی کوژتن و گەڕاوە هەریر. بەوە شان و شەوکەتی قوبادی شکاند و بلاّوی کردەوە.

بەو سەرکەوتنە سلەیمان بەگ زۆر بەرزبوو و بەسەر هەموو فەرمانڕەواکانی دراوسێیاندا

زاڵبوو، بەدیاری و پێشکەش دان سەریان بۆ چەماندن و لە ترسی سلەیمان بەگ لە لەرزیندا بوون. سلەیمان بەگ بەوجۆرە تەپڵی ئازادی و سەربەستێتی لێدا و بەسەربەخۆیی لەسەر خاکی سۆراندا فەرمانڕەوا بوو.

لە «حەسەناوا»ی ئەردەلان، بێکە عولەمای بەناوبانگ مەلا حەیدەری باپیرە گەورەی بنەماڵەی حەیدەریی ماوەران و هەولێر و بەغدا و مەلا ئەبوبەکری باپیرە گەورەی مەلا گچکە (مەلا ئەفەندی مەلا ئەبوبەکر)ی هەولێری و ئەحمەد ئەفەندی ئەعیان کە هەردووکیان کانیی فەزڵ و هونەر و زانستیی کوردستانن، بردنیە خاکی سۆران. مەلا حەیدەری لە هەریر و مەلا ئەبوبەکری لە هەولێر دامەزراندن. لەو دوو زانا کوردانە عیلم پەرەی بەست و کوردستان هەتا ئەمڕۆ لەوانە فێری زانستێ بوون و گەلێک زانایان پێگەیاندن.

ناوونیشان و ئاساری سلێمان بەگ هەتا ئەمڕۆکەش لە کوردستاندا هەرماوە و بەدەنگ و خۆشخوانیی و پێ هەڵگوتن بەبەیتی سلەیمان بەگ دەبێژرێ کە پیاوێکی دادگەر و تێگەیشتوو و ئازا و بەناوبانگ بووە. هەتا مرد سەربەخۆ فەرمانڕەوایی کرد و گۆڕەکەشی لە هەولێرە.

## - عەلی بەگ کوڕی سلێمان بەگ

لە پاش بابی بوو بەفەرمانڕەوای سۆران. بەقسەی شەرەفنامە لە ساڵی ١٠٠٥ھ دا فەرمانڕەوا بووە، بەڵام مردنی لە ئێمە دیار نەکراوە.

خانزادە خاتوونی خوشکی سلێمان بەگ بۆتە فەرمانڕەوا. قەڵایەکی لە ناحیەی باڵەک و ڕۆژهەڵاتی ڕایات هەر ماوە، لەلای بانەمان و لە پشت هەریرێ قەڵای ماوە. قەڵای بنەی هەریر زۆر گەورە و سەختە و دیوارەکانیشی لەجێی خۆیەتی. ئێستاش بەناوی خانزادی سۆرانەوە ناو دەبرێن و لە بەیت و هەڵبەستاندا خانزاد و لەشکری لە کاردان. لە ئاساری عەلی بەگ گەلی عەلی بەگ و ڕێگا و پردەکانی هەر ماون.

## بەندی دووەمین

### لە مستەفا بەگەوە هەتا میر محەمەدی گەورە ١٠٣٢-١٢٢٩ھ

«نەعیما» ، کە مێژوونووسی تورکانە ، دەڵێ فەرمانڕەوای سۆران مستەفا بەگ لە هەموو بزووتنەوەیەک و لە هاتوچوونی لەشکری عوسمانیدا بۆ سەر شارەزوور و سنووری ئێران دەگەڵدا بوو و لە چەند سەفەری بەغدایەدا پیاوانە شەڕی کرد بوو.

بەڵام لە سەفەری نەسووح پاشای سەرعەسکەری ڕۆم، کە پیاوێکی دڵڕەق و زاڵم بوو، مستەفا بەگ یاریدەی نەکرد و نەچووە کنی. لەگەڵ کوڕی تەویل کە بەسەر بەغدا زاڵ بوو ڕێککەوت و بەمەرج بوو بەهەواداری. لەبەرئەوە گوێی نەدایە فەرمان و قسەی نەسووح پاشا و بۆچوونە سەر بەغدا بەهێندی نەگرت.

ساڵی ١٠٣٢ سەرداری ڕۆم، حافزی ئەحمەد پاشا بۆچوونە سەر بەغدا لەشکری ئاژۆت.

شا عەباسی شای ئێران لە دەرتەنگ ڕاوەستابوو؛ چاوەنۆڕی بزووتنەوەی ڕۆمیانی دەکرد.

حافز پاشا ئەمەی بەئەستەمبووڵ ڕاگەیاند کە کاروباری بەکر سوباشی جارێ وابمێنێت نەک پەلاماری بدرێ؛ چونکو ترسی ئەوەمان لە پێشەوەیە کە ببزوینەوە، شا عەباس لینگمان دەداتە سەر و دوامینی ئیشمان شپرزە دەبێ.

قسەکەی حافز پاشا لە سەرداری ڕۆم خۆش نەهات و پەسند نەکرا و فەرمانی دایێ کە لینگ بداتە سەر بەغدا و بیگرێت.

حافز پاشا ناچار بوو لە کوردستاندا دەستی بەلەشکر خڕکردنەوە کرد و کۆمەکی لە هەموو فەرمانڕەوا و ئەمیرانی کوردستان خواست. لەولاشەوە سەرداری ڕۆم لە دیاربەکر و خز و ئەرغەنی لەشکرێکی کۆکردەوە و بەلەشکرەوە چووە مووسڵ.

سەیدێ خانی میری عیمادییە، کوڕێکی خۆی و لەشکری بادینانی هەڵگرت و چووە مووسڵ. بوستان پاشا کە بەگلەر بەگی کەرکووک بوو، لە کوردی شارەزوور و بابان و ئەو دەوروپشتە سوپاهێکی شەڕکەری پێکەوەنا و چاوەنۆڕی دەکرد.

سەیدێ خانی میری عیمادییە کە خاڵی مستەفا بەگ سۆران بوو، وەڵامی دایە مستەفا بەگی بەلەشکری سۆرانەوە، یارمەتی لەشکری عوسمانی بکات.

مستەفا بەگ، بەسوپاهی خۆیەوە چووە کەرکووک. بوستان پاشا لەشکری شارەزووریشی خستە ژێر فەرمانی مستەفا بەگەوە و ناردیە بەغدا.

مستەفا بەگ کە بەسەرکردەیی لەشکری ئاژۆتە سەر بەغدا «ئەبداڵ بەگ» (خان ئاودەڵ)ی کوڕی عیزەدین شێری سۆرانی کردە نایبی خۆی و ڕوویان لە بەغدا کرد. لە نزیک «امام اعظم» چادریان هەڵدا. لە نێوانی کورد و بەکر سوباشیدا گەلێک قاقەز و ئێلچی هاتووچوونی کرد، بەڵام بەبێ سوود ماوە.

بەکر سوباشی بەشەو بەسەر لەشکری کوردانی دادا و شەڕ و کوژتارێکی قورسی لێکردن. لەو شەڕەدا کوردێکی زۆر بەکوژت چوون. بۆ سبەینێ دەستەپیاوێکی ئازای ناردە مەیدانەوە و هەردوو لا بۆ کوژتار ئامادە بوون و هەتا ئێوارە لە یەکتریان کوژت و لە دوای ئێوارە هەردوو لا گەڕانەوە.

ڕۆژی دووەمین هەروەها کوژتار بوو. ئەو ڕۆژە لەشکری بەغدا تەنگەی بەکوردان هەڵچنی و شپرزەی کردن. لەو شەڕەدا مستەفا بەگ لە مەیدانێدا بەکوژت چوو. بەهەزار دەردەسەری جەنازەکەیان ڕزگار کرد و هەڵیان گرت و ڕوو بەخاکی سۆرانیان برد و دایانەوە دەستی دایکی.

لەولاوە سەرداری ڕۆم لە کەرکووکەوە بەلەز ڕوو بەبەغدا پەلەی کرد. سلەیمان پاشای والی کەرکوک لە ڕێگایێ نەخۆش کەوت. کوڕ حوسێن پاشا، میری سۆران ئەبداڵ بەگ (خاون ئاودەڵ)، حاکمی خز و شەرەفخان، حاکمی ئەکێل مەئموون خان، حاکمی تەرجیل ئیبراهیم بەگ، حاکمی پاڵوو حەسەن بەگ، حاکمی ئەرغەنی سەرزل عەلی بەگ، حاکمی خەرپووت ئیبراهیم بەگ، حاکمی عیمادییە سەیدێ خان، ئەو ٩ فەرمانڕەوا و میرانی کوردە بەسوپاهی کوردانەوە چوونە بەغدا.

بوستان پاشا بەلەشکری کوردی شارەزوورەوە کەوتە پێش، ئەبدال بەگی سۆران کەوتە جەرگەی سوپاهەوە و بەجارێکی لە بەرامبەر بەغدایەدا ڕیزبوون و دەستیان بەشەڕ کرد.

لەو شەڕەدا گەلێک کورد بەکوژت چوون. سووباشی بەمامڵەت لەگەڵ عوسمانیی ڕێککەوت و لەسەر بەغدا ماوە، لەشکری کورد لە دوای گەلێک قوربانیدان گەڕاوە. (نعیما - جلد ٢ - لاپەڕە ٢٨٠).

لە مستەفا بەگ و میر ئەبدالّ ئەوەندەمان دەستکەوت کە گوترا. لە دوای ئەوان میری سۆران کەوتە ژێر پەردەی نەزانینەوە؛ چونکە لەگەڵ دراوسێکاندا شەڕوشۆڕیان نەبووە و دەگەڵ ڕۆم و ئێراندا مامڵەت و کۆمەگیان ڕووی نەداوە؛ بەتایبەتی کەسێکیش سەربهوردیانی ڕانەگرتووە. جا لەبەر ئەوە مێژووی سۆران داپۆشراوە.

بەڵام هێندە تێگەیشتووم کە لە دوای مستەفا بەگ و میر ئەبدالّ بەگ، خاکی سۆران تووشی گەلێک هەڵگێڕ و وەرگێڕ و بێ هێزی بووە و گەلێک خاک لە دەست میرانی سۆران دەرخراوە؛ بابان بەسەریاندا زاڵبوون و قەڵای ڕواندزیشیان لە دەستدا نەماوە. بەڵام ئەوەی لە زمانی خەڵکی ڕواندز و کتێبە دەسنوبسراوەکان و هێندێک گوتە و قسەی پیر و زاناکانم دەست کەوتبێ ئەمانەن کە لە هاتوودا دێنە گوتن؛ ئەویش بەڕاستم وەرگرتووە کە دەیانڵێم.

## میر ئۆغز کوڕی عەلی بەگ کوڕی سلێمان بەگ کوڕی شاقولی بەگ

ئەم میرە لە دوای عومەر بەگی میری سۆران بوو بەمیر و لەسەر فەرمانڕەوایی سۆران دامەزراوە. لە پاش عومەر بەگ قەڵای «دووێن»ی گرت و ئاوەدانی کردەوە. لەوددەمەدا لە لایەن حکوومەتی بابانەوە وەتەنگ هێنرا و هەربری لە دەست دەرخرا و بۆ خۆپارازتن جگە لە قەڵای ڕەواندز چیدیکەی شک نەدەبرد کە پەنای بۆ ببات. ئەویش لە دەست خەڵکی بیانییدا بوو. ناچار لەگەڵ ڕواندزیان موخابەرەی کرد و بەپەنهانی پەیمانی لێ وەرگرتن و کردنیە هاودەنگی خۆی و بۆ یاریدەدان ئامادەی کردن.

بەکۆمەگی و یارمەتیدانی «شەمام» ناو ژنێکی کوردی ڕواندز گەلێک هەواداری پەیداکردن. لە دوو لاوە لەشکری ئاژۆتە سەر ڕواندز بەبێ ئەوەی دەست درێژەکانی بیانی ئاگادار بن، بەپشتیوانی ئەهالییەوە ڕواندزی گرت و دوژمنەکانی گرتن و کوژتنی، کاروباری تێدا دامەزراند و بۆ یادگاری لە ڕۆژهەڵاتی قەڵای ڕواندزدا دوو کۆنگەرەی بەناوی «شەمام» دروستکردن. ئەو کۆنگەرانە ئێستاش لەو کۆنگەرانە یەکێکیان ماوە و پێی دەڵێن کۆنگەرەی شەمام.

لە دوای ئەوە میر ئۆغزدۆڵی ئاکۆیان و دەشتی سۆرانی گرت و ڕواندزی کردە پایتەخت. ئەوە یێکەمین جارە شاری ڕواندز کرا بەپایتەختی سۆران. میر ئۆغز هەتا ساڵی ١٢٠٧ فەرمانڕەوایی کرد و بەئامرزشی یەزدان شاد بوو.

## ئەحمەد کوڕی ئۆغز

ئۆغز بەگ کە مرد، ئەحمەد بەگی کوڕە گەورەی لەسەر تەختی فەرمانڕەوایی دانیشت. هیندێک لە سەرکردەی سوپا تەمای شۆڕشیان هەبوو، بەزۆر و بەبەخشیش نەوازشی کردن و فیتنەی کوژاندەوە.

لە ساڵی ۱۲۱۵دا ڕۆژێکی ئەحمەد بەگ چووبووە سەرسا کە لەسەر ڕێگای جندیانە و ئێستاش قشلەی لێیە، لە سەیران بوون و دەگەڵ «شەنگی بەگ»ی دەرگەڵەیی ڕمبازێ و شەڕ ناخێوی دەکرد. لەناکاو دڵی ڕاوەستا و مرد و بەربۆوەوە خوارێ. شایی بوو بەشین، جەنازەکەیان هەڵگرت و لەسەر تەپەی داری سەیدێ، کەلەکانی گەرمۆکانە، ناژتیان.

ساڵی ۱۹۲۸ی زایینی من چووم گەڕام و گۆڕەکەی لەوێ بوو دۆزیمەوە. لەسەر کێل و بەردی گۆڕەکەی ئەمانە نوسرا بوون خوێندمەوە. لە کێلی لای پێیانی ئەمەیە: «الدوام لله. هذا قبر المرحوم المغفور له أحمد بگ ابن أوغز بگ رحمه الله. توفى في سنة الف ومائتين وخمسة عشرة من الهجرة».

لە کێلی لای سەری ئەم شیعرانە بەفارسی نووسرابوون:

یارب بەصفا ساز گوزین دار سلامت

باز آیدو برهاندم از چنگ ملامت

ئەوانە پێنج شیعرن و لە بەردی باشوور و باکوری گۆڕ (قبر)ەکەدا ئەم دوو شیعرانەی شێخی سەعدی نووسراون «ای کریمی کە از خزانەء غیب» هەتا دوایی (سنە ۱۲۱۵).

ئەو قەبر و بەرد و کێلە ئەمڕۆکەش وەکو خۆیەتی و ماوە.

«ئۆغز بەگی کوڕی مەحموود بەگی کوڕی ئەحمەد بەگی کوڕی سوڵتان مەحموود بەگی کوڕی خان ئاودەڵی کوڕی یەزدین شێری کوڕی ئۆغز بەگی کوڕی عەلی بەگی کوڕی سلەیمان بەگ».

ئەمەم لە کتێبێکی دەستنووس وەرگرت کە لە دەوری ئۆغز بەگدا بەوجۆرە نووسرابووکە ئەحمەد بەگ لە ساڵی ۱۲۱۵ مرد، خەڵک کۆمەڵەیان بەست و ئۆغز بەگیان کردە میری سۆران و هەموو پێویستییەکی فەرمانڕەواییان بۆ ڕێکخست. بەڵام پیاوێکی ئاینپەروەر و بەنوێژ و ڕۆژوویێکی زۆربوو. هەموو دەمێ لە مزگەوتدا ڕایدەبوارد و لەگەڵ مەلا و فەقێ هەستان و دانیشتنی هەبوو و نەدەپەرژایە سەر فەرمانڕەوایی.

بەڵام ئەحمەد بەگ کوڕی چاک و ئازای لە پاش بەجێما. سلەیمان بەگی کوڕی عەلی بەگی سیلاحشۆر کە ئەمڕۆکە یێکە پیاوی ڕواندزە، نەتەوەی ئەو ئەحمەد بەگەیەیە.

نازانم لەبەرچی بووە کە کوڕانی ئەحمەد بەگ نەبوونە میر و ئۆغز بەگ هەڵبژاردراوە.

میر ئۆغز بەگ ٦ کوڕی ناوداری هەبوون و خاکی خۆی بەدەستووری هاتوو بەسەردا بەشکرد بوون. هەودیان و شێتنێ و دۆڵەمەڕی بۆ تەمەرخان. سیدەکان و خاکوڕک و پیرەسنی بۆ یەحیا بەگ. دەشتی سۆران و باپشتیان بۆ بایز بەگ. رواندز و ئاکۆیان و باڵەکان بۆ مستەفا بەگ کە کوڕی گەورەی بووە. میر ئەحمەد و میر حەسەن کە کوڕە بچووکی بوون، لەماڵ خەریکی خوێندن بوون. ئەوانە هەرێیکە لەسەر خاکێکی کە بابی پێیدابوون دانیشتبوون و فەرمانڕەواییان دەکرد. ساڵی ١٢١٨ میر ئۆغز بەگ مرد.

## مستەفا بەگ کوڕی ئۆغز بەگ

کە ئۆغز بەگ مرد، بەکۆمەگی و یارمەتی خەڵکی ڕواندزەوە، مستەفا بەگ بوو بەمیری سۆران. براکانی بەبرا گەورە و میر پەسندیان کرد و کاروباری فەرمانڕەواییان بۆ پێکهێنا و دامەزراندرا.

مستەفا بەگ هەرچەندە پیاوێکی زرنگ و ئازابوو، بەڵام لە بەرامبەر شۆڕش و سەرکێشی براکانی لێ بزربوو. گەلێک تەقەلایدا نەشیا کاروباری فەرمانڕەوایی ڕێکخا، چونکو براکانی هەرێیکەی لە گۆشەیەکی سۆراندا بزۆزیان دەستپێکرد بوو و هەردەمە و بەبهانەیەکی پشێویان دەنواند.

مستەفا بەگ نەیدەویست، بەخوێنڕژتن پێشیان پێبگرێ، ئەوانیش لە وەڕا نەدەمان، وایشیان لە تام بردبوود دەرەوە.

ساڵی ١٢٢٠ تەمەرخان بەگ لەتەک سلێمان بەگی بابانی حاکمی کۆیێ و هەریردا بناغەی دۆستایەتی دامەزراند و بۆچوونە سەر رواندز هانیدا و داوای یارمەتی لێ کرد، بەمەرجی ئەوە تەمەرخان بکرێتە میری سۆران، لەسەر ئەوە پەیمانیان گرێدا.

سلێمان پاشا بەسپایەوە چووە پێش. میری ڕواندز توانای پێش بەدوژمنگرتنی نەبوو و پشێوی نێوانی بێ هێز و ناتەوانی کردبوو. چەند کەسێکی کە لە دەستتدا بوو خزاندیە ڕواندزەوە و هاواری لە براکانی کرد، کەسیان یارمەتییان نەکرد. سلێمان پاشا لەولاوە ڕوو بەڕواندز هاژۆتی و گەیشتە شاری «ئالانە» کە ئەمڕۆکە دێیەکە لە چۆمی خەلیفان. لەشکری بابان لەوێ هەڵیدا.

میر مستەفا هەرچەندە تەقەلای دا و لەملا و لەولا داوای یارمەتی کرد و خەریک بوو پێویستی شەڕ پێکەوەنێ؛ بەڵام بۆی ڕێک نەکەوت. ناچار و نائومێد بوو دەستی لە گیانی بەردا و سەری خۆی هەڵگرت و بەشەو لە «گەلی کۆنە بەفر لە کێوی کوڕەکەود سەرکەوت و پەنای بۆ سلەیمان پاشا برد کە دوژمنی بوو، یان بیگرێ یان بیبەخشێ. لە ڕێگادا پاسەوانان دەنگیاندا و گوتی: (ناردراوی مستەفا بەگم قاقەزم بۆ پاشا پێیە». بەو شەوە بردیانە چادری پاشا.

سلێمان پاشا کە لێی وردبووەوە، پیاوێکی لاوچاک و زانای کەوتە بەرچاو. بەمیهرەبانی و نەوازش جێدانیشتنی نیشاندا و لێی پرسی تۆ کێی و ناوت چییە؟ گوتی مستەفا بەگم و سەربهوردی خۆی بۆ گێڕاوە.

سلەیمان پاشا زۆر داما و لێی پرسی: نەترسای هاتیە لام؟ گوتی: لە پیاوەتی و گەورەیی بنەماڵەییت دڵنیابووم و بەمیهرەبانی و دڵپاکی و بەخشندەییت شادمان بووم کە هاتم. لەسەر هەتا دوایی بەسەرهاتووی خۆی گێڕایەوە.

پاشای بابان زۆر پیاوانە و جوامێرانە پەرا (خزمەت)ی کرد و ئەو شەوە بەمیوانداری و کەیف دەگەڵی بەسەری برد. سبەینێ بەخەڵات و دیاریی گەلێک دەستگیری و مەرج و پەیمانی لە تەکدا گرێدا و ناردیەوە ڕواندز و بۆ خۆشی گەڕاوە کۆیێ.

## مستەفا بەگ و شەڕی بابان

مستەفا بەگ بەو دەستوورە ڕایبوارد و هەتا ساڵی ١٢٢٧ھ بەئازادی فەرمانڕەوایی کرد. دیسان براکانی لەتەک حوکمدارەکانی باباندا دەستیان کردەوە.

سلێمان پاشا لەو ساڵەدا بوو بەحاکمی کۆیی و حەریری. لەگەڵ ئاورەحمان پاشای بابان شەڕیان کردبوو. ئاورەحمان پاشا چووبووە خاکی ئەردەڵان. سلەیمان پاشا کەلێنی دەستکەوت و لە ڕۆژی ٢٠ی مانگی ڕەجەبدا لەشکری ئاژۆتە سەر قەڵا و شاری ڕواندز، لە ڕۆژهەڵاتی شار و لە دەشتی سەرسا شاری تەنگەتاو کرد.

مستەفا بەگ بەوە هیچ تەنگەتاو و ڕەنجیدە نەبوو، پشتی بەقەڵای سەخت و دۆڵ و خەرەند و گەلی ڕواندزەوە دەروازە لەسەر خۆی گرێ دا و دانیشت. هەموو ڕۆژێ هەڵمەتیان دەبرد و بەبەرد و گوللە و تفەنگ دەگەڕاندرانەوە، نزیکی مانگێکی بەو دەستووره ڕابوورا و شەڕ و شۆڕش ڕاگیراو بوو.

لە مانگی شەعباندا ئاورەحمان پاشا لەولاوە هێزی گرتبوو، پەلاماری خاکی شارەزووری

دابوو. سلێمان پاشا کە لەوە گەیشت، ناچار بوو دەست لە ڕواندز بەردات و خۆی بگەیەنێتە خالید پاشا لە دەست ئاورەحمان پاشادا تەنگەتاو کرا بوو. لەشکری هەڵگرت و گەڕاوە.

مستەفا بەگ ١٠٠ کەسی ئازای ڕێکخست و ناردی لەگەڵی «مێگر» و «بێجان» دایمەزراندن و ڕێگا تەنگ و سەختە پیادە ڕێییانەی گرت. لەشکری بابان هەموو سوارئەسپی چاک و پۆشتە و پڕ چەک بوون. چەکی دەستیان ڕمب و شیر و خەنجەر و دەمانچە و قەرەبینا و تفەنگی بازنە زێڕ و زیو بوو. نەیانتوانی لە ڕێگای گەلی و تەنگ و سەختی مێگردا شەڕ بکەن، هەرکەس رکێڤی لە ئەسپ دا و سەوکەوت و گرانبار و چەک و باروووت و دانەوێڵەیەکی قورسیان بەجێهێشت. هەمووی کەوتە دەست مستەفا بەگ، بەو جۆرە لەشکری بابان گەڕاوە خاکی خۆی.

هەموو خەڵکی ڕواندز ئەم سەربهوردەی لە مەودوا زانی کە سەیدێ مستی ناو پیاوێکی ڕواندزی کە نۆکەری مستەفا بەگ بوو، لەسەر ئەشکەوت (شکەفت)ی «کۆنە قەپچی» لە سەنگەردا دەبێ، لەودەمەدا سوارەیێکی بابان سواری ئەسپێکی بۆزی تێکسمراو بووە و ڕمبێکی سەر بەتۆپز و کولینگەدار و بەتۆپی لە دەستدا. کاڵەیەکی شەمامەبەندی ئەوریشم چنی لەپێدا، دەرپێ و دەمەو قۆپانی ماوتی زەردی لە لینگدا، شیرێکی کالان زیوی دەستە و گۆپکە زێڕی بەتەنیشتیدا هەڵواسرا و، جووتە دەمانچەیەکی قەرەبینای جەوهەرداری بەقەڵپوزی زیندا، تفەنگێکی شەشخانەی بازنە زێڕ لە پێش، شاڵێکی تورمەی گرانبەهای لەسەر ئالاندوە؛ دەرماندان و گوللە و ساچمە و چەشنی و پەڕۆ و بەردئەستێدانی بەملا و بەولادا بەربۆتەوە. کەمبەرەیەکی زیوی لەپشتە، خەنجەرێکی قونچک زێر بەپشتەوە، بەلەنجەولار لەسەر لار کیفێک لارسوار بووە و زۆر بەشۆخوشەنگی جڵەوی ئەسپی شل بەرداوەتەوە و دەڕوا و لەناکاو لە کۆسپەیەک سەر دەکەوێ. لە پڕێکا سەیدێ مستی بانگی دەکا و تێی دەخوڕێ، مەڕۆ تفەنگت بۆ هات.

سوارەی لاوچاکی بابان دەڵێ باوەکەی ڕانک لەپێ، توخوا ئەمە مەکە. بەخوا کەمەری زێڕی خێزانم بەدوو هەزار ڕیاڵ و کۆفیە و کاشانەیان بەپێنج سەد ڕیاڵ و لاو لەرزانە و دەرزی سەر بەرۆکیان بەهەزار ڕیاڵ و چەکمەی زەردیان بەدە ڕیاڵ کڕاون، تۆ هەموو بەرگی بەرت دوو ڕیاڵ ناهێنێ. چۆن من دەکوژی. ئەوە دەڵێ و ڕکێڤ لە ئەسپ دەدا و بۆی دەردەچێ و سەردەکەوێ. هەتا سەیدێ مستی تفەنگی دادەگرێتەوە و تیزە و بەردەستێی لەسەر دادەنێ و قامکی پێدا دێنێ، سوار لەبەر چاوان ون دەبێ.

مستەفا بەگ بەم جۆرە گەلێکی ماڵ دەستکەوت و گەڕاوە. بەڵام زۆر پێ نەچوو لەگەڵ براکانی تێکچوونەوە. تەمەرخان و میر یەحیا چەند جاران هەڵمەتیان بردە سەر ڕواندز و نێو بازاڕیان تالان کرد و جەور و ئەزیەت و ئازاری خەڵکیان دەکرد. بایز بەگ لە تەکیانا ڕێککەوت و پشتی لە مستەقا بەگ کرد. مستەفا بەگ بێ هێز بوو.

چەند جار مستەفا بەگ ویستی یەکێک لە براکانی بکاتە میر و بۆ خۆی بەگۆشەگیری دانیشێ، بەڵام بووک شازەمان خێزانی کە ژنێکی بەهۆش و تێگەیشتوو و زانابوو، نەیهێشت و پێی گوت چوار کوڕت هەیە و میر محەمەد گەورەیانە و لە جۆڵەمێرگ دانیشتووە، بیکە بەمیر و لێیگەڕێ.

مستەفا بەگ دەستبەجێ میر محەمەدی خواستە ڕەواندز و بەشەو ئەوەی بۆ گێڕاوە، بەمەرجی ئەمە بابی خۆی لە هیچ کارێک نەگەیەنێت، میرایەتی دەکا. مستەفا بەگ ترسا لەوەی میر محەمەد هەموو براکانی بکوژێ، لەبەرئەوە نەیکردە میر.

ساڵی ١٢٢٩ مستەفا بەگ بێزار بوو، بانگی میر محەمەدی کرد و لەسەر دەستی گەورە و ڕیش سپی و چاودشان بەسێ مەرج میر محەمەد بوو بەمیر. مستەفا بەگ چووە ئاکۆیان و قەڵای «دمدم»ی دروست کرد و تێیدا دانیشت، هەتا ساڵی ١٢٣٨ لەوێ مرد، جەنازەکەیان هێناوە ڕواندز و لە گەردەگەردێ ناژتیان.

## بەندی سێیەمین

### میر محەمەد ئەمیری مەنسوور کوڕی مستەفا بەگ ١٢٢٩-١٢٥٤

هەروەکو گوترا مستەفا بەگ بەڕاو و تەگبیری گەورەکان بە٣ مەرجان کە میر محەمەد خواستبووی، بوو بەمیری ڕواندز.

میر محەمەد ساڵی ١١٩٨ھ لە ڕواندز هاتۆتە جیهانەوە. دایکی ناوی بووک شازەمان بوو. لەکن مامۆستای تایبەتی خوێندوویەتی، مەلای بەناوبانگی کوردستان مەلا ئەحمەد ئادەمی (دێڵـزەیی) کـە لە باڵەکـان بـوو، بەتایبـەتی مـسـتـەفـا بەگ بردیە ڕواندز و قـوتابخـانەیەکی بۆ دروست کـرد کـە ئەمـڕۆکـەش ئەو مـزگـەوتە دیوارەکـانی مـاوە کـە لە باشووری (قیبلە) قەڵاتی لۆکان و لە دەری شووڕەی قەڵای پێشوو بوو، لەوێ دانا و لەگەڵ پەروەرشی میر محەمەد خەریک بوو.

میر محـەمەد کە لە خوێندن سەرکـەوت، لە لایەن بابیەوە ناردرایە سـەر دێهاتی دۆڵی گـەڕان، جـۆڵەمـێـرگ، دۆڵـی هەوتیـان و سـەرچیـا. لەو خـاکـانەدا بەڕەعـیـەتپـەروەری ڕایدەبوارد.

لە ساڵی ١٢٢٨ میر مستەفا لە دەست براکانی بێزاربوو، ناردیە دووی میر محەمەد کە بیکاتە میری ڕواندز. میر مـحـەمـەد ٣ مەرجی لە تەکیـا کـرد، ئەوجـا مـیریەتی خسـتـە گەردن:

یەکەم- مستەفا بەگ ٦٠٠٠٠ ڕیاڵ و بووکشازەمان ٣٠٠٠٠ ڕیاڵ، کە دەکاتە ٩٠ هەزار ڕیاڵی بدەنێ.

دووەم- مستەفا بەگ خۆی لە کردەوە و ئیشوکاری محەمەد بەگ نەگەیەنێت.

سێیەم- باوکی لە ڕواندز بچێتە گوندی ئاکۆیان دانیشێ.

مستەفا بەگ ترسا کە میر محەمەد هەموو برا و خزمەکانی بخنکێنێ، گوتی: پێویست نابینم و گەڕاوە چووە جۆڵەمێرگ.

ساڵی دووەم مستەفا بەگ بێزاربوو، ناردیە دووی میر محەمەد و کلیلی خەزینە و ماڵ و

قەڵای پێدا و ٦٠ هەزاری خۆی و ٣٠ هەزاری بووکشازەمانی پێدا و لەسەر دەستی سەرۆکان کردیە میر و باری کرد و چووە ئاکۆیان دانیشت، هەتا ساڵی ١٢٣٨ مرد.

میری گەورە زۆر تێگەیشتوو و زانا و زرنگ بوو، بەلەز دەستی بەپێکهێنانی پێویست ‌و چەک و جەبەخانە رێکخستن کرد و سێ چوار هەزار ریاڵی دا بەچەک و دوو هەزار پیاوی ئازای کردنە سوپا و بەچەک و جەبەخانە ڕازاندییەوە و نزیکەی هەزار سوارەیێکی قۆچاخیشی ڕاگرت و بەشیر و ئەسپی چاک و جلوبەرگی جوانی کردن. لە بەرامبەر ڕواندز لەسەر تەپەیەک کە لە باکوری شارە، قەڵاییێکی زۆر سەخت و توند و بڵندی دروست کرد و ناوی نا «ئێچ قەڵا» (ئەمڕۆش ئەو قەڵایە ماوە) بەتۆپ و تفەنگ و سوپا پڕی کرد بوو.

لە مانگی ڕەجەبی ئەو ساڵەدا دەستی کردە بناغە دامەزراندنی قەڵا و شوورەی دەوری ڕواندز. دوو کۆنگەرەی لە ڕۆژئاوای شار و لەسەر تەپەیێک دامەزراند. ئەم شیعرە فارسییەی لە دەروازەکەیان نویسی:

دو کنگر را نهـادم بر دو پیکر
رواندز شـد رویین دژ، بار دیگر

ئەمڕۆ ئەوانە خرابەن. لە ڕۆژهەڵاتی شار کۆنگەرەیێکی پێشوو شەمام و یێکی دیکەی دروستکردن و ناوینان جووت کۆنگەرەی شەمامێ، کە ئەمڕۆکەش کۆنگەرەیێکی ماوە.

لە دەورەی شار دیوار و شوورەی بینا کرد و بەسێ دەروازەی دامەزراند. دەروازەیەک لەسەر خەرەند و دەروازەی بەشوورە لەسەر دەروازەکە کۆنگەرەی دروستکردن. هەر دەروازەییێک کونگەرە و بورج و سەنگەری لێ دامەزراندن و بەچەک و سوپا پڕی کردن. بەوجۆرە ڕواندزی زۆر توندکرد. ویستی لە باشووری (قیبلە) قەڵاوە بیبڕێ. خەرەند کە ڕۆژهەڵاتی شارە لەگەڵ گەلی خاڵەڕەش بیگەینێتەوە یەک و بیدڕێ، کە ئاوی خەرەند و چۆمی ڕواندزی پێدا هاتوچوو بکەن. ئەمڕۆکە جێگای ماوە، بەڵام تەواوی نەکرد.

لە دوای ئەوە کە ئەو کارە گەورانەی پێکهێنا و دیوار و شوورە و قەڵا و کۆنگەرەکانی ڕێکخست و بەچەک و سوپا دایمەزراندن، گەلێک سوارانی بلباسی بردە کن خۆی و کردنیە سوارەی تایبەتی و جیرەی بۆ بڕینەوە و لەسەر ڕێیاندا پاسەوانی دانان کە کەس ڕێگری و خراپە نەکات.

لە هەموو کارێکی کە کردوویەتی ئەمە زۆر گەورە و بەجێ بوو کە میری گەورە بۆ ئاگاداری و تێگەیشتنی خاکی خۆی، پیاوی چاک و خراپی دانا بوو. ڕەشبەڵەک، ژن و پیاو پێکەوە ڕاوەستان و کۆمەڵبەستن، لە مزگەوت دانیشتن بێ پەرستش، بەجارێک

لابران. ڕەعــیــەت و ئەهالی شـار و دێهـات و سـوپا بێ پەردە دەچوونە کنی، کـەسـێک نەدەبووە ڕابەری چوونەکن مـیـر. خـاوەند پیـشـە و کـار و عـولەمـا لەلای زۆر خـۆشـەویست بوون. لە گـەڕۆک و فـەقـێ و ئەوانەی بۆ کـاروئیش دەچوونە دێهـات و لە هێلکەفـرۆش و چەرچی و دۆم پیـاوانی هەڵبـژارد بوون. ڕۆژ بەڕۆژ چی بکرابایە و کێ هاتوچۆی بکـردبایە پێیـان ڕادەگەیاند. بۆ ئەو جۆرە پیاوە قسە گێڕەوانە جیرەی بۆ گرێ دابوون. لەناو بازرگان و عولەماش پیاوی تایبەتی هەبوون و ئاگاداریبیان دەکرد. ڕۆژ و شەوێ کێ بڕۆیشـتبایەتە ڕواندز میر دەیزانییەوە و هیچی لێ ون نەدەبوو.

## کوژتنی عەبدوڵڵا ئاغای خەزێنەدار

عـەبدوڵڵا ئـاغـای خـەزێنەدار کـە لە لای مـسـتـەفـا بەگ بوو، لەلای مـیـری گـەورەش بوو بەخەزێنەدار. گەلێک هاتوچۆی تەمەرخانی مامی میری دەکرد. میر محەمەد جارێکی پێی گـوت: «عــەبدوڵڵا چاوەش زۆرم خــۆش دەوێـی و حــەز ناکــەم دڵت بشـکـێنم، چیـدیـکە هاتوچۆی تەمەرخانی مامم مەکە». عەبدوڵڵا ئاغا پەیمانیدا کە نەچێ. جاری دووەم دیسان چوو، کە گەڕایەوە میر بانگی کرد و گوتی: عـەبدوڵڵاغـا زۆر حەقت لەسەر بابم هەیە من حەز ناکەم ژێرپێ بی و دەستهەڵگرە.

سێیەمین جار بەهێندی نەگرت و چووە هەودیان، لە گەڕانەوەدا بوو بەمیر ڕاگەیاندرا کە عەبدوڵڵاغا چووە و گەڕاوە.

میـر لە پەنجـەرەوە تەمـاشـای کرد لە گەلی گیـانـهـاوێژ دێتەخوار. فـەرمـانیـدا بەمـامـیـس چاوەش و سوراو چاوەش، بچن عەبدوڵڵاغا بگرن و بیبەنە کنی.

هەردوو کە گەیشـتنێ بانگیـان کرد: خەنجەردانێ عەبدوڵڵاغا. عـەبدوڵڵاغـا خەنجەری نەدانێ. مـامیس چاوەش گوتی: حەولا کـار لەکار ترازاوە، یان دەتگرین و یان دەتکوژین. عەبدوڵڵاغا شەرمی بەخۆی بوو خەنجەریان بداتێ، ڕەشاغای خواست و خەنجەری دایێ.

ڕەشاغا هەم سەرکردەی سوپاو هەم گەورە و قسە ڕەوای شاری ڕواندز بوو. عەبدوڵڵاغا و خەنجەری بردە لای میر. ڕۆژی ٢١ی شەوالی ساڵی ١٢٢٩ عەبدوڵڵائاغا گیرا.

میر بەعەبدوڵڵاغـای گوت: چەند جار رام ئەسپاردی گوێ دێری و قسە بیستیت نەکرد و خـــۆت لە پێناوی تەمـــەرخـــان نا. ئەوەی پێگـوت و ناردیە زیندانەوە. ژن و منداڵی عەبدوڵڵاغـا بەلەز چوونە ئاکۆبان و هاواریان بردە بەر مستەفا بەگ کە فریای عـەبدوڵڵاغا کەوێ.

میر بەحەسەن مەملووکی میر غەزەبی گوت: بەشەو لە زینداندا عەبدوڵلاغا بخنکێنێ و بەسێدارەی داکات. ئەوە یێکەمین پیاوێکە میر کوژتی و بەداریدا کرد.

سبەینێ زوو، مستەفا بەگی بابی میر گەیشتە ڕواندز. عەبدوڵلاغای بەدارەوە دی و زۆر دڵگیربوو. بەمیری گوت: عەبدوڵلاغا هی کوژتن نەبوو. میر گوتی: هۆ باب مەرجی من و تۆ چی بوو؟ مستەفا بەگ بەڕەنجیدەیی و دڵگیریی گەڕاوە ئاکۆیان.

عەبدوڵلاغایان لەو بەری پردی ڕواندز لەسەر ڕێگای باپشتیان ناژت. کوژتنی عەبدوڵلاغا بوو بە ناوبانگێکی زل بۆ میر و بەهەموولاییێکەوە دەنگیداوە. دۆست و دوژمن داچڵەکین و سلەمین و وەجنقینەوە. سامی میر بەسەر هەموو دراوسێکاندا شکا و مامەکانی کەوتنە ترسولەرزەوە.

## چوونی میر بۆ سەر مامەکانی لە ساڵی ١٢٣٠ی کۆچیدا

میری گەورە و زانا، کە بناغەی فەرمانڕەوایی لە ڕواندز دامەزراند، خۆی توند کرد و شاری کردە قەڵاییێکی سەخت و دژوار، چەک و پێویست و سوپا گەیشتە پایەی دڵخواز. بۆ ئەوە کە میر بتوانێ گەورە بێ، لە خاکی خۆیدا بێ ئازار و ئێش بژی، لە پێش هەموو چتێکیدا لابردنی مامە سەر ڕەقەکانی خستە پێش. بۆ سەرکەوتن و بەئارەزوو شادبوون، دەبێ مامەکانی بکاتە پایەی ژێر پێ تابتوانێ سەرکەوێ. بۆ ئەوە لەشکر و پێویستی ساز کرد و بەدڵێکی ڕقاوییەوە ڕۆژی یێکەمی موحەڕەمی ١٢٣٠ لەشکری لە ڕواندز دەرخست و بە٢ هەزار پیادەی ئازاوە چووە سەر «هەودیان».

میر کە گەیشتە سەر چۆمی باڵەکییان فەرمانی دا پردێکی ١٨ گڵی دامەزراند. لەشکر لە نێوانی هەودیان و باڵەکییاندا هەڵیدا. لەولاوە تەمەرخان چووە پێشی.

لە دوای شەڕ و کوژتار، تەمەرخان تەنگەتاو کرا و هەڵات و ڕوو بەشێتنە چوو. میر بەکوژتار کەوتە دووی هەتا لە قەڵای شێتنەی پەستاوت و لە دووی نەبووەوە.

تەمەرخان قەڵابەندیی کرد. میر دەورەی قەڵایدا، هەردوو لا بۆ کوژتاری یەکتر تێدەکۆشان. میر شەو و ڕۆژ قەڵای ئاور باران دەکرد و هەڵمەتی دەبردێ، تەمەرخان بەرامبەری کرد و لە کونگەرەوە بەتفەنگ دەیانگێڕانەوە پاشێ.

قەڵای شێتنە زۆر توند و قایم و سەخت بوو و گرتنی زۆر دژواربوو. میر زۆر ئەزیەتی کێشا، لە پاشان فەرمانیی دا لە بورجی ڕۆژئاوای لای قیبلەوە لغومیان لێدا و کۆڵیان و پڕیان کرد لە باروت و ئاوریاندا، بەجارێک بورجی هەڵتەکاند و بەریداوە خوارێ.

رۆژی ٢٨ی موحەڕەم بورج کە کەوت لەشکری میر بەخەنجەر و قەرەبینا کەوتنە ژوورەوە و هەتا ئێوارە لەنێو قەلادا شەڕبوو. گەلێک پیاو کوژرا و خوێنێکی قورس ڕژاندرا. تەمەرخان و مەحموود بەگی کوڕی بەدیل گیران. لەلایەن میرەوە، محەمەداغای شێتنە کرا سەرکردەی شێتنە و چەند کەسێکی بۆ بەجێهێشت و بۆ خۆی و دیلەکانی گەڕانەوە ڕواندز.

شەوی یێکەمینی ڕەبیعی یەکەم میر فەرمانیدا بەحەسەن مەلووکی میر غەزەب کە تەمەرخان و مەحموود بەگی کوڕی بخنکێنێ. ئەو شەوە هەردوو کوژران و بەدارێدا کران. سبەینی بردیانە سەر ڕێگای پردی ڕواندز و ناژتیانن.

من بۆ خۆم سالی ١٩٢٧م چوومە شێتنە. ئەو قەلایە و بورجەکانی کە ڕووخاندرا بوون دیتمن. ئەمڕۆ ئەو قەلایە وێرانە، بەلام جێگایەکی زۆر سەختە. خەلکی شێتنە و ئەحمەدخان نەتەوەی ئەو محەمەداغایەن کە میری گەورە کردبوویە گەورەی شێتنە.

پیاوە گەورانی ئاوایی، سەربهوردی مێژووی شەڕ و گرتنی تەمەرخان و قەلادەورەدان و بورج ڕووخاندن و کوژتارەکەیان بۆ گێڕامەوە. بەلام لەم نامەیەدا ناگونجێ درێژەی پێ بدەم، بەکورتی لە مەلیخام ئەو بهوردە وەرگرت کە لەسەرەوە گوتران. بەوە دلنیابووم نەک بەقسەی ئەهالی شێتنە.

لە دوای ئەوە قاقەزێکی بۆ میری ڕۆست و یەکێک بۆ یەحیا بەگی مامی نارد کە بەقسەی خاو فریونەخۆن. گوناهی خۆیان لە گەردنی خۆیان بێ. میری ڕۆست بەهەڕەشە وەلامی داوە.

میری گەورە ٣ جاران لەشکری بردە سەر ڕۆست، سەرنەکەوت و بەشکاوی گەڕاوە. هەتا جاری سێیەم زۆر شپرزە کرا و هەتا زێوە کە سەعاتێک لە ڕۆژهەلاتی ڕواندزەوەیە، هەلیان بڕی.

لە دواییدا میر ١٠٠٠ پیادەیەکی ئازایدا بەئەحمەد چاوەش ناو سەرکردەیێکی ناردیە سەر ڕۆست. ئەحمەد چاوەش بەفیل میری ڕۆستی گرت و هێنایە کن میری گەورە. ڕۆژی دووەمی ڕەبیعی یەکەم، میر ئەویشی خنکاند و لەلای مام و برازای ناژت.

لە دوای کوشتنی میری ڕۆست لەشکری ئاژۆتە سەر میر یەحیابەگ. لە نزیک سیدەکان بەرەنگاری یەکدی بوون و دەستیان بەکوژتار کرد. لە دوای دوو ڕۆژ شەڕ و کوژتار، میر محەمەد مامی تەنگەتاو کرد و شکاندی و هەلیبڕی هەتا لە سیدەکانی خزاند.

میر یەحیا دووبارە لەشکری کۆکردەوە و لە قەلای سیدەکاندا قەلابەندیی کرد. میر

محەمەد قەڵای دەورەدا و بەگەرمی هەڵمەتی بردە سەر.

میـر یەحـیـا ناچار بوو خـۆی بەدەسـتـەوەدا. مـیـر یەحـیـا و عـوسـمـان بەگی کـوڕی بەزنجیرکراوی ناردرانە ڕواندز. لە ڕواندز لە بەندا بوون. شەوێک کەلێنیان دەستکەوت و لە بەند ڕزگاربوون ڕوو بەباشوور(قیبلە) چوون.

لە دەرزە بەردان لەبەر تاریکی شەو و شپرزەیی خۆیان، باب و کوڕ لێک هەڵبڕان. میر یەحـیا ڕێگای سـەرەوەی گرت و لـەبەر سەرای حکـوومەتی ئێـسـتـا گڵـکەندێ خۆی تێدا دەشارێتەوە، کە عوسمان بەگی کوڕی بگاتێ و دەربازبن و بڕۆن.

عـوسـمـان بەگ لە ڕێگای پیـادەڕۆ بەگـەلی خـاڵەڕەشـدا دەچێ و هەتا دەگـاتە ئاوی خاڵەڕەش و بابی نابینێت و دەگەڕێتەوە.

لەو دەمــەدا پێ دەزانـدرێ کـە هەڵاتـوون. سـەرهەنـگ و پاسـەوانان دەکـەونە دوویان. یەحـیـابەگ دەبینن، بەڵام چاو دەقـۆچێـنن و دەڕۆن. حەسـەن مەلـووک دەگـاتە یەحـیـابەگ و چاوی پێ دەکەوێ، دەڵێ: میران هەستە. ئەویش دەپاڕێتەوە. حەسەن مەلووک تفەنگێکی پێوەدەنێ و برینداری دەکا و دەیگرێ.

سەرهەنگ و نۆکەران دەگەنێ و دەیبەنە خوارەوە، لەودەمەدا عوسمان بەگ بەدوای بابیدا دەگەڕێتەوە، لەبەر دەرزە بەردان ئەویش دەگرن و دەیانبەنەوە بەندیخانە.

میر محەمەد فـەرمووی هەردووکیـان بکوژن. هەردووکی دەکوژن و بەداریاندا دەکەن. لە پاش شەو و ڕۆژێک لەلای تەمەرخان دەیاننێژن. کێلی عوسمان بەگ لە تەپەی دار سەیدی من بۆ خۆم دیومە و ئێستاش ماوە و لەسەریشی نووسراوە.

مـیری گـەورە بەوانە کـاروباری خـاکی سـۆرانی بۆ ڕێـک دەکەوێ؛ دڕک و بەرهەڵست و کۆسپەی گەورەی لە خاکـیدا نامیینی و بەئازادی دەست بەفـەرمانڕەوایی دەکا. لە دوای سـاڵێـک دەکـەوێتـە سـەر هەوەس و ئارەزووی خـاک فـرەکـردن و فـەرمـانڕەوایی پتـر و گەورەکردن، بۆ گەیشتنە ئەو ئارەزووە پێویست ساز دەکات.

## چوونی میر و لەشکرکێشانی بۆ سەر برادۆست و لیتان ساڵی ١٢٣١

میـر کاروباری خاکی سۆرانی کە دامەزراند، لەشکری هەڵگرت و چووە سـەر برادۆست و قەڵای «هەرکیلا»ی دەورەدا کە مەحموود بەگی کوڕی سەلیم خان بەگی لەسەر بوو.

مەحموود بەگ کە لەوە ئاگادار بوو، بەلەز لەشکری کۆکردەوە و دەروازەی لەسەر خۆی گرێدا و بەقەڵابەندی بۆ خۆپارازتن دانیشت.

میر که گەیشتە سەر قەڵا دەورەیدا و لەهەر چوارلاوە بەتۆپ و تفەنگ و ئاوریاران تەنگەی بەقەڵابەندەکان هەڵچنی. مەحموود بەگ زۆر بەئازایی پێشی پێگرت.

ڕۆژی سێیەمی شەڕ چووە سەردیواری قەڵا و بانگی میری کرد و گوتی: «خودا بەردار نییە، ئەم ئادەمزادانە لە پێناوی من و تۆدا بچن و تۆ ببیە مایەی ئەم خوێن ڕێژی و کوژتارە. ئەگەر ڕاستت دەوێ و مەردی بەتەنهایی وەرە مەیدانەوە، منیش دێمە پێش و خەنجەر و دەمانچەی یەکتری دادەگرین، هەر کامێکمان سەرکەوت، خاک و میللەت بۆ ئەو بێت. ئیدی هێندە ئەزیەتدان بۆ چییە، یا من تۆ، یا تۆ من دەکوژی و ئەم بەندەی خودایە ڕزگاربن».

میر لە بری جوابی، فەرمانی دا بەسوپای بەگەرمی هەڵمەت ببەن و پیاوانە پەلاماری قەڵا بدەن و دەبێ ئەمڕۆ قەڵا بگیرێ.

مەحموودبەگ لە دیواری قەڵاوە سێرەی تفەنگی لە میر گرت و گوللەیەکی بۆ هاویژت و لە شاڵی تورمەی سەروپێچی میریدا و دووکەڵی لێ بڵند کرد. مەحموودبەگ بەدەنگێکی بەرزەوە گوتی: «ها من خولامی لەعلی خانێمە». میر بیستی و پرسیاری کرد داخوا ئەو لەعلیخانە خوشک، دایک، ژن یاخود دەزگیرانی مەحموودبەگە کە بەناوی ئەوەوە لە خۆی خوڕی.

گوتیان نەء؛ ناوی تفەنگەکەیەتی.

ئەگەرچی گوللە لە شاڵی مێزەری کەوت بەڵام زیندەی نەگرت و هەر لە شاڵدا مابووەوە. مەحموودبەگ بەو دەستووره زۆر بەدلێرانە و ئازایی شەڕی کرد. بەتەڕدەستی و پیاوانە لە پێش میر ڕاوەستا و بەرامبەری و کوژتاری لێ کرد.

میر هەرچەندە کۆشا چارەیەکی نەدۆزیەوە کە بتوانێ قەڵا بگرێ، ناچار بەفێڵ ڕوو بەدێی «گردکال» گەڕاوە تاکو مەحموودبەگ وا تێبگا میر هەڵات.

لەودەمەدا سەلیم خان کە لە قەڵای کانی ڕەش دادەنیشت، زانییەوە کە میری سۆران پەلاماری مەحموودبەگی کوڕی داوە، کەوتە تەقەلا و تالووکەوە. دەستە لەشکرێکی شەڕکەری هەڵگرت و بەپەلە ڕوو بەچۆمی «بەرازگر» چووە خوارێ. کە گەیشتە سەرچۆمێ ویستی لە «پردی زەراتی» بپەڕێتەوە، تەنها دوودار لەسەر پردەکە مابوون. لە تاوی کوڕی گوێی نەدایێ و بەچەکمەوە بەسەر ئەو دوو دارانەدا پەڕیەوە و خۆی گەیاندە قەڵای «هەرکیلا». مەحموودبەگ بۆ پێشوازی چوو و دەرگای کردەوە.

له لایەن میرەوە بەپەنهانی چەند پیاوێک لە دوور و نزیکی قەڵا داندرابوون. بەگورجی پەیامیان دا بەمیر کە قەڵا کرایەوە. لە ڕۆژی ٢١ی مانگی ڕەبیعی دووەم، میر بەپرتاوی لینگیدا سەر قەڵای هەرکیلا و بەزۆر گرتی و مەحموودبەگ و سەلیم خانیشی شکاند.

میر کە قەڵای هەرکیلای گرت، لینگیدا سەر قەڵای «سارداو». حەسەن بەگی برادۆست بەلەشکر و هێزییەوە لەوێ خزابوو و بەرامبەری ئامادە بوو.

میر کە گەیشتە سەریان، تەنگەتاوی کردن. برادۆستی پیاوانە بەگژیدا چوون و لە هەردوو لاوە گەلێک ناوداری کورد کوژران. برادۆستی پاڵەوانانە قۆڵیان لەشەڕ هەڵکرد و میری ڕواندزیان وەتەنگ هینا و تێکیانەوە پێچا. حەسەن بەگ بەچەند پیاوێکەوە هەڵمەتی بردە سەر میر، بۆ خۆی بەقسەی ناحەز و ڕەق لە میر خوڕی.

میری دلێری خودپەسندی نەرم و ڕەوشت چاکی زمان خاوێن بانگی حەسەن بەگی کردو و گوتی: «هۆ میران، لە ڕۆژی مەیدانداریدا جوامێری و پاڵەوانی چییە؟ دەستوبرد و کۆشش و شیر وەشاندن و هەڵمەت و خەنجەربازی. بۆ زمانێکی درێژ هەڵدەبڕی، قسە هاوێژیی و پڕوپووچ و لاف وگەزاف دوورە لە ڕەوشتی گەورە و دلێر و پاڵەوانان. خۆت ڕاگرە ئەوا بۆت هاتم». میر کە ئەوەی گوت، دەستیدا قەرەبیناکەی و هەڵمەتی بردە سەر حەسەن بەگ.

پیاوەکانی میر لە پشتەوە دەستڕێژێکی تفەنگیان کردێ. میر کە نزیک بووەوە جووتە قەرەبیناکەی لە پەڕەی سینگی حەسەن بەگ ئاوردا، چەند پیاوێکی حەسەن بەگ تەمای بزووتنەوەیان بوو، میر قەرەبینایەکی دیکەشی بەوانەوەنا و لینگیدا سەریان و بەتفەنگ ئاورباارانی کردن و کوژتنی.

شکستە کەوتە لەشکری حەسەن بەگ، لەشکری میر بەکوژتار کەوتە دوویان، هەتا لە قەڵای پەستاوتن، کوژتاری لێکردن.

کە برادۆستی شکان زۆر کەمیان خۆیان لە قەڵای سارووددا خزاند و هی دیکە کوژران.

میر قەڵای دەورەدا و لە هەموولاییێکەوە وەتەنگی هێنا و هەڵمەتی بردە سەری. هەتا ڕۆژی دووەمی جەمادی یەکەم، نەردیوانیان بەدیواری قەڵاوەنا. لەشکری میر پاڵەوانانە سەرکەوتن و بەکوژتار چوونە نێو قەڵاوە و دەروازەیان کردەوە. لە دوای ئەوە چەند بەگزادە و پیاوی ناوداری برادۆست ئامانیان خواست و ئاماندران.

میر هەموو خاکی برادۆستی گرت و پیاوی خۆی لەسەر دانا و لە قەڵاکاندا سەرۆک و

لەشکری دامەزراند. قەڵای سارووی کردە ناوچەی سەرهەنگیی خۆی و دەستە سوپاهێکی لەژێر فەرمانی ئەحمەد سەرهەنگدا ناردە سەر قەڵای «کەکلە»، بۆ خۆشی بەلەشکرەوە چووە سەرخاکی مەرگەوەڕ و شنۆ؛ بەشەڕگرتنی و لەشکری ڕوو بەلاجان ئاژۆت.

کە گەیشتە نزیک خێڵی لیتان، تەمای دەست بزێوی و سەرکێشییان نەبوو، میر خۆی تێ نەگەیاندن و ڕۆیشت هەتا لە قەڵای «نەلووس» تێپەڕی.

بەگزادەی عەشیرەتی لیتان بەخەڵکی قەڵای گوت کە بەدەنگێکی بەرزەوە «قەبووقەبوو» بکەن، کە بۆ لەشکری شکاو ئەوە دەبێژرێ.

میری ڕواندز لەوە زۆر دڵگیر و ڕەنجیدە بوو، لە قینا لەشکری گەڕاندەوە و ڕووی لە قەڵای نەلووس کرد. بەگزادە و میللەتی لیتان قەڵابەندییان کرد، میری ڕواندز سێ شەو و سێ ڕۆژان قەڵای دەورەدا. ڕۆژی ١٥ی جەمادی دووەم قەڵای گرت و گەورە و بچووک و نێرومێ و ورد و مەزنی کوژتن. ئەو قەڵایەشی ڕووخاند و تێکیدا.

شێخ یووسفی شەمسەدینی بورهانی موکری لەوددەمەدا منداڵ و شیرەخۆرە بوو. دایکی و ئەو ڕزگاربوون و ئەو منداڵە بچووکەی بردە سابڵاغ و بەخێوی کرد هەتا بووە بەو پیاوەی کە لە شەرق و غەربدا نێوبانگی پەیدا کرد و پێگەیشت، میری ڕواندز لە دوای ئەوە لە مانگی ڕەجەبدا گەیشتەوە ڕواندز.

میر لە خاکی برادۆست، کانی مس و قورقوشم و مەعدەنی دیکەی پەیداکردن کە بتوانێ لوولە تۆپ و گوللە دابڕێژێ؛ لەوانە گەلێکی بارکرد و هێنایە ڕواندز. میر لە دوای ئەو هەموو شەڕ و خاک گرتنە، لەشکری جیرەخۆری گەیاندە ٦ هەزار شەڕکەر و بەچەک و بەرگ ڕازاندنیەوە.

لەوپێش گوتمان کە میر لە خاکی برادۆستەوە، ئەحمەد سەرهەنگی بەلەشکرێکی ڕێککەوتووەوە ناردە سەر قەڵای کەکلە. ئەحمەد سەرهەنگ بە«ئەحمەد بدێری» ناوبانگی کرد بوو. قەڵای کەکلە لە ژێردەستی حەسەن بەگی شێروانیدا بوو، کە ئەحمەد بدێری گەیشتە پێشەوە، حەسەن بەگ بەلەشکرەوە چووەپێش. شێروانی زۆر بەمەردی شەڕیان کرد. لەو شەڕەدا چەند پیاوی ئازا و ناوداری سۆران بەکوژت چوون. ئەحمەد بدێری کە وەکو پڵنگ وابوو، لە هەڵمەت بردن پاش نەدەکەوت و چیرەبوو، فەرمانی دا بەلەشکری خۆی کە بەخەنجەر و قەرەبیناوە هەڵکوتنە سەر مەتەرێز و سەنگەری شێروانییەکان. سۆرانی مەردانە بۆ پێشەوە پەلاماریاندا و شاڵاویان برد، بەکوشتار و خوێنرێژی کەوتنە

نێو سەنگەرانەوە و تەنگەیان بەحەسەن بەگ هەڵچنی و لە سەنگەریان دەرپەڕاند و ڕوو بەقەڵای کەکلەیان هەڵبڕی و پەستاوتیانە نێو قەڵاوە و دەورەی قەڵایاندا.

حەسەن بەگ لە نزیک قەڵاوە سەنگەری گرت و بەرامبەر بەئەحمەد بدێری ڕاوەستا و شێرانە شەڕی کرد. ئەحمەد بدێری لە پەلاماردان و کوژتار لێکردنیان ڕانەدەوەستا.

ڕۆژی ٧ی مانگی جەمادی یەکەمی ساڵی ١٢٣٧، ئەحمەد بدێری لە مەیدانی شەڕدا کوژرا. لەشکری میر لە شەڕ سارد نەبوونەوە، دەستبەجێ سەرکردەییێکیان هەڵبژارد و لەهەر چوار کەنارەوە لینگیاندا سەر حەسەن بەگ و تەنگەتاویان کرد و لە سەنگەریان هەڵکەند و دەریانپەڕاند. حەسەن بەگ خۆی هاویێژتە نێو قەڵاوە و دەروازەی لەسەر خۆی داخست.

لەشکری سۆران دەورەی قەڵایان لە چەمبەردا و ٨ ڕۆژ لەسەریەک ئەوان لە دەرەوە و شێروانییش لەسەر دیوارانەوە شەڕیان کرد. سۆرانییەکان لەژێر قەڵاوە کارێزیان لێدا و پڕیان کرد لە باروت. ڕۆژی هەشتەم قەڵایان دەورەدا و باروتیان ئاوردا و دیواری قەڵایان بەرداوە، حەسەن بەگ و باب و مامی بەدیل گیران و ناردرانە ڕواندز.

خاکی شێروان و هەموو قەڵا سەختەکانی گیران و سەرکردە و سوپای سۆرانی لەسەر داندران و قەڵای کەکلەشیان دووبارە دروستکردەوە.

کە ئەحمەد بدێری دۆڵەمەڕی کوژرا، عەبدوڵلاغای سەرهەنگ کە ئاکۆیی و باپیرە گەورەی حەمەعەلیاغای ڕواندزی کە ڕەئیسی بەلەدیەی ڕواندز بوو، کرا سەرکردەی لەشکری سۆران و هەموو شەڕ و کوژتار و گرتنی قەڵاکانی شێروان و بەدیل گرتنی حەسەن بەگ لەوەوە بوو. عەبدوڵلا سەرهەنگ کە شێروانی بەتەواوی گرت دایمەزراندەوە. پیاوانی ئازای خۆیانی لەسەر جێگا سەختەکان دانا و مزگێنی گرتنی شێروان و دیلەکانی بۆ میر ناردە ڕواندز.

میری گەورە گوتی: «بەڕاستی شێروان گیرا و بوو بەخاکی ئێمە. بەڵام پیاوێکی ناودار و گرانبەهای وەکو ئەحمەد بدێریشمان لەسەر دانا و لە دەستمان چوو کە سەد شێروانی دێنا».

عەبدوڵلا سەرهەنگ کە لە دوای هەموو کاروباری شێروان ڕێکخستن گەڕایەوە ڕواندز، ئەودەمە عەبدوڵلاغا بوو بەعەبدوڵلا سەرهەنگ و بەکڵاوی لباد و دروشمی سەرهەنگیی خەڵات کرد. هەموو سەرکردە و سەرۆک و سوپاهییەکانی بەخەڵات دڵخۆشی داوە و کوڕی

ئەحمەد بدێری کردە سەرکردەی دۆڵەمەڕی و قەڵای شیتنە.

لەو ساڵەدا وەستا ڕەجەب ناو کوردێکی وەستاکار و دانا کە لە تۆپ دارژتندا دەکۆشا، چونکە پیاوێکی زانا و کاربین بوو بەدوو لا زۆر چاک سەرکەوت. لوولە تۆپی دارڕژتن و گوللەشی دروست کرد. زۆر شایانی سپاس و پێداهەڵگوتنە. ئەمڕۆکە نموونەی کردەوە و کاری ئەو گەورە زانا و خاوەند پیشەیە لەبەر چاومانە و لوولەتۆپەکانی کە دایڕژتووە لەبەر دەرگای سەرای ڕواندز داندراون. بەڕاستی شایانی شانازییە کە لە جێگایەکی وەکو ڕواندزدا لوولەی وای لێ دارێژرابێ. کانی مز و ئاسن و ئەوانەی بۆ ئەو بەکار بێ لە ڕواندزدا بۆی ڕێکخراوە. هەر لەو ساڵەدا سەید حەسەنی ڕەشوانی لە مانگی زیلحیجەدا ناردە سەر زێبار. عەزۆ ئاغای سەبتی و جەوەراغای نەقبوکی کە گەورەی زێبار بوون، بەلەشکرەوە چوونە پێش سەید حەسەن و ڕێگایان پێ گرت. سەید حەسەن هەرچەندە تەقەلای دا نەشیا بۆ پێشەوە بچێت، بەڵام دەرگای فڕوفیلّی لەسەر کردنەوە و پەیمانی لە تەکیانا کرد و گرتنی و بردنیە لای میر. بەوە لایەکی خاکی زێبار کەوتە ژێر فەرمانی میرەوە.

ئەو دوو گەورە کوردانەی زێبار بەئاسوودەیی دانەنیشتن و بۆ پشێوی و شۆڕش تەقەلایاندەدا. میر هەرچەند پەند و نەسحەتی کردن و بەسەریاندا هات بێ سوود بوو، لە دواییدا ژەهراوی دانێ و کوژتنی.

هەر لەو ساڵەدا میر محەمەد لەتەک عەباس میرزای نایبوسەڵتەنەدا پەیمانی گرێدا و ناردراوی بۆ تاران بەڕێ کرد و لەگەڵ فەتالی شای قاجاڕدا گرێی دۆستی و پێکهاتنیان بەست و ناردراوەکەی گەڕاوە.

هەر لەو ساڵەدا میر محەمەد ناردی لە ورمێوە «خان گیلدی» وەستاکار و چەخماخسازی بردە ڕواندز تا خەنجەر و دەمانچە دروستکات.

## دامەزراندن و ئاوایی

میری گەورە ساڵی ١٢٣١ لە گەڕەکی کاولۆکان کارخانەی شیر و خەنجەر و تفەنگ و لوولەتۆپ و گوللەی دروستکردن و دارژتن و زێرینگەری و دارتاشی، بۆ کالانەی شیر و خەنجەر و ڕەوڕەوەی تۆپ و چتی پێویستی دیکەشی دامەزراند و خستیە ژێر گەڕانێکی ڕێککەوتوو لە چەمبەرێکدا گەڕان، تۆپ و گوللە دارژتنی خستە ژێر فەرمانی وەستا ڕەجەب. دارتاشی و خەنجەر و تفەنگ و دەمانچە دروستکردنی خستە دەست «خان گیلدی» و بەدەستووری خوارەوە فەرمانڕەوایی خستە قاڵبێکی زۆر جوان و دامەزرا، هەر کار و پیشە و ئیشێکی دایە دەست زانا و خاوەندی خۆی. سەردار و گەورە و میری هەمووان، میر مەنسوور محەمەد بەگ، میری ڕواندز، ڕەسووڵ بەگی برای میر کارپەزێر و سەرپەرشتی هەموو کارێک. ئەحمەد بەگی برای میر سەرهەنگی سەرهەنگان. حەمەدی شێروانی مامیس، سوراو، عەبدوڵلای ئاکۆیی، خدری حەمەدی، سۆفی ئاغای، کە ئەوانە شەش کەس بوون کران بەسەرهەنگ و لەژێر فەرمانی ئەحمەد بەگیدا دەگەڕان. وەستا ڕەجەب فەرمانڕەوای تۆپخانە و جبەخانە. خان گیلدی گەورەی خەنجەرکەر و زێڕینگەران، وەستا برایمی ماویلی سەر میعماری بینا و وەستای دیواران، حاجی مستەفاغا گەورەی بازرگانان (خەڵکی هەنارە باتاس و سورچی بوو) ئەوانە بەو دەستوورەی دامەزراندن و هەر کەس لە کاری خۆیدا تەقەلایدا و دەستی بەئیش کرد. لە حەفتەی جارێک کۆ دەبوونەوە، ئەگەر چتێکی زل بەدەستەوە بووایە لێی دەدوان و لەسەری ڕێک دەکەوتن و پێکیان دێنا. لە دوای ئەوە هەر کەس دەچووە سەر ئیشی خۆی. (مەلیخا).

لە ڕواندز میر محەمەد ئەم حەوت ڕەنگە دراوەشی هەبووە کە بۆ خۆی لە سککەی داوە:
١- یوزلغ (پازدە قرۆش بووە) ٢- ڕیاڵ (یازدە قرۆش بووە) ٣- قرۆش (حەوت غورش

بوو) ٤- تەنیگر (چوار قرۆش بوو) ٥- جلق (سێ چارەگە قرۆش بوو) ٦- خودابەندە (چارەگە غروشێک بوو) ٧- شایی (نیو غروش بوو) کە سەد غروش لیرەیەکی زێڕی عوسمانی بووە. ئەوانە هێندێک زێڕ و هێندێک زیو و هێندێکیش مس بوون، بەڵام چکۆلە و ئەستووربوون. من بۆ خۆم تەنیا جلق و خودابەندەی میری ڕواندزم چاوپێکەوت، مس بوون. تەنیگریش زیو بوو بەپانی بەقەد قرۆشی تورک بوو، ئەستوورایی بەقەد چارێکە مەجیدی دەبێ.

ئەو سێ دراوانە ئێستاش لە لامە، بەخەتی فارسی زۆر خۆش لەلاییێکیەوە «الامیر المنصور محمد بیگ» و لەلایەکی تریشەوە «ضرب فی رواندز»ی لێ نووسراوە. بەڵام ساڵیان سواوە و دیار ناکەن. مەلیخا کەمەنزومی تەئریخی میری، بەدەستووری سەرەوە ناوی دراوەکان دەبێژرێ، لەو ساڵەدا لێدراون.

ساڵی ١٢٣٢ میر سوپاهی جیرەخۆری گەیاندە ١٥ هەزار؛ ٥ هەزار پیادەوە ١٠٠٠٠ سوارە بەچەک و بەرگی تایبەتی ڕازاندنیەوە. بۆ سەرهەنگان ڕانکوچۆغەی ئاوریشمچن، مەرەزەی خەتێکی سپی و یەکی ڕەش لەبەرکردن و کڵاوی لبادی لەلای گوێی ڕاستی بەدرێژی بستێک بەبەرداوەیی لە سەرنان؛ ئەوە دروشمی سەرهەنگیی بوو.

بۆ پیاوی سوپاهی ڕانکوچۆغەی زەرد و کڵاوی لبادی ڕەنگ خاکی بوو، چەک دەمانچەیەکی قەرەبینا و تفەنگی ئەستی و بەرد و باڕووت و ساچمە و گوللەدانی شاخی و چەوریدان و سغرە دەمانچەیان پێبوو و هێندێک رمووزیشیان هەبوو. سوارە وەک سەرهەنگ ڕانکوچۆغەی بەڵەکی پێ ئاوریشم و جووتە دەمانچەی قەرەبینای بەقەڵپووزی زینییەوە هەڵواسراو هەریەک شیرێک بەتەنیشتییەوە و تفەنگی کورتی ڕەشۆکی بازنە زیویان پێبوو.

میر و سەرهەنگی سەرهەنگان و کارپەریز، شاڵی تورمەیان لەسەردەنا. میر کەوڵی سەمموورە و سەرهەنگ و ئەوانی دیکە پەستەکی درێژی هەتا ئەژنۆیان لەبەر دەکرد. بۆ پەرای میر، چوار کەس ئێشک ئەغاسی هەبوون، بەتۆپزی زیو لە پێش میر دەچوون. لەسەرادا هەر ئەوان ڕێگای ژوورەوەیان هەبوو، پاشماوەی میر و کۆنە بەرگی میر بۆ ئەوان بوو. میر کە بەپێیان بچووبایە مزگەوت، هەر چوار بەتۆپزی زیوەوە لە پێشی دەڕۆیشتن.

میری گەورە لەوساڵەدا دەستی کردە مزگەوت و مەدرەسە و قەڵا و پرد ئاواکردن. ٩ پردی لەسەر ڕووبار (چۆم)ی ڕواندز دروستکردن: ١-ڕواندز ٢- خەلکان ٣- هەوارە کۆن

٤- بەرسرین ٥- چۆمەریخن ٦- ئۆمەراوە ٧- ناوپردان ٨- دەربەندی شیوەزور ٩- ڕایەت. جگە لەمانە لەسەر چۆمی ڕۆست دوو پردی دروستکردن: (چۆمی بالووک) «سمیلان». لەسەر چۆمی بالەکییان پردیکی دامەزراند، لەسەر چۆمی خەلیفان لە زارگەلی عەلی بەگ پردیک و لە ئاشی ئاودەڵ ئاغا پردیکی لەو سالەدا تەواو بوو. لەسەر چۆمی بەرازگر پردیکی زۆر سەخت و جاکی دامەزراند. دروستکردن.

ئەو پردانە ئەمڕۆش ماون و بەدەستووریکی فەننی و جوانن، هەمووی بەگەچ و بەردی تراشراو دامەزراندوە. هێندێک لە گەورە و موهەندیسەکانی بەریتانی کە لەو بابەتەوە دەگەلیان دواوم، ئەو دەستوورەیان پەسند کردووە و لە چلۆنی دامەزراندنی پایەکانی واقمابوون و لە سەختی و پایەداری و گەچەکەی و بەردەکانی سەریان سوڕمابوو؛ چونکو ئەوە سەد و هێندە سالەیە پردی دروست کردووە، ئەمڕۆکە وەکو تازە دامەزراندرابێ وایە و گێچی هەر سپی ماوەتەوە.

میر لە ناوچەی ڕواندز لە پشت قەلاتی لوکانەوە شوورەییکی ئەستوور و بلندی بینانا و لەتەک شوورەی قەلای لیکداوە. لە ڕۆژئاوای قەلاوە بۆ خۆی و سەرای فەرمانڕەوایی خانووبەرەیەکی گەلیک گەورەی دروست کرد. لە لای ڕۆژهەلاتەوە لەسەر خەرەند شوورەییک و پردیک و مزگەوتیکی سەختی دروستکرد. لەسەر پردەکە کونگەرە و لە دەرگای مزگەوت کونە مەتەریز و سەنگەری تیدا دامەزراند. هەر چوار کەناری بەقەلا و شوورە سەختکرد و پڕی کرد لە سوپا و تۆپ و جەبەخانە. لە کەلەکین و لە بیجان نزیک ڕواندز و لە سیدەکان و هەودیان و ڕۆست قەلای دروستکردن، لەسەر هەریەک لەو قەلایانە پیاوی پەسندی خۆی لەسەردانان. لە گەلی میگرەوە ئاوی بەجۆگەدا کیشا نیو قەلای ڕواندزەوە. ئەمڕۆش شاری ڕواندز ئەو ئاوە بەکار دەبەن.

ئەو هەموو کار و ئیش و بینایانەی کە گوتران بەسێ سالان دواییان هات و دروستکران. هەموویان دەستکاری وەستا برایم ماویلین. لە دوای جۆگەکیشان مزگەوتیکی زلی لەنیو شاری ڕواندزدا دروست کرد. ئەمڕۆکەش دیوارەکانی ماون. هەر لەو سالەدا بایزبەگی ترسا و چووە ئەستەمبووڵ و پەنای بردە بەر سولتان مەحموودی ڕۆم.

سالی ١٢٣٣ لە کارخانەی ڕواندز لوولەتۆپ داڕێژرا و پیگەیشت. مەلیخا دەلێ کە: لوولەتۆپ داڕێژرا و بەتەواوی لە قالب دەرخرا، وەستا ڕەجەب مزگینی دا بەمیر کە پیگەیشت. میر دەستبەجێ هەزار ڕیاڵ زێری بۆ وەستا ڕەجەب و بۆ هەر شاگردیک سەد

ڕیاڵ و بۆ وەستا ڕەجەب شاڵێکی تورمە و کەوڵێکی سموورە و ئەسپێکی زۆرچاکی بەپێشکەش بۆ نارد و رای ئەسپارد کە بێتە خزمەت. میر ڕانەوەستا وەستا ڕەجەب بێت، هەستا بەپێیان چوو، لەبەر ڕکێفی وەستا ڕەجەبدا ڕۆیشت هەتا گەیاندیانە سەرا و ڕێزی لێنا و سپاسی کرد.

لە ڕواندز نزیک ٢٢٢ دانە لوولەتۆپ داڕێژراوە. دوو قەنتار و چوار قەنتار و شەش قەنتاریشیان هەبووە.

ساڵی ١٩٢٦ سەید تاها ئەفەندی قایمقامی ڕواندز کە لە هاتوودا لێی دەدوێین، سێ لوولەتۆپی لە چۆمی ڕواندز و لە ژێر پردێ دەرخست کە لە دەوری تورکاندا فڕێ درابوونە نێو ڕووبارەوە. هەرسێکی هێنانە گەڕەکی قەلات و لە پێش دەرگای سەرای دانان و ئێستاکەش هەرهەن: ١- دوو قەنتار و ٢-- چوار قەتنار -٣- شەش قەنتارەو لەسەریان نووسراوە. یەکەم کە دوو قەنتارە ساڵی ١٢٣٤ھ، هی دووەم کە چوار قەنتارە ساڵی ١٢٤٢ و هی سێیەم کە شەش قەنتارە ساڵی ١٢٤٤ داڕێژراون و لەسەر هەرسێکیان ناوی میری ڕواندز ئەمیری مەنسوور محەمەد بەگ نووسراوە. لە هاتوودا نموونەی نیشان دەدرێ.

لەو ساڵەدا میر بەمیرزا محەمەدی وەقایع نیگار و سەرنووسەری گوت کە هەموو کردەوە و سەربهوردی میر بنووسێتەوە. ئەویش بەفارسی و بەشیعر دەستی کردە نووسینەوە. هەتا دوامینی ڕەسووڵ پاشای تێدایە کە ساڵی ١٢٢٨ هەتا دوامینی ڕەسوول پاشای گوتووە و ناوی نا «مەلیخا». ئەو کتێبە لە کن گەلێک کەسی ڕواندزی هەبووە؛ بەڵام لە هاتنی ڕووس و موهاجەرەتی خەڵکی ڕواندز لەنێوچووە. تەنیا نوسخەیێکم دەستکەوت و بۆ نووسینەوەی ئەم پەڕاوییە (کوردو میرانی سۆران) زۆر بەکارم هات؛ چونکو بەدرێژی سەربهوردیان باس دەکات.

میری گەورە کە پێویستی فەرمانڕەوایی پێک هێنا و چەک و ئالاتی ڕێکخست، حکوومەتە بچووکەکەی خستە شکڵی حکوومەتێکی زۆر جوانەوە، بۆ فەرمانڕەوایی دەستوور شوێنێکی تایبەتی دانا.

ساڵی ١٨٢٦م / ١٢٣٤ھ بانگی ئازادی بلند کرد و جاڕی سەربەخۆیی کێشا و ناوی خۆی نا «میری مەنسوور» فەرمانڕەوا «میری سۆران» بەهەڕەشە هەموو فەرمانڕەوا و دراوسێکانی لەرزاند. قاقەزێکی مەحموود پاشای بابان کە بۆ عەباس میرزا

نایبوسەڵتەنەی نووسیبوو چاوم پێکەوت و ئێستا لامە کە لە دەست میری ڕواندز شکایەت دەکا و هاوار دەباتە بەر نایبوسەڵتەنە.

میری گەورە بەداد و ڕەعیەتپەروەری و سوپاخواهی و مەملەکەتداری ناوبانگی کردووە و لە هەموو لایێکەوە خاوەند پیشە و کاری تێدا کۆکردنەوە و بەخەڵات و ڕوودان نەوازش کران.

ئاسایش و ئەمنییەت بەجارێک کەوتە نێو خاکییەوە. ڕەوشت و خوویێکی چاک و پەسندی هەبوو، دزی و ڕێگری و خراپە نەما، کەس بەچاوی خراپە تەماشای کەسی نەدەکرد. بەو ڕەوشتە خاکی ڕواندز گەیشتە بەرزترین پایە. میر محەمەد لە دوای ئەوە کە سێ ساڵ لە ڕێکی خاک و سوپا خەریک بوو، پێویست و چەکی ئامادە کرد، ساڵی یەکەم بەپەنهانی بەهەمە خاکە دراوسێیەکاندا پیاوانی زانای دەناردن کە چاوڕاوی بۆ بکەن و خەڵکی بۆ دڵخۆشی بدەنەوە. لەگەڵ گەورە و سەردار و عەشایرەکاندا بەپەنهانی موخابەرەی دەکرد و دەیکردنە هاودەنگی خۆی، دەگەڵ گەورەکانی هەریر و هەولێر و کۆیێ پێکەتییان پەیدا کرد بوو، پەیمانیان لە تەکیا گرێ دابوو.

ساڵی ١٢٣٨ میر محەمەد لەشکری هەڵگرت و لەناکاو لینگی دا سەر شاری هەریر کە پایتەختی بابوباپیرانی بوو و لە دەمێکی دوورەوە لە دەست باباندا دەگەڕا. هێزی بابان نەشیان خۆ لەپێشی ڕاگرن و بەبێ شەڕ، سوباشی و سەردار سوپاهەکان لەشکری خۆیان ڕوو بەکۆیێ گەڕاندە دواوە.

میری گەورە بەبێ شەڕ هەریری گرت و دایمەزراند و لە دوای سێ ڕۆژان چووە سەر خۆشناو. عوسمان بەگی سەرکردەی لەشکری میری خۆشناو دەچێتە پێش. لە دوای شەڕ و کوژتارێکی قورس، میرانی بایز بەگ کە گەورە و میری خۆشناو دەبێ، بەپەیمان سەر بۆ میر محەمەدی میری ڕواندز دەچەمێنێ و بەسوێند عوسمان بەگ دەبەخشێ و دەیباتە هەریر. لە مانگی ڕەبیعی دووەمی ساڵی ١٢٣٨ھ دا خنکاندی؛ ئەوە لە خەڵک زۆر گران هات.

میر لە دوای ئەوە لەشکری هەڵگرت و چووە سەر قەڵای دێرە. سوباشی بابان کە لەوە ئاگادار بوو، هەڵات و چووە کۆیێ، بەبێ شەڕوشۆڕ و کوژتار قەڵای دێرە کەوتە دەست میر. لەو دەمەدا کە میر لەشکری ڕوو بەهەریر ئاژۆت، ئێلی حەیدەریی ماوەران کە نەیاندەویست تەقەیان تێکەوێت، پیاوەکانیان چوونە هەولێر.

که میر دیرەی گرت، حەیدەرییەکان تێگەیشتن میر هەولێریش دەگرێ، تەمایان بوو بۆ مووسڵ هیجرەت بکەن، بەڵام میر لەتەک عولەما و گەورەکانی هەولێردا ڕێککەوتبوو و پەیمانی دەگەڵ کردبوون. لەودەمەدا میر جگە لە سوپاهی خۆی لەشکری خۆشناو سورچی و زراری و کۆڕیشی لەگەڵ بوو و هەمووی لە دێرە کۆبوونەوە و ڕۆژ بەڕۆژ پتر دەبوون.

لە گەورە عولەمایانی هەولێر، مەلا عوسمان و مەلا ڕەسووڵ و ئاغا و ئەعیانی شار یەعقووب ئاغا کۆبوونەوە و هەموو گەورە و عولەماکانی هەولێریان بۆ پرسیار و یێکەتی، کردنە هاودەنگ. بەهۆگری وەڵامیاندا بەمیر و بۆ هاتنە هەولێریان ناردە دووی. میری گەورە بەدابودەستگایەوە هەستا و چووە هەولێر، بەڵام زۆر بەدژواری قەڵای گرت. خدربەگی کوڕی بایزبەگ کە خەزوورزای بوو، کردیە حاکمی هەولێر. ڕۆژی ٢٠ی ڕەمەزانی ئەو ساڵە هەولێری کەوتە دەست.

میر محەمەد کە کاروباری دامەزراند، ئەوانەی بەراوەژووی ئەوبوون بەخۆشی و توندی رامی کردن و میللەتەکەی هۆگری خۆی کرد و دەگەڵ گەورەکانی کوردی دزەییدا ڕێککەوت و لەتەک عەشایری عەرەبی تەی و جبووردا موخابەرەی نواند. هێندێک لە دزەیی سەریان بۆ نەچەماند و هێندێک لە عارەبیش هەڕەشەیان لێ کرد.

ڕۆژی پازدەی زحیجە، میر لەشکرێکی پێکەوە ناو لەژێر فەرمانی ڕەسووڵ بەگی برای خۆیدا ناردیە سەر دزەیی و عارەبان و لە دێی کەندیناوە بەرامبەر بەیەکتر ڕاوەستان و لە دوای شەڕ و کوشتارێکی قورس، تەنگە بەڕەسووڵ بەگ هەڵچنرا.

لەشکری زراری کە سەید حەسەنی ڕەشوانی سەرکردەیان بوو، کەوتبوونە نێو عەشیرەتەوە و تاڵانییان دەکرد. بەوە ڕەسووڵ بەگ بێ هێزبوو و شکا. لەشکری سۆران بوو بەدووبەش: بەشێکیان بۆ ڕزگارکردنی ڕەسووڵ بەگ ڕووبەڕووی دوژمن شەڕیان دەکرد، بەشی دووەمیان لەگەڵ ڕەسووڵ بەگدا گەڕانەوە. بەوجۆرە ڕەسووڵ بەگ لە مەیدانێدا ڕزگار بوو. مانگی موحەڕەمی ساڵی ١٢٣٩ لەشکری سۆران ڕوو بەهەولێر گەڕاوە.

ڕەوشتی ڕەسووڵ بەگ وابوو، ڕۆژی شەڕ لەبن قەڵپووزی زینەوە بەپەنهانی قووڵاپی زنجیری لەبن بەرگەوە لە خۆی گرێ دەدا کە لە ئەسپ بەر نەبێتەوە خوارێ. سەید حەسەنی ڕەشوانی لەوە ئاگادار نەبوو، حەزی لە ڕەسووڵ بەگ نەدەکرد. لە هەڵاتندا گەیشتە جۆگەیەک، کە هەسپی ڕەسووڵ بەگ تەکانی دا خۆی و بازیدا سەید حەسەن سەرەڕمێکی گەیاندە کەمەربەندی ڕەسووڵ بەگ کە لەگەڵ تەکانی ئەسپ بەربێتەوە. بەڵام چونکو خۆی

گرێ دابوو، ئەسپ بازیدا و ڕەسووڵ بەگ هیچ باکی نەبوو و بەرووی سەید حەسەنیشیدا نەداوە.

سەید حەسەن لە خۆی دڕدۆنگ بوو، کە نزیک بەهەولێر بوونەوە هەڵات و کەوتە کێوان و دەستی بەسەرکێشی کرد.

ڕەسووڵ بەگ سەربهوردەکەی بۆ میر محەمەد گێڕاوە. میر محەمەد لەو سەربهوردە دڵگیر و ڕەنجیدە بوو، لە سەرکردەکانی لەشکری «قۆچاخلی» ناوی ناردە کن سەید حەسەن کە بیگرێت و یان بیکوژێت.

قۆچاخلی بەفێڵ چووە کنی و وای نواند کە تۆراوە و پەنای بۆ بردووە. چەند ڕۆژێک وامـاوە، ڕۆژێک لە جلیدبازیدا قەرەبینایێکی بەمووڕەی پشتی سەید حەسەنەوە ناو وایزانی کوژتی و هەڵات و چووە لای میر.

میر بەوە کە ڕەسووڵ بەگ بەشکاوی گەڕاوە زۆر ڕەنجیدە و دڵتەنگ بوو. لەشکرێکی دیکەی دووبارە کۆکردەوە و لەژێر فەرمانی ڕەسووڵ بەگدا ناردیە سەریان. لە دوای شەڕ و کوژتار، شێخ حەموودی ڕەئیسی عەرەبیان بەدیل گرت و ناردیانە هەولێر و کوردەکان سەرکەوتن و هەموو عەشایری ئەو دەوروپشتەی خستە ژێر فەرمانییەوە و گەڕاوە هەولێر و لە مانگی جەمادی دوودا گەیشتەوە لای میر.

میر محەمەد کە لەوە سەرکەوت و هەموو خاکی هەولێری هێنایە ژێر فەرمانەوە، لەگەڵ محەمەد پاشای والی کەرکوکدا موخابەرەی کرد و بۆ گرتنی خاکی بابان پێکەوە ڕێککەوتن. کە لەوە پشت توندبوو بەگەورەکانی پردێ ڕایگەیاند و پەیمانی دەگەڵ کردن. ڕۆژی ١٠ی مانگی ڕەجەب ڕەسووڵ بەگ چووە سەرپردێ و گرتی و لە ٢٠ی مانگدا کاروباری تێدا دامەزراند، (عەودێ کاکەڕەش)ی کردە حاکمی پردێ و لە دوامین مانگی ڕۆژوودا گەڕاوە هەولێر.

میری گەورە لەگەڵ دامەزراندن و ڕێکخستنی ئەو خاکە خەریکبوو، لە دوامینی ئەو ساڵەدا لەسەر چۆمی دێرە، برووشە، لە دوێن، هەولێر، بانەمان، دێرە، قوشتەپە، پردێ و لە چەند جێگایەکی تر قەڵای زۆر سەخت و بڵندی دروستکردن، لە نزیک ڕێی پردێ قەڵایەکی دامەزراند و هەولێر و پردێی بەقەڵا توند کرد. سنوور و تخووبی لە زێی گوێڕەوە هەتا زێی پردێ و بەرەوخوارەوەش هەتا نزیک چیاکان خستە دەست. لەودەمانەدا قاقەزێکی لە هەباساغای دیمۆکری و یەکێکی لە سەرهەنگی فاجاڕان وەرگرت. کە

حکوومەتی قاجارِ لە مەحموود پاشای بابان دڵگیرە و هێزی ناداتێ، ئەمڕۆ و سبەینێیەک لەشکری قاجارِ ڕوو بەسلێمانی دەبزوێ، کە مەحموود پاشا دەرکەن.

میر ئەو دوو قاقەزانەی بۆ گەورەی خۆشناو و کۆیێ ناردن و لەتەک عولەمای کۆیێ بناغەی یێکەتی و پەیمانی دامەزراند و بەگەرمی موخابەرەی دەگەڵ کردن. بەپەنهانی دڵی هەمووانی کێشا وەلای خۆی و گەورە و بچووکی کۆیێ ببوونە هەواداری. لەو بابەتەشەوە محەمەد پاشای کەرکووکی بەپەیمان ڕاگرتبوو.

«قاقەزێکی مەحموود پاشا بۆ نایبوسەڵتەنە» بەدووروودرێژی لەو بابەتەوە چاوم پێکەوت کە لە دەست میری ڕواندز و چاو ڕاو و بزووتنەوەی بۆ سەر کۆیێ، شکایەتی لەلای عەباس میرزا دەکرد. وام بۆ دیار بووە کە ئەو قاقەزەی هەباس ئاغای دیموکری لە لایەن بداغخانی حاکمی موکری بۆ میری ڕواندز ناردرا بوو. میر محەمەد و نایبوسەڵتەنە سوێند و پەیمانیان لەتەک یەکترا هەبوو، مەسەلەن: ئەگەر میر بڕواتە سەر پاشای بابان، نایبوسەڵتەنە یارمەتی بابانەکان نەکات و گۆشەگیر ڕاوەستێ و یا ئەویش لەلایێکەوە بڕواتە سەر سلەیمانی. بەڵام «مەلیخا» لە پەیمان و مەرجی میر و عەباس میرزاوە نادوێ.

قاقەزی مەحموود پاشا بۆ عەباس میرزا وا نیشان دەدات. میری گەورە کە کاروباری هەولێری دامەزراند، لە مانگی سەفەری ساڵی ١٢٤٣دا هەستا چووە سەر کۆیێ. لەشکری بابان بەبێ شەڕ لە کۆیێ دەرکەوتن و لە ڕێگەی دووکانەوە ڕوو بەسلەیمانی گەڕانەوە. میری ڕواندز بەشادی چووە شاری کۆیێی گرتی و ڕۆژی ١ی مانگی ڕەبیعی یەکەم گەیشتە نێو کۆیێ. وەتمان بەگی ئامۆزای خۆی کردە حاکم و لەسەری دانا، عولەما و ئاغایانی کۆیێی بەخەڵات و بەرات شادکردن. گەورەی گەردییان عەباس ئاغا و سەرۆکی دزەییان قەرەنی ئاغای خەڵاتکردن و بەکەیفوشادمانی ناردنیەوە. لە دوای ئەوە میر قەڵاو کونگەرە و سەنگەر و بورجی شاری دروستکردن و لەنێو شاردا قەڵایێکی سەختی دامەزراند.

لە مانگی جەمادی دووی ئەوساڵەدا، میر محەمەد چووە سەر ڕانیە و گرتی، سەرۆکانی بەبە ئەوێشیان وەکو خاکەکانی دیکە بەجێهێشت و گەڕانەوە سلەیمانی.

میر بۆ بەرهەڵستی لە دەربەندی ڕانیە، لە دەراوی دووکان و لەسەر گردی «کەتی سارکەیی» و لە دوو قەمچووغەدا قەڵا و شوورەی دروستکردن، لە پاشان لەتەک مەحموود پاشای بەبەدا پاسخیدا و ڕێککەوتن و پەیمانیان گرێدا. تخووبی سۆران و بەبە قەمچووغە

بوو. بۆ لەشکر و دانەوێڵـە، شـوورەیەک و شـەش کـونگەرەی لەوێ دروست کـرد. بەدەستوورێکی باش دایمەزراند.
مەحموود پاشای بەبە لەبەر دوژمنی خۆبەخۆیی نێوانیان نەدەپەرژا سەر ئەوە کە بشێ پێش بەسێڵاوی سوپای جەنگاوەر و ڕەشیدی میری ڕواندز خۆی ڕابگرێ و لە بەرامبەر ئەو هەموو هەڵمەتی یەک لە دووییەک توانای بزووتنەوەی نەبوو.
عەبدوڵڵا پاشای بەبە لە سەردەشت دانیشتبوو، چاوەنۆڕی کەلێنی دەکرد، لە لای کرماشانەوە تەنگەتاو کرا و تخووبی شڵەژان، ناچاری ئەوەبوو کە بەخۆپارازتن و شەڕ نەکردن پاشەوپاش لەشکرەکەی بگێڕێتەوە و لەگەڵ میری ڕواندزدا ڕێککەوێ.
میر محەمەدی دلێر کە لە گرتنی کۆیێ و رانیە ئاسوودە بوو، بەکەیفوشادمانی ڕوو بەڕواندز گەڕاوە. پایتەختەکەی وەکو ڕۆژ تیشکی بەختەوەری درەوشایەوە و پرشنگی دەدا. ڕواندز ڕۆژی وا خۆش و بەکەیفی بەخۆیەوە نەدیبوو. میر لە بەرامبەر ئەو وشەیەی بەبەکان کە دەیانگوت: «حوکمدارانی بەبە و کۆیێ و هەریر» تۆپێکی دارژت و ئەم وشانەی لەسەر نویسی: «نصر من اللّه وفتح قریب» «ئەمیری مەنسوور محەمەد بەگ موتەسەریفی رواندز و کۆیێ و هەریر». لەساڵی ۱۲٤٤دا ئەو تۆپانە بەو دروشم و ناوە دارێژران. ئەمڕۆکە تۆپێکی بەو ناوەوە لە ڕواندز و لەبەر دەرگای سەرادا هەیە، کە ساڵی ۱۲٤٥ دارێژراوە و ئەوەی سەرەوەشی کە لەسەر نووسراوە، یەکێکە لەو ۳ تۆپانەی کە لەپێشدا بێژران. میر ئەوجا لەتەک حکوومەتی فاجاڕی ئێرانێدا پەیمانی گرێدا و فەرمانی ئەمارەتی ڕواندزی بەئازادی بۆ ناردرا.
حکوومەتی ئێران و خانی موکری و خانی چاری (چهری) و خانی هەکاری یەک لە دوای یەک پیرۆزنامەیان بۆ نارد. حکوومەتی بەغدا و مووسڵ کەوتنە ئەندێشە و ترسەوە. داود پاشا، مەلا محەمەد ناو عالیمێکی گەورەی کورد کە خەڵکی خەتێ بوو و بە«مەلای خەتێ» ناو دەبرێ، ئەمڕۆ نەتەوەی ئەو لە ڕواندز هەن و عالیمن، بەدیارییەوە ناردە لای میر کە لەتەکیا ڕێککەوێت کە بۆ ڕۆژی تەنگی، خۆی پێ ڕزگارکات.
داود پاشا چونکو لەتەک مەحموود پاشای بەبەدا نێوانی ناخۆش بوو، لەبەرئەوە کە میری ڕواندز ئەو خاکانەی لێ گرت پیرۆزبایی لێکرد.
کە مەلا محەمەدی خەتێ هاتە ڕواندز، چونکو هەر خەڵکی ئەو خاکە بوو، لەلای میر مایەوە و بوو بەشێخولئیسلام و موفتی حکوومەتی سۆران و هەمەکارەی میر و باوەڕ پێ هاتووی وی.

سالّی ١٢٤٤ عەلی بەگی میری کوردی داسنی، عەلیاغای ئەلقووشی کوژت.

مەلا یەحیای مزووری کە گەورە و زانا و عالیمی کوردی مزووری و برازای عەلیاغا بوو، بۆ تۆڵە ئەستاندنەوەی مامی لە عەلی بەگ، لە نیوەی ئەوساڵەدا هەستا پەنای بردەبەر میری گەورە. لە ڕواندز لەلایەن میر محەمەد و مەلای خەتی میوانکرا و بەنەوازش و میهرەبانی پەیمان و دڵخۆشیان داوە.

لە دوای گەیشتنی مەلا یەحیا بەڕواندز، سەعید پاشای ئامێدی لە ئیسماعیل پاشای برازای ڕەنجیدە بوو و پەنای بردەبەر میری ڕواندز کە یارمەتی بدات. بەمیهرەبانی و دەستی ڕێزلێنان میوانداری کرا و پەیمانی پێدرا و لە میر میوان بوو. مەلا یەحیا و سەعید پاشا بەگەرمی میریان هاندەدا و دەیانخستە سەر هەوەسی گرتنی ئامێدی و چوونە سەر داسنی. دەستیان هەڵنەگرت هەتا میری گەورەی دوورئەندێش مەرجی لە تەکا گرێدان و دەگەڵیان ڕێککەوت و پەیمانیدا. ئەوانیش بەپەنهانی و بۆ هاودەنگ و ئاشنا و هەوادارانی خۆیان دەنووسی و ئامادەی ڕۆژی پێویستیان کردن.

بەچاو ڕاوی میری بادینان و مەلای گەورەی مزوورییەوە، گەورە و بچووکی خاکی بادینان بوونە هەواداری میری ڕواندز و چاوەنۆڕی هاتنی بوون.

میر محەمەد بۆ چوونە سەر بادینان و داسنی خۆی ساز کرد و چەک و پێویستی پێکەوەنا و ئامادە بوو.

لەودەمەدا گەورە و عولەماکانی بەغدا لە دەست حکومەتی نۆکەرباب (کولەمە) وەڕزبوون و لە گیان بێزار کرا بوون. ناوبانگی ڕەشیدی و دینداری و ڕەعیەتپەروەری میری ڕواندزیان بیستبوو. قاقەزیان بۆ میر نارد و بۆ هاتنە سەر بەغدایان هاندا. جگە لەوانە لەگەلێک جێگایانی دیکەوە پێشوازی میریان دەکرد و ناردراویان بەگەرمی دەنارده لای میر. گەلێک کەسی دیکەش پەنایان بۆ میر بردبوو و داوای کۆمەگی و یارمەتییان لێ دەکرد. (مەلیخا).

سالّی ١٢٤٧ میری گەورە لەشکرێکی قورسی هەڵگرت، لە زێی بادینان پەڕییەوە و لینگی دادا سەر خاکی کوردی داسنی و کوژتارێکی بێ ژماری لێکردن. عەلی بەگی میری داسنی، بەلەشکری داسنییەوە چووە پێشی، لە دوای شەڕ و کوژتارێکی قورس تەنگە بەعەلی بەگ هەڵچنرا و ڕەپێچکدرا و هەڵات و ماڵ و منداڵی خۆی هەڵگرت و چووە تووری عابدین، لەنێو کێو و لێڕەوار و دۆڵ و دەرەکاندا گەلێک خۆیان شاردەوە و پتریان

ڕوو بەمووسڵ هەڵاتن (القضية الكردية - معروف چياووك). میر بەشەڕ و کوژتار کەوتە سەریان و لە گردی کوێنجک گەیشتە عەلی بەگ و دەورەیدا و تەنگەتاوی کرد لە پاش کەمێک کوژتار عەلی بەگ بەپەیمان خۆی و ماڵ و منداڵی بەدەستەوەدا. میر دەستبەجێ باری کردنو ناردنیە پایتەختی خۆی کە ڕواندز بوو.

میر لە دوای ئەو سەرکەوتنە ڕوو بەمووسڵ جڵەوی سووڕاند. محەمەد بەگی والی مووسڵ کەوتە تەقە و ترسی لێ پەیدابوو. پردی دەجلەی ڕووخاند و بورج و سەنگەر و قەڵای مووسڵی توند کرد و دەرگای قەڵای لەسەر خۆی گرێدا و قەلابەندیی کرد.

میر دێهات و ئاواییەکانی دەوروپشتی مووسڵی لووس و تالان کرد و هەرکەسێک بۆ بەرامبەری ڕاوەستابایە سەری نەرم دەکرد. لەوێوە لەشکری ڕوو بەئامێدی ئاژۆت، میر کە گەیشتە ئامێدی بەتوندی قەڵای دەورەدا. میر مووسا پاشا قەڵابەندیی کرد و دەروازەی لەسەر خۆی داخست و بۆ بەرامبەری لەو قەڵاوە بورج و کونگەرەی پڕ لە سوپا و چەککردن. خەڵکی ئامێدی بەدڵپاکی سوێندیان بۆ خوارد کە شەڕی بۆ بکەن.

میری گەورە لە لایێکەوە بەگەرمی قەڵای ئامێدی لە چەمبەردا بوو، خەریکی بوو، لە لایەکی دیکەوە دەستە لەشکرێکی لەژێر فەرمانی شالی بەگی خزمیدا ناردە سەر زاخۆ و دستە لەشکرێکیشی لەژێر سەرکردەیی ڕەسووڵ بەگی برای ناردە سەر ژەنگار و گرتیان. لە دوای سێ مانگ دەورەدان و وەتەنگ هێنانی قەڵای ئامێدی خەڵکەکەی تەنگەتاوبوون و مردن و گرانی و نەبوونی کەوتە نێویان و لە تەک میردا ناردراو و قاقەزیان لە هاتوچوون دابوو. بەمەرجی بێ ئەزیەتی و تالان و نەکوژتن مامڵەتیان کرد و شار و قەڵایان بەدەستەوەدا.

میر لە دوای دامەزراندنەوەی ئاسوودەگی و ڕێکیی، میر مووسا پاشای کردە حاکمی ئامێدی و دەستە لەشکرێکی دایێ. (مەلیخا).

هەروەکو دوو سێ ساڵ لەمەوپێش لەلایەن هێندێک مونەوەرانی کوردەوە بۆم ناردرا، چەند قاقەزێکی میری ڕواندز لەتەک محەمەد عەلی پاشای میسر و لە جوابەکەشی وا دەردەکەوێ لە دوای گرتنی ئامێدی و زاخۆ و ژەنگار پەیمانی یارمەتیدانی یەکدیان گرێداوە، کە محەمەد عەلی پاشا و لەشکری ڕوو بەسووریا و ئادەنە بچنەخوار، میریش لەوێوە ڕوو بەماردین و دیاربەکر لەشکرکێشی بکات. ئەو موخابەراتە لە مانگی تشرینی ١٢٤٧هـ/ ١٨٣١م دا بووە.

میری گەورە لە مانگی مایسی ١٨٣٢دا ئەو خاکانەی گرت. لە دوای ئەوە میر و

محەمەد عەلی پاشا لەتەک یەکتردا ئاگاداربوون. ئیبراهیم پاشای میسر لە تەمموزی ١٨٣٢م دا کە گەیشتە «حومس»، قاقەزێکی بۆ میر نارد، لە دەرەوەی مووسڵ بەمیر گەیشت.

میر لە دوای ئەوانە ساڵ تێوەر نەسووڕاوە کە لەشکری بردە سەر ئاکرێ. ئیسماعیل پاشا لەژێر فەرماندەی پساغای زێباریدا لەشکری ناردە پێشەوە و جێگا تەنگ و دۆڵ و شێوەکانی توند گرت. لەشکری میر بەهەڵمەت بردن پەلاماری زێبارییانی دا و کوژتار و خوێنڕێژی گەرم بوو. زێباری تەنگەتاو کران و هەڵچنران، هەتا لە کووچە باغی ئاکرێ پەستاوتران. زێباری خۆیان گەیاندە قەڵاوە و لە کووچەکاندا شەڕکرا.

ڕۆژی دووەمی شەڕ لە خزمانی میر محەمەد شاڵی بەگ لەرانی بەدوو جێ بریندار کرا و لە لەشکری میر گەلێک کوژرا.

میر بەوە دەستی هەڵنەگرت و ئاکرێی دەورەدا. نزیک مانگێک لە دەورەی قەڵا شەڕ کرا و هەرچەند میر لە کوژتاردا بەدەست زێبارییانەوە تەنگەتاو کرا بوو، ئارەزووی کیشوەرگیری میری دلێری ڕاگرتبوو.

پساغای زێباری پیاوێکی ڕەشید و ناوداری ئەرژەنگ بوو، بەگەرمی هەڵمەتی دەبرد و قەڵای بەخێو دەکرد. لە پیاوانی میر گەلێک ناودار و ئازا کوژران.

میر فەرمانی دا کە بەشەو لینگدەنە سەر قەڵا و بیگرن. سوپاهی سۆران بەشەو شاریان تەنگەتاو کرد. پساغا بۆیان دەرکەوت، نزیک دە کەس لە چاوەشانی میر کوژران و لەشکری میر تەنگەتاوبوون. عەبدوڵلا سەرهەنگی ئاکۆیی دەست بە ئەنجامدانی فەرمانی دا بەچاوەشەکان پاڵی پێوەنێن و لە پشتیەوە بن ئەگەر سەر وەرسوڕێنی بیکوژن. یەک لە دوای یەک ١٢ چاوەش زنجیریان بەست و عەبدوڵلا سەرهەنگیان خستە پێشەوە و پاڵیان پێوەنا و بۆ قەڵایان سەرخست.

بەو دەستوورە عەبدوڵلا سەرهەنگ نزیک دیواری قەڵابوو، پساغای زێباری لەسەر ڕا بۆیان چووە خوارێ. عەبدوڵلا سەرهەنگ سێرەی تفەنگی گرتبوو دەچووە پێش. پساغا کە نزیک بووەوە، عەبدوڵلا سەرهەنگ تەقەی لە تفەنگ هێنا و لە سینگی پساغای دا و خستی و لینگی گرت و هاوێژتیە خوارەوە و بانگی کردە میر مزگێنی بێ قەڵای ئاکرێ گیرا. میر فەرمانیدا لە هەموو لایێکەوە هەڵمەتیان بردە قەڵا. زێباری ڕوویان لە هەڵاتن کرد.

میری گەورە کە لە بادینان گەڕاوە لەشکری مونتەزەم و ڕێککەوتووی گەیاندە ٣٠ هەزار کەس ؛ ١٠ هەزار سوارە و ٢٠ هەزار پیادە. میر ٣ خەزێنەداری هەبوون:

١- فەقێ ئەحمەدی خەتێ - خەزێنەداری بەتایبەتی دراوی میر بوو.

٢- فەقێ وسووی جۆلەمێرگی - خەزێنەداری خەرج و خەراج و مالیە و باج بوو.

٣- محەمەد شاتر - خەزێنەداری ماڵی تاڵان و زەوتکراو بوو.

جیرە و نان بەهەژار و عولەما و بێ دەسەڵاتان لە خەزێنەی یێکەمین دەدرا. جیرەی سەرهەنگ و سوپا و بینادانان و ئاوەدانکردن لە خەزێنەی دووەم دەدرا. خەڵات و بەخشیش و نیشان لە هی سێیەم دەدرا. بەو جۆرە ئوموورێکی چاکی دامەزراند. هەر کەسەی دەفتەری هاتن و لێوەرگرتنی بەتایبەتی هەبوو، هەموو ڕۆژێ دەنووسرا. میرزا محەمەدی مونشی وەقایع نیگار (ڕۆژنامەنووس) بوو، هەرچیەک ڕووی بدایە دەینووسی و دەیکردە کتێب (مەلیخا).

میری گەورە لە دوای دامەزراندن و ڕێکخستنی ئاکرێ چووە سەر زێبار کە لەسەر ئاکرێ بوو ئەویشی بەشەڕ گرت. کە هەموو خاکی ئاکرێی کەوتە ژێر پەنجەوە، لەشکری ئاژۆتە سەر جزیرە و لە دوای گەلێک شەڕوشۆڕ، بنەماڵەی ئازیزانی تەنگەتاو کرد. جزیرەی گرت و چووە سەر قەلای «ئەرخ». لە پاش زۆر شەڕ و کوژتار قەلای ئەرخیشی گرت و ڕوو بەمووسڵ جڵەوی سووڕاندەوە و لە «حەتارە» بەسەر کوردی داسنی دادا و کوژتارێکی قورسی لێکردن و لەوێوە چووە سەر ئەلقووش.

دانیشتووەکانی ئەلقووش بۆ شەڕ ئامادە بوون. میری گەورە بەکوژتار کەوتە سەریان و شیری تێنان و گیانلەبەرێکی نەهێشت و هەمووی کوژتن.

کە ئەلقووشی پووچ کردەوە، چووە سەر «دێر هورمز» کە ڕەبەنی لێ دادەنیشتن. ڕەبەنەکان و دانیشتووەکان خۆیان شاردەوە، کەمێک لە زانا تێگەیشتووانی ڕەبەنەکان (رهبان) چوونە لای میر. میر لە کوژتار پاراستنی، بۆ بەخێوکردنی ڕەبەن و دێر هورمز هێندێک لەشکر و سەرکردەیەکی خۆی بەجێهێشت و بۆ خۆی چووە سەر مووسڵ. والی مووسڵ چونکو نەدەشیا بەگژیدا بچێ و بەرامبەر بەلەشکری سۆران ڕاوەستێ، پردی دەجلەی تێکدا و قەلای لەسەر خۆی گرێدا و قەلابەندیی کرد. میر دەورەوپشتی مووسڵی تالان کرد و بۆ دەورەدان لەشکرێکی لە دەرەوەی مووسڵ بەجێهێشت و بۆ خۆشی بەلەشکرێکی قورسەوە چووە سەر زاخۆ و دهۆک و ئامێدی و گرتنی و مووسا پاشای

لەسەر دانا و لەشکر و قورخانە و پێویستی بۆ بەجێهێشت و دووبارە چووە سەر جزیرە کە لە دوای ئەوە دەستیان بەسەر کێشی کردبوو، بەزۆر و کوژتار گرتییەوە.

«مەلیخا» دەگێڕێتەوە کە پیاوێکی ڕەسووڵ بەگی برای میر، بەزۆر سەوەتە ترێیەکی لە باغەوانەکانی جزیرە ئەستاند بوو، ئەو باغەوانە چووە لای میر و شکایەتی کرد. میر گوتی: ئەو پیاوەی کە ترێی لە تۆ ئەستاندووە دەیناسی؟ باغەوانەکە پیاوەکەی لەنێو لەشکر دۆزییەوە و نیشانی میری دا. میر دەستبەجێ فەرمانی دا پیاوەکەیان خنکاند.

ڕەسووڵ بەگ چووە لای کە تکای لێ بکات و بیبەخشێ میر گوتی: «ڕەسووڵ دادگەری خۆم ناکەمە فۆتەبەر و بەروانکەی نۆکەرێکی سەوەتە دز و تکای برام».

میر لە دوای ئەوە جزیرەی خستە دەست و دامەزراند و لینگی دا سەر ماردین و نوسێبین و ئەو خاکانەی گرتن و لەشکر و پیاوانی باوەڕ پێهاتووی خۆی لەسەر دانان و لە ساڵی ١٢٤٩ ڕوو بەئامێدی گەڕاوە. لەوێ دیسان چەند قاقەزێکی محەمەد عەلی پاشای میسری پێگەیشت و لە عیراق و دەورەی فورات و خاکانی دەرەوەش قاقەزی گەورە و پیاوە ناودارەکانی بۆ چوو کە لە تەکیاندا ڕێککەوێ.

میر کە چووە سەر ماردین و نوسێبین و دەوروپشتیان، خەڵکی ئامێدی گەلەکۆمەکیان لە میر مووسا کرد و دەریانپەڕاند و سەعید پاشایان لە جێگەی وی کردە گەورە و لە دەورەی کۆبوونەوە. میر لەوە ئاگادار بوو، بەڵام پیش چوونە سەر ئامێدی لینگی دا سەر مووسڵ و دەورەیدا و تەنگەتاوی کرد و دێهات و ئاوایی دەوروپشتی تاڵانکرد و ڕوو بەئامێدی ئاژۆتی.

میر کە گەیشتە نزیک ئامێدی ئەهالی و سەعید پاشا دەرگای قەڵایان لە سەرخۆ گرێدا و قەڵابەندیان کرد. میر نزیک سێ مانگ لە دەورەدانی ئامێدی و شەڕ و کوژتاردا بوو و لە هەر چوار کەنارەوە وەتەنگی هەڵێنا و دەستی کردە هەڵمەت بردن.

شار گرانی لێ پەیدابوو، نەخۆشی تێکەوت، دانیشتووەکانی قەڵا تەنگەتاوبوون و پیاویان ناردە کن میر و داوای مامڵەتیان کرد. بەمەرجی سەعید پاشا بەدەستەوەدان، میر پەنای دان و لە ماڵ و گیان ڕزگاربوونی کردنە پەیمان. خەڵکی ئامێدی سەعید پاشایان بەدەست میرەوەدا و لە سەختی ی ڕزگاربوون.

میر کە چووە نێو شارەوە، ئەوانەی مایەی ئەو شۆڕشە بوون بەسزای گەیاندن. ڕەسووڵ بەگی برای کردە حاکمی ئامێدی. میر کە کاروباری ئامێدی و ئەو خاکانەی ڕێک خست و

دایمەزراند، لەهەر جێگایەکدا لەشکر و پیاوی باوەڕ پێهاتووی لەسەردانان و هەمووی لە ڕواندز گرێدان. ئەوجا دیسان ڕووی لە مووسڵ کرد و بەتوندی دەورەیدا و تۆپی لێ گرێدا و دەستی بەهەڵمەت بردن کرد و مووسڵی لە چەمبەردا.

سەعید پاشای کوڕی یاسین ئەفەندی کە والی مووسڵ بوو، نەدەشیا لە بەرامبەری شەڕ بکا و ئەو هێزەی نەبوو کە پێش بەلەشکری خوێن ڕێژی ئازای سۆران بگرێ و ڕووبەڕووی هەڵمەتی پڵنگانەی میر خۆڕاگرێ، ناچاربوو کە خۆی بخاتە بەربەختی میری گەورەوە. قاقەزی بۆ نووسی و پیاوانی گەورەی ناردە کن. لە دوای پێکهاتن، سەعید پاشا بۆ خۆشی هەستا چووە لای میر و بەپێشکەش و دیارییدان و پاڕانەوە لە تەکیا مامڵەتی کرد و فەرمانی والیەتی مووسڵی بۆ سەعید پاشا نووسی و دایێ و خەڵاتی کرد و ناردیەوە سەر مووسڵ.

لە دوای ئەوە میر بەماڵ و چەک و قورخانە و تاڵان و دیل و گیراوێکی قورسەوە ڕوو بەڕواندز گەڕاوە. نزیک ٢ هەزار کەسی داسنی بەدیل گرتبوو، بردنیەوە ڕواندز. لە کیژ و ژنی داسنی کە ٥٠٠ی پتری پێ بوو، گەلێکی بەگەورە و سەرهاتی مووسڵ بەخشی و بەئاغاکانی هەولێر و کۆیێ و ڕواندزی دان. لەو شارانە ئەمڕۆکە زۆر ماون کە نەنکیان داسنی بووە و میر لە گەڕانەوەیدا پێی دابوون و مارەیان کردبوون.

میری داسنی عەلی بەگ و نزیک ٢ هەزار دیلی لەپێشدا ناردبوونە ڕواندز. مەلیخا دەڵێ کە میر گەڕاوە ڕواندز ئێخسیرێکی کە لە ڕواندز کۆکرابوونەوە لە ١٠ هەزار پیاو و ژن پترتر بوون.

لە دوای گەڕانەوەی میر بۆ ڕواندز، ژنی عەلی بەگی داسنی کەلێن دەگرێ و کۆمەڵەیەکی زلی داسنی خڕ دەکاتەوە و دەچێتە سەر قەڵای ژەنگار. بابەکراغای ئێشک ئەغاسی میر بەسوباشی لەسەر ژەنگار داندرابوو. ڕەشەی سوباشی و بابەکراغا بە ٣٠ کەس لەشکری سۆرانەوە لە قەڵادا بوونو ئاگایان لە بزووتنەوەی داسنی نەبوو، بێباک دانیشتبوون. داسنییەکان پەلاماریان دانێ و لەهەر چوار کەنارەوە ئەو خانووەی سۆرانیی تێدابوون ئاوریان تێبەردا، لەودەمەدا پیاوێکی بابەکراغا بۆ سەر ئاو چووبوو لە دەرەوە بوو، کەوایزانی هەڵات و ڕوو بەڕواندز بۆی دەرچوو. جگە لەو پیاوە کەسیان ڕزگار نەبوون و هەمووی سووتان. باوەکراغا و ڕەشە سوباشی و ٢٩ کەس سووتاندران.

کابرای هەڵاتوو کە گەیشتە ڕواندز، بەمیری ڕاگەیاند. میر ٥٠٠ سوارەی بەلەز بۆ

ژەنگار نارد. لێشاوی داسنی هەتا نزیک مووسڵ هاتبوون، لەشکری سۆران کە گەیشتێ، دەستیان بەکوژتار کرد و داسنییەکانیان تەنگەتاوکردن و نزیک ٧٠٠ تەن (کەس)یان لێ بەدیل گرتن و چوونە ژەنگار و ئوموریان دامەزراندەوە، بەلەز مزگێنیان دا بەمیری گەورە. لە دوای دامەزراندنەوەی کاروباری ژەنگار، لە مانگی ڕەمەزانی ساڵی ١٢٥٠دا گەڕانەوە شاری ڕواندز.

میری گەورە ئەو پشێوی و شەڕ و شۆڕشەی داسنی لە عەلی بەگی میری داسنی دەزانی و گوتی ئەو هانی داون. بانگی کردە کن خۆی و پێی گوت: ئەمە سێ ساڵە بەڕێز و خۆشەویستیی لە ڕواندز دانیشتووی هێشتا دەست لە فیتنە ئەنگێزی هەڵناگری.

عەلی بەگی میری داسنی پێیدا هەڵکالا و گوتی: «من بۆ مەلاکە خوینێک ناقاڕێم». میری گەورە دڵگیربوو و ڕقی هەستا و دەستبەجێ فەرمانیدا عەلی بەگیان کوژت و ٣ ڕۆژ لاشەکەیان بەپردی ڕواندز هەڵاوەسی و لە دواییدا ناژتیان.

وەکو لە پیاوە پیرەکانی ڕواندزم بیستووە، عەلی بەگ گەلێک ڕەند و لاوچاک و مەرد و شۆخ بوو. شایانی کوژتن و خنکاندن نەبوو، بەڵام میری گەورە بەدەسیسەی مەلا دیندارەکان لە عەلی بەگی خواستبوو کە موسڵمان بێ. عەلی بەگیش بەقسەی میری نەکرد.

ئیسماعیل پاشا ڕوو بەچیاکان هەڵات و لەسەری مانگیی ئەیلوولی ساڵی ١٨٣٢دا ئاکرێ کەوتە دەست میری گەورە.

ئیسماعیل پاشا کە هەڵات میر کەوتە سەری و لە کێوەکانی نزیک ئاکرێ دەورەیدا. ئیسماعیل پاشا و زێبارییەکان وەکو پڵنگی ڕق هەستا و ڕوو بەمیر گەڕانەوە و دەستیان بەپەلامار و هەڵمەت بردن کرد.

مەلیخا لەو شەڕەدا وا دەگێڕێتەوە کە: میر دەستە و پێوەندی لە گۆشەیەک دابەزی بوون و تەماشای شەڕیان دەکرد. محەمەد شاتری قلیانداری میر قەنەنەیەکی بۆ میر تێ کرد بوو و دابوویێ و بۆ خۆشی بەپێوە ڕاوەستابوو، گوللە تفەنگی زێبارییان هات و لە سەرەقلیانەکەیدا، گوللەی دووەم و هی سێیەم لە باس قەنەنەیدا و لە نزیک دەستی میر کەوت، هی چوارەم لە لای ڕاستی میر لە زەویدا.

محەمەد شاتر گوتی: میرم ئێرە جێگای دانیشتن نییە هەستە با سواربین. میر خۆی نەشڵەژاند و شلوێ نەبوو و بەسەر خۆی نەهێنا، فەرمانی بەسوپا دا بەگەرمی هەڵمەت

ببەنە سەر دوژمن و دەست بەخەنجەر بکەونە سەریان. لەشکری سۆران ئیسماعیل پاشایان تەنگەتاوکرد و خوێنێکی قورس ڕێژرا. ئیسماعیل پاشا ناچاری هەڵاتن بوو.

میر کە چووە سەر بادینان لەژێر فەرماندەی شا موورادبەگدا لەشکری ناردە سەر لاجان و خاکی موکری. شا موراد بەگ چوو لاجانی گرت و لە گوندی نەڵووس و پەسوێ قەڵای دروستکردن. لە کۆنە لاجان گوندی «جەران» کۆنە قەڵایەکی هەبوو تازەی کردەوە. لەولاوە فەتح عەلی شای قاجارِ ئەمریدا بەنایبو سەڵتەنە کە بڕواتە سەر شا موورادبەگ. لەولاوە ئەمریدا بەخوسرەوخانی والی کوردستان و محەمەد خانی سەرهەنگی فەوجی تەورێز کە پێش بەلەشکری سۆران بگرن. لەودەمەدا شا موراد بەگ چووبووە سەر سندووسێ و لە گرتنداببوو کە لەشکری قاجارِ گەیشتە سەری.

ساڵی ١٢٤٧ لە گوندی «مەحمەدشە» لەشکری کوردی موکریان و سنە و مەراغە و تەورێز لە بەرامبەری ڕاوەستان. لە دوای شەڕ لەشکری تەورێز شکا، ماڵ و ئەسپابێکی زۆر کەوتە دەست شا موراد بەگ و گەڕاوە پەسوێ (تەئریخی قاجاریە).

ساڵی ١٢٥٠ کە محەمەد شای قاجارِ لەسەر تەختی ئێران دانیشت، میر بناغەی ئاشتی لە تەکیا دامەزراند و ڕێککەوتن. لەسەر ئەو ڕێککەوتنە میر لاجانی بەردا. لەو ساڵەدا دووبارە شەڕی نێوانی سۆران و داسنییان ڕوویداوە؛ ئەویش ئەمەیە کە دێتە گوتن:

میر کە عەلی بەگی کوژت، ژنی عەلی بەگ تکای لە میر کرد کە لاشەی عەلی بەگ بباتەوە یەزیدخان. ئەویش بۆ پێکهاتنی داسنی و سۆران جەنازەکەی بە ٢٥ سوارانـدا ناردە ژەنگار.

ژنی عەلی بەگ بۆ تۆڵەسەندن ئەو ٢٥ کەسەی بەکوژتندا.

سەید حەسەنی ڕەشوانی بۆ ئەوەی میر عەفوویکا بەلەشکرەوە چووە سەر یەزیدیان و کوژتاری لێکردن و ژنی عەلی بەگیشی بەئێخسیری ناردە «گرمامک» و لە پێش لەشکری میردا بەداریاندا کرد.

میر لە ڕواندز بەلەشکرەوە ڕوو بەژەنگار چوو، لە ڕێگا تووشی لاشەی ئەو ژنە و چەند کەللەسەری یەزیدیان بوو. کە پرسی کرد، پێیان گوت: سەید حەسەن تۆڵەی ئەستاندەوە و لەودەمەشدا بە٢ هەزار ئێخسیری یەزیدییەوە هاتنە کن میر.

میر بەخشی و روتبەی سەرهەنگی دایەوە و گەڕاوە ڕواندز. ساڵی ١٢٥١ ئیسماعیل پاشای ئامیدی موخابەرەی لە تەک میر کرد کە بیکاتە حاکمی دهۆک. میر لێی بهورد و

ناردیە کن ڕەسووڵ بەگی برای کە لە دهۆک دایبمەزرێنێ. ئەویش بردیە دهۆک و ئوموورى بۆ ڕێک خست.

لەودەمەدا سەعید بەگی ئاکرێیش بەخشرا و بەحاکمی ناردرا ئاکرێ. میر حافز عەلی پاشای والی بەغدای خستە ترسەوە. عەلی پاشا ٢ ساڵ لەوەپێش ڕوتبەی پاشایی و میری میرانی بەخەڵاتەوە بۆ میر محەمەد نارد و دەکۆشا لە تەکیا ڕێککەوێ (مەلیخا).

حکوومەتی عوسمانی، محەمەد پاشای ئینجە بەیراقداری بەلەشکرەوە ناردە مووسڵ و قاقەزی لە پاشای کوردستان و والی بەغدا و مووسڵ و دیاربەکرێ نووسی کە کۆمەگی بەیراقدار بکەن.

عەلی پاشا یاریدەی دا و گەیاندیە مووسڵ. میر ئەمریدا بەئیسماعیل پاشا و سەعید پاشا و ڕەسووڵ بەگی برای کە بەلەشکرەوە بچنە سەر بەیراقدار. لەولاوە بەیرەقدار کۆمەگی لە ئەهالی مووسڵ خواست و بەلەشکرەوە لە مووسڵ دەرکەوت و ڕوو بەئامێدی ئاژۆت و هەر دێهات و ئاوابیەکی کوردی کەوتە پێش کوژتاری لێ کرد.

لەودەمەدا ئیسماعیل پاشا چوو بوو بۆ ئاواکردنەوەی قەڵای «نێراوە» کە لە شیمالی شەرقی ئامێدییە. ڕەسووڵ بەگ و زۆر لەشکریش چووبوون. بەیراقدار چوو بەبێ شەڕ ئامێدی گرت و پڕی کرد لە عەسکەر و گەڕاوە مووسڵ و لە دێی «کر عەرەب» دانیشت و ناردیە دووی هەموو ڕوئەسای شێخان، ئەوانیش بەبێ ترس هاتنە کنی.

لەشکری بەیراقدار دەورەی ڕوئەساکانی کوردی دان و گرتنی و کوژتنی و ژن و منداڵیشیان بەدیل بردنە مووسڵ.

بەیراقدار لەشکری کۆکردەوە و بۆ چوونە سەر ڕواندز ئامادە بوو. ئیسماعیل پاشا «جورنەقەب» ناو پیاوێک لە خێلی زێبار، ناردە «گردی حەمە عەرەب» (تل جومر) کە بچێ بەیراقدار بکوژێ. چوو بەشەو پارێزی بردە چادری بەیراقدار، پیاوێک نووستبوو بەخەنجەر دایگرت و هەڵات. بەیراقدار نەبوو کە کوژتی میوانێکی بوو.

بەیرەقدار کە ڕوو بەڕواندز هات، میر لەشکرێکی لە ژێر فەرمانی ڕەشید بەگدا ناردە پێشی. ئەگەرچی عولەمایان نەیاندەهێشت شەڕ لەگەڵ تورکان بکا، ئەحمەد بەگی سەرهەنگ قبووڵی نەکرد و گوتی: دەبێ شەڕ بکرێ. لەشکری میر لە نزیک زێی بادینان پێشیان بەتورک گرت و لە دوای شەڕ بەیراقداریان شکاند و گەلێک تالانیان کەوتە دەست و گەڕانەوە ڕواندز.

میر ٣ هەزار کەسی ئازای بۆ ئیسماعیل پاشا ناردە ئامێدی، بەڵام بەیراقدار زووتر چووە ئامێدی و قەڵای توند کرد و ئامادەبوو.

ئیسماعیل پاشا قاقەزی بۆ ئەهالی ئامێدی و مەلا یەحیا نووسی کە یاریدەی دوژمنی کورد نەدەن و سەر لە ئیتاعەتی گەورەی میللەت پێچانەوە و خۆ بەقوربانی دوژمن کردن دووری مروەتە و بوونە سەبەبی خوێنی موسڵمان ڕێژتن بێ ئیمانییە. چۆن دەبێ لەبیر بکرێ کە ژن و منداڵی کورد لە دەست دوژمناندا لە مووسڵدا دەفرۆشرێن.

ئیسماعیل پاشا بەوجۆرە موخابەرەیەکی دوورودرێژی لە تەک ئەهالی ئامێدیدا کرد و قەڵای دەورەدا و وەتەنگی هێنا و ئامێدی گرت و دامەزراندەوە.

بەیراقدار لەولاوە لەشکری لە مووسڵ هەڵگرت و ڕوو بەئامێدی چوو. ئیسماعیل پاشا کەوایزانی چوو لە «عێن توتای توت» ڕاوەستا و دەست بەکوژتار کرا. لە دوای شەڕ بەیراقدار بەشکاوی ڕوو بەمووسڵ هەڵات. کورد بەکوژتار کەوتنە دوویان و ماڵ و ئەسپابێکی قورسیان بەتاڵان گرت و بەشادمانی گەڕانەوە.

جاری دووەم بەیرەقدار لەشکری هەڵگرت و ڕوو بەئامێدی چوو، ئیسماعیل پاشا لە شێخان چووە پێشی و بەگژیدا چوو. لە دوای گەلێک شەڕ بەیراقدار هەڵات و خۆی گەیاندە مووسڵ.

ئیسماعیل پاشا مزگێنی ئەو هەموانەی بەدیارییەکی چاکەوە بۆ میر ناردە ڕواندز و بۆ خۆشی گەڕاوە دهۆک و ڕەسووڵ بەگی برای میر لەسەر ئامێدی دایمەزراندەوە و ٦٠٠ پیاوی ئازای لەکن بوو. میر کە زانی تورک ڕۆژ بەڕۆژ هەڵمەت دەبەن و دەست هەڵناگرن، قاقەزی لە محەمەد شای قاجار نووسی و بەسەفیری خۆیدا ناردیە تاران کە یارمەتی بکات و بەلەشکر و جەبەخانە دەستی بگرێت.

محەمەد شا جوابی داوە کە هەر دەمێک بخوازێت کۆمەگی دەکات. حکوومەتی ئاستانە بەپێی سیاسەتی ئەو دەمە کە ئیتفاقی لەگەڵ حکوومەتە گەورەکان کرد، حکوومەتی ڕووس ڕووی لە شکستە و ئێران بێهێز و غەوغای نێوانی خۆیان و مەسەلەی داوای سەڵتەنەت و زیللە سوڵتان و شازادەکانی دیکە لەپێشەوە بوو، گەلێک ئەسپابی تر هەبوو، ئەوەی بەکەلێن زانی کە لەشکر بنێرێتە سەر کوردستان و بەتایبەتی میری ڕواندز بخاتە ژێر پەنجەوە.

بۆ گەیشتنە دڵخوازیان لەپێشدا مەنشوورێکی سوڵتان مەحموودی عوسمانی بەناوی

خەلافەتی ئیسلامیەوە بۆ عولەمایان ناردرا. بۆ مەلا یەحیای مزووری و بۆ مەلا محەمەدی خەتی و مەلا عزرائیلی جزیری و بۆ هەریەک مەنشوورێکی پڕ لە ئایەت و حەدیس ڕەوانە کرا و بەناوی خەلافەتەوە گوێی مەلایەکانی کوردستان پڕ لە با کرا.

## نائومێدی و دەسیسە

سەدری ئەعزەمی پێشووی والی سیواسی ئەودەمە، مستەفا ڕەشید پاشا کە ناوبانگی بە«دیبلۆماتلی» پەیدا کردووە ناردرایە کوردستانی شیمالی. لە دوای ئیجرای زوڵم و ئیستیبداد ڕووی لە جزیرە کرد و لەوێوە چووە سەر «زاخۆ». سەرکردەیەکی پاشای ڕواندز شاری بەدەستەوە نەدا، لە دوای موخابەرە و هاوار لە ڕواندز کردن، تورک وەتەنگیان هێنا. ئەو سەرکردە کوردە غیرەتی هەڵنەگرت شار بەدەست تورکەوە بدا و ڕوو بەڕووبار لە پەنجەرەوە خۆی هاویشتە خوارەوە و خنکا. لە دوای ئەو تورک زاخۆیان گرت.

لەوێوە مستەفا ڕەشید پاشا ڕوو بەئاکرێ چوو. «پیربالْ چاوەش» کە سەرهەنگی لەشکری سۆران بوو لە قەڵادا بۆ بەرامبەری ڕاوەستا. تورک دەورەیاندا و دەستیان بەدیوار سمین کرد. پیربالْ چاوەش بەشەڕ نەیهێشت دیواری لەسەر کونکرێ و ٣ مانگ خۆی ڕاگرت. زێباری و خێڵی ئاکرێ خیانەتیان کرد؛ ئەویش ناچاربوو بەشەو قەڵا بەربدا و بەرەو ڕواندز هەڵات.

حکوومەتی ئاستانە ئەمریدا بوو بەوالی دیاربەکر و بەغدا و مووسڵ کە یاریدەی مستەفا ڕەشید پاشا بدەن و لە سێواس و مووش و بتلیس و ئەرزەڕۆمیشەوەعەسکەر بۆ دیبلۆماتلی چوو. بەیراقداریش بەلەشکری مووسڵەوە چووە کنی و لە ئاکرێوە ڕوو بەحەریر لە زێ دەرباز بوو.

میر قەڵای ڕواندز و ڕێگایانی بەسوپا توند کرد و لە ڕواندزەوە بەلەشکرێکی ٤٠ هەزار کەسییەوە چووە دەشتی حەریر و بەلەز قاقەزێکی بۆ محەمەد شای قاجاڕ نارد کە یارمەتی بکات.

میر لە ژێر فەرمانی سەرهەنگ ئەحمەد بەگی برای خۆیدا لەشکری ناردە پێش ڕەشید پاشا و لەسەر زێ شەڕێکی خوێناویان کرد و زۆر کوژتار کرا.

بەڕاستی کوردەکان پڵنگانە شەڕیان کرد و بەگەرمی هەڵمەتیان بردە سەر دوژمنیان. بەڵام چونکە ژێر پایەی ئیش لە دەست مەلا و فەقێیەکاندا کلۆر کرابوو، شەڕ لەگەڵ ڕۆمیاندا بێسوود بوو، مادامە میری گەورە بەبێ فتوای مەلاکان کاری نەدەکرد، ئەو ڕۆژە

هەتا ئێوارە تۆپ و تفەنگ لەهەر دوولاوە کاری دەکرد و بەشەویش هەر پایەدار بوو.

مستەفا پاشا کە لەپێشدا تەفەکوری کردبوو، بەراوەژوورووی دا و ناچار بوو بەشەو پاشەوپاش بگەڕێتەوە. بەهەر جۆرێک بوو لە زێ پەڕیەوە و ڕوو بەمووسڵ ڕۆیشت و هەڵات. تالان و ئەسپابێکی زۆر کەوتە دەست کوردەکان و گەڕانەوە حەریر.

مستەفا پاشا کە گەیشتە مووسڵ فەرمانێکی ساختەی بۆ مەلا محەمەدی خەتێ نووسی و قاقەزێکی پڕ لە ئایەت و حەدیس کە ئالەتی دەستی تورک بوو بۆ میللەتی کورد کوژتن بەکاریان برد و بۆمیری گەورەیان نارد کە بیخەڵەتێنن.

مەلای خەتێ چونکە پەروەرشی دەستی داود پاشای گورجی زادەی والی بەغدا بوو، لەو جۆرە مەنشوور و فەرمانانە ئاگادار بوو، دەزبەجێ تەرویجی کرد و فتوای دا کە شەڕ لەگەڵ سەلاتینی «ساتیر»ی ئالی عوسمان دا بۆ دین و تەڵاق و باوەڕی ڕەخنەی هەیە. دڵی کوردی هەژاری لەشەڕ خاوکردەوە.

حاجی قادری کوڕی برایم ئاغای ئێشیک ئاغاسی میری گەورە بەزبانی خۆی بۆی گێڕامەوە کە میر ئەحمەدی برای میری گەورە لەگەڵ مەلا محەمەدی خەتێ لە مەجلیسدا بەکێشە هاتن. ئەحمەد بەگ ڕووی لە هەموو لەشکر کرد و گوتی (هەرکەس هەواداری شەڕی ڕۆمی (عوسمانی)یانە بکەوێتە لای منەوە و هەرکەس شەڕ ناکات بکەوێتە لای مەلای خەتێوە. سەرهەنگ و لەشکر هەمووبەجارێک کەوتنە پشت ئەحمەد بەگ و چەند فەقێیەیەک لەلای مەلا و میری گەورە مانەوە. لەگەڵ ئەوەشا میر گەڕاوە ڕواندز و لە هەموولایێکەوە هێزی خۆی خڕکردەوە. ئەحمەد بەگ و ٣ هەزار کەس لە حەریر مانەوە و چاوەنۆڕی دەم و گەڕانی دەوران بوون.

مستەفا ڕەشید پاشا لە مووسڵ لەشکری مووسڵ و بەغدا و دیاربەکر و سیواسی هەڵگرت و لە ڕێگای ئاکرێوە ڕوو بەشێروان و مزووری بۆ چوونە سەر ڕواندز ئاژۆتی.

بایزبەگی «باپشتی» کە چەند ساڵ لەوەپێش چووبووە ئەستەمبووڵ بەرابەری لەگەڵی چووە ڕواندز و بەوەوە موخابەرەی لەتەک کوردەکاندا کرد. حافز عەلی پاشای والی بەغداش، بەهێزێکی زۆرەوە لە بەغدایێ دەرکەوت و ڕوو بەهەولێر خوشی.

مستەفا ڕەشید پاشا لە ئاکرێ کە: دەرکەوت فەرمانێکی هەڵبەستی بەعارەبی و پڕ لە ئایات و حەدیس بۆ میر ناردە ڕواندز. بەکورتی ئەمەی خوارەوە تەرجەمەیەتی:

«بەشەرت و عەهد و میساق و پەیمانی خولەفایانی ڕاشیدین بێت کە لەگەڵ

موسڵمانانی کردوویانه، ئەمینت دەکەم کە هەر چتێکی ئێوە پێتان ناخۆش بێت، لە حەقتاندا ئیجرا ناکەم و هیچ بێدڵی و ناگوزارێکی لە ئێوە خۆش نەبێت لە ئێمەوە بۆ ئێوە روونادات. ئارەزوومان هەر ئەوەندەیە کە ئێوە بکەونە ژێر سێبەری «ظل الله» ئەمیری موئمینین کە زاتی ئەقدەسی شاهانەیە. ئەوجا لە هەموو بەڵا و موسیبەت رزگار دەبن و لە دنیا و ئاخیرەتدا بەئاسوودەیی و کەیف خۆشی دەژین. شەرت و عەهدێکی خەلافەتی ئیسلامی کە لەگەڵ ئومەرایانی ئیسلامی کردووە، ئەمنیش ئەو پەیمانەتان لەگەڵ گرێ دەدەم کە ئەمین بن و نەترسێن. ئەمن بەشەفەقەت و عەدالەت ئێوە وەکو ئەولادی خۆم لەژێر باڵی مەرحەمەتدا بەخێو دەکەم و بەنیشان و خەلات، فەرمانی میری میرانی ئەمارەتی سۆرانتان بۆ تەسدیق دەکەم. هەر چیەکت بوێ و هەر پێویستیەکت رووبدا دەیدەم و لە هەموو تەنگانەیەک یارمەتیتان دەکەم و بەسەر دوژمنتاندا زاڵ دەکەم. ئەوانەش لە دوای هاتنتان بۆ بابی عالی دەکەوێتە ئیجرائاتەوە».

کە ئەو فەرمانە گەیشتە رواندز، میر هەموو سەرهەنگەکانی لەشکری کۆکردنەوە و مەلا محەمەدی خەتێی خواستە حزوور. لەشکر و ئەهالی بەجارێک گوتیان: چوونتان لە دوای نەبوونی ئێمەیە.

مەلای خەتێ هەستا خوتبەیەکی دووردرێژی خوێندەوە و فتوای دا هەرکەسێک شەڕ لەگەڵ لەشکری عوسمانی بکا بەبێ ئیمان دەمرێ و لە ژیانیدا تەڵاقی دەکەوێ. ئەو خوتبەیە لەو رۆژەدا تەئسیری بەخشی و بوو بەمایەی بێ هێزبوونی میر و ناچاری کرد کە خۆی تەسلیم بەتورک بکا هەروەکو کردی.

لەولاوە رەشید پاشا نزیک بووە وە هەتا گەیشتە دەشتی سۆران. چادر و خەرگای هەڵدا و دیسان قاقەزێکی بۆ میری گەورە و یەکێکیشی بۆ مەلا محەمەدی خەتێ ناردە رواندز و تەئميناتێکی زۆری دا بەمیری گەورە و بەشەرەف و حەمیەتی دەوڵەتی خۆی دڵی ئاسوودە کرد و دووبارە پەیمانی لەتەکیا گرێدا کە حکوومەتەکەی پێ بداتەوە و بیکاتە میری میران و روتبەی پاشایەتیشی بۆ تازەکاتەوە.

مەلا محەمەدی خەتێ بڕیاری دا کە میری گەورە بڕواتە لای مستەفا رەشید پاشا. میری گەورە و مەلا بەپەنهانی لەشکر و سەرهەنگەکانەوە موخابەرەیان لەگەڵ کرد. میر ئەحمەدی برای دەکاتە وەکیلی حکوومەتەکەی و مەلا و چەند سوارێک هەڵدەگرێ و دەچێتە کن مستەفا رەشید پاشا و بەحورمەتەوە پێشوازی لێ کرا.

مستەفا ڕەشید پاشا سوپاسی بۆ مەلای خەتێ دەکا و پێی دەڵێت بەشەرەف سوێند بێ بەشادی میر دەنێرمەوە سەر حوکمداری خۆی. مەلا ئەسعەدی خەیلانی زادە و حاجی قادری ئیشیک ئاغاسی زادە کە لە بابی خۆیان بیستووە دەڵێن میر باری ۲۰۰ ئێستر دراوی دا بەمستەفا پاشا و بەو جۆرە میر دەخاڵەتی بەمستەفا پاشا کرد و لەسەر پەیمانی ئەو خۆی تەسلیم کرد و ناردرا ئەستەمبووڵ و عەفوی سوڵتان مەحموودی بۆ ئیسدار کرد و لەسەر عەهدێکی پێی دابوو، ڕوتبەی میری میران و پاشایەتی بەفەرمانەوە بۆ ئەستاند و بۆ گەڕانەوە بۆ ڕواندز ئەمری وەرگرت.

لەودەمانەدا مستەفا ڕەشید پاشا مرد. دوژمنی مستەفا پاشا کە عەلی ڕەزا پاشا والی بەغدا بوو، بەلەز وەڵامیدا بەئاستانە ئەگەر میر محەمەد پاشا بگەڕێتەوە ڕواندز، عیراق لە دەست دەچێت و ئیدارەی حکوومەت و شیرازەی ئیش تێک دەچێت.

میر لەودەمەدا ڕوو بەتەرەبزوون لە ئاستانە دەرکەوتبوو. بابی عەلی ئەمریدا بەوالییەکان، لە تەرەبزوون یاسیواس بەشەو ئیعدام و گوم کرا.

سبەینێ مەلا عەزیزی موفتی ڕواندز کە ئامۆزای پاشا بوو لەگەڵی چووبووە ئاستانە، لە بازاڕدا دیتی پۆستی خەز و دەمەر قۆپان و تورمەی سەری میر لە دەست دەلاڵ دایە، ئەوانیش بەلەز بۆ کوردستان دەچنەوە.

## بەندی چوارەمین

### میر ئەحمەد کوڕی مستەفا بەگ

میر کە چووە ئەستەمبووڵ میر ئەحمەدی کردە جێنشینی خۆی. کە مەلا عەزیزی موفتی و پیاوانی میر بەهەڵاتن گەڕانەوە ڕواندز، سەربهوردیان بۆ سەرهەنگان گێڕاوە. میللەت کۆبوونەوە و میر ئەحمەدیان کردە میری ڕواندز.

میر ئەحمەد بە«میر ئەحمەد لالە» ناوبانگی کرد بوو. لە میر ئەحمەد گەورەتر سلێمان بەگی برای بوو، لە لای کاولۆکان دادەنیشت. هەوای حوکمداریی کەوتە سەر. شەوێک لە گەورەی بازرگان حاجی ئیلیاس و لە سەرهەنگان عەبدوڵلا سەرهەنگی ئاکۆیی و چەند پیاوی گەورەی ڕواندز بەمیوانی بانگ کردەماڵی خۆی. لە دوای نانخواردن دەرگای گاڵەدا و گوتی میریی ڕواندز بۆ برا گەورەیە، دەبێ هەمووتان ڕێ بدەن.

ئەوان هەرچەند تەقەلایاندا بێ فایدە بوو. هەستان کە بڕۆن دەرگایان بەبەستراوی دیت، لەسەربانی قەڵاجاڕیان کێشا دەورە دەوری میر سلێمان بەگە. میر ئەحمەد بەلەشکرەوە دەورەی قەڵایدا، لە دوای ٢ ڕۆژ شەڕ و کوژتار، سلێمان بەگ ئاڵای تەسلیمی هەڵدا. میر ئەحمەد پیاوانی ناردە ژوورەوە. سلێمان بەگی ماویلی دەچێتە پێشەوە کە سلێمان بگرێت، سلێمان دەست بەخەنجەر بۆی دێت، لەودەمەدا پاشەوپاش و لە سەربان بەردەبێتەوە. لە سەرەوە سلێمان بەگ بەگوللە دایدەگرێ.

میر ئەحمەد پیاوانی نارد و گرتیان. عەبدوڵلا سەرهەنگ و حاجی ئیلیاس و هەواڵانی گیران، بەڵام لە دواییدا عەبدوڵلا سەرهەنگ بەبێ گوناه کوژرا و ئەوانی دیکە بەربوون. بووکشازەمانی دایکی میر تکای بۆ سلێمان کرد و ڕزگار بوو؛ بەڵام حەپس کرا.

عەبدوڵلا سەرهەنگ پیاوێکی قارەمان بوو، لە خزمەتی میر محەممەددا زۆر پەرای کرد. قەڵای ئاکرێ و جزیرە ئەو گرتی. یێکە پایەی لەشکری ڕواندز و لە کوردی ئاکۆیانی حاریس ئاغابوو. کە کوژرا ٣ کوڕی بەجێ هێشت: برایماغا، حەمەداغا، داوداغا. سەرۆکی شارەوانی ڕواندز محەممەد عەلیاغا کە ئەمڕۆکە هەیە کوڕی برایماغایە.

کە عەبدوڵلا سەرهەنگ کوژرا، عایلە و براکانی باریان کردو چوونە شنۆ و لەگەڵ

تەرەفدارانی سلێمان بەگ ڕێککەوتن و لەتەک مەحموود بەگی کوڕی عوسمان بەگدا کە ئامۆزای میر ئەحمەد بوو بەهێزێکەوە چوونە سەر میر ئەحمەد. لە دوای شەڕ و کوژتارێکی زۆر بەشکاوی ڕوو بەشنۆ گەڕانەوە.

ڕەسوولْ پاشا کە لە ئامێدی گەڕاوە ڕواندز، ناردی ئەو عایلەیەی بردەوە و هەردوو برایانی حەپسکردن. لە پاش ٢ سالاّن بەریدان. ئەمڕۆکەش ئەو عایلەیە هەر دەستدرێژن.

لە دوای میر محەمەد نێوانی سلێمان بەگ و میر ئەحمەد بەپشێوی ڕادەبووران. ئەحمەد پاشای بابان چووە سەر مەرگە و قەمچووغە و رانیە و کۆیەی گرتن و خێلّی مەنگوڕ و چناران و خۆشناو و پیران و خەلەکان و بیتوێنی خستەژێر حوکمیەوە. شاری هەولێر بەدەستیەوە کەوتە دەست «محەمەد مەسرەمی»ی. ئاکرێ و زاخۆ و دهۆک کەوتنە دەست ئیسماعیل پاشا؛ تەنها ئامێدی لە دەست ڕەسوولْ پاشادا ماوە.

سەعید پاشای ئاکرێ لەشکرێکی لە خێلّی زێبار و شێروان هەلّگرت و ڕوو بەڕواندز چوو. میللەتی بالّەکیان لەشکریان دایێ و چوونە «گەرووی چەنگە» کە لە شیمالی ڕواندزە. «گیاناوێژ»یشیان گرت کە لەسەر ڕێی ڕواندز و باپشتیان دایە و چوونە خوار بۆ سەر ڕواندز.

لە لایەن میر ئەحمەدەوە دەست بەبەرامبەری کرا، لە دوو کونگەرەی ڕۆژئاوای شار و ئیچ قەلاّوە بەتۆپ ئاوربارانیان کردن و زۆر سوپاهی سەعید پاشایان کوژت. دەستەپیادەی ڕواندز لە دوو قۆلّەوە چوون و پشتی دوژمنیان گرت. سەعید پاشا شکا و هەلاّت.

میر ئەحمەد ٢ سالْ حوکمداری کرد، بەلاّم لەبەر شۆڕش لە حکوومەتی خۆی کامەران نەبوو. میر کە ڕۆژی جومعە بچووبایە مزگەوت لە دەروازەی سەرایەوە هەتا دەرگای مزگەوت دوو ڕێز لەشکر ڕادەوەستان و زۆر سەرۆک و سەرهەنگ لەگەلّیدا سوار دەبوون و لەنێو خۆیان دەگرت و دەیانبردە مزگەوت و دەگەڕانەوە. میر ئەحمەدیش بەو دەستوورە ڕۆژی هەینی سواربوو گەیشتە سەر پردی خەرەند کە بەپردۆکەی مەلا ئەحمەدی مەلا سلێمان دەناسرێ.

مەحموود بەگی کوڕی عوسمان بەگ کە سەربهوردی بابوباپیری گوترا، بۆ تۆلّەسەندنەوە لە ڕواندز چاوەنۆڕی کەلێن بوو. لە مالّی «ئەللّا بەگ» ناو و لەپشت پەنجەرەوە سێرەی تفەنگی گرتبوو. میر ئەحمەد کە گەیشتە نێو دەرگای پرد، کوللەیەکی لە موورەی پشتیدا و لە ئەسپی بەرداوە. لەشکری دەورەی خانووی ئەللّا بەگیان دا و چوونە ژوور. مەحموود

بەگ ٦ی دیکەشی بریندارکرد و ئینجا کوژرا. میر ئەحمەد کە زامدار بوو بردیانە ماڵ و دەرمانیان کرد.

سەرهەنگ کۆبوونەوە و لەشکریان ساز کرد و ئەمری بەگزادە کوژتنیاندا. ٣ ڕۆژ لەنێو شاردا کوژتاریان لە بەگزادە کردن؛ ڕۆژی سێیەم ئەحمەد بەگ گیانی دا و بەبەهەشت شادبوو. لە دوای ناژتنی ئەحمەد بەگ، سەرهەنگەکان لەشکریان نارده دەرەوە و هەر بەگزادەیەکیان دەستکەوت کوژتیان .

## سلێمان بەگ کوڕی مستەفا بەگ

کە میر ئەحمەد مرد، سەرهەنگ و گەورەی لەشکر و شار خڕبوونەوە و سلێمان بەگیان لە حەپس دەرخست و کردیانە میری سۆران. چەند ڕۆژێک ڕاینەبوارد کە دەستی بەتۆڵە ئەستاندنەوە و ئەزیەتدانی ژێردەستان کرد. پیاوێکی زنجیرەوانی میر ئەحمەد هەبوو، گرتی و ئیعدامی کرد. کە لە حەپسدا ڕۆژیک زووتر بردوویەتە ژوورەوە، ڕقی ئەوەی لێ هەڵگرتبوو. کە بوو بەمیر یەکەمین جار ئەو پیاوە بێ گوناهەی کوژت.

خەزێنەی حکوومەتی کێشایە ماڵی خۆی و تواندنیەوەو کردنیە سندە بۆ پاشەڕۆژ بەکاربێت.

سەرهەنگەکان کە تەماشای بزووتنەوەی سلێمان بەگیان کرد، شایانی میریی نەبوو، چوونە کنی و پێیان گوت کە دەبێ چاو لە گوناهانی پێشوو بپۆشی و لەگەڵ دراوی خەزینە خیانەت نەکەی؛ چونکە ئەو هەردووکانە بناغەی چەسپاندنی حوکمڕانیی تۆن. سەرهەنگان هەرچەندە کۆشان نەشیان پێش بەسلەیان بەگ بگرن و چارەیان نەکرد، لە دوامینیدا گرتیان و خستیانە حەپسەوە.

## حوکداری بەگەل (جمهوریت)

میللەت کە سلێمان بەگیان حەپس کرد، لە سەرهەنگەکان و گەورەکانی ڕواندز کۆمەڵەیەک خڕبوونەوە و حکوومەتەکەیان کردە «گەلی» و بەگەل ئیدارەیان دەست پێکرد و لەتەک ڕەسووڵ بەگدا بناغەی هاتووچۆیان دامەزراند.

لەودەمەدا نێوانی سەعید پاشا و مەلا یەحیای مزووری تێکچوو بوو، بەماڵ و منداڵەوە هەڵات و ڕوو بەبەغدا ڕۆیشت. سەعید پاشا بنچەنگی لە فەسادی چۆڵ بوو، لەتەک ڕەسووڵ بەگدا موخابەرەی کرد و بەمامڵەت ڕێککەوتەوە. ڕەسووڵ بەگ ئالەت و

موهیمات و لەشکرێکی کە هەیبوو ڕێکی خست و ئامێدی تەسلیم بەسەعید پاشا کرد. لە مانگی ڕەبیعی یەکی ساڵی ١٢٦٠ لە ئامێدییەوە ڕوو بەڕواندز بزووت. کە نزیک ڕواندز بوو، ئەهالی و سەرهەنگ و لەشکر پێشوازییان کرد.

دەورەی سەرهەنگەکان کە بەگەل حوکمڕانییان دەکرد ٢ ساڵ و ٢ مانگ بوو، گەلێک چاکەیان بۆ میللەت هەبوو. داد و ئاسوودەگی و ئەمنیەت لە دەوری میری گەورە چاکتر نەبووایە کەمتر نەبوو. هەر دوژمنێکی بنەماڵەی سۆران بوو بەزۆر پووچیان کردەوە و قەڵای ڕواندز و دەورەوپشتیان زۆر چاک بەخێو کرد و لەگەڵ ڕەعیەت و لەشکریاندا گەلێک میهرەبان و دادڕەسبوون. لە دەوری ئەواندا مەلای خەتێ لە ڕووکەوتبوو و لەنێو میللەتدا ڕێزی نەمابوو؛ ناچار باری کرد و چووە گوندی خەتێ کە لەنێو هەرووتی دایە.

## ڕەسووڵ پاشای کوڕی مستەفا بەگ

ڕەسووڵ پاشا کە گەڕاوە ڕواندز، ٦٠٠ نەفەر لەشکری خۆی هەبوو و ١٠ تۆپ و باڕووت و جەبەخانەیەکی لەتەکدا بوو؛ دەستی بەدامەزراندنەوەی حوکمداری کردەوە. لە دوای چەندێک بەقسەی موفسیدان یەکە خۆشەویست و ئازا و موددەبیری ئیش و سوپا کە «حەمدی شیرین» بوو بەبهانەیەکی پڕوپووچی گرت و خنکاندی. زۆری پێنەچوو لە سەرهەنگەکان «حەمدی سۆفی» ناوی گرت و هەردوو چاوی دەرهێنا. لە دوای چەندێکی دیکە یەکە خۆشەویست و پیاوانی میر کە «محەمەد شاتر»ی نێو بوو گرتی و لووس تالانی کرد.

بەوجۆرە ڕەسووڵ پاشا سەرهەنگەکانی ئیشوکار گوزاری هەمووی ڕەنجیدەکردن و ئەزیەتیدان.

ڕەسووڵ پاشا کە لە ئوموری خۆی پەرژایە سەرکاری دەرەوە، لەگەڵ ئەحمەد پاشای بابان موخابەرەی کرد و پیاوانی زانا لە نێوانی هەردوولادا هاتووچوونیان کرد؛ لە دواییدا پێکهاتن. ڕەسووڵ پاشا «فاتیمەخان»ی خوشکی خۆیدا بەحوسێن بەگی برای ئەحمەد پاشا، ئەوجا دۆستی و ئاشنایەتی بوو بەخزمایەتی. ئەحمەد پاشا خاکی دێرە و هەریری بەبێ شەڕ داوە بەڕەسووڵ پاشا.

ڕەسووڵ پاشا لەگەڵ حوکمدارییی خۆی خەریکبوو، بۆ تۆڵە ئەستاندنەوە لە باڵەکییەکان کە یاریدەی سەعید پاشایان دابوو، لەشکری سازکرد و بەناوی ڕاو، چوونە گوندی باڵەکییان. ئەهالی پێشوازیان کرد. ڕەسووڵ پاشا ئەمریدا هەرکەسێک دەستی تفەنگ

بگری له گوند دەرکەوێت.

ئەهالی بێ هۆش ئاگایان له پاش و پێشی کار و کردەوەی خۆیان نەبوو. نێرینه له ئاواییدا نەما و هەموو دەرکەوتن. ڕەسووڵ پاشا پێی گوتن بۆ شارەزایی ڕێگا بکەونه پێش لەشکرەوە. باڵەکییەکان بەگۆرانی و کەیف کەوتنه پێش، هەتا له گوندێ دوورکەوتنەوە. لەشکر دەورەی دان و شیلنگه تقەنگێکی کردنی و زۆریان لێ کوژتن و هی ماوە گیران و دەستەبەستە خستیانه پێش سینگی ئەسپەوە و ڕوو بەگوند جڵەویان سووڕاندەوە. گوندی لووس تاڵان کرد و گەڕاوە ڕواندز.

له دوای تاڵان و کوژتاری باڵەکییان، ڕەسووڵ پاشا بۆ تۆڵەکردنەوە له «سەلیم خان»ی سەرۆکی سەرچیا ٣٠٠ کەس شەڕکەری لەژێر فەرمانی سەرکردەی جۆلەمێرگی «مورادخان»دا نارده سەر قەڵای کەلەکین. مورادخان بەشەڕ دەورەی قەڵای دا. لەتەک خۆیان نەردیوانی بردبوو؛ بەدیواری قەڵایەوە نا. لەشکری خستە سەرەوە. سەلیم خان ئاگادار نەبوو، هەر هێندەی زانی دوژمنی گەیشتە سەرێ، دەست بەخەنجەر ڕوو بەوان چوو، نەیانهێشت بگاتە پێشەوە بەتفەنگ کوژتیان و خەنجەر و تفەنگەکەیان بۆ ڕەسووڵ پاشا نارد.

عەلی بەگی کۆسە، کە سەرکردەی میری خۆشناو بوو، لەپێشدا ئەوبوو بەبۆنەی تەسلیم کردنی هەریر بەئەحمەد پاشای بابان. له لایەن ئەحمەد پاشاوە حاکمی هەریری کردبوو. ڕەسووڵ پاشا ئەو ڕقەی لەدڵدا بوو، سەرکردەی لەشکری خەیلانی نارده سەر میری کۆسە کە له قەڵای «دێرە» دادەنیشت. بەشەو لەشکریان برد و قەڵایان گرت و میری کۆسە و چەند سەرکردەیەک و چەند نۆکەریان لێ کوژت و بەشادی گەڕانەوە ڕواندز. له دوای ئەوە ڕەسووڵ پاشا لەژێر فەرمانی (قۆچاخلێ)دا لەشکرێکی نارده سەر محەمەد مەسرەفی حاکمی هەولێر، کە له دوای میری گەورە خیانەتی کرد بوو لەتەک ڕۆمیاندا ڕێککەوتبوو.

قۆچاخلێ کە چوو له شەرقی شیمالی قەڵای هەولێر تووشی مەسرەف بوو. له دوای کەمێک شەڕ مەسرەفی بریندار کرد و گەڕاوە ڕواندز.

«ئاموور ئاغای باوەخەلە» له خێڵی زراری له فیتنه و شۆڕش ڕانەدەوەستا. ڕەسووڵ پاشا ناردیه سەری و له دوای چەند شەڕێک کوژتیان.

له کوژتنی ئەحمەد بەگ (میر ئەحمەد لاڵە)دا دوو ئامۆزای خۆی کە «ئۆمەربەگ» و «ئاحنا بەگ» بوون دەستیان تێدابوو. له ترسی ڕەسووڵ پاشا بەماڵەوە هەڵاتبوون و

چووبوونە خاکی مەرگەوەڕ کە لە نزیک شنۆیە، ڕەسووڵ پاشا چەندجاران پیاوی ناردە سەریان کە بیانکوژن؛ بەڵام وەبەر نەدەکەوتن.

بایز بەگی باپشتی چونکە لە دەوری میری گەورەدا هەواداری ڕۆمیان بوو، چوو بووە ئەستەمبووڵ و لەگەڵ ڕەشید پاشادا گەڕابووەوە. ئەو ڕقە هەر لە دڵی ڕەسووڵ پاشادا مابوو، ناردی لووس تالانی کرد. چونکە پیربوو نەیکوژت، بەڵام بەماڵ و منداڵ و کولفەتەوە بۆ هەولێری نەفی کرد. موڵک و ماڵی بایز بەگ و ئاحنا بەگ و ئۆمەر بەگی زەوتکردن و دانیە پیاوانی خۆی.

ڕەسووڵ پاشا بەو جۆرە کوڵی دڵی خۆی بەهەمووان دارژت و هەریەک لە ناحەزانی بەدەرد و ئەزیەت گرفتار کرد. کە لەوانە ئاسوودە بوو لەگەڵ لەشکر ڕێکخستن و ڕەعیەت نەوازی و ئالەت و پێویست پێکەوەنان خەریک بوو. هەتا ساڵی ١٢٦٨ بەئازادی و موستەقیللی حکوومەتی سۆرانی ئیدارە کرد و بەچاکی ڕایبوارد. لەو ساڵەدا حکوومەتی عوسمانی لەشکرێکی قورسی ناردە عیراق و هەولێر و کەرکووک و ئاکرێ و ئامێدی و زاخۆ و دهۆکی پڕ لە عەسکەر کرد. خەڵاتی میری میرانی و ڕوتبەی پاشایەتی لە لایەن نامیق پاشای والی بەغداوە بۆ ڕەسووڵ پاشا ناردرا و لەسەر خاکی ڕواندز و هەریر وشێروان و باڵەک و برادۆست کرا بەمیری میران و فەرمانی بۆ ناردرا. لە دوای چەندێک حکوومەتی عوسمانی مەنشوورێکیان بۆ ڕەسووڵ پاشا نارد کە دەبێ ساڵی ٨٠ هەزار ڕیاڵ بدات بەحکوومەتی تورک.

ڕەسووڵ پاشا کە وردبووەوە و تەماشای ڕاست و چەپی ئوموووری خۆی کرد، ناچاربوو کە ئەو دراوە بخاتە عوهدەوە و دەفعی شەڕ بکات هەتا هێزێک پەیدا دەکات. چەند ساڵێک لەژێر ئەو قەیدەدا بوو، بەڵام ئاقچەپێک و پوڵێکی لێ نەدا.

نامیق پاشا قاقەزێکی بۆ نووسی و داوای دراوەکەی لێ کرد، ڕەسووڵ پاشا بەهانەی گرت و نەیدا. ساڵی سێیەم دووبارە نامیق پاشا مەنشوور و هەڕەشەیەکی بۆ نارد و داوای ٢٤٠ هەزار ڕیاڵی لێ کرد. ڕەسووڵ پاشا لەزی لە کار کرد و بەنەدان جوابی داوە و گوتی چۆن دراو ئەدا.

ساڵی ١٢٧٢ نامیق پاشا لەشکرێکی قورسی ناردە سەر ڕەسووڵ پاشا و ئەمریدا بەمووسڵ و هەولێر کە بەلەشکرەوە یارمەتی بکەن. ئەو لەشکرە کە لە هەولێر دەرکەوت ڕوو بەڕواندز چوو. لە دەشتی حەریر لەشکری ڕەسووڵ پاشا پێشی پێگرت و لە دوای شەڕ

و کوژتار قووەتی کوردی حەریر و دێرە و دووینیان بەردا و چوونە ڕواندز.

ڕەسووڵ پاشا دەورووپشتی ڕواندزی توند کرد و گەرووی گەلی عەلی بەگ و ڕێگای ڕەنگینە و کونەبەفر و کوڕەک و گەرووی بێجانیان بەلەشکر و تۆپ توندکردن و سەنگەری تێدا دامەزراندن. ڕەسووڵ پاشا و ماڵ و منداڵ و خەزێنە و گرانباری لە ڕواندز دەرخست و بەچەند سەرهەنگ و هێزەوە ناردیە قەڵای «سیدەکان». لەشکری نامیق پاشا لە سپیلک سەرکەوت و هەموو خێڵی کوردی لەگەڵ خۆی بردبوو. کە گەیشتە چۆمی خەلیفان بەڕابەری شارەزایانەوە لە کوێرە ڕێگایەکی کە لەشکری ڕەسووڵ پاشا نەیانگرتبوو لەشکری ئاژۆت ڕوو بەڕواندز ڕۆیشت. کە لە پیادە ڕێ سەرکەوت لەشکری ڕەسووڵ پاشا سەرسامان، ڕەسووڵ پاشا کەوای بیست، میللەت و ئەهالی بانگکرد و گوتی من لە شار دەردەکەوم با کوژتار نەکەوێتە نێو شارەوە. مادامەکی خێڵی کورد خیانەتیان کرد من شەڕ ناکەم و ئێوەش بڕۆنە پێشوازی عەسکەری ڕۆم و بەمامەڵەت بیانهێننە نێو شارەوە. ڕەسووڵ پاشا و دەستە و دایرەی سواربوون و چوونە «سیدەکان» و لەتەک حکوومەتی ئێراندا موخابەرەی کرد.

لە ئەهالی ڕواندز چەند گەورەیەک لەگەڵ نامیق پاشادا موخابەرەیان کرد و بەمامەڵەت ڕۆژی ١٥ی جەمادی دووەم ١٢٧٢ ڕۆژی جومعەی دوای ئێوارە لەشکری ڕۆمی گەیشتە نیو ڕواندزەوە. چوون لەسەرسا خێوەتیان هەڵدا و لەنێو شاردا دەستیان بەتەشکیلات کرد. کەنعان پاشا ناو تورکێکیان کردە موتەسەریفی ڕواندز و عەسکەرێکی زۆری لێدانا. هەر لەو ساڵەدا تەلگورافی بردە ڕواندز و دایرەی نفووس و گومرگ و ڕەدیف و مەئموورران و مەکتەبێکی ڕەسمی ئیبتدائیشی تێدا دامەزراندرا.

ڕەسووڵ پاشا کە گەیشتە سیدەکان لەتەک ئێراندا موخابەرەی کرد، وەلیعەهدی ئێران لە شنۆ جێگای نیشاندا. ڕەسووڵ پاشا هەتا ساڵی ١٢٧٧ لە شنۆ مایەوە و لە دواییدا لەگەڵ نامیق پاشای والی بەغدا موخابەرەی کرد و بەوەعد و پەیمان لە شنۆ دەرکەوت، ماڵ و عایلەی سەرهەنگ و دەستە و لەشکری ناردە ڕواندز، بۆ خۆی و عایلەکەشی ڕوو بەکەرکووک چوون.

تەقیەدین پاشای موتەسەریفی کەرکووک بەحورمەتەوە پێشوازی کرد و لە گەڕەکی ئیمام قاسم دەستە خانووبەرەیێکی زۆر چاکی پێدا. ڕەسووڵ پاشا کە عایلەکەی دامەزراند، چووە بەغدا. نامیق پاشا لە دوای ئیحترام گرتنی کردیە موتەسەریفی مەرکەزی بەغدا.

ڕەسووڵ پاشا دوو ساڵ لەسەر ئەو وەزیفەیە مایەوە، لەو دەمەشدا ئەسعەد پاشای ئاکرێ برایە بەغدا و دەستبەسەر بوو.

ساڵی ١٢٨١ نامیق پاشا بوو بەموشیری مابەین و چووە ئەستەمبووڵ و ڕەسووڵ پاشاشی لەگەڵ خۆی برد. لە دوای ساڵێک ڕەسووڵ پاشا کرایە والی شاری «وان» و نزیک ١٠ ساڵان لە وان والی بوو.

ساڵی ١٢٩٢ بوو بەوالی ئەرزەڕۆم و لەوێ ژنی هێنا و ماڵی ڕێک خست.

ساڵی ١٢٩٤ بۆ شەڕی ڕووس ئیشتراکی عەسکەری ئەحمەد موختار پاشای کرد. ڕەسووڵ پاشا ساڵی ١٢٩٨ لە ئەرزەڕۆم مرد. ئیحسان بەگ و چەند کوڕی دیکەی لە پاش بەجێما. لە ژنی ڕواندزی کە «بووک ڕابی»ی خوشکی حاجی مستەفا ئاغای ڕواندز بوو، ٣ کوڕی و لەگەڵ کیژێکی بەجێهێشت و لە کەرکووک مانەوە.

کوڕی گەورەی ئەسعەد بەگ کە بابی عەبدوڵلا موخلیس بەگ بوو، کە ئەمڕۆکە عەبدوللا موخلیس بەگ لە هەولێرە. کوڕی ناوەنجی ناوی فەتاح بەگ بوو کە بابی ئامینەخانی دایکی، کەریم بەگی قایمقامە، ئەمڕۆکە ئامینەخان ماوە، کوڕی بچووکی ناوی ڕەشید بەگ بوو؛ چووە ئەرزەڕۆم و لەوێ مرد. لە موقابیل ئەرازی و موڵکی ڕەسووڵ پاشا، حکوومەتی عوسمانی ساڵی (٧٥٠٠) قورۆشی بۆ ئەولادانی ڕەسووڵ پاشا بڕیەوە.

ڕەسووڵ پاشا پیاوێکی تێگەیشتوو و زرنگ و ئازا و موددەبیر و وریا بوو، گەلێک پەرای بۆ کوردی سۆران کرد؛ بەڵام زەمانە نەیهێشت سەرکەوێ. لە میری گەورە بەتوڵەتر و ڕق ئەستوورتر بوو. لە پاش ٩٠ ساڵ ژیان بەئامورزشی خودا شادبوو. حکوومەتی سۆران بەو ئینقرازی هات و ڕواندز چەند ساڵێک موتەسەریف نشین بوو، لە دواییدا بوو قایمقام نشین. هەروەکو لە هاتوودا لێی دەدوێین.

ڕەسووڵ پاشا لە پاش میر محەمەد پاشای برای ٧ ساڵان پاشایەتی کردووە، هەرچەندە تورکان هەر ساڵەی داوای ٤٠ هەزار لیرە خەرجیان لێ دەکرد، نەیدانێ لە دواییدا لەشکرێکی زۆری عوسمانییانی هاتە سەر و لە پاش چەند لێکدانێکی، چەندین جار لەشکری تورکانی تێکشکاند و زیانێکی بێ ئەندازەی پێگەیاندن.

دیسان عوسمانییەکان مەلاکانیان لە ژێرەوە هاندا و ئەوانیش دەهۆڵیان بەناوی ئایین و خەلافەتی ئیسلامییەوە لێدا و دەستیان بەچاوڕا و فتوای ناڕەواکرد. ڕەسووڵ پاشاش چاوڕاوی مەلایەکان کارێکی وای لێکرد، دەستی لەشەڕ هەڵگرت و ڕووی لە ئێران کرد و

وێنەی ڕەسوڵ پاشا برای میری گەورە (محەمەد پادشای ڕەواندز) و پادشای هەرە دوایی کوردستانی سۆران لە بەگی دیبلیدا[1]

٥ سالان میوانی وەلیعەهد بوو و ڕێزیکی زۆری گیرا و لە دواییدا لەسەر تکای عوسمانیان و ئێرانی چووە بەغدایە و لە نزیک مەیدانێدا لە ناو ئەو خانووەی دادەنیشت کە چاپخانەی ڕۆژنامەی عیراقی لە سەردەمی ئیحتیلالدا تێدابوو و لە بەغدایە گەڕەکێکیشیان بەناوی وی نا و ٥ هەزار قورۆشیشیان جیرە بۆ بڕیبەوە.

ڕەسووڵ پاشا موتەسەریفیەتی بەغدای کردووە و لە ١٢٧٢ھ دا بۆ هاوکاری شەڕی رووسان بەفەرمانداری چۆتە ئەرزەرۆم و پایەی «ڕۆم ئیل بەگلەر بەگی» دراوەتێ و دووبارە بەئەرزەرۆمیدا لە ١٢٧٥ بۆ سەردانی خزم و کەسوکارەکانی هاتۆتە بەغدایە و ماوەیەکی

---

(١) داخی گرانم! هەرچەندە بەشوێن وێنەی بەهەشتی محەمەد پادشای ڕواندزێدا زۆرم هەوڵ و تەقەلا داوە. دەستم نەکەوت. بەڵان سوپاس بۆ خودا کە وێنەی رەسول پاشا و ئیحسان بەگ و رەشید بەگی کورەکانی رەسول پاشام دەست کەوتن.

تێدا ماوەتەوە و لە دواییدا بەڕێگای حیجازێدا چۆتە ئەستەمبووڵێ و کرا بەوالی وڵاتی وان و دوای سێ ساڵان بەئارەزووی خۆی وازی لە والیەتی هێنا و ڕووی لە ئەرزەڕۆم کرد.

هەرچەندە ڕەسووڵ پاشا لە خێزانی بەرایی ئەو چوار کوڕانەشی هەبوون ئەسعەد بەگ - فەتاح بەگ - ڕەشید بەگ - بارام بەگ، سەرەڕای ئەوەش لەوی خانەوادەی «وجنەزادە»کان پادشایان کردە زاوای خۆیان و لە خێزانی دووەمیشی کوڕێکی بوو ناوی نا «ئیحسان بەگ».

ڕەسووڵ پاشا لە یارمەتی شەڕی ٩٣ دا پایەی وەزارەتی فەخری دراوەتێ و لەوە بەولاوە ئیتر هەر لە ئەرزەڕۆم دانیشت و لە ساڵی ١٣٠١ھ دا هەر لەوێ کۆچی دوایی کردووە.

## نەوەکانی ڕەسووڵ پاشا

ئەسعەد بەگ کوڕە هەرە گەورەی ڕەسووڵ پاشا، خوێندەوارێکی پێشکەوتوو بوو؛ ڕەوشەنبیرێکی پایەبەرز بووە، داخەکەم لە ١٢٧٥دا لە زێی بەغدایەدا خنکاوە و لە لای شێخ عومەری سەهرەوەردی شاردراوەتەوە و تەنها عەبدوڵڵا موخلیس بەگی کوڕی بەیادگار بەجێهێشتووە.

فەتاح بەگ کوڕی دووەمی ڕەسووڵ پاشا لە ١٢٤٧ھ لە ڕواندز لە دایکبووە و لە بەغدایە لەلای موفتی زەهاوی و مامۆستایانی تایبەتی خوێندەوارییەکی بەرزی دەست خستووە و لە نووسینی گشت شێوە خەتێکیدا خۆشنووسێکی بێ هاوتا بووە و شارەزایییەکی تەواویشی بەسەر زانستی مێژوو و ئەردناسی (جوغرافیا) و وێنەگەریەتی و پزیشکیەتی (طبابە) کوردەوارێتی و نیشانە ئەنگێوێدا هەبووە. دیوانێکی زۆر بەرزیشی بەزمانی کوردی و فارسی و عەرەبی هەیە.

فەتاح بەگ قایمقامییەتی «سنجار» و «چەڵدر» و کەیخودایەتی وان و ئەرزەڕۆم و سەرداریێتی «کۆمیسیۆنی سرکی» پاریسی.کە لە ئەیالەتی شارەزووریدا دامەزراند بوو کردووە. لە دواییدا بووە بەقایمقامی سەلاحیە - کفری و خانەقین و سوق ئەلشیووخ وسەماوە و کراویشەتە سەرۆکی وێکەوتن (تحقیقات) و سەرداری کۆمەڵەی باربووی قاتوقڕی لێدراوەکانی ئەنەدۆڵ و سەرۆکی دادگای سزای بەسرە و بگێری (مدیر) دەفتەری خاقانیی بەغدا و بەڕێوەبەری زانیاری بەغدایە و لە جڤاتی (مجلس) گەورەشدا ئەندامەتی کردووە و لە چاخی پادشایەتی باوکیدا کەیخودا و نووسەری فارسی بووە. لە دواییدا لەبەر نەخۆشی دەچێتە ئەستەمبووڵێ لە ١٣٠٥ کۆچی دوایی کردووە.

ڕەشید بەگ: کوڕی سێیەمی ڕەسووڵ پاشا لە ١٢٤٨ی کۆچیدا لە ڕواندز هاتۆتە مەیدانی ژیانەوە. هەرچەندە خوێندەواریەکی زۆر بەرزیشی بووە، لە خزمەتی باوکی خۆی بەدەر هیچ جۆرە فەرمانێکی تری نەدیتووە، ئەویش لە ساڵی ١٣١٨ی کۆچیدا لە ئەرزەڕۆمێدا کۆچی دوایی کردووە.

بارام بەگ: کوڕی چوارەمینی ڕەسووڵ پاشایە و لە ١٢٥٠ی کۆچیدا لە ڕواندز لە دایک بووە و لە گەلێ زانستی و زماناندا شارەزا بووە. داخم ناچێ کە سەربهوردی بەتەواوی و بەرواری کۆچی دواییشی دەست نەکەوت.

ئیحسان بەگ: کوڕی پێنجەمینی ڕەسووڵ پاشایە. لە پاش ئەوەی کە لە خوێندندا بەهرەیەکی زۆر و پوختی وەبەرکەوت، کرا بەئەندامی ئیستیئناف و مەجلیسی ئیدارە و گەلێک فەرمانانی گرنگی دیتووە و ماوەیەکیش مودیری ڕێگای ئاسنی نێوانی شام و حیجاز بووە و لەسەر تێچاندنی شۆفاران لە ١٣١٨دا بردیانە ئەستەمبووڵێ و تا سەردەمی مەشرووتیەت بەناوی دەربەدەری لەوێدا ڕاگیراوە. لە دوای شەڕی پێشوودا هەر لەوێ کۆچی دوایی کردووە.

وێنەی ئیحسان بەگی کوڕی ڕەسوڵ پاشایە لە
بەرگی دیلیدا

عەبدوڵڵا موخلیس بەگ: کوڕی ئەسعەد بەگی کوڕی ڕەسووڵ پاشایە لە ١٢٧٥ لە بەغدایەدا هاتۆتە ناو گیتییەوە. زانیارییە کۆنەکانی لە لای مامۆستایانی تایبەتی فێربووە و لە پاش کۆچی دوایی باوکی بەماڵەوە چۆتە کەرکووک و لە ١٢٩٨ لە قەڵەمی تەحریراتی موتەسەریفیەتدا کاری کردووە؛ تا گەیشتۆتە پایەی مودیری تەحریرات و لە ساڵی ١٣٠٧دا بەناوی مەئمورییەتی لێکۆڵینەوە (تحقیقات) چۆتە کۆیێ و ڕواندزێ. لە دواییدا چەند جارێکی لە سەلاحیە و مەعموورە و قەڵادزێ و ڕانیە و شوێنانی تردا قایمقامیەتی کردووە و لەگەڵ محەمەد فازیل پاشای چەچاندا بەسەفەر چۆتە لاجانێ و لە ١٣٢٥دا لە مووسڵ کراوەتە مەعاوەنی مەکتووبچی، تا ئیحتیلال. چەندین مەدالیای لە خزمەتدا وەرگرتووە و لە پاش ئیحتیلال ماڵەکەی گوێزتەوە هەولێر و لە ١٩٢٤دا لە بەغدایەدا بوو بەئەندامی مەجلیسی تەئسیسی و لە ١٩٢٥دا بوو بەنوێنەری (نائب) هەولێر. ئەوجارە ماڵەکەی گوێزتەوە بەغدایە و لەوێ لە ١٩٤١دا کۆچی دوایی کردووە و تەنها یەحیا بەگی لە پاش بەجێماوە.

وێنەی بەهەشتی عەبدوڵڵا موخلیس بەگی
کوڕی ڕەسوڵ پاشایە

٧- یەحیا بەگ: کوڕی بەهەشتی عەبدوڵڵا موخلیس بەگی لە ١٣٠٦ی کۆچیدا لە کەرکووکێ پێی ناوەتە کۆڕی ژیانەوە. چەند جۆرە زانیاریەکی لە قوتابخانە کۆنەکان و لە لای مامۆستایانی تایبەتی تا جامی خوێندوە و شەش مانگیشی لە ئەعدادیدا خوێندوە و لە ١٣٢٠دا بۆتە سەرنووسەری دادگای نیزامییەی کەرکووک و ڕواندز و ڕانیە تا سەردەمی ئیحتیلال. لە پاش ماوەیەک بێ ئیشی بۆتە مودیری ناحیەی دێرە و حەریر و مودیری مالی کۆیێ و سەرنووسەری موحاسیبی هەولێری و مودیری تەحریرات. ١١ سالانیش لە ڕانیە و مەخموور و کۆیێ و مەرکەزی سلەیمانیدا قایمقامیەتی کردووە و دووجارانیش لە هەولێر و سلێمانیدا کراوەتە وەکیلی موتەسەریف. ئیتر لەسەر ئارەزووی خۆی وازی لە فەرمانی دەوڵەتی هێناوە و لە هەولێرێ دانیشت و خەریکی ڕەنێوهێنانی سامانی خۆی بوو، بەڵان ئێستا چەند ساڵێکە بەماڵەوە چۆتە بەغدایە. داخەکەم ئەو بنەماڵە خانەدانە هیچ کەسێک بەیادگار لە پاش خۆی بەجێ ناهێڵێ.

وێنەی یەحیا بەگی کوڕی بەهەشتی عەبدوڵڵا موخلیس بەگی کوڕی ئەسعەد بەگی کوڕی ڕەسوڵ پاشای برای محەمەد پاشای ڕەواندزییە

## ناوداران

* وەستا ڕەجەب: لە ١٢٧٠ی کۆچیدا کۆچی دوایی کردووە و کوڕێکی مستەفا ناوی لە پاش بەجێماوە. مستەفاش کوڕی بووە و ناوی ناوە نەورۆز. حاجی نەورۆزیش ٨ منداڵی بووە: نەجیب، محەمەد، عەبدوڕەحمان، شێخ سلێمان، ساڵح و زولەیخا. هەتا ئێستا لەوانە تەنها شێخ سلەیمان و ساڵح ماون.

## هەندێ سەربهورد

میر محەمەد پاشای ڕواندزی کە بەهاندانی مەلای خەتێ و مەلا یەحیای مزووری و مەلا عزرائیلی جزیری پەلاماری بردە سەر دێهاتەکانی شێخان و دەستی بەیەزیدی کوژتنێ کرد، دوای کوژتارێکی بێ ئەندازە ماڵێکی زۆر و هەزاران ژن و کچی یەزیدیان بەتاڵان هێنا. لە تێپەڕینیدا خۆی لە «ئەلقووش» نەگەیاند کە هەموویان فەلەبوون؛ بەڵان لە گەڕانەوەیدا لەسەر ئارەزووی مەلا ناوبراوەکان لە ١٥ ئازاری ساڵی ١٨٣٢دا کوژتارێکی بێ جێ و ناڕەوای لێکردن و سێ پیاوی زۆر گەورەی ئایینیش لەو هەرایەدا کوژران.

لەوکاتەدا «مەتران یووسف ئەدۆ»شیان گرت و ویستیان بیکوژن؛ گوتی حەز دەکەم لە پێش کوژتنمدا پادشا ببینم. کە بردیانە لای محەمەد شا بەکوردی گوتی شاهم ئێمە بۆچی دەبێ لە دەست زوڵم و زۆری تورکاندا بپارێزرێین، بەڵان لەسەردەمی پادشایەکی دادگەری وەکو تۆدا کەی ڕەوایە کە ئێمە تووشی ئازار و کوژتار و تاڵان بین.

پادشا زۆر پەشیمان بۆوە و دەستبەجێ فەرمانی دا کەس نەکوژن و ئەو هەموو ژن و کچ و ماڵێکی کە بەتاڵان برابوون دایەوە بەمەتران یووسف ئەدۆ و بەهۆی ویەوە هەموو بە ماڵ و خاوەندەکانی خۆیان گەیشتنەوە. ئیتر پادشای ڕواندز هەر ئەدەمێ ئەو هەرێمەی بەلەشکرەوە بەجێهێشت و بەرەو ڕواندزێ گەڕایەوە.

کاتێکی کە پادشا بەلەشکرەوە بەنزیک دێی «حەتارا»دا تێدەپەڕی تەماشای کرد داوەت و ڕەشبەڵەک و شایی و زەمزەمەی حەوت بووکان بوو. لەبەر گەرمی بەزموڕەزمی، هۆشیان لەوە نەبوو کە بەپیریانەوە بچن و یا ڕێزیان لێ بگرن و یا چ هێز و سوپایەک گەیشتۆتە ئاوایی وان.

پاشا پرسی خەڵکی ئەو دێیە چین؟ هەر کە پێی گوترا یەزیدین، دەستبەجێ فەرمانیدا کە تاڵانیانکەن و بیانکوژن. لەوێش دوای کوژتارێکی قورس ماڵ و ژن و کچێکی زۆریان بەتاڵانبرد.

میری میران بەبێ ئەوەی کە بیر لەوە بکاتەوە کە ئەو بێچارانە هەر چییەکی هەن خۆ کوردن، لەسەر هیچ و خوڕایی و بەبێ تاوان شایی و زەمزەمە و خۆشی لێکردنە شین و شەپۆڕ.

هەرچەندە محەمەد پاشا دەوڵەتێکی ئازاد و پێشکەوتووی کوردی دامەزراند و مێژووی کوردانیشی تازە کردەوە، کاتێکی کە ئەو تۆپ و هەموو جۆرە چەکێکی لە ڕواندزێدا دارشت و دروستیکردن، تورک و عەجەمان سەریان لە فیشەگ دروستکردنیش دەرنەدەچوو؛ بەڵکو تورکان چەکیان لە ئەڵمان و عەجەمانیش لە ڕووسانیان دەکڕی. سەرەڕای ئەوەش میر محەمەد پاشا تاوانی زۆرە و چاویان لێ ناپۆشرێ.

نازانم میر بۆ سوودی چ دوژمنێکی کوژتاری لە برا یەزیدییە کوردەکان کرد و هەزاران ماڵ و نامووسی وانی بەتاڵان برد و بەسەر ئەم وئەویدا بەشییەوە، لەکاتێکدا کە میر خەریکی ڕاونانی تورکان بوو، بۆچی بەبێ شەڕ و بێ جێ کوژتاری لە فەلەکانی ئەلقووش کرد کە هەزاران ساڵە لە کوردستانێدا بەخۆشی و ئارامی ژیاون. خوا فەرموویەتی: «لاتجادلوا أهل الكتاب إلا بالتي هي أحسن» واتا: لەگەڵ خاوەند کتێبان بەشێوەیەکی جوان نەبێ پیلەبازی مەکەن. جا بەبێ تاوان چۆن ڕەوایە بکوژرێن.

دەستووری دەوڵەتی محەمەد پاشا قورئان و هی عوسمانیان بەپێچەوانەی قورئان بوو، کە مەلا سەر بەتورکەکان دەیانگوت: تفەنگ بەتورکەوەنان زیانی بۆ ئاین و تەڵاق هەیە، دەبوو میر چەند مەلایەکی تری خودا پەرست کۆکاتەوە و لێیان بپرسێت قورئان یا حەدیسەکانی پێغەمبەر لە کامە شوێندا قۆڵیان بۆ ئەوە کێشاوە کە تورک پەلامار بەرێتە سەر کوردان و بیانکوژێ خەزایە. بەڵان کوردان بۆ پارێزگاری خۆیان دەست بوەشێنن کافر دەبن و تەڵاقیان دەکەوێ؟ گەورەترین تاوانی میر ئەوەبوو کە مەیدانیدا مەلایان خۆیان تێکەڵ بەکاروباری دەوڵەت بکەن.

## بەندی پێنجەمین

موتەسەریف و قایمقامەکانی تورک کە لە دوای میرانی سۆران لە ڕواندز فەرمانڕەواییان کردووە ئەمانەی هاتوون:

موتەسەریف: ١- کەنعان پاشا ٢- ئەسرار پاشا ٣- کێ بووە نەزاندراوە ٤- بەهرام پاشا.

ئەم بەهرام پاشایە ڕۆژێک دەچێتە گوندی باپشتیان و چاوی بەکیژی بایز بەگ دەکەوێ و داخوازی دەکات. بایز بەگ دەیداتێ. لەوەوە عەبدوڵڵا پاشای برای بایز بەگ سەر دەکەوێ و دەگاتە پایەی پاشایەتی.

لە قایمقامەکانەوە ڕەواندز خرایە سەر خاکی شارەزوور.

١- قەدری بەگ: کەم مایەوە.

٢- عوسمان شەوقی: پیاوێکی تورکپەروەر بوو.

٣- حەلیم ئەفەندی: بەڕەوشت چاکی و پیاوەتی ناسراوە.

٤- عارف حیکمەت بەگی ئالووسی: لەساڵی ١٣٠٨ - ١٣٠٩ قایمقام بوو، پیاوێکی زانا و تێگەیشتوو و بەکەڵک بووە.

٥- عەبدوڵڵا بەگی بەبە: کوردی سلێمانی لە ساڵی ١٣٠٩ - ١٣١٢ لە ڕواندز قایمقامێکی خودپەسند و بەدەعیە و هیچ نەکەربوو.

٦- مەجید پاشای خەڵکی کفری، زۆر بەغیرەت و ئازا و ڕەشید و بەکردەوە بوو. هەتا ساڵی ١٣١٦ قایمقامی کرد.

٧- عەزیز سەبری بەگ. کوردی دیاربەکر، ئەهالی ڕواندز، نەیاندەویست و بەعەزل کردنیاندا.

٨- سەعید بەگی عەفەجان زۆر تێنەگەیشتوو لە ئومووروکاری ئیدارە نەزانبوو. میللەت نەیاندەویست. ساڵی ١٣١٧ - ٣٢٠ لە کانی ڕەش ڕێگەیان پێگرت و ڕووتیان کردەوە.

٩- ( ) لە ساڵی ١٣٢٠ - ١٣٢٢ قایمقام بوو. لە کاروباردا سست و بێدەسەڵاتبوو.

١٠- مستەفا پاشای ئەسلان زادە: خەڵکی شام بوو، لە دەورەی ئەودا فوئاد بەگی زابتی تورکی خەڵکی کەرکووک لەلایەن دوو پیاوی ئاغاوە کوژرا. خەڵکی ڕواندز و ئەشراف و گەورەکان تووشی چەرمەسەری بوون. هەموو گەورەکانی ڕواندز بەگیراوی ناردرانە کەرکووک و لەوێوە ڕەوانەی دیاربەکر کران. ساڵی ١٣٢٢ - ١٣٢٤ لەوێدا بەگیراوەیی مانەوە. لەو ڕۆژەوە ڕواندز تووشی وێرانی و شپرزەیی و نیفاق و تێکچوون بوو. کوژرانی فوئاد بەگ بوو بەمایەی یەکتر لە ناوبردنی خۆیی و نەگبەت. هەتا ئەمڕۆکەش لە کایە دایە. مستەفا پاشا لەسەر ئەو شۆرشە لە ساڵی١٣٢٣ عەزل کرا.

١١- تۆفیق بەگ: هەموو گەورە و سەردار خێڵەکانی کوردی سەر نەرمکردن و ساڵی ١٣٢٤ لابرا

١٢- عیرفان بەگ: کوردی دیاربەکر بوو. ساڵی ١٣٢٤ بوو بە قایمقامی. لەمەودا مەشرووتیەتی عوسمانی ئیعلان کرا، ئەویش لە مەیدانی ڕواندزدا خوتبەیەکی بۆ خەڵکەکە خوێندەوە کە میللەت ئازادە. گلوبێکی لە ڕواندز دامەزراند و لە دوای ساڵێک گەڕاوە دیاربەکر.

١٣- مستەفا نەجات بەگ: بێ کەڵک و بێ ئیدارەبوو. بەکەیف ڕایدەبوارد.

١٤- عومەر ئاسەف بەگ: بێدەسەلات بوو. ئەهالی ڕواندز سامیان لێ شکابوو، لە دایرەی حکوومەتدا لێیاندا

١٥- حەسەن حوسنی بەگ: چاکەی لە دەست نەهات.

١٦- عەلی نیازی بەگ: ساڵی ١٩١٤ بوو بەقایمقام. شەڕی جیهان لە دەورەی ئەمدا دەسپێکرا. ساڵی ١٩١٦ لە ڕواندز دەرچوو.

-١٧ مەزهەر بەگ: نەیاری کورد بوو. بەفەلاقە و دارکاری و لێدان گەورەکانی کوردی ئەزیەت دەدا.

١٨- شەفیق بەگ.

١٩- شەوکەت بەگ.

٢٠- عەلی نەشئەت بەگ: ڕەعیەت ئازاردەر و دوژمنی میللەت بوو.

٢١- مەسعوود بەگ: لە ئیدارە دوور و خەریکی کەیف بوو. کەوتە دەوری ئینقیلاب و زەمانی مەئموورانی بەریتانی بەسەر داهات.

***

## بەندی شەشەمین

## حکومداری مەعاونی حاکمانی سیاسی ئینگلیز لە ڕواندز

هەروەکو مێجەرهای لە کتێبە گرانبەهاکەی خۆی «دوو ساڵ لە کوردستان»دا گوتوویەتی، ئەوەی کە لە ڕواندز دواوە بەکورتی وەرمانگێڕا کە دەڵێت:

لە پێش شەڕی جیهاندا ڕواندز نزیکەی ١٠ هەزار سەر پیا و ژن و بازاڕێکی گەورە و چەند مزگەوتی تێدابوو. (لاپەڕە ١٩٢).

لە ساڵی ١٩١٦ ڕواندز لەلایەن ڕووسەکانەوە گیرا و هێندێک ئەرمەنی و ئاسووری و عەجەمیان لەگەڵدا بوو. گەلێک خراپەیان کرد و زیانێکی قورسیان لە خاکی ڕواندزدا و شارەکەشیان، جگە لە دوو سێ خانوو کە کردبوویانە سەرا، هەموویان سووتاند.

بەرامبەر بەو هەموو خراپەیەی کە کرا، هەموو خێلاتی ڕواندز و هەولێر و کۆیێ کۆبوونەوە و چوونە پێش ڕووس و هەڵمەتیان برد و بەزۆر ڕووسەکانیان لە ڕواندز دەرپەڕاند و ڕواندزیان گرتەوە.

بەڵام زۆری پێنەچوو تورکەکانیش ڕواندزیان بەردا و لێی دەرکەوتن و ڕواندزیان بێ حکوومەت بەجێهێشت. لە پاش دەرچوونی تورک لە ڕواندز، ئەوەندەی پێنەچوو، میللەت و ئەهالی ڕواندز تێکڕا مشەخت (مهاجر) بوون و هیجرەتیان کرد.

وا دیار دەکات لە ساڵی ١٩١٨دا ئەهالی لە سەدا بیستی نەماوە یا تەنها لە شاردا سەدا بیستی ماونەتەوە.

لە کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩١٨دا مێجەرنۆیل بۆ ئیدارەکردنی قەزای ڕواندز کرایە موعاونی حاکمی سیاسی. لە دوای داگیرکردنی ئینگلیز، ئەو پیاوە یەکەمین حاکمێکی ئینگلیزە کە لەسەر قەزای ڕواندز داندراوە.

مێجەرنۆیل کە گەیشتە ڕواندز بەتەڕدەستی ئیشوکاری حکوومەتی خستە دەست خۆی و مەئموورانی خۆجێیی دامەزراند و ئیدارەی ناحیەکانی دایە دەست ئاغاکان و مانگانەی بۆ بڕینەوە.

لە دوای میّجەر نۆیل ٣ کەس یەک لە دوای یەکتر بەموعاونی حاکمی سیاسی ئیدارەی قەزای ڕواندز داندران کە A. P. Oی ئینگلیزی بوون.

لە ساڵی ١٩١٩دا «کاپتان کرک» بەموعاونی حاکمی سیاسی قەزای ڕواندز دامەزراندرا. بەڵام کاپتان کرک وەختێکی هات و گەیشتە ڕواندز، ڕواندزی لە حاڵەتێکی شپرزەیی و خراپی و تێکچوونیدا چاوپێکەوت.

هەرای شێخ مەحموود کوردستانی شڵەژاند بوو. کوردەکان سەریان بۆ حکوومەت نەدەچەماند. نەمانگانەی ئاغاکان و نەموساعەداتی زراعییە دەیهێنانە ژێر ئیتاعەوە. لەگەڵ ئەوەشدا هەمیسان «نوری ئەفەندی کوڕی باویل ئاغا» ناو سەرۆکێکی پۆلیسان لەنێو شاری ڕواندز وا سەرکێشی دەکرد.

لەلایەکی دیکەشەوە لەلای ئامێدی (عیمارییە) هەرا و شەڕ و شۆرش دەستی پێکرابوو و حاکمێکی بەریتانیایان کوژتبوو. جا لەبەر ئەوە کاپتان کرک پێی نەکرا و نەیتوانی خۆی لە ڕواندز ڕابگرێ و بمێنێتەوە.

کاپتان کرک خواستی کە ڕواندز بەربدات و لێی دەرکەوێ، بەڵام گەورە و سەرهاتەکانی ڕواندز نەیاندەویست شارەکەیان بەبێ حکوومەت و حاکم بمێنێ، لەبەر ئەوە گەلێک لەبەر کاپتان کرک پاڕانەوە و تکایان لێکرد نەچێ و بەجێیان نەهێڵێت.

١٠ مانگی ئاغستۆسی ساڵی ١٩١٩ میّجەر کرک ناچاربوو ڕواندز بەردا و لەگەڵ دەستە و دایەرە و هێزەکەی خۆیدا چووە باتاس.

هێندەی پێنەچوو، کە گەورە و کاربەدەستانی ڕواندز، چوونە لای کاپتان کرک و خواهیشتیان لێ کرد کە بگەڕێتەوە ڕواندز.

کاپتان کرک نەیدەویست بێتەوە ڕواندز، بەڵام هەر هێندەی پێکرا «حاجی نەورۆز ئەفەندی» کردە وەکیلی خۆی و چەند مەئموورێکی بۆ دامەزراند کە یاریدەی بدەن.

جگە لە شێخ مەحەمەد ئاغای مەلا شەرەفی وەڵاش کە پاسی ڕێگای ئێرانی دەکرد، مانگانەی هەموو ئاغاکانی بری. (لاپەڕە - ١٩٤)

ئێوارەی ١٠ کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩١٩ میّجەرهای چووە ڕواندز. ڕۆژی دووەمین گەورەکانی شاری بانگکردن و پیاوانی وەکو شێخ محەمەداغای وەڵاش و حاجی نەورۆز ئەفەندی و کەریم بەگی کوڕی ئەحمەد ئەفەندی و محەمەد عەلی ئاغا و خەلیفە ڕەشیدی برای کۆکردنەوە و قسەی لەگەڵ کردن. (لاپەڕە ٢٠٨)

میجەرنۆیل لە چاغی خۆیدا یووسف بەگی برای بەگۆکی کردبووە سەرۆکی ناو دەشت کە حاجی نەورۆز ئەفەندی کرا بەحاکمی ڕواندز، یووسف بەگ کەمێک بێ هێزبوو و لە توانایی کەوتبوو. لەبەر ئەوە هەولّوتەقەلای دا کە ببێتە حاکم (لاپەڕە - ٢٠٨).

لە ١٢ی کانوونی یەکەمی ١٩١٩ مێجەرهای دەڵێ: لە دیوەکەی خۆم دانیشتبووم، دەنگە دەنگێکم بیست و هەراوهوریایەکم کەوتەبەر گوێ. پرسیارم کرد. گوتیان یووسف بەگە لەسەر چەند مەڕێک بەشەڕ هاتووە و بەگژ ئاغایەکی باپشتیاندا چووە.

هەردووکم بانگکردن. یووسف بەگ لەسەر ئەوە کە ئاغاکە قسەی خۆی تەواوکا ڕانەوەستا و بەدەمیدا چوو، منیش خۆم لێ توندکرد و توڕە بووم. یووسف هەستا کە بڕوا، فەرمانمدا بەسەید عەلی سەر پۆلیس کە بیگرێت، ئەویش دەستبەجێ یووسف بەگی گرت و لە دیوێکی کرد.

دووبارە فەرمانمدا بەسەید عەلی سەرپۆلیس کە لە نیوەشەودا یووسف بەگ هەڵگرن و ڕەوانەی کانی وەتمانی بکەن کە لەشکر بەزبوو، لەوێشەوە بۆ هەولێری بەرێکەن.

لە نیوەشەودا یووسف بەگیان دەرخست کە بیبەن، هاواری کرد. بۆئەوەی دەنگی دەرنەکەوێ و نەقیژێنێ بەمشکیەکەی سەری دەمیان بەست. تومەز نەشیاوە نەفەس بخواتەوە و خنکا.

لە پاش ئەوە کە یووسف بەگ بەو دەم بەستنە خنکا، بەپەنهانی لە کانی وەتمانێ ناژترا. (لاپەڕە - ٢١٣ - ٢٢٠)

مێجەرهای دەڵێ: کە ڕۆژی ١٥ی کانوونی یێکەمی ساڵی ١٩١٩ هەموو ئاغا و گەورەکانم کۆکردەوە و هورگەیەکم دامەزراند. ئیسماعیل بەگی کوڕەزای عەبدوڵلا پاشام کردە حاکمی قەزای ڕواندز و هەموویانم بەقورئان سوێندا کە یاریدەی بدەن و پشتیوانی بکەن. بەمجۆرە کاروباری ڕواندز ڕێکخراوە و گەڕامەوە هەولێر. (لاپەڕەی ٢٢٣).

هەر لە سەرەتای بەهاری مانگی مارتی ساڵی ١٩٢٠ لە ڕواندز و دەوروپشتیدا شۆڕش و پشێوی دەست پێکرا.

بارزانی و زێبارییەکان بەسەر ئاکرێ (عقر)یان دادا و تالانیان کرد.

عەشیرەتی سورچی بادینان و سورچی سۆران ڕێککەوتن و لە دەشتی حەریر پێک گەیشتن و یێکیان گرت و چوونە سەر ڕواندز.

کاپیتان «هۆجنسەن» لە ڕواندز بە ١٠٠ کەسێک و دەستە و پێوەندییەوە هەستا لەگەڵ

عەبدوڵڵا پاشا و ئیسماعیل بەگ و هەوادارەکانیان کەوتنە ڕێگا و بۆ وەڵاش چوون و لەوێوە بۆ دەربەندی ڕانیە و کۆیێ ڕۆیشتن و گەیشتنە هەولێر.

ڕۆژی ١٣ی ئەیلوولی ساڵی ١٩٢٠ شێخ مەزۆ و شێخ عەبدوڵڵا سورچی گەیشتنە ڕواندز و داگیریان کرد. بەوجۆرە ئەوەی لە دەست ڕووس و ئەرمەنی و ئاسووری ڕزگار بوون، ئەمجارە لە دەست سورچیەکاندا تووشی ئەزیەت و نەبوونی بوون. (لاپەڕە - ٣٢٤).

بەم ڕەنگە ڕواندز لە حاڵەتێکی زۆر سەخت و پشێویەکی گەلێک ناخۆشدا بوو و هەر ڕۆژە لە دەستێکدا پێبەست دەکرا.

## سەید تاها ئەفەندی

سەرە بەهاری ساڵی ١٩٢٣دا سەید تاها ئەفەندی نەوەی شێخ عوبەیدوڵڵای نەیری لە لایەن حکوومەتی بەریتانیاوە کرا بەقایمقامی ڕواندز. بەدەستوورێک کەم کەمە ڕواندز ڕووی لە ئاوەدانبوون کرد.

سەید تاها ئەفەندی چاپخانەی من و گۆڤارێکی لە ڕواندز دامەزراند کە گۆڤاری «زاری کرمانجی» بوو. ناردی ماکینەیەکی هەنگوین و ماکینەیەکی جووجەڵە دەرهێنان و کەرستەی ئاوریشمی هێنایە ڕواندز. قوتابخانەیەکیشی بۆ منداڵان دامەزراند و ڕۆژ بەڕۆژ ڕواندز ڕوو بەئاوەدانی دەچوو.

مانگی شوباتی ساڵی ١٩٢٤ من کە چوومە ڕواندز زۆر کەم خانووبەرە مابوون و کاولۆک بەجارێک وێران ببوو، بەڵام بەکەمە چاخێک ئەمنیەت و ئاسایش ڕووی لە ڕواندز کرد و ئاسوودەگی کەوتە خاکی سۆرانەوە، قەڵات ئاوەدانکرا و دوکان و بازاڕی تێدا بینانرا و خەڵک دامەزراوە. لە دێهاتەکاندا مودیری ناحیە و مەکتەب داندران، ڕێگای ئۆتۆمۆبیل دەست پێکرا. (١٣)ی مانگی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٢٨) سەید تاها ئەفەندی بەمەئزونیەت چووە ئێران و لەوێ مایەوە. کەریم بەگی کوڕی ئەحمەد ئەفەندی قەزای ڕانیە بەوەکیلی ناردرا ڕواندز، حکوومەتێکی مەدەنی لە ڕواندز دامەزراند و پۆلیسی ڕەسمی و ئیدارەیەکی قانوونی ڕێکخرا.

(٢٩)ی مانگی کانوونی دووەم سەید تاها ئەفەندی لە تارانەوە ئیستیعفای کرد، ڕۆژی (٢٣)ی شوبات وەزارەتی داخیلیەی عیراق بۆ تەحویلی کەریم بەگ فەرمانی دا. کەریم بەگ هێندە بۆ سەرکەوتن و بەرزبوونی ڕواندز نەکۆشا، تەنها بەسوڕەتێکی کەموکورتی

بۆڕی ئاو بۆ نێـو شاری ڕواندز ڕاکـێشـرا و چەند مـەکـتـەبێک هێنرایە ڕوو. لە مـانـگی ئەیلوولی سـاڵی (١٩٣٠)دا کـەریم بەگ بۆ کـۆیێ و ڕەزا بەگ لە شـارباژێڕەوە ناردرایە ڕواندز. مـانگی نیـسـانی (١٩٣٤) ڕەزا بەگ تەقـاعـود کـرا. ناجی بەگی هورمـزی بوو بەقـایمقـام، بەڵام زۆر نەمـاوە کـە بتـوانێ تا ئارەزووی چەند خزمـەتێکی کـە هەیبوو بەجێ بێنێ. قـایمقـامی غـەییـوری ئێستـاکـەمـان موراد بەگ لە دوای ناجی بەگ هاتە ڕواندز، لەو ڕۆژەوە، قەزا لە قەزا دوور و ئاسوودەیە، هەرچەندە ڕەوشتی دادخوازی و ڕەعیەتپەروەری و دڵسۆزی دەنوێنێ و بەچاکترین شێوە و تەگبیر بۆ ئاوەدانی هەرێمی ڕواندز و پێشکەوتنی تا بشتوانێ تەقەڵا دەدات، ئاوات و دڵخوازی ئێمەش ئەوەیە کە بۆ پەرای گەل و نیشتمان پایەدار و ڕاوەستاو بێت.

داماو حوزنی موکریانی

**سەرنج (١)**

دوای موراد بەگ عەبدولقادر ڕەشید و پاش ویش شێخ حەسەنی تاڵەبانی، ئیتر لە دوای ویش ئەوانەی خوارەوە یەک لە دوای یەکتریدا لە ڕواندزێدا بوونە قایمقام:

سەعید بەگ - مەردان بەگ - ئەحمەد دەبوونی - عەلی سەروەت - عەبدولقادر ڕەشید (دووبارە) - ئیسماعیل حەقی - عارف تاڵەبانی - داود سەلمان - بورهان بەگ - سامی عەلی - جەلال سەعید - فایق تۆفیق - سدیق عەبدولقادر - عومەر میران - بایزاغا - فەوزی بەگ - بەدرەدین عەلی - عەبدوساحیب غەرباوی.

**سەرنج و تۆمار (٢):**

میر محەمەد پاشای ڕواندز لەلایەن منداڵانەوە تەنها کچێکی (ڕابی) ناوی بووە و بەس، ئەویش لە هەرەتی جوانی و جحێلیدا لە پێش ئەوەی شوو بکات کە بیستی تورکان میر محەمەد پاشای باوکیان شەهید کردووە، دەستبەجێ لە تاوان ڕەوانی پاکی بۆ لای گیانی پاکی باوکی فڕی. لە بابەت میر محەمەد پاشای ڕواندزێ کە بە(میری کۆرە) ناوبراوە چەندین بیروڕای بەپێچەوانەی یەکتر هەن. پیرەمێردەکانی ڕواندز لەو لایەنەوە دوو دەستەن: دەستەیەکیان دەڵێن: لە ڕووی ئەوەوە کە یاسای میری گەورە قورئان بوو، هەرکەسێکی بەچاوێکی ناپاکییەوە تەماشای نامووسی ئەم و ئەوی بکردایە چاوی دەردەهێنا بۆیە (میری کۆرە)یان پێگوتووە. دەستەیەکیش لەسەر ئەوەن کە: بنەماڵەی میری گەورە چونکو لە بنچینەدا لەمەڕ گوندی کۆڕێ، بوون هەر بەمیری کۆڕێ ناوبراوە. کەوابێ لە کرک کردندا (تەلەفوز) ڕێی گەورە بەهەڵە گچکە کراوەتەوە. لە پارچە قاقەزێکی کۆندا کە تەنها بەروارانی مێژوویی زۆری تێدایە و ئێستا لەلامە وا نووسراوە: هاتنی محەمەد پاشا و تەمەر پاشای کۆیێ بۆ سەر ئەحمەد پاشا و شەڕکردن وان لە خوارەوەی گڵەزەردە و کوژرانی تەمەر پاشا و گیران و کوێرکرانی محەمەد پاشا بەدەستی ئەحمەد پاشا و مردنی ئەحمەد پاشا لە (١٧)ی مانگی ڕۆژووان لە قەراخی ساڵی (١١٩٢)دا لام وایە کە ئەو محەمەد پاشایە هەر میری گەورەیە، ئەگەر هەوبێت بیروڕای منیش لەم بابەتەوە ئەوەیە: نەتەوەی کوردان چەند سەدەیەکی ناوی (میر)یان لە جیاتی پادشا بەکارهێناوە. لە سەردەمی میر محەمەد و پێشتریش لە هەموو شوێنێکی کوردستانێدا میر زۆربوون، بەڵان لە ڕووی ئەوەوە کە میر محەمەد پاشا جاری سەربەخۆیی و ئاڵای ئازادی کوردستانی هەڵداوو بەخاوەن تاج و تەخت و سککە و پوول و پارە و

سوپا و هەموو جۆرە چەکێکی لە ڕواندز دادەڕشت، بەو هۆیانەوە گۆی پێشکەوتنی لە هەموو میرەکانی کوردستان بردبوو. لە گشتیان بەدەستەلاتر و بەهێزتر و پڕ شانوشکۆتر و گەورەتر بوو، بۆیی (میری گەورە)یان پێ دەگوت. هەروەکو هەموولایەکیش دەیزانن ئەودەمی پیتی (گ) نەبوو هەر بە(ک) دەنووسرا و پیتی (ە) لە دوای وشانەوە نەبایە لە جیاتی سەر (فەتحە) بەکار نەدەبرا، کەوایە (گەورە) بە(کورە) نووسراوە و بەهەڵەش کرکی پێ کراوە و ڕاستییەکەی میری گەورەیە نەک میری کۆرە.

**سەرنج (٣):**

بەگزادەکانی ڕواندز و باپشتیان و بادلیان و دەرگەڵە، لەو بنەماڵە بەرزەن؛ بەڵان ئیسماعیل بەگی کوڕی سەعید بەگی کوڕی عەولا پاشای کوڕی بەکر بەگی هی گوندی باپشتێن، زۆر لە پێش میر محەمەد پاشایدا لە خانەوادەی سۆران جوێ بوونەتەوە.

**بەروار (تأریخ)انی مێژوویی و پێویست**

- میر محەمەد پادشا لە ١١٩٨ ی کۆچیدا لە ڕواندزێ لە دایک بووە.
- میر محەمەد پادشا لە ١٨٢٦ز دا تەپڵی ئازادی و سەربەخۆیی لێدا.
- میر محەمەد پادشا لە ١٢٢٩ کۆچیدا لەسەر تەختی پادشایی دانیشت.
- میر محەمەد پادشا لە ١٢٤٧ ی کۆچیدا بەلەشکرەوە پەلامارێکی ناڕەوای بردە سەر برا کوردە یەزیدیەکان و کوژتاری لێکردن.
- میر محەمەد پادشا لە ١٢٤٦ ی کۆچیدا شاری هەولێری گرت.
- میر محەمەد پادشا لە ١٢٤٨ دا شەڕی لەگەڵ زێباریان کرد.
- میر محەمەد پادشا لە ١٢٣١دا لە ڕواندزی کاولۆکاندا کارخانەی تۆپ داڕژتن و چەک دروستکردنی دامەزراند.
- میر محەمەد پادسا ١٢٥٠ی کۆچیدا بناغەی دۆستایەتی لەگەڵ محەمەد شای قاجاڕ دامەزراند.
- میر محەمەد پادشا لە ١٢٥٢ی کۆچیدا خۆی بەدەست تورکانەوە دا و چووە ئەستەمبووڵ و لە گەڕانەوەدا شەهید کرا.
- کۆچی دوایی مەلا یەحیای مزووری بێگانەپەرست لە ١٢٥٤ی کۆچیدا.
- شەڕی بەدرخان پاشا لەگەڵ تورکان لە ١٢٦٢ی کۆچیدا.

- له دایکبوونی شێخ عەبدولقادری کوردی گەیلانی لە ٤٧٠ی کۆچیدا، تەمەنی ٩١ ساڵ و لە ٥٦٠ی کۆچیدا کۆچی دوایی کردووە.
- کۆچی دوایی شێخ عەبدوڵلای هەولێری لە ١٢٥٢ی کۆچیدا.
- کۆچی دوایی حاجی مەلا عومەرە ئەفەندی باوکی مەلا ئەفەندی هەولێری لە ١٣٠٩ی کۆچیدا.
- کۆچی دوایی سلێمان بەگی غازی کوڕی سلێمان بەگی بەبە لە ١٠٨٨ی کۆچیدا.
- گرانی لە ساڵی ١٢٧٦ی کۆچیدا.
- ڕشانەوە چاوقوڵکە (تاعوون) لە چاخی دەوڵەتی بارام پاشادا لە ١١٥٢ی کۆچیدا.
- ڕشانەوە (تاعون)ی گەورە و گرانی١٧١١
- چاوقوڵکە (تاعون) لە دوای قاتوقڕیەکی زۆر سەخت ١٢٤٣
- هێڵنج و ڕشانەوە ١٢٥٩.
- ڕشانەوەی جاری چوارەم ١٢٤٦.

**سەرنج** (٤):

لە دوای وەرگەڕانی دەوڵەتی سۆران، ڕواندز ماوەیەکی بەئەیالەت مایەوە، لە پاشان بوو بەقەزایەکی ٥٥ گوند و ٣ ناحیە و خرایە سەر سنجاقی شارەزوور و بوو بەیەکێک لە قەزایەکانی شارەزوور؛ بەڵان لە سەردەمی حکوومەتی مونتەدبەدا بوو بەقەزایەک و خرایە سەر لیوای هەولێر.

## سەر ئەژمێری پێشوو و ئێستای ڕواندز

بەپێی لیستەیەکی «قاموس الاعلام» بەرگی ٤ و لاپەڕە ٢٨٨٨ ئەودەمی ڕواندز ١٠ هەزار کەس بوو. ساڵی ١٩٣٥ لە سەرئەژمێری شاری ڕواندزدا ٢١٧٦ کەس بوون و قەزا بەهەموو ناحیەکانیەوە ٣٨٣٤٢ سەرە.

شاری ڕواندزێ لە پێشدا لە خوارەوە لەسەر ڕووبارێ بوو. کە پەرەی ئەستاند، سەرەوەش ئاوەدانکرایەوە کە بەقەڵات دەناسرێ. ئێستا مزگەوتێک و تەکیە و خانەقایەک و ٩ چایخانە و ٢ گەراج و دەستە دوکانێک و چاپخانە و مەکینەی پاکەت دروستکردن و چەندین خانو و سەرا و قوتابخانەی کوڕ و کچان و گومرک و بروسکە و چەپەر (پۆستە) و نەخۆشخانە و بەیتەری لێیە و لە زۆرترین ماڵاندا باخچەی جوان هەیە.

شاری ئەمڕۆکەی ڕواندزێ لە هی پێشوو گەلێک جوانتر و خۆشتر و خانووبەرەکانیشی گوشادترن. لە کاولۆکانیشدا چەند ماڵێکی لێیە. قایمقام کەریم بەگ ویستی کۆنە شار ئاوەدان بکاتەوە، بەڵام داخەکەم سەری نەگرت.

## موتەسەریفەکانی لیوای هەولێر

کە هەولێر کەوتە ژێر ئاڵای عیراق و بوو بە«لیوا» و ڕواندزیش کرایە قەزایەکی ئەم لیوایە، ئەحمەد ئەفەندی کوڕی عوسمان ئەفەندی کە پیاوێکی گەورە و لە یەکە بنەماڵە خانەدانەکانی هەولێرە، ئەمڕۆکەش لە مەجلیسی پیرانی عیراقیدا ئەندامە، بوو بەموتەسەریفی هەولێر. لە دوای وی مەجید ئەفەندی یەعقووبی کەرکووکی. لە پاش ویش حەمید ئەفەندی موسڵی و جەلال بەگی بابانی سلێمانی و لە دوای وانیش مەحموود فەخری میللی کەرکووکی و لە دوای وانیش پایەبەرز ئەحمەد تۆفیق بەگ بوو بەموتەسەریف و خاکی سۆرانی بەدڵپاکییەتی و میهرەبانی و ژێر دەستپەروەری و نیشتمانپەرستی و داد و مرۆیەتییەوە ڕووناک و ئاوەدان کردووە. ئەمڕۆکە هەموو دانیشتووانی لیوای هەولێر سوپاسی دەکەن و لە دادپەروەری و نیشتمانپەرستی وی سوپاسبژێر و خۆشحاڵن.

مێژووی میرانی سۆران بەناوی پیرۆزی وی و لە سەردەمی پڕ فەڕیدا کە بەخشڵی چاپی یەکەم ڕازاوەتەوە مایەی سەربڵندی و بەختەوەرییە.

ئەم پایەرزانەی کە لەدوای ئەحمەد تەوفیق بەگ لە لیوای هەولێریدا تا ساڵی ١٩٦٢ کراونەتە موتەسەڕیف ئەمانەن:

١- ساڵح زەکی بەگ ٢- مستەفا یەعقووبی ٣- مستەفا قەرەداخی ٤- سەعید قەزاز ٥- شێخ حەسەنی تاڵەبانی ٦- ڕەشید نەجیب ٧- جەمال عومەر نەزمی ٨- نەجمەدین سایب ٩- عەبدولحەلیم سنەوی ١٠- ئیسماعیل حەقی ١١- مستەفا یەعقووبی ١٢- خالید نەقشبەندی ١٣- عەلائەدین مەحموود ١٤- بەدرەدین عەلی.

# کوردستانی موکریان
# یا
# ئاتروپاتین

ئازەربایجان

کردەوەی

**حوسێن حوزنی**

لە سەرەتای تاریخەوە هەتا سەیفودین موکری
سالانی ٨٧١ھ/ ١٤٦٦م

چاپی یێکەم

KURDSUTANI MUKURI

ATR U PATIYN

( Azirbayjan )

Le sefetey tariykhewe Hata Sayfaddiyni Muku rly

Salaniy 87 9 H 1466 M Husêin Huzni Mukuriyani

بەناوی خوداوەندی بەخشندە و میهرەبان

لە دوای سوپاس، گەلێک مێژووی کوردانمان بەسیپارەیی چاپ و بڵاوکردنەوە. بەڵام ئارەزوومان ئەمەبوو، بەچاکی لە مێژووی کوردستانی موکریان ئاگادار دەبین. کە وردبووینەوە بەبێ زانینی تەئریخی «ئاتروپاتین» لە خاکی موکریان گەیشتن زۆر دژوارە؛ ناچار بەتێکەڵاوی ئەم کتێبەمان دەست پێ کردووە و ناومان لێنا «کوردستانی موکریان» یا «کوردی ئاتروپاتین».

نووسەر بۆ گەیشتنە دڵخواز ١٥ ساڵ پتر خەریکی کۆکردنەوەی داوە پۆو هەودای بڵاو و لەملا و لەولا کەوتووی پەراگەندە و پەرێشانی ئەو بوو. هەر هەودا و پۆێیکی لەلایێکەوە کەوتبوو، گردم کردەوە و لێکم گرێدا و گەیاندمەوە یەکدی. بۆ ئەوە دوو چتی زۆر زل لەبەرچاوم بوو:

١- نووسینەوەی مێژووی کوردستانی موکریان بەهۆی گەلێ کتێب و نووسراوانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا و تەماشاکردن.

٢- یەکسەرە لە سەرچاوەکان (منبع) وردبوونەوە و کۆکردنەوەی ئەو سەرچاوە بڵاوانەی کە هەریەک بەلایێکدا پەرشبوون. وا نەبووە کە ئەوەش یەکێک لێی دوابێ. هەریێک بەپێی هەڵکەوتنی و بەسەر داهاتنی لە هەزاران سەربهورداندا دێرێک لە هی کوردستانی موکریان دەستکەوتبێ، کە بەپێی هاتن و چوونی خۆیان لێی دوابن و باسیان کردبێ.

هەروەکو لە دەورانی گەلێک دووری پێش ئیسلامیدا، ئاسووری و کلدانی و میسری و یۆنانی و ڕۆم لە هاتووچوون و شەڕ و کێشەیاندا لە کوردانی ئاترۆپاتین و لە دەوری ئیسلامدا مێژوونووسەکان بەهۆی هەڵکەوتن و شەڕ و زاڵبوون و هاتووچوون و ڕابیتە و ئاسایش و داوا یارمەتی و پشتیوانی، لە کتێبەکانی خۆیاندا سەربهوردیان نووسیوونەوە و هێندێک مێژوو یا جوغرافیای ئەقوام و خاکی ئاتروپاتین و ئاسیایان کە نووسیوە لە ڕیزی ئەقوامی ئاریانیدا لە کورد کە دوابن، کوردی ئاتروپاتین کەوتۆتە بەرچاو، ئەویش زۆر بەوردبینی نەبێ نابیندرێ و ئەویش زۆر پچڕپچڕ و بڵاو و شپرزەیە.

ئەوانەی گوتراو ئەوەندە بڵاو و شپرزە و بێ سەروبەرن و کەموکورت دەتواندرێ بگوترێ کە هاتوونەتە پایەی لە بیرچوونەوە و ونبوون. بۆ کۆکردنەوە و پێکەوەنووساندنیان ڕەنج و

ئەزیەت و ماندووبوونێکی زۆر و بەسەربردنێکی دوورودرێژی دەوێ. لەگەڵ ئەوەشدا چەند هەزاران کتێب کە بەزمانانی لێک جودا لە عەسرانی پێش ئیسلامەوە تا ئەمڕۆکە نووسراونەوە و هیچ کامێکیان نەکراونە کوردی و کۆکردنەوەی ئەو هەموو کتێب و نووسراوانەش لە هێز و تەوانایی و بەدەستەڵاتی ئێمە بەدەرە و دەموچاخ و سەرمایەش نەهێلەر و دەست و زمان گرێدەرە، کە پەردەی کەموکورتی لابرێ و لەسەر بنەچەکەییێکی جوان و خاوێن و توند ڕێکخرێ و کتێبێکی شایان و بەڕێز بێتە پێشەوە. دەورو عەسرەکانی ڕابردوو، ئێستا زۆرچاک لەبەرچاوانن کە لە چی تەمومژ و تاریکیدا تواندراوە. ئەم مەعلووماتەی تەئریخیە، کۆکرێتەوە و ئەم کتێبە بنووسرێتەوە و بخرێتە ڕوو (بەبێ ئەوەی ک ئاشکرا بووبێ موەفەقییەت تا چ پایەیەک ڕووی داوە).

ئەمەش نادیار نییە کە تەنها کەسێک نەشێ و لە تەوانایدا نییە، مێژووی ئەو هەموو عەسرە تاریک و شپرزە و بڵاوەی کورد کۆکاتەوە و بیکاتە پەراوێ (کتێب)؛ نووسەریش لەوە ئاگادار و دڵنیایە. بەڵام گوتراوە «ئەگەر هەمووش نەزاندرا با هەمووش بەرنەدرێ». لەبەرئەوە تەقەلا درا بەهەر جۆرێک بوو. هەموو ئەزیەت و سەرئێشە و ناگوزیرێکم خستە مل؛ هەرچی لەدەست هات کۆششم کرد ئەم کتێبە لە ڕۆژی ناسینی تەئریخەوە تا ئەمڕۆکە بەپایانم گەیاند و کردمە ٣ بەش:

بەشی یێکەم لە ناسینی تەئریخەوە تا دەوری سەیفودین موکری ساڵی ٨٧١هـ ١٤٦٦م
بەشی دووەم لەو تەئریخەوە تا دوایی هاتنی حاکمانی موکری بەشی سێیەم هەتا ئەمڕۆکەیە.

نووسەر زۆرچاک ئەمەی زانیوە کە ئەم کتێبە لە کەموکورتی و لە چەوت و خواری نەپارێزراوە. تێگەیشتووەکان بەچاوی میهرەبانی کە وردبنەوە، ئەو گوناهە لە ئێمە ناگرن و دەیهاوێژنە سەر کەچی زەمانە و دەست نەڕۆیشتن. پشتیوانی لە خوا دەخوازم.

ڕواندز - کانوونی دووەم - ١٩٣٨

حوسێن حوزنی

# بەندی یێکەمین

## جوغرافیای کوردستانی موکریان و شێوە و ڕەوشتو

## دەستوور و زمان و خوویان

زەوی و خاکی ئەمڕۆ کە ناوی موکریانە، خاکێکی زۆر بەپیت و بەرەکەت و حاسڵخیزە و کەوتۆتە جنووب و جنووبی شەرقی و شەرق و جنووبی غەربی گۆلی «ورمێ»وە؛ بەڵام لە پێشدا بەخاکێکیان گوتووە کە خاکی مادی بچووک بووە؛ ئەمڕۆکە ئەیالەتی ئازربایجانی ئێرانی پێ دەڵێن، هەروەکو لە هاتوودا دێتەگوتن.

**کێوەکانی موکریان:** ئەو کێوانەن کە لە شیمالی غەربی بۆ جنووبی شەرقی ڕاکشاون و ریزە کێوێکن بەچاکی بەرامبەر بەکێوە بەرزەکانی زاگرۆس ڕاوەستاون و لێک گرێدراون و پێکەوەنووساون. لە پێکەوە بوونی ڕشتەی زاگرۆس پێکەوە و لەنێوانی یەکدا ڕاکێشراون. بەهۆی شێو و دۆڵە گەورەکان و چۆمەکانەوە لێک پچڕاونەوە و بوونەتە دوو کەرت و بوون بەدوو کێو.

**کێوەکانی ڕۆژئاوا:** گەلێک توند و سەخت و دژوارن. لە ڕۆژهەڵاتەوە نزم و ئاسان و بەر پێ خۆشن. بەبەرزی نێوەنجی کێوەکان ۳۲۰۰ مەتر دەبن و سەرقوچکە و تەپڵەسەری ئەو ڕشتەیە کە لە نێوانی مەزرای «شنۆ» و «ئالان» دایە و یەک یێکە و لێک نەپچڕاوە و هەڵکەوتووە ئەمانەن: چیای ڕەش، کێوی سپی، بارزین، کانی خولا، قەندیل، باقر، حاجی برایم. جگە لەوانە چەند شاخی قووچی دیکەش هەن کە ساڵی دوازدە مانگ و پترین مانگانی ساڵ ئەو کێوانە بەبەفر داپۆشراون و کوێستانێکی زۆرخۆش و ڕەنگین و جوانن.

لە نێوانی گەردنی کێلەشین و ئالاندا، ڕشتە کێوەکانی موکریان، خاوەند ڕێکوپێکی و وێچوێکی زۆرجوان و خاوێن. ڕاکێشراویان لە شیمالی غەربیەوە بۆ جنووبی شەرقی خوار بۆتەوە و ریز ڕاوەستاون. لێک پچڕانەوەیان لە «ئارارات»ەوە لەگەڵ کێوەکانی «زەهاو» و «لوڕستان»ە.

له ڕۆژهەڵاتی موکریاندا دوو ڕیزە کێو هەڵکەوتوون، یەکیان ناوی «بەردەسێر»ە و هی دووەمیان ڕشتەی موکریانە. لە بەرامبەرەوە وەکو یەکدی هەڵکەوتوون. گەرووی چۆمی «چەخەتوو» لێکی پچڕیون. ڕشتەی کێوی بەردەسێر چۆمی «تەتەهوو» دڕیویەتی و کردوویەتە دوو لەت. کلکەی ئەو ڕیزە شاخە بەناوی کێوی «کورتەک» دەناسرێ و هەتا شاری سابڵاخ و جنووبی گۆلی ورمێ ڕاکشاوە. درێژیی کێوی بەردەسێر، لە شیمالی غەربییەوە بۆ جنووبی شەرقی بەکەمێک خواربوونەوە ڕووی بەڕۆژهەڵات درێژ بووە و ڕاکشاوە.

ئەو ڕیزە کێوانە شایانی ئەهەمیەتە بۆ بەشکردن و هەڵکەوتنی. بەڕاستی هەموو ئاوەکانی کوردستان لەو ڕیزە کێوانە هەڵدەقوڵێن و لەوێوە بەبەشکردن دێنە خوارەوە. دامێنی ڕۆژهەڵاتی ئەو کێوانە ڕوو بەسەرەوژێری، هەموو نەرمایی و بەرپێ خۆش و ئاسان و چایەر و لەوەڕباش و جوان و زۆر بەرزە و بەگەرووی ڕێڕەوی چۆمی چەخەتوو دوایی دێت. ئەو کێوانە دەکشێنە سەر چۆمی چەخەتوو و دامێنی دوایی پێ دێ. کە ئەو چۆمە کەوتۆتە دامێنی ئەو کێوەوە، لە ڕۆژئاوای ئەو، گەلی «گەروو»ی چەخەتوو و چۆمی «زێ» (زاب)ە.

شاخی بەرز و کێو قوچەکانی سەر تەپڵە و کەللەسەرە بەرزەکانی ئەو ڕیزە کێوە ئەمانەن کە دینەگۆتن. شوان، بریان، پاڵانسەر، داڵانپەڕ، شیرنستان، کوردتەک، کێوی یاقوباغا، ملەی کێلەشین.

ڕێبواری زێی گەورە ڕوو بەڕۆژئاوا لە جێگا بەکلکی کێوەکانەوەیە، ئەویش لە ڕیزە کێوی بەردەسێر هەڵکەوتووە. زێی گەورە ڕوو بەڕۆژئاوا دەچێتە خوارەوە، بەڵام سەرچاوەکانی ئەم چۆمەش هەر سەری ئەو کێوانەیە کە لێی هەڵدەقوڵێ. شاخ و قوچکە و بەرزی ئەوان ئەمانەن «کێوی تەکڵوو» کە گەلی و چۆمی چەخەتوو لە چۆمی سەقز کە قۆڵکی چۆمی چەخەتووە لێکی جوێ دەکات و دەیپچڕێنێ.

کێوەکانی کە لە خاکی موکریان هەڵکەوتوون، ئەوانیش کلکەی پێچ و چین بەچینی خواروخێچی و ملەکانی کێوی بەردەسێرە کە بەنێو خاک و زەوی ئەو پارچەدا بەهەموو لاییێکدا بڵاوبۆتەوە و ڕاکشاوە و قوچکە بەرزەکانی ئەوەبوون کە لە سەرەوە گوتران. کێوی تەکڵوو و کێوی «وەنەوشە» لە نێوانی چۆمی «خاڵۆ» و چۆمی تەتەهوودا هەڵکەوتووە. کێوی «پارشان» لە نێوانی چۆمی خاڵۆ و چۆمی تەتەهوو دایە، کێوی «سورمتان» لە شیمالی سەرچاوەی تەتەهوودایە.

بەپێی ئەوە دەتوانین کێوەکانی موکریان بکەینە دووبەش. یەکێکیان: چیا گەورەکانن کە لە شیمال و شیمالی غەربی بۆ جنووب و جنووبی شەرقی ڕاکشاون و هەموویان خاوەند قوچکە و شاخ تیشەی زۆر بەرز و بڵند و ڕیز و ناسراو و بەناوبانگ و دیارن.

هی دووەم: چین و پێچوخواری کێوەکانی دووەمن کە لە ڕۆژئاواوە بۆ ڕۆژهەڵات لای کێوەکانی گۆڕیوە. ئەم کێوانەش لەژێر تەئسیری تەنگەتاوکردنی زۆرگران و سەختی ئاورپژێنی کێوی «سەهەند»دا وەرگەڕاوە و ڕاگیراوە. لای دووەمی ئەوانەش دیسان تووشی گەلێک ئەمدیو و ئەودیو، وەرگەڕان و گۆڕان بووە.

## چۆمەکانی کوردستانی موکریان:

لە کوردستانی موکریاندا بۆ ڕۆیین و چووینی ئاوەکان دەتواندرێ دوو لایان بۆ دابندرێ. یەکیان لای شیمالی ڕۆژهەڵات کە چۆمەکانی ئەولایە عیبارەتن لە چۆمی چەخەتوو و تەتەهوو؛ هی لای دووەمی لای جنووبی غەربی، تەواو ڕۆژئاوایە کە پێی دەبێژرێ کانیی زێی (زاب) بچووک، کە ناوی پێشووی «کیالووی» و بەکوردی زێیە.

چۆمەکانی موکریان چونکە کێوپارە و بەرزونزم و بڵند و نەویە، لە دوو لاوە لە ڕۆیین و خشاندایە؛ یەکیان شیمال و دووەمیان جنووبی غەربییە. چۆمەکانی شیمالی بۆ گۆلی ورمێ و چۆمەکانی جنووبی غەربی بەهۆی زێ (کیالووی)یەوە دەڕوات و دەڕژێتە دیجلەوە.

**حەوزەی ورمێ:** لەبەرئەوەی کە سەرچاوەی چۆمەکانی لە کێوە بەرز و بەفراوییەکانی بەردەسێر و چلچاوە هەڵدەقوڵێن، چۆمەکانی هەموو دەمێ پڕ لە ئاون و پڕن و ڕێگای ڕۆیشتنی ئاوی ئەو چۆمانە، چونکو شۆڕەکات نییە و بەسەر خاک و زەوی جواندا دەخوشن، ئاوی چۆمەکانی شیرین و ڕوون و سووکن. گەورەتری ئەو چۆمانە، چۆمی چەخەتوو و تەتەهوون.

چەخەتوو ناوی قەدیمی چۆمی زێڕین (زەڕین رود)ە. لە دەوری مەغۆلەکاندا ناوی گۆڕدراوە و کراوەتە مەغۆلی و پێیان گوتووە چەخەتوو. ئەو چۆمە بەدرێژایی ٢٤٠ کیلومەترە کە نزیک ٣٧ فرسەخە لە چلچاوە و سەرچاوە وەردەگرێ. لە جنووبەوە بۆ شیمال دەخشێ و دەڕواتە خوارەوە. بەشی بەرزی ئەو چۆمە، چۆمی خوڕخوڕەیە. بەشی موهیمی لەلای چەپەوە چۆمی سەقزە کە ئاوی کانییەکانی کێوی بەردەسێرن و ڕوو بەسەقز دەچنە خوارەوە. لە دوای ئاودێری و تێراوکردنی ئەو خاک و زەوییەیە بەبانی مەیدانێکی

فــرەوبەرین دادەگــرێت و دەڕوا و تێکەڵ بەچۆمی چەخــەتوو دەبێ و قــوڵێکی گــەورە دادەمەزرێنێ.

**چۆمی چەخـەتوو**: لەو جـێگایە کـە لەگـەڵ چۆمی سـەقـز دەگـەنە یەکـدی تا جـێگای تێکرژانیـان، لە لای چەپیەوە قـوڵێکی دیکەی زلی نییە. بەڵام لەلای ڕاستـەوەی هەمـوو ئاوەکانی کێوانی «قودا، سارۆ» دەچنەخوارێ و تێکەڵ بەو دەبنەوە. قوڵانی دیکە بەناوی «لەیلان، سارۆق» لە دامێنی سەهەندەوە دێنەخوار و لە هەوشارەوە سەرەوژێر دەبن و نزیک تێکەڵبوون تێکدەرژێن و لەگەڵ چەخەتوو دەبنە یەک چۆم و بۆ گۆلی ورمێ دەخشن؛ ناوی چەخەتوو دەکەوێتە سەر. لە شەرقی شیمالی و شیمالی شاری میاندوا و سەرەوژێر دەڕوا و دەرژێتە گۆلی ورمێوە.

ئاوی ئەو چۆمـە گەلێک خـۆش و شـیرین و پڕ سوودە و هەمـوو خـاکی دراوسێکانی کە بەسـەر خـاکـیدا دەڕوا، ئیسـتفـادەیەکی قـورسی لێ دەکـەن، بۆ کـردار و باخ و باخـچـە و شیناوەردی، بەند و جۆگەی گەورەیان هەڵبەستووە و بەکاری دەبەن. بەڵام ئاوی ئەو چۆمە پتری بۆ کوردەکـانی «ساین قـەڵا» خێر دەداتەوە. ئەوان لە هی دیکە پتر زەویوزاری لەبەر دەکـەن و بەکـاری دەهێنن، بەند (سـەد)ی زۆر زلیـان لێ هەڵگرتووە و بەسـەر ئەو خـاکـە حاسڵ خیزەدا بڵاویان کردۆتەوە و ئاودێری دەکەن.

**چۆمی تەتەهوو**: ئەو چۆمـە ناوی پـێشـووی بالارود، ڕووباری باڵابووە. لە سـەرچاوەوە تاکـو دەرژێتـە گـۆلی ورمـێـوە کـورتە و کـەم ئاوتریشـە لە چۆمی چەخـەتوو. ئەو چۆمـە لە گـەلیـێـکی زۆر قــووڵ و تەنگەوە دەچێت و ڕیزە کـێــوی کـورتەک و بەردەسـێـر لە یەک دەپچڕێنێ و دەڕواتـە خوارەوە. لە لای چەپەوە چۆمی «ڕەش» کە چۆمی سـابڵاخـە و لەگەڵ چەند چۆمی بچووکی دیکە لە جنووبەوە بۆ شیمـال دەچنە خوارەوە و لە نزیک تێکرژانیـان تێکەڵ دەبن و دەچنە گۆلی ورمێوە.

ئەو دوو چۆمـە زلانە کـە چەخەتـوو و تەتەهوو یا بەناوی خـۆیان چۆمی زێرین و ڕووباری باڵابن، لەبەر شیرینی و خوشئاویان و بێ خوێ و سوێر نەبوونیان ماسی زۆر گەورە و زل و چاکیـان تێـدایە، بەڵام لەبەر گـوێنەدان و خـۆ تێنەگـەیاندنیـان و بێ خۆ لێ مـاندووکـردنی ئەهالی ئەو دەوروپشـتـەی هەردوو چاک نەیـان کـردووە بەپیـشـە و ڕاوەمـاسی لێ ناکـەن؛ بەدبەختانە لەو گەنجینە پڕ پیتزە سوودمەند نابن.

**حەوزەی دیجلە**: ئاوی بەشی جنووبی غەربی کوردستانی موکریان کە سەرچاوەیان لە زۆر

کێـوانەوە دەردەکـەوێ و دەڕوا و یەکـدی دەگـرنەوە و چۆمـی زێـی (کـیـالووی) بـچـووک دادەمەزرێن و کۆدەبنەوە و بەڵێشاو لە کێوەکانی جنووبی غەربییەوە دەچێتە خوارەوە و دەڕوات.

قووڵی و پڕ ئاوی کیالووی: لە سەرەتادا لە تەپڵەسەری (مەیدان) کە ٣١٤٠ گەز بەرزە، سەرچاوەکانی کانی سەرچاوەیەتی کە هێندە بەرزە. ئەو بەشە لە بەربوونی کیوی «لگبن» کە ١٥٦٠ گەز بەرزە و لە لای چەپەوە گەلییێکی بڵند و بەرز هەڵکەوتووە کە چۆمێکە پێی دەڵێن چۆمی لگبن. لە دوای ئەوە کە لە کێوەکەوە دەچێتە خوارەوە و بەلای جنووبدا پێچ دەخوا و خوار دەبێتەوە، لە دۆڵێکی خواروبەریندا پان دەبێتەوە و لە نزیک دێی «کاسەکەران» تێکەڵ بەچۆمی لاین دەبێ و دەچێتە خوارەوە. گەلێک چۆمی بچووک لە ڕاست و چۆپی خۆیانەوە هەڵدەگرن و دەست بەڕۆیین دەکەن.

کە دەگاتە سەردەشت لەناحیەی سەردەشت کە لە بەرزیدا لە هەزار گەز کەمتر نییە و دەچێتە خوارێ. لەوێدا بەکیالووی دەڵێن «گارفین». ئەو چۆمە لە سەرەتادا چۆمی مەیدان کە لە کێوەکانی غەربی سابلاخ دێتە خوارێ پێی دەڵێن چۆمی مەیدان. لەوەبەرەو خوار پێی دەڵێن چۆمی لگبن. لە لای ڕاستەوە چۆمی «لاوین» کە لەگەڵ چۆمی لگبن تێکەڵبوون، کە چووە خوار پێی دەڵێن چۆمی «ترکەش». کە نزیک سەردەشت بوو پێی دەڵێن: «کەڵوو». لەوە چووەخوار «گارفین»ی پێ دەڵێن. کە کەوتە دەشتی دیوی کوردستانی عیراقەوە پێی دەڵێن زێی کۆیێ، بەڵام هەموو ناوی زێی کیالووی یاخود زابی بچووکە.

چۆمی کیالووی کە گەیشتە ناحیەی سەردەشت زۆر توند و تیژڕەوێکی وایە کە لە دەوری ١٦ فرسەنگدا ٥٦٠ گەز بەرەو ژێر دەچێتە خوارەوە. لە دواییدا کە لە ناحیەی سەردەشت تێپەرێ، دووبارە ڕوو بەڕۆژئاوا دەخشێ و لە کێوە گەورە و بەرزەکانی ڕۆژئاوای دەربەندی ئالان و جنووبی دەشتی هەولێر تێدەپەڕی و تێکەڵ بەدیجلە دەبێ.

**قۆڵی گەورەی چۆمی کیالوو:** چۆمانی «پەزاوە» و چۆمی «لاوین» و چۆمی «مسین» و ڕووباری بچووک و چۆمی گچکۆڵەکانی دیکەیە. لە سنووری ڕۆژئاوای جنووبی شنۆوە ڕوو بەڕۆژهەڵاتی جنووبی دەخشن و دەچنە خوارێ و تێکەڵ بەیەکدی دەبن و کۆدەبنەوە و چۆمی (کیاڵووی) زابی بچووک دادەمەزرێن و دەڕۆن.

هەروەکو لە پێشدا گوتران چۆمی مەیدان (مەیدان بەڵەک) و چۆمی لگبن دەبەن و وێڵی وڵاتان دەبن و دەست لە زێدی (وطن) خـۆیان بەردەدەن و بەری خـۆیان دەدەنە خـاکی

گەرمێن و دەشت و چۆڵان. لە لای ڕاستییەوە قۆڵی گەورەتری چۆمی کیالووی چۆمی «بانە»یە. لە دوای خاکوزەوی بانە ئاودێر و تێراوکردنی دەچێتە خوارێ و لە نزیک سەر دەشت لە شیمالی ڕێبازی «ئالان» تیکەڵ بەکیالووی دەبێ و لەوێدا کیالووی زۆر بەگەورەیی دەڕوات.

دۆڵ و گەلی بەرزی زێی کیالووی لە دوو لاوە دوو ڕێزە کێوی بەرزی داگیر کردووە. ئەو چۆمە ماددەی نەرمی و سستی و شلی کێوەکانی دەگەڵ خۆیدا بردووە و لە دۆڵی نێوانی دوو کێوی تێک پەستاوتووە و سەرلەنوێ لەو تێک پەستاوتووەدا، ڕێی چووینی بۆ خۆی کردۆتەوە. لە بەشی نێوەنجیدا فرەییێکی زۆرە و سەرەوژێری و لێژی و خواری گەلێک لەسەر خۆترە و نەرم و هێمن دەخشێ و لە چوونی دا باشە.

لەو مەیدانی چووینی کیالوویدا کە ئاوەکانی تێکەڵ دەبێ و لە کێوە بەرزەکانەوە بۆی دەچێتە خوارەوە و کۆ دەبنەوە و بەیێکەتی و کوومی دەڕۆن، هەریەک لەڕاستی خۆی ڕیزەی گرتووە و دەڕوا هەتا دەگەنە زێێ. پانایێکی فرە و شایانی چاندن و کرداری پەیدا کردووە. ئەوە بەکانی زێڕین کرداری موکریان ئەژماردراوە و بەمەعدەنی تەلا و بۆ گەلێک ئیشی بەکەڵک بەکاری دەبەن.

**خاکی کوردستانی موکریان**: بەو خاکە دەڵێن کە کەوتۆتە نێوانی گۆلی ورمێ و سنە و گەڕۆس و زابی گەورە و دیالە و کێوەکانی هەورامانەوە. بەڵام ئەمڕۆ لە جنووب و لە جنووبی غەربی گۆلی ورمێوە بەسەر سنووری ئێران و عیراقدا تاکو دەچێتە شاخەکانی هەورامان، لە شەرقەوە بۆ شیمالی شەرقی بەپشت تێلەکۆ و ساین قەڵادا دەخشێ، لەبەر مەراغەوە تاکو دەگاتە ڕۆژهەڵاتی جنووبی گۆلی ورمێ. خاکی موکریانی ئەمڕۆ، ئەو خاکە خاکی مادی بچووک، ئاترۆپاتەگان (٤٠٠ ساڵ ق.م)ەوە و هیچ جوێ نەبووە و بچووک نەکراوەتەوە. کە تەماشای خەریتەی پێش میلادی عیسا بکرێ، شاری ساباڵاخ ناوچەی موکریانە. لە ڕۆژهەڵاتییەوە سەقز، لە جنووبییەوە سەردەشت، لە جنووبی ڕۆژهەڵاتی بانە، لە ڕۆژئاوای شیمالییەوە شنۆ، لە شیمالەوە گۆلی ورمێ، لە ڕۆژهەڵاتی شیمالییەوە ساین قەڵا داخیلی موکریانی ئەمڕۆکەیە؛ هەروەکو لە باسی چۆم و کێوەکاندا باسکران.

لە دەوری مادیەکاندا بەو خاکەیان گوتووە «مادی بچووک» و لە پاشا بەخاکی ئاترۆپاتەگان (ئازربایەجان) ناونراوە کە ئەمڕۆکە بەموکریان ناودەبرێ.

## ئابووری (إقتصاد) کوردستانی موکریان:

کوردستانی موکریان خاک و سەر زەوییێکی زۆر پوخت و بەپیّز و کردار و پڕ سوودە. کێو و دەشت و دۆڵ و تەپە و گرد و شیو و نەوال و کەل و ملە و لاشیوە بەرزونزم و بڵندونەویەکانی، شین و خۆش و بەچایەر و جوان و ڕەنگینە و هەموو جێگای کێڵگە و چاندن و بەکاربردن و شایانی تێدا کۆشان و تەقەلادانە.

چۆم و جۆگە و ڕووبار و بەندە پڕ ئاوەکانی شایستەی بەکارهێنان و بەخۆڕایی نەچوینە. بۆ چاندن و جووت و ڕەنجبەری، کانی گەوهەر و خاکی زێڕاوییە. بۆ گەنم و جۆ و دانەوێڵە و مێگەڵە مەڕ و چار و پێڕۆ بەخێوکردن بێ وێنە و ئامادەیە؛ خاکەکەشی بۆ پێگەیاندن و بەخێوکردن زۆر پەسند و سازە بۆ ئیشوکار و کەم تێدا ماندووبوون.

**کان (معدن)**: کانی گرانبەها و بەسوود و پڕ بەهەرەی بێ ژمارە. لێڕەوار، میشە، جەنگەڵ، دارستانی گەلێک هەیە و خاکی ئامادەیە بۆ ناژتنی داری بەبەر و چاک و هەموو ڕەنگەی زۆرە. بۆ پێگەیاندنی گیای کیمیایی و گیای خواردن و گیای سەنعەتی گەلێکە و بەتایبەتی باڵندە و پێڕۆ (حیوانات)ی کێوی بۆ ڕاوکردن هێندە هەیە نایێتە ژمارەوە کە لە کەوڵ و پێست و گۆشت و پەڕ و تووکی ئیستفادەیێکی قورس دەکرێ.

بەڕاستی کوردستانی موکریان، چاکترین خاک وزەوی و ئاوی هەیە بۆ بەکاربردنی و تێدا کۆشان و بەپیت و پیّز و بەسوودترینی خاکی کوردەکانی دیکەیە. دەستی تەبیعەت لە دروستکردن و ڕێکخستن و دانانی کانی گرانبەها لەو خاکەدا کورتی و لەچەڕی نەنواندووە، زۆر بەدڵسۆزی سەروەت و چتی بەقیمەتی تێدا داناوە و بەکەم بزووتن و هێندێک ڕوو تێکردن و تۆزێک ماندووبوون، هەموو چتێکی دەداتێ. پیاو زۆرکەم تەقەلا بدا و تۆزێک بۆی ماندوو ببێ و هێندێک خەریکی بێ، لە هەموو خاکەکانی دیکە پتری دەداتێ؛ دانەوێڵە و چاندنی زۆرچاکی لێ پەیدا دەکا و زۆر تێیدا دارا و بەختەوەر دەبێ. ئەگەر لە کێوەکانی بەرز و سارد و لە گرد و شاخە فێنکەکانیدا مەڕوبزن و چاوڕ و ئەسپ و گا بەخێوکا و داری لێ بچەقێندرێ، ئاووخاک و هەوای هێندە ساز و ئامادە و بەسوودە، زۆر سەروەت و سامانی پێ دەبەخشێ و دەوڵەمەندی دەکا. بەڵام کۆشش و تەقەلایەکی کەمی لەسەر بکا و تێیدا بجووڵێت و ببزوێ و بۆ دەستی تەبیعەتی نەهێڵێ زوو بەئارەزوو دەگا.

ئەگەرچی گەورە و خاوەند موڵک و دێهاتەکانی کوردستانی موکریان لە بەخێوکردن و

بەکـــاربردنی ئەو خـــاک و ئاووهەوایە چاویان نەقـــووچاندووە، بەڵام بەچاکی حـــەقی بەکاربردنیان پێنەداوە. هەرچەندە زۆر حەز لە ئاوەدانی و خاکپەرستی و چاندن و کردار و باخوباخچە و شیناوەردی دەکەن. لەگەڵ ئەوەشدا خاکی موکریان جیگای بێ کردار و چۆڵی زۆرە و بەبێ ئاوەدانکردن مـاوەتەوە. گـەلێک خـاکی هێـشـتـا نەکـێـڵـدراوە و مـاوەتەوە و دەستی لێنەدراوە، هەر لەژێر دەستی تەبیعەت دایە؛ وەکو گەنجینە و گەنجوور داپۆشراوە.

سەروەت و حیشمەت و سامان و مەڕ و حەیواناتی «ماد»یەکان کە لاپەڕەکانی مێژوو بەباسکردنیـان پڕ کـراوە، لە سـایەی ئەو خـاک و ئاووهەوایەی مـوکـریانەوە بووە کـە پێی ناوبانگیان بەدونیادا کردبوو و پێی بوون بەدەوڵەت و حکوومەت.

خاکی کوردستانی موکریان چونکو لەگەڵێک عەسرانی خراپدا بەسەری بردووە لەگەڵێک گـەڕان و سـوڕانی زمـانەدا دووچار بەوەگـەڕان و تێکچـوون و کـەوتن و پەرێشـانی و شـپـرزەییـەکی زۆر بـووە؛ بەسـەریەکـدا کـەوتووە و لە وردبوون و سـەرەوژێریدا ئەمـدیو ئەودیوێکی زۆری پێ کراوە.

مەعدەنانی بەسوود و گرانبەها و بەقیمەتی بۆ دەرخستن زۆر سووک و ئاسانە. هەرچەند بۆ کاربردن و هێنانە دەستی لەگەلێک زەمانەوە ئامادەیە، بەڵام گەلێکیش ماوە کە هێشتا دەستی لێ نەدراوە.

**ئەو مەعدەنانەی بەئاسانی دەردەکەون:** پتریان نەوعی بەردن، بەردئەستێ - بەردە قسڵ - بەردە گـێـج - گـڵـی سـپی - بەردی خـوێ - بەردی مـەڕمـەڕ - بەردی سـمـاتە - بەردە پازار؛ ئەو بەردانەی بەئاسانی لە دەستدان، ئەوەبوون. بەڵام ئەو مـەعـدەنانەی بەئەزیەت و دژواری دەست دەکەون ئەمانەن: ڕەژی بەرد - گۆگرد - زەرنیخ - تەڵق - مومیایی - مس - قوڕقوشم - زێر.

**ئاوی مەعدەنی:** ئاوی مـەعـدەنی گراو لە خاکی کوردسـتـانی مـوکـریاندا زۆرن، لە نزیک سابڵاخ و لە کەناری ڕۆژئاوای شار، گراوێکی پڕ سوود و بەکاری هەیە. لە ژێر ئەو گراوە کە بووە بەبەرد، مەڕمەڕێکی زۆر ڕوون و خاوێن و جوان پەیدا دەبێ. وەکو شووشە ڕوونە؛ لە پەنجەرەی مزگەوتەکاندا لە بری شووشە بەکـاریان بردووە. بۆ کێلی بەگزادە و حاکمەکانی موکریان کراون بەکێل. ئەو گراوە ئاوەکەی بۆ گەلێ نەخۆشی بەکار دەبەن.

ئاوی گۆلی ورمێ مەعدەنییە. لای جنووبی خاکی خوێلێن کە شیمالی موکریان و خاکی موکریانە، ساڵێ میـقدارێکی بێ ژمار خوێی لێ هەڵدەگیرێ و دەفرۆشرێ. لە پێشدا ئاغا و خـاوەند مـوڵکەکـانی مـوکـریان دەسـتـیـان بەسەردا گرتبوو و بەقـیـمـەتێکی زۆرکـەم، بەبار

دەیانفرۆشت. بەڵام لەدواییدا ئینحیسار کرا و بۆ کوردستانی موکریان زۆر بەسوودە.

**گیایانی کیمیایی:** کوردستانی موکریان دارای داری لێڕەواری خاوەند سوود وەکو: بەڕو، مازوو، گێوژ، گوێز، تاوک، بادام، بەلاڵووک، بناوە و گەلێک داری دیکەش هەن لە لێڕەوارەکاندا کە سوودمەند و بەکەڵکن.

مازوو گەلێک بەکەڵکە بۆ کوردەکان و بەپێزە. بۆ دەباغ بەکاری دەبەن و تیجارەتێکی زۆری لەسەرە. داری مازوو چواردە بەران دەدا.

**گیایانی کێوی:** تێبی و سەنعەتی لەنێو مێشە و دارستان و لێڕەوارەکاندا گەلێکن. لە داریش بەولاوە گیای خۆڕسک و کێوی بۆ تێب و سەنعەتی زۆرباش و بەکەڵکی هەیە. بۆ کیمیا و سەنعەت و تێب بەکاردەبرێن و لە شیرە و شیر و ڕەگی دار و گیاکانی کێوی ئیستفادەییێکی بێ ژمار دەکرێ، بەتایبەتی گەزۆ زۆر بەکار دەبەن. ئەوە ماددەییێکی شیرینە کە دەکەوێتە سەر گەڵا و بەرگی دارەکانی لێڕەوار. لەویش چاکتر و بەکەڵکتر بنێشتە؛ شیرەی داری قەزوان و «دارەبەن»ە، بەبرینداركردنی دارەکە شیر دەردەخا و دەبێتە بنێشت.

کەتیرە: شیرەگیای کێوییە کە پێی دەڵێن «گوێنی». کە بریندار کرا شیرە لە جێگای برینەکە دێتەخوار. ئەو کەتیرەیە تیجارەتێکی قورسی لەسەر دەگەڕێ و بۆ دەرەوە دەچێت و بەکار دەبرێ.

«سەهلاب» کە بنەگیایە و دەردەخرێ و لەپاش بەئاو و ئاور زەرد دەکرێ و وشک دەکرێتەوە. ئەویش زۆر بەکەڵکە بۆ کوردەکان. توجار دەیبەنە ئەوروپا، ساڵی لەوانە باروبارخانەی قورس باردەکرێ و بۆ دەرەوەی کوردستان دەنێردرێ.

**دارانی دەستچین:** داری دەسچین و بەبەر و بێ بەر لە کوردستاندا هێندە زۆرن، نایێنە ژمار، بەڵام ئەوەی ئێمە زانیومانە ئەمانەن:

**دارانی بەبەر:** سیر، ئالوبالوو، گێلاس، قەیسی، توو، ترش، سماق، هەنجیر، هەنار، هەرمێ، سنجوو، پستە، فندق، هەڵووچە، بادام، هولوو، خۆخ، شەفتالوو، گوێز، ترێ. بەتایبەتی جۆرە ترێیەکی زۆر لە موکریاندا هەیە نایێتە ژمارە، بەڵام من ناوی ئەو چەند جۆرەم زانیوە، لێرەدا لێدوانی بێ کەڵک نەدیترا بۆیێ باسی دەکەم: خەلیلی، گەزەنگی، مایەمێو، دەستەچن، حوسێنی، ڕیشی باب، تولوخ، چاوکوتکە، شیرە، کشمیشی، بۆڵمازوو، ساحیبی، سەرقوڵکە.

**دارانی بێ بەر:** چنار، پەڵک، چناری جەوهەردار، گەز، بۆز، بیی، ئەرغەوان، بیدمشک، شەنگەبی، ڕەشەبی.

**حەیوانات:** لەبەر ئاووهەوا و لەوەڕی باش کوردستانی موکریان حەیوانی کەوی و کێوی زۆرن. ئەو خاکە هەموو جۆرە حەیواناتێکی لێ پەروەردە دەبێ. جا چ کێوی بێ و چ کەوی بێ، چاکی پێدەگەیێنێت. حەیواناتی کەوی زۆر بەکەڵک بێ مەڕ و بزن.

لەسەر قوچکە و تەپۆڵکە سەرەکانی کوێستانەکان و هەتا دامێنی خوارەوەی شێن و پڕ لەوەڕ و چایەر خۆش و پڕ گیایە. پترینی دێهات مەڕوبزن بەخێو دەکەن، بەڕوون و پەنیر و خوری و مەرەز و موو فرۆتن بەڕێ دەچن. مەرەز و خوری و موو دەڕێسن و بەتەنین و کر و بەرگ و داخەر و بەخۆدادەر بەکاری دەبەن.

**چاکترین حەیواناتی کەوی:** پێڕۆ و چارۆیە کە ئەسپ و ماین و گا و مانگا و گامێش و کەڵ و ئێستر و کەرە. لە کوردستانی موکریاندا ئەو حەیواناتانە تۆوی زۆرچاکیان بەخێوکراوە و جنسیان زۆر پەسند و هەڵبژێردراوە.

لە کێو و دەشت و دۆڵەکانی موکریاندا حەیواناتی کێوی گەلێک جۆری هەن: پڵنگ - گورگ - ڕێوی - چەقەڵ - چواڵەکە - کورەبەش - کەمتیار - بەراز - ورچ - دەڵەک - کەروێشک - سمۆرە. گەلێک حەیواناتی دیکەشی هەن کە ئەهالی ڕاویان دەکەن و لە پێست و گۆشت و پیویان ئیستفادە دەکەن، بەتایبەتی لە کەوڵ و پێستەکانیان زۆر ئیستفادەیان هەیە و تیجارەتێکی قورسی لەسەرە، کە بۆ خاکی ئەوروپا دەبرێن.

**زمان و شێوەی کوردی موکریان:** زانا و گەورەکانی کوردناس و بەتایبەتییەکانی کوردئاگا، لە بابەت زمان و شێوەی کوردەکانی موکریانەوە گەلێکیان گفتوگۆ لێ کردووە و هەریەک بەباوەڕی و تێگەیشتنی خۆی لێی دواوە و بەڕاستی کردویانەتە موباحەسە و گفتوگۆیەکی عیلمیی زۆر بەقیمەت و حەقی ڕاستەقینەکەیان پێداون.

حەسەن پیرنیا لە کتێبی ئێرانی قەدیم و لە فەسڵی دووەمی تەمەددونی «ماد»ی دا لە «دارمیس تیتیر»ی موتەتەبیعی ئێرانی نەقل دەکا کە کتێبی موقەدەسی زەردەشتیان ئاوێستا بەزمانی مادی نووسراوەتەوە، دەڵێت: بەهەرجۆرێک بێ، شکێکی نییە کە زمانی مادی لەگەڵ زمانی پێشووی پارسیدا نزیکی یەکدی بوون و زۆرکەم لەگەڵ یەکدیدا تەفاوەتیان بووە، هەروەکو لە دەوری «ئیسترابۆن»دا مادی و پارسی بەئاسانی لە یەکتری گەیشتوون، گەلێک لە عولەماکان بەوە دڵنیان، کە زمانی کوردی ئێستاکە زمانی مادی بووە.

ئنسیقلۆپەیدیای ئیسلام لە زمانی کورد دواندا دەڵێت:

زمانی موکریانی کرمانجی تا بانە و سەقز دەڕوات و لەوە بەولاوە ناچێت. لە جنووبی ئاوی چەخەتوو و خوڕخوڕە و تێلەکۆ بەولاوە شێوەی کوردستانی سنە دەست پێدەکا هەتا دەگاتە سنە. ئەردەلانییەکانیش هەتا پایەیەک زمانەکەیان شێوەی موکریانییە، گەرچی لەمەوپێش نزیک بووە لە زمانی هەورامان، بەڵام لەبەر تێکەڵاوی ئەردەلانیەکان لە عەشایرانی موکریان و دانیشتنی عەشایری موکریان لە خاکی ئەردەلاندا بۆتە مایەی وەرگەڕانی زمانی ئەردەلانی بەشێوەی موکریانی. هەر بەو دەستووره تا ئەندازەیەک زمانی ئەردەلانی ئەمڕۆ لە شێوەی پێشووی خۆی لایداوە و بۆتە شێوەییێکی جوان و وێچووی موکریان.

گەورە (موستەشریق) ڕۆژهەڵاتناسەکانی کوردان لە بابەت زمانی کوردیەوە گەلێک دواون و بیریان لە زمانەکانی ئێران و زمانی دیکە کردۆتەوە و خستوویانەتە مەیدانی باس و خواسەوە. هێندێک بەوە باوەڕیان کردووە کە زمانی کوردی و پارسی لە دەورێکی زۆر لەمێژدا یەکبووبن، بەڵام کەم کەمە هەرچووە و لە یەکدی جویّ بۆتەوە و دوورکەوتۆتەوە. لەسەر خەتێکی ئاشکرا و دیار و زاندراو، ڕوویان لە بەرزبوون و سەرکەوتن کردووە، تاکو گەیشتۆتە پایەیەکی وا کە ئەمڕۆ خۆیان نواندووە و خۆیان نیشانداوە و لەبەرچاون. جا کەوا بوو بەپێی ئەوە ناتواندرێ ببێژرێ کە: شێوەی کوردی شێوەیەکی فارسییە و یەکبوون و لێک دوورکەوتوونەوە.

بەپێی ئەمە کوردی لە زمانی ئێرانی جویّ بۆتەوە و هەریەک لەمانە چەند شێوەییێکیان لێ پەیدا بووە، دەبیندرێ و دێتە بەرچاوان کە لە ولاتی ئێراندا فارسی چەند جۆرە شێوەیەکی تایبەتی هەیە، بەڵام لە بنەچەکدا هەموویان فارسین؛ نە موکریانی و نە لوڕی و نە بەختیاری و نە بلووجی و نە گۆران و نە کەلهوڕی و نە کرمانجی شیمالی و غەربی و نە شێوە کوردییەکانی دیکە و نە زازایی و نەدونبلّی و ئەوانەن. هەروەها کوردیش زۆر شێوەی هەن و خاوەند داراییێکی بەرزن و خۆیان نواندووە و شێوەیەکی سەربەخۆن. مودەقیق و زانای مێژوو (تأریخ)ی کورد «مێجەر ئەدمۆندس» لە مەقالەییێکی دا کە کراوەتە سیپارە و لە چاپدراوە و بڵاوکراوەتەوە دەڵێت: ئیدی بەچاکی و خاوێنی و تەواوی ئاشکرا بووە کە زمانی کوردی شێوەیەکی فارسی نییە. زمانێکی پاک و خاوێن و پالاوتووی «ئاری»یە و بەتایبەتی هەڵبژاردراوی و تایبەتییێکی سەربەخۆی هەیە.

هەموو وردبینەکان و زانا و تێگەیشتووە زمانزانەکان لەگەڵ زمانی کوردی خەریکبوون و

تێیدا سەرکەوتوون، لەوە کە ئەم هەموو شێوانەی زمانی کوردی داخوا کامەیان بنەچەک و ئەساسن بۆ ئەوانی دیکە. لەوەدا گەلێک ماندووبوون و واق ماون، بەڵام لەپاش گەلێک تەدقیقات، زۆر بەچاکی تێگەیشتوون و باوەڕیان کردووە و بەوە دڵنیابوون کە بەپێی ئەتنۆغرافی و جوغرافی و ڕیوایەت و دەنگە دەنگ و زمان و عەنعەناتەوە، کوردی موکریانی (ساباڵاخ) دارای ئەو هەموو مەرج و ئەوساف و شرووتانەیە و زۆرچاک خۆی نواندووە و شایان و پەسند کراوە کە ئەمڕۆ ببێتە نموونە بۆ ناسین و زانینی ڕەگەز (عرق)ی بنەچەکەی (أساس) زمانی کوردی. چونکو ئەو هەموو ئەوساف و شرووتانەی تێدایە کە ئیسپاتی بنەچەکەی خۆی بکا.

بەچاکی بەمە باوەڕکراوە کە زەردەشت لە خاکی موکریان لە شاری سەردەشتی ئەمڕۆ هاتۆتە دونیا و بەزمانی دوای ماد قسەی کردووە. مێژوونویسەکان گوتوویانە لە سنووری بەرەو ژوورتری وڵاتێک هاتۆتە سەر زەوی کە ئەمڕۆ بەخاکی موکریان ناسراوە. شێوەی ئەو زمانە کە «زەندا وێستا»ی کتێبی موقەددەسی پێ نوویسراوەتەوە، هەرە نزیکترینی شێوەی موکریان وە یاخود یەکسەرەزمانی موکریانییە. زانا و عولەماکان بەگەرمیەوە بەوە دڵنیابوون و باوەڕیان کردووە، هەروەکو گوترا.

حەسەن پیرنیا لە کتێبی ئێرانی قەدیمدا گوتوویەتی کە کتێبی زەردەشت بەزمانی مادی بووە و زمانی مادی ئەوڕۆژە، زمانی کوردی ئەمڕۆکەیە. عولەما و زاناکانی ئاورووپا و گەورەکانی دینی زەردەشتیانی ئەمڕۆکە کە لە ئێران و هیندستانن، ئەوانەی سەرەوە تەسدیق دەکەن و بەوە قەراریان داوە کە زەردەشت لە خاکی موکریانی ئەمڕۆکە لە دایکبووە و بەزمانی مادی بچووک قسەی کردووە و کتێبی موقەددەسی بەو زمانە بووە کە زمانی موکریانە.

زمانێکی ئەو کوردانەی لە خاکی دیجلە و زێی بادینان (زێی گەورە) و شەتی ئەدهەم و سیرواندا کە قسەی پێدەکەن، شێوەیەکی بێ گرێ و خاوێن و پاک و بەرز و جوانیان هەیە. لە بابەت ئیشکالی ژمارەی کەلیمات و وشەوە زۆر دەوڵەمەند و دارای گەلێک لوغەتە؛ ئەوە شێوەی موکریان و زمانی موکریانییە.

مامۆستای تێگەیشتووی زمانی کوردی «مێجەرسۆن» دەڵێت: ئەو شێوە و زمانەی کورد قسەی پێ دەکا پێیان دەڵێن کوردی، لەو زمانانەی کوردی کە لە کوردستاندا هەن و بەکار دەبرێن شێوەی زمانی موکریانی زۆر بەئەهەمیەت و بەرزە. جگە لە شێوەی موکریان،

زمانی «زازا» زۆر ئەهەمیەتی هەیە و بەزمانێکی وا ڕەوان و خاوێن قسە دەکەن کە زمانی «ئاری»یێکی پالاوتووی بێ قرێژ (چلّک)ە وەکو زمانی موکریان وایە. جگە لە زمانی موکریانی ئەو خاوێنی و پاکییە کە لە زمانی زازادا هەیە لە زمانەکانی دیکەی کورددا نییە، ئەوە ئیسپات دەکا کە زمانی کوردی موکریانی بەرزتر و خاوێنتر و چاکتر و پالاوتووتری کوردییە.

هەموو شێوەی زمانەکانی کوردی کە تیرەکانی دیکەی کورد قسەی پێ دەکەن، لە بابەت وشەوە لە وشەی بیانی تێکەلاوی هەیە و جگە لە کوردی زمانی دیکەشی تێکەلّ بووە و لە جێگای کوردی وشەی بیانی جێی گرتووە، بەلام پالاوتوو کرا و خاوێن و بێ گرێتری ئەو شێوە و زمانانەی کە کوردەکان قسەی پێ دەکەن و بەکاری دەبەن، لە هەمووان پەسندتر و جوان و خۆشتر زمانی سابلاخ (ساوجبولاغ موکریان) و شێوەی موکریانە. چونکو ئەو زمانە خاوەند وشەیەکی زۆری بنەچەکەییە و زۆر مەردانە وشە و لوغەتە ئەسلّییەکەی ئەساسیی ڕاگرتووە و لە موقابیل ئەو هەموو سەردەمە و وەرگەڕان و ئینقیلابانەی بەسەریدا هاتووە وشەی بنەچەکەی خۆی بەخێو کردووە و بەکاری دەبات. وشەی کۆنە هەرە پێشینەکانی وەکو بووە ڕایگرتووە و لە دەستی نەداوە و بەپێچەوانەی تیرەکانی کورد خۆی نواندووە.

تیرەکانی دیکەی کورد هێندێک وشەی عەرەبی و تورکی و کلدانی تێکەلاو بووە و وشەی بنەچەکەی خۆیان لە دەست داوە و ونیان کردووە. بەلام موکریانی بەهەموو ڕاوەستانێکەوە بەرامبەر بەهەموو هەلّمەتێکی نەیار، وشە هەرە کۆنەکانی خۆی گرتووە و بەری نەداوە، هەروەکو خاک و نیشتمانەکەی بەجێی نەهیشتووە و بەری نەداوە. بەو جۆرەش شێوەکەی هەر بەخێو کردووە و وشەکانی بەرنەداوە، ئەگەرچی لە هەموو تیرەکانی دیکەی کورد پتر لە ژێر پێ پان کراوەتەوە. هەروەکو هێندێک کورد بەگۆم دەلّێن دنکز کە تورکییە و یان «بەحر» کە عەرەبییە. بەلام موکریانی پێی دەلّێت گۆل یا گۆلاو. هێندێک بەسەهۆلّ دەلّێن «جەمەد» کە عەرەبییە یان «بووز» کە تورکییە، بەلام موکریانی پێی دەلّێت: سەهۆلّ. هێندێک بەپاپۆر دەلّێن گەمی، بەلام موکریانی پێی دەلّێت: «کەشتی» و بەلێخوڕەکەی دەلّێ: «کەشتیەوان». هێندێک بەزەوی دەلّێن عەرز، عەرەبییەکەی «أرض»، بەلام کوردی موکریان دەلّێت زەوی. هێندێک بەبالّندە دەلّێن «طیر» کە عەرەبییە، بەلام موکریان پێی دەلّێت «بالّندە».

بەو جۆرە کوردی موکریان شێوە و وشە و بنەچەکە هەرەکۆنەکەی خۆی زۆرباش بەخێو کردووە، ئەگەر میسال بۆ ئەوە بێندرێتەوە، دەبێ تەئلیفاتی تایبەتی بۆ بکرێ، لەبەرئەوە ئەو چەند وشەی سەرەوەمان بەنموونە نیشاندا و باسمان کرد.

ئەوانەی بەوشە و شێوەی موکریانی بناسرێن و کەموکورتی شێوەی موکریانیان بەخێو کردبێ، شارانی هەولێر و ڕواندز و ڕانیە و قەڵادزێ و کۆیێ و لیوای کەرکووک و چەمچەماڵ و سلێمانی و هەڵەبجە و شارباژێر و پێنجوین و سووورداشە لە خاکی کوردستانی عێراقدا ئەگەرچی شێوەی بنەچەکەییان شێوەی موکریە، بەڵام هێندێک وشەی بیانی تێکەوتووە و وەکو موکریانی ئەمڕۆکە بەپاکی و خاوێنی نەماوە؛ بەتایبەتی زۆر وشەی تورکی کەوتۆتە نێو وشەکانی سلێمانییەوە. لەگەڵ ئەوەشا شێوەی موکریانی خۆیان هەر بەخێوکردووە، بەئەندازەییێک تەنها وشەکانییان کەمێک گۆڕدراوە.

بەڵام خاکی موکریانی ئەمڕۆکە کە شاری سابلاخ و شنۆ و سەردەشت و بانە و سەقز و ساین قەڵان، زۆرباش وەکو لەسەرەوە گوترا، وشە و شێوەی موکریانی بەخێوکردووە و لەنێو ئەواندا وشە تێکنەچووە. بەڵام شێوە کەمێک کە نزیک بەئەردەلان بووبێ، سەقز و ساین قەڵایە، ئەویش بەئەندازەییێکی زۆرکەم شێوەیان فەرقی کردووە، بەڵام وشەکانیان هەر لە جێی خۆیان جێگیرن و نەبزووتوون.

## ڕەوشت و دەستووری کوردستانی موکریان:

کوردەکانی کوردستانی موکریان، خاوەند ڕەوشتێکی باش و خاوێن و چاکن. هەموویان تەبیعەتەن زرنگ و وشیار و تێگەیشتوو و بیرتیژ و قسەزان و زمان ئاوەر و بەفەراسەت و عاقڵن. زۆرکەمیان دەکەوێتە بەرچاو کە گێژ و کاس و هێڕ و تێنەگەیشتووبن. ئەگەر لە ڕەوشت و کردەوەیان ورد ببرێتەوە، تەماشا دەکرێ لە هەموو تیرەکانی دیکەی کورد هەڵبژاردراون. کوردی موکریان لەگەڵ خوێندن و عیلم و خەتخۆشی و فەن زۆر بەهەوەس و بەکۆشەوەن، زۆرکەم دەبیندرێ کە نەیخوێندبێ و خەتی خۆش نەبێ. لەبەرئەوەیە کوردێکی موکریان کە چووە نێو کوردەکانی دیکەوە بەبێ ئەوەی بناسرێ و ناوی بزاندرێ پێی دەبێژرێ «میرزا» یەعنی ئەمیرزادە؛ چونکو لە پێشدا تەنها ئەمیرزادەکان دەیانخوێند. ئەوە ئیسپاتی دەکا کە هەموو کوردستان ئاگادارن و زانیویانە و باوەڕیان کردوە بەوە کە کوردی موکریان هەموو خوێندەوارن و کاتب و عالیم و زانا و شاعیر و مێشک ڕوون و وریان.

بۆ بەرگ و داخەر و پێخەف و نێومـاڵ، ڕوحی خانەوادەیەتی، لە هەموو کەسێک پتر پێشکەوتوون. بەرگی زۆرچاک و گرانبەها و پێخەف و داخەری زۆرچاک بەکاردەبەن. هیچ پیاو و ژن و کوڕ و کچی ئەوان نابیندرێ کە بەرگی ئاڵوواڵ و جوانیـان لەبەر نەکـردبێ. دەچییە هەر ژووری خانووێکی کوردی موکریانەوە، نییە مافووری گرانبەها و بەڕە و لباد و جاجم و مەوج و پێڕکی زۆر چاک نەبیندرێ.

لە ماڵەوە زینەت و جوانکردنی باڵەخانە و کۆشکەکانیان بەپەنجەرەی شووشەبەند جوان ڕازاندراوەتەوە. هەرکەس بەپێی دارایی خۆی نێو ماڵێکی پوختە و باشی پێکەوە ناوە، هەر ئیشـوکـارێک بکا، ئێـوارە دەچێتە نێـو خـانوێکی خاوێن و دەرگاوبانێکی جوانەوە. خـانووبەرەکـانیـان گـەورە و پچـووک بێ بەزەوق دروسـتکراون. خـواردن و خـۆراکی زۆر بەلەززەت و باش و چەور و خۆش نەبێ نایخۆن ئەگەر کەمیش بێ.

کـوردی مـوکـریان بەتەبیـعـەت حـەز لە بـاخـوبـاخـچـە و گـوڵ و گـوڵزار دەکـەن و گـەلێک ئەهەمیەتیان پێداوە و زۆر پێشیـان خستووە، بەتایبەتی ئەهالی سابڵاخ گەلێک ئارەزووی دەکـەن و بـاخـوبـاخـچـە و داری چاکـیـان لە دەوروپشت و ڕۆژئاوا و شـیـمـالی شـار پێگەیاندووە. لەنێو هەموو حەوشی خانووبەرە و ماڵێدا باخچە و گوڵزار دامەزراندراوە.

تەرزی خـانووبەرە و بینـایان زۆرجوان و گـەورە و مـەحکەمـە. دیوارەکـانیـان یـا خشـتی سوور و قسڵ و یا مۆرەیە، بەڵام پتریان خشتی سوور و قسڵ و گێچە و نێو حەوشەکانیان بەردەڕێژە.

هەر دێ و ئاوەدانییێک لە دێهات و مەحال و ناحیەکانی کوردستانی موکریان تەماشا بکرێ، لەلایەن خاوەند موڵکەکانەوە مەدرەسە و قوتابخانە بۆ خوێندن و تەحسیلی علووم دامـەزراندراوە. لە بـابەت علوومی پێـشـــوو بەناوچەی عـیلم داندرابوو. هەر عـالـیم و مـەلاییێکی چاک هەبوایە دەیانبـردە لای خـۆیان. مـەدرەسـە و مـزگـەوت و قـوتابخـانەی ڕێکوپێک و باشیـان هەبوو. لە نەفـسی شـاری سـابڵاخ سێزدە مەدرەسـەی زۆر گـەورە و قـوتابخانەی بەناوبانـگ هەبوو. گەورەکانی مـوکریان زۆریان، جگە لە کوردی و فـارسی و عـەرەبی، زبـانـی فـرەنگسـتـانیش دەزانن و خـوێندنیـان هەر لە مـاڵی خـۆیان بووە. لەگـەڵ ئەوەشا ئەدیب و عـالیم و شاعیر و خۆش خەت و زانا دەبن و لە عیلمدا سەردەکەون.

گەورەکانی موکریان زۆر لەگەڵ چاندن و باخ پەروەردەکردن خەریکن. گەنم و جۆ و برنج و دانەوێڵەییێکی بێ ژمار پێدەگەێنن. لە ساڵی ١٩٢٦م وە چەوەندەری قەندیان دەست پێ

کردووه و دەیچێنن. زۆر مونتەزەم فێری پەروەردەکردنی بوون. لە چۆمی مەجیدخان هەتا دەگاتەوە قەرەداخ شیمالی شارویران، هەموو دەستی بەچەوەندەر چاندن کردووە. تووتن پێگەیاندن گەیاندراوەتە بەرزترین پایە و سەرخراوە.

ئەهالی شاری سابلاخ بۆ تیجارەت و کڕین و فرۆتن و داد بەستاد لە هەموو کەسێکی دیکە پێشکەوتووترن. شارەکانی ئێران و ڕووسیا نییە کە کوردێکی سابلاخی لێ نەبێ و بەتیجارەت و بازرگانی خەریک نەبێ. کوردی سابلاخ بەتایبەتی و هەموو کوردی موکریان هێندە لەگەڵ بازرگانی و کڕیار و تیجارەت هەوەسدارن و حەزی لێدەکەن، سەد هێندە لە مەئموریەت و ژێردەستی دڵگیرن و نەفرەت دەکەن. لە منداڵیەوە بەکڕین و فرۆتن ئاڵوودە دەبن، ئەوەش پتر بۆ خوێندن و نووسین هانیان دەدا، تاکو دەفتەر و نووسین لە دەست خۆیاندابێ نەک بیانی.

کوردی موکریان بەجارێک خاوەند عیزەتی نەفس و حەمیەت و پیاوەتین و میهمانپەزێر و غەریب نەواز و دەستگیری کەوتوو و هەژار و لێقەوماوانن؛ هەر فەلاکەت و کێشە و نەبوونییێک بەسەر کوردی موکریاندا هاتبێ، لەو ڕوویەوە بووە، هەروەکو لە داهاتوودا باس دەکرێن. هەر لێقەوماوێک و دەستەنگ و داماوێک پەنای بۆ بردبن، پەنایان داوە و دەستیان گرتووە. بۆ پشتیوانی و پێویستی چی بووبێ بەجێیان هێناوە و یارمەتی و کۆمەکیان کردووە. ئەگەر لەو ڕێگایەشدا ماڵ و بوون و نەبوونی دانا بێ بەری نەداوە. ئەو خووڕەوشتە لە کوردی موکریاندا نەبێ لە کوردەکانی دیکەدا ناکەوێتە بەرچاو.

کوردی موکریان لەگەڵ ئەوەشا کە خووڕەوشتیان تیجارەت و بازرگانی و کڕیارە، گەلێک بەبەخشش و کەرەم و نانوخوانن و بەمەسرەف و دەست بڵاون. ئەویش هەموو بۆ میوانداری و پیاوەتی، دەنا سەفاهەت و ئەعمال و پیشەی خراپیان نییە. لەگەڵ مەشرووباتی ئەلکوولیدا بێ هەوەسن و حەزناکەن نزیکی چتی دیکەش بن. خواردن و چاو تووتن و بەرگیان زۆر دەچێت.

هەموو دڵپاکن و ڕووخوش و ناوچاو خاوێن و تێرن و غەییور. لە پیاوەتی و بەخشین و دەستگرتندا گرژی و منەت نیشان نادەن و پێیان عار و کورتی و بەدنەژادیە.

کوردی موکریان بەجارێک پیاووژن و منداڵیان بەئەندام جوان و سوور و سپی و شیرین و شۆخوشەنگ و قەشەنگن. ناحەزییان زۆر نەدیتراوە. هەموو بەجارێک دەنگخۆشن و قسەنەزم دەکەن و گۆرانی دادەنێن. هەموو کوردستان دەنگ و خۆشخوانی و نەزم لە وان

فێر دەبن. تەبیعەت دەنگ و ئاوازی خۆش کردوون و تەبعی مەوزوون و شاعیرن. ئەمڕۆکە هەر نەزمێکی خۆش و ئاودار و تەڕ و باشێ لە کوردستاندا بێ هی موکریانە. شایر و شاعیری غەڕا و بەناوبانگیان لێ هەڵکەوتووە. ئاووهەوا و خاکەکە بەتەبیعەت پێیان دەگەیێنێت.

**ساباڵخی موکریان:** شاری ساباڵخ لە دوای ئەوە کە شێربەگی موکریانی لە دەست شا عەباسی سەفەویدا هەڵات، دێهاتەکانی سووتاند و هەڵات و گەڕاوە، ساڵی ١٠٣٩ ئەو شارە ئاوەدانکراوەتەوە. بەڵام لە دەوری نادرشادا شارێکی گەورەبووە. ئەو شارە هەرجێی دانیشتنی حاکمانی موکریان بووە.

ئەو شارە لەنێوانی ٤ کێودا هەڵکەوتووە، ڕۆژهەڵاتی شار کێوی «داشا مەجید»ە، جنووبی شار کێوی «عەلیاباد»ە، ڕۆژاوای شار «مەیدان بەڵەک»ە، شیمالی غەربی شار کێوی «خەزایی»ە. شیمالی ڕۆژهەڵاتی شار کێوی «قوڵقوڵاخ»ە. کلکەی قوڵقوڵاخ کە کەلکی بەگزادانە، ڕوو بەڕۆژاوا دەڕوا و چۆمی ساباڵخ لە کێوی خەزایی دەپچڕێنێتەوە.

شاری ساباڵخ لە پانایێکی نێوانی کێوی شامەجید و عەلیاباد و ئەوانەدا هەڵکەوتووە. چۆمی ساباڵخ لە جنووبەوە بۆ شیمال دەچێتە خوار. کە کەوتۆتە ڕۆژاوا و ڕۆژاوای شیمالیەوە، کێوانی خەزایی و مەیدانی لە دەشتی شاری ساباڵخ پچڕیوەتەوە.

شاری ساباڵخ خاوەند باخچەیەکی زۆرە. بەدرێژایی چۆمی «ڕەش» ئەمبەرەوبەر باخ و باخچە و مێشەوداره، هەتا دەچێتە خانەگی وسووکەند، لەو چۆمە ئاودێر دەکرێن.

لەو چۆمە لە پردی سوورەوە هەتا خواری شاری ساباڵخەوە، چوار بەند (سەد)ی زۆر گەورەی لێ هەڵبەستراوە کە هەر بەندێک چۆمی بەجارێک پێدادەچێ. لە وسوکەند و قونقەڵا و دارەلەک دیسان یەک لە دوای یەک بەندی لێ هەڵبەستراوە و هەموو مەحالی شارویران ئاودێر دەکا.

ساباڵخ ١٣ مزگەوت و ٢ تەکیە و ١ خانەقای هەیە کە ئەمانەن: ١- مزگەوتی دارۆغە ٢- مزگەوتی سوور (جامیعە) ٣- مزگەوتی حاجی ئەحمەد ٤- مزگەوتی مەلایەحیا ٥- مزگەوتی قازی ٦- مزگەوتی سەید بایزید ٧- مزگەوتی سەید نیزامی (مزگەوتی گورگان) ٨- مزگەوتی هەباساغا ٩- مزگەوتی ڕۆستەم بەگ ١٠- مزگەوتی شا دەروێش ١١- مزگەوتی تازە ١٢- مزگەوتی قیبلە ١٣- مزگەوتی بازاڕ.

تەکیەکان: ١- تەکیەی خەلیفە مەحموود (سەید قادر)، ٢- تەکیەی گوڵبابا.

خانەقای نیری لە مزگەوتی هەباساغایە و خانەقای سەیدی زەنبیلی لە مزگەوتی حاجی ئەحمەدە. هەموو ئاوەدانن و مەدرەسەیان هەیە، بەڵام نوێژی جومعە لە مزگەوتی سوور دەکرێ. سابڵاخ ٤ حەمامی هەیە: ١- حەمامی میرزا ڕەسووڵی لەشکری ٢- حەمامی پۆتێ ٣- حەمامی شوجاعدەولە ٤- حەمامی هەباساغا. حەمام و مزگەوتی هەباساغا، هەباساغای دێبوکری دروستی کردوون و زور گەورە و خۆشن. کنێشتەیەکی جوان و کلیسەیێکیشی لێیە. سابڵاخ خاوەند کاروانسەرا و تیمچە و ڕاستەبازار و مەیدان و دوکان و چایخانەیێکی زۆرە، هی بەناوبانگیان، مەیدانی «ئارد»ی و مەیدانی «حەمەخرچە» و مەیدانی «داران» و مەیدانی ئاسنگەران و مەیدانی زیرینگەران و مەیدانی ڕەژی فرۆتن و مەیدانی مەنگوڕان.

کاروانسەرا بەناوبانگەکانی: ١- کاروانسەرای کەریمخان ٢- کاروانسەرای تووتن ٣- کاروانسەرای نەراقیان ٤- کاروانسەرای (مووسڵیان) ٥- کاروانسەرای قازی ٦- کاروانسەرای میرزا ڕەحمەت، چەند کاروانسەرای بچووکی دیکەش هەن. دوکانی گەلێکن، لە دەوری شاهنشاهی پەهلەوی دا جادەیێکی دوورودرێژ لە پردی سوورەوە بۆ سێ ئاشان بەسەر بەستێنی ڕەنگریزاندا، بەکووچەی جوولەکاندا ئەمسەرە و ئەوسەر کێشراوە و دروست کراوە و لە دەست دایە لە بەستێنی چۆمییەوە بەسەر خرێدا ڕاست بۆ باخی قیبلە بکێشرێ، نەقشەی داندراوە.

**باخە بەناوبانگەکانی سابڵاخ:** ١- باخی مەجیدخان ٢- باخی سەیفودین خان ٣- باخی گوێزی ٤- باخی زیخێ ٥- باخی قۆڕی ٦- باخی قۆپی ٧- باخی حەسەنخان ٨- باخی قازی ٩- باخی سیسە ١٠- باخی قیبلە و نزیک ٥٠ باخی دیکەش هەن.

لە سابڵاخ ئاوی کارێز و کانی و چاڵاو دەخۆنەوە و لە ئاوی چۆمیش ئیستفادە دەکەن. کارێزی بەناوبانگ و پڕ ئاویان چوارن کە لە قیبلەوە بۆ ناو شار چووە و مزگەوت و حەمامەکان بەکاری دەبەن. بەڵام لە زۆر مزگەوت و ماڵەکاندا کارێز و بیری خۆیان هەیە.
شاری سابڵاخ ١٠ گەڕەکن: ١- گەڕەکی چۆمی ٢- گەڕەکی مزگەوتی سوور ٣- گەڕەکی حاجی حەسەنیان ٤- گەڕەکی قەڵا ٥- گەڕەکی ڕزگەیان ٦- گەڕەکی جوولەکان ٧- گەڕەکی خرێ ٨- گەڕەکی ئەرمەنیان ٩- گەڕەکی قوڵەقەبران ١٠- گەڕەکی قیبلە.

قەبرستان (گۆڕستان) لەبەرداشامەجیدەوە بەدرێژی گۆڕستانی موسڵمانانە، لە لای قیبلەوە قەبری بەگزادانە، لە قیبلەی شار، گومبەزی بوداقخان و کەریمخان و پیاوە

گەورەکان و حاکمەکانی موکریانە، لە ڕۆژئاوای جنووبی شار و لەسەر کەلکی قۆرخی قەبرستانە، لەسەر ڕێگای گراوان و پردی سوور قەبرستانی جوولەکانە، لە ڕۆژهەڵاتی شار و لەپشت سێ ئاشان قەبرستانی ئەرمەنیانە.

ئاساری قەدیم لە سابلاخ زۆرن، بەڵام ئەوانەی بەناوبانگن ئەمانەن: ١- کۆشکی «فەقرەقا» کە لە نزیک دێی ئیندرقاشە ٢- «بەردە کونتێ» لە خوار دێی وسووکەندەوەیە، ٣- گردی «قوڵی» لە خوار دریازەوە کەوتۆتە نێوانی قونقەڵا و دریاز ٤- گردی «لەجێ» سێ گردن و نیو سەعات لە خوار ئیندرقاشن ٥- کۆنە شار (شارویران) لە شیمالی ئیندرقاش گوگتەپە لە ڕۆژهەڵات و لە ڕۆژاوای لەجی شیمالی (گاپیس) و کێچاوا، جنووبی ئیندرقاشە. ئەو کۆنە شارە کەوتۆتە نێوەڕاستی ئەوانەوە، ٦- قەڵای سارم لە ڕۆژهەڵاتی سابلاخ بەسەعاتێک دوور لەسەر کێویکی زۆر بەرزە، دێی لاچین لە جنووبی ئەو کێوەیە ٧- قەڵای «موتاوا» لە دەشتی کۆنە لاجان دایە: دێی «جەڕان» لەسەر ئەو قەڵایەیە و ئاساری ماوە. ٨- گردی «هۆلاکۆ» لەسەر چۆمی چەخەتوو لە ڕۆژهەڵاتی میاندواوەیە. لەگەڵێک جێگای دیکەشی ئاسار هەنە.

بەڵام شار ویران (کۆنەشار) کۆنە پایتەختی مادی بچووک (پرسپە) بووە. لە هاتوودا باسی دەکرێ کە دەورێکی زۆر گەورەی بەسەر بردووە.

لە ئاسارانی تازە «مزگەوتی سوور» و «پردی سوور» هی حاکمە کوردەکانی موکریان و پردی میاندواو لەسەر چۆمی تەتەهو، هی حاجی ڕەسووڵی گەورە سابلاخی و پردی قەرەقشلاخ هی مەولانا سادقن. هەروەکو لە جێی خۆیاندا لێیان دەدوێین. لە دێی بۆکان و قەرەگوێزو ئینچکەی شێخان، ئاساری قەدیمە هەن. لە ئینچکە بورجی ڕۆژ و مانگ لەلایەن شێخەکانی ئەوێوە کراون.

## عەشیرەتەکانی کوردی موکریان

### کوردی ڕاوەند و شوول و شاهێن:

لە دەوری ئیسلامیەتدا، لە ساڵی ١٩ی هیجری «هورمزان»ی حوکمداری ئەهواز داوای یارمەتی لە کوردانی موکریان و کوردی دیکەی کرد. لەشکرێکی قورسی کورد لە عەشیرەتی شوول - سوڵدز - شاهێن - ڕاوەند لە خاکی موکریانەوە بەهاوارییەوە چوون. لە دزپوول (دزفول) پێی گەیشتن. نەوبەخت لە شاهنامەی پەهلەوی، جلدی یەکەمی لاپەڕەی ١٠دا بەم شیعرەی خوارەوە لێیان دواوە کە دەڵێ:

ز کـوردان شـاهین و ڕاوەند و شـوول
بسی لشکر آمـد سـوی دیزوپول

هەر لەو لاپەڕەیدا فەرهەنگۆکێکی کردۆتەوە و دەڵێت:

شـوول - سـوول - شـولدز - سولدز عـەشیـرەتێکی گـەورەی کـوردن کـە لە خـاکی بانە و سەقز و ڕۆژاوای ئەو خاکەدان.

لەوەوە وامان بۆ ئاشکرابوو کە ئەو خاکە نێـوانی مەحالی زارزا شنۆ و سـەقز و بانەیە. ئەمڕۆکە مەحالی سندووس (سلدوز) لە شیمالی غەربی سابلاخ و ڕۆژهەلاتی شاری شنۆوە هەڵکەوتووە و بەناوی ئەو کوردانەوە بووە.

عـەشیرەتی شاهین لە خاکی گوڵبـاخی ئەمڕۆکەدا بوون. عـەشیـرەتی «زوردلان» لە نزیک کرماشان و هەرسیندا بوون. ئەردەلان لە مانیە، ئەویش هەر لەسەر کوردی شوول بوون. عەشیرەتی کوردی ڕاوەند لە خاکی ئێستای مەراغە و گەرمەڕو و کێوی سەهەند و گەوگان و دیخورگاندا دانیشتوون. حکوومەتی ڕاوەند کە لە بەندی چوارەمینی ئەم کتێبەدا باس دەکرێن لەو عەشیرەتەن. بنەماڵەی سەلاحەدینی ئەیووبی کە لە شام و میسر حوکمداریان کردووە لە عەشیرەتی ڕاوەندن.

ئەو عـەشیرەتە پیاوانی زۆر گەورەیان لێ هەڵکەوتووە: «ئیبن ڕەوەندی»ی بەناوبانگ و خـاوەندی «خـەمسـە»ی شـێخی شیـرازی لەو عـەشـیـرەتە کـوردەن. کـە ئەبو مـوسلیـمی خـوراسـانی لەگـەڵ مـەڕوانی ئەمـەوی شـەڕی کـرد و لەگـەڵ سـەففـاح پاسـخی دا بەهۆی کوردەکانی ڕاوەندەوە بوو. نەوبەخت لە شاهنامەی پەهلەوی جلدی سێیەمدا دەڵێت:

سـبـە جـامـەگـان از سـران رەوەند
همان جنگ جویـان کـوهس سهند
هرآنکس کـە دینش بود خـرمی
کـز ایران شـمـارد سـراسـر زمی

**عەشیرەتی کوردی بانۆکی:**

لە دەوری حکوومـەتی ئەمـەویدا کـوردی مـوکـریـان گـەلێک چووبوونە نێـو سـوپـاهی ئەمەویەکانەوە. ساڵی سەد و سی و دووی هیجری کە حکوومەتی ئەمەوی دوایی هات، ئەو عـەشیـرەتە کـوردانە لە فـەلەستین و شـامـەوە ڕوو بەکـوردسـتـان گـەڕانەوە و لە قـەلای «قەلب» ئیـمـارەتێکی بچووکیـان دامەزراند و یازدە قـەلای گـەورە بەناحیـە و دێهـاتییـەوە

خستیانە دەست خۆیان. ئەم هەشت عەشیرەتە بوون کە شەرەفنامە و «کوردلەر» باسی کردوون و لێیان دواوە، کە لە کوردی خاکی موکریان بوون و لە لەشکری «مروان الحماری» دوامین خەلیفە ئەمەویدا خزمەتیان کردووە:

١- بانۆکی، ٢- هوێدی، ٣- دڵخیزان، ٤- بوجیان، ٥- زیلان، ٦- بسیان، ٧- زکزیان، ٨- بەرازی. ئەم هەشت عەشیرەتە لەسەر قەبیلە و تیرە پتربوون و هەموویان ئاینی داسنییان هەبووە. لەو خاکەی کە گرتیان تا نزیک ساڵی هەزاری هیجری ئیمارەتیان هەر مابوو، بەناوی ئیمارەتی سلێمانییەوە ناودەبران؛ چونکە یەکەمین ئەمیرێکیان کە لە قەڵای قەلب دانیشت و دەستی بەئیمارەت کرد ناوی سلێمان بوو.

**عەشیرەتی ڕۆژەکی:**

لە خاکی موکریانەوە عەشیرەتی بلْباس و قەوالیس کە نۆزدە قەبیلە بوون، باریان کرد و چوونە نزیک شاری «خۆی»ی لە جێگایەکە پێی دەڵێن تاو (تاب) دانیشتن و کۆبوونەوە و هەوای کیشوەرگێریان کەوتە سەرەوە. ڕوو بەخاکی بدلیس چوون و حاکمێکیان بۆ خۆیان دانا. بدلیس و حزۆیان گرت و دەستیان بەفەرمانڕەوایی کرد. ئەوانە بەسێ قۆڵ داندراون:

١- بلْباس، ٢- قەوالیس، ٣- حەزۆ.

بلْباس دە قەبیلەن ١- گەلەچیری، ٢- خرِبیلی، ٣- باڵەکی، ٤- خیارەتی، ٥- کۆڕی، ٦- برِیشی، ٧- سەکری، ٨- کارسی، ٩- بێدوری، ١٠- پلاکوردی.

عەشیرەتی قەوالیس نۆ قەبیلەن: ١- زەردوزی، ٢- وانداکی، ٣- پڕتافی، ٤- کوردەکی، ٥- سەهرەوەردی، ٦- کاشاغی، ٧- خالدی، ٨- واستودەکی، ٩- عەزیران.

عەشیرەتی حەزو پێنج تیرەن: ١- قیانی، ٢- بایکی، ٣- مودەکی، ٤- زوقیسی، ٥- زێدان.

حەسەن درێژ (ئوزن حەسەن) لە سەرەتای حکومەتەکەیدا چووە سەر بەدلیس. ئەمیر ئیبراهیم حاکمی بەدلیس بەرامبەریی کرد. دەورەدانی بەدلیس سێ ساڵی کێشا، لە هەموو ئەهالی شار و لەشکری بەدلیس ئەمیر ئیبراهیم و شەش پیاو ڕزگاربوون؛ ئەمیر ئیبراهیم ناردرا قەزوین.

لە دوای مردنی حەسەن درێژ، یەعقووب بەگی کوڕی لەبەرئەوە لە عەشیرەتی ڕۆژەکی لەبەدلیس هەر سەرکێش بوون و شەڕیان دەکرد، ئەمیر ئیبراهیمی کوژت. لە ئەمیر ئیبراهیم سێ کوڕ بەجێمان کە حەسەنعەلی و حوسێنعەلی و شامحەمەد ناویان بوو.

له عەشیرەتی ڕۆژەکی محەمەد ئاغای کەڵهوکی کە سەرهات و زانای ئەو عەشیرەتە بوو، لەبەر پشێوی کەوتبووە لەشکری مەڕی سپییەوە. هەموو دەمێ کوردەکانی دەبزاوت کە بچنەوە سەر بەدلیس و بیگرنەوە. له دوامیندا حەسەنعەلی و حوسێنعەلی کوڕانی ئەمیر ئیبراهیمی لە قەزوینەوە بردە خاکی هەکاری، هەردوو میرزادەکان کوژران. محەمەداغا گەڕاوە قەزوین.

شامحەمەدی کوڕی سێیەمی ئەمیر ئیبراهیمی هەڵگرت و چووەسەر بەدلیس، بەکۆمەکی عەشیرەتی ڕۆژەکییەوە بەدلیسی لە پاش ٢١ ساڵ لە دەست ئاقوینلوەکان دەرخستەوە و حکوومەتی تێدا دامەزراندەوە. ئەو بیست و چوار عەشیرەتە کە لە «تاو» کۆبوونەوە و بەناوی ڕۆژەکی ناوبانگیان دەرکرد و لە حکوومەتی بەدلیسدا زۆر خزمەتی کوردیان کرد و بنەماڵەی حاکمی بەدلیس کە شەرەفخانی خاوەندی شەرەفنامەیە لە بنەماڵە و حاکمانی بەدلیسە، کە ئەو عەشیرەتە خزمەتی کردوون. لەوان پیاوانی گەورەیان لە حکوومەتی عوسمانی و سەفەویدا پێگەیشتوون و خزمەتی زۆر گەورەیان لێ ڕوداوە.

لە ڕۆژێ کە ئەو عەشیرەتە گەورە کوردەی موکریانە کەوتنە خاکی بەدلیسەوە و حکوومەتێکی گەلێک جوانیان لەوێ دامەزراند، هەتا دەوری سوڵتان سلێمانی قانوونی زۆر ئیشی گەورەشیان لەو خاکەدا نیشاندا و بەزۆری بازووی خۆیان لەو خاکەدا سەربەرزبوون. هەر سوڵتان و پاشایانی جیهانگیر کە چووبنە ئەو خاکەوە، هەتا عەشیرەتی ڕۆژەکیان دڵنیا نەکردبێ و بەلوتف و میهرەبانی دڵخۆش نەکرابان، ئەو خاکانە بۆ کەس نەدەبوونە ماڵ و ئاسوودە نەدەمان.

سوڵتان سلێمانی قانوونی بەقەهر و غەزەب کە چووەسەر بەدلیس، حاکمەکانی کوردی بەدلیس هەڵاتن و پەنایان بردەبەر حکوومەتی ئێران.

عەشیرەتی بلّباس و بایکی و زێدان و مۆدکی سێ ساڵ شەڕ و کوژتاریان لەگەڵ ڕۆم کرد و نەیانهێشت ئاسوودە دانیشن. لە دوامیندا حکوومەتی عوسمانی جاڕی شەڕی عموومی بەسەردا کێشان. لە هەموو لایێکەوە لەشکری ئومەرایانی کورد و عوسمانی بەهەموو هێزێکییانەوە چوونە سەریان. لەگەڵ ئەوەشدا پێیان نەوێران و دەرەقەتیان نەهاتن.

ئەمیر و ئاغازادەکانی ڕۆژەکی نەدە چوونە بەر دەرگای هیچ حاکمێکی کوردستان. زۆر غەیوور و ئازا و زرنگ و زانا و تێگەیشتوو بوون.

پیاوانی زۆر گەورەیان هەبوو. دەروێش مەحموودی گەلەچیری زۆر شاعیر و ئەدیب و

زانا و تێگەیشتوو بوو. چووە لای سوڵتان سلێمانی قانوونی، سوڵتان زۆری خۆشویست و کردیە نەدیمی خۆی و هەمیشە هەم مەجلیسی بوو. لە پاشان کردی بە«کیتابدار»ی بەتایبەتی سوڵتانی.

حەیدەر بەگی برازای دەروێش مەحموودی گەلەچیری چووەلای سوڵتان سلێمانی قانوونی لەبەر ئازایی و ڕەشیدی و زرنگی و ناوبانگی مەردانەگی، سنجاغی عەشیرەتی «جیهانبەگی» و «محالی پالو»ی بەئیقتاع پێدا. زەمانێکی دوور خۆی و نەتەوەی لەسەری بوون.

ئیبراهیم بەگی کوڕی قەلەندەراغای بلّباس چوو کەوتە سیستانەوە. لە دەوری سەفەوییەکاندا لە لای محەمەدخانی حاکمی سیستان دامەزرا؛ لە پاشان چووە سەر خاکی بلووچستان. لە پاش چەند شەڕ و کوژتارێک کە لە هەمووواندا سەردەکەوت و بلووچەکانی دەشکاند، بەزۆری بازووی خۆی بلووجستانی گرت و خستیە ژێر فەرمانی خۆیەوە. عەشیرەتێکی زۆری لە بلّباس بردە ئەو خاکەوە. ئێستاش لە بەلوجستاندا مەنگوڕ و بلباس و عەشیرەتی دیکەی کورد لەو خاکەدا هەن کە بەهۆی ئیبراهیم بەگەوە چوونە ئەوێ و لەوێ دامەزران و هێز و تەوانایان تێدا پەیداکرد. ئیبراهیم بەگ لە ساڵی ١٠٠٠ هیجری دا لە بلووجستان مرد.

**عەشیرەتی بشنەوی:**

لە ساڵی ١٥٠ی هیجری، عەشیرەتێکی زلی کوردستانی موکریان لە محالی زەرزاوە ڕوو بەخاک و کێوەکانی هەکاری ڕۆیشتن. لە وان حکوومەتی کوردی بشنەوی لە دیاربەکر و خەڵات لە عەسری سێیەمی هیجریدا دامەزراندرا. لە خاکی هەکاری دا ئومەرایانی هەکاری لەو عەشیرەتەن کە بەبشنەوی ئەشنەوی - شنەوی، ناوبانگیان کردووە کە بەناوی حاکمانی هەکاری (حەکاری) دەناسرێن.

**عەشیرەتی کوردی موکریانی ئێستا:**

کوردی موکریانی ئێستا بە٢٠ عەشیرەت دێنە ژمارەوە و هەر یەک لەم عەشیرەتانە زۆر قەبایل و بەرەبابیان لێ جوێ دەبێتەوە. بەڵام ئێمە لێرەدا هەر لە عەشیرەتە ڕاستەقینەکە دەدوێین کە ئەمانەن: ١- بەگزادەیی، ٢- دێبوکری، ٣- حەسەن خاڵی، ٤- مەنگوڕ، ٥- گەورک، ٦- مامەش، ٧- پیران، ٨- زەرزا، ٩- تیلەکۆ، ١٠- چارداوەڕوو، ١١-

باشۆکێ، ١٢- ئۆمەربڵ، ١٣- باریک، ١٤- ورمزیار (هورمزیار)، ١٥- سیت، ١٦- سێ لەکەیی، ١٧- بەختەچی، ١٨- گەڵباخی، ١٩- گۆران، ٢٠- شقاق.

**عەشیرەتی بەگزادە:**

لە بنەماڵەی حاکم و میرانی کوردی موکریانن. هەموو خاوەند ماڵ و حەشەم و موڵک و ئەملاک و دێهات و سامانێکی زۆرن. گەلێک پیاوانی ناودار و زرنگ و ئەدیب و گەورەیان هەنە کە لە داهاتوودا بەهەڵکەوتی سەربهوردە ناویان دەبرێن و باسیان دەکەم.

**عەشیرەت دێبوکری:**

نەتەوەی ئالورئاغا و شالورئاغان. دێبوکری کە لە ڕۆژاوای جنووبی شاری سابڵاخە پێگەیشتوون و بوونەتە عەشیرەتێکی گەورە و زەبەر دەست و دارا و دەوڵەمەند و خاوەند موڵک و سامان. ئەوانەش بەچوار بەرەباب دەناسرێن: ١- هەباساغایی، ٢- سلێماناغایی، ٣- حەمەداغایی، ٤- مارفاغایی.

١- **هەباساغایی:** کە لە ئیندرقاش و کارێزە و عەمبار و سەراو و سەرچاوە دادەنیشن. هەباساغا سێ کوڕی هەبوو: ١-قادراغا ٢- هەباساغا ٣- ئەحمەداغا.

هەباساغا لە دەوری زەفەرودەولە خنکاندرا. قادراغای کوڕی لەلای حکوومەتی قاجاڕان زۆر بەقیمەت و خۆشەویست بوو. هەباساغا کە برا گەورە بوو، ڕوتبەی میرئاخۆری شای پێدرا، سەربهوردیان لە دوامینی ئەم کتێبەدا باس دەکرێ.

٢- **سلێماناغایی:** لە قونقەڵا دادەنیشت، خدرئاغای کوڕی سلێماناغا پیاوێکی زرنگ و ئازابوو. لە دوای ئەو کوڕی حەسەناغا لەجێی بابی دانیشت؛ کە مرد. ئێستا کوڕی ئەو باپیراغایە، زۆر دەوڵەمەند و زرنگ و ئازایە.

٣- **مارفاغایی:** حاجی ئەحمەداغای حاجی ئێلخانی کوڕی مارفاغایە. ٣ کوڕی زۆر ناودار و بەکاری هەیە کە ئەمرۆکە موکریان بەوان دەناسرێن: ١-عەلیاغا ٢- مەحموداغا ٣- حاجی بایزاغا. لەم کتێبەدا لە زۆر جێگایانی بەندەکانی دوای ٩ - ١٠ - ١١دا ناویان دەبرێن و سەربهوردیان باس دەکرێن.

٤- **حەمەداغایی:** چوار بەرەبابن کە ئەمڕۆکە لە ئیندرقاش و گێچا دادەنیشن و دەستڕۆیی و بەکارەن؛ بەڵام نەک وەکو مارفاغایی.

**عەشیرەتی حەسەن خاڵی:**

لە عەشیرەتی هەرە پێشووی موکریان دێنە ژمارەوە. بەبنەماڵەی ئاغا و خاوەند موڵک دەژمێردرێن. لە دێهاتی ڕۆژهەڵاتی شاری سابڵاخ لە عیساکەندی و مووساکەندی و بورهان و ئەو جێگایانە دادەنیشن. ئێستا بێدەستن، بەڵام دەستی ڕێزیان لێ دەندرێ.

عەشیرەتی مەنگوڕ و گەورک و مامەش و پیران بەبلباس ناودەبرێن و دەناسرێن. عەشیرەتێکی زۆر لەمێژی کوردستانی موکریانن. هەمووددەمێک لە کێو و شاخە بەرزەکانی ڕۆژاوا و جنووبی شاری سابڵاخ دادەنیشن.

بەگەورەکانی مەنگوڕ دەڵێن «کادەرویشی» یا «مەزن». بەگەورەکانی گەورک دەڵێن «کەڵشێری» یا «خدری خدران». بەگەورەی پیران دەڵێن مەزن، بەگەورەی مامەش دەڵێن مەزن یا ڕەئیس. لە هاتوودا سەربهوردی مەزن و گەورەکانی هەر چوار عەشایەر باس دەکرێن.

عەشیرەتەکانی دیکە لەژێر ئیدارە و گەڕانی بەگزادە و دێبوکریدا دەژین. گەڵباخی و چاردواوەڕوو گەورە و مەزنی خۆیان هەیە. بەڵام بەڕاستی جگە لەم چوار عەشیرەتی بلباسە، چاردە عەشیرەتەکانی دیکە لە ژێر فەرمان و گەورەی بەگزادەی دێبوکری دان و هەریەک بەبلاوی لە محالێک دانیشتوون.

عەشیرەتی پژدەر و نورەدینی لە دەوری حاکمانی موکریاندا عەشیرەتێکی زۆر گەورە و بەهێزی موکریان بوون، بەڵام ئەمڕۆکە لە خاکی خۆیاندا زۆر بەهێز و دەوڵەمەندن. لە سایەی بابەکراغای گەورەیانەوە بەڕێکی و موتەفیق لەژێر ئیدارەی عیراق دان، لە خاکی موکریاندا نین و سەربەخۆ عەشیرەتێکی ناودار و غەییور و حەمیەتمەند و گەورەن.

هەر ٣ عەشیرەتانی سووسنێ و ملکەڕی و بەراجی کە لە لای سەردەشت دادەنیشن لەسەر عەشیرەتی موکریانن؛ بەڵام چونکو ئەمڕۆکە لە خاکی پژدەر دادەنیشن و هێندێکیان تێکەڵ بەکۆمەڵی گەورک بوون، بۆیە لە لیستەی عەشایرانی موکریاندا باس نەکران. بەڵام ڕەوشت و بەرگ و شێوەی زمانیان لە عەشایرەکانی موکریان دوورنەکەوتۆتەوە و لەژێر تەئسیری زمانێکدا دەژین.

نورەدینی و پژدەریش هەروەها لە هاتوودا لەگەڵ هەڵکەوتووی سەربهوردان دێنە باسکردن.

## مەحال (ناحیە)ی موکریان

خاکی موکریانێ ئەمڕۆ کە بە١٨ ناحیە (مەحال) داندراوە. عەشایرانێ کە لە سەرەوە لێی دواین لەم مەحالانەدا دانیشتوون. هەندێ مەحالیش بەناوی عەشیرەتێکی لێ دامەزراوە ناوبانگی کردووە:

١- مەحالی شازادە، ٢- ئاخچەی وان، ٣- جانمەرد، ٤- موکریان، ٥- مەجیدخان، ٦- داشکستان، ٧- بەی، ٨- فەیزوللابەگ، ٩- تیکانتەپە، ١٠- هەوشار، ١١- گەورک، ١٢- سەردەشت، ١٣- مەنگوڕ، ١٤- لاجان، ١٥- کۆنەلاجان (پیران)، ١٦- زەرزا، ١٧- سندووز (سولدز - سلدوز)، ١٨- شار وێران.

**قەسەبەی موکریان:** خاکی موکریانی ئەمڕۆکە هەشت شاری هەیە، ناوچەی موکریان شاری سابلاخە: ١- سابلاخ (مەهاوا)، ٢- سەردەشت، ٣- بانە، ٤- بۆکان، ٥- ساین قەلا، ٦- میاندواو، ٧- نەغەدە، ٨- شنۆ (ئەشنود).

**دەشتی موکریان:** خاکی موکریانێ ئەمڕۆکە چوار دەشتی زۆر گەورەی هەیە، کە هەریەک لەو دەشتانە بەناو جوێ دەبنەوە: ١- دەشتی شاروێران، ٢- دەشتی لاجان، ٣- دەشتی سندوس، ٤- دەشتی میاندواو.

**دەشتی لاجان:** بەدەشتی مامەش و لای غەربی جنووبی بەکۆنە لاجان یا دەشتی پیران ناودارە.

**دەشتی سندوس:** بەدەشتی نەغەدە و لای ڕۆژاوای بەدەشتی زەرزا و لای شیمالی بەدەشتی «کەنار دەریا» ناودەبرێ.

**دەشتی میاندواو:** بەشامات، بەتالاو، بەحاجی حەسەن ناودەبرێ و بەگەزلین لای شیمالی غەربی و بەکەلبی ڕەزاخان لای جنووبی شەرقی ناودەبرێت.

**شەرقی میاندواو:** نێوانی چۆمی چەخەتو و چۆمی تەتەهوو، بەدە دەشتی گامیش و گۆلی ورمێ و شیمالی میاندواو بەدەشتی مەڵکەندی، لەمەوپێش شیمالی میاندواو بەخاکی «مەقدەم» و جنووبی بەخاکی «دەهدەم» دەناسرا.

دەوروپشتی بۆکان دەشتی هەیە، بەڵام زۆر بچووکە کە پیی دەڵێن: دەشتی «ناچیت» یا «وشتەپە».

## بەندی دووەمین

## فەسڵی یەکەم

### لوللو - لوللوبووم - گوتی - کوتی - کاسی - کاسۆ

### لە ئەقوامی ئاریانی کە لە کێوەکانی زاگرۆس دانیشتوون

### ١- لوللو یا لوللوبووم:

ئەم قەومە لە قەرنەکانی زۆر پێشووەوە لە خاکی زەهاو و شارەزووردا دیتراون؛ بەڵام لە کەیەوە لە قەومی هیندی جوێبوونەوە و کەوتبوونە ئەو خاکەوە نەزاندراوە، هەر هێندەمان بۆ ئاشکرا بووە. لە پێش ئەواندا میللەتی گوتی لە کێوەکانی زاگرۆسدا هەبوون، لوللووەکان تێکەڵ بەو میللەتەی گوتی بوون کە ئەوانیش ئاریانی بوون و لەو خاکەدا زیندەگانیان دەکرد. ئاسارێک کە لە کەرکووک دەستکەوتووە لێمان دیار دەکا کە ئەو میللەتە خاکی «هاڵمان»یشیان گرتووە و بەسەریدا زاڵبوون.

ئەو میللەتە لە قەرنی هەژدە و نۆزدەی پێش میلاددا لە خاکی ئاسوور حوکمداریان کردووە، عەسری سێزدەمین لەشکری ئاسوور و لوللو پێکەوەبوون. لە دەوری «ئاشوور ناسرپاڵ»ی دووەمدا خاکی لوللوو گەلێک ئاوەدان و پڕ لە میللەت بووە. لە سنعەت و کار و پیشەی چاک زۆر پێشکەوتوون. پادشای ئاسوور پیاوە کارکەر و سنعەتکارەکانی لوللوی بردۆنەتە ئاسوورستان و ئیشی پێ کردوون. لەوانەوە میللەتی ئاسوور فێری سنعەت و پیشە و کاربوون. ئەو قەومە بەتەدقیقاتی پرۆفیسۆر «سپایزەر» دەبنە باپیرەی کوردەکانی «لوڕ».

### ٢- گوتی - کوتی:

میللەتی گوتی کۆمەڵەیەکی هەرە گەورەی قەومی ئاریانی دانیشتووی کێوی زاگرۆسە و لەگەڵ سۆمەر و ئاکاد شەڕیان کرد و «نارامسین»ی فەرمانڕەوای بەناوبانگی ئاکادیان شکاند و حکوومەتەکەیان لێگرت. حوکمدارەکانی «لاغاش»یشیان خستە ژێر فەرمانی

خۆیانەوە. بەتەواوی خاکی سۆمەر و ئاکادیان کەوتە دەست و بەسەریدا حوکمڕانیان کرد.

یێکەمین فەرمانڕەوای گوتی «ئانناتۆم» لە قەرنی ۳۱ی پێش میلاد لەگەڵ حکوومەتی عیلام شەڕی کرد.

«ئاننۆ - بانینی» پادشای گوتی لە قەرنی ۲۸ی پێش میلاددا لەگەڵ «گوتی پاتەسی» پادشای لاغاش بەشەڕهات و گرتی و خستیە ژێر فەرمانی خۆیەوە. ئەو پادشایەش گوتی بوو کە لە ئاکاد و بابیلستان حوکمڕانی دەکرد.

لە ئاساری ئاسوور کە لە قەرنی (۱۳) سێزدەمی پێش میلاددا. حکوومەتی ئاسوور ئیحتیاجێکی زۆریان بەمیللەتەکانی لوللو و گووتی بووە و داوای یارمەتییەکی زۆریان لێ کردوون و ئەوان فریایان کەوتوون. نیشتمانی میللەتی گوتی (کوتی) ڕێزە کێوی زاگرۆس (کوردستان) بووە.

لە قسە و گوتەی ڕۆژهەڵاتناس و زاناکان وا تێدەگەین کە ناوی: کورتیوی، کاردۆخ، کاردۆخۆی، کوردۆئەی، کوردایبا، کاردا، کورتی، گوتی، کوتی، غوردی، کارداک، غوردیا، غوردویای، سیرتی، غوردوئەنی، کارداویە، کاردایە، کارتاوایە، هەموویان، لەگەڵ ویکنەچوونیشیان یەکێکن.

پرۆفیسۆر «سپایزەر» و موستەشریق «دراوەر»، کوردی ئەمڕۆ و کاردۆخ کوردوخۆی. ئەکسەنەفۆن و «کاردای» سۆمەرەکان دەکەنەوەیەک و هەموویەکن و فەرقیان نییە.

## ٣- كاسی - كاسۆ:

ئەو قەومە لە لای ڕۆژاوای خاکی کێوی کوردستان (زاگرۆس) و لە ڕۆژهەڵاتی لای دیجلە دادەنیشتن و بەکردار و چاندن و جووت خەریکبوون. «رب النوع»ی گەورەی ئەوان، خودای ڕۆژ ناوی «سوریاش» بوو. ئەوە لەفزی ئارامییە. ئەو میللەتە ئنقرازی بەحکوومەتی حامورابی دا و لینگیدا سەر «هیت»ەکان و لە بابیلی دەرکردن و بناغەیەکی حوکمداری و سەڵتەنەتی لە خاکی بابیلستان «سۆمەر» و ئاکاددا دامەزراند. ناوی حکوومەتی کاسییەکان «کاردونیاش» بوو. شەش عەسر ئەو سەڵتەنەتە گەورەیە بەخۆشی ڕایبوارد و بابیلی بەخێو کرد.

لە دەوری سەڵتەنەتی کاسیدا حکوومەتی ئاسوور لە کەلێن و دەرفەتدا بەرزبوو، کە ئەو حکوومەتە نەزاندرا بوو. دووجار لە ۱۲۷۵ ولە ۱۱۰۰ ق.م لینگیان دا سەر بابیل و گرتیان؛ بەڵام بۆیان ڕاگیراو نەبوو. لەپاش هەموو شەڕ و کوژتار، بەشکانی ئاسوور

دوامینی شەڕهات.

لە سەڵتەنەتی کاسیدا نێوانی بابیل و میسر گەلێک دۆستی و ئاشنایەتی پەیدابوو و پێکەوە بەخۆشی ڕایانبوارد.

بۆ کێشانی عەڕرابە (ئەڕابە) کاسییەکان ئەسپیان بەکاربرد و بوو بەڕەوشت.

لە دەوری سەڵتەنەتی کاسیدا «شوتروک ناخونتا» پادشای ناوداری عیلام بابلی گرت و هەموو چتمەکی گرانبەهای ئەو شارەی بردە شووش؛ لەوانە پەیکەری «نەرامسین» بوو، لە پاش سیی ساڵ گەڕاندراوە بابیل. پەیکەری خودای گەورەی بابلییەکان مردۆک بوو.

هەڵمەت و پەلاماردانی عیلام سەڵتەنەتی کاسی (کاردۆنیاش)ی خست و تێکیدا، کاسییەکان لە پاشان گەڕانەوە کوردستان (ایران باستان - حسن پیرنیا - مدخل سلسلەی سیوم - لاپەڕە ١٢٤).

ئەحمەد ڕەفیق لە تەئریخی عموومی جلدی ١ و لاپەڕە ١٦١ - ١٦٢دا باسی کاسییەکان دەکا و دەڵێ: قیصلر، یعنی شمدگی کوردلر، کاسۆکان، یەعنی کوردەکانی ئێستا هەموو دەمێک ڕەوشتی خۆیان بەختیو کردبوو. ئەو کاسییانە لە ڕۆژهەڵاتی دیجلە دانیشتوون و بەنفووز بوون. لە ساڵی ١٨١٤ی پێش میلاددا لینگیان دا سەر حوکمداری یەکەمین و تازەی بابیل کە «ئیلۆ مایلو» بوو، لە ناویان برد و پووچیان کردەوە و ئەو حکوومەتەیان تێکدا.

کاسییەکان هەرکە بەسەر بابیلستاندا زاڵبوون، خاکێکی کە حامورابی گرتبووی، کەمکەمە کەوتە ژێر دەستی کاسییەکانەوە. لە دوامیندا حکوومەتی نەزاندراو لە «الاسار، قلعە الشرق» هاتبووە ڕوو. ئاسوورییەکانی بۆ جنووب ئاژۆت و کاسییەکانی شکاند و ئەقوامی سامی سەرکەوتن.

ئاکادەکان بەمیللەتی کاسۆ (کاسی)یان گوتووە «کاشش» و لە کتێبە موقەدەسەکاندا بە«کوش» ناوبراون. کاسییەکان کە حکوومەتەکەیان تێکچووە، گەڕانەوە کێوی زاگرۆس (کوردستان).

لە عەسری حەوتەمینی پێش میلاددا «سنا خریب» چووە سەر میللەتی کاسی و شەڕی لەگەڵدا کردن. لە دەوری هەخامەنشیدا بۆ هاتووچووینی بابیل و هەمەدان (ئەکباتان) هەموو ساڵێک دراوێکی قورسیان بەباجیی ڕێگا لە پادشایانی هەخامەنشی دەستاند. ئەسکەندەر چووە سەریان و شەڕی لەگەڵا کردن. سەرداری ڕۆما «ئەنتیفۆنۆس» بەناو

عەشیرەتی کاسایدا چوو و لە «پۆلی تەنگ گەلّوو» تێپەڕی.

میللەتی ماد (میدیا - مادا) کە چوونە کێوی زاگرۆس، لەگەڵ کاسییەکان ڕێککەوتن. ئەودەمە کێوی زاگرۆس نیشتمانی کاسی (کاسۆکان) بوو. لە ڕۆژاوای گۆلی ورمێ و لە کێوەکانی هەکاری ئەمڕۆ کە میللەتی کوردو (کوردۆخ) هەبوون، لەلایێکی سەلماس و خۆی و لە ڕۆژهەڵاتی گۆمی وان پارچە خاکێک بەناوی کوردو (کاردا) ناوبانگی کردبوو کە لە هاتوودا باسیان دەکرێ.

# فەسڵی دووەم

## ماد و هەخامەنشی و ئەسکەندەر و جێنشینانی ئەسکەندەر

### ١- دەوڵەتی ماد

بۆئەوەی بنەچەکە و باپیرەکانی ڕابردووی کوردی موکریان و مێژووی زۆر لەمەوپێشی کوردستانی موکریان بزانین و تێی بگەین کە لە کەیەوە ئەو خاکە لە دەست ئەو کوردانەدا بووە، بەکورتی ناچارین هێندێک لە میللەتی ماد و مانناى و گام میرو و خاک و نیشتمانەکەیان بدوێین و کەمێکیش باسی میللەتی نەهری (نەیری) بکەین و دەورەکانی هەخامەنشی و ئاشکانییەکان و ساسانییەکان بخەینە پێش چاو، تاکو کەم تا کورتێک بەسەر مێژووی خاکی موکریاندا ئاگادار بین.

**ماد:** ئەم باسە لە بەرگی یێکەم و فەسڵی یێکەم و لاپەڕە ٦٨ی ئێرانی باستان تەئلیفی حەسەن پیرنیا وەرگیراوە:

مادیەکان: ئارین و باپیری کوردەکانی موکریانی ئەمڕۆکەن؛ بەڵام کەنگێ هاتوونە ئێران نەزاندراوە و وەکو ئاریانیەکانی دیکە نەگەیاندراوەتە زانین کە کەی هاتوونە خاکی ئێران. مادەکانیش هەروا نامەعلوومە، بەڵام ئەوەندەمان بۆ ئاشکرابووە کە هاتوون لە غەربی خاکی ئێران و لە کێوەکانی زاگرۆس جێگیربوون و لەوخاکەدا قەومی «کاسی» لەمێژبوو هەبووە و لە یەک ڕەگەزی ئاریانی بوونیان بێ شوبهەیە؛ هەروەکو لە دوامینی فەسڵی ئەم بەندەدا بەدرێژی لێی دەدوێم.

«تیگلات پالاسەر»ی حوکمداری ئاشوور ساڵی ١١٠٠ ق.م لەشکرکێشی کردۆتە سەر ئەو خاکە کە لە پاشان بوو بەخاکی ماد. لە زاگرۆس و یان لە کێوەکانی کوردستان تێپەڕی. بەڵام لە نووسراوێکی دا ناوی مادی نەبردووە. «شەلمانەسەر» لە دوای ئەو، ساڵی ٨٤٤ ق.م بۆ سەر حکوومەتی نەهری کە ئێستاکە بەکوردستان ناودەبرێ، لەشکری برد و چووە نێو ئەو خاکەوە. ئەو خاکە لەوەپێش لەبن فەرمانی حکوومەتی بابیلدا بوو. ئەمیرەکەیان ناوی مەردۆک (مەرودمیک) بوو. ئاسوورییەکان کە نزیکبوونەوە، ئەو ئەمیرە هەڵات و چووە نێو لێڕەوارەکانەوە و گەنج و ماڵی بەجێهێشت بۆ ئاسووریەکان کە تاڵانی کەن. لەپاش ئەوە پیاوێکی کوردی کاسی کە لە ڕەگەزی میللەتی نەهری بوو، بەوالیەتی لەسەر ئەو خاکە داندرا کە ناوی «یانزۆ» بوو. لەپاش چەندێک یانزۆ پشتی بەمیللەتەکە قایم بوو و سەرکێشیی کرد.

سالّی ٨٣٨ ق.م شەلمەنەسەر چووە سەریان. یانزۆی کاسی و نەعرییەکان هەلاتن و ٢٨ ئەمیر پادشای نەهری بەدیل گیران و برانە پایتەختی ئاسوور. لە دوای ئەوە لەشکرە شەرکەرەکەی ئاژۆتە سەر خاکی «ئامادای» و «خرخار»، کە ئەو جێگایانە بەنزیک کرماشانی ئەمرۆ دەناسرێن.

«شەمس ئەداد»ی حوکمداری ئاسوور جێنشینی شەلمەنەسەر، ناوی مادی بردووە کە چووەسەری و گرتوویە و باجی لێ ئەستاندووە و زۆر شارانی مادی خراپ کردوون، لەوەوا دەردەکەوێ کە ئەو خاکە گەلێک ئاوەدان و بەنفووس بووە.

ئەداد نیراری سێیەمی ئاسووری سالّی ٨١٠ ق.م چووە سەر ماد. تیگلات پالاسەری چوارەم سالّی ٧٤٤ ق.م لەشکری بردە سەر ماد و هەلّمەتی دایە. لەبەر دوژمنایەتی یەکدی و شەڕی ناوخۆیی و لێک بلاوبوون، یەکەیەکە شکاندران و زۆر خاکیان لێ گیرا و خسترا سەر خاکی ئاسوور. ٦٠٠٠٠ پیاویان لە ماد بەدیل گرت. لە مەڕ و گا و بزن و ئەسپ و ئێستر و گامێش و وشتر، مێگەلێکی زۆری بێ ژماریان بەتالان بردە پایتەختی ئاسوور و کوژتارێکی قورسیشیان لە میللەتی ماد کرد.

سالّی ٧٣٧ ق.م مادیەکان بەدەست ئاسووریەکانەوە تووشی کوژتار و تالان و بەدیل چوونێکی زۆربوون. دیلی مادیەکان گەیاندرانە پایتەخت، مادیەکان وایان بەسەرهات لە ژیان نائومێدبوون و دەستیان لە زیندەگانی بەردا.

سالّی ٧٢٢ ق.م سارگۆنی دووەم کە چووەسەر فەلەستین، دیلێکی بێ ژماری لە ئیسرائیلییەکان ناردە خاکی ماد و دایمەزراندن. لە دوای ئەوە بەچەند سالّێک سارگۆنی دووەم چووە سەر میللەتێک کە لە جنووبی گۆلی ورمێ دادەنیشتن؛ ئاری نەژادو خزم و هەمرەگەزی مادیەکان بوون کە پێیان دەگوتن مانتای (ماننی). ئەو خاکە ئەمرۆکە خاکی موکریان و مەحالی سابلاخە. سارگۆن بەگژیاندا چوو. پاشای مانابیەکان کە ناوی «دەیائوککو» بوو بەدیل گیرا و ناردرایە سووریا و لە شاری «حەما» داندرا. جێگەی حیرەتە ئەو پادشایە کە گیرا نەکوژرا و بەحورمەتەوە بەخێو کرا.

گەلێک لە مێژوونووسەکان گوتوویانە دەیائۆککو یێکەمین پادشای مادییە کە لەسەر تەخت دانیشتووە. ئاسوورییەکان بەو خاکەیان دەگوت ولاتی دەیائۆککو. لە پاش ئەوەی کە گیرا و برایە حەما بەخاکی جنووبی گۆلی ورمێ، یان گوتووە: «بەیت دیا ئۆککو».

لەپاش ئەو شکان و پەریشانیەی مادیەکان، ٢٢ ئەمیر و پادشاهی ماد چوون و کەوتنە

بەر پێی حوکمداری ئاسوور و بەسوێندخواردن سەریان بۆ چەماند.

لەودەمانەدا ساڵی ٧٢٣ - ٧٠١ ق.م سناخریب بۆ سارگۆنی بابی نوویسی کە میللەتێکی شەڕکەر و ئازا کە ناویان گام میرا (گامیرا)یە هەڵمەتی بردەسەر خاکی وان. «ئەرگیشی دووەم»ی پادشای وان لە دەستیان تەنگەتاوە و ناتوانێ بەرامبەریان بکات.

ئاسووریەکان بەو میللەتەیان گوتووە «گامیرا»، لە تەوراتدا «جوومەر» و یۆنانەکانیش پێیان دەڵێن «کیمرۆ»، ئەوانە لە ڕەگەزی ماد و خزمی ماننای و لە نەژادی ئاری و زۆر جەنگیی وزەبەردەستن.

لە دەریای «ئازۆف» و لە ڕێگای قەفقازەوە چوون و هەڵمەتیان بردەسەر حکوومەتی وان. ئەو میللەتە سیلاحشۆڕ و سوارچاک و شیرباز و بەتەن و مەن و زل و بەهێز و شەڕکەرن. زەمانێکی دوورودرێژ ئاسووریان تەنگەتاو کرد. بەیارمەتی و کۆمەگی و پشتیوانی براکانی میللی خۆیان کە ماد و ماننای و سگ بوون، هەڵمەتی شێرانەیان دەبردە سەر ئاسووری. لەپاشان ڕوو بەئاسیای سوغرا چوون.

ئەوانە ئەو کوردانەی کوردستانی شیمالی ئەمڕۆکەن کە بەکرمانج ناو دەبرێن. بەڵام مادی و ماننای «باسیل نیکاتین» ئەم تیرە کوردە بە«ماندایامانج» (ئۆمان ماندا) ناو دەبا کە لە دەوروپشتی وان زۆر لەمێژتر جێگیر ببوون و ئەو خاکانەیان کرد بوو بەنیشتمانی خۆیان. لە خاکی ئاتورر پاتەگانەوە لینگیان دەدا سەر دەوڵەتی ئاسوور و تاڵان و کوژتاریان لێدەکردن.

کیمرۆییەکان لە پاشان چوونە ئەترافی وان و ئاسیای سوغرا و دەستەیێکیشیان بۆ جنووب چوون و لە مان (ماننای) دامەزران و حکوومەتێکیان دامەزراند کە تەورات بەو حکوومەتە دەڵێت «ئاشگناز»؛ چونکو ئاشکوزا ناوی کوڕی کیمرۆ بووە و لە نوویسراوەکانی ئاسووریدا نێوی ئەو پیاوانەیان بە«ئاشکوزا» بردووە.

ڕووسای دووەم کوڕی ئەرگیشی حوکمداری وان بۆ بەرهەڵستی و پێشگرتن بەمیللەتی کیمرۆ سەنگەر و قەڵای دروست کرد. قەڵای «تۆپراق قەڵا»ی نزیک ئەرزەڕۆم یەکێکە لەو قەڵایانە کە بۆ پێشگرتنی ئاشکوز کیمرۆکان دروست کرد.

هەرچەند گەلێک ساڵان ئاسوور ئەسپی لەنێو خاکی ئەو میللەتەدا داژوت، لە لێک جویبوون و نەیاری ناوخۆی ماد و ماننای و کیمرۆ و نەمرییەکان ئیستفادەی کرد و حکوومەتی خۆی گەورە کرد، بەڵام لەپاشان ئەو برایانە پێکەوە پشتیان پێک گرت و

دەستیان دایە شییر و لە هەرچوار لاوە پەلاماری ئاسووریان دا و گەورەیەکی ئازادیان لە خۆیان کردە پادشا و کۆبوونەوە کە ئەمەیە «کشات ریت». کشات ڕیتی ماد کۆمەڵێکی لە ماد و کیمرۆی و ماننی وسگ کۆکردنەوە و لنگی دا سەر قەڵای (کی شاشۆ) کە لە نیوەڕاستی خاکیدا و لە نزیک گۆلی «ورمێ»یەوە بوو.

گەورەی مادییەکان «مامی تیاریش» و گەورەی سگەکان «سپاکا» بوون. لە ژێر فەرمانی ئەو گەورانەدا کۆبوونەوە. لە شەڕێکدا ئاسووری لە دەست ئەواندا شکان. ساڵی ٦٧٢ ق.م هەموو تیرەکانی ئاری بیژراو، بوونە یەک و بۆ لابردنی ئاسوور ڕێککەوتن.

سگەکان کە لە خاکی ئازربایەگان حکوومەتیان دامەزراند «ئاسوور حیدین»ی ئاسوور ئەوانی کردە هەواداری خۆی و کچی خۆی دا بە«بارتاتۆی» پادشای سگ. بەوە ئاسوور توانیان پێش بەشۆڕشی کیمرۆکان بگرن. لەسەر ئەوە کیمرۆکان ڕوو بەئاسیای سوغرا چوون.

ئەوە بۆمان دیار دەکا کە حکوومەتی ماد و سگ لە خاکی ئازربایەگاندا هەبوون. ماد لە جنووبی گۆلی ورمێ و سگ لە شیمالی گۆلی ورمێ بوون، بەڵام ئاسوور بۆ بەرەی کاری خۆی تۆی خراپی و نیفاقی لەنێوان ئەو دوو برایەدا چاندبوو، بەوە ئینقرازی خۆی دواخست؛ دەنا لە کۆمەڵایەتی ئەوان ئاسوور تێک دەدرا.

ساڵی ٧٦٤ ق.م ئاسوور حیدین لنگی دا سەر ڕۆژهەڵات و ئەمیری ئەوێ و چەند کەسێکی بەدیل گرت. لەبەرئەوە زۆر لە ئەمیرانی ماد بەدیاری و پێشکەشەوە چوونە لای و سەریان بۆ چەماند.

خاکی مادی ئەو وەختە هەمەدان و کرماشان و هێندێک لە کوردستان و ئاوربایەگان بوون. کەوا بوو لاییێکی شیمالی غەربی حکوومەتی ئارارات بوو کە پایتەختی شاری وان بوو. جنووبی ماد، کلدان و عیلام بوون، بەڵام لە دواییدا کە حکوومەتی دامەزراند فرەبوو.

زۆری و ئیستبدادی ئاسوور میللەتی کوردی مادی ناچار کرد کە حکوومەتێکی گەورە دامەزرێنێ. شەڕوشووری ماد هەموو دەمێک لەگەڵ ئاسووردا بوو. کە کەلێن و دەرفەت وەدەست مادیەکان دەکەوت، لنگیان دەدا سەر ئاسوور. کە تەنگەتاو دەکران ئاسوور لەشکری دەبردە سەریان و دەیکوژتن و شار و دێهات و ئاوایی لێ خراپ دەکردن.

مادیەکان لە پێش زەمانێکی دوورودرێژەوە بەئاریانی ناونرابوون. لە دواییدا بۆ خۆیان

ناوی خۆیان نا ماد. ئەو مادیانەش شەش تییرەبوون:
١- بوز ٢- پارتاکون ٣- ئیستیروخات ٤- ئەریزانت ٥- بۆدین ٦- موغ.
مادیەکان گەلێک دەوڵەمەند و خاوەند مەڕومالآت و ڕەوەی ئەسپ و بارگیر و وشتر و ئێستر و گا و گێل و مێگەلە مەڕوبزن بوون. بەحشمەت و دەوڵەت و سامان، ناوبانگیان کردبوو. ئەسپی ماد لە هەموو ئەسپی دونیا بەناوبانگتر بوون و بۆ تەن و مەن و خۆشبەزی بێ وێنەبوون.
حەسەن پیرنیا لە تەئریخی ئێرانی قەدیمدا لە ماد کە دەدوێ دەڵێت: مادیەکان لە مەملەکەتی خۆیان کە ئازەربایەگان (ئاتروپاتەگان) و کوردستان و خاکی دیکەیە، دامەزران و بوونە شارستانی. ئەگەرچی لە یەک جوێبوون، بەڵام لەپاش ئەوە کۆبوونەوە، لە وەختی تەنگانی و هەڵمەتی دوژمندا دەبوون بەیەک وجوود و پێشیان بەسلاوی دوژمن دەگرت.
لەوە وامان بۆ دیار دەکرێ کە مادیەکان لە شکڵی ڕەوەندا هەر تییرەیەک لە ژێر فەرمانی مەزنی خۆیاندا شەڕیان کردووە. لە پاشان ئەو مەزنانە بەئەمیر و یا بەپادشا ناودەبران.
مادیەکان بەوانەیان گوتووە: «کشات ریت». مومکینە ئەو ناوە ناوی پادشا بووبێ، داریۆشی گەورە لە نوویسراوی بیستووندا گوتوویەتی: «فەراوەرتیش»ی ماد دەیگوت «من کشات ریت»ی مادم. ئەوە دەلیلە کە مادیەکان بەپادشا یا ئەمیریان گوتووە: «کشات ریت». چونکو لە گەلێک جێگای دیکەش کە دەکەوێتە بەرچاومان، بەو مەعنایە تێدەگەیێندرێ کە کشات ریت یەعنی پادشاه.
«کیتزیاس» موئەڕیخی یۆنانی لیستەی پادشایانی مادی بەو جۆرە نوویسیوەتەوە: ١- ئاریاکیس (٢٨) -٢- مائۆداکس (٥٠) -٣- سۆسارمیس (٢٨) -٤- ئارتی کاس (٥٠) -٥- ئاربیانیس (٢٢) -٦- ئارتایۆس (٤٠) -٧- ئارتینیس (٢٢)-٨- ئاس تی بۆراس (٤٠) -٩- ئاسپنداس (٢٥) -١٠- ئاس تی گاس (٣٥ ساڵ) حوکمڕان بوون.
بەڵام مێژوونوویسەکانی ئاسار و عولەماکانی دوای موحەقیقەکان بەدەستووری خوارەوە، سەربهورد و شەڕ و مێژووی پادشاکانی مادیان نوویسیوەتەوە کە ئێمە لێرەدا لێی دەدوێین، هەرچەندە ئارەزوومەندین لەم کتێبە (پەراوی)یەدا کەمتر سەربهوردیان بخەینە بەرچاو.

ئیستبداد و جەور و ئەزیەتدانی ئاسووریەکان میللەتی مادی تەنگەتاو کرد و ناچاری کردن کە بەرامبەر بەو زوڵمەی لێیان دەکرێ کۆببنەوە و لەژێر باری ئیستبدادی ئاسوور دەرکەون و ببنە میللەتێکی فەرمانڕەوا و حاکم و تۆڵەی ئەو هەموو ئەزیەتە لە ئاسوور بکەنەوە کە لێیان دەکرا.

ئەوە وای بەمادی کرد هەتا بوونە فەرمانڕەوا و بوونە پادشا و بوونە شاهەنشاه. میللەتەکانی دەوروپشتی خۆیان خستە ژێر حوکمی خۆیانەوە و هەتا دەریای ڕۆم حوکمڕان بوون.

ئەوەش بەهۆی تییرە و میللەتە بڵاوە کۆکراوەکانەوە وەدەستکەوت. هەر وەکو لە پێشدا لێی دواین، ماد و نەمری و کیمرۆ وماننی و کاسی و سگەکان کە هەموو بەبڵاوی و پارچە پارچە، بەزیللەت لەژێر پەنجەی بابیل و نەینەوادا گوزەرانییان دەکرد، ئەگەر وشیار نەبوونایەتەوە و تۆوی نیفاقێکی کەوتبووە نێوانیان هەلیاننەقەندبا و کۆنەبوونایەوە و بەدڵێکی خاوێن دەستیان بەیەکدی نەگرتبا، لەژێر باری زیللەتی ئاسوور دەرنەدەکەوتن و شاهنشاهییان دانەدەمەزراند.

**کشات ریت - یان پادشایانی ماد**

«دەیائۆکۆ» یێکەمین پیاوێکە بەکشات ریت (پادشا)ی مادی ناوبانگی کردووە. هێندێک لە عولەمایان دەڵێن ئەو هەر پادشای ماننی (کوردستانی موکریان)ەکە ئاسوور بۆ خاکی سوریە سورگومی کرد و لە حەما داینا. هەروەکو لە پێشدا لێی دواین، ئاسوورییەکان لە دوای سورگومکردنی بۆ حەما ناوی مەملەکەتەکەی ئەویان بە«بیث دەیائۆکو» ناوبردووە، بەڵام هێندێک لە عولەمایانی دیکە دەڵێن خاکی ئەو هەمەدان بووە.

لە لایەن یۆنانییەکانەوە ئەو پادشایە بە«دیۆکیس» ناوبراوە، ساڵی ٦٥٥ ق.م مرد.

لێرەدا دەبێ کەمێک وردبینی بکرێ، وادیار دەکا کە ئەو پادشایە ئەمیرێکی کوردی موکریان بووە و لە جنووبی دەریاچەی ورمێ حوکمڕانی کردووە، چونکو هەڵمەتی ئاسوور بۆ سەر خاکی ئەو، وامان نیشان دەدا کە ئەو خاکە موکریان بێ نەک هەمەدان.

فراوەرتیش: لە ساڵی ٦٥٥ - ٦٣٣ ق.م فەرمانڕەوایی کردووە. میللەتی ڕۆژهەڵات کە لە ڕەگەزی خۆی بوون کەمکەمە کۆی کردنەوە و خستنیەژێر فەرمانی خۆیەوە. میللەتی «پارس» دیسان کەوتە ژێر فەرمانییەوە. فراوەرتیش بەگەرمی تەقەلای دا کە لەژێر

پەنجەی ئاسوور خۆی و میللەتەکەی ڕزگار کات. لەشکری کێشا و چووە سەر نەینەوا، لە نزیک هەولێر، کە بەدەست «ئاسوورنابو» گیرا و کوژرا. ئەو شەڕ و کوژتارە ساڵی ٦٣٣ ق.م ڕوویدا، بەڵام بێ سوود بوو نەگەیشتە دڵخوازێکی کە هەیبوو.

هووە خشتر (کەیکسار): لە شکانی بابی دەرسی وەرگرت و میللەتەکەی بەسوارچاکی و سیلاحشۆڕی وەسەر خست و بەگژ ئاسووریدا چوو و شاری نەینەوای دەورەدا. بەڵام بەدبەختانە میللەتی سیت (سگ) لە قەفقازەوە هەڵمەتیان بردە سەر ئاتورپاتەگان (موکریانی ئەمڕۆ) کە شیمالی خاکی مادبوو.

هووەخشتر بەناچاری گەڕاوە پایتەخت و لەشکری برد و لە شیمالی گۆلی ورمێ پێشی بەسیت گرت و شەڕێکی قورسی لەگەڵا کردن. بەڵام خۆی شکا و شەرتە سەختەکانی سیتەکانی پەسندکردن. لەوەوە خاکی کوردستان تووشی شپرزەیی و کوژتار و تاڵان بوو. ٢٨ ساڵ خاکی مادی بچووک (کوردستانی موکریان) ژێرپێ و پێپەستی کوژتار و تاڵانی سیت بوو.

ساڵی ٦١٥ ق.م هووەخشتر سەرکردەکانی سیتی میواندارکردن و هەمووی کوژتن. لە دوای ئەوە سیتەکانی لە خاکی خۆی دەرکرد. لەو ساڵەدا بەدوژمنایەتی ئاسوور لەگەڵ «نەبۆ پۆلاس سار» کە داوای پادشایەتی دەکرد ڕێککەوت. لە دوای ئەوە نەینەوای دەورەدا. پادشای ئاسوور لەنێو قەسری شاهیدا خۆی و گەنج و ماڵ و منداڵ و ژن و حەشەمی خۆی سووتاند. ئاسوور و خاکی ئاسیای سوغرا هەموو کەوتنە ژێر فەرمانی مادیەکانەوە و گەورەبوون و بوونە پادشا.

پادشای ماد کچی خۆیدا بە«بەختونەسر» و کردیە پادشای بابیل.

ئاستیاک (ئەژدەهاک) لە دوای بابی بوو بەپادشا؛ بەڵام لەبەر بێ موبالاتی، زوو دەوڵەتی ئەو کەوت و کۆروشی پارس بوو بەپادشا. مادیەکان بۆ خۆیان سەریان لە ژێر فەرمانی ئەژدەهاک دەرخست و کورۆشیان کردە پادشا لە ساڵی ٥٥٠ ق.م.

**خاکی ماد:**

عیبارەت بوو لە ئازەربایەگان و هێندێک لە کوردستان و عیراقی عەجەم. بەڵام کە ڕووی لە گەورەیی کرد، لە چۆمی هالیس تاکو باختەر و لە گۆلی خەزەر تاکو پارس و خوزستان بوو.

(ماد) دوو بوون: مادی گەورە و مادی بچووک. مادی گەورە لە عیراقی عەجەم بوون،

مادی بچووکیش له خاکی ئازەربایەگان (کوردستانی موکریان) دابوون، کە بەخاکی ئاتورپاتەگان، ولاتی دەیائۆککو، خاکی ماننای،ماننی، مان، ماندا، مەندان، دەناسرێ و ناوبراوە؛ ماندا - مەندان ئەمڕۆکە تییرەییێکی گەورەی خێلّی هەرکین.

**٢- کەوتنی دەوڵەتی ماد - دەبێ چۆن بەراوردێ لە کەوتنی دەوڵەتی ماد بکەین؟**

کورتی تەمەنی ئەم دەوڵەتە و بەتالووکە کەوتنی، بۆتە مایەی پشێوی سەر سووڕانی مێژوو و دیریکنوویس و ڕۆژهەلاتناسەکان. ٥٦ ساڵ لەنێوانی ٦٠٦ - ٥٠٥ پێش میلاددا هەیە. ئەوەندە بۆ سەڵتەنەتێک درێژ و بۆ تەمەنی دەوڵەتێک زۆر کورتە. ئەگەرچی لەو بابەتەوە سەرچاوەکانی پێشوو و تازە چی تێدا نییە لێمان ئاشکراکا، بەلام سەربهوردێکی کەموکورت کە لە مادەکانەوە کەوتۆتە دەستمان، بۆ چلۆنی کەوتنیان سەر ڕشتەیەک لە دەستدا نییە. بەگوتنی: هیرۆدوت و ئەکسەنەفۆن و مێژوونوویسەکان، وامان تێدەگەیێنێت کە کۆشک و خانووبەرەی چەند نهۆم و باخوباخچە و ڕاو و نێچیری وا پان و درێژ و پێویستانی بەتایبەتی بۆ ڕاو داندرابوون. لەبەر دەرگای پادشایانی ماد، هەزاران پێشکار و نۆکەری بەبەرگی ڕەنگاوڕەنگ و سوور و کەسک و ئاڵوواڵا و کەمبەربەندی زێڕ و بازوبەند و ملوێنک زێڕ و بەگەوهەر و پێویستی هەموو جۆرە سەما و یاری بۆ کەیفوشادی لە دەرباری شاهەکانی ماد دەبیندرا و بەچاکی وەکو دەرباری ئاسووریەکانی دەنوواند.

ئەوە وامان نیشان دەدا کە لەپاش کیشوەرگیری هووەخشتر پیاوانی دەربار و کاربەدەستەکانی ماد لەنێو شەپۆلی شایی و کەیفدا دەسووڕان؛ بەوە تووشی تەنپەروەری و بێدەسەلاتی و پشت ساردی و کار نەدیتن ببوون. لەشکریان و سەردارەکانی ماد لە دەوری سەڵتەنەت درێژی دوامین پادشای ماددا سستیان تێکەوتبوو و ڕەوشتی جەنگاوەری و مەردانەگی و دلێریان ون کردبوو؛ جا بۆیە وایان لێهات و نەشیان لە پێش کۆسپەیەکی تازەی پارس (پارسییەکان)ی کە لە کێو گەورە ببوون و بەزیندەگانی سەخت بەڕێ چووبوون خۆیان ڕابگرن و بەرامبەرییان بکەن.

پارسییەکان لە دوای زاڵبوونیان بەسەر ماددا بەرگ و ڕەوشتی خۆڕازاندنەوە و زیندەگانی و تەنپەروەرییان لە مادەکان وەرگرت؛ بەوە کەوتنە شایی و زەماوەندەوە. لە ئیشوکاردا سست بوون و ڕەوشتی ئازایی پێشوویان لە دەستدا، لەبەر ئەوە بوو ئەسکەندەر لە پێش شەڕی «ئەلیس سۆس»دا بەدەستە لەشکرێکی خۆی گوت کە: «بڕۆن زینەتی ئەم ژنانە (مەبەست سەردارەکانی پارس بوو) بڕفێنن».

ئەسکەندەر بۆ خۆشی لە شەڕی «گۆگامیل» لەبەر چل ڕۆژ مانەوەی لە بابیل تووشی ئەو سستییە بوو. ئەسکەندەر ئەگەر زوو نەچووبایە، تووشی شپرزەیی دەبوو. دەوری پاش ئەسکەندەر کەوتن و سستی یۆنانی و سلووکییەکانیش لەو ڕووەوە بوو کە لەوە پێش ماد و پارسەکانیشی پێکەوتن.

گەلێک لە دێریک و مێژوونووسەکان بەمە دڵنیان کە دەوڵەتی مادی ئاریانی وەرگەڕایە سەر دەوڵەتی هەخامەنشی (پارس)ی ئاریانی، جوداییەک نەکەوتە تەشکیلاتی دەوڵەتەوە. دەوڵەتی ماد یان شاهنشاهی ئەژدەهاک لە دەست کوروشدا تێکنەچوو، بەڵام ڕەنگی گۆڕا لە تیرەییێکی ئاریانی بۆتیرەیەکی ئاریانی و لە پیاوێکی ئاریانی بۆ پیاوێکی ئاریانی دەورە کرا. ئەژدەهاکی دوامین ئیمپراتۆری مادی ئاریانی لەسەر کار لاچوو، کۆروشی ئاریانی کەوتەسەر کاری ئیمپراتۆری ئارياییەوە. نەقشەییێکی هووەخشتر کێشابووی کە بچێتەسەر دراوسێکانی و بیانگری، لە پاشان ئیمپراتۆری دوای ئەو لە دەست هات و خستیانە ڕوو. مێژوونووسەکانی یۆنانی و عیبری و تەتەبوعاتی تەئریخی ئێرانی قەدیم تەرجومەی فەرەنگی لەسەر ئەوە یەک قسەن کە گوترا. ئەمەشیان نیشان داوە کە لە دوای کەوتنی ماد بەقەڕنێک ئەو ناوە هەرمابوو.

جوغرافیازان و دێریک نووسەکانی پێشوو مادیان بە٢ [دەستە] داناون:

١- مادی گەورە لە عیراقی عەجەم؛ ٢- مادی بچووک لە ئازەربایەگان و پارچەیەکی کوردستاندا فەرمانڕەوابوون. هێندێک عولەما گوتوویانە ماد سێ بوون: ٣- مادی ڕازی (ڕەی) بوون. بەڵام ئەو داوای دواییە بەخۆی نییە، چونکو لەودەمەدا ڕەی لەسەر خاکی مادی گەورەبوو. مادی گەورە لە ڕۆژهەڵاتەوە هەتا گۆلی خەزەر بوو. دەروازەی ئەو دەربەندە دەروازەیەکی ئاسنی هەبوو کە لە نێوان مادی گەورە و پارتو (پارت)دا هەڵکەوتبوو.

لە دەورەی ساسانیدا بەمادیان دەگوت «مای». لە دەوری ئیسلامیشدا بە«ماه» ناوبراوە کە جەمعەکەی «ماهات» بووە؛ هەروەکو ماه نەهاوەند و ماه بەسرە. لە ڕۆژئاوای خاکی ئێراندا، گەلێک جێگا و دێهات ناویان مارە؛ وەکو: مارئاوا (مارئاباد). عولەماکان گوتوویانە: مار لە مای لە مادەوەیە.

«ویکتۆر لانگلوا» کە نووسینی مێژوونووسەکانی ئەرمەنی کۆکردوونەوە دەڵێ: ماد بەزمانی ئەرمەنی مارە. بەپێشووی ئەژدەهاکی دوامین سەڵتەنەتی مادیان گوتووە: «ویشتا بازونک» کە مەعنای ئەوە بەکوردی هەژدیها زادەکانە.

## ٣- تەمەددونی دەوڵەتی ماد

لە بابەت تەمەددونی مادەوە ئاسارێکی وا دەست نەکەوتووە کە بتوانین پتر لە تەشکیلات و ئیجتماعی و کردەوەیان بدوێین. ئەگەر لە کتیب و نووسراوەکانی پێشینیاندا چتێکیش هەبێ کەمە. تاکو ئێستا لە پادشایانی ماد نووسراو و ئاسارێکی وا دەست نەکەوتووە. ئەوەی کە نزیک باوەڕێکی چاک بێ ئەمەیە: لە پێش گەورەبوون و دامەزراندنی دەوڵەتی مادی گەورەدا، هەریەک لە تیرەکانی ماد بەموستەقیللی ژیاون. لە دوای دەوڵەت دامەزراندنیان و هێز پەیداکردن و گەورەبوونی ماد، بڵاویان کۆبووەوە و بەگەورەکان و ئومەراکان هێزیان پتر کرد. بەڵام نازاندرێ کە ئومەرایانی خۆجێیی بەجارێک لە نێوانیدا لابرا بن. لە دوای کەوتن و نەمانی دەوڵەتی ماد، لەو خاکە ئەیالەت و وڵات و شاران لەژێر فەرمانی میرەکانی خۆجێییدابوون. لە بنەماڵەیاندا حکوومەت هەر ڕاگیراو یەک لە دوای یەک هەر پایەداربوون، ماد زۆر لەوەپێش ٢ بەش بوون: ١- بەشی شەڕکەر. ٢- بەشی گەورەکان. لە قەرنەکانی دواییدا بەشی ڕووحانی و ڕەنجبەریشیان لەسەر زیادکردن و بوونە ٤ بەش. لە چاغی مادەکان ئەو ٤ بەشە هەرهەبوون.

موغ: موغەکان تایفەییێک بوون لە ماد کە بەشی ڕووحانییان دامەزراندبوو. وا دیار دەکرێ کە مەزهەبی مادەکان مەزهەبی ڕەسمی موغەکان بووە. ناتواندرێ بێتەگوتن کە مەزهەبی زەردەشت لەودەمەدا لە ماد بڵاوبۆتەوە یان نە؛ چونکو ئاریانیان لەوە پێش ڕووناکییان دەپەرست. دەشێین بڵێین کە ڕۆژپەرستن لە مەزهەبی مادەکاندا هەبووە.

هەموو موحەقیقەکان بەوە باوەڕیان کردووە کە زەردەشت لە ماد چۆتە باختەر. وا تەسەور دەکەن کە موغەکان سیحر و جادووگەرییان تێکەڵ بەمەزهەب کردووە. زەردەشت ویستوویە ڕێکی خاتەوە، لەبەرئەوە کە موغی لێبوون، هەستا چووە باختەر و بەهرەمەندی دەستکەوت.

«دار مسس تیتەر» ئێرانناسی زانا دەڵێ: ئاوێستا لە دەوری مادەکاندا نووسراوەتەوە. «نۆڵدکە» دەڵێ: ئەگەر نووسراوانی پادشاکانی ماد دەستکەون وابزانم لە بابەت زمان و نووسینەوە زۆر وە پادشایانی پارس بچێت.

زانا و محققەکان دەڵێن: زمانی ماد زۆر نزیک بەزمانی پارسی پێشوو بووە و ماد و پارس زۆر بەئاسانی لە زمانی یەکدی گەیشتوون. «دارمسس تیتەر» دەڵێ: زمانی کوردی ئێستا لە زمانی ماد موشتەققە. هێندێک عولەما گوتوویانە: زمانی پشتوو یان پەختوویی

(ئەفغانی)یش لە زمانی ماد موشتەققە.

**لە بابەت سەنایعی ماد:** مەعلووماتی کەم لە دەستدایە؛ چونکو خانووبەرە و قەسری ئەو عەسرە هیچ نەماوە. بەڵام لە ئاسار ،کەمێک کە دەسکەوتووە دێتەگوتن. زانا و عولەماکان دەڵێن میعماری ماد لە هی هەخامەنشیەکان ناحەزتر و لە هی پێش هاتنی ئاریانییەکان بۆ ئێران جوانتربووە. مادەکان دەستووری میعماریان لە میعمارانی وان پایتەختی ئۆرارتو (ئارارات) وەرگرتووە. ئەو ئاسارانەی ماد کە دۆزراونەوە ئەمانەن:

١- شێرێکی بەرد لە نزیک هەمەدان، ئەم شێرە تا ساڵی ٩٣٠ میلادی ڕاوەستابوو، ئێستا کەوتووە و شکاوە (نۆڵدکە).

٢- لە نزیک سەرپردی زەهاو گۆڕێک بەدوکانی داود ناو لە بەرد هەڵقەندراوە. لەوێ شکڵی پیاوێکی ماد لە بەرد و بەرگی مادی لە بەرەو برسومێکی لە دەست دایە کە دەستەکە پەلک و پۆپی دارە و بەگەڵای خورما پێچراوە. لە چاغی پەرستش، بەدەستەوە دەگیرێ.

٣- گۆڕێکە لە نزیک کرماشان هەروەکو ئەو گۆڕە «فروهەر»ی لەسەر هەڵقەندراوە.

٤- لە لوڕستان گۆڕێکە نزیک سەرپرد پێی دەڵێن «وتاخی فەرهاد»؛ بەڵام ناتەواوە.

٥- لە دێی ئیسحاقوەند نزیک کرماشان، گۆڕێکە پیاوێک لە چاغی پەرستشدا لە بەرد هەڵقەندراوە.

جگە لەوانەش «پوولی بیوس» دەڵێ لە هەمەدان قەسرێکی زۆر گەورە هەبووە. لە هەمەدان گەلێک ئاساری دیکەش دەستکەوتوون، بەڵام چونکو بینا و خانوو ئاساری ماد لە خشتی خاو (کاڵ) و گڵ و قوڕ بووە و زۆری پێنەچووە لە ناوچووە و نەماوە. ئەگەر لە بەرد و خشتی سوور ئاساریشیان بەجێ هێشتبێ لە کەوتنی دەوڵەتەکەیاندا ونکراون، بەڵام ئەمەمان زۆر چاک لێ ئاشکرا بووە کە پادشایانی هەخامەنشی هەموو چتێکیان لە ماد وەرگرتووە و ڕەوشت و تەرتیباتی دەوری هەخامەنشی هی مادەکان بووە. ئەمە گەواییێکی ڕاستە کە چتێکی دەوری ماد یان هەخامەنشی دەبینین، نازانین کامیان هی ماد و کامیان هی هەخامەنشییەکانن.

هیرۆدۆت و سترابۆن نوویسیویانە کە هەخامەنشی چلۆنی بەرگیان لە ماد وەرگرتووە. کڵاوی لبادی (تەپڵە) و کەوای ئاودامێن و کەوش، لەوانەیە کە پارس لە مادیان وەرگرت. پراشێک و ئوپیبرت و وینگلیر کە ڕۆژهەڵاتناسی بەناوبانگن لەو ڕێگایەدا

زۆر مـاندوو بوون و دەڵێن تەمـامی مـەدەنیـیـەتی هەخـامـەنشی و ئاسـار و کـردەوە و تەرتیـبـاتیـان، هی مـاد بـوونی بێ شکە. مـادەکـان دەیانەویست بگەنە دەریا؛ زۆر کـۆشـان. ئەژدەهاک لە پێش شـەڕی لەگـەڵ کـۆروشـدا دەسـتی هەڵمـەتی بۆ بابیـل هەتا سووریا برد و گەیشـتە حەما (حماة - حماه). ڕۆژ بەڕۆژ دەوڵەتی بابیلی خسـتبـووە هەڕەشەوە. دەوڵـەتی ماد هێز و قـودرەت و تەواناى حەیرەت ئەنگێزی خۆی بەرز کرد و دراوسێکانی ترساند.

## ٤- دەوڵەتی هەخامەنشی

پارسـیـیـەکـان ئاری نەژادن، بەڵام نەزاندراوە کـەنگێ هاتوونە خـاکی ئێـران. لە نووپسراوەکانی ئاسوور وا دەردەکەوێ هەروەکو مادییەکان دەورێکی دووردرێژ لە فەرمانی ئاسوور دابوون. یەکێک لە پاشایانی ئاسوور بەخۆی نازیوە کە (٢٨) کەسی لە ئۆمەرای پارسی خستۆتە ژێر فەرمانی خۆیەوە. لە دەوری «سەرگۆن شەلمەنەسەر» پادشای ئاسوور کە لە ٧٢١ - ٧١٣ ق.م فەرمانڕەوایی کردووە، لە دەوری ئاسوور حید دین کە تا ٦٦٧ ق.م حوکمڕان بووە. پادشا و ئومەرایانی پارس دەسـتنیشـانی ئەوان بوون، لە دوای ئەوە پارس لە بەند و زیللەتی ئاسووری ڕزگاربوون و کەوتنە ژێر فەرمانی برا مادییەکانیانەوە.

پارسەکان شەش تیبیرەی شاری و دێنشین و چوار تیبیرەی ڕەوەند و چادرنشین بوون.

شەش تیبیرەکان ئەمانەن: ١- پاساگاردی ٢- مەرەفی ٣- ماسپیان ٤- پانتالی ٥- درووزی ٦- ژرمن. چوار تیبـیرەی ڕەوەندەکـانیش ئەمـانەن: ١- سـاگارتی ٢- مـەرو ٣- دروپیک ٤- دائین.

بنەمـاڵەی هەخـامـەنشی لە زادەگـانی تیبـیـرەی پارس گـاردییـەکـان بـوون. دوو بەرەباب لەوانە پادشاییان کردووە؛ چونکو دارا دەڵێت: من نۆیەمین پادشای هەخامەنشیم.

**کـۆروشی پادشـای هەخـامـەنشی:** لە پاشـان بەسـەر خـاکی مـاددا زاڵ بوو و ئەو حکوومەتەی تێکدا، بەڵام شکڵ و تەرتیـبـاتی حکوومەتی ماد تێک نەدرا. سـاڵی ٥٥٠ ق.م کە سـاڵی نۆیـەمـینی حوکـمداری کـۆروش بوو، هەمـەدانی پایتـەختی مـاد بەدەست کۆروش گیـرا. لە دوای ئەوە کۆروش هەمـوو خاکی مـاد و مـوسـتەعـمـەرەکـانیشی خسـتە دەست خۆی و مادی بچووک (کوردستانی موکریان)یش کەوتە ژێر فەرمانییەوە.

کۆروش سـاڵی (٥٢٩ ق.م) مرد. لە دوای کـۆروش «کەم بووجییە»ی کـوڕی لە سـاڵی ٥٢٢ - ٥١٩ ق.م حوکمڕانی کرد. بۆ کوردی ئاتورپاتەگان ئەمیرێکی خۆیی داندرا. کە

کەمبووجییە مرد «کئومات» ناو موغێک ناوی خۆی نا «بردیا» برای کەمبوجییە و لەسەر تەختی پارس دانیشت. لە کورد زۆر بوون بەهەواداری و مادی بچووکیش قبوولی کرد. دارای گەورە ساڵی ٥٢١ ق.م کئوماتی گرت و کوژتی و بۆ خۆی بوو بەپادشا.

**داریوش - دارا:** کە خاکی مادی گەورەی گرت ناوی خۆی نا پادشای مادی بچووک. کوردەکان کەلێن و دەرفەتیان دەستکەوت و هەستانە سەرخۆیان و «فراوەرتیش» ناو گەورە زادەیەکی خۆیان کرد بەپادشا و لەسەری کۆبوونەوە. لەشکری ماد کە لەگەڵ دارادا چووبوونە سەر بابیل، سەرکێشیان کرد و چوونە لای فراوەرتیش و هێزیان پێدا.

داریۆش سەرکردەیەکی سوپاهی خۆی کە مادی بوو ناردە سەریان کە ئەو شۆڕشە تێک بدات. لە نێوانی هەردوو لادا چەند شەڕ و کوژتار کرا، بەڵام بێ سوود ماوە. مادیەکان سەرکەوتن و دارا تەنگەتاو کرا.

لە دوای ئەوە داریوش فەرمانی دا شەڕ نەکرێ. چەندێکی پێچوو سەرکردەیەکی ئەرمەنی ناردە سەر فراوەرتیش، ئەویش لە دوای دووجار شەڕکردن شکاندرا. لە دوای ئەوە سەرکردەیەکی پارسی ناردە سەریان، ئەویش دوو شەڕی کرد و شکا و پەرێشان کرا.

داریوش کە بابیلی گرت و لینگی دا سەر ماد و لە دوای شەڕ و کوژتار مادی شکاند. فراوەرتیش هەڵات و لەپاشان گیرا و بردیانە هەمەدان و بەداریدا کرد و کوژتی. داریوش ئەوەی لە نەقشەی بێستوون دا بەتەفسیلی نوویسیوە و دەڵێ: فراوەرتیش بەخۆی گوت: من پادشا (کشات ریت)ی مادم. گرتم و زبانیم بڕی و کوژتم.... لەو نەقشەیەدا وێنەی فراوەرتیشی تێدایە و بەرگی لە بەرگی کوردی ئەمڕۆ دەچێ. لەوددەمەدا بوو «چیترە تەخماه» لە ساگارتی سەری بڵند کرد و گوتی: من نەوەی هووەخشتەری مادم. داریۆش چووەسەری و گرتی وبردی لە هەمەداندا ساڵی ٥٢١ ق.م بەداریدا کرد.

لە ساڵی ٥٥٠ - ٣٣١ ق.م، ١٢ کەس لە هەخامەنشییەکان لەسەر خاکی مادی گەورە و مادی بچووک (کوردستانی موکریان) دا پادشایەتیان کردووە. لە هەموو شەڕ و کوژتار و سەفەرێکدا مادیەکان لە سوپاهی هەخامەنشییەکاندا بەدڵ تێکۆشاون و پیاوی گەورە و سەردار سوپاهیان بووە. بەڵام وەنەبوون زۆر خۆشەویست بن لە لایەن پارسەکان، ئەگەرچی یەک ڕەگەز و یەک نەژادیش بوون، بەڵام حەزیان لێ نەدەکردن.

هەرچەندە مێژوونوویسەکان دەڵێن: حکوومەتی ماد کە تێکچوو و حکوومەتی پارس دامەزرا و جێنشینی مادی کرد، فەرقێکی نەکەوتە تەشکیلات و ئیدارەوە، بەڵام من وام

بۆ ئاشکرا بووە، بەپێی حکوومەتەکانی ئێستا ئیسپاتی مودەعام دەکات کە پارسییەکی کێوی و شار و ئاوەدانی نەدیتووی دوێنێ کە ژێردەستی مادی بووبێ و ئەمڕۆکە بووبێتە حاکم، چۆن بەرامبەر بەمادیەکان بوغز و غەرەزیان نەکێشاوە. هەروەکو ماد بەسەر ئاسووردا زاڵبوون چیان بەئاسوور کرد، پارسیش کە بەسەر ماددا زاڵ بوو ئەوەی کردووە. موعامەلەی داریوش لە نەقشەی بێستووندا کە لە حەق کوردە مادیەکاندا کرد و بەمەسەلەی فراوەرتیش و چیترەتەخمەهـ بۆمان ئاشکرا دەکا کە چی بەکوردە مادیەکان کردووە و تووشی چ ئەزیەت و کوژتار بوون. هەر بەو جۆرە ماد (کورد) دیسان کە چاوی بەخۆی کەوت، دوێنێ کە حاکم و ئیمپراتۆر بوو و ئەمڕۆکەش ژێردەست و فەرمانبەرە، ئەوە لە لایێکەوە و لەلاییێکی کەشەوە بزووتنەوەی پارسیەکان و موعامەلەی داریوش و هەخامەنشییەکان کە لە حەق گەورەکانی خۆیاندا چاوپێکەوت، بەبێ شک برینیان دەکولاوە و لە دڵیان دەگرت. بۆیە لە شەڕی ئەسکەندەردا ئەو میللەتە ئازایەی ماد هیچ کۆمەگی داریوشی دواییان نەکرد. ئەوە بێ شوبهەیە کە داریۆشی گەورە لە دوای یەکدی بەچەندێک ٩ پادشای ئەوان بگرێ و چاویان دەربێنێت و زمانیان ببڕێ و بەداریانداکا و ئەوانەش هیچ دڵگیر نەبن. فەن قبووڵی ناکا و تەئریخیش چاوی لێ ناقووچێنێت. هەروەکو لە نووسراوەکانی بێستوونی داریوش و ڕەسمەکان ورددەبینەوە، بۆمان حەل دەبێ. کە وایە کورد گەلێک ئەزیەت و پەرێشانیی بەدەست داریوشەوە کێشاوە؛ لەبەرئەوە لە شەڕی ئەسکەندەردا هیچ یاریدەیان نەداوە.

**٥- ئەسکەندەر**

ئەسکەندەر کوڕی فلیبی ماکدۆنییە. ئەوەڵ کەسێک کە لە ماکدۆنیە (مقدونیە)دا بوو بەپادشا فلیب بوو. ساڵی٣٥٩ تا ٣٣٦ ق.م لەگەڵ یۆنان و دراوسێکانیا شەڕی کرد. لەپاشان لە ژێر فەرماندەی دوو سەرداری خۆیدا لەشکری ناردە سەر پادشاکانی هەخامەنشی. لەشەڕێکدا ساڵی ٣٣٦ ق.م کوژرا.

ئەسکەندەر لە دوای بابی لەسەر تەخت دانیشت و کەوتە سەر هەوای پێشونایی بابی. لە دوای ئەوە ئێران کەوتبووە شۆڕش. ئەسکەندەر یۆنانی دامەزراندەوە و چووەسەر داریۆش.

لە بەهاری ساڵی ٣٣٤ ق.م ئەسکەندەر لە دەربەندی دەردەنێل تێپەڕی و لە کەناری مەرمەڕە لەگەڵ لەشکری پارس -کە هەمووی مادبوون- شەڕی کرد. بەوجۆرە خشا و

چووەپێش. لە هەولێر شەڕی لەگەڵ داریۆش کرد و شکاندی و کەمکەمە بەگەرمی ئەو خاکانەی گرت. ساڵی ٣٣٠ تا ٣٢٣ ق.م خاکی کوردستان کەوتە ژێر فەرمانی ئەسکەندەرەوە، بەڵام حکوومەتی مادی بچووک لەو چاغەوە دامەزراندراوە.

ساڵی ٣٢٥ ق.م ئەسکەندەر چووە سەر خاکی کوردەکانی کاسی. لە شەڕدا سەردار سوباهێکی کوژرا. ئەسکەندەر کە بەسەر ئەواندا زاڵ بوو بۆ، ڕوح دڵخۆشیی دانەوەی «هیڤیس تیۆن» کە سەردارەکەی بوو، سەری هەمووانی بڕی و کردنیە قوربانی ڕوحەکەی. مێژوونووسەکان ئەو سەربهوردەیە بەدڵگیری و ئەسەفەوە باس دەکەن. ئەو مەسەلە وەحشەتکارەی ئەسکەندەر «پلۆتارک - ئەسکەندەر بەندی ٩٤»و حەسەن پیرنیا (ایرانی باستان) بەحیرەتەوە لێی دواون.

## ئاسرەپات

لە دوای ئەوە خاکی کوردستان (مادی بچووک) کەوتە دەست ئەسکەندەر، هەروەکو مەرز و بوومەکانی دیکە ئەو خاکەشی کردە «خشەشرەیوان» کە بەیۆنانی «ستراپ» و بەعەرەبی (والی) بێ؛ هەموو خاکی ژێردەستی کە پارچە پارچە کرد و کردنیە حکوومەتی بچووک. والیەکانی. پتر لە مادەکان دانا؛ زۆربشیان ئارییایی نەژادبوون. لە جنووبی غەربی گۆلی ورمێوە هەتا سەری چۆمی ئاراس و بەسەر چۆمی ئاراسدا هەتا دەریای خەزەر و لە دەربەندی خەزەرەوە بەقەزوێن و زەنگاندا ڕوو بەهەمەدان بڕوا و ئەردەڵان و خاکی کوردستانی موکریان و کەمێک خاکی بابان و سۆران و لە سەرووی کێوەکانی هەکاریشی لەگەڵدا بێ، کرا بەحکوومەتێک کە لەوەپێش بەمادی بچووک ناوبراوە. پایتەختی «پەرسپەهـ» بوو. پیاوێکی کورد کە ناوی (ئاسرەبات) بوو، لەسەری کرا بەحوکمدار (خشە شرەیوان). زۆر لە مێژوونووسەکان گوتوویانە وەجهی تەسمیەی ئاتورپاتەگان لەو حوکمدارەوە بووە کە ناوی (ئاسرەپات) بوو. خاکێکی لە ژێر فەرمانی ئەودا بوو بە ئاسرەپات - گان ناونرا. لە چاغی ساسانیان دا بە«ئاسرەپاتگان - ئاتورپاتەگان» ناودەبرا؛ چونکو بەو ناوەوە ئاتەشگەدەیێکی گەورە لەو خاکەدا هەبوو. بەڵام ڕاستیەکەی هی یێکەمینە. لە پاشان بەئازربایەگان و ئازربادنجان ناوی گۆڕدرا.

لە دوای مردنی ئەسکەندەر کوردەکان ئیستفادەیەکی قورسیان کرد، ئەو خاکە دیسان هەر بەحکوومەتی ماوە و بەناوی مادی بچووک ناوبانگی کردەوە. خاکی ئاسرەپات (ئاتورپاتەگان) بەئازادی حاکمی خۆی لەسەر ماوە.

کورد لە چاغی دوای ئەسکەندەر «سلووکی»یەکاندا ڕاستەوڕاست بوون بەتەوایفولمووک. هەر پارچە زەویەک لە دەست ئەمیر و حاکمێکی خۆجێیدا ماوە. لە کێوی زاگرۆس سێ حکوومەتی میللەتی کورد و لە ئاسرەپات - (ئاتورپاتەگانیش) حکوومەتێکی زۆر قەشەنگی تێدا دامەزراندراوە. هەرکە پشێوی لە نێوان سلووکی ڕوویدا، کوردەکانی ئاتورپاتەگان لە ژێر فەرمانی سلووکی دەرکەوتن. کوردۆخ لە لایێکەوە و کاردای سیرییش لە لایێکەوە لە سلووکی پچڕانەوە.

خولەفا: جێنشینەکانی ئەسکەندەر کە ٩ کەس لە ساڵی ٣١٢ - ١٦٤ ق.م حوکمڕانیان کردووە خاکی ئەسکەندەریان کردۆتە چەند حکوومەتێک. تەنها کوردستانی ئازربایەگان بەموستەقیللی ژیاوە؛ سێ ئەمارەتی دیکەی کوردیش لە ڕوودابوون.

حکوومەتی ئاتورپاتەگان، هەتا چاغی ئاشکی شەشەم (میهردادی ئەوەڵ) پادشای ئاشکانی هەر لە شەوکەت و گەورەییدا ماوە. ئەو گەلێک جەوری لە خۆجێیەکان کرد و خاکەکەی خستە ژێر حوکمی خۆیەوە و حکوومەتی ئاتورپاتەگانی تێکدا. هەروەکو لە هاتوودا دێ.

چاغی ئەسکەندەر بۆ هەموو کوردەکان بەهەمووانی و بۆ کوردی ئاتورپاتەگان بەتایبەتی دەورێکی ڕەش و نەگبەتێکی بێ پایانیش بوو، بەڵام لە دوامیندا بەدامەزراندنی حکوومەتی ئاترەپات دڵخۆشی کوردەکانی داوە و مەمنوونی کردن؛ ئەوەبوو بەمایەی دووبارە دامەزراندنەوەی حکوومەتەکەیان. پایتەختی ئەو حکوومەتە «فرادە ئەسپە - پەرسپەهـ» بوو، هەروەکو لەمەوپێش لێی دواین.

## فەسڵی سێیەم

### کوردۆخ؛ کاردا؛ هالّدی؛ سیرتی؛ ئازارتیا؛ کرچخ؛ کارتاوی

**١- کوردۆخ - کوردۆک:**

حەسەن پیرنیای مێژوونووسی بەناوبانگی ئێران لە کتێبی دووەمی ئێرانی باستان دەورەی ئەوەڵی پارسی داریۆشی دووەم لاپەڕە ٩٨٩دا لە نووسینی ئەکسەنەفۆن پاشەوپاش گەڕانەوەی دە هەزار کەسیدا، کتێبی ٣ فەسڵیدا باسی دەکا: یێکەمین سەربهوردی زۆر زل و گەورەی دوامین سەڵتەنەتی داریۆشی دووەم ڕوویداوە، دووەمین پشێوی و سەرکێشی و شۆڕشی کوردۆخ (کوردۆک)ەکان بووە. ئەمانە لە کێوەکانی لای بەرەوژووری دەستە چەپی تیگر (دیجلە)دا جینشین بوون و زەندەگانییان دەکرد و بەهێز و تەوانا بوون. (زاناکان بەگەرمی ئەوانە دەکەنە باپیرە گەورە و نیاکانی کوردەکانی ئەمڕۆکە).

ئەکسەنەفۆن دەڵێ: پادشای پارس بە ١٢٠٠٠٠ لەشکری سوپاهی جەنگیی ئازاوە چووەسەر کوردۆخەکان تاکو سەری شۆڕش بەرپاکەرەکان نەرمکا و ئەو میللەتە بخاتە ژێر فەرمانی خۆیەوە، بەڵام ئازایی و جەنگاوەری کوردۆخەکان و سەختی و توندی کێوەکانی نیشتمانیان و ئەزیەت کێشانی لەشکر لە دۆڵ و گەلی و دەربەندە تەنگ و سەختەکانی کوردستاندا پادشای پارسی لەو چوونە سوودمەند نەکرد. لەگەڵ ئەوە شا کە تووشی ئەزیەت بوو، بەهرەیەکی دەستنەکەوت. ئەو لەشکرە قورسە زۆر بەشپرزەیی گەڕاوە، چەندجار ئەو پادشایە تووشی ئەو سەفەرەبوو، بەڵام هەر لە دەست کوردۆخەکاندا بەشکاوی و پەرێشانی دەگەڕاوە و پێیان نەدەوێرا.

لەوەوە بۆمان ئاشکرا دەبێ کە کوردۆخەکان حکوومەتێکی باشیان هەبووە، پادشا و یان ئەمیرێکیان ئەوانی کۆکردۆتەوە کە هەڵمەت بەرن و پێش بەلەشکری پادشای پارس بگرن و داریۆش شپرزە بکەن.

**٢- کاردۆ:**

زۆر لە زانا و تێگەیشتووەکانی ڕۆژهەڵاتناسانی فەرەنگستان و ئینگلیز و ئەڵمان و فرەنسا و ئامریکان تێکۆشاون و ماندووبوون؛ لە بابەت هاتن و چوون و موهاجەرەت و کەلیمەی «کورد»ەوە دووچار بەئیختیلاف و تێکەڵاوی بوون. ئەویش وەنەبێ دوور لە تێگەیشتن بێت و حەل نەکرابێ. ئەوەی عولەمایانی ئەمڕۆ لەسەری کۆبوونەوە و

ڕێککەوتوون ئەمەیە: کورد لە پێش چوونیان بۆ ئەو خاکەی کە ئەمڕۆکە نیشتمانیانە میللەتێکی ئاریانی (کورد)ی دیکە لەو خاکەدا هەبووە، ئەوانیش بە«کاردۆ» ناوبراون. کاردۆکان خاوەند مەدەنییەت و شوێنێکی ناسراوبوون. براکانیان کە چوونە نێویانەوە تێکەڵ بەخۆیان کردوون و ناوی خۆیان لەسەر ئەوان داناوە، چونکە لە ڕەگەزێک بوون و بوونەتە یەک میللەت.

لە پارچە بەردێکی دوو هەزار ساڵ لەمەوپێشدا کە دۆزراوە، ئاسوورییەکان بەجێیان هێشتووە. لەوێدا لە میللەتی کاردا (کارداکا) دواوە، تەرجەمەی ئەو بەردەکە کراوە تووشی دوو پیتی «کا» بوون کە لە سەرەتای وشە و لە دوامینیدا نیشان دراوە و دووبارە کراوەتەوە. وا دەزاندرێ «کاردا» وەکو کوردە و «کارداکا» وەکو «کوردەکان» دێتە بەرچاو.

خاک و جێگای دانیشتنی کاردا لە تخووبی گۆلی وان بەلای جنووبیدا درێژبۆتەوە. گەلێک قەلا و جێگایانی سەخت و توندیان هەبووە، ئاساریان لەو خاکەدا تا نزیک قەرنی پێنجەم و شەشەمی هیجری هەر مابوو.

لە نەقشەی حەسەن پیرنیا لە ئێرانی باستاندا ورمێ و شنۆ و خۆی و سەلماسی ئەمڕۆکەشی دەکەوێتە سەر. کەوابوو خاکی هەکاری و برادۆست و موکریان و سۆران و دنبلی و مەحموودی قەرنی دەیەمی هیجری گرتووە. خاکی جزیر و بۆتانیشی لەسەر بووە هەروەکو دێتەگوتن.

مەملەکەت و خاکی کاردۆ «کاردا» بووە. لە مەنقوولات و ئاساری «تیگلات پیلیسەر» پادشای ئاسوور و شەڕکردنی لەگەڵ میللەتی «کورتی» و ئیشارەت دان بەوە، ئیسبات دەکا کە کورتی لە کوێ هەبوون و بەهێزبوون کەوا شەڕی لەتەکیاندا کردووە. لەو دەورە و لە دەوری پێش ئەویشدا ناوی گوتی براوە کە خاوەند مەدەنییەت و جێگای بەرز و داراییەکی بەهێزبوون، هەروەکو بەتایبەتی لێی دواین.

ئەکسەنەفۆن لە کتێبی «ئاناباسیس» و بەشی چوارەم فەسڵی سێ قەتعەی یەکەم گەڕانەوەی دە هەزار کەسییدا کە لە گەڕانەوەی خۆی دواوە، زۆر بەئازایی و ڕەشیدی و دلێریی بەکاردۆکانیدا هەڵگوتووە.

لەپاش ئەوە ناوی (کاردۆ) لە کتێبەکانی یۆنانیدا بەگەرمی دەکەوێتە بەرچاوان، دێریکنوویس و موئەلیفەکانی یۆنان خاکی کاردۆیان لە ژێر ناوی کاردۆدا بردووە. جێگا و نیشتمانی کاردۆ لە کەناری لای چەپی تیگر (دیجلە)وە کەوتۆتە دەوروپشتی کێوانی جودی (کودی - گوتی).

«ئارامی»یەکان ئەو دەوروپشت و سیلسیلەی کێوی «جودی»یان بە«بیس کاردۆ» و هەموو خاکی نێوانی دیجلە و فوراتیان بەکارتا (کاردۆ) و ئەرمەنییەکان بەکوردۆخ و عەرەبەکان بە«کرداء» وە یان بە«کوردای»ییان ناوبردووە. لە کتێبی «فتوح البلدان – بلاذری» لاپەڕە ۱۷٦دا بەکرداء (کوردای) ناوی بردوون.

ئیسترابۆنی جوغرافیازانی یۆنان لە کتێبی ۱٦ و فەسڵی یەکەم و قیتعەی ۲٤دا دەڵێ: میللەتی گوردین کە لە نەژادی کاردۆن لە بەشێکی سەخت و بەرزی کەناری چۆمی دیجلەدا، جێگایان گەلێک توند وەکو ساریزا و ساتالکا و قەڵای پیناکایان هەیە. ئەم قەڵایە لەسەر گردێک بەشکڵی سێگۆشەییدا دامەزراندراوە.

لەوە بەولاوە، وتەی کاردۆ کەمبووەتەوە. بەڵام مێژوونووسەکانی دەوری ئیسلام خاکی کاردۆیان بەجزیرەی عومەر و چەند عەسرێکیش بەبوختان (بۆتان)یان ناوبردووە.

مێژوونووسەکانی یۆنانی و ئەرمەنی، مەملەکەت و خاکی کاردۆیان زۆر بەئاوەدانی و نفووس باس کردووە؛ دەڵێن: ۳ شاری زۆر گەورەی خۆشیان هەبووە: ۱- ساریزا -۲- پیناکا -۳- سانالکا. ئەم ۳ شارانە لە کەنار چۆمی دیجلە بوون.

هەروەکو ئەکسەنەفۆن لە کتێبی ئاناباسیس، بەشی چوارەمی، فەسڵی سێیەمدا، دوورودرێژ لە کاردۆ و نیشتمانی کاردۆ دواوە. کاردۆ لە عەسری ئەردەشێری دووەمی هەخامەنشیدا، پادشای هەخامەنشییان پەسند نەکردووە و نەکەوتوونەتە ژێر فەرمانییانەوە. بەئازادی و سەربەخۆیی ژیاون و لەوەپێشیش هەر ئازاد بوون.

کتێبەکانی ئەرمەنی وامان نیشان دەدا کە تیگرانی دووەمی پادشای ئەرمەنی، لە قەرنی یێکەمینی پێش میلاددا، لەشکری بردۆتە سەر خاکی کاردۆ.

لە ساڵی ۱۱۵ی پێش میلاددا «مانی سارۆس»ی پادشای کاردۆ، کەوتە ژێر فەرمانی ئەرمەنستانەوە و فەرمانبەرداریی تیگرانی کرد.

خاکی کاردۆ یەعنی نیشتمانی میللەتی کاردۆ، هەر جێگای خۆیان بووە، هەرچەند کە کەوتبنە ژێر فەرمانی بیانیانیشەوە، بەڵام ڕەوشت و خوو و زمان و دەستووری نەژادیان لە دەس نەداوە و بۆ ئازادی کۆشاون و لە ڕێگای سەربەخۆییدا تەقەڵایان داوە. بۆ ئازادی دەستخستن و ڕزگاربوون پەلەیان کردووە و دەستیان کەوتووە.

وتە کەلیمەی کاردۆ بەزمانی سۆمە بەمەعنای ڕەشیدی و دلاوەری و ئازایی هاتووە.

### ٣- خاڵدی - هاڵدی

له نێوانی وتەی کاردۆ و خاڵدیدا بەوێچوون و شێوە پتر نزیکی لێکچوونن و موشابەهەتی تەواویان لەگەڵ یەکدا هەیە.سس خاڵدی بەزمانی سۆمەری و خاڵدی بەزمانی ئاسووری ئۆرارتو یان ئوراشتو نوویسراون. بەزمانی عیبرانی ئارارات و بەزمانی یۆنانی (کزاردۆ)یان ناوبردوون. ئەوانە هەر ئەو میللەتەن کە لە نزیک قەڕنی نۆبەمی پێش میلاددا لە (ئاثرەپاتگان)ەوە ڕوو بەگۆلی وان چوون و لە جنووبی ئەو دەریاچەیەدا دامەزران و دەوڵەتێکی خۆیی و ئازادیان هەبووە. لە مەدەنییەتدا زۆر بەرزبوون. ئەو دەوڵەتە هەتا قەڕنی شەشەمی پێش میلاد بەشانوشەوکەت و مەدەنییەتێکی قورسەوە خۆیان نوواندوە. ئەکسەنەفۆن لە کتێبی «کوروپدیا - تەربیەی کۆروش - جلدی ٣ی فەسلی یەکەم»دا دەڵێ: لە سەرەتای قەڕنی شەشەمی پێش میلاددا، میللەتێکی تازە نوێی ئاری (وا دەزاندرێ کە میللەتی ئەرمەن بووبێ) هەڵمەتیان بردە سەر خاکی وان و میللەتی هاڵدییان ڕوو بەکێوەکان هەڵبڕی.

**خاڵدی - کاردۆ:** دەوڵەتی قەومی ئاریانی خاڵدی - کاردۆ، بەدەست میللەتی ئەرمەنی ئارییانییە و ئینقرازیان هات.

ئاساری ٣ قەڕنی هی ئەو خاڵدیانە کە لە خاکی خۆیاندا لە دوایان بەجێماوە، لە دوای شەڕ و کوژتار و شۆڕش هەڵاتن.

کشانەوەی میللەتی خاڵدی - کاردۆ بۆ کێوان: خاڵدی - کاردۆ لە خاکی شیمالی گۆلی وان کە وڵاتی «تربیزند» کە «ترەبزوون»ی ئەمڕۆکەیە دامەزران و لەوێ مانەوە و کردیانە جێگا و نیشتمانی خۆیان. ئەو خاکە لە چاغی دەوڵەتی دووەمی شەرقی بیزانسدا بەخیلات (ئالخات - ئەخلات) ناوبراون، ئەمڕۆکەش لە لای غەربی شیمالی گۆلی وان شارێک هەیە کە ناوی خلات (ئەخلات)ە. لە قەڕنی پێنجەم و شەشەمی هیجریدا لە گۆلی وانەوە هەتا ترەبزوون بەوڵاتی ئەخلات ناودەبرا.

زەوی و خاکێکی زۆر لەوەپێشی کاردا یان کاردۆ، نیشتمانی کاردۆ - هاڵدی بووە؛ ئێستاش ئەو خاکە لانکی پەروەرشی ئێلات و عەشایری کوردە. پیتی کاردۆ و کورد پێک گەیاندوویەکی وەهایە کە هەردووکی لێک گرێداوە، کە کوردەکانی ئەمڕۆ نەتەوەی ئەو کاردۆیانە بوونی بەبێ شک نیشان بدات، ئەمڕۆکە بەکوردەکانی ئەو خاکە دەبێژرێ کوردۆ.

کاردۆ - هاڵدییەکان لە سەرچاوە بەرزەکانی چۆمانی دیجلە و فورات و ئاراسدا

جێگیربوون و دەوروپشتی ئەو خاکانەشیان هەموو خستبووە ژێردەست و دەستووری خۆیانەوە. شاری توشپا (وان)یان کردبوو بەپایتەخت. «احمد رەفیق تأریخی عمومی لاپەڕە ٣٤٦ی جلدی یەکەم» دەڵێ: بەکەم دەمێک ڕوو بەڕۆژهەڵات و جنووبی گۆلی وان کیشوەرگیریان کردووە. میللەتەکەی بلند باڵا و بەهێز و تەوانا بوون. هێندێکیان شوان و جوتیار و بازرگان بوون.

مەعبوودەکەیان ناوی «هاڵدی» بوو. هەروەکو بۆ خودای ڕۆژ و با پەرستشیان دەکرد، بۆ هاڵدیش ئەو پەرستشە هەبوو. ئەمڕۆکەش لەنێو ئەو کوردانەی شیمالیدا عەشیرەتێکی زۆر گەورە بەناوی عەشیرەتی هاڵدییەوە هەیە. لە ئەدوار و قەرنەکانی دوای ئیسلامییەوە تاکو ئەمڕۆکە، لەو خاکانەدا ئەو ناوە بەگەرمی دەکەوێتە پێش چاوان.

بنەماڵەی ئەمیرەکانی جزیرە لە سەرەتای ئیسلامییەوە هەتا قەرنی دوامین و سێزدەمینی هیجری ئەو بنەماڵەیە لەو خاکەدا فەرمانڕەوابوون، بەعەشیرەتی خاڵدی یان بەبنەماڵەی میرانی خاڵدی ناسراون، لەو بنەماڵەیە ئەمڕۆکە ئەوی ماون بەکوڕانی بەدرخانییان بنەماڵەی بەدرخانی ناوبانگیان هەیە. ئەوانە بنەماڵەیێکی کوردی خاڵدین کە ئێمە لێی دەدوێین و لە کتێبی ئومەرایانی کورددا ناوبراون.

### ٤- سیرتی

کۆمەڵەیێکی زلی ڕۆژهەڵاتناس و دێریکنووسەکانی کوردی ئاوروپای وردبین و موحەقیقەکانی ئەڵەمان وەکو هارتمان و نۆڵدکە و ویسباخ لە دوای گەلێک لێوردبوونەوە و تەحقیقات و تەتەبوعات و پشکنینی قورس، لوغەت و شێوەی ڕەنگاوڕەنگ و دەستووری بەجێهێنانی کوردی تەرزی ئەدای و بەراوردکردنەوەیێکی زۆر، وایان بۆ ئاشکرا بووە و پێی دڵنیابوون کە شێوەی کورد و کاردۆ لەگەڵ شێوەی زمانەکەیان بەتەحقیق گەیاندراوە کە یەکن. ئەو زانایانە بەپێی نوویسرا و کتێبەکانی یۆنانی پێشوو، بەبوونی نەژادی ئاریانی -کە سیرتی بن- ئیشارەتیان داوە و پێی دڵنیابوون و باوەڕیان کردووە کە سیرتی کوردن.

«ئیسترابۆن»ی جوغرافیا نوویسی یۆنانی لە دوو جێگای کتێبەکەیدا باسی میللەتی سیرتی کردووە و میسالی بەهێندێک شێوە و لوغەتیان هێناوە و بەئاشکرا میللەتی سیرتی ئاریانی نەژادبوونیانی باس کردووە. یێکەمینیان: لە کتێبی ١١ فەسڵی ١٣ قیتعەی ٣ لە ڕیزی ئەژماردنی ئەو قەومانەدا کە لە خاکی ماد دانیشتوون، لە دوو قەوم

دواوە کە یەکێکیان سیرتی و دووەمیان مەردە. دووەمیان لە کتێبی ١٥ کە بەتایبەتی هی هیندستان و ئێرانە، قیتعەی ئەوەڵ فەسڵی سێیەم لە ڕیزی ئەو میللەتانەی کە لە خاکی ئێران دانیشتوون باسی میللەتی سیرتی و مەردی کردووە و هەردووکانی بەئاریانی نەژاد داناوە.

وامان بۆ دیار دەکرێ کە هەردووک تیپرەی مەرد و سیرتی لە خاکی پارس دانیشتوون، لە پاشان ڕوو بەڕۆژاوا چوون و لەسەر زەوی ڕۆژاوای خاکی ماد دامەزراون کە موکریان یان ئازربایەگانی ئەمڕۆکە بێ. ئەوددەمەش وەکو ئێستا ئەو خاکە هەر کوردی تێدابووە. بەناوی سیرتی ئەمڕۆکەش عەشیرەتێکی کورد لە خاکی نێوان جۆڵەمێرگ و باشکالاندا هەن (هەکاری). شارێک بەوناوە لەنێوان دیاربەکر و بەدلیسدا بە(سیرتی) هەرماوە کە بەکوردی سیرت و بەعەرەبی سعرتە.

زانا و ڕۆژهەلاتناسەکانی فرەنگستان لە دوای لێکدانەوە و وردبینی و بەراوردکردن و سەرنجدانێکی قووڵ لە کتێبەکانی ئوسترابۆندا گەیشتنە پایەیێکی وا کە لە قەراینی «فقه اللغة»دا بەختیاری و کورد هەریەکن و سیرتییەکان باپیرە گەورەیانن. موهاجیرەکانی سیرتی باپیرە گەورەی ئەو کوردانەی ڕۆژاوای خاکی مادن.

وەکو لە قسەی عولەماکان ورد دەبینەوە، وامان بۆ دیار دەکرێ کە لە قەرنی پێنجەم و شەشەمی میلاددا سیرتی دەستی بەهیجرەت کردووە و بەگەل و کۆمەڵە ڕوو بەڕۆژاوای ئازربایەگان چوون و لەو خاکەدا هەڵگیرِ و وەرگێرِێکی زۆریان پێکراوە. وام بۆ ئاشکرا دەبێ کە لە دوای تێکچوونی دەوڵەتی ماد، کوردەکانی سیرت لەگەڵ هەخامەنشی ڕێک نەکەوتوون و لە ئازەربایەگان و کێوەکانی موکریاندا کەمێک خۆیان گرتووە. لە سەڵتەنەتی دارای گەورە، ئیشتراکی فراوەرتیشیان کرد. دارا کە مادی بچووک (کوردستانی موکریان)ی گرت دەبێ سەریان بۆ نەچەماندبێ و بۆ کێوەکان هیجرەتیان کردبێ؛ بەلام بەپێی زانینی خوارەوە، وا دەردەکەوێ لەپاشان کەوتوونە ژێر فەرمانی داراوە. مێژوونووسەکان لێی دواون و دەڵێن: سیرتی لە قەرنی پێنجەمدا بەگەلە لە خاکی مادی بچووکەوە دەستیان بەهیجرەت کرد. لە چاغی پادشاکانی ماددا دلێری و پاڵەوانی و جەنگاوەری سیرتی کیشوەرگیری کرد. لە چاغی هەخامەنشیەکانیشدا ڕوو بەڕۆژاوا چوون و تووشی گەلێک نەقل و نقوول بوون. ئەوبەرە و ئەمبەرەی سیرتی و کەشماکەشەی کە: بەسەریاندا هاتووە، لە ئەدوارانی موختەلیفەی ئێراندا ئەوە هەر هەبووە.

«عەلی ئەسغەر شەمیمی» لە جوغرافیای کوردستاندا دەڵی: سیرتی بەتایبەتی لە

لەشکرکەشی ماد بۆ سەر ئاتینە و لە ساڵی ٤٩٠ - ٤٨٠ی پێش میلاددا لە لەشکرکەشی داریۆشی گەورە بۆ زاڵکردنی دەوڵەتی خۆی دەستی هاوێژتە دەریای مەدیترانە و دەریای ڕەش. ساڵی ٤٩٠ کە لەشکری بردە سەر یۆنان هەتا نزیک پایتەختی ئاتینە چوو.

ساڵی ٤٨٠ خشایرشای کوڕی داریۆش بۆ گرتنی ئەو خاکانەی بابی خەریکی گرتنیان بوو. سوپاهێکی قورسی کۆکردەوە و چووە سەر ئاتینە و گرتی و ئاوری تێبەردا.

ئەو شەڕ و کوژتارانەی لە تەئریخەکانی فەرەنگستاندا کە بەجەنگی «مدیک» ناودەبرێن، هەموو لەشکر و جەنگاوەرانی سیرتییەکان بوون، کە ڕوو بەئاسیای غەربی هەڵمەتیان برد و دوژمنیان بەزاند، لەو خاکەدا جێگیربوون و مانەوە. لە هەڵاتن و شکان و گەڕانەوەدا لە کێوە بەرز و سەختەکانی ڕۆژاوای ئاسیادا بۆ خۆپارازتن و مەڕوماڵات بەخێوکردن، خۆیان ڕاگرت و دامەزران. لەپاشان لەو خاکەدا دانیشتن و بوونە خۆجێ و خاوەند زەوی و موڵک و ئەملاک.

چونکو گەڕانەوەیان دژوار و دوژمنیان بەهێز و زەبەردەست بوون، لەبەرئەوە ناچارمان کە جێگای خۆڕاگرتن سەخت بکەن، هەتاکو تیێدا بپارێزرێن. لەدواییدا کە تەماشایان کرد خاکێکی خۆشە و بۆ بەرێچوونیش دەست دەدات، لەبەرئەوە جارێک بۆی دانیشتن و کردیانە نیشتمان و زێد.

چونکو سیرتی زۆر ئازا و زرنگ و ڕەشید و دلێر و سیلاحشۆر و بەتەن و مەن و هەڵبژاردە بوون، قەبایل و تیرە خۆجێیەکانی ئەو خاکانەیان بەجارێک نەبوو کرد و لە وان ناوێکیان نەهێشت. ئەو شاخ و کێو و ئاوایی و شارانەیان خستە دەست. دانیشتووەکانی کەنار و نزیک دیجلەشیان کردە ژێردەست و فەرمانبەریی خۆیان؛ زۆری پێنەچوو ئەوانیشیان لەنێو خۆیاندا پووچ کردەوە. ئەو هەموو دەربەدەری و هەڵگێڕ و وەرگێڕیەی کە بەسەر سیرتیدا هات، لەگەڵ ئەوەشا ڕەوشت و خوو و دەستووری نەژادیان هەر ڕاگیرابوو، هیچ ڕەوشت و دەستوورێکیان لە خۆجێیەکان وەرنەگرتووە، جگە لەچتی سوودمەند و ئیشوکاری وێچوو نەبێ.

سیرتی سەرەتای هیجرەتیان لە خاکی موکریانی ئەمڕۆکەوە بووە. بەسەر گۆلی ورمێدا چوونە ئەرمەنستان و بەسەر خاکی ئەوێدا زاڵبوون و هێزیان پەیدا کرد و خاکێکی پان و بەرینیشیان وەدەست خست.

دێریکنویس و مێژوونوویسەکانی ئەرمەنی ناوی پێکەوەی و وێچوونیی کورد و

کوردۆیان بۆ خاکێک هەڵبژاردووە کە ئەوان تێیدا دانیشتوون. لە ئەوەڵ و نێوانی وڵاتی ئەرمەنستاندا لە هەموو جێگایاندا وتەی کورد و کوردۆیان چەند بارە کردۆتەوە. دیسان لە نووسینی مێژوونووسەکانی ئەرمەنی وا دەردەکەوێ کە هەڵمەتبەرەکانی کوردۆ زۆر بەلەز جێگیربوون و دانیشتوون و دانیشتووەکانی پێشووی وڵاتی «کرچج»یان لەنێو خۆیاندا تواندۆتەوە؛ بەتایبەتی لەنێو ئەواندا یێکەتی و خۆشەویستی و ڕیشەی نەژادی و میللیەت زۆر گەرم بووە. جا لەبەر ئەوە هەردوو زۆر زوو پێکهاتن و ناخۆشییان دیاری نەکردووە.

### ٥- ئازارتیا

یێکەمین تیرەیێکی کە لە کوردی سیرتی جوێ بووەوە و ڕوو بەرۆژاوای ئازربایەگان ڕۆیشت تیرەیەک بوون پێیان دەگوت «ئازارتیا» یا «ئاساگارتیا»، ئەم تیرەیە لە پێشا لە ڕۆژهەڵاتی خاکی پارسدا دانیشتوون. لە چاغی حکوومەتی ئاسووریدا چوونە سەر خاکی ماد و لەوێ جێگیربوون. لە چاغی کیشوەرگیری کۆروش و داریۆشی گەورەدا، یەعنی لە قەرنی پێنجەم و شەشەمی پێش میلاددا ئازارتیا لە سیرتی جوێ بووەوە و دەستیان بەهیجرەت کرد. لە خاکی موکریانەوە چوونە هەولێر (اربیل). چونکو ئەو خاکە بەرزترین و خۆشترین و حاسڵات خیزترینی کەناری دیجلە بوو، بۆ تێدا دانیشتنیان پەسندکرد و لە خاکی موکریانەوە باریان کرد و چوونە هەولێری پێشوو.

لە سەرەتای حوکمڕانی داریۆشی گەورەدا سەریان بۆ نەچەماند و بەرامبەری لەشکر و سوپای داریۆشیان کرد و کوژتارێکی قورسیان لە داریۆش کرد. داریۆش بەشەڕ و کوژتار بەسەریاندا زاڵ بوو و دەستی جەور و ستەمی بەسەریاندا درێژ کرد. چەند سپەهبودان و سەردار و پادشای سیرتی گرتن و بردنیە پایتەختەکەی خۆی و کوژتنی. هەریەک لەو گەورانەی سیرتی کە گرتوونی و بە چ جۆرێک کوژتونی لە نەقشەی بێستووندا نووسراوە. شکڵ و قیافەت و ڕەنگ و بۆی پەیکەری پادشای «ئاساگارتیا» بەبەرجەستەیی لە بیستووندا هەڵقەندراوە. ڕاستەوڕاست وەبەرگ و ڕەنگی کوردی ئەمرۆکە دەچێت. دەستووری بەرگ و ڕاوەستانی هەروەکو کوردێکی ئەمڕۆکە وایە. کوردی سیرتی تووشی گەلێک کوژتار بوون.

لە دوای ئەوە شەڕکەر و ئازا و لێهاتووەکانی ئاساگارتیا لە چاغی نێوان تێکچوونی ئومەراکانی سلوکیدا پاش ئەسکەندەر یاریدەیاندا و ئیشتراکی شەڕیان کردن، لەگەڵ

ئومەڕاکاندا بەڕاستی دەستیان دایە، لەگەڵێک جێگایاندا سەرکەوتن و ناوونیشانیان پەیداکردووە و جێگایەکی بەرزیان دەست خست.

### ٦- کرچخ

لە سەرەتای قەڕنی دوامینی شەشی میلادی و لە نزیک دەرکەوتنی ئیسلامیدا قەبیلەیەکی زلی «کرچخ» بەشێکی زۆری لە جنووبی غەربی و جنووبی ئەرمەنستان گرت و خستیە ژێر فەرمانی خۆیەوە. ئەو خاکە بەناوی خاکی کرچخ ناوبرا.

لە تەئریخی ئەرمەنییاندا خاکی کرچخ بەو خاکەیان گوتوە کە کوردەکان لە سەری بوون. لە زمانی ئەرمەنیدا کرچخ بەمەعنای کوردە. ئەو ناحیە و خاکەی کە بەو ناوەوە لە تەئریخی ئەرمەنیدا نووسراوە، ئەمڕۆکە بەخاکی خۆی و سەلماس و ورمێ ناودەبرێن. لە مەنابیعی ئەرمەندا ئەو جێگایە وەکو وڵات (لواء - ئەیالەت)ێک بووە. لە تەئریخی ئەرمەنییان دا سێ لیوای زۆر گەورە بەو ناوەوە ناسراون:

١- کوردۆخ ٢- کوردزیخ ٣- کاراتۆنیخ.

دیسان دێرێک و مێژوونووسەکانی ئەرمەنی و ڕۆمی لە قەرنی چوارەمی میلادیدا، خاکی کوردۆیان لە هەموو جێگایەکدا بەتموریخ ناوبردووە.

### ٧- کارتاوایە - کارتاوی

جگە لەوانەش لە سیرتی تیرەیەکی دیکە هیجرەتیان کردۆتە ڕۆژاوای خاکی موکریان کە بەکارتاوی ناوبراون. لە نووسراو و دێریکەکانی ئارامیدا ئەو ناوە دێتە بەرچاومان. مێژوونووسەکان کە باسی ئەو تیرەیان کردبێ بە«کرتاوی» ناویان بردوون و نووسیویانن و بەبنەچەکەی کوردیان داناون.

لە سوریا و لە خاکی عەنتاب و حەلەبدا عەشیرەتێکی زل بەو ناوەوە هەیە.

ئەمیرێکی ئەوان کە ناوی عەبدوڕەحمان بەگی «قەرتاوی» بوو لە حەلەب دۆست و ئاشنام بوو. لە شەڕی جیهاندا لە پێناوی میللەتەکەیا پووچ کرایەوە. ئەو بنەماڵەیە، بەعەشیرەتی «کرتاوی» یا «قرتاوی»یان ناوبردوون. ئەم سەربهوردە لە کتێبێکی دیکەمدا کە نووسیومەتەوە بەناوی «کوردی سوریا»وە ناونراوە و بەدووورودرێژی لێی دواوم، بەڵام هێشتا چاپ نەکراوە. بەپێی ئەوانە وا باوەڕ دەکرێ کە موهاجەرەتی تیرەکانی کورد بۆ ئاسیای غەربی بەگەرمی، یەک لە دوای یەک بووە.

## بەندی سێیەمین

## فەسڵی یەکەم

١- ئاشکی لە ٦، میهردادی یەکەم ساڵی ١٨٠ ق.م کە بوو بەفەرمانڕەوای پارت، بەپێی شوێنی «فری یاپیت» ئاشکی کەلای دەربەندی خەزەری لە حکوومەتی ئاتورپاتەگان گرتبوو، ئەویش لە دواییدا چووەسەر خاکی مادی پچووک (کوردستانی موکریان).

میللەت چونکو ڕوحی ئازادپەرستی هەبوو، بۆ بەرامبەری کەوتنە ژێر ئاڵای پادشاکەیان و بەگژ میهردادا چوون. لە دوای خوێنڕێژییەکی زۆر، میللەتی ئاتورپاتەگان شکان.

میهرداد بەکوژتار کەوتە نێویانەوە و خاکی ئاتورپاتەگانی هەموو بەشەڕ گرت و حکوومەتێکی چەند سەد ساڵەی خۆجێیی پووچ کردەوە و کردیە ئەیالەتێکی ژێردەستی خۆی.

کوردەکان سەریان بۆ چەماند، بەڵام کوردی کێوەکانی جنووب و ڕۆژاوای گۆلی ورمێ بۆ خۆگرتن مانەوە و نەکەوتنە ژێر فەرمانی میهردادەوە، ئەگەرچی میهرداد ڕوو بەخاکی ئەرمەنستانی ئاژۆت.

ساڵی ١٣٨ ق.م بەمردنی میهرداد میللەتی مادی پچووک کەلێنیان دەست خست و دەستیان بەسەر بڵندبوون کردەوە.

«ئانتیۆخوس سی» دە حوکمداری سلوکی چووە سەر سووریا کە بچێتە سەر پارت (ئاشکانی)؛ بەڵام ڕێک نەکەوت، فەرهادی دووەم ئاشکی ٧ زوو فریا کەوت.

لەوەدا میللەتی ئاتورپاتەگان چاکتر کەلێن گیربوون، ئەمما زۆری پێنەچوو سگ (سیتە)کان بەگژ فەرهاددا چوون؛ ئەوجا لەو شەڕوشۆڕشەدا کورد ئیستفادەیان کرد و حکوومەتەکەی لە دەستچوویان وەدەست خست. ئاڵای ئازادییان هەڵکردەوە و لەژێر پەنجەی پارتەکان دەرچوون.

٢- ساڵی ٧٧ ق.م تیگرانی پادشای ئەرمەنستان بەکۆمەگی حکوومەتی «پونت» چووە سەر خاکی ئاتورپاتەگان (کوردستان) و تاڵانی کرد. لەبەرئەوەی کە لەشکرێکی قورسی

پێ بوو، حکوومەتی ئاتورپاتەگان پێی نەوێرا و نەشیتوانی داوای یارمەتی لە سەدروگی ئاشکی ١٠ بکا؛ چونکو پیر و بێهێز بوو.

تیگران بەبێ ڕەحمی بەسەر ئەو خاکەدا لەشکری ئاژۆت و بەکوژتار گرتی و خستیە ژێر فەرمانی خۆیەوە و حکوومەتی خۆجێیی مادی پچووکی تێکدا.

ئەم تیگرانە لە پێشدا لە لای میهردادی دووەم گرەو بوو، لە دواییدا بەریدا و کردیە والی ئەرمەنستان، ئەویش لە کەلێندا بوو، هەتا بەسەر خاکی کوردەکانی دادا.

## ٣- ڕۆم و ئاتورپاتەگان

«دۆن زیس» ناو سەردار سوپاهێکی فەرهادی چوارەم ئاشکی ١٤، ساڵی٣٧ ق.م هەڵات و چووە لای مارک ئانتوانی گەورەی ڕۆم کە والی میسر بوو؛ بۆ گرتنی خاکی پارت هانیدا. ئەویش بە سەد هەزار لەشکری ئازا و شەڕکەرەوە لینگیدا سەر مادی پچووک (کوردستانی موکریان) و بەشەڕ و کوژتار کەوتە نێوی و هەڵمەتی بردەسەر پایتەخت کە بەپەرئاشپا (فرادەئاسپا) بوو کە لەپاشان بەپرسپەهـ ناونراوە.

حەسەن پیرنیا لە تەئریخی ئێرانی قەدیم و ئێرانی باستاندا دەڵێ: ئەو شارە لە جنووبی شەرقی گۆلی ورمێوە بووە کە لەوەپێش کەمێک لێی دواین. لەشکر و سوپای ڕۆم کە گەیشتە سەر ئەو خاکە بەتاڵان و کوشتار نزیک پایتەخت بووەوە. میللەتی مادی پچووک لەژێر ئاڵای پادشای خۆیاندا بۆ شەڕ ئامادەبوون و قەڵابەندیان کرد. بەڵام پادشاکەیان لە تەئریخی حەسەن پیرنیادا باس نەکراوە کە ناوی چ بووە.

مادی پچووک، کورد بوونی بێ شکە. هەروەکو ڕەوشتی کوردان کەمەری خزمەتیان بۆ بەخێوکردنی نیشتمانەکەیان و پارازتنی پایتەختی حکوومەتەکەیان گرێدا و دلێرانە تێکۆشان و هەڵمەتیان بردە سەر لەشکری ڕۆم و تێکیانەوە پێچان و تەنگەیان پێهەڵچنین و کوژتارێکی قورسیشیان لێکردن و دە هەزار کەس لە سوپاهی ڕۆم لە دەست ماد (کورد)ەکانی ئاتورباتەگاندا کوژران. لەپاش ئەو سەرکەوتنە لە باروبنە و گەنجینەی ڕۆمیان دا و تاڵانیان کرد.

ئانتوان و لەشکرەکەی زۆر پەرێشان و شپرزە بوون. هی ماوی زۆر بەئەزیەت خۆیان ڕزگار کرد و هەڵاتن و ڕوو بەکێوەکانی ڕۆژهەڵاتی ورمێ و سەهەند و لای تەورێزدا ڕۆیشتن. دوو ڕۆژ لەو کێوانەدا مانەوە، لەپڕێکا پاڵەوانەکانی ماد گەیشتنە سەریان و ڕۆژی سێیەم دەستیان بەکوژتاریان کرد، هەتا گەیاندیانە سەرچۆمی ئاراس هەشت هەزار

کەسی دیکەشیان لە ڕۆمی کوژت.

سەرەتای ساڵی ٣٦ ق.م ڕۆم بەهەموویەوە نۆزدە ڕۆژ لە خاکی ئاتورپاتەگاندا ما؛ بەڵام ١٨٠٠٠ کوژتاری دا و بەشپرزەیی و بڵاوی هەڵات. هەرچەندە ماڵ و بار و چەک و پێویست و پێڕۆیان هەبوو هەموو بەتاڵان کەوتە دەست مادەکان (ایران قدیم - حسن پیرنیا لاپەڕە ١٣٣).

لە دوای ئەو شەڕە بەدوو ساڵ، جارێکی دیکەش ڕۆم لەشکری بردە سەر خاکی ئاتورپاتەگان؛ بەڵام شکا و تاڵانێکی قورسی کەوتە دەست ئاشکانییەکانەوە. لەوە بەشێکی کەم درا بەپادشای مادی پچووک. ئەو پادشایە بەو بەشە دڵنیا نەبوو، ئەمما لە دڵی گرت و پشووی خواردەوە و لەبەر فەرهادی ئاشکانی دەنگی نەکرد. لە پاشان بەپەنهانی وەڵامی دا بەمارک ئانتوانی گەورەی ڕۆم و پەیمانیشی لەگەڵ گرێدا کە یارمەتی بدات بچنە سەر خاکی پارت (ئاشکانی).

مارک ئانتوان چتی وای لە خەودا نەدەدی کە بەئاشکرا بۆی وەدیهات. زۆر زوو بەبێ خۆگرتن لەزی کرد و لەشکری ئاژۆتە سەرخاکی ئەرمەنستان و هەمووی گرت و پێپەستی کرد. ساڵی ٣٣ ق.م گەڕاوە میسر و لەوێوە دووبارە چوو لەسەر چۆمی ئاراس و لەگەڵ پادشای مادی پچووک دیدەنی کرد و پەیمانیان گرێدا و پێکهاتن. پارچەیەکی نزیک تخووبی ئاتورپاتەگانی لە خاکی ئەرمەنستان دای بەپادشای مادی پچووک. دەستە لەشکرێکی ڕۆمیشی دایێ کە ئەو پارچە خاکەی ئەرمەنستان بۆ پادشای مادی پچووک بەخێو بکرێ.

مارک ئانتوان لەبەر نێوان تێکچوونی لەگەڵ «ئۆکتای نووس» ناچاری گەڕانەوە بوو و دەستی لەو سەفەرە بەردا.

فەرهادی ئاشکانی کەلێنی دەست خست و هەڵمەتی بردە سەر خاکی مادی پچووک و بەشەڕ گرتی و پادشای مادی پچووکی بەدیل برد و ئەو حکوومەتەی تێکدا و تاڵانی کرد. بەڵام زۆری پێنەچوو دیسان کوردەکان (مادی پچووک) خۆیان کۆکردەوە و حکوومەتەکەیان دامەزراندەوە. ئەمما نەزاندرا ئەو پادشایەی مادی پچووک کە بەدیل گیرا چی لێ هات و لە پاش ئەو ساڵی ٣ ق.م کێ کرا بەپادشا. هەر هێندە دەزانین ساڵی ١ ق.م ئەردەوانی سێیەمی ئەشکێ ١٨ لەسەر ئاتورپاتەگان بەناوی مادی بچووکەوە حوکمڕانی دەکرد. ساڵی ١٦م چووەسەر «وانان» و بەشەڕ دەری کرد و بۆخۆی لەسەر تەختی پارت دانیشت.

**٤- كتێبی موقەددەسی زەرتەشتیان و موغ**

لە دەوری پێشوو هەتا دوامینی حکوومەتی ئاشکانی، موغ لە حکوومەتدا ڕوکنێکی گەورە و هەمەکارەی ئیشی سەڵتەنەت و ڕوحانی و دینی و فێرکردنی میللەت بوون. ئاشکانی و حکوومەتی مادی پچووک مەجلیسی گەورەیان هەبوو، لە ئیشکال و کاری زۆر سەختدا کۆدەبوونەوە. ئەو مەجلیسە بەناوی «موغستان» ناودەبرا. وەکو مەجلیسی ئەعیانی ئەمڕۆکەی عیراق، هەموو ئیشوکاری گەورە لەو مەجلیسەدا حەل دەکرا، ئەویش هەموو گەورەکانی موغ کۆدەبوونەوە. لە دوای فەرهاد ساڵی ٦م، ئاشکی ١٦ کە مرد موغستان کرا. داوایان لە حکوومەتی ڕۆم کرد کە شازادەیێکیان بۆ بنێرن تا لەسەرتەختی پارت دانیشێت.

ڕۆمەکان «وانان» ناو، پیاوێکیان بۆ ناردن کە بەئاشکی ١٧ ناونراوە، هەتا ساڵی ١٦م پادشایی کرد. لەو ساڵەدا ئەردەوانی سێیەم کە لەسەر خاکی ئاتورپاتەگان فەرمانڕەوایی دەکرد لینگیدا سەر «وانان» و دەری کرد.

«بلاش»ی یەکەم ئاشکی ٢٢ لە ساڵی ٥٥م کتێبی موقەددەسی زەرتەشتیانی و کتێبی «دین کورد» و کتێبی «ئاوێستا»شی کۆکردنەوە. هەرچەند ئاشکانییەکان ڕوویان لە دین نەبوو، بەڵام بلاش زۆر دینداربوو.

ئەو کتێبانەی دینی زەرتەشت لە چاغی زاڵبوونی ئەسکەندەری گەورەدا لە دەستچوو بوون. بەبڵاوی لە دەست هێندێک کەس و لە زاری هێندێک موغدا مابوون، کردنیە کتێب. ئەمما لە چاغی ئەردەشێری بابەکاندا زۆرچاک کۆکرانەوە. بلاش لەو ڕێگایەدا زۆری تەقەلای دا، هەتا بۆی پێکهات.

لە چاغی ئاشکی ٢٢ دا و لە ساڵی ٦٣م میللەتێک لە ئاریان کە ناوی «ئالان» بوو لەگەڵ گورجی ڕێککەوتن و لینگیاندا سەر خاکی مادی پچووک و تالانیان کرد و کوژتارێکی قورسیان لە میللەتی ئاتورپاتەگان کرد.

بلاش بۆ پێش بەئالانییەکان گرتن داوای یارمەتی لە حکوومەتی ڕۆم کرد، بەڵام ڕۆم یاریدەی نەدا. میللەتی ماد گەلێک ئەزیەتی لە دەست ئەوانە دی و تالانێکی زۆریان کەوتە دەست ئالانییەکان و لەو خاکە دەرچوون. (حسن پیرنیا - ایرانی قدیم - لاپەڕە ١٣٨).

جاری دووەم ئالان لە ساڵی ١٣٥م لینگیان دا سەر خاکی مادی پچووک و دەستیان

بەتالآن و ڕاوڕووت کرد. بلاشی دووەم، ئاشکی ٢٤ دراوێکی قورسی دا بەئالانەکان کە خاکی ئاتورپاتەگان و میللەتی ماد لە شەڕی ئەوان بپارێزرێن. ئالانەکان بەبێ کێشە لەو خاکە دەرکەوتن.

## ٥- چووینی ڕۆم

### جاری چوارەم بۆ سەر ئاتورپاتەگان

ساڵی ١٦١م بلاشی سێیەم ئاشکی ٢٥، چووە سەر خاکی ئەرمەنستان و سووریە؛ لەولاوە سەرداری ڕۆم بەلەشکرەوە چوو پیشی پێ گرت و شکاندی. بلاش زۆر بەشپرزەیی هەڵات. ڕۆم بەو هێزەوە ڕانەوەستا، هەڵمەتی بردەسەر ئاوربایەگان و پەلاماری دایێ کە بیگری، بەڵام لە ڕێگادا چاو قوڵکە کەوتە نێو لەشکری ڕۆمەوە. ساڵی ١٦٥م بەناچاری گەڕانەوە.

لە ساڵی ١٩٧م دا خاکی ئاتورپاتەگان کەوتە ژێر فەرمانی ئەردەوانی پێنچەمەوە. برایێکی ئەو کە ناوی بلاشی پێنجەم بوو لە بابیل دادەنیشت، هەموو دەمێ نێوانیان بەشەڕ و کوژتار ڕادەبرا. میللەتی مادی پچووک (ئاتورپاتەگان) لێیان بێزار ببوون، لەبەرئەوە حکوومەتی ئەردەوان ڕوو بەکەوتن دەچوو. لە چاغی ئەم پادشایەدا ئەردەشێری پاپەگان دەرکەوت و لە ساڵی ٢٤٤م دا ەردەوانی کوژت و بەسەرخاکی مادی پچووکدا زاڵبوو. کوردەکان لەو دەورەدا تووشی گەلێک کێشە و هاتووچوون و شەڕ و کوژتار بوون. خاکی ئاتورپاتەگان لە دەوری ئەردەواندا زۆر بەپشێوی ڕایبوارد.

# فەسڵی دووەم

١- شەڕی ئەردەشێر (ئارت خشتەر) پاپەگان لەگەڵ کوردی ماسیۆس

کارنامەی ئەردەشێر لە میللەتێکی کورد دواوە کە لە کێوی ماسیۆس موستەقیل بوون و پادشا و تەختیان هەبووە و بەسەربەخۆیی و ئازادی ژیاون. بەڵام کێوی ماسیۆس لە کوێ بووە، ناوی پادشای کوردان چی بووە، پایتەختی ئەو پادشایە چ شارێک بووە، باس نەکراوە. بەڵام بەپێی شەڕەکەی ئەردەشێر و هەڵاتنی لە دەست کورد، وا دەردەکەوێ کێوەکانی ڕۆژاوای موکریان بووبێ، کە هەڵاتووە ڕوو بەدەشت گەڕاوەتەوە و ڕاستەوڕاست کێوەکانی نێوانی گۆمی ورمێ و هەولێر بووە. لەوە ڕەشتەیەک لە دەستدا نییە کە ببێتە مایەی لێدواندن.

کارنامەی ئەردەشێر بەمجۆرە لەو شەڕە دواوە کە ساڵی ٢٢٦م ئەردەشێر بەسوپاهێکی قورسەوە لینگی دا سەر کوردەکانی ماسیۆس کە بەموستەقیللی ڕایاندەبوارد. کوردان لەژێر فەرمانی پادشای خۆیاندا کۆبوونەوە و هەڵمەتیان بردەسەر دوژمنیان و کوژتارێکی قورسیان لە لەشکری ئەردەشێر کرد و ئەردەشێریان تەنگەتاو کرد و شکاندیان و هەڵیانبڕی و بەکوژتار کەوتنە دووی. لەو لەشکرە قورسە کە ئەردەشێر پێی بوو، تەنها سێ هەزار پیادە و هەزار تیرەندازی لێ ڕزگاربوو؛ هی دیکەی هەموو کوردەکان کوژتیان. بەڵام کوردەکان زوو گەڕانەوە؛ زۆربە دوویدا نەچوون کە دوایی پێ بدەن. هەرکە گەڕانەوە تالانێکی دەستیان کەوتبوو بەشیان کرد و هەریەک چوونەماڵی خۆیان و بێ باک پشتێندی ئاسوودەکییان لێ کردەوە و دانیشتن. ئەردەشێر بەشپرزەیی کەوتە دەشتێکەوە، یەک و دوو بڵاوەکانی کۆکردنەوە و هەڵ دەهات و بەدەشت لە دوورەوە تروسکەی ئاوری چاوپێکەوتبوو؛ ڕووی لەو ئاورەکرد. کە نزیکبووەوە تەماشای کرد شوانە مەڕ دەلەوەڕێنێ ئەو شەوە ئەردەشێر لەسەر خاکی وشک خەوت و مەتاڵی کردە سەرین و برسی و تونی ماوە. تونوایەتی و برسایەتی پەکی خستبوو، چوو لایدا کن شوانە.

لەسەر شوانی مێگەڵەکەی پرسی کە لەو خاکەدا جێگایەکی وا هەیە ئەمشەو مێگەڵە مەڕەکەم (مەبەستی لەشکرە شکاو و پەشێوەکەی بوو) بتوانی ئاسوودە بێ و منیش شوانی ئەم مەڕەم. شوانەکە گوتی چوار فرسەنگ دوور لێرە جێگاییێکی وا هەیە ئەگەر بتوانی بگەیێ، لەوێ ئاسوودە دەبی و دەشێی ماندوویی خۆتانی تێدا بحەسێننەوە. ئەردەشێر کۆشا و لەملا و لەولا لەشکرە شکاوەکەی کۆکردنەوە و تەماشای کرد ئەوی نەکوژرابوون و

مابوون و له دەوری کۆبوونەوە سێ هەزار پیادە و هەزار تیرەندازبوون، هەمووی خستنەوە سەریەک و بردنیە ئەو جێگایە کە شوانەکە پێی گۆتبوو. کە تەماشای کرد خاکێکی خۆش و بەئاو و لەوەڕ و سازگار و بەچاو جوان و ڕەنگینە؛ لەوێ لەشکربەزی کرد. ناردی لە خەڵکی ئاوایی کۆکردنەوە و دڵخۆشی دانەوە و دراوی بەسەردا بەخشینەوە. بۆ پشکنینی کوردەکان چەند کەسێکی لەوان ناردە نێوانی کوردەکانەوە.

لە ڕووی چارەڕەشی و بەدبەختیەوە، کورد کە دوژمنی شکاند، بەبێ باکی هەرکەس چوونەوە ماڵی خۆیان و بڵاوەیان کرد بوو. ئەوە کە بەئەردەشێر ڕاگەیاندرا، بەبێ خۆگرتن ئەردەشێر لەشکرەکەی ڕێکخست و لینگیدا سەریان و دەستی بەکوژتاری کورد کرد. لە هەموو لایێکەوە کوردی هەڵبڕی و تەنگەی پێهەڵچنین، هەتا گەیشتە پایتەختەکەیان هەمووی کوژتن. پادشا یا ئەمیرەکەی کوردانی بەژن و ماڵەوە، بەکەس و کارو خزم و خوێش و دەبێ وەندیەوەی بەدیل گرتن و بۆ خاکی پارس سەرگومی کردن. هەموو کوردی کێوی ماسیۆسی قەتلوعام کرد و ئاواییەکانی سووتاند.

ئەردەشێر لە دوای دامەزراندنی حکوومەتی ساسانی، هەموو خاکی کوردستانی کەوتە ژێر فەرمانەوە و کتێبی زەندئەو یستا و دین کوردی کۆکردەوە. دینی زەرتەشتی کردە دینی ڕەسمی حکوومەتەکەی و بۆ موغ و هیربذ و مۆبەدەکان جێگایێکی بەرزی دانا و لە حکوومەتی دا کردنیە بیرەوەری. ئاتەشکەدە وێرانەکانی ئاوەدانکردەوە و ئاورە کوژاوەکانی هەڵایساندەوە. قشوونی جاویدانی داریۆشی ژیاندەوە؛ قانوونێکی شەش مادەی بۆ حکوومەتەکەی دانا. ناوچە بۆ حکوومەت ولابردنی پادشا و ئومەرا لە خاکی خۆیدا، کۆکردنەوەی کتێبی زەرتەشت، دانانی «تەنسەرنامی» (هێربذانی هێربذ)، دینی زەرتەشتی ڕەسمی دینی حکوومەت، وەسیەتنامەی ڕابردووان و بەشکردنی ئەهالی بەچەند تەبەقە و ڕوتبە و مەنسەب بۆ موەزەفانی حکوومەت و قشوونی جاویدان زندووکردنەوە و جەزا سووک کردن.

## ٢- ئاتورپاتەگانی و ڕۆم

گالیریۆس گەورەی ڕۆم ساڵی ٢٩٦م لینگیدا سەر گۆشەیێکی خاکی ساسانییەکان و بەسەر «حەڕان»دا زاڵبوو. بەڵام نێرسی (نیرسیە) پادشای حەوتەمی ساسانی چووە پێشیان لەشکری ڕۆمی شکاند. تیرداد شازادەی ساسانی و گەورەی ڕۆم خۆیان هاوێژتە فوراتەوە و ڕزگاربوون.

ساڵی دووەم گالیریۆس لەلایێکەوە هەڵمەتی بردە سەر خاکی ئاتورپاتەگان، لەو شەڕەدا نێرسی بریندارکرا. بەمامڵەت شەڕ دوایی هات و مەرجە سەختەکانی ڕۆم کە ئەمانە بوون، نێرسی بەناچاری پەسندی کردن، کە ئەم پێنج وڵاتە بدرێتە ڕۆم: «قەڵای زنتا» کە قەڵایێکی سەختی ئاتورپاتەگان بوو لەگەڵ ئەو پەیمانانە کەوتە دەست ڕۆمەوە، کە لە ناوەڕاستی دیجلە هەڵکەوتووە. پێنج وڵاتەکان ئەمانەن ١- ئەرزن کە لە وڵاتی بدلیسە ٢- مووک ٣- زابدی ٤- ڕهێمە ٥- کاردۆ (کوردۆ). ئەم خاکی کاردۆیە وەکو لە نەقشەی ئێران قدیم حسن پیرنیا دایە، خاکی موکریانی ئەمڕۆ بەدرێژاییەوە لە گۆشەی جنووبی دەریاچەی ورمێ ڕوو بەغەرب بڕوا. گەوەڕ و مەرگەوەڕ و خاکی هەکاری لەگەڵدا بێ و لە شەرقی سابڵاخەوە، سەقز و بانەش داخیل بێ کە بەخاکی کاردۆ ناوبراوە. بەهەر جۆرێک بێ زۆرچاک بۆمان دیارنەکراوە، بەڵام کێوانی نێوانی دەریاچەی ورمێ و مووسڵ و هەولێر بەکاردۆ ناسراون. نێرسی ساڵی ٢٩٧م ئەو مەرجانەی مۆرکرد و خاکەکانی بێژراوی دا بەڕۆم.

هەروەکو لە مێژووی ئاتورپاتەگانی دەوری ساسانی ورد دەبینەوە، مادی پچووک ناکەوێتە بەرچاو. خاکێکی لە شەرەفنامەدا بەخاکی کوردۆ یا کاردۆ ناوبراوە، لە شوێنی مادی پچووکدا کاردۆ دەبینین. وا دیارە ئەم خاکەی ئازەربایەگانی ئەمڕۆ، لەو دەورەدا خاکی کاردۆ بووە و شەڕی ئەردەشێر لەگەڵ کوردی ماسیۆس دەبێ لە کێوەکانی جنووب و غەربی سابڵاخ بووبن، کە قەندیل و کورتەکی ئەمڕۆکە بن.

حەسەن پیرنیا لە کتێبی «ایران قدیم»دا دەڵێ: ڕۆم لەپاش ئەو پەیمانە خاکانی ئازربایەگان و تیسفوونی وەبەر هەڕەشەکردن دابوو، موعاهەدە و پەیمانی واپیس تا ئەودەمە لەگەڵ پادشا و ئەمیرەکانی ئاریانی نەژاددا نەکرابوو.

ئەو پێنج ولایەتانەی بێژران کە کەوتنە ژێر فەرمانی ڕۆمەوە، هەموو کوردبوون؛ هەروا لە دەست ڕۆمدا مانەوە، هەتا ساڵی ٣٦٣م شاپووری گەورە بەچەند شەڕێکی لەگەڵ ڕۆمدا کردی و سەرکەوت، ئەو خاکانەی خستە ژێر فەرمانی حکوومەتی ساسانییەوە.

بەڕاستی شەست و شەش ساڵ خاکی کاردۆ و کوردەکانی دیکە لەژێر حوکمی ڕۆمدا بوون، بەڵام ڕۆژێک سەریان نەچەماند و شۆڕش و پشێوی لەو خاکەدا هەر نەبڕا، چونکە ئومەراکانی ڕۆم عیسایی و کاردۆکانیش زەرتەشتی بوون و پێکەوە نەدەگونجان و ڕێک نەدەکەوتن.

ساڵی س٣٨٢م خاکی کوردستان و ئازرپایەگان لە ژێر فەرمانی شازادەکانی خۆیان

دابوون و ئەرمەنستان شازادەکانی ئاشکانیانی لەسەر داندرا.

لە ساڵی ٣٩٩م دا دینی عیسایی کەوتە خاکی کوردستان و ئێرانەوە. یەزدیگوردی یەکەم مەیدانی دا بەوە دینی عیساییەکە لەو خاکەدا بڵاوبێتەوە؛ بەڵام کورد نەیاندەویست. «داس» نێو کوردێک لە لای ورمێ ئەو دینەی گرت و بوو بەموبەشیر.

ساڵی ٤٢٠م بەهرام گوڕ لە ئازربایەگانەوە لەشکرێکی قورسی هەڵگرت و هەڵمەتی بردە سەر ڕۆم. لەولاوە ڕۆم کەوتبووە ئەرمەنستانەوە. دینی عیساییش لە ئەرمەنستاندا کرابوو بەدینێکی ڕەسمی و «مەسرووب» ناوخەت و نوویسراوی بۆ ئەرمەنی دانابوون و لە دینی زەرتەشتی و شێوەی ئاریانی دوورکەوتنەوەیان دەویست. بەڵام زۆر نەچوو دووبارە ئەو دینە لابراوە و ڕۆم دەرکران.

لەو دەورەدا «هەیاتیلە» پەیدابوون، لە شەڕ و شۆڕشی ئەواندا کورد زۆر لەناوچوون. بەکۆششی «واهان» فەرمانڕەوای ئەرمەنستان دینی عیسایی لە خاکی ئەرمەنستان و گورجستاندا لە ساڵی ٤٣٠م بووە دینی ڕەسمی.

ساڵی ٥٠١م دینی مەزدەک کوڕی بامیداد بڵاوبۆوە و کەوتە خاکی ئازربایەگانەوە. کورد زۆر کەمیان ئەو دینەیان پەسند کرد. لەو ساڵەدا شۆڕش و شەڕی «هەیاتیلە» کوردی زۆر شپرزە کرد.

## ٣- بەهرامی چوپین

ئەم پادشایە کوردە لە بنەماڵەی گورگین میلاد و لەگەڵێک عەسرانەوە بەسەر گۆشەیەکی خاکی ئازربایەگان دا پادشاییان کردووە؛ بۆ خۆشی زۆر ئازا و بەناوبانگ و ڕەشید بووە، پادشاکانی ساسانی هەموو دەمێ ئەندێشەیان لێ کردووە.

بەهرام کوڕی میهرەبان (میهران) کە خاوەندی خاکێک بوو لە گۆشەیێکی ئازربایەگاندا. ساڵی ٥٨٨م خان تورک لینگی دا سەر گۆشەیێکی خاکی ئێران. بەهرام چوپی بەشەڕ بەسەریدا زاڵبوو و خانی تورکی کوژت و لە شەڕی دووەمدا کوڕی خانی تورک بەدیل گیرا و بەهرام زۆر ناوبانگی کرد و ٢٥٦ باری وشتر زێڕ و گەوهەری بەتاڵان دەستکەوت و بۆ هورمزی کوڕی نەوشیرەوانی بەدیاری نارد.

هورمز نەیەویست بەهرام سەرکەوێ. بۆ شەڕی ڕۆم بەهرامی نارد بچێت و نەگەڕێتەوە. بەهرام چووە «لازبیکا» (لازستان) لە دوای شەڕ و کوشتار بەهرام لەوێ شکا.

هورمز بەمە کەیف خۆشبوو. بەرگی ژنان و دۆخدانە و تەشی و شانەی بۆ نارد. لەشکر و سوپاهی بەهرام بەوە دڵگیربوون و سەرکێشییان کرد و چوونە تیسفۆن گرتیان. هورمز هەڵات و لە لایەن (بیستام - ویستاخم)ی خزمێکی خۆیەوە کوژرا.

ساڵی ٥٩٠م بەهرام لەسەر تەختی شاهی دانیشت. خوسرەوی پەروێز پەنای بۆ ڕۆم برد و گەڕاوە سەر ئازربایەگان و گرتی و شۆڕش کەوتە نێو کوردستانەوە. بەوە کە بەهرام لە خاکی ئازربایەگاندا کە خاکێکی پیرۆزی زەرتەشتیان بوو، شەڕی لەگەڵ خوسرەو کرد و میللەت یارمەتی نەدا و شکا و هەڵات.

ئەو بەهرامە ئێمە بەکوردی دەناسین لەبەرئەوە کتێبێکی تایبەتیم بۆ نووسیوەتەوە، تەماشای ئەو کتێبە بفەرمووێ کە ناوی «شاهنشاهێکی کورد»ە.

کورد لە ساڵی ٢٢٦ - ٦٣٢م لەگەڵ حکوومەتی ساسانی و ڕۆم بەکێشە و ژێرکەوتن و سەرکەوتن بەسەریان دەبرد. هەندێک جار ئازاد و سەربەخۆ دەبوون و هەندێک جاران دەکەوتنە ژێر ئیدارەی پادشایانی ساسانییەوە و هەندێک جاران ڕۆم بەسەریاندا زاڵ دەبوو؛ هەروەکو لە ڕابردوودا بەکورتی لێی دواین. هەتا زهووری ئیسلامی، غازییانی ئیسلام خاکی ئازربایەگان و باقی کوردستانیان گرت و کوردیش وەکو باقی ئەقوامەکانی ئاسیا کەوتنە ژێر فەرمانی خەلافەتی ئیسلامەوە، هەروەکو لە هاتوودا بەتەفسیل باس دەکرێ.

## فەسڵی سێیەم

## کیشوەرگیری غازییانی ئیسلام

لە شەڕی نێوانی ساسانییان و غازییانی ئیسلامدا، کورد بەشێکی زۆر گەورەی لەشکری ساسانیانی لە دەستدا بوو. بەگەرمی یارمەتی حکوومەتی ساسانییانی دەدا، لەبەرئەوە لەم فەسڵەدا شەڕی سەرەتایی و دوامینی غازییانی ئیسلام و شکانی کورد و گرتنی هێندێک خاک و هەشت شەڕی ئیسلام و یەزدیگوردا چەند شەڕی ئیسلام و کوردەکان بدوێم کە ئەمە لە هاتوودا دێتە گوتن.

سەرەتای شەڕی غازییانی ئیسلام و کورد و موجاهیدانی ئیسلام، یەزدیگوردا لە دەوری بەهرامی چوپین و خوسرەوی پەرویز دەستپێدەکا. خاکی کوردستان بەهەمووەتی و کوردستانی ئازربایەگان و دەوروپشت بەتایبەتی، لەبەر هەڕەشە و هەڵمەتی غازی و موجاهیدانی ئیسلامدا بوون، هەتا بەجارێک بەسەر ئەو خاکانەدا زاڵبوو، هەروەکو دێتە باسکردن.

**١- شەڕی دوقار:** لە ساڵی ٦٠٤ - ٦١٠م لە دەوری پەرویزدا کەموکورت دەستی پێ کرد، بەڵام ئەمە سەرمەشق و تاقیکردنەوەی هێزی ساسانییان و ئازایی غازییان بوو کە دەست پێکرا.

**٢- شەڕی زنجیر:** ساڵی ١٢ھ /٦٣٢م خالید ئیبن وەلید چووە سەر خاکی نێوانی خەلیجی فارس و کوێت. هورمز سەرحەدداری ساسانی چووە پێش بەگژیاندا چوو، لە شەڕدا هورمز کوژرا، خالید دەستی بەگرتنی خاکانی تخووبی کرد. لە دواییدا «موسەننا بن حاریسەی شەیبانی» کردە جێنشینی خۆی. ئەویش ڕێزی لێگرت و گەلێک شار و خاکی سنووری خستە دەست.

**٣- شەڕی پرد:** ساڵی ١٣ھ یەزدیگورد لەشکرێکی قورسی لەژێر سەرداری ڕۆستەم فەروخ هورمزدا ناردە پێش. لەولاوە سەرکردەی بەناوبانگی ئیسلام «ابو عوبەیدە مەسعوود سەقەفی» لە کەڵەک پردی لەسەر فورات دروست کرد و پەڕیەوە و بەگژ ڕۆستەمدا چوو.

ئەسپی ئیسلام چونکو پیل (فیل)یان نەدیبوو، لە دیتنی فیل سڵەمینەوە و نەچوونە پێش. ئەبو عوبەیدە ناچار بەپێیان شەڕی کرد. ئەسپی غازییان هەڵاتن. فیلی سپی ڕۆستەم ئەبو عوبەیدەی خستە ژێر خۆی و برینداری کرد. لەو شەڕەدا موسەننا کوژرا، ئێرانی سەرکەوتن و ئیسلام شکان.

**٤- شەڕی بوەیب:** ئیسلام مەردانە بەگژ ئێرانییاندا چوو. ئەوی لە شەڕی پرد لە دەستیان دابوو، گێڕایانەوە.

**٥- شەڕی قادسیە:** سەرکردەی بەناوبانگی ئیسلام «سەعد وەقاس» بەلەشکرێکی قورسەوە چووە سەر عیراق. ڕۆستەم فەروخ هورمز بە ١٢٠ هەزار شەرکەری ئازاوە پێشوازی سەعدی کرد. ساڵی ١٤ھ/ ٦٣٦م چوار شەو و چوار ڕۆژ لەسەریەک شەڕ کرا. شەوی ڕۆژی پێنجەم کە بە«ليلة الهرير» (لوورەی سەگ) ناودەبرێ و شەوی ڕەشی ئێرانی و بەختەوەری ئیسلامە، موجاهیدانی ئیسلام بەشەویخوون هەڵمەتیان برد؛ لەشکری ڕۆستەم شکا و هەڵات. ڕۆستەم خۆی هاوێژتە فوراتەوە کە بەمەلە دەرباز بێ، «حەلال بن عەلقەمە» کەوتە دووی و گرتی و کوژتی و کەللەسەرەکەی بەڕمدا کرد و چوو لەسەر تەختی ڕۆستەم دانیشت. لەو شەڕەدا «درەفشی کاویانی» و بایی دووسەد هەزار دینار گەوهەر و ماڵ و چتی گران بەهای بێ ژمار کەوتە دەست موجاهیدانی ئیسلام. ئەو هەموو گەوهەرانەیان بە ٥٠٠ دینار فرۆت.

موجاهیدانی ئیسلام لە دوای ئەو سەرکەوتنە چوونە سەر شاری تیسفۆن (تاقی کیسرا) کە پایتەخت بوو؛ بەشەڕ گرتیان. یەزدیگورد هەڵات و تالانێکی زۆر قورس کەوتە دەست ئیسلامان. مافووری بەناوبانگی بەهارستان و زێڕ و گەنجێکی هێندە زۆر بەتاڵان گیرا کە مێژوونووسان لە ژمارەی عاجزن. ئیسلام زێر و کافووریان نەدەناسی.

**٦- شەڕی جەلەولا:** ساڵی ١٦ھ/ ٦٣٧م یەزدیگورد چوو بووە «حەلوان» کە شارێکی بەناوبانگی کوردستانی شارەزوور بوو. سەعد وەقاس لەشکرێکی قورسی دا بەهیشام بن عەتبە و قەعقاعی بن عەمرو، لە جەلەولا بەگژ کوردەکانی کە یاریدەی یەزدیگوردیان دەدا چوون. یارمەتی گەیشتە کوردەکان و بەئازایی تێکۆشان، بەڵام لەدواییدا کورد شکان و ئیسلام سەرکەوتن. سەرکردەی کوردان میهرانی ناوبوو. لەو شەڕەدا ئیسلام سەد هەزار ئەسپی مادی و تالانێکی زۆریان دەستکەوت.

لە دوای ئەوە سەعد ویستی بۆ پێشەوە هەڵمەت ببات، بەڵام خەلیفەی دووەم بۆی نووسی «بين النهرين» بۆ ئێمە کافییە. حەسەن پیرنیا لە «ایران قدیم - لاپەڕە ١٩٩»دا دەڵێ: ئەیکاش لە کێوەکانی کوردستاندا دەربەندێک بوو، نەلەشکری ئێران و نەعەرەب لەوێ دەرباز دەبوون. هیچ هێزێک لەوێ تێنەدەپەڕی، بۆیە خەلیفە فەرمانی چوونە پێشەوەی بەسەعد نەداوە. ساڵی ١٦ھ لەگەڵ خاکە نەرم و دەشتایی «بين النهرين» و شارەزوور خەریکبوو.

**٧- ئەهواز:** ساڵی ١٩ھ/ ٦٤٠م هورمزانی پادشای خوزستان داوای یارمەتی لە کوردەکانی موکریان (ئازربایەگان) و هەمەدان و کرماشان کرد. لەشکرێکی قورسی لە دزپوول کۆکردبوو. لە کوردی موکریان سێ عەشیرەتی زۆز زل و گەورەی کورد، کە کوردی ڕاوەند و شوول و زوردلان بوون، چوون بەگژ غازییاندا چوون. کوردی شاهین و گێل بەهاواری هورمزانەوە چوون. «نەوبەخت - شاهنامەی پەهلەوی - جلدی یەکەم - لاپەڕە - ١٠ - ١١ - ٣١» بەدرێژی لەوە دواوە کە کوردەکان چوونە کۆمەگی. ئەو چوار شیعرییە، کە دوو شیعری لە لاپەڕەی ١٠ - ١١ دوو شیعری لە ٣١ دایە، بۆ نموونە لێرەدا دەینوویسم کە باسی کوردەکانی شاهین و ڕاوەند و شوول و هەرسین و کەنگاوەر و زوردلان و گێلی کردووە و لە فەرهەنگیدا جێگای ئەو کوردانەشی نیشان داوە کە تێیدا دانیشتوون و نیشتمانیان بووە:

ز کوردان شاهین و راوەند و شوول
فراوان بیامد سوی دیزوپوول
زهرسین و کنگاور و زوردەلان
یکی لشکر ئامادەشد از یلان

***

صف هرمزان را سواران گیل
سوی میسرە باسیە زنجیر پیل
سپهدارشان گیلوی صف شکن
همە کورد پر زور شمشیر زن

شێخ ئەحمەد حەللان لە «الفتوحات الاسلامیة» لاپەڕە ١١٦ لە جلدی یەکەمدا لەو شەڕە دواوە و دەڵێ هورمزان «واستعان بالأکراد فکتب عتبە بذلك الی عمر»، هورمزان کۆمەگی لە کوردان خوازت، عەتبەش ئەوەی بۆ عومەر نوویسی. عومەری ئیبن خەتاب خەلیفەی دووەمە.

لە نێوانی هورمزان و ئیسلامدا کوژتارێکی قورس کرا، کورد زۆر کوژران و هی ماوی شکان و هەڵاتن و بەشپرزەیی و پەرێشانی لە مەیدان دەرکەوتن. بەڵام لە دوای هەژدە مانگ دەورەدان و شەڕ و کوژتار ئەو سەرکەوتنە بۆ ئیسلام ڕوویدا. هورمزان بەدیل گیرا و برا بۆ مەدینە. لەدوای ساڵێک لە مەدینە هورمزان بەدەستی ئەبو حەفەسی کوڕی عومەر کوژرا.

**٨- شەڕی نەهاوەند:** لە ساڵی ٢١ھ/ ٦٤٢م ڕوویدا. یەزدیگورد لەوێ لەشکرێکی قورسی لە کورد لەسەرخۆی کۆکردبۆوە، لەو ساڵەدا نەعمان بن موقرین بەلەشکرەوە چووە حەلوان کە بچێتە «ڕەی». لەوێ گرداوەری یەزدیگورد کە بەنەعمان گوترا هەتا چووەسەر نەهاوەند، لەولاوە یەزدیگورد لەشکرێکی زۆری دا بەفەیروزان و ناردیە پێشوازی نەعمان. ئەو لەشکرە سی هەزار کەسی کوردی لەگەڵ بووە، لە مەیدانی شەڕدا نەعمان لە دوای چەند شەڕ و کوژتار کوژرا. حوزەیفە لە جێی نەعمان سەردار سوپاهی کرد و شەڕی ڕاگرت، لەو شەڕانەدا گەلێک لە کورد لە خوێندا کەوتن و هی ڕزگار بوو بەپەرێشانی ڕووی لە هەڵاتن کرد و شکا. یەزدیگورد لە دوای ئەو شپرزەییە خۆی نەگرت و هەڵات. ساڵی ٣١ھ/ ٦٥٢م یەزدیگورد کوژرا.

لە دوای ئەو شەڕ و کوژتارانە کوردەکان داچلەکین و لە کێوە بەرز و سەختەکانی نیشتمانیان خزان. بۆ خۆپاراستن لەگەڵ کۆبوونەوە و بەرامبەری خەریکبوون. موجاهیدانی ئیسلام لە دوویان نەبوونەوە و لە هەموو لایێکەوە بۆیان چوون، هەروەکو لە هاتوودا لێی دەدوێین.

یەکێک لە شاعیرانی ئەودەمەی کوردان لە قیتعە و هەڵبەستێکیدا ئەو شەڕ و کوژتارەی تەمسیل کردووە. ئێمە ساڵی ١٩٢٩ لەسەر پارچە هەمبانێک ئەم چوار شیعرەمان دەستکەوت؛ لە مجەللەی «زاری کرمانجی»دا بەدرێژی نەشرمان کردبوو ئەمەیە کە دەبێژرێ:

هورمزگان ڕمان، ئاتیران کوژان
هۆشان شارەوە گەڤرە گەڤرەکان
زۆر کرنە عەرەب کوردی نەخاپوور
گەنانە پالە بەشی شارەزوور
ژن و کەنیکان وەدیل پەشینان
مەرد ئازا تلین ژ ڕووی هەوی نان
ڕەوشی زەردەشت مایە وەبێ دەس
بەزی کاناکا هورمز وە هیچ کەس

ئەو چوار شیعرە لوغەتی کوردی ئەو سەردەمە و شەڕی غازیانی ئیسلام لەگەڵ کوردی خاپوور و شارەزوور و شکانی کورد لە دەستیان و زەردەشتی بوونی کوردەکانی ئەو

خاکانەمان بەچاکی بۆ ئاشکرا دەکا و شەڕەکانی لە هاتوودا مێژوو نووسەکان لێی دواون و «ابن اثیر» و «دحلان» و «طبری» و غەیرە باسی کردوون ئەو چوار شیعرە تەئیید دەکەن.

دەحلان لە: «الفتوحات الاسلامیة جلدی یەک - لاپەڕە ١١٤»دا دەڵێ: ساڵی ١٦ھ ڕەبعی بن ئەفکەل و ئیبنولهیرسەمە لە دوای گرتنی مووسڵ چوونەسەر کێوەکانی شیمال و دەوروپشتی مووسڵ، هەموو قەڵاکانی کوردانیان گرت (ثم فتحت بقیة اعمال الموصل وجمیع معاقل الأکراد وسار الجمیع للمسلمین) ئەوە بەشی خاپوور و هەکاری و ماردین و ئاکرەن.

هەر لەو ساڵەدا موجاهیدان هەڵمەتیان بردە سەر کێوەکانی کوردستانی دەوروپشتی شارەزوور و دەستیان بەگرتن کرد.

١- **شەڕی ماسیبدان:** ئازین کوڕی هورمز لە کوردەکان لەشکرێکی ڕێک خستبوو، شاری «ماسیبدان»ی کردبۆوە لەشکربەز و خەریکی هێز فرەکردن بوو. سەعد وەقاس لەشکرێکی دا بە«زورار بن خەتاب» و ناردیە سەر ماسیبدان. لە دەشتی ماسیبدان ئازین پێشی پێ گرت و دەست بەکوژتار کرا. ئازین بەدیل گیرا، زورار دەسبەجێ سەری بڕی. کورد شکان، شەڕ و کوژتار کەوتە لای سیروان، کورد هەڵاتن.

٢- **شەڕی دینەوەر و سیمرە:** ساڵی ١٧ھ ئەبو مووسا کە لە شەڕی نەهاوەند سەرکەوت، لەو ساڵەدا چووە سەر دینورد دینەوەر) کە شارێکی زل و گەورەی کوردان بوو. بەبێ شەڕ مامڵەت کرا و دینەوەر کەوتە دەست ئەبو مووسا. لەوێوە چووە سەر شێروان. ئەو شارەش بەمامڵەت گیرا. لەوێ ئەبو مووسا پێنج ڕۆژ دانیشت. سائیبی کوڕی ئەقرەعی سەقەفی ناردە سەر شاری سیمرە کە پایتەختی «میهریجان قەزەف» بوو، بەمامڵەت ئەویش گیرا.

٣- ساڵی ٢٢ھ «بکیر» ناو سەرکردەیێکی ئیسلام لە کێوە بەرزەکانی جرمەیدان سەرکەوت کە بچێتە سەر ئازربایەگان. لەولاوە ئەسفەندیاری کوڕی فەروخ هورمز پادشای ئازربایەگان بەلەشکرەوە چووە پێشی. هەرچەندە کوردەکان لە شەڕەکانی گوتراودا داچڵەکی بوون و لە شەڕ ماندوو ببوون، بەڵام دیسان بۆ ئەسفەندیار لەشکریان کێشا و چوونە پێش بکیر، لە دوای گەلێک شەڕ و کوژتار، کورد شکان؛ ئیسلام سەرکەوتن و ئەسفەندیار بەدیل گیرا و کەوتە دەست بکیر و بەئیحترامەوە ڕاگیرا. لە دوای بکیر عەتەبە بن فرقە لە جێی بکیر دانیشت. بەهرامی کوڕی هورمز چووە پێش و بەگژی داچوو، لە دواییدا شکا و هەڵات. لە دوای ئەو شەڕە بەمامڵەت ئەسفەندیار بەردرا.

٤- ساڵی (٢٣ھ) عەزرە بن قەیس کە لەسەر حەلوان بوو، چووە سەر شارەزوور و نەیتوانی بیگریت. عەتەبە بن فرقە لەشکری بردەسەر لە دوای شەڕ و خوێنڕژتن بەماملەت گیرا؛ وەکو حەلوان قەرار درا.

لە چووینی کێوەکانی قەندیل و باڵەکدا موجاهیدانی ئیسلام نزیک شەش هەزار کەسیان بەدووپشک مرد. کوردی سامغان، داراباد، بەجزیە و خەراج مامڵەتیان کرد؛ بەڵام کوردێکی بێ ئەژمار لەو شەڕانەدا کوژران. دەحلان لە «الفتوحات الاسلامیة» جلدی یەک لاپەڕەی ١٣٧ دا دەڵێت: «وقتل خلقاً كثيراً من الأكراد».

٥- ساڵی (٢٣ھ) ساریە بن زەنیم لەشکری بردەسەر کوردەکان لە نساو دارابگرد؛ دەورەیان دان، ئەوانیش یارمەتییان لە کوردان خوازت و کۆبوونەوە و کوردەکانیش کۆبوونەوە لەسەریان و ئیسلامەکانیان تەنگەتاو کرد و تووشی ترسێکی گەورەیان کردن.

دەحلات لە «الفتوحات الاسلامیة» جلدی یەک - لاپەڕە١٤٠دا دەڵێ: «فنزل عليهم وحاصرهم ماشاء اللّه ثم أنهم أستمدوا وجمعوا وتجمعت إليهم الأكراد... فداهم المسلمين أمر عظيم».

کورد لای کێوەکانی گرتبوو، ئیسلام لە دەشت دا بوون، لە هەموو لایێکەوە تەنگە بەئیسلام هەڵچنرابوو. ڕۆژی هەینی (جومعە) بوو، عومەر خەلیفە لە مەدینە لەسەر مینبەر خوتبەی خوێند، لەپڕێکدا هاواری کرد: «یاساریە بن زنیم الجبل یاساریە الجبل الجبل» کەهەی ساریەی کوڕی زەنیم بۆ کێو هەی ساریە کێوکێو. گۆیا لەو شەڕەدا ساریە گوێ لەو دەنگەی خەلیفە بووە کە لە مەدینە لەسەر مینبەر هاواری کردووە، لەبەرئەوە پشتی داوەتە کێو و کوردەکانی شکاندووە.

ئەو سەربهوردە لاپەڕەیەکی زۆری کتێبی تەئریخی ئیسلامی پڕ کردۆتەوە و مێژوونووسەکانی سوننی بەباوەڕێکی تەواوەوە ئەوەیان نووسیوە. لە دوای ئەوە ساریە کە گوێی لەو دەنگە بوو پشتی دا کێو و کوردەکانی شکاند و تالانێکی قورس و گەوهەرێکی زۆر گران و قورس کەوتە دەست موجاهیدانی ئیسلامەوە.

٦- ساڵی ٢٣ھ ئەبو موسا چووە سەر ئەو کوردانە کە لە پیرۆز و نەهرتیرە و ئەهواز و مەنازیر کۆبببوونەوە. مانگی ڕەمەزان لە نێوانی نەهرتیرە و مەنازیر پێیان گەیشت. کورد شەڕ و کوژتاریان گەرم کرد، لە دوای خوێنڕێژێکی بێ ژمار گەلێک کورد کوژران و ئەبو مووسا تەنگەی بەکورد هەڵچنی و شکاندنی و ڕەپێی نان، هەتا لە کێوە بەرز و جێگا سەختەکانی پەستاوتن.

٧- ساڵی ٢٣هـ سەلەمە بن قەیس ئەلئەشجەعی چووەسەر کوردەکان، کوژتارێکی قورسی لە کورد کرد و هەمووی قەتلوعام کردن. دەحلان دەڵێ «قطع النسل»ی کردن. بەڵام گەوهەرێکی «سەفت»ی گەلێک گرانیان لەگەڵ ماڵ و ئەملاک و نەقدینە دەستکەوت.

## موجاهیدانی ئیسلام لە کوردستانی ئازربایەگاندا

کە کوردستان و هەموو خاکی ئێران لە سەرەتای ئیسلامییدا کەوتە دەست غازی و موجاهیدانی ئیسلام، ئەو غازییانە دەگەڵ بڵاوکردنەوەی دین، هەر خاکێکی دەیانگرت، بەگەرمی لێی دادەمەزران و تێیدا جێگیر دەبوون. هەر خاک و زەوییێکی خۆش و بەرچاو جوان بوایە، دەیانکردە نیشتمانی خۆیان. لەو خاکانەی کە بەگەرمی تێیدا دانیشتوون، خاکی ئازربایەگان پتری تێرژا و بەفرەیی تێیدا دانیشتن: ئەویش لەبەر سێ چت بوو:

١- ئەو خاکە ناوچەیێکی دینی زەرتشت و جێگای ئاتەشکەدەی گەورە و پتری جێی موغ و پیاوانی گەورەی ئەو دینە بوو. موجاهیدانی ئیسلام پتر لەوە تەقەلایان داوە میللەتی ئەو خاکە زووتر بخەنە دەست و دینی ئیسلامی تێدا جێگیرکەن. لە مێژووەکاندا دێتە بەرچاومان لە دەوری خەلیفەی سێیەمدا ئەشعەب بن قەیس گەلێک پیاوانی ئەهلی عەتا و دیوانی بردۆتە ئەو خاکە و لەو شارانە دایمەزراندوون، تاکو ڕەوشتی ئیسلامییەت نیشان بەمیللەت بدەن، هەروەکو لە داهاتوودا باسی دەکەین.

٢- میللەتی خاکی ئازربایەگان بەئاسانی و بەخۆشی بۆ موجاهیدان سەری فەرمانبەرییان نەچەماند. بەخوێنرێژی و کوژتارێکی زۆر قورس و بێ ژمار ئەو خاکە کراوەتەوە. ساڵی ٢٣هـ حوزەیفەی یەمانی لینگی دا سەر ئەو خاکە، لەشکری ئازربایەگان کە کوردەکانی شوول و ڕاوەند و شاهێن و زور و دلان بوون، وەکو باسیان ڕابرد، لە شەڕی یەک لەدوای یەکی ئەهواز و قادوسیە و ئەوانە و لە شەڕی دوامینی «واجرد»دا بەشپرزەیی و ماندوویەتی و پەرێشانی گەڕابوونەوە و هێشتا پشوویان نەخواردبۆوە. ترس و ئەندێشەی موجاهیدانی ئیسلامیان هەر لە دڵدابوو و داچڵەکی بوون، ناچاری ئەمان خوازتن بوون، لەگەڵ حوزەیفە یەیمانی ئاشتییان بەست و گرێ فەرمانبەرییان گرێ دا. بەڵام ڕق و نە کێشان لە دڵیاندا دەجۆشا. لە کەلێندا بڵند دەبوون و شەڕ و کوژتاریان دەست پێ دەکردەوە و بۆ دەرکردنی دوژمن تەقەلایان دەدا و کۆدەبوونەوە و پشێوی و نەیاری و سەرکێشی و کوژتاریان دادەمەزراندەوە. جا لەبەرئەوە موجاهیدانی

ئیسلام لەو خاکەدا زۆر ماندوو دەبوون.

خاکی کوردستانی ئازربایەگان لەو خاکانەیە کە بەزۆر و خوێنڕێژی گیراوە و ئەم خاکانەش حوکمێکی تایبەتییان لەسەر دەکرێ، وەکو ئەو خاکانە لە لایەن عەرەبەوە بە«البلاد والأراضي المفتوحة عنوة» ناو دەبرێ، کە بۆ ئەوەش دەستوورێک هەیە. ئەوجا میللەتەکانی ئەو خاکە لە دەشتەکانەوە دەکەوتنە کێوپارەکان و شاخ و کێوە بەرزەکانی سەخت و دژواری دەوروپشتی و نێوانی خاکی ئازربایەگان، بۆ خۆپارازتن تێیدا دانیشتن. وەکو کێوانی موکریان، سەهەند و قەندیل، دالانپەڕ، کورتەک و کێوانی پشت خۆی و سەلماس، ماکۆ و موغان و گەیلان و وتالشستانیان دەخستە دەست. کە کەمێک تەنگەتاو بکرابان بەرەو ژوورتریش دەچوون، ئەو جێگایانەیان دەگرت و تێیدا بەئازادی و سەربەخۆیی و دارای خۆیان تێدا دەنواند. حکوومەتی خۆجێیی خۆیان دادەمەزراندەوە، هەر بەکێشە و شەڕ و کوژتار ڕایاندەبوارد.

جا لەبەر ئەوە موجاهیدانی ئیسلام دڵنیا نەبوون بۆ بەخێوکردنی ئەو خاکە و پارازتنی هێزیان لە شەڕ و کوژتاری کوردەکان و هەموو دەمێک بەناچاری بۆ پاس و ڕاگرتن، هێزێکی قورسیان لەو خاکە دادەنا. «طبری» لە جلدی پێنجەم، لاپەڕە، ٤٥، دا دەڵێ: هەموو دەمێ شەش هەزار شەڕکەری جەنگی لە کووفەوە دەناردرا خاکی ئازربایەگان و بەهەر چوار ساڵ جارێک دەگۆڕدران.

٣- خۆشی و خوڕەمی خاک و ئاووهەوا و مێرگ و شینایی و چیمەن و کوێستان و گەرمەسێری لێک نزیک و لەوەڕ و چایەری زۆری کێوە بەرزەکان و ناو دەشتی و سەرچاوەی کانیاوی سارد و پڕ ئاو و جوێ و جوێباری جوان و قەشەنگ و چۆم و جۆگە و ڕووباری پڕ لە ئاوی شیرن و بێ ژماری خاکی ئازربایەگان کە بۆ ژیان و زیندەگانی و گوزەرانی ئێلات و ڕەوەند چاکترین و پڕ پیت و پێزترینی خاکانی سەر زەوی دنیا دێتە ئەژماردەوە؛ جا لەبەرئەوە موجاهیدانی ئیسلام ئەو خاکەیان کە گرت و بەسەریدا زاڵبوون، بەکەم دەمێک لە هەموو لایێکەوە قەبیلە و عەشیرەتەکانی «تاتێک» بەدەستە و پۆل یەک لەپاش یەکدی ڕوویان تێ دەکرد و جێگیربوون و بەسەر ئەو خاکەدا دەستیان ڕاگرت. لە بەسرە و یەمەن و کووفە و سووریاوە بۆی چوون، یەعقووبی لە «البلدان»دا لاپەڕە ٢٧٢ دووروودرێژ لەوە دواوە و دەڵێ: «ثم نزلها العرب لما افتتحت» کە موسڵمانەکان ئازربایەگانیان گرت چوون تێیدا دانیشتن.

ئەحمەد کیسرەوی بەخشی دووەمی «شەهریاران گمنام» لە «پلازەری» ئەویش لە «واقید» ناو و ئەردەبیلی وەردەگرێ: وەختێک کە ئازربایەگان کەوتە دەست موجاهیدانی ئیسلام، لە کووفە و بەسرە و شام و کەلێک خاکی دیکەوە، قەبایل و عەشایری عەرەب چوونە خاکی ئازربایەگان. هەر کۆمەڵەیەک بەپێی لە دەست هاتنیان پارچە خاکێکیان خستە دەست و لەسەری دانیشتن و هێندێک بەکڕین زەویان پەیدا کرد و لە خۆجێیەکانیان کڕی و خاوەند زەویوزارەکان و خاوەندی دێهات و خاکەکان بۆ خۆپارازتن و گوزەران، دێهات و زەوییەکانی خۆیان پێ دەدا و بۆ خۆشیان بەسەپانی و ڕەنجبەری باخچە و باخەوانی و جووت بەندی و خزمەتکاری لە لایان دادەمەزراندران و زیندەگانییان لەگەڵیاندا دەکرد. ئەمە جوملەیەکی پلازەرییە کە بەعەرەبی لێرەدا بۆ شاهید دەینووسینەوە کە دەڵێ: «اخبرني واقد أن العرب لما نزلت ازربايجان نزعت اليها عشايرها من المضريين والشام وغلب كل قوم على ما أمكنهم، وإتباع من العجم الأرضيين والجئت اليهم القرى للخفارة فصار أهلها مزارعين لهم».

لە دەوری خەلافەتی عوسماندا، ئەشعەس بن قەیس بەوالیگەری ناردرایە سەر ئازربایەگان. کۆمەڵەیێکی زلی لە ئەهلی عەتا و دیوان بردنە ئازربایەگان: «ئەوانەی عەرەب بوون سالانەیان لە بیت المال، دەدرایێ کە لە شاران و ئاواییاندا بگەڕێن و شرووت و دەستووری ئیسلامی فێری خەڵک بکەن». جاری دووەم ئەشعەس لە دەوری خەلافەتی عەلی دا کۆمەڵەیێکی قورسی لەوانە بردە ئازربایەگان و لە شار و دێهاتانی ئەردەوێڵدا دایمەزراندن. (فتوح البلدان - لاپەڕەی ٣٣٦ - ٣٣٧).

«ابو الفرج» لە جلدی ١١و لاپەڕە ٥٩ی «اغانی»دا لە شەڕوشۆڕی نێوانی بەنی تەغلەب و بەنی قەیس دواوە. تەغلەب ناردیە بەنی تەغلەب موهاجیرانی کە لە ئازربایەگان بوون «شعیب بن ملیل» بە دوو هەزار سوارەوە یارمەتی کرد. ئەوە دیار دەکا لەودەمەدا عەشیرەتی عەرەب لەو خاکەدا چەند زۆربووە و بەتێکەڵاوی لەگەڵ دانیشتووەکانی خۆجێیدا ئەژماردراون.

کیسرەوی لە یەعقوبییەوە وەردەگرێ کە جگە لە کیشوەرگیری سەرەتای ئیسلامییەت، لە قەرنی دووەمی هیجریشدا عەشیرەتێکی زۆر چوونە ئازربایەگان. ئەبو جەعفەری خەلیفەی عەباسی کە یەزیدی کوڕی حاتەم سەلەمی کردە والی ئازربایەگان، یەزید لەو عەشیرەتانەی عەرەب کە لەگەڵ خۆی بردنە ئەو خاکە، عەشیرەتی زۆر قورس بوون و لە

بەسراوە هەڵی گرتن. «ڕەواد بن موسەنای ئەزدی» لە تەوریز و «بز» و «موڕ کوڕی عەلی تائی» لە «نزیز» دانا، ئەو شارانە نزیک ئەردەوێڵ هەڵکەوتوون و «همدان الطائی» برد لە میانە دایمەزراند و قەبیلەکانی یەمەنی بەهەموو لایەکدا بڵاوکردەوە.

قەبیلەی «نزار» «هی نجد وحجاز» بوون و «صفو بن لیث العتبی» و ئامۆزای ئەو کە «بعیث بن حلبس» بوون بەهەموو خاکەکانی ئازربایەگاندا دەستەڵاتییان هەبوو، «یعقوبی» جلدی ٢ لاپەڕە ٤٤٦ بەدوورودرێژی لەوە دواوە.

کیسرەوی لە «شهریارانی گمنام» بەخشی دووەمدا بەدرێژی لەوە دواوە و یەک بەیەک باسی حوکمدارەکانیان دەکا کە لەو شارانەدابوون بەحوکمڕان و فەرمانڕەوا. ئێمە لێرە بەکورتی لێیان دەدوێین، چونکو لە خاکی ئازربایەگاندا حوکمڕانی و سەرکێشیان کردووە. مەبەستی ئێمەش لەم کتێبەدا لە کورد دوانیش بێ بەموناسەبەت. ئەو خاکە چونکو لە دەست کورددا بووە و ئەوان بەسەریدا زاڵبوون، دەبێ ناوی شار و ئەو حوکمڕانانەی «تاتیک» نەژاد ببەم تاکو سەربهورد کورت نەمێنێت.

١- **مەرەند:** دێیەکی بچووک بوو «حلبس»ی بابی «بعیث» چوو لەوێ دامەزرا و گەورەی کرد و «محمد»ی کوڕی ئەو لە دوایی کۆشک و باڵەخانە و خانووبەرە و قەڵای لێ بینا ناو کردیە شارێکی گەورە و مەحکەم لە ساڵی ٢٣٥هـ دوایی هات.

٢- **تەوریز (تبریز):** ڕوادی کوڕی «مثنی الازدی» لێی دانیشت. لە دوای ئەو «وجناء»ی کوڕی ڕەواد لەگەڵ براکانی خانووبەرە و کۆشک و سەرا و قەڵایان لێ دروست کرد. دەوروپشتی شاریان بەشوورە و بورج توند کرد و کردیانە شارێکی زۆر گەورە. ساڵی ٢٣٥هـ دوایی هات.

٣- **میانە و خەلباسە:** «همدان الطائی» لێی دامەزرا. لە پاش ئەو «عبدالله»ی کوڕی «جعفر الهمدانی» لەسەری دانیشت و کردیانە شار.

٤- **بەرز:** خاکێک و شارێک بوو لەلایەن «الطائی»یەکانەوە بیناکراوە. ئەمڕۆ ئەو جێگایە لە خاکی موکریان دایە. بەمحالی هەوشار یان هەوشاریساین قەڵا دەناسرێ و بەناوی «بەرز»، شارێک لەوێ هەر هەبووە، بەڵام قەڵاییێکی لێ دروست کرا و خەڵکێکی زۆری تێدا هاندرا و بوو بەمەملەکەتێکی زۆر ئاوەدان.

٥- **سەراب:** میللەتی کندە لەوێ جێگیربوون و کردیانە جێگای سەرکێشی و دەستەڵاتی خۆیان.

٦- نریز: دێیەک بوو کۆشکێکی کۆنی کاولبووی لێ بوو، «مور»ی کوڕی «عمر موصلی طائی» چوو لەوێ خانووبەرە و ئاوایی تێدا دامەزراند. لە دوای ئەوە کوڕەکانی زۆر زل و گەورەیان کرد، بازاڕی «جابڕەوان» کە نزیک ئەوێ بوو گرتیان و گەورە و ئاوەدانییان کرد. ساڵی ٢٦١ھ دوایی هات.

خاکی ئازربایەگان لە دەست حوکمڕان و ئەمیر و پادشاکانی خۆجێیی دەرچوو بوو. لەو خاکەدا هەر شارێک، کە وەکو گوترا، پیاوێکی بیانی لەسەر دامەزرا بوو. تەنها لە شاری ورمێ و خۆی و سەلماس و شنۆ و گەلێک لە محالی موکریان و لاجان و ئەو دەوروپشتەدا ئەمیر و پادشایەکی کە مابوو، صدقە کوڕی عەلی کوردی بوو و براکانی لەگەڵیدا بەیێکەتی لەو شاری ورمێیەدا دامەزرابوون - هەروەکو لە هاتوودا بەدرێژی باسی دەکرێ- حوکمڕانیان دەکرد. (فتوح البلدان - پلازەری - لاپەڕە ٣٣٨ - ٩٣٣).

کیسرەوی بەدووردودرێژی کە لە زەمان زاڵی و سەربهوردی پادشایانی ئازربایەگانی ئەو دەورە دواوە دەڵێ: خۆجێییەکان زمانی عەرەبییان نەدەزانی، بەڵام بازرگان و خاوەند موڵک و دێهات زۆر چاک لە عەرەبی تێدەگەیشتن.

ئەستەخری و «ابن حوقل» لە خسووس زمانی ئازربایەگانەوە زۆرباش و ئاشکرا دواون و دەڵێن: خۆجێیی هێندە تێکەڵ بەوان نەدەبوون. لە خاکی موغاندا شلکە ناوێک دەستی بەسەرکێشی کرد، بەڵام نەژادی نەزاندراوە.

«مهلهل تمیمی» عەرەبی بەنی تەمیم لە ئازربایەگاندا دەستی بەشۆڕش و سەرکێشی کرد. خەلیفە «هارون الرشید» «حرش» ناو پیاوێکی کردە والی ئازربایەگان و چووەسەر «مهلهل» لە دوای کوژتار «مهلهل» هەڵات و هێزەکەی بڵاوبۆوە.

ئەوانە لەو ڕۆژەوە کە چوونە خاکی ئازربایەگان هەریەک لەو خاکە کە تێیدا بوون، دەستیان بەسەرکێشی کرد، هەتا دەوری خەلیفە مەئموونداا یەک لە دوای یەکدی گیران و برانە بەغدا و سەرکێشییان لەو خاکە بڕا و ڕوو بەخۆشی دەچوو. کیسرەوی لە (شەهریارانی گومنام) (بەخشی دووەم - چاپی تەهران ١٣٠٨) یەزدیگوردیدا بەدرێژی باسیان دەکا.

# بەندی چوارەمین

## فەرمانڕەوایانی کورد

### ڕاوەندییان، هەزبانییان، ڕەوادییان، ئەحمەدیلیان، فەزلّوونیان

وەکو لەمەپێش باسکرا کوردی ڕاوەند لە سەرەتای ئیسلامی و کێشە و شەڕی موجاهیدانی ئیسلام و یەزدیگورد و کیشوەرگیران و غازی و ئیسلام و هورمزاندا لەگەڵ لەشکری ئەمیراندا بوون و شەڕیان دەکرد و زرنگی و ئازایی خۆیان دەنواند و لە خاکی شنۆ و سابلاخ و بانە و سەقز و ئەو مالانەدا دارای هێز و تەوانایەکی وابوون کە هورمزان لە ساڵی ۱۹ی هیجریدا داوای یارمەتی لەم کوردانەی ڕاوەندە کردووە.

لە سەرەتای «سفاح» و «ابو مسلمی خوراسانی»دا ئەو کوردانەی ڕاوەند لەو خاکانە و لە کیوەکانی سەهەند و لە مەراغەدا بەپڕ هێزی بوونە و بووین و دەسەڵاتی خۆیان نواندوە و ڕۆژ بەڕۆژ لە هەموو سەربهوردێکی هەڵکەوتووی خاکی ئازربایەگاندا شەڕکەری و ئازایی و جەنگاوەری کوردانی ڕاوەندمان دەکەوێتە پێش چاوان؛ بەتایبەتی لە سەرەتای ئیسلامەوە هەتا عەسری پێنجەم و شەشەم و نیوەی قەڕنی حەوتەمی هیجری کوردی ڕاوەند لاپەڕەکانی مێژووی ڕۆژهەلاتی پڕ کردووە.

ئەم کوردانە هێندێک جار بەهەزبانی و هەدیانی و ڕەوادی و بەڕاوەندی باس کراوە، گەلیک جار کوردی ڕاوادیان بەتیرەیەکی هەزبانی هێناوەتەوەوە و نوویسیوە و هێندێک جاریش هەزبانیان کردۆتە تیرەیەکی ڕاوەندی.

«ئەبو موسلیم لە پاسوخیدا بو سەفاح» نەوبەخت لە جلدی سێیەم «شاهنامەی پەهلەوی» لاپەڕەی ۱۳یدا کە لە کوردانی ڕاوەند دواوە دەڵێ:

سیەجامەگان باسرانی رَوَند
همان جنگ جویان کوه سهند
هرآن کس کە دینش بود خرّمی
کز ایران شمارند سراسرزمی

وادیار دەکرێ کە هێزی کوردی ڕەوەند لەو دەمەدا لە سەهەند و مەراغە بووە و لە سەرکێشی خوڕەمی بوون. (ئەبو مسلیّم) بەوان پشت گەرم و دڵنیابووە کە لە پاسوخیدا پێیان نازبوە.

لەو چوار شیعرەی پێشووی دەوری هورمزان کە داوای کوردەکانی شوول و شاهێن و ڕاوەندی کردووە یاریدەی بدەن، کوردی ڕاوەند لە خاکی لاجان و شنۆ و نزیک ورمێ و دەوروپشتی مەراغەدا بوون. لە دوای ئەوە کە موجاهیدانی ئیسلام بەتوندی خاکی ئازربایەگانیان گرت، کوردەکانی ڕاوەند دەستیان بەهیجرەت کرد و هێندێک لەوان چوونە خاکی ئەرمەنستان و ئاران و ئانی، هێندێک چوونە خاکی هەولێر و هیندێک لە خاکی ئازربایەگاندا ماونەوە.

ئەوانەی چوونە خاکی ئەرمەنستان و ئاران و ئانی، لە گەنجە و ئاران حکوومەتێکیان دامەزراندوە بەفەزلّوونیان، یا شەدادیان ناوبانگیان کردووە. ئەحمەد کیسرەوی لە (شەهریارانی گومنام) بەخشی دووەم، لاپەڕە ۲۲دا دەڵێ: خانەدانی محەمەد کوڕی شەداد کە حوکمڕانی ئاران و پادشایی ئەو خاکەی دامەزراندوە و پێنج کەس لەو بنەماڵەیە پادشا بوون، بە«شەدادیان» ناوبانگیان کردووە، کوردن و لە تیرەیەکی ناوداری کوردی ڕەوەدین کە بەرەوەدیان ناودەبرێن.

ڕەوەد ئێل و عەشیرەتێکی کوردبوون لە خاکی شنۆ و ئەو جێگایانەدا دانیشتوون و بەهەزبانیش ناودەبران. ئەمرەوەدیانە تیرەکیشیان بەزلی و فرەیی لە خاکی ئازربایەگاندا مابوون و تیرەیەکی زلیان لە خاکی ئەرمەنستاندا جێگیر ببوون. ئیبنی ئەسیر ئەم تیرە کوردەی بەچاکترین و ئەشرافترینی کوردەکان ئەژماردووە. سوڵتان سەلاحەدینی ئەیووبی لەو تیرەیە بوون.

لەو تیرەی ئاران، لە شاری دوینەوە باپیرە گەورەی سەلاحەدین چووە مووسڵ. نەجمەدین ئەیوبی کوڕی لە تکریت دانیشت و لە پاشان لە میسر و شام بوون بەسوڵتان.

دوقتۆر ئەحمەد بیلی لە کتێبی «حياة صلاح الدين الايوبي» لاپەڕەی ۳۵ کە لە سەربهوردی سوڵتان سەلاحەدین دواوە دەڵێ: ئەو بنەماڵەیە کە میسر و شامی گرت و بەدەوڵەتی ئەیووبی ناوبانگی کرد لە ئەشرافی کوردان، لە قەبیلەیەک بوون کە بەرەوەدی کە تیرەیەکی کوردی هەزبانی بوون: (عائلة كردية ملكت مصر والشام وعرفت بدولة الايوبية أو دولة بني ايوب، وهذه العائلة من أشراف الأكراد من قبيلة منهم تعرف

بالراوادية من بطون الهذبانية أحد قبائل العجم.).

له قەرنی سێیەمدا بەناوی هەدیانی و له قەرنی چوارەمدا بەناوی ڕاوادی له ئازربایەگاندا پادشاییان کردووە و له قەرنی چوارەم و پێنجەمدا له هەولێر بەناوی هەزبانی «ئەمیر مووسەک» حکوومەتێکی دامەزراندوە که پێنج کەس لەوان فەرمانڕەواییان کردووە. له ئازربایەگاندا «ئەحمەدیلیان» پادشاییان کردووە، ئەوانە تییرەیێکی ئەو کوردە ڕاوەندەن که له سەرەتای ئیسلامیدا هەبوون.

جگه لەوانەش لەپاش دەورێکی دووری دەستەڵاتی موجاهیدانی ئیسلام له شاری ورمێ و ئەو دەوروپشتەدا، پادشایەکی کورد هەڵیدا و حکوومەتێکی خۆیی کوردی دامەزراندوە که ناوی سەدەقه بوو و له فەسڵی داهاتوودا باسی دەکەین.

# فەسڵی یەکەم

## سەدەقەی کوڕی عەلی - عەلی کوڕی سەدەقە - زورەیق کوڕی عەلی

### ١- سەدەقەی کوڕی عەلی

وەکو لە پێشدا گوتمان: خاکی ئازربایەگان لە سەرەتای ئیسلامییەوە بەهۆی هاندانی خەلیفەکانی ئیسلام لە هەموولایێکی عەرەبستانەوە بەگەرمی عەرەب چوونە ئەو خاکەوە و تێیدا دانیشتن و لە هەموو شارەکاندا بناغەی فەرمانڕەواییەکیان بۆ خۆیان دامەزراند، بەڵام هەموو دەست نیشان و فەرمانبەری خەلیفە بوون و یەک لە دوای یەک والی لەلایەن خەلیفەوە دەناردرا ئازربایەگان. ئەو فەرمانڕەوایانە هێندێک جار ئەو سەرکێشی و سالووکانەیان دەگرت و هێزەکانیان بڵاودەکردنەوە، هەروەکو بەکورتی لە ڕابردوودا لێی دواین.

بەڵام لە خۆجێیی و کورد لە نێوانی ئەوانەدا کەسێکی لە خاکی ئازربایەگاندا ئاڵای سەربەخۆیی هەڵکرد سەدەقەی کوڕی عەلی کورد بوو، ئەویش بەزەبەردەستی و ئازایی خۆی لە کێوەکانی نێوان مووسڵ و ئازربایەگان چووە خوار. لەگەڵ براکانی خۆی بەسەر شاری ورمێیان دادا و گرتیان. شارانی خۆی و سەلماس و شنۆ و محالی لاجان و سندوز و موکریانی ئەمڕۆکەشیان خستە دەست و شاری ورمێی کردە پایتەخت و بوو بەپادشای ئەم خاکە.

یێکەمین پادشا یا میرێکی خۆجێی کە مێژوونووسەکان لێی دوابن لەو دەورەدا باسیان کردبێ سەدەقەی کوڕی عەلی کورد بووە. لەگەڵ براکانی خۆی لینگیان داوەتە سەر ورمێ و ئەو خاکانە و گرتوویانە. بناغەی پادشاییەکی خۆجێییان تێدا داناوە: (دائرة المعارف الاسلامیة - جلدی یەک - لاپەڕە (٦٧٤): (فتح آرمة صدقة بن علي وقد شید فیها عدة قلاع).

کیسرەوی لە پلازەری وەردەگرێ کە دەڵێ سەدەقە کوڕی عەلی بەدەستە شەڕکەر و پیاوانی جەنگاوەرەوە چووە سەر ورمێ. لە دەوری ابو جەعفەر مەنسوور خەلیفەی عەباسی دابوو. لەگەڵ خۆجێیی و دانیشتوانی ئەوێ شەڕی کرد. ئەو شارە و دەوروپشتی و ناحیەکانی گرت و خستییە ژێر فەرمانی خۆیەوە.

سەدەقە و براکانی لەنێو شاری ورمێ قەسر و کۆشک و باڵەخانە و بینای زۆر زل زلیان

لێ دروست کرد و خانووبەرەی بەرز و جوان و بەدابیان تێدا دانا. دەورەی شاریان بەشوورە و بورج و باروو گرت. دەورەی دیواریان کردە خەندەق و پڕیان کرد لە ئاو. لە هەموولاییێکەوە خەڵکیان بردە ئەو شارە و دایاننان و شاریان گەورە کرد و ڕێکیان خست. لەشکر و سوپا و چەک و پێویستی شەڕیان تێخزاند. بەکەم دەمێک ورمێ بوو بەپایتەختێکی گەورە و ئاوەدان و بەناوبانگ، زۆر قەشەنگ و زۆر جوان و بەخانووبەرە و کۆشک ڕازاندراوە.

سەدەقە ڕۆژ بەڕۆژ زلبوو و شار و دێهاتی دەوروپشتی ورمێی خستە دەست ڕۆژاوا و جنووب و شیمالی گۆمی ورمێ بەدرێژییەوە هێنایە ژێر فەرمانەوە. لە دەوری خەلافەتی «هارون الرشید»دا شارانی خۆی و مەراغە و سەلماس و شنۆی بووە. لە سەرشان و هێز و تەوانایی پتربوو، ڕووی دەستەلاتی و ناو و نەبەردی و هێزی بەسەر هەموو ئومەراکانی ئازربایەگاندا سەرکەوت. بەچەک و لەشکر و تیپ بوو بەپادشاییێکی ئازاد و سەربەخۆ، کەسێکی هاونەبەردی نەبوو. پێویستی پادشاهی هەمووی بۆ ڕێکەوتبوو، دەستی هاوێژتە خاکی دەوروپشتی تخووبی مەملەکەتی. کێوەکانی نێوانی ئازربایەگان و مووسڵی خستە ژێر فەرمانییەوە، مووسڵی وەبەر هەڕەشەدا. «وجناء ازدی» خاوەنی تەورێز لەگەڵیدا پەیمانی دۆستی و ئاشنایی بەست و سوێندی بۆ خوارد.

ئەو زلبوون و سەرکەوتنەی سەدەقە بۆ خەلیفە کۆسپەییێکی گەورە و جێگای لێ وردبوونەوە و ئەندێشە بوو، خەلیفە کەوتە ترس و والیگەری ئازربایەگان و ئەرمەنستانیدا بەخوزەیمە کوڕی خازم کوڕی خەزیمە. لەشکر و پێویستی شەڕی دایە و ناردی. لە هەموو خاکی ئازربایەگاندا جگە لە مەراغە جێگایەکی دەست نەکەوت بتوانی تێدا لەشکربەز بکا و تێیدا دانیشێ و ڕووبەڕووی سەدەقە بتوانێ ببزوێتەوە. خوزەیمە بەهەر جۆرێک بوو لەشکرەکەی گەیاندە مەراغە و بەلەز دەورەی شاری کردە شوورە و بورج و باروو، قەڵایەکی سەخت و توندی لێ دروستکرد و تێیدا دانیشت و دەستی بەقەڵابەندی و خۆپارازتن کرد. دەورەی شوورەی شاری کردە خەندەق و پڕی کرد لە ئاو.

ئەم سەربهوردەی خوزەیمە وامان تێدەگەێنێت کە سەدەقە لە خاکی ئازربایەگاندا پادشایەکی نەبەرد و ئازادبووە، لەو خاکەدا جگە لەو، چ پادشایەکی خۆجێیی دیکە نەبووە.

بەقسەی کیسرەوی گۆیا سەدەقە کوردی کێوەکانی لای مووسڵ بووە، چۆتە سەر ورمێ و

پادشاهی تێدا دامەزراندوە. لەوە کە والی خەلیفە بەتالووکە لە مەراغە قەڵای کردەوە و تێیدا دانیشتووە بۆمان ئاشکرا دەبێ کە سەدەقە گەلێک بەهێز و تەوانا بووە، والی نەیتوانیوە بچێتە سەری و نەشیویراوە لە جێگاییێکی بێ شوورە و قەڵا لەشکربەز بکا و تەوانای نەبرد و شەڕی سەدەقەی نەبووە. ئەوە والی ناچار کرد بخزێتە نێو مەراغەوە و دەرگا لەسەرخۆی بگرێ، تاکو سەدەقەکە چووەسەری پێی نەوێرێ.

بەڵام وا دیار دەکەوێ فەرمانڕەواکانی بیانی کە هەریەک لە شارێکی ئازربایەگان دانیشتبوون، دەبێ بەنەیاری سەدەقە یارمەتی والییان دابێ کەوا توانیویە بگاتە مەراغە و دیوار و شوورەی شار و قەڵا دروست بکا.

کوردەکانی ڕاوەند و سوڵدز و هەزبانی بەچاکی یاریدەی سەدەقەیان داوە و بۆ بەرزبوونی کۆشاون و لە ڕێی ئەودا شەڕیان کردووە و بەفەرمانڕەوایی خۆیان ناسیووە. جگە لە وەندە چ سەربهوردەکانی دیکەی سەدەقە لە دەستدا نییە و لەوە پتر چ دەنگی نەزاندراوە.

## ٢- عەلی کوڕی سەدەقە

سەدەقە کەی مردووە و چۆن بووە، لەوەی کە گوترا پتر دەست نەکەوتووە. هەرواش نەزاندراوە عەلی کوڕی ئەو سەدەقەیە کەی بۆتە پادشا. بەڵام هێندێک لە دەستدایە کە عەلی لە دوای سەدەقەی بابی بۆتە پادشای ئەو خاکانە و دەوری ئەم پادشایە لە لاپەڕەکانی مێژووا بەبێ دەنگی بەسەرچووە. دێریک و مێژوونویسەکان لە سەربهورد و ئیشێکی ئەم پادشایە نەدواون و لە کتێبەکاندا ناونەبراوە.

## ٣- سەدەقە کوڕی عەلی کە بەزوریق ناسراوە

سەدەقەی دووەم کە کوڕی ئەو عەلییە مێژوونویسەکان بەزوریق ناویان بردووە، پیاوێکی ئازا و پادشایەکی زرنگ و بەهێز و تەوانا و بەناوبانگ بوو، بەسەر هەمووخاکی بابی و باپیریدا فەرمانڕەوایی کرد و هەموو شار و ئاواییەکانی کێوی نێوانی ئازربایەگان و مووسڵی گرت و بەمدیوە و دیوی ڕاست و چەپی ئەو کێوەدا زاڵ بوو. بەپێی و شوێنی بابی هەڕەشەی لە مووسڵ کرد و ئەمیرەکانی دراوسێی داچڵەکاندن. زۆر توند و لێهاتوو و ڕەشید و ئازابوو، هەموو ئومەراکانی دەوروپشت ئەندێشەیان لێ دەکرد و هەمووی تەنگەتاو کردبوون.

زوریق زۆر گەورە و پایەبەرز و جێگا بڵند و بەهێزبوو. خەلیفە مەئموون والی و گەورەی ئەرمەنستان و هەموو ئازربایەگانی پێبەخشی و هانی دا بچێتەسەر بابەکی خوڕەمی.

زوریق لەشکرێکی جەنگی پێکەوەنا لە ژێر سەرداری سەرکردەیێکی بەناوبانگی خۆیدا کە ناوی ئەحمەدی کوڕی جونەید بوو ناردیە سەر بابەک. لە دوای شەڕ و کوژتارێکی قورس و خوێنڕێژێکی بێ ژمار، ئەحمەد لە دەست خوڕەمییەکاندا کوژرا و گەلێک لە سوپاکەی لەنێو چوون.

سالّی ۲۱۱ھ زورەیق لەشکرێکی هەلّگرت و چووە سەر مووسلّ کە بیگرێ، چونکو لەوەپێشی باپیریشی ئەو ئارەزووەی هەبوو بەلاّم بۆی نەهات. زوریق بۆ بەجێهێنانی ئەو ئارەزووە لینگی دا سەر مووسلّ «سید کوڕی انسی ازدی» حوکمڕانی مووسلّ بوو؛ بەرامبەری لەشکری بردە پێش. چەندجار لە نێوانیاندا شەڕکرا و خوێنڕێژرا. زوریق نەیتوانی بگاتە مووسلّ. ئەمجارە چل هەزار پیاوانی جەنگی و ئازای هەلّگرت و چووە سەر سەید، لە دوامینی شەڕ و کوژتاردا سەید بەدیل کەوتە دەست سوپاهی زوریق و لە دەستیاندا کوژرا. هێزی سەید پووچکراوە، دارا و هەبوونی بەتالاّن گیرا و چووە مووسلّ و بەسەریدا زالّ بوو.

خەلیفە مەئموون کە لەو سەربهوردە ئاگادار بوو، بەدلّ لە زوریق دلّگیر و گەلێک ڕەنجیدە بوو؛ ڕقی هەلّستا. والیگەری ئەرمەنستان و ئازربایەگانی دا بە محەمەد کوڕی حەمیدی تووسی. لەشکر و سوپا و پێویستییەکی قورسی پێدا و ناردی کە لە مووسلّەوە بچێتە سەر ئازربایەگان و سەری زورەیق پانکاتەوە و لە نێوانی لابەرێ، ئەوجا بچێتە سەر ئیشی خۆی.

محەمەد کوڕی حەمید بەو هێزەی لە دەستی دابوو چووە مووسلّ. زوریق چوو پێشی پێ گرت. هەردوو لا بەرامبەر یەکدی ڕاوەستان، لە دوای شەڕ و کوژتار و خوێنڕێژی و چەندجار بەگژ یەکدا چوون، زوریق شکا و لە دوامیندا بەدیل گیرا و لە سالّی ۲۱۲ھ دا زوریق بەدیل کەوتە دەست و محەمەد ناردیە بەغدا.

جگە لەوە سەربهوردی ئەو بنەمالّە پادشایەی کوردەمان چی دیکە دەست نەکەوت، نازانین زورەیق چی لێ هات و مالّ و کەسوکاری لە ورمێ چیان بەسەرهاتووە و چۆن دوایی بەو حکوومەتە کوردە دراوە و ورمێ کەوتە دەست کێوە؟ بەلاّم محەمەد کە چووە ئازربایەگان هەموو سەرکێشەکانی لەو خاکەدا بوون گرتنی و ناردنیە بەغدا. یەک لەوانە «علی کوڕی مر الطائی» خاوەندی نریز و دووەم «محمد کوڕی ڕواد الازدی» خاوەندی تەورێز و گەلێک لەم سالووکانەی دیکە گیران و محەمەد کوڕی حەمید ناردنیە بەغدا.

## فەسڵی دووەم

### هەدیانییان - هەزبانییان

### دەیسەمی کوڕی ئیبراهیم

لە دوای ئەوە حکوومەتی سەدەقە لە خاکی ئازربایەگان پچڕاوە، بەکەم دەمێک لەو خاکەدا حکوومەتی خۆجێیی کورد دامەزراوەتەوە، بەڵام لەنێوانی تێکچوونی حکوومەتی زوریق و دامەزراندنی حکوومەتی دەیسەمدا -کە نزیک سەد ساڵێکە- گەلێک چتی گەورە لە خاکی ئازربایەگاندا ڕوویداوە، شەڕوشۆڕ و پشێوی و کێشە و هەڵمەت و خوێنڕێژییەکی بێ ژمار بووە، ئەوەی بەنەیار ڕەوا بووبێ بەسەر کوردی ئەو خاکەدا هاتووە و لە کوردانی ڕاوەند (ڕەوەد) گەلێکیان بۆ خاکانی هەولێر و ئاران و ئانی و ئەرمەنستان هیجرەتیان کردووە.

ئەو کوردانە کە لە دەوری سەرەتای ئیسلامییەوە هەتا قەڕنی دووەمی هیجری لەگەڵ موجاهیدانی ئیسلام لە کێشە و شۆڕشدا بوون، وەکو دارێکی پیری گەندەڵی لێ هاتبوو، لکوپۆپ و شاقولانی بڕابوو. لەناکاو لەبنەوە ڕیشەی هاوێژتوو لە هەموو لایێکەوە خەڵف و جوزکەی هەڵدا کە لە خاکی ئاران و هەولێر لکوپۆپی بەرزکرد و لە شام و سووریا و میسر ڕیشەی داکوتاوە، لەسەر مینبەران خوتبەیان بەناو دەخوێندراوە و میللەتێکی زل لە ژێر سێبەریاندا ئاسوودە ژیان.

ئەو کوردانەی ڕاوەند وەکو لە پێشدا لێی دواین لە سەرەتای ئیسلامی یەکە نەبەرد و نەیارانی ئیسلام بوون؛ بەڵام لەپاشان بوون بەیەکە موجاهید و گیان فیدا لە ڕێگای ئیسلامیەتدا. لە مەیدانی گیانبازی و غەزادا بۆ دینی ئیسلام ئەوەی سینگی خۆی دەکردە مەتاڵ و سوپەر لە پێش فەڕەنگدا ڕادەوەستا. ئەو کوردانەی ڕاوەندبوون کە لەشکر و سوپای نەیاری ئیسلامیان دەشکاند و خۆیان دەنواند و لەسەر مینبەرانی میسر و شام و یەمەن و حیجاز و ئەرمەنستان و ئاران و ئازربایەگان خوتبەیان بەناو دەخوێندرایەوە و میللەتی ئیسلام لەو خاکانەدا دوعای فەتح و زەفەر و نەسرەتدانیان بۆ دەکردن.

ئەویش لە ڕووی زرنگی و وشیاری و ئازایی ئەو میللەتەی کوردەوە بوو کە لە دوای دەست لە نیشتمانی خۆبەردانیان، لە خاکی بیانیدا ڕیشەی حکوومەتی خۆیان داکوتایەوە و بەکەم ئەشخاسێک بەسەر شار و مەملەکەتاندا زاڵبوون. هەروەکو هێندێکیان لە هاتوودا

باس دەکەین کە فەزلوونیان و ڕاوەندیان و هەزبانیان و ئەحمەدیلیان و ئەیووبیان بن کە هەریەک لەسەر خاکێک دامەزران و بوون بەپادشا و سوڵتان و فەرمانڕەوا. ئەوەی لەوان پێشدەستی کرد و هاتە مەیدانەوە و بەسەر خاکی ئازربایەگاندا زاڵبوو و پاشایەتی کرد، دەیسەمی کوڕی ئیبراهیمی کوردی هەدیانی (هەزبانی) بوو، کە ئێمە لەم فەسڵەدا لێدوانی مەبەستمانە.

## لە پێش دەیسەمدا

## ئازربایەگان

بەڵام لە پێش دەیسەمدا لە خاکی ئازربایەگاندا گەلێک کەس سەرکێشیان دەکرد و فەرمانڕەوای ئەو خاکە بوون؛ لەوانە محەممەد ئەفشینی کوڕی دیوداد و یووسفی برای -کە بەکوڕانی «ئەبو ساج» ناو دەبرێن- چوونە سەر خاکی ئازربایەگان. عەبدوڵلای کوڕی حوسێنی هەمەدانی یەمەنی لەو خاکەدا یێکە سەرکێش و سالووک بوو و پشێوی و شۆڕشی خستبووە ئازربایەگانەوە. کە چووینی محەممەدی زانی، چووە پێشی و بەگژیدا چوو. لە پاشان محەممەد، عەبدوڵلای لە شەڕدا گرت و کوژتی. خاکی ئازربایەگان و ئەرمەنستان و ئارانیان گرت و لەسەری بوون بەپادشا و جاڕی ئازادی خۆیان کێشا. لە دوای ئەوە دیودادی کوڕی بوو بەپادشا. لە دوای دیوداد، یووسفی کوڕی ئەبو ساج کە نەبەرد و ئازاترینی پادشایانی دەوری خۆی بوو.

گوتمان کە یووسف بەدەستەڵات و نەبەردترینی پادشایانی ئازربایەگان و ئەو جێگایانە بوو. لە دوای ئەوە کە بوو بەپادشا و ئاڵای سەربەخۆیی و ئازادی هەڵدا، سەری لە فەرمانی خەلیفەی بەغدا وەرگێڕا. ساڵی ٣٠٧ﻫ لە لایەن خەلیفەوە مؤنس مظفر ناردرا سەری و لە شەڕدا یووسف گیرا. گەلێک لە بەندی بەغدا بەگیراوی ماوە و لە زینداندا بوو. لە ساڵی ٣١٠ﻫ لە لایەن خەلیفەوە بەردرا و گەڕاوە سەر خاکی خۆی. پادشایەتی ئازربایەگان و ئەرمەنستان و ئارانی هەبوو، خاکی «ڕەی» و «قەزوین» و «ئەبهەر» و «زەنگان»یشی پێدرا. چوار ساڵ لەسەر ئەو خاکە پانوبەرین و گەورە پادشاهی کرد. ساڵی ٣١٤ﻫ خەلیفە بۆ بەغدای خوازت کە دوژمنی گەورە و بەسام و بەهێزی خەلیفە، میللەتی «قەرمەتی»یان بوون؛ بیانشکێنن. یووسف بەشانوشەوکەت و لەشکرێکی بێ ژمار و چەک و پێویستییێکی بێ پایان، بۆ لابردنی قەرمەتیان چووە بەغدا. لە شەڕدا یووسف کەوتە

دەست ئەبو تاهیری قەرمەتی و کوژتی.

«ابن الاثیر» و «ابن الحوقل» و کیسرەوی بەخشی یەکەم ئینسقلۆپیدیای ئیسلامی و هی دیکەش بەدرێژی لە دەیسەم دواون و ئێمە لە کتێبێکی بەتایبەتی چاپکراوماندا باسمان کردووە.

دەیسەم کوڕی ئیبراهیمی کورد لە لەشکری یووسف ئەبی ساجدا سەرکردەیەک بوو. ساڵی ۳۰۷هـ کە خەلیفە گرتی و بردیە بەغدا، دەیسەم لەسەر ئەو خاکە دانیشت و لە ساڵی ۳۱٤هـ دا یووسف کە چووە بەغدا، دەیسەم جێنشین و وەکیلی بوو لەسەر ئەو خاکانە بەوەکالەت فەرمانڕەوایی کرد؛ هەروەکو لە هاتوودا لێی دواوین.

ئیبراهیم بابی دەیسەم، کورد و لە قەبیلەی هەدیانی(هەزبانی) لە نێوانی شنۆ و سەقزدا بوون. لەبەر هێندێک شپرزەیی نێوانی کوردان لە دەست سەرکێشەکانی خاکی ئازربایەگان، ئیبراهیم ناچار دەستی لە نیشتمانی بەردا و چوو بووە لای «هارون البجیلی خارجی» کە بەسەر هێندێک خاکی لای مووسڵ و هەولێردا زاڵ ببوو. (تەماشای کتێبی ئێمە - مێژووی دەوری ئەمارەت - چاپکراوە ساڵی ۱۹۲۷ - نەشری «٦»ی زاری کرمانجی بکرێ).

ساڵی ۲۸۳هـ هاڕوون کە بەدەست «معتضد» خەلیفەی عەباسی بەدیل چوو، ئیبراهیمی کوردی بابی دەیسەم لەو مەیدانەی خوێناوییە ڕزگار بوو؛ هەڵات و چووە نیشتمانەکەی خۆی؛ کچی ئەمیری کوردەکانی شا دلووبەی مارە کرد. «ابن مسکویە» دەنووسێ کە: «ئیبراهیمی بابی دەیسەم یەکێک بوو لە خاریجیان لەگەڵ هاڕوون خاریجی بەناوبانگ بوو. لە دوای ئەوە کە هاروون کوژرا ئیبراهیم هەڵات چووە ئازربایەگان، کچی یەکێک لە گەورەکانی کوردی بەژنی هێنا و دەیسەم لەو ژنە بووە.» کە گەورە بوو، گەیشتە لای کوڕی ئەبی ساج و بوو بەیەکێک لە سەرکردە ناودارەکانی کوڕی ئەبی ساج.

کیسرەوی بەخشی یێکەم - لە لاپەڕە ٥٨ دا دەڵێ: وەختی ڕۆیینی یووسف لە ئازربایەگان هێشتا ئەو خاکە بەو ئەسپاردرابوو، دەیسەمی کردە جێنشینی خۆی یا تەنها فەرمانڕەوای ئازربایەگانی دابوو بەدەیسەم.

بەو جۆرە دەیسەم لە لەشکری ئەبوساجدا سەردار سوپا بوو. بەپێی گفتوگۆی مێژوو و دێریک نووسەکان و بەگوتەی کیسرەوی دەبێ لە تەئریخی ۳۰۷هـ وە دەیسەم لە لای کوڕی ئەبی ساج سەردار و گەورە بووبێ کەوا سەرکەوتووە.

بەڵام کوردەکانی ئازربایەگان چونکو لە پشێوی و شۆڕش و ئیستبدادی سەرکێشەکان ماندوو و بێزار ببوون و چاویان لە ئازادی و سەربەخۆیی بوو، باری نەیاریان لەسەر شان گرانبوو؛ هەرکە دەیسەم کەوتە ڕوو. کوردەکانی ئازربایەگان بەجارێک ڕوویان تێ کرد و لە دەورەی کۆبوونەوە، بۆیە وا زوو بلند بوو و پێگەیشت و کوڕی ئەبی ساج باوەڕی پێ هێنابوو، لەسەر خاکی خۆی کردبوویە وەکیل و سەردار سوپا. کە کوڕی ئەبی ساج یووسف کوژرا، بەجارێک ئاڵای ئیستیقلالی خۆی هەڵدا و بوو بەپادشایەکی بەشان و شەڕەف و نەبەرد و بەناوبانگی ئازربایەگان و ئاران و ئەرمەنستان.

کیسرەوی دەڵێ: چونکە لەودەمەدا کوردان خزم و خۆیشی دەیسەم بوون و لە ئازەربایەگاندا زۆر و پڕ (ئەنبوەوفراوان) بوون و بەپشتیوانی ئەو کوردانەوە دەیسەم زۆرچاک دەیتوانی بەپیرۆزی و خۆشی پادشایی و حوکمڕانی بکا و سەربەرز و ئازادبێ. بێژراو چونکە وەکو بابی کێشەی خاریجی هەبوو و باوەڕی بەخەلافەت و خەلیفە نەبوو، کوردەکانیش هەموو پشتیوانییان کرد، بەبێ ئەندێشە ئاڵای ئیستیقلالی هەڵکرد و خەلیفەی نەناسی و دەستی بەمەملەکەتداری و لەشکر بەخێوکردن و میللەت نەوازی کرد.

سەربهوردی دەیسەم و پادشایەتی لەسەر ئەو خاک و زەویە پان و درێژ و زلە بەخۆشی ڕابوارد؛ تاکو ساڵی ٣٢٦ھ لە هیچ کتێب و ئاسارێکدا دەنگێک لە دەیسەمەوە نییە. وا دیار دەکا بەبێ کێشە ئەو چەند ساڵەی بەپادشاهی ڕابواردبوو، بۆیە مێژوو و دێریک نوویسەکان لێی نەدواون. لەو ساڵەی گوترا «ابن الاثیر وابن مسکویه» لە شەڕ و کێشەکانی دەیسەم لەگەڵ لەشکری گیلی دواون.

## شەڕەکانی دەیسەم

## لەگەڵ لەشکری گێلی

«تجارب الامم» ساڵی ٣٢١ھ دەڵێ: لەشگری کوڕی پیاوێکی گێلی لە تیبیرەی گێل، لە پێشدا لە سەرکردەکانی سوپاهی ماکان بوو؛ لە دوایی چووە لای مەرداویچ، لە دوای کوژرانی مەرداویچ لە لایەن وشمگیر برای مەرداویچ کە حوکمڕانی خاکی هەمەدان بوو، لەوێ ماڵ و پێویست و لەشکرێکی باشی کۆکردەوە. ساڵی ٣٢٦ھ تەمای گرتنی ئازربایەگانی کرد کە ئەو خاکە لە دەیسەم بگرێت؛ چونکە وشمگیر دوژمنی دەیسەم بوو یارمەتی لەشگری دا.

ئەو لەشکرە لە عەشیرەتی گێلی کوردی «گێلۆیە»ی ئەمڕۆکە بوو کە لە دەوری سەرەتای ئیسلام و تا ئەمڕۆکەش بەو ناوە عەشیرەتێکی زلی کورد هەن لە کێوی گێلۆیە.

دەیسەم لەولاوە لەشکرێکی قورسی لە کوردان گرد کردەوە و بۆ پێش پێ گرتنی ئەو تالووکەی کرد. لە نێوانی دوو مانگدا دوو جاران شەڕ و کوژتاریان کەوتە نێوان؛ لە هەردوو شەڕدا دەیسەم تەنگەتاو کرا و شکاندرا. لە هەموو خاکی ئازربایەگاندا تەنها ئەردەویلْ نەبێ لە دەست دەیسەمدا نەما، لەشگری بەسەر هەموو خاکی ئازربایەگاندا زالْ بوو.

ئەودەمە پایتەخت و گەورەترین شارانی ئازربایەگان ئەردەوێلْ بوو. دوو بارووی سەخت و توندی هەبوو. خەلْکی ئەو شارەش هەموو ئازا و شەڕکەر و کورد بوون. کیسرەوی دەلْێ: بەدلێری و جەنگی و درشت خویی و هەنگامە جویێ ناوبانگیان کردبوو. لەشگری دەیەویست بەبێ خوێنرێژی و کوژتار بیگرێ. قاقەزێکی بۆ خەلْکی شار نوویسی و دلْخۆشی دانەوە و پەیمان وەعدەی چاکی پێدان و لەبەریان پاڕاوە، بەلاّم موعامەلەی گێلییەکان لەگەلْ خەلْکی هەمەدان و بەدڕەفتاری ئەوانیان بیستبوو، بەقسە و پەیمان تەفرە و فریویان نەخوارد. پێی خۆگرتن و بەرامبەریان چەقاند و ڕاوەستان.

لەشگری دەورەی شاری گرت. ئەردەوێلْییان دەستیان بەبەرامبەری و شەڕ و کوژتار کرد؛ پالْەوانی و ئازاییان نیشاندا. ئیش درێژەی کێشا و میللەت تەنگەتاو بوو، پیاوانی ناردە لای دەیسەم یارمەتییان لێ خوازت. دەیسەم دەستە لەشکرێکی کوردی کۆکردنەوە و بەپەنهانی چووە نزیک ئەردەوێلْ. ڕۆژێکی بەتایبەتی دانا کە ئەو لە پشتەوە و ئەردەوێلْییان لە پێشەوە بەسەر لەشگری دابدەن. لە ڕۆژی ژواندا دە هەزار کەس ئەردەوێلْیان هەموو بەزوبێن و مەتالْ و سوپەر لە شار دەرکەوتن و دەستیان بەشەڕ و کوژتار کرد، لەولاشەوە دەیسەم بەدەستە لەشکری خۆیەوە لە پشتەوە لەناکاو لینگیاندا سەر لەشگریان. دەستیان بەقیژە و هاوار کرد.

سوپاهی لەشگری سەریان لێ شێوا. نەیانتوانی خۆبگرن، پشتیان لە دوژمن و ڕوویان لە هەلاّتن کرد، گەلێک پیاوانی لەشگری لە مەیداندا کوژران، بنەوبار و چەک و گرانەباریان هەموو بەجێهێشت و ڕوو بەخاکی موغان هەلاّتن.

موغان پارچەیەک بوو لە خاکی ئازربایەگان؛ لە سەرەتای ئیسلامییەوە ئازادی خۆیان لە دەست نەدابوو. حوکمڕانی موغان بە«ئەسپەهبەد» ناو دەبرا. لەودەمەدا کە لەشگری پەنای

بۆ برد، ئەسپەهبودی موغان بەکوڕی «دەلوولە» ناو دەبرا، چووە پێشوازی لەشگری و بەنوازش خۆی و سەرکردەکانی میوانداری کرد و بردنیە ماڵی خۆی و زۆری ئیحترام گرتن.

لەشگری سەرکردەکانی لە میوانداری ئەسپەهبود دانا و بۆ خۆشی بەپەنهانی ڕوو بەخاکی گەیلان ڕۆیشت. لە دوای چەند ڕۆژێک گەڕاوە، لەشگرستان کوڕی خۆی و برازای خۆی، بەهەزار پیاوی شەڕکەر و ئازاوە و بەچەک و پێویستییەکی تەواوەی لەگەڵ خۆیدا هێنان و لە ئەسپەهبودیش لەشکر و پیاوانی وەرگرت و جاری دووەم بۆ شەڕی دەیسەم هەڵمەتی بردەوە سەر ئازربایەگان.

لەولاوە دەیسەم پێشوازی کرد و بەگژ یەکدا چوون. دەیسەم تەنگەتاو بوو و شکا، چوو لە چۆمی پەڕیەوە و ڕێگا سەختەکانی لە لەشگری گرت و کەنار چۆمی کردە لەشکربەز.

ڕۆژێک لەشگرستان کوڕی لەشگری و برازای و چەند پیاوانی ئازای گێلیی، لە سێ فرسەنگ دووری لەشکربەز لە چۆمی ئاراس بوارێکی تەنگیان دۆزیەوە، کە ئاو لەسەرەخۆ دەچوو. لە لەشگری ئیزنیان دەخوازت کە بپەڕنەوە ئەوبەر و بەگژ دەیسەم دابچن. شەوێ لەناکاو هەستان و چوون و دەستەیەکی کەڕەنا و شەیپووریان لەگەڵ خۆیاندا برد، چەند کەسێک بەمەلە پەڕینەوە و بەگوریس وەکو پرد لەسەر ئاو گرێیاندا کە لەشکرەکە دەستی پێ بگرن و پێی بپەڕنەوە، بەوجۆرە هەموو لە ئاو پەڕینەوە. لەپڕێکدا لینگیان دا سەر لەشکرگاهی دەیسەم بوق و کەڕەنایان لێدا و هاوار و هەرایان دەستپێکرد و چەند کەسێکیان لە کەنار لەشکربەزی دەیسەم کوژت، لەشکری کورد سەریان لێ شێوا و لەناکاو هەر کەس لە جێی خۆیان بڵندبوون و بەتاریکی شەو نەشیان دەست بکەنەوە، بار و بارگە و بنەیان بەجێهێشت و ڕێگای هەڵاتنیان گرتە پێش. دەیسەم بەناچاری هەڵات، ڕوو بە«ڕەی»چوو کە وشمگیر کوڕی زیار یارمەتی بدات.

لەشگری لە دوای ئەوە کە دەیسەم شکا خاکی ئازربایەگانی یەک بەیەک گرت و لەسەری دانیشت و دەستی بەسەرکێشی کرد. بەڵام لە نوویسینی «ابن مسکویە» وا دەردەکەوێ لەشگری بەسەر ئەردەوێڵدا زاڵ نەبووە، چونکە شارێکی سەخت و میللەتەکەی جەنگی و ئازا بوو و بەجارێک دوژمنی لەشگری بوون.

دەیسەم کە گەیشتە ڕەی، سەربهوردی لەشگری و یارمەتی کوڕی دەلوولە ئەسپەهبدی موغانی بۆ گیراوە و داوای کۆمەگی لێ کرد کە جارێکی دیکە بگەڕێتەوە سەر حکوومەتی ئازربایەگان.

وشمگیر له هەڵمەتبردنی لەشگری بۆ سەر ئازربایەگان و زاڵیی بەسەر ئەو خاکەدا، گەلێک دڵگیر و توند بوو. پایەداری و دەستەڵاتی لەشگری لەو خاکەدا بەزیانێکی قورسی خۆی دەزانی؛ لەبەرئەوە خواهشتی دەیسەمی ڕەوادی و بۆ یارمەتیدان دڵنیای کرد. لەگەڵ یەکدیدا پەیمانیان گرێدا و لەشکرێکی پێدا و خەرجی و مەسرەفی لەو ڕۆژەی گەیشتە «خونج»، کە شارێک بوو لەنێوان مەملەکەتی ڕەی و ئازربایەگاندا بوو، لەسەر دەیسەم بێ. کە دەیسەم ئازربایەگانی گرت خوتبەی لەسەر مینبەرەکان بەناوی وشمگیر بخوێنێتەوە و ساڵی سەد هەزار زێر بەباج بداتە گەنجینەی وشمگیر و لە دوای دەرکردنی لەشگری، سوپاکەی بۆ ببردرێتەوە ڕەی.

دەیسەم ئەوانەی پەسند نەکرد و لەشکر و سوپای هەڵگرت و ڕووبە ئازربایەگان کەوتەڕێ و تالووکەی لە گەڕانەوە کرد کە زوو بگاتە سەر لەشگری و لە خاکی ئازربایەگان دەری پەڕێنێ.

لەشکری لەوە ئاگادار ببوو کە دەیسەم پەنای بردۆتە بەر وشمگیر، لەوە کەوتبووە ئەندێشە و ترسەوە. پیلسواری کوڕی مالیک کەنگری برازای محەمەدی کوڕی موسافیر «سالاری» کە یەکێک بوو لە سەرکردەکانی لەشگری و زۆر خۆشەویست و نزیکی بوو و باوەڕی پێ کردبوو، ناردیە سنووران (میانە) کە پاسەوانی ڕێگا بکا و ئاگاداری هاتووچووان بێ.

پیلسوار ناردراوێک بۆ «ڕەی» دەچوو، خستیە دەست. تەماشای کرد قاقەزێکی هێندێک سەرکردەی لەشگری بۆ وشمگیریان نوویسی بوو، لەوێدا خواهشتی لێبووردنیان کرد بوو و چاوەنۆڕی جواب بوون، کە لەشگری بەجێ بێڵین و بچنە ژێر ئالای وشمگیرەوە. پیلسوار ئەو قاقەزەی بۆ لەشگری نارد.

لەشکری کە لە قاقەزی سەرکردەکانی ئاگاداربوو، زۆر ترسا و کەوتە ئەندێشەوە. بەلام ئەو ڕازەی بەپەنهان کرد و دەری نەخست، کە وەلامی دەرکەوتنی دەیسەم سەری پێی درا کە ئەوا لەشکری وشمگیری پێیە و هەڵمەت دەباتە سەر ئازربایەگان. لەشگری هەموو سەرکردەکانی خۆی هەڵگرت و لە بیابانێکدا وەخڕبوون. سەربهوردی پێ ڕاگەیاندن و کردیانە ڕاووتەدبیر. لە دوای گفتوگۆ و قسەیەکی زۆر، هەمووی ڕازی کردن کە دەست لە ئازربایەگان بەردەن و بچنەسەر ئەرمەنستان؛ چونکە خاوەندێکی نەبەردی نییە تالانی بکەن و ماڵ و سامان و چەک و پێویستیەکی قورس دەستخەن و لەوە پاش بچنە مووسڵ

و لەوێوە بەتاڵان و ماڵ دەستخستن بچنە خاکی دیاری «ڕەبیعە»، دیاربەکر.

دەیسەم کە گەیشتە پێش، کەوتە سەر لەشگری و ڕفاندی. تاڵان و ماڵێکی زۆری لێ گرت. لەشگری جگە لە خاکی زۆزان و هەکاری، ڕێگایەکی دەستنەکەوت، لەوێوە ڕوو بەمووسڵ هەڵات. لە ڕێگایەدا ئادوم کوڕی گورگێن چووە پێشی و بەفێڵ لەشگری گرت و کوژتی.

«ابن مسکویە» بەدرێژی ئەو سەربهورد و شەڕ و هەڵاتن و گرفتاریی لەشگری نووسیوە. بەڵام «ابن الأثیر» دەڵێت گەورە و سەرهاتێکی ئەرمەنی کە ناوی «نیسان» بوو، چوو لەشگری گرت و کوژتی. نزیکەی پێنج هەزار کەس کە لەگەڵیدا بوون هەموو کوژران. تەنها لەشکرستان کوڕی لەشگری و چەند کەسێکی ڕزگاربوون و چوونە مووسڵ و پەنایان بۆ «ناصر الدولە»ی حەمدانی برد.

دەستەیێک لەوانە کە نزیک پێنج سەد کەس بوون لەگەڵ پیلسوار چوونە بەغدا، لەلای «پچکەم» کە «امیر الامرا»ی بەغدابوو دامەزران. موددەتێک لەوێ ماوە. ساڵی٣٢٩ھ پچکەم کوژرا، ویستیان پیلسوار لە جێی ئەو دانێن، تورکەکان نەیانهێشت و پیلسواریان کوژت.

بەڵام لەشگرستان و دەستە لەشکرێکی کە لەگەڵیدا مابوو، «ناصر الدولە» لەشکر و سوپای بۆ کۆکردەوە و لەژێر فەرمانڕەوایی حوسەینی ئامۆزای خۆیدا بۆ یارمەتی ناردیە سەر ئازربایەگان.

«ابن مسکویە» دەنووسێ کە: بەهێزێکەوە حوسەین و لەشگرستانی جاری دووەم ناردەوە ئازربایەگان کە دەیسەم دەرکەن. «ابن الاثیر» ئەو سەربهوردە بەدوورودرێژی دەنووسی و دەڵێ: لەشکری «ناصر الدولە» بەپەرێشانی هەڵات و گەڕاوە مووسڵ.

«ابن الاثیر» لە ڕیزی ئەو ساڵەدا کە لەو سەربهوردانە دواوە دەڵێ: ئەو پشێوی و شۆڕشەی کە ڕووی لە دەیسەم دەکرد، هەموو لەو دیلەمانەوە بوون کە لە سوپای دەیسەمدا ئیشیان دەکرد. بەسەر هەموو کار و پیشە و هێزی دەیسەمدا ئاگادار ببوون.

ئەو هەموو سەربهوردانەی بێژرا و هاتوو، بەدرێژی لە کتێبی «تجارب الامم» سەربهوردی ساڵی ٣٢٦ھ دێتە بەرچاوان و «ابن الاثیر» و «ابن مسکویە» هەرچەندە هەموویان لەو ساڵەدا بەتەفسیل باسیان کردووە، بەڵام هێندێکی ئەوە هی ساڵی دیکەیە و لەگەڵ یەک ساڵ لێی دواون. کیسرەوی لە بەخشی نوخوستیە لاپەڕە ٦٣دا دەڵێ: ئەو

هەموو سەربهورده لە ساڵێکدا ناگونجێ. دەبێ بڵێین بەشێکی هی ساڵی ڕابردووه کە مێژوونووسەکان لە ساڵێکدا لێی دواون.

## دڵشکاوی کوردان لە دەیسەم

## چووینی دەیلەمان بۆ ئازربایەگان

دەیسەم کە بەسوپاهی وشمگیرەوه گەیشتە ئازربایەگان، دیسان ڕشتەی پادشاهی خستەوه دەست خۆی و دایمەزراندەوه، ئەو لەشکرە کە هێنابووی، ناردنیە «ڕەی»؛ بەڵام هێندێک لەوانە پێیان خۆش بوو نەچنەوه، لە لای دەیسەم مانەوه خزمەتی دەیسەمیان لە هی وشمگیر پێ چاکتربوو. بەڵام لە بابەت ساڵانەیێکی پەیمانی دابوو بە وشمگیر و خوتبەی لەسەر مینبەر بەناوی وشمگیرە خوێندنەوەی نەکەوتە ڕوو؛ چونکە وشمگیر لەگەڵ «سامان»یان و «بویە»یەکاندا لە کێشە و شەڕ و پشێویدا بوو دەیسەم ئەو پەیمانەی بەستبووی بەهێندی نەگرت و نەیخستە کردەوه، چونکە لەو ترسێکی نەمابوو کە گوێی بداتە پەیمان و مەرج و گوتەیەکی لەگەڵیدا گرێدابوو.

وەکو گوتمان «حوسێن حەمدانی» و لەشگرستان کوڕی لەشکری لە لایەن «ناصر الدولە»وه لینگیان دا سەر ئازربایەگان و دەیسەم ئەوانی شکاند و تەنگەی پێ هەڵچنین و ڕفاندنی. گەڕانەوه و چوونەوه مووسڵ، هیچیان لەگەڵیدا پێ نەکرا.

لەودەمانەدا کوردان لە ئازربایەگاندا هێزیان ئەستاندبوو و پڕ لەو خاکە ببوون و لەشکر و سوپا و کاردار و سەرکردە و هەمەئیشە و بەدەستەڵاتی دەیسەم هەموو کوردبوون. خاکی ئازربایەگان هەموو کورد بوون و هەرچیەکی بکرابا بەوان نەبوایە نەدەکرا. لەبەر هێندێک ڕەوشت و کرداری دەیسەم کە لە کوردان خۆش نەدەهات، کورد بەجارێک لێی دڵگیر و ڕەنجیدەبوون.

«ابن الاثیر» دەڵێ: هەموو لەشکر و سەرکردە و کاربەدەستەکانی دەیسەم کوردبوون. ئەوەی شەڕی بکردبا و جەنگی و دلێری و ئازایی بنواندبا و لە ڕێی ئازادی دەیسەمدا بکۆشابان کوردەکان بوون، لەگەڵ ئەوەشدا دەیسەم پتر ڕووی خۆشی لە دەیلەمیان بوو و بەسەر میللەتی خۆیدا گەورەتری ڕادەگرتن؛ ئەوەش لە کوردان گران هاتوو. بەدڵ لە دەیسەم ڕوو گەردان ببوون. دەستیان بەبیانووگرتن و دڵساردی کرد، هەر یەک بەسەر خاکێکی ئازربایەگاندا دەستیان کێشا و هێندە گوێدێری فەرمانی دەیسەمیان نەدەکرد.

دەیسەم لەو بزووتنەوە و کردەوەی کوردان هەراسان بوو، دەیەویست پشتیوانێکی بەهێز پەیداکا و سەری کوردان بەوە نەرمکات و ڕامیانکاتەوە. لە ڕووی بێ تەدبیری و هەراسەوە، ناردی کۆمەڵەیێکی دیکەی دەیلەمی خوازتە لای خۆی. یەکێک لەوان سالووک (صعلوک) کوڕی محەمەدی برای سالاری مەرزەبان بوو. خوازتییە ئازربایەگان و لە لای خۆی ڕایگرت، هەروەها عەلی ناوێکی کوڕی فەزڵ کە لە سەرکردەکانی پچکەم بوو و دەری کردبوو، بەدەستەیێکەوە لە لای مووسڵ بوون. کەوتنەڕێ و چوونە لای دەیسەم، زۆر بەکەیفوشادمانی دڵخۆشی داوە و قەدری لێ گرت. ماڵ و پێویستی چتمەکێکی بێ ژماری پێبەخشی و ڕایگرت. بەپشتیوانی ئەوان و دەیلمەکانی لەلای بوو، پشت توند بوو، چەند کەسێکی گەورە و بەناوی کوردانی گرتن و خستنیە زیندان و بەندەوە. ئەو شار و خاکانەی لە دەستیاندا بوو، لێی ئەستاندنەوە.

بەڵام لێرەدا دەیسەم لەوە ئاگادار نەبوو کە دامەزراندنی حکوومەت و بوونە پادشایی لە ئازربایەگاندا بەپشتیوانی کوردەوە بوو نەک بیانی؛ نەیزانی بوو هەر کەس خوێش و کەسی خۆی ڕەنجیدە بکا و هێز بداتە بیانی، دوامینی کاری نەگبەتی و پەشیمانییە، چونکە گەورەییێکی میللەت، بەمیللەتەکەیەوە گەورەیە. کە لەو میللەتە پچڕاوە، بیانی چاو لە جێگا و سامانی دەکەن و هەرچییێکی لێ بکەن بەزەییان پێدا نایە. هەروەکو دەیسەم کە دەیلەمی بردە لای خۆی و میللەتی خۆی بۆ شکاندن، لە دوامیندا سالار مەرزەبانیان بۆ گیانی دروست کرد و لە جێی ئەویان کردە پادشا، خاک و نیشتمان و میللەتەکەی کەوتە ژێر پەنجەی ئەو دوژمنەوە کە بەجیرە و ماڵ و دراوی دەبێژرێ. لاپەڕەکانی مێژوو پڕ لەو جینایەتانەی گەورەکانی کوردن کە لەگەڵ خۆیان و میللەتەکەیان کردوویانە.

دەیلەم لەو حکوومەتە کوردەدا بەجارێک خاوەند دەستەڵات بوون و گەیشتنە پایەیێکی وا بۆ ساڵی ٣٣٠ھ دەیسەم بەسەریاندا فەرمانی نەدەڕۆیی. دەیلەمیان کەمکەمە دەستیان بەهێندێک جێگایانیشدا کێشا و چەند قەڵا و سەر ڕەویان خستە ژێر چاودێری خۆیانەوە. ڕۆژ بەڕۆژ بۆ هێز و تەوانا فرەکرن دەچوون.

دەیسەم زۆر دڵگیر بوو، ئەوەی لە وەزیری خۆی «ئەبولقاسم عەلی کوڕی جەعفەر» دەزانی؛ چونکە کیشی باتینی (باطني) هەبوو، دەیلەمەکانیش لەسەر ئەو کیشە بوون و دەیسەم کیشی خاریجی هەبوو.

ئەو وەزیرەی دەیسەم کە ئەبولقاسم عەلی کوڕی جەعفەر بوو، کوردبوو؛ خەڵکی

ئازربایەگان بوو. پیاوێکی زرنگ و وشیار و کارزانا و تێگەیشتووبوو.

«ابن حوقل» لە چاپی لیدن - لاپەڕە ٢٥٤دا دەڵێ: لە دەوری یووسفی کوڕی ئەبوساجدا کاری باج و مالیاتی ئازربایەگان و ئاران و ئەرمەنستان بەو ئەسپاردرابوو. لە ساڵی ٣٣٠ھ لەنێوانی ئەو و دەیسەم ناخۆشی پەیدابوو. ئەبولقاسم لە خۆی و گیانی دڵنیا نەبوو و دەترسا و هەڵات و چووە «تارم».

«ابن الاثیر» دەڵێ: ئەبولقاسم و ئەو گەورانەی کوردان کە لە زیندان بوون، کەلێنیان دەست خستوو و هەڵاتن بۆ قەڵای تارم پەنایان برد و چوونە لای کوڕانی سالار کە وەهسودان و مەرزەبان و محەمەد بوون.

کیسرەوی بەخشی یەکەم لاپەڕەی ٦٤ دەڵی: چوونە تارم لە دەمێکدا بوو کە مەرزەبان و وەهسودان لە محەمەدی بابیان ڕووگەردان ببوون. ئەوەی بەدرێژی نوویسیوە و تەفسیلی پێ داوە. بەسەر دز و گەنجینەی محەمەددا دەستیان درێژ کردبوو. ئەبولقاسم چووە لای مەرزەبان، چونکە مەرزەبان یەکێک بوو لەسەر هاتووی باتینی (باطني) و بەگوتەی «ابن مسکویە» ئەبولقاسمیش یەکە پیاوێک بوو «باطني وباطنیة»تی بڵاو دەکردەوە. بەوبۆنەیەوە مەرزەبانی پەسند کرد و چووە لای. چونکە هەردووکیان کیشی «باطني»یان هەبوو، پێکەوە بوونە دۆست و میهرەبانیان پەیدا کرد. مەرزەبان ئەوی کردە وەزیری خۆی و مەیدانی دایێ بەبێ پەردە کێشی «باطني» بڵاوکاتەوە و بۆ سەرکەوتنی ئەو کێشە بەئاشکرا و بەجیدال تەقەلا بدات.

ئەبولقاسم کەوتە کۆشش و کردەوەی هاندانی مەرزەبان بۆ چوونەسەر ئازربایەگان و بەگژ دەیسەمدا کردن و ئەو خاکە لە دەست دەیسەم دەرخستن؛ لە پیت و پێز و خۆشی و دارایی ئەو خاکە دوا. بەوە گەیشت کە مەرزەبان دڵنیا کات، ئەوجا لەگەڵ ئەوانەی لە لای دەیسەم بوون و دەیناسین، باوەڕی پێ کردبوون، ئەوانەی کیشی «باطني»یان هەبوو لەگەڵ دەیسەم کە لە خارجیان بوو، بەدڵ دوژمنایەتیان دەکرد و ئەوانەی کە لە دەیسەم ڕەنجیدە و دڵگیربوون و قاقەزی بۆ نوویسین و دڵخۆشی دانەوە و بۆ فەرمانبەری مەرزەبان سازی کردن.

کیسرەوی بەخشی نوخوستین - لاپەڕە ٦٥ دەڵێ: ئەوانەی بێژراو کە ئەبولقاسم خوازتنی و وەڵامی دانی و بۆ ڕووگەردانی لە دەیسەم و فەرمانبەری مەرزەبان نوازشی کردن و دڵخۆشی دانەوە، هەموو دەیلەمی بوون. قسەکانی ئەبولقاسمیان پەسندکرد و پەیمانیان

دایه کە مەرزەبان ڕوو بەئازربایەگان لەشکری ئاژۆت، دەست لە دەیسەم بەردەن و بکەونە ژێر فەرمانی مەرزەبانەوە. لەوانە یەکێکیان سالووکی برای مەرزەبان بوو. کە لە پێشدا ناوبراو چووبووە لای دەیسەم و بەئیحترام و خۆشی و نوازش ڕایگرتبوو.

مەرزەبان بەو پەیمانە دڵنیا و بەهێز بوو، لەشکری ڕێکخست و لەگەڵ ئەبولقاسم چوونەسەر ئازربایەگان. لەولاوە دەیسەم بەلەشکرەوە پێشی پێگرت و ڕیزی بوو. بەڵام لە پێش ئەوەدا شەڕێک ڕوویدا، دەیلەمانێکی لەلای دەیسەم بوون کە لە دوو هەزار کەس پتربوون، بەجارێک لێی جوێبوونەوە و چوون گەیشتنە مەرزەبان و لە کوردەکانیش دەستەیەک دیسان لە دەیسەم پچڕانەوە و چوونە لای مەرزەبان. ئەوەی بەدەورەی دەیسەمەوە مان کۆمەڵەییێکی زۆر کەمبوون. کەمەری مەردانەگی و گیان سپاردنیان بەست و ڕوو بەشەڕ چوونە مەیدانەوە، بەڵام لە بەدبەختانە بەری هەڵمەتێکی مەرزەبانیان نەگرت و شکان و کوژران و بڵاوەیان تێکەوت.

دەیسەم لە دوای ئەوە کەسی بەپشتەوە نەما و لەشکرەکەی بڵاوبۆوە، ناچار ڕوو بەخاکی ئەرمەنستان هەڵات و پەنای بردەبەر خاچێک (غاغیق)ی کوڕی دێرنیق ئارجرونی کە لەسەر پارچەییێکی بچووکی ئەرمەنستان حوکمڕانی دەکرد. پادشای گەورەی ئەرمەنستان ئەودەمە «باگردونیان» بوو، بەڵام ئەمە لەنێو ئیسلام و ئەرمەنیاندا زۆر ناسراوبوو، لەسەر خاکی «وان» و «سەتان» هەتا نزیک خاکی نەخچەوان حوکمڕان بوو. لەگەڵ دەیسەم دۆستی و ئاشنایەتییێکی قورسیان هەبوو؛ لەمێژبوو نێوانیان بەخۆشی ڕادەبرد. کە چوو پەنای بۆ برد، غاغیق زۆری بەخێرهێنا و ئیحترامی گرت و میوانداری و ئامۆژگاری نواند، ماڵ و پێویستییێکی بێ ژماری پێشکەش کرد. لەولاشەوە مەرزەبان چوو هەموو خاکی ئازربایەگانی خستە دەست خۆیەوە و بەحوکمڕانی لەسەری دانیشت.

«تجارب الامم» ساڵی ٣٣٠ و «ابن الاثیر» بەدرێژی لەوە دواون و چووین و پەنابردنی دەیسەم و زالی و حوکمڕانی مەرزەبان لەسەر ئازربایەگانیان باسکردووە. دیسان لە ئازربایەگان وەزیری مەرزەبان ئەبولقاسم عەلی بوو کە خستیە سەر ئەو هەوەسە. هەموو کاروباری حوکمڕانی مەرزەبان لە دەست ئەودا بوو.

### شەڕی جاری دووەمی دەیسەم و مەرزەبان لە ئازربایەگاندا

وەکو گوترا وەزیر ئەبولقاسم، کە هەموو کاروباری مەرزەبان بەدەست ئەو ڕێکوپێک دەخرا، زۆری نەکێشا لەگەڵ مەرزەبان ناخۆشییان لێ پەیدابوو، چونکو لە نزیکان و دەستە

و پێـوەندی مـەرزەبان چەند کـەسـێکیـان دوژمنایەتیـیـان لەگـەڵ ئەبولقـاسـمدا هەبوو و نێـوانیـیـان تێکچـوو بـوو، ئەوانیش مـەرزەبانیـان بۆ ئەوە هان دەدا و دەیان بزاوت کـە ئەبولقـاسم ئەزیەت بدا و تووشی چەرمـەسـەری و ئەزیەتی بکات. بەهەمـوو هێـزیانەوە بۆ ئەوە تێدەکۆشان و لە کردن و تەقەلادا بوون کە ئەبولقاسم تووش بکەن.

ئەبولقاسم لەوە کەوتە ترسەوە و لە گیانی خۆی ترسا. بەمەرزەبانی گوت: ئەگەر بچیتە تەورێز مـاڵێکی قـورست بۆ کـۆدەکـەمـەوە و لە خـەڵکـەکـەی گـەلێک چتت بۆ دەسـتـێنم. دەیویست بەوبۆنەیەوە لەژێر پەنجەی مەرزەبان دەرکەوێ و دووربێتەوە. مەرزەبان پێی فریو خواردوو قسەکەی لێ پەسند کرد و لەشکرێکی دایە جستانی کوڕی شەرمەزن و حەسەنی کوڕی محەمەد مەهلەبی کردنە سەرکردە و لەگەڵیدا ناردنیە تەورێز.

ئەم شەرمەزنە کە جستانە، لە هاتوودا کە باسی دەکرێ، لە ئازربایەگاندا بوو بەپیاوێکی گەورە و مەهلەبی لە پاش لە بەغدا گەیشتە پایەی وەزارەتی خەلیفە و زۆر ناودار بوو.

«کیسرەوی» بەخشی نوخوستێن لە «ابن مسکویە» وەردەگرێ کە تەورێز شارێکی گەورە و دیوار و بارووێکی ئەسـتـوور و توندی هەبوو. دەورەی ئەو بەمـێشـە و داری بەبەری بێ ژمـار ڕازاندرابووەوە. شـارێکی سـەخت و توندو قـایم و خـەڵکی ئەوێ دلێـر و پاڵەوان و دەوڵەمەند بوون.

کە ئەبولقاسم گەیشتە تەورێز و لەگەڵ مـیللەتەکەیدا میهرەبانی و ڕووخۆشی دەست پێ کرد. بەدخوویی و بەدڕەوشتی و ستەمکاری و نامیهرەبانی دەیلەمیانی بۆ باسکردن و پێی دەگـوتن: ئەوانە چاکی کـەسـیـان ناوێ. جگە لەمـە کـە ڕیشـەی خـەڵک لەبن هەڵکەنن و خـەڵک ماڵ وێرانکەن، چ ئارەزوویەکی دیکەیان نیـیـە. لە لایێکەوە بەو گـوتانە خـەڵکی تەورێزی لە دەیلەمـیـان هان دەدا و بەپەنهـانیش قـاقـەزی بۆ دەیسـەم نوویسی لە ڕابوردی ڕابردنی خـوازت و داوای گـەڕانەوەی لێکرد و پەیمانی دایە و سـوێندی بۆ خـوارد کـە بگەڕێتـەوە سـەر ئازربایەگـان و هەرچەند دەیلەمـیـانیـان لە تەورێزن بیـانکوژی. «ابن مـسـکویە» و «ابن الاثیـر» شـەڕەکـانی دەیسـەم و مـەرزەبان هەمـوو لە سـاڵی ٣٣٠ھ دا دەنوویسن. کیسرەوی دەڵێ: ئەو هەموو شۆڕشە لە ساڵێکدا ناگونجێ.

ئەگەرچی «ابن حوقل» بەئاشکرا دەورەدانی ئەردەوێلی بەساڵی ٣٣١ھ نوویسیوە، لەوە وا دەردەکەوێ دوو ساڵی کێشاوە.

دەیسەم کە ساڵی پار لە مەرزەبان شکانی خوارد و هەڵات و چووە ئەرمەنستان و پەنای

برده لای غـاغـیق، بەپەنهـانی لەگـەڵ کـوردانی ئازربایەگـان مـوخـابەرە و نوویسـینی دەسـتپـێکرد. لەگـەڵ دڵداری و نوازشی کـوردان دەکـۆشـا کـە بیـانخـاتەوە لای خـۆی و لە دەیلەمـیـان بپـچڕێتەوە و بیـانکاتە لاگیـری خۆی؛ چونکە تێگەیشـتبـوو ئیش لە کوێوە لێی تێکچوو.

کیسرەوی لە بەخشی نوخوستین لاپەڕە ٦٧ دەڵێ: چونکو زانیبووی کە مایەی تێکچوون و خـراپی کـاری ئەو هەر ئەو دوورخسـتنەوەی کـوردان و نزیکخـسـتنەوەی دەیلەمـیـان بوو. ئەمـە عـەینی عـیـبـارەتی کـیـسـرەوییـە لێـرەدا دەینووسم: «نهـانی بەکـوردان آزربایەگـان نامەنگاشت. بەدلجوئی ایشان می کوشید کە دوبارە بەسوی او برگردند. چە دانستە بود کە مایەی خرابی ری (؟) همانا دورکردن کوردان و نزیک ساختنی دیلمان بود...». کە قاقەزی ئەبولقاسم بەو گەیشت، زۆر شاد و کەیفخۆش بوو. جوابی داوە کە تا تۆ دەیلەمیان نەکوژی باوەڕت پێ ناکەم و لێت دڵنیا نابم.

ئەبولقـاسم ئەو قـسـەیەی لەگەڵ تەورێزیان خسـتـە گفـتـوگۆوە. بەپشـتـیـوانی تەورێزیان لەشکری دەیلەمیان کە لەوێ بوون کوژتاریان لێکردن و هەمـوو سەرکردەکانی ئەوانیان گرت و خسـتـیـاننە زیندانەوە. ئەبولقـاسم بۆ خـۆی تالووکەی کرد و چووە دووی دەیسـەم و بردیە تەورێز.

ئەو قـسـەیە کە بڵاوبۆوە، ئەو کوردانەی کە هەمـوو لە مـەرزەبان دڵگـیـربوون بەپۆل چوونە تەورێز و سـوپاهێکی قـورسی کـورد لە تەورێز گـردبوەوە، لە هەمـوو لایێکەوە کورد لەسـەر دەیسەم کۆبوونەوە و کەوتنە ژێر ئاڵایەوە.

مـەرزەبان لە ئەردەوێڵ کە ئەوەی بیست ئەبوجەعفەر ئەحمەد ناوێکی کردە وەزیری خۆی لەجێ ئەبولقـاسـمی دانا و لە ئەردەوێڵ بەجـێی هێـشـت و بۆ خـۆشی بەلەشکرەوە ڕوو بەتەورێز چووە شەڕی دەیسەم. لەولاوە دەیسـەم بەدەستە لەشکری کوردانەوە چووە پێشی. هەردوولا بۆ کوژتار ڕیزبوون. چەندجار تەنگەتاو بوو، نەشیان بەرامبەری بکات و هەڵات. دەیسەم چوو پەنای بۆ تەورێز برد و بەشکایی گەڕاوە پاش.

تەورێزییـان چونکە دەسـتـیـان بەخـوێنی دەیلەمـیـان پیس کـردبوو، زۆر لە مـەرزەبان دەترسان. بەدڵێکی پڕ هێزەوە بۆ یارمەتی و پشـتیـوانی دەیسـەم بلندبوون و دەسـتیـان دایە چەک و شیر و دەروازەکانی شاریان بەست و ئامادەی شەڕ و کوژتاربوون.

مـەرزەبان دەورەی شاری چەمـبـەردار گـرت و تەقـەلای دەدا جارێکی دیکەش ئەبولقـاسم

بکاتەوە بەهەوادار و لایەنگیری خۆی، دڵخۆشی و نوازش و پەیمانی بۆ خستە پێشەوە و قاقەزی بۆ نووسی و سوێندی بۆ خوارد و پەیمان و دڵنیای بەچی بێ بۆ دەرمیان کرد. گوتی هەروەختێک بگەڕێتەوە کنی لە ڕابردوو چاو بپۆشی. جگە لە خۆشی و دڵنیایی و چاکە چی دیکە لەو نەبینی.

ئەبولقاسم وەڵامی داوە: «من لە دەیسەم کەوتمە ترسەوە و پەنام بۆ تۆ هێناوە، ئێستا بۆ من جگە لە دڵنیایی و لە گیان ئەمین بوون ئارەزوویێکم نییە. ئەگەر تۆ لە گیان دڵنیام کەی و لە ئیشوکار ببەخشی و ئازادمکەی کە لەمە بەولاوە لە گۆشەی تەنهایی دادەنیشم، هەڵدەستم دێمەوە لای تۆ».

مەرزەبان ئەوەی لێ پەسند کرد و بەسوێند و پەیمان دڵنیایی پێدا. لەو نێوانەدا چونکە دەوردانی تەورێز درێژەی کێشا دەیسەم ڕۆژێک بارووی شاری کونکرد، لەگەڵ ئەو کوردانەی کە لەگەڵی بوون و هەواداری ئەویان دەکرد و دەوڵەتخواهی بوون، لە شار دەرکەوتن.

مەرزەبان نەچووە دوویان، ترسا نەوەکو بگەڕێتەوە سەر شەڕ و کوژتار و تەورێزیی لەولاوە لە شار دەرکەون و پاشوپێشی لێبگرن و هەڵمەت ببەنە سەری.

دەیسەم چوو لینگیدا سەر ئەردەوێڵ و گرتیەوە و لەسەری دانیشت.

ئەبولقاسم لەشاری تەورێز دەرکەوت و گەیشتە مەرزەبان. بەڵام تەورێزییان خۆیان گرت و ڕاوەستان. بەڵام لێرەدا «ابن مسکویه» و هی دیکە و کیسرەوی نانووسن تەورێز و مەرزەبان چییان لە نێواندا ڕابرد و نەزاندرا ئەو سەرکردانەی مەرزەبان کە لە تەورێز زیندانی بوون، ئەبولقاسم لەگەڵ خۆی بردوونی یان چۆن ڕزگاربوون. کە دەنگی گرتنی ئەردەوێڵ بەدەست دەیسەم بەمەرزەبان گەیشت، مەرزەبان بەشێکی لەشکری بۆ دەورەدانی تەورێز بەجێهێشت و بەشێکی لەگەڵ خۆیدا برد و لینگیدا و چووەسەر دەیسەم کە لە ئەردەوێڵ بوو تا دەری بکا.

لێرەدا ناوی «ئەبولهەبائی کوردی ڕاوەندی» دەبرێ کە خاوەندی خاکی ئەهر و ززەقان دەهاتە ئەژمارەوە و لە ساڵی ٣٤٤هـ دا بوو بەباجەدری سالار. هەروەکو بەتایبەتی لێی دەدوێین.

## دەورەدانی ئەردەوێڵ و گرفتاریی دەیسەم بەدەست مەرزەبان

مەرزەبان لەوە کە دەیسەم چووە ئەردەوێڵ و تێیدا دانیشت، زۆر دڵگیربوو. چونکە لە سەختی و دژواری ئەو شارە شارەزابوو، دوژمنی و کینەی ئەردەوێڵیان لەگەڵ دەیلەمیانیشی لێ ئاشکرا بوو. وا تێگەیشتبوو بۆیە دەیسەم یان ڕێ داوە و یارمەتی دەکەن، چونکە حەزیان لە دەیلەمیان نەدەکرد. مەرزەبان کە گەیشتە ئەردەوێڵ، شاری دەورەگرت و وەتەنگی هەڵهینا. پیاوانی نارده تارم کە وەهسودانی برای وخزم و خوێش یارمەتی بکەن، بۆ دەورەدانی شار بەتوندی تەقەلای دەدا.

دەیسەم کە لە ئەردەوێڵ حکوومەتی دامەزراندەوە، محەمەدی کوڕی ئەحمەد ناو کە بەنەعیمی ناوبانگی کردبوو، لە جێی ئەبولقاسم کردی بەوەزیری خۆی؛ هەموو کاروباری حکوومەتی خستە دەست. مەرزەبان بەپەنهانی لەگەڵ نەعیمی موخابەرەی کرد و بەپەیمان سوێندی دایێ کە بیکاتە وەزیری خۆی، بەمەرجی ئەوە فریوی خوارد.

دەورەدانی شار کە درێژەی کەوتێ، دانەوێڵە و تیشوو ڕووی لە بڕان کرد. دەیسەم لە نەعیمی خوازت چارەیێک بدۆزێتەوە و ڕێگای پەیداکردنی دانەوێڵە دەستخات و پێی گوت: «دەبێ چی بکەین و چۆن دەستی خەین؟ نەعیمی پێ گوت: جگە لەمە کە بۆ مامڵەت، گەورە و سەرهاتوو و پیرەمێردەکانی شار بنێرنە لای مەرزەبان، ئەوان بۆ تۆ ئەمان بخوازن، لە دوای ئەوە شار بدەینە دەست مەرزەبان، چ چارە و ڕێگاییێکی دیکە لە دەستدا نییە». دەیسەم چونکە دڵشکاو و نائومێد ببوو، قسەکانی ئەوی پەسند کرد، گەورەکانی شاری کۆکردنەوە و بۆ ئەمان خوازتن ناردنیە دەریی شار.

بەڵام نەعیمی پەیامی بۆ مەرزەبان ناردبوو کە گەورەکان گەیشتنی نەیەڵێت بگەڕێنەوە نێو شار و لە لای خۆیان ڕایانگرن. کە ئەو دەنگە گەیشتە خەڵکی شار بۆ گەورەکانیان جۆشان و خرۆشان.

دەیسەم ناچار لە شار دەرکەوت چووە لای مەرزەبان. مەرزەبان پێشوازی کرد و زۆر بەئیحترامەوە نوازشی لەتەکدا نواند ئەمانی دا و دەستی ڕێز و گەورەیی لێنا و نەعیمی کە بەپەیمان لەگەڵی پێکهاتبوو کردیە وەزیری خۆی. مەرزەبان چووە نێو شار و ماڵ و دراوێکی زۆری لە ئەهالی ئەستاند. گەورەکانی شاری هەریەک بەئەوەندە دراو و ماڵ و چتی گرانبەها جەریمەکردن، بەجەزا و سزاواری ئەوە کە یارمەتی دەیسەمیان دابوو، فەرمانی دا دیواری باروو و شوورەی شار بەدەستی خۆیان خراپکەن.

مەرزەبان بەرهەڵستی نەما و نەیار بەکەم چاخێک هەموو ئازربایەگان و ئاران و ئەرمەنستانی تا دەربەندی شیروان گرت. حوکمڕان و پادشاکانی ئەو خاکە کەوتنە ژێر فەرمانبەرییەوە، بەبێ گوتن لە دوای کێشە و شۆڕش کوردەکانی ئەو خاکە بەجارێک بوونە ژێر فەرمانی و باج و خەراجیان بەمەرزەبان دەدا.

دەیسەم کە خۆی بەدەستەوەدا و بەئیحترامانە ڕاگیرا، لە دوای چەندێک کە لەلای مەرزەبان بوو، خوازتی کە بەگۆشەگیری لە تارم دامەزرێ و ئاسوودە بەسەری ببا، ئەوەی لە مەرزەبان خوازت کە خۆی و ماڵ و منداڵ و کەسوکار و خزم و خوێشاوەندانی بچێت لە دز (قەڵا)ی تارم بەبێ دەخلی دانیشێت، سەرپەرشتی موڵک و ئەملاکی خۆی بکا و بەئیشوکاری کردار ڕاببوێرێت. مەرزەبان لێی پەسندکرد و بەکەسوکار و خانەدانی و خزمانییەوە ناردیە دزی تارم لێی دانیشت. هەتا مەرزەبان بەدەست ڕوکنودەولەی بووەیە گرفتاربوو، دەیسەم دووبارە گەڕاوە سەر پادشاهی ئازربایەگان هەروەکو لە داهاتوودا دێتە گوتن و لە سەربهوردی دەدوێین. (ئەوەی لە دەیسەم و شەڕی ئەو و مەرزەبان و تەورێز دواوین، لە بەخشی یەکەم «شهریاران گمنام» و «ابن الاثیر» حەوادیسی ساڵی ۳۳۰ و «تجارب الامم» پتری ئەم باسە لە «شهریاران گمنام» وەرگیراوە.

لە ساڵی شۆڕش و شەڕی مەرزەبان لەسەر ئازربایەگان گەلێک سەربهورد ڕوویداوە مەرزەبان ئاسوودە نەبوو، یەک هەڵمەتی ڕووس بۆ سەر شاری بەردعە و قەتلوعامی موسڵمانان لەو شارەدا؛ دووەم سەر بڵندکردنی جەعفەری کوڕی شکۆیەی گەورە و سەردار و فەرمانڕەوای کوردی هەدیانی بوو لە خاکی سەلماس و ورمێدا. وەکو دەبێژرێ.

## جەعفەر کوڕی شکۆیە

## کوردی هەدیانی

وەکو کیسرەوی لە بەخشی یەکەمی «شهریاران گمنام»دا لێی دواوە، وا تێدەگەیەندرێ ئەم ئەمیرە کوردە گەورەییێکی ناودار و لەسەر خاکی سەلماس فەرمانڕەوایی دەکرد و لە دەوری دەیسەمدا زۆر زەبەردەست و یێکە پشتیوانی حکوومەتی کورد بووە. بەخۆی و کوردەکانی هەدیانی کۆشاون. کە دەیسەم شکا و هەڵات، ئەو هێزێکی کە پێی بووە گەڕاوەتەوە خاکی سەلماس و لەگەڵ دارایی و بەخێوکردن و خۆپارازتن خەریکبووە. لەوەختی خۆبەدەستەوەدانی دەیسەم کە بێژرا ئەو سەری بۆ مەرزەبان نەچەماند، بۆ بەرامبەری و پێش پێگرتن خۆی ڕاگرتووە.

بەڵام لەودەمەدا شەڕی ڕووس و موسڵمانان لە شاری بەردەعە ڕوویدا، مەرزەبان ناچار بەلەشکرەوە چووە شەڕی ڕووس. «بەخشی یەکەم» «شهریاران گمنام» لاپەڕە ٧٠ - ٨٠ بەدرێژی لێی دواوە. لەودەمەدا جەعفەر کەلێنی دەستخست کە هێزێک پەیداکا و خاکی ئازربایەگان بگرێ و بیخاتە ژێر فەرمانی خۆیەوە.

ئەگەرچی ناسرودەولەی حەمدانی چاوی لەگرتنی ئازربایەگان بڕیبوو. وەکو بێژرا ساڵی ٣٢٦ - ٣٢٧ لەشکرستان کوڕی لەشکری کە پەنایان بۆ بردبوو، حوسێنی ئامۆزای خۆی لەگەڵ خستن و لینگیان دا سەر خاکی ئازربایەگان و جەعفەری کوڕی شکۆیێ پێشی پێگرت و شکاندنی. نوویسیمان کە دەیسەم چوو و شکاندنی و ڕوو بەموسڵ گێڕانیەوە. جەعفەر لەگەڵ ناسرودەولە ئەمجار ڕێک کەوت و پەیمانی لەتەکدا گرێدا ساڵی ٣٣٣ه.

ناسرودەولەی حەمدانی کوڕی حوسێن سەعید -کە ئامۆزای خۆی بوو- بەلەشکر و سوپاوەی ناردە سەلماس و دەستیان بەلەشکر کۆکردنەوە کرد. ئەگەرچی کیسرەوی ئەمە بەهاندانی ناسرودەولە دادەنێ، بەڵام دەڵێم لەمە زۆرچاک تێدەگەین کە کوردەکانی ئازربایەگان فەرمانبەری مەرزەبانیان نەویستووە؛ بۆیە لە دەمێکی وا سەخت و دژوارییدا، هەموو موسڵمانان لە خوراسان و چوارگۆشەی ئازربایەگان و خەزەرەوە بۆ غەزای ڕووس چووبوون بەهاواری موسڵمانەکانی بەردەعەوە، جەعفەر لە سەلماس ئاڵای سەربەخۆیی هەڵکرد و لەگەڵ دوژمنێکی پێشووی خۆیدا ڕێککەوت کە لەشکری بۆ بنێرێ و ئازربایەگان بگرێت. ئەگەرچی ئاگاداربوو بەسەر کوڕانی حەمدانی و ئارەزووی گرتنی ئازربایەگانیشی هەبوو، وایشی زانی کە کوڕانی حەمدانی دەست ڕەش بوون. بۆ ئەو چتێکی گەورە یا ئەمارەتێک دەمینێت کەوا وەڵامی دانێ بەهاواریەوە بچن.

ساڵی ٣٣٤ لەو ڕۆژانەدا لەشکری ڕووس لە بەردەعە لەشکری ئیسلامی شکاندبوو و موسڵمانەکان هەڵاتبوون کە وەڵامی بزووتنەوەی کوردانی هەدیانی و یارمەتیدانی کوڕانی حەمدانی بەمەرزەبان درا. مەرزەبان جگە لەمە چارەییێکی نەدۆزیەوە کە پێنج سەد کەسی دەیلەمیان و پێنج سەد سوارەی کورد و دوو هەزار هەواداری بداتە دەست سەرکردەیەک و دەوری «ئەرک» بگرن. بۆ خۆشی دەستە سوپایەک هەڵگرێ و بێتە سەر کوردانی هەدیانی. بەو جۆرە بۆ خۆی و لەشکرەکەی ڕوو بە«ئەوران» چوون. کیسرەوی دەڵێ: ئەم کەلیمە لەگەڵێک جێگای کتێبی «ابن مسکویه»دا هەیە، بەڵام نەزاندراوە لە کوێیە.

وەکو گوترا کە مەرزەبان دەستە لەشکرێکی لە بەردەعە بۆ شەڕی ڕووس بەجێهێشت و

بۆخۆشی لینگیدا سەر کوردی هەدیانی، لەوەدەمەدا حوسێن حەمدانی کەوتبووە پێش لەگەڵ مەرزەبان کەم شەڕێکیان کرد. چونکو زستان بوو، لەشکری حوسێن پتری عەرەب بوون و نەشیان بەو بەفرە خۆبگرن، کشانەوە و لە شارێکی بەبورج و باروو لەگەڵ کورد دامەزران.

مەرزەبان لەبەر زستان و بەفر گەڕاوە و کوڕی حەمدانی لە دوای چەندێک وەڵامی پێدرا لەلایەن ناسرودەولەوە کە زوو بیگاتێ، چونکو ئەمیرولئومەرای بەغدا مردووە و ئەو دەچێتە بەغدا و دەبێتە ئەمیرولئومەرا. لەبەرئەوە حوسێن گەڕاوە مووسڵ. بەڵام کورد و مەرزەبان هەروا مانەوە هەتا ساڵی ۳۳۷ کە مەرزەبان و ڕوکنودەولە بەشەڕ هاتن و مەرزەبان بەدیل گیراوە.

## هاتنەوەی دەیسەم
## بۆ سەر ئازربایەگان

ساڵی ۳۳۷هـ نێوانی مەرزەبان و ڕوکنودەولە لەسەر ئەوە کە ناردراوی خۆی ناردبووە لای موعیزدەولە، ڕووی ناردراوەکەی تاشی بوو، نێوانیان تێکچوو. لەشکرێکی پێنج هەزار کەسی هەڵگرت کە سێ هەزار کورد لەژێر سەرداری شا فەیروزی کوڕی کوردەوییەدا و دوو هەزار دەیلەمی لەگەڵ خۆیدا برد و چووە سەر ڕەی. لەولاوە ڕوکنودەولە سوپاهێکی لەژێر فەرمانی محەمەدی کوڕی عەبدوڕەزاقدا نارده پێشەوە.

ئەم کوڕی عەبدوڕەزاقە «ابن الاثیر» و هی دیکەش لە ڕیزی ساڵی ۳۳٦دا باسیان کردووە کە گەورەترین پیاوێک ئێرانی بووە. کیسرەوی دەڵێ: شاهنامەی ئەبوومەنسوور بۆ ئەو نوویسراوەتەوە کە ڕەفیقی و فیردەوسی ئەویان نەزم کردووە.

ئەم محەمەدە چووە پێش مەرزەبان و بەشەڕ گرتی. لە قەزوین شەڕیان بوو. پێنج هەزار کورد و دەیلەمی لەگەڵ مەرزەبان شکان و گەلێک لە سەرکردەی مەرزەبان کوژران و مەرزەبان و سێزدە کەس لە سەرکردەکانی بەدیل چوون. ڕوکنودەولە بردنیە ڕەی، مەرزەبانی نارد لە دزی سەمیرۆم کە لەو لای سپاهانەوە بوو، خستیانە زیندانەوە و سەرکردەکانیشی هەریەک لە لایەک بەندکردن.

لەوانەی کە لە شەڕ هەڵاتبوون، جەستان شەڕمەزن (شرمزن) و عەلی کوڕی فەزڵ کە لە مووسڵەوە دەیسەم بردبوویە لای خۆی - وەکو باس کرا - و شا فەیروز کوڕی کوردەویە، چوون لەسەر محەمەد پیربابی مەرزەبان کۆبوونەوە و وەهسوودانی برای مەرزەبان -کە جێنشینی برای بوو- لە بابی ترسا و هەستا و هەڵات چووە دزی خۆی کە لە تارم بوو.

بەڵام محەمەد پیر و بێ ئیدارە بوو، دەستی بەخراپی بوو، تەمای گەلێک بەدی کرد. گەورەکانی ویستیان بیکوژن. محەمەد هەڵات و چووە تارم و وەهسوودان بابی خۆی گرت لە دزی شیسکاندا خستیە زیندانەوە، هەتا ساڵی ٣٤٢ لەوێ مرد. کە محەمەد هەڵات دەیلەمیان لەسەر کوڕی فەزڵ کۆبوونەوە و کردیانە پێشەوای خۆیان لە ئازربایەگاندا و بەفەرمانڕەوایی ئازربایەگانیان دانا. بەڵام لەولاوە ڕوکنودەولە، محەمەد کوڕی عەبدوڕەزاقی بەلەشکرەوە ناردە سەر ئازربایەگان.

وەهسودان کە لەو سەربهوردە ئاگادار بوو، هەستا چووە لای دەیسەم و ئازادی کرد و خەڵات و پێویستی و چەک و دراوێکی قورسی دایێ؛ چونکو لە نێوانی کورداندا بەپادشا و گەورە ناسرا بوو و هەر خۆشیان دەویست و هەواخواهانی ئەوبوون. ناردیە ئەو شارانە کوردان کۆکاتەوە و پێش بەمحەمەدی عەبدوڕەزاق بگرێ. عەلی کوڕی فەزل دیسان دەیسەمی بەپادشا پەسند کرد و کەوتە ژێر فەرمانییەوە. دەستیان بەلەشکر کۆکردنەوە کرد.

دەیسەم کە ئازربایەگانی گرتەوە، چوو لە ئەردەوێل دانیشت و پێویستی پادشاهی ڕێک خست. ئەبو جەعفەر کوڕی عەبدوڵلا کە وەزیری سالار مەرزەبان بوو، لەوەپێش دەیسەم کردیە وەزیری خۆی. بۆ لەشکر و سوپا کۆکردنەوە دەکۆشان کە لەودەمەدا محەمەدی کوڕی عەبدوڕەزاق لە «ڕەی»یەوە گەیشتە ئازربایەگان و ڕووی لە ئەردەوێل کرد. دەیسەم ئەردەوێلی بۆ بەجێهێشت و چووە شاری ورسان (ورثان - ورتان) کە شارێکی بچووکی ئازربایەگان و دوو فرسەنگ دوور لە چۆمی ئاراس بوو.

کیسرەوی دەڵێ: بۆ باج و خەراج و کۆکردنەوەی لەشکری کورد چووبووە ئەو شارە. کە محەمەد چووەسەر ئەردەوێل، ماڵ و پێویستیی شەڕی ڕێک خست و کوردانی لەسەر خۆی گردکردەوە و ئامادەی چوونە سەر کوڕی عەبدوڕەزاق بوو؛ هەڵمەتی بردەسەر. بەڵام گەنجینە و بنە و گرانەباری خۆی لەژێر فەرمانی ئەبوجەعفەری وەزیری خۆیدا بەجێهێشت. کە لە کێوەکانی موغان بچێتە جێگایێکی سەختەوە و خۆی بپارێزی.

بەڵام ئەبوجەعفەر بەڕەوشتی وەزیرانی ئەو دەمە خیانەتی کرد و بنەوبارگە و گەنجینەکانی هەڵگرت. هەروەکو وەزیرەکانی ئەو دەورانە کە گەلێکمان دێتە بەرچاو و بەتایبەتی هی دەوری دەیسەم لە خیانەتدا دوانەدەکەوتن و لەگەڵ خاوەندی خۆیان بەدنمەکیان دەکرد و دەبوونە هەواداری دوژمنیان. بەو بنە و گەنجینەوە، هەستا چووە

ئەردەویێڵ خۆی گەیاندە محەمەد کوڕی عەبدوڕەزاق و ماڵەکەی هەموو دایێ.

دەیسەم لەولاوە لەشکری هەڵگرت، چوو لینگیدا سەر کوڕی عەبدوڕەزاق لە شەڕدا بوو، ڕۆژی کوژتار ئەو سەربهوردەی خیانەتی وەزیری پێ ڕاگەیاندرا. بەپایەیەک غەموو ئەندوە، گەرمیان گیری بوو، نائومێدی و دڵتەنگی بەسەریدا هات و نەیتوانی شەڕ بکات. لەشکرەکەی ئەویش بەیەک هەڵمەت تەنگەتاو کرا و شکاندرا و هەڵات.

کوڕی عەبدوڕەزاق لە ئەردەویێڵ فەرمانڕەوایی دامەزراند و ئەبوجەعفەری زۆر نوازش کرد و کردیە وەزیری خۆی و لەجیاتی هێنانی ئەو بنەوگەنجینە دەستی عیززەتی لێنا، بەڵام دەیسەم پارچە خاکێکی ئازربایەگانی لە دەست ما، لەوێ خەریکی کۆکردنەوەی سوپابوو.

کیسرەوی بەخشی یەک - لاپەڕە ٨٨ دەڵێ: کوڕی عەبدوڕەزاق وەزیرێکی لەوە پێش لە خوراسانەوە لەگەڵ خۆی هێنا بووی کرد بەسەرکردەی دەستە لەشکرێک کە بچێت لە هێندێک جێگایانی لە دەستیاندا بوو خەرج و باج کۆبکاتەوە. ئەو پیاوەش لەوە کە ئەبوجەعفەری کردبوو بەوەزیری لە کوڕی عەبدوڕەزاق دڵگیر و ڕەنجیدە بوو، لەوددەمەدا کەلێنی دەسخست و بەو لەشکر و دەستگایەی پێی بوو هەستا چووە لای دەیسەم. بەئیحترام و خۆشی و نوازش ڕاگیرا و خەڵاتکرا.

کوڕی عەبدوڕەزاق کە لەوە ئاگاداربوو، زۆر پێی ناخۆش بوو، گەلێک کەوتە هەراس و ڕەنجەوە. دڵی لە ئازربایەگان و فەرمانڕەوایی ئەو خاکە هەڵکەندرا و کەوتە ئەندێشەوە. ساڵی ٣٣٨ ئەبوجەعفەر وەزیری هەڵگرت و دەستی لە ئازربایەگان بەردا و گەڕاوە چووە «ڕەی» و بۆ ساڵی دوایی، چووە خوڕاسان و لەگەڵ سامانیان ڕێککەوتەوە.

دەیسەم کە ئەو وەزیرەی چووە لای بەهێز بوو و لەشکرێکی لە کوردان پێکەوە ناو لینگیدا سەر محەمەدی کوڕی عەبدوڕەزاق لە خاکی ئازربایەگانی دەرکرد، لە دوای ئەوە یەک لە دوای یەکدی خاکی ئازربایەگان و ئاران و ئەرمەنستانی گرتنەوە و گەڕاوە ئەردەویێلی کردە پایتەخت و بەپادشاهی لەسەر ئازربایەگان دامەزراوە و پێویستی حوکمڕانی ڕێک خست و دیسان وەزارەتی خۆی داوە دەست عەبدوڵلا نەعیمی، کە ناوی لە پێشدا گوترا. (تجارب الامم حوادث ساڵانی ٣٣٩ و ٣٤٢ھ کیسرەوی - بەخشی یەکەم - لاپەڕە ٨٨).

لە دوای ئەوە کە دەیسەم هەموو خاکی ئازربایەگانی گرتەوە، لەشکرێکی زلی لە کوردان هەڵگرت و چووەسەر شارانی نەخچەوان و دوین (دبیل). لە پشێوی نێوانیدا، فەزڵ ناو

کوڕی جەعفەری حەمدانی و ئیبراهیمی کوڕی زابی بەسەر ئەو دوو خاکەدا زاڵ ببوون و سەربەخۆ لەوێدا حوکمڕانیان دەکرد. دەیسەم هەردووکی شکاندن و شارەکانی لەژێر دەست دەرخستن و خستنیە ژێر فەرمانی خۆیەوە. کاروباری پادشاهی و فەرمانڕەوایی دەیسەم ڕەونەقی زیاد کرد و ئیش و فەرمانی ڕوو بەبەرزبوون ڕۆیشت. لەلایێکی دیکەشەوە ڕوکنودەولە بوو بەخاوەندی «ڕەی» لەلای خوڕاسانەوە خەریکی شەڕ و زەد و خورد بوو لەگەڵ «سامانی»یان؛ نەدەپرژایە سەر ئازربایەگان و دەیسەم.

دەیسەم بەبێ بەرهەڵست و کۆسپە بەپادشای ئازربایەگان و ئاران و ئەرمەنستان جێگیر بوو. کوردانی ئەو خاکە ڕوویان لە ئازادی و ئاسوودەگی کرد.

لە دوای چەندێک عەلی کوڕی میشکی -کە سەرکردەیەکی سالار مەرزەبان بوو- لە شەڕی قەزوین لەگەڵ سالار، بەدیل کەوتە دەست ڕوکنودەولە و لە بەند ڕزگار بوو. هەڵمەتی بردە سەر گەیلان و کۆمەگی پێکەوەنا.

گەلێک لە مێژوونووسان دەڵێن ڕوکنودەولە بەریدا و لەشکری دایێ و ناردیە سەر دەیسەم. بەهەر جۆرێک بێ کە گەیشتە گەیلان، لەگەڵ ئەو دەیلەمیانە کە لایەن دەیسەم بوون، موخابەرەی کرد. بۆ تێکدانی کاروباری دەیسەم تێکۆشا. ئەو دەیلەمیانەی بەپەنهانی کردە هەواداری خۆی و لەپاشان نزیک بەتارم بۆوە و نزیکی وەهسوودان بوو و لەگەڵیدا پێکهات. هەردوو لا بۆ پشێوی و تێکچوونی حوکمڕانی دەیسەم تەقەلایان دا. لەودەمەشدا قاقەزی سالار مەرزەبان بەوان گەیشت کە لە زیندانی سەمیروم ڕزگار بوو بەسەر ئەو دزەدا دەستی درێژ کرد. هەروەها قاقەزانی مەرزەبان گەیشتە هەموو دەیلەمیانی تارم و ئازربایەگان و دەیسەم لە ڕزگاربوونی سالار و پەیام و وەڵامی عەلی و وەهسودان بۆ دەیلەمیانی ژێر دەستی خۆی ئاگادار نەبوو.

دەیسەم هەروەکو لە قاقەزانی سالار و عەلی و وەهسودان بۆ دەیلەمیان، ئازربایەگان بێ خەبەر بوو، هەروەهاش لە خیانەتی نەعیمی وەزیریش دڵنیابوو. تەنها دوژمنێکی بەرامبەری خۆی بدیبایە عەلی کوڕی مێشکی بوو. لەشکرێکی ڕێک خست بۆ چوونە سەر عەلی ئامادە بوو. «غانم» ناو، خوارزا (خوشکەزا)ی خۆی کردە جێنشین لەگەڵ وەزیر نەعیمی لە ئەردەوێل بەجێی هێشتن، بۆ خۆشی بەو سوپاهی کە پێکی هێنابوو چووەسەر عەلی کوڕی مێشکی و هەڵمەتی بردە سەر تارم.

بەڵام نەعیمی وەزیر کە ڕەوشت و کرداری بوو، بۆ تێکدان و کینەجوویی کەلێنی

دەستکەوت. غانمی هاندا و بۆ سەرکێشی و پشێوی هەڵایساندن، بزاوتی و لە خاڵی خۆی سەرکێشی کرد. بۆ خۆشی ماڵ و گەنجینە و دارایی و هێزی دەیسەم کە هەبوو، هەڵیگرت و لە ئەردەوێڵ دەرکەوت و چوو بۆ تارم و گەیشتە کوڕی مێشکی.

دەیسەم وەختێک لەوە ئاگادار بوو، کە بەلەشکرەوەی گەیشتبووە زەنگان، تەمای چووینی سەر عەلی هەبوو؛ ناچار لەو چووینە دەستی هەڵگرت و گەڕاوە. کە گەیشتەوە زەنگان، دەیلمانیان لە سوپاهی ئەودا بوون، سەرکێش بوون و شۆڕشیان هەڵایساند. دەیسەم بێدەسەڵات ماوە. ناچار ڕۆژێک بەبۆنەی ڕاووشکارەوە، هەرچەندە ماڵ و گەنجینە و داراییێکی لە دەستیدا مابوو، هەڵیگرت و لێیدا چوو بۆ «بەردەعە». کە وردبۆوە کاری خۆی بەبەراوەژوو ئیشی سەڵتەنەتی واژگون چاوپێکەوت. پیاوانی دڵسۆزی خۆی ناردە لای دێرنیق کوڕی غاغیق ئارجرونی کە لەودەمەدا لەجێی بابی ببوو بەپادشای «وان» و ئەو خاکانە و ناردیە لای برای ئەو، ئەبوسەهل هامازاسپ و ناردیە لای ئاماس (عەباس)ی کوڕی سنباد باگرتونی پادشای ئەرمەنستان عیبارەتی عەرەبی «ابن مسکویە» ئەمەیە: «وکان أنفذ الی أرمنیة من یوطيء له نیات ملوکها من ابن الدیراني وابن جاجیق واخیه حمزة وابن سباط وغیرهم...» و جگە لەوانەش قاقەزی بۆ حوکمڕانەکانی دیکەش نوویسی و لەگەڵیاندا پەیمانی بەست و بناغەی دۆستی دامەزراند کە هەردەمێک تەنگەتاو و ناچاربوو، پەنایان بۆ ببا و ئەوانیش یارمەتی بدەن.

لەودەمە وەڵام بەدەیسەم درا کە عەلی کوڕی مێشکی بەدەستە لەشکرێکی کەمەوە تەمای چوونەسەر ئەردەوێڵی کردووە. دەیسەم لە بەردەعەوە بۆ شەڕی عەلی کەمەری بەست و گەڕاوە و بەگژیدا چوو؛ هێشتا ئیشی شەڕی دوامینی نەهاتبوو. دەیسەم لە ڕزگاربوونی سالار و یەک قسەی دەیلەمییان لەگەڵ سالاردا هوشیار نەببۆوە. کە دەیسەم نزیک بەئەردەوێڵ بووە جگە لە جوستان کوڕی شەرمەزن کە پیێ پەیمان و قەراری توند ڕاگرتبوو کە کەسێک لە دەیلەمیان لەلای دەیسەم نەمان.

هەموو چوون و گەیشتنە عەلی کوڕی مێشکی. بەڵام کوڕی شەرمەزن هەواداری دەیسەم بوو، لەسەر ئەوە هەرماوە.

لەو شەڕەدا جەستان بەدیل کەوتە دەست دەیلەمیان. دەیسەم و دەستە لەشکرێکی کورد کە هەواداری بوون و دەوڵەت خواهی، ڕوو بەئەرمەنستان هەڵاتن. لەوێ بەربوونی سالار مەرزەبانی بیست کە گەیشتە ئازربایەگان و ئەردەوێڵی گرت و بەسەر هەموو گەنجینە و

دزان و ماڵی دەیسەمدا دەستی کێشا.

سالار لەشکرێکی لەژێر فەرمانی عەلی کوڕی مێشکیدا بەدوای دەیسەمدا ناردە ئەرمەنستان. دەیسەم چونکو لە خۆی ڕانەدەدی بەرامبەریان بکات، ناچار لە ئەرمەنستانەوە چووە مووسڵ و لەوێوە چووە بەغدا (تجارب الامم، سەربهوردی ساڵی ٣٤٣، شهریاران گمنام، کیسرەوی، بەخشی یەکەم، لاپەڕە ٩٦).

سالار مەرزەبان بەسەر هەموو خاکی دەیسەمدا زاڵبوو و ناوی پادشاهی ئازربایەگانی بەخۆیەوە ناوە، هەتا ساڵی ٣٤٦هـ -کە ساڵی مردنیەتی- لەو خاکەدا فەرمانڕەوایی کرد.

## دوامین جار پادشاهی و هەڵاتنی دەیسەم بۆ ئەرمەنستان

هەروەکو گوترا دەیسەم کە هەڵات و چووە ئەرمەنستان کوڕی غاغیق زۆر حورمەتی گرت و لەشکری بۆ کۆکردەوە کە بگەڕێتەوە سەر ئازربایەگان؛ بەڵام چونکو هێزێکی وای نەبوو، ناچار بنە و گەنجینە و دارایییێکی هەیبوو لە ئەرمەنستان بەجیهێشت و هەستا چووە مووسڵ. لەوێوە چووە بەغدا و پەنای بردەبەر خەلیفە و لەگەڵ موعیزودەولە دەیدەنی کرد. لە میوانخانەی موعیزودەولە میوانداری کرا.

موعیزودەولە چونکو سالار مەرزەبان دوژمنی ڕوکنودەولەی برای بوو، بەنەیاری ئەو دەیسەمی زۆر بەئیحترامەوە ڕاگرت. دیاری و پێشکەش و ماڵێکی بێ ژماری دایێ. ساڵی پەنجا هەزار دینار جیرەی بۆ بڕیەوە کە هەتا دەگەڕێتەوە ئازربایەگان گوزەرانی پێ بکات. هەموو جاری قسەی لەگەڵ دەکرد و پێی دەگوت: «ئەبوسالیمی برام». کیسرەوی لە بەخشی یەکەم، لاپەڕە ٩٧دا دەڵێ: ئەبوسالیم کونیەی دەیسەم بوو پێی درابوو.

دەیسەم نزیک ساڵێک لە بەغدا ماوە. «ابن الاثیر» دەڵی: چاوەنۆڕی ئەو پەیمانە بوو کە موعیزودەولە پێ دابوو کە سوپاهی بداتێ و یارمەتی بکات و بگەڕێتەوە سەرخاکی خۆی.

«ابن مسکویە» دەڵێ: دەیسەم هەموو جارێ دەیگوت: «خۆشتر و بەکەیف و شادمانیتر زیندەگانێکی کە کردوومە، ئەو ڕۆژانە بوو کە لە بەغدا پێی دەژیام و ڕامدەبوارد».

دەیسەم چاوی لەوەبوو کە موعیزودەولە یارمەتی بکات و بینێرێتەوە ئازربایەگان کە دیسان لەوێ بەپادشاهی دامەزرێتەوەو خاکی خۆی بگرێتەوە دەست خۆی. بەڵام چونکو ساڵی ٣٤٣ ڕوکنودەولە لەگەڵ سالار مەرزەبان لە «ڕەی» پەیمانی ئاشتی و خۆشیان بەست و کچی مەرزەبانی لە خۆی مارەکرد، بەژنیی بردیە لای خۆی، دەیسەم تێگەیشت کە ئەو ئومێدەی بەموعیزودەولە هەبوو بڕا و موعیزودەولەی پەیمانی خۆی ناباتە سەر. هەستا

دەستووری لە موعیزودەلە خوازت و گەڕاوە چووە مووسڵ کە بەلکەم ناسرودەولە پشتیوانی بکات. لەوێش کە لە ناسرودەولە نائومێد بوو، هەستا چووە حەلەب. لەگەڵ سەیفودەولەی حەمدانی برای ناسرودەولەدا گفتوگۆی کرد. سەیفودەولە زۆر بەحورمەتەوە ڕایگرت. دەیسەم چەندێک لەوێ ماوە.

کوردانی ئازربایەگان کە هەواداران و دەوڵەت خواهەکانی دەیسەم بوون، بەگەرمی قاقەزیان بۆ دەیسەم دەناردو هەواداری خۆیان و دڵخۆشی دانەوەی دەیسەمیان دەنوویسی.

لەودەمانەدا مەرزەبان چووبووە دەربەندی خەزەر لەگەڵ شۆڕش و شەڕی میللەتی ئەو خاکە خەریکبوو. کوردەکانی ئازربایەگان وەڵامیان دا بەدەیسەم و لەوەیان ئاگادارکرد و بۆ گەڕانەوەی ئەو بۆ سەر ئازربایەگان وشیاریان کردەوە.

سەیفودەولە لەوە ئاگادار کرا کە سالار لە گۆشەییێکی ئازربایەگان خەریکی شەڕ و کوژتارە و کەلینە بۆ چوونە سەر ئازربایەگان. ساڵی ٣٤٤ سەیفودەولە لەشکرێکی بۆ دەیسەم ڕێکخست و دەستە لەشکرێک لە کوردانی لەسەر کۆبۆوە. بەو هێزەوە چووە سەر خاکی ئازربایەگان. کوردانی هەدیانی و ڕاوەند و هەزبانی لەشکریان بۆ کۆکردەوە و چوون بەبێ شەڕ خاکی سەلماسیان گرت و بینای حکوومەتیان تێدا دامەزراند و خەریکی کۆشەوە و هێز و پێویست پێکهێنان بوو.

لەودەمەدا سالار مەرزەبان لە شۆڕشی دەربەندی خەزەر ڕزگاربوو و بەسەرکەوتن گەڕابۆوە. کە گەیشتە ئەردەوێڵ لەشکری هەڵگرت و چووە سەر دەیسەم. دەست و پێوەندەکانی دەیسەم دەستیان لەشەڕ بەردا و بوونە لایەنگیری مەرزەبان و دەیسەمیان بەجێهێشت.

دەیسەم ناچار و نائومێد هەڵات ڕوو بەئەرمەنستان ڕۆیی و پەنای بردەبەر دێرنیق ئارجرونی کە دۆستی پێشوو و هەواداری خۆی بوو و لە چوونە مووسڵیدا ماڵ و گەنجینەی لەلای ئەو بەجێهێشت بوو. بەهەموو حورمەت و کەیفەوە پێشوازی دەیسەمی کرد.

مەرزەبان قاقەزی بۆ دێرنیق نوویسی کە دەیسەم بگرێت و بیداتە پیاوانی ئەو کە بیبەنە لای مەرزەبان. دێرنیق ئەو خیانەتەی بەخۆی ڕەوا نەدی و نەیکرد. لەنێوانیدا گەلێک جار هاتووچوون و نوویسراو و گفتوگۆ کرا. دوامین بەمە قەراردرا کە دێرنیق دەیسەم بگری و لە لای خۆی ڕایگرێ.

کە دێرنیق دەیسەمی گرت و خستیە زیندانەوە. مەرزەبان فەرمانێکی سەخت و

هەڕەشەیەکی قورسی بۆ دێرنیق نارد کە دەبێ دەیسەم بەدەستەوە بدات.

دێرنیق کە هیچ چارەی نەما، دەستی لە دامێنی حەمییەت بەردا و پیاوێکی وا گەورە و پادشاییێکی وای گرت و دایە دەست دوژمنانی. کە دەیسەمیان گرت و بردیانە ئازربایەگان و دایانە دەست سالار مەرزەبان، بەبێ ڕەحمی و بەغەداری و ئیستبداد موعامەلەی لەگەڵ کرد و هەردوو چاوی دەیسەمی هەڵقەند و بەکوێری خستیانە زیندانەوە.

«ابن مسکویه» لە جێگایەکدا دەنووسێ: سالار لە دوای کوێرکردن، دەیسەمی کوژت. لە جێگایەکی دیکەدا دەڵێ: ساڵی ٤٢٦ لە دوای مردنی سالار، خوێشانی سالار چوون لە زیندان دەیسەمیان کوژت، تاکو شۆڕش هەڵنایسێت. «ابن الاثیر» دەڵێ: لە دوای مردنی مەرزەبان، دەیلەمییان چوون لە زینداندا کوژتیان.

کیسرەوی لە بەخشی یەکەم «شهریاران گمنام» و لەلاپەڕە ٩٨دا ئەم قسانەی خوارەوەی دەیسەم لە محەمەد بن زەکەریای قەزوینی دەگێڕێتەوە کە لە کتێبی «عجائب المخلوقات»دا کە ناوی چۆمی ئاراس دەبا، لە زمان دەیسەمی دەنووسێ و دەڵێ: دەیسەمی کوڕی ئیبراهیم خاوەند و پادشای ئازربایەگان گوتی من لەگەڵ لەشکر و سوپای خۆم بەسەر پردی ئاراس تێدەپەڕین. کە گەیشتە نێوەڕاستی پردەکە، ژنێک هاتە بەرچاوم منداڵێکی لە باوەش خۆی گرتبوو، لەناکاو ئێسترێک لوشکەی لەو ژنەدا و لە پردێ فڕێیدایە خوارەوە. منداڵەکەی لە باوەشی پەڕی، چونکو لەو سەر پردەوە تا ئاوەکە نێوانی زۆرە، درەنگ گەیشتە ئاوەکە، جارێک نقووم بوو و سەرکەوتەوە و ڕزگاربوو. لەو بەردانەی لەنێو چۆمی دابوون تووشی ئێشوژانێک نەبوو. لەو نێوانەدا هەڵۆیەک لەو هەڵۆیانەی کە زۆر بەپری لە کەنار چۆمی لە بەرد و شاخەکاندا هێلانەیان کردووە، چوو منداڵەکەی لەسەر ئاو هەڵگرت و ڕفاندی ڕوو بەهێلانەی خۆی؛ منیش دەستە پیاوێکم بەدوایدا نارد. لە دەشت و چۆڵێک هەڵۆکە دێتەخوارەوە دەسڕازەی منداڵەکە دەپچڕێ و پیاوەکان دەگەنە سەری لێی لە هەڵلا دەدەن. هەڵۆ دەستی لە منداڵ بەردا و فڕی و چوو، ئەوانیش کە گەیشتنە منداڵەکە تەماشایان کرد زندووبوو دەگریا. هەڵیان گرت و هێنایانەوە و دایانەوە بەدایکی خۆی.

## حوکمڕانانی خۆجێی ئازربایەگان لە دەوری دەیسەمدا

لیستەیێکی کیسرەوی لە بەخشی یەکەم، «شهریاران گمنام» لاپەڕە ١٠٢ - ١٠٦یدا لێیان دواوە. ١٣ کەس بوون کە لە داهاتوودا ئێمە بەکورتی باسیان دەکەین. هەر

کامێکیان کوردبوون ناویان بەکورد دەبەین. کە کیسرەوی لە «ابن حوقل» و «مروج الذهب» و هی دیکەی وەریگرتووە.

١- شروان شاه ئەحمەد کوڕی محەمەد ئەوەیان لە گەورەتری پادشایان ئەو جێگایانە داناوە. سالّی ٣٣٢ بەگەورەتری پادشای کێوانی قەوقاز (قفقاز)یان هێناوەتە ژمارەوە. جگە لە شێروان بەسەر ئاران و خاکی موغاندا زالّبوو.

٢- ئەبو عەبدولمەلیک خاوەند شەکی: گۆیا ئەم پیاوە لەو بنەمالّە بووە کە لەسەر دەربەند فەرمانڕەوایییان هەبووە. ئەوە تا سالّی ٣٢٧ پادشایی کردووە. لە دوای عەبدولمەلیک کوڕی ئەو ئەحمەد بۆتە جێنشین. گۆیا لەنێوانی ٤٠ سالّدا ٥ جار لە پادشاهی کەوتەوە و دووبارە گەڕاوەتەوە سەرتەخت. بەلاّم لە مێژوونوویسەکان ئاشکرا نییە کە ئەم ئەحمەدە بۆ خۆی عەبدولمەلیک بووە، یا کوڕی عەبدولمەلیک بووە.

٣- سنخارب خاوەندی[ ؟] گۆیا ئەم ناوە هی بنەمالّەی حوکمڕانێکی ئەرمەنییانە. مێژوونوویسەکان بە«صناری» ناویان بردوون. «صنار»یان کۆمەلّەیێکی ناسراو بوون، لەسەر دینی عیسایی بوون.

٤- خاوەندی جرزان گورجستانە. بەزمانی پێشووی ئاریانی بەو میللەتەیان گوتون «وراج» و بەخاکی نیشتمانی ئەوانیان گوتووە «وراچان» بەدەستووری زاندرا و گرچان یا گرژان بووە کە لە پاشان بۆتە گورجان و جرزان.

٥- سغیان کوڕی مووسا: موسا یا مووسس ناو لەو دەورەدا لە «ئۆدی» و لە دەوروپشتی ئاران دانیشتووە

٦- ئەبولقاسم ویزۆری خاوەندی ویزۆر: نەزاندراوە کە ئەو خاکە لەکوێ بووە و سەربهوردیشی نادیارە.

٧- ئەبولهەیجا ڕاوەندی کوردە و ئەم ئەبولهەیجایە بنەچەکەی ساریانی دەرخست و لایبرد و بەسەر هەموو خاکی ئازربایەگاندا پادشایی کرد. لە هاتوودا باسی دەکەین کە ناوی ئەو حوسێن بووە و لەو دەورەدا لەسەر خاکی ئەهرو رزقان (خووی، سەلماس) فەرمانڕەوابوو.

٨- ئەبولقاسم خیزانی: کوردە و خیزان شارێکە ئەمڕۆش بەو ناوەوە لە نێوانی بەدلیس و وان دایە. شەرەفنامە حاکمانی ئەو خیزانە[لە] تالانی (١٠٠٥ھ) باس دەکا. ئەگەرچی خیزانییان بەخاکی ئاران داناوە، بەلاّم دەبێ نەیانزانیبێ. خیزان ئەرمەنستان

بووه نەک ئاران؛ چونکو نزیک (وەستان) بووە.

٩- کوڕانی دێرانی: خانەدانی ئارجرونی کە لە «وان» و «وەسطان» تا نزیک نەخچەوان حوکمڕانییان دەکرد، فەرمانڕەوایانی ئەو بنەماڵە کە لەودەمەدا ناویان هەبووە. هەروەکو لە سەربهوردی دەیسەمدا لێی دواوین. دێرنیق کوڕی غاغیق (خاچیک) و برای ئەو هامازاسپ کە کونیەی ئەبوسەهل و مێژوونوویسەکان بە«حەمزە» ناویان بردووە لە هێندێک جێگایان دا فەرمانڕەوایی هەبووە.

١٠- کوڕانی سەنباد: خانەدانی باگراتونی بوون. لە دوامینی قەڕنی سێیەمی هیجرییەوە بناغەی فەرمانڕەواییان دامەزراند بوو و گەورەترین پادشایانی ئەرمەنستان بوون. سەنباد دووەمین پادشای ئەم بنەماڵەیەیە. لەگەڵ یووسف ئەبی ساج شەڕی کرد و لەوەپێش لەگەڵ محەمەد ئەبی ساجدا گیروگرفتیان زۆر بوو. لە دوامیندا بەدەست یووسف گورفتار و نابوود بوو. لەبەرئەوە ناوبانگی کرد و ئەو بنەماڵە بەکوڕانی سنباد ناودەبرێن.

لە ساڵی ٣٤٤دا پێشەوا و گەورەترینی پادشای ئەو بنەماڵەیە «ئاشوود»ی سێیەم کوڕی «ئاباس» بوو. ئاباس دوو ساڵ لەوەپێش مردبوو دوو کوڕی لەپاش بەجێمابوو: «ئاشوود و مووشیغ». ئاشوود گەورەتر بوو کرا بەجێنشینی بابی. لەپاش حەوت ساڵ ئاشوود لە شاری ئانی و مووشیغ لە شاری قارس لەسەرتەخت دانیشتوون. ئەو بنەماڵەیە لێرەبوون بەدوو بەرەباب.

١١- جەعفەر کوڕی شکۆیە: کوردی هەدیانی لەلای سەلماس و بەسەر خاکێکدا حوکمڕان بوو؛ وەکو لە پێشدا گوترا.

١٢- سناخریب: خاوەندی خاچین. خاچین ناوی دز (قەڵا)یەک بوو لە ئارچاخ (قەرەباغی ئێستا). سناخریب یا سنگریم و فەرمانڕەوایانی دیکەشیان هەبوون.

١٣- سالار مەرزەبان دەیلەمی: کە بەرهەڵست و دوژمنی کورد و دەیسەم بوو - وەکو سەربهوردی بێژرا - لە ساڵی ٣٣٠ دوامینیدا بەسەر خاکی ئازربایەگاندا زاڵبوو و شەش ساڵ بەئەسارەت و دەربەدەری و دە ساڵ بەپادشای ئازربایەگان ڕایبوارد. ساڵی (٣٤٦) مانگی ڕەمەزان بەنەخۆشی مرد و کوڕی ئەو جەستان و ئیبراهیم و ناسر و کەیخوسرەوی لە دوادا بەجێمان. هەروەکو لە هاتوودا باسی کوڕانی سالار دێتە گوتن.

## ئازربایەگان لەپاش دەیسەم

## حوکمڕانی کوڕانی سالاری دەیلەمی

کە مەرزەبان مرد، نێوانی وەهسودانی برای مەرزەبان و کوڕانی سالار مەرزەبان تێکچوو. لەسەر میراتی سالار دەمیان تێکنا. چونکو سالار لە پێش مردنیدا وەسیەتی کردبوو بەپەنهانی دزدارەکانی تێگەیاندبوو، جەستانی کوڕی جێنشینە. بەئاشکراش ئەنگوستەویلەی خۆی دابوو بەوەهسودانی برای کە پاش مردنی سالار ئەو جێگیر بێ. لەسەر ئەوە تێکچوون و وەهسودان هەڵات و چووە تارم و جەستان بوو بەپادشای ئازربایەگان.

زۆری پێنەچوو کوڕانی سالار بەفەسادی مامیان و بەدڕەوشتی خۆیان ڕوویان لە بەراوەژووی کرد. لە لایێکەوە جەستانی کوڕی شەرمەزن بەسەر لایێکی خاکیدا زاڵبوو و لە لای دیکەیەوە مامی خراپی دەکردن.

لەو نێوانەشدا کوردان کەلێنیان دەستخستبوو، هەریەک لە جێگای خۆی بڵندببوون. لەلایێکیشەوە ئەبو عەبدوڵڵا نەعیمی کە وەزیری جەستان بوو، لە پشێوی ئیشوکاری جەستانی کوڕی سالار و گەورەبوونی جەستانی کوڕی شەرمەزن دەگەڕا.

لەودەمەدا ئیبراهیمی کوڕی سالار لەسەر ئەرمەنستان بوو. ئەبو عەبدوڵڵا قاقەزی بۆ نارد و ڕووبەڕووی براکانی هانیدا. جەستانی کوڕی شەرمەزن کە لەسەر ورمێ بوو کردیە هاودەنگی و پێکەوە لینگیاندا سەر خاکی مەراغە و گرتیان.

جەستانی کوڕی سالار لەبەردەعە بوو؛ گەڕاوە ئەردەوێڵ و قاقەزی لە ئیبراهیم برای خۆی و کوڕی شەرمەزن نوویسی و قاقەزی بۆ نەعیمی نوویسی و نوازشی کردن.

کوڕی شەرمەزن گەڕاوە ورمێ و لەگەڵ نەعیمی دەستیان لە ئیبراهیم بەردا. ئیبراهیم تێگەیشت کە فریو درا هەستا گەڕاوە ئەرمەنستان (ئاران).

کوڕی شەرمەزن و نەعیمی شاری ورمێیان توند کرد و باروویان تازەکردەوە و قەڵایان لێ بیناکرد و پڕیان کرد لە چەک و پێویست. ئەوجا ڕوویان لە هەردوو براکان یەعنی: جەستان و ئیبراهیم کوڕانی سالار وەرگێڕا و هیچیان نەناسین.

جەستان و ئیبراهیم کوڕانی سالار تێگەیشتن فریوی دوژمنیان خواردووە پێکهاتنەوە. تەمای چوونە سەر کوڕی شەرمەزنیان کرد، لەودەمەدا لە گەیلان موستەجیربیللای عەباسی

پەیدابوو ڕووو بەئازربایەگان چووە خاکی موغان. نزیک ۵۰۰ کەسی پێ بوو. لە ورمێوە گەلێکی چوونە لا، کاری موستەجیر بەرزبوو. سوپەهسالاری لەشکری دا بەجەستان کوڕی شەرمەزن.

جەستان و ئیبراهیم کوڕانی سالار لەشکریان برد و چوونە موغان و لینگیاندا سەر موستەجیر و شەڕیان دەست پێ کرد. لەشکری کوڕی شەرمەزن شکا و گەلێکی کوژتار لێ کرا و هەڵات چووە ورمێ. بەڵام موستەجیر لە دەست کوڕانی سالاردا گورفتار بوو و مرد. کوڕانی سالار بەشادمانی گەڕانەوە.

بەڵام وەهسودان مامی کوڕانی سالار، لە خراپی ڕانەوەستا. ئەوجار ناسر برای جەستان کوڕی سالاری لە برای خرۆشاند. جەستان لە ئەردەوێڵ دەرکەوت و چووە «دز نیر». ناسر ئەردەویلی کە گرت، چوو دەورەی ئەو دزەی دا. بەڵام زۆری پێ نەچوو لە فڕوفێڵی وەهسودان ئاگاداربوو، بەئیحترامەوە پەیمانی بەجەستان برای دا لە قەڵای دەرخست، بەشادمانی هەردوو گەڕانەوە ئەردەوێڵ.

لەبەر نەبوونی پوول و دانەوێڵە و پێویستی لەشکر هەردوو برا تەنگەتاو بوون؛ دایکیان هەڵگرت و چوونە تارم و پەنایان بۆ مامیان برد کە دەستیان بگرێ. ئەویش زۆر بەسووکی و بەدنامی هەرسێکی گرتن و خستنیە زیندانەوە. لەشکر و پیاوانی لەگەڵیان بوون کردنیە هەواداری خۆی و ئیسماعیلی کوڕی خۆی کردە پادشای ئازربایەگان و کوڕی شەرمەزن بەلەشکریەوە خوازت و کردیە سوپەهسالار.

ساڵی ۳۵۰ ئیبراهیم کوڕی سالار لە ئەرمەنستانەوە چووە مەراغە، بۆ شەڕی ئیسماعیل لەشکری هەڵگرت. وەهسودان لە تارم کە ئەوەی بیست، جەستان و ناسر و دایکی ئەوانی هەرسێ کوژتن و ئەوەی لەگەڵیان لە ئازربایەگانەوە چووبوون، کوژتنی. لەدوای ئەوە قاقەزێکی بۆ جەستان کوڕی شەرمەزن و حوسێن کوردی ڕاوەندی (ئەبولهەیجا) -کە ناوی دێتەگوتن- نوویسی بۆچوونە سەر ئیبراهیم هانی دان و یارمەتیشی بۆ ناردن و بۆ ئیسماعیل کوڕی خۆشی نوویسی لەئەردەوێڵەوە بچێتە سەر ئیبراهیم تاپووچی بکاتەوە.

ساڵی ۳۵۲ ئیبراهیم وردبۆوە کە بەرامبەری ئەو هەموو دوژمنەی پێ ناکرێ لە مەراغەوە ڕووو بەجێگای خۆی هەڵات. کوڕی شەرمەزن گەیشتە مەراغە و بنە وماڵی ئیبراهیمی تاڵان کرد و شاری مەراغەشی گرت.

ئیبراهیم لەشکری کۆکردەوە کە بچێتەسەر ئیساعیل. ساڵی ۳۵۳ لەناکاو ئیسماعیل

کوڕی وەهسوودان مرد. ئیبراهیم کەلێنی لە دەست نەدا و لینگی دا سەر ئەردەوێل و گرتی. شەرمەزن کوڕی مێشکی نەیتوانی خۆی بگرێ ڕوو بەتارم هەلات. ئیبراهیم بەلەشکرەوە چووە سەر تارم. وەهسوودان بۆ دەیلەمان هەلات. ئیبراهیم تارمی گرت و لە خراپی وێرانکردن ڕانەوەستا، لەپاشان گەڕاوە ئازربایەگان.

وەهسوودان لەشکری کۆکردەوە و لەگەڵ شەرمەزندا ناردیە سەر ئازربایەگان. چەند جار لەگەڵ ئیبراهیمدا شەڕ و کوژتاری کرد. لە دوامیندا ئیبراهیم هەلات، تەنیا سوارە گەیشتە «ڕەی» و پەنای بردەبەر ڕوکنودەولەی بوەویە.

ڕوکنودەولە کچی سالار مەرزەبانی لەپالدا بوو زۆر حورمەتی ئیبراهیمی گرت. لەو سالەدا لە «ڕەی» شەڕێک ڕوویدا؛ ئیبراهیم زۆر بەچالاکی هونەری نواند. سالی ٣٥٥ بوو ئیبراهیم یارمەتی درایێ و ڕوکنودەولە لەشکرێکی لەژێر فەرمانی وەزیر «ئیبن عەمید مەعرووف»دا لەگەڵ ناردە سەر ئازربایەگان و لەسەرتەختی حوکمڕانی ئازربایەگانی داناوە. بەلام نەزاندراوە لە دوای هەلاتنی ئیبراهیم ئازربایەگان لەژێر فەرمانی پیاوانی وەهسودان بوودا یا نا؟ چونکو کەسێک پێشی بەئیبراهیم نەگرتووە. کیسرەوی لە بەخشی یەکەم، «شهریاران گمنام» لاپەڕە ١١٧دا دەلێ: فەرمانڕەوایانی خۆجێیی سەرانی کوردان و جەستان و شەرمەزن بەقسەی ئیبن عەمید، سەریان بۆ فەرمانی ئیبراهیم چەماند. لە دوای ئەوە ئیبن عەمید کە ئازربایەگانی بۆ دامەزراندەوە، گەڕاوە «ڕەی».

بەپێی ئەوە کە کتێبەکانی مێژوو لێی دواون، لەمە پتر لە سەربهوردی ئیبراهیم چتێک لە دەستدا نییە، بەلام لە دوای ئیبراهیم ئەبولهەیجای کوڕی ئەو، چەندێک بەحوکمڕانی ڕاییبواردووە وەکو باسی دەکەم.

لە سەربهوردی سالار و کوڕانی سالار دواین، بەلام حکوومەتی ئازربایەگان بەڕاستی بۆ ئەوانە ساغ نەبیوە. کوردەکان بەگەرمی لە بەرامبەری ئەوانە ڕادەوەستان و سەریان بۆ فەرمانیان نەدەچەماند. هەروەکو «ابن مسکویە» لە بابەت چوونی ئیبن عەمید بۆ یارمەتی ئیبراهیم و گەڕانەوەی بۆ «ڕەی» لە زمانی ئیبن عەمید وەردەگرێ کە لەودەمەدا لە «ڕەی» بووە و لەگەڵ ئیبن عەمید گفتوگۆی کردووە. لە هێزی خاک و پیت و بەرەکەتی کردار و دەستەلاتی کوردان لە خاکی ئازربایەگاندا دواوە.

«ابن مسکویە» دەلێ: ئوستاد ڕەئیس «ئیبن عەمید» لە پێش هەموو چتێکدا لەوە ترسی هەبوو کە دوای گەڕانەوەی لە ئازربایەگان بۆ ڕەی، شارێک لەو خاکە لە دەست

ئیبراهیمدا نەمینێت. کورد هەموو خاکی ئازربایەگانیان گرتبوو و بەسەر هەموویاندا زاڵ ببوون.

«ابن مسکویە»» دەڵێ: گفتوگۆیەکانی ئوستاز ئیبن عەمید وەکو وەحیی ئاسمانی کە کەمێکیش بەختا نەچوو، لە دوای گەڕانەوەیان لە ئازربایەگان حاڵی ئیبراهیم کە ڕوو بەچاکی چووبوو و مەملەکەتی کەوتبووە نەزم و ڕێکییەکەوە. زۆر نەچوو هی دیکە تەمایان لەو خاکە کرد و گرتیان.

کیسرەوی لە بەخشی یێکەمی «شهریاران گمنام» و لە لاپەڕەی ۱۲۱ لە نوویسینی «ابن مسکویە» دواوە کە لە زمانی ئوستاد ئیبن عەمیدیان وەرگرتووە دەنوویسێ کە لە نوویسراوەکانی «ابن مسکویە» و لەو قسانەی کە لە زمانی ئیبن عەمید دەگێڕێتەوە، ئەم مەتڵەبە گەلێک جاران دووبارەی کردۆتەوە کە: کوردان لە ئازربایەگاندا گەلێک زۆر و بەدەستەڵات و چیرەبوون. عیبارەتی فارسییەکەی کیسرەوی بۆ موستەنەداتی تەئریخی ئەمەی هاتووە: «در نوشتەهای ابن مسکویە و در نقلهائی کە او از زبان ابن عمید می کند، این مطلب تکرار شدە کە کوردان در ازربایەگان فراوان و چیرە بودند». هەر لە دوای ئەو عیبارەتە کیسرەوی بۆ خۆی دەڵێ کە: زۆری و فراوانی کوردان لە ئازربایەگاندا لە هەموو دەورێکدا هەر هەبووە (فراوانی کوردان در آزربایەگان درهر دورە بودە است).

لێرەدا بەو قسانە وامان بۆ دیار دەکرێ کە کورد لە خاکی ئازربایەگاندا بەهێز و دەستەڵات و زۆر و زۆردار بوون و لەودەمەشدا ئەبولهەیجا حوسێن -کە لەپێشدا ناوی گوترا- لە ڕۆژاوای ئازربایەگان، بناغەی حوکمداری دامەزراندبوو و کوردەکانی لەژێر ئالای خۆیدا کۆکردبوونەوە. ئیبن عەمید و مسکەویە کە چووبوونە ئازربایەگان، ئەبولهەیجا حوسێن بەفەرمانڕەوای «ئەهرو و زرقان»یان دی بوو.

«ابن مسکویە» لەو حوسێن ڕاوەندی (ڕاوادی) خاوەندی ئەهر و زرقان دواوە و بەبێ لێکدانەوە «ابن مسکویە» و «ابن عمید» ئەو حوسێن خاوەندی ئەهر و زرقانیان بەکورد ناوبردووە.

بەبێ شک حوسێن ئەبولهەیجا کورد بووە کە ئەو دوو گەورەی تەئریخ نوویس بەکوردیان داناوە کە بۆ خۆشیان چاویان پێکەوتووە و چوونەلای و بۆ فەرمانبەری ئیبراهیم، نوازشیان کردووە (هەروەکو گوترا).

کیسرەوی دەڵێ گۆیا «ئیبن عەمید» و «ئیبن مسکەویە» دیسان دووچار بەئیشتیباه

بوون کە ئەبولهەیجایان بەکورد داناوە و مەقسوودی هەردووکیان چیرەگی و دەستەڵاتی و گەورەبوونی ئەوە؛ چونکو ئەبولهەیجا لە پاش گرفتاری ئیبراهیم لە جێی ئەو بۆتە پادشای ئازربایەگان و لە دەوری ئیبراهیمیش دا بەهێز و زۆرداربووە. بەڵکەم گرفتاری ئیبراهیم هەر بەدەست ئەو بووە. عیبارەتی فارسییەکەی کیسرەوی ئەمەیە: «گویا ابن عمید وابن مسکویه نیز دچار اشتباه معروف گردیده‌اند ابوالهیجارا کرد می پنداشته‌اند و مقصود هردوو چیرگی اوست. زیرا ابوالهیجا کە پس ازدستگیری ابراهیم بەجای او، پادشاه آزربایگان می شود، معلوم است کە در زمانی ابراهیم نیز چیره و زورمند بوده‌است، بلکه بایدگفت کە گرفتن و بندکردن ابراهیم جز بەدست او نبوده است».

لێرەدا ئێمە کە لێی ورد دەبینەوە، زۆرجوان و ئاشکرا بۆمان دیار دەکرێ و لەو سەربهوردانەی بنەماڵەی سالار و کردەوەکانیان ڕادەبینین و باش تێدەگەین کە ئەودەمە ئازربایەگان سەرانسەر کورد و خاکی ئازربایەگان هەموو لەژێر دەستی کورداندا بووە. کیسرەوی لە بەخشی یێکەم، لاپەڕە ١١٧یدا کە دەڵێ: خولاسەی ئەو شەرحانە ئەمەیە کە ئوستاز ڕەئیس «ابن عمید» چووە ئازربایەگان و لە مالیاتی ئەو خاکە دواوە... گوتوویە: بەڵام ماڵێک کە لە ئازربایەگان دەگاتە ئیبراهیم گەلێک کەمە. بۆچی؟ چونکو ئیبراهیم بەتەن ئاسایی و خۆشی لە لای ژنان دەژی و هیچ دەمێک ناپەرژێتە سەر نەزم و سامانی وڵات و کوردان کە بەسەر هەموو گۆشەیێکی وڵاتدا دەستیان هەیە و بەدەستەڵاتن، هەریەک لەوانە بۆ خۆیان ماڵیات وەردەگرن. فارسییەکەی جوملەی باسی کوردی ئەمەیە: «چە ابراهیم باتن آسائی و خوشی پیش زنهازیستە، هرگز بەنظم و سامان ولایت نمی پرداخت و کردان کە بەگوشه‌های ولایت دست یافته بوده‌اند، هرکدام برای خود مالیات می گرفت».

ئیبن عەمید پیاوێکی چاترین زانا و گەورەترین وەزیر بووە و «ابن مسکویه» تەئریخ نوویسی بەناوبانگ کە لە دەستەڵات و هێزی کورد لە ئازربایەگاندا دواون و حوسێن کوڕی محەمەد ڕاوەندی (ڕاوادی)یان بەکورد باسکردووە، زۆرباش ئەمە ئیسپات دەکا کە: کورد سەریان بۆ دەیلەم نەچەماندووە و لەگەڵ ئازادی خۆیان خەریکبوون. هەرکە سالار مەرزەبان مردووە، زوو ئەبولهەیجا حوسێن جێی دەیسەمی گرتۆتەوە و حکوومەتی دامەزراندوە و لەسەر هەموو خاکی ئازربایەگان بوو بەپادشا، وەکو لە فەسڵی سێیەمدا دێتە گوتن.

لە سەربهوردی ئیبراهیمدا دوو چتمان بۆ ئاشکرا دەبێ: یەکەمیان ئەمەیە سەرکەش و فەرمانڕەواکانی کورد زۆردارتر بوون لە دەوری ئەودا هێز و تەواناییان پتر کردووە و بەسەر

دەیلەمیاندا زاڵبوون لە دوامیندا ئیبراهیمیان گرتووە و لە دزێکدا خستوویانەتە زیندانەوە و بۆ خۆیان بەسەر خاکی خۆیاندا بوون بەپادشا.

دووەمیش سەربهوردی ئیبراهیم و هەتا ساڵی ٣٦٩ زیندوومانی ئەوە کە بەتەن ئاسایی لەگەڵ ژن و کەیف بەسەری بردووە، نەک وەکو سالار مەرزەبان بەمەیدانداری و شەڕ.

لە دوامینی بنەماڵەی سالاریان ئەبولهەیجا کوڕی ئەم ئیبراهیمە بووە لەسەر دوین ماوە و چۆتە یاریدەدانی مووشیغ خاوەندی قارس -کە لەوەپێش ناوی بێژرا- لەگەڵ سنباد کوڕی ئاشوود کوڕی ئاباس نێوانی تێکچوو. ساڵی ٣٦٧ داوای یارمەتی لە ئەبولهەیجا کوڕی ئیبراهیم سالار کردووە و لە پاشان ساڵی ٣٧٠ یا ٣٧١ هەموو موڵکی لە دەست چووە. گۆیا هەتا ساڵی (٣٧٢) مانگی شەوال زندووبووە. (کیسرەوی، شهریاران گمنام، بەخشی یەکەم، لاپەڕە ١٢١ - ١٢٢ - ١٢٣).

## سالار ئیبراهیم

## کوڕی مەرزەبان کوڕی ئیسماعیل کوڕی وەهسودان

ئەم سالار ئیبراهیمە نەوەی ئەو ئیسماعیلەیە کە وەهسوودانی بابی لە تارم ناردیە ئەردەوێڵ و کردیە پادشای ئازربایەگان لە جێگای کوڕانی سالار مەرزەبان کە ناسر و جەستان بوو داینا. هەروەکو لە سەربهوردیاندا باس کراوە کە ساڵی ٣٤٩ بوو بەپادشا و بەمەرگی خۆی مرد. بەڵام لە مەرزەبان کوڕی وەهسوودان کە بابی ئەم ئیبراهیمەیە ئاگادارنین و ئەمانەش بەبنەماڵەی دەیلەمیانی گنگریان ناودەبرێن نەک «سالاریان».

بەڵام کوڕانی وەهسوودان چونکو برازای سالار مەرزەبان بوون، هەر بەسالاریان ناوبراون و سەربهوردی ئەم ئیبراهیمی کوڕی مەرزەبانیش ئاگاداری لە دەستدا نییە، هەر هێند «ابن الاثیر» لە ڕیزی ساڵی سەربهوردی فەخرودەولەی بووەیەدا ساڵی ٣٨٧ لەم ئیبراهیمە دواوە کە بەسەر خاکی زەنگان و ئەبهەر و سەهرەوەردا دەستەڵاتی بووە. قەڵا بەناوبانگەکانی ئیبراهیم دزی «سەر جیهان» یەعنی لە خاکی موکریاندا ساین قەڵای ئەمڕۆ کە بووە.

کیسرەوی لە بەخشی یەکەمی «شهریاران گمنام» لاپەڕە ٥٠یدا دەڵێ: دزی سەرجیهان لە نزیک ساین قەڵای ئێستادا لە خەمسە بووە (یکی از دز های معروف او «سرجهان» بود، در نزدیکی ساین قلعەی کنونی در خمسە). چونکو ئەم سالار ئیبراهیم دەیلەمییە بەسەر هێندێک خاکی کوردستانی موکریاندا زاڵبووە. دەمەوێ هەرچەند سەربهوردێکە

دەستم کەوتبێ لێی بدوێم.

«ابن الاثیر» ساڵی ٤٢٠ باسی نەکردووە کە ئیبراهیم سالار چی کردووە، بەڵام مستەوفی لە «نزهة القلوب» دا کەمێک لە شەڕی ئەو قەزوینیانە دواوە و دەڵێ: لەبەر شەڕ بارووی قەزوین خراپکرا، بەڵام لەو ساڵەدا مەحموودِ غەزنەوی چووبووە «ڕەی» و مەجدودەولەی گرتبوو.

«ابن الاثیر» دەڵێ: کوڕی ئەو مەسعوودە بەسەر خاکی زەنگان و ئەبهەردا زاڵبوو، لە دوای گەڕانەوەی سوڵتان مەحموود لە «ڕەی»یەوە بۆ خوڕاسان لە نێوانی سالار ئیبراهیم و مەسعووددا شەڕ و کوژتار ڕوویداوە و ئیبراهیم لە دەست مەسعوود گرفتار بووە و بەدیل چووە.

«ابن الاثیر» ئەو سەربهوردەی دووروودرێژ نووسیوەتەوە. ئێمە ئەم سەربهوردە لە «ابن الاثیر» و کیسرەوی و بەیهەقی وەردەگرین کە لەم جێگایەدا دەینووسمەوە و بەکورتی لێی دەدوێم:

یەمینودەولە سوڵتان مەحموودی کوڕی سەبوکتەگین کە «ڕەی» گرت و خستیە ژێر فەرمانی خۆیەوە، مەرزەبان کوڕی حەسەنی خرِ ئەمیل -کە یەکێک بوو لە شازادەکانی دەیلەم- پەنای بۆ سوڵتان مەحموود بردبوو. مەحموود بۆ چوونەسەر خاکی سالار ئیبراهیم لەشکری دایە و بەڕێی کرد کە ئەو خاکە لە سالار بگرێ.

مەرزەبان هەستا چووە سەر سالار و هێندێک لە دەیلەمییان، چوونەلای و لەودەمەشدا مەحموود ڕوو بەخوڕاسان گەڕاوە. سالار لینگیدا سەر قەزوین و لەگەڵ ئەو لەشکرە کە یەمینودەولە لەوێ دانابوو، شەڕی کرد. خەڵکی شار یارمەتی سالاریاندا. خەڵکێکی زۆر لە سوپاهی یەمینودەولە کوژرا و هی ماوی تەنگەتاوکران و هەڵاتن. لە دوای ئەوە سالار چوو پەنای بردە ئەو کێوان و چۆمانە کە لە نزیک سەر جیهاندا هەڵکەوتبوون (دەوروپشتی چۆمی چەختوو).

مەسعوود کوڕی سوڵتان مەحموود لە «ڕەی» کە ئەو وەڵامەی پێدرا، بەتالووکە هەڵمەتی بردەسەر سالار. لەنێوانی هەردوولادا گەلێک شەڕ و کوژتاری چەندجارە ڕوویدا و لە هەمووواندا سەرکەوتن لەلایەن سالارەوە بوو.

بەڵام مەسعوود ڕێگای فڕوفێڵی گرت. کۆمەڵەیەکی لە سوپاهیانی سالاری هەڵخەڵەتاندن، ماڵ و دراوی بۆ ناردن، ئەوانیش لە هەموو چتی پەنهانی سالار

مەسعوودیان ئاگادار کرد و دەستە لەشکرێکی مەسعوودیان لە ڕێگاییێکی ناشارەزاوە بردە پشت سەری سالار. ڕۆژی یەکەمی ڕەمەزان ئەو دەستە لەشکرە لە پشتەوە و مەسعوود لە پێشەوە بۆ سالار چوون و هەڵمەتیان برد.

سالار بەوە سەری لێ شێوا و ڕووی لە هەڵاتن کرد. لەشکرەکەشی هەر یەک بەلایەکدا هەڵاتن و بڵاوەیان کرد. سالار بۆ خۆشی لە جێگاییێک پەنهان بوو. ژنە لادێییەک جێگای ئەوی بەمەسعوود نیشاندا. مەسعوود پیاوانی نارد و گرتیان. لەگەڵ خۆیدا بردیە دزی (قەڵا) سەر جیهان کە لە دەست کوڕی سالاردا بوو؛ لێی خوازت دز بەدەستەوە بدات، ئەویش نەیدا. مەسعوود هەموو دزەکانی سالاری گرت و ماڵ و دارایی سالاری هەموو تالانکرد. لەسەر کوڕی سالار کە لەسەر جیهان بوو، هەروا لەسەر گەورەکانی کورد کە لەو نزیکانە بوون، خەرجێکی دانا کە سالانە بیدەنە گەنجینەی مەسعوود.

کیسرەوی لە بەخشی یەکەم و لاپەڕە ٥١دا دەڵێ: «مسعود دزهای دیگر و سراسر خاک سالار را بامال هایش تصرف نموده برپسر او درسرجهان و بر بزرگان کردان -که در آن نزدیک ها بودند- مالی قرار داد، که سالانه بپردازند».

ئەو قسەی کیسرەوی زۆرچاک بۆمان ئاشکرا دەکا کە لەودەمەدا گۆشەیەکی کوردستانی موکریان کەوتۆتە دەست سالار و هەموو خاکی موکریان سەرانسەر کوردی تێدا بووە و ئەو کوردانە خاوەند دەستەڵات بوون. کە مەسعوود وەکو خەرجی لەسەر کوڕی سالار دانا بەو جۆرەش لەسەر گەورەکانی کوردی داناوە کە لە نزیک سەر جیهان گەورەبوون. لێرەدا کەوا ئەهەمییەتێکیان پێدراوە دیار دەکرێ کە هەریەک لەوانە دارای مولک و خاک و میللەت بوون کە وەکو کوڕی سالاریان داناون و لە ڕێزی پایەی ئەویان هێناونەتە ئەژمارەوە. دیارە شەڕی کوڕی مەحموود لەگەڵ سالاردا گەلێک جار بووە هەتا شکاندوویە. لە عیبارەتێکی کیسرەوی لە بەیهەقی دەگێڕێتەوە کە دەڵێ: لە زستانێکدا چەند ئارەزوو گەیینە جێ؛ وەکو: شەڕ لەسەرجیهان و گرتنی سالاری تارم و لە کوڕی کاکۆ دان و سوپاهان گرتن. «دریک زمستان بسیار مراد بەحاصل آمد چون جنگ بەسر جهان و گرفتن سالار طارم و پس از آن زدن پسر کاکو و گرفتن سپاهان». لە دوای ئیبراهیم، سالاری کوڕی بۆتە فەرمانڕەوا. کیسرەوی (شهریاران گمنام) و ناسر خوسرەوی بەدرێژی لە بنەماڵەی دەیلەمیانی کونگریان و سالاریان دواون.

## فەسڵی سێیەم

## ئەبولهەیجا حوسێن کوڕی محەمەد

## کوردی ڕاوادیان

لە فەسڵی دووەمی ئەم بەندەدا بەکورتی لە ئەبولهەیجای کوردی ڕاوەندییە دواوین کە لە دەوری مەرزەبان سالاری دەیلەمیدا لەسەر خاکی ئەهر و زرقان فەرمانڕەواییێکی کورد بووە و لە چووینی «ابن عمید» و «ابن مسکویه» بۆ ئازربایەگان دیسان لێی دواوین و دووبارە کردنەوەی جوان نییە؛ بۆیێ لێی نادوێمەوە.

«ابن حوقل» لە ڕیزی ساڵی ٣٤٤دا نوویسیویە کە ئەبولهەیجا خاوەندی ئەهر و زرقان بوو. هەر ساڵەی پەنجا هەزار دینار باجی بەمەرزەبان سالاری دەیلەمی دەدا. مودەقیقی تەئریخی دەیلەمیان سەید ئەحمەد کیسرەوی لە «ئاسوغیک» مێژوونوویسی بەناوبانگ وەردەگرێ و «ابن حوقل» و «ابن مسکویه» دیسان لێی دواون، کە ئەبولهەیجا کوردی ڕاوادی بووە. مەملانی کوڕی ئەبولهەیجا بەنەوەی ڕاوادیان ناویان هێناوە.

هەروەکو لە پێشدا لێی دواوین. ئەبولهەیجا حوسێنی کوڕی محەمەد وەهسودان کنگری برای مەرزەبان سالار، قاقەزێکی وەرگرت لە ساڵی ٣٥٠دا کە کۆمەگی ئیسماعیلی کوڕی بدا و بچێتە سەر ئیبراهیمی کوڕی مەرزەبان کە برازای وەهسودان و ئامۆزای ئیسماعیل بوو. کیسرەوی لە «شهریاران گمنام» بەخشی دووەم - لە لاپەڕە ٣٧دا دەڵێ: ئەم حوسێنە کە وەهسوودان داوای یارمەتی لێ کرد، ئەم ئەبولهەیجایەیە کە لەدوامیندا بوو بەپادشای ئازربایەگان. کوڕی ئەو ناوی مەملان بوو بەناوی بابی حوسێن کراوە «محەمەد». لە ڕەوشتی زمانی کوردان دایە بە«محەمەد» دەڵێن: «مەمۆ - مەمێ - مەملان» پیتی «ح» و «د» فڕێ دەدەن بە«مەم» ناوی دەبەن، مەم چکۆڵە دەکەنەوە و پێی دەڵێن: «مەمڵ - مەملۆک - مەملان».

حوسێنی کوڕی محەمەد (ابو الهیجاء) ساڵی ٣٧٨ زیندوو و حوکمڕانی ئازربایەگان بووە. کیسرەوی دەڵێ: ئەبولهەیجا کونیەی حوسێن بوو کە ئەو حوسێنەی لە دەوری سالاردا فەرمانڕەوای ئەهر و ڕزقان بوو.

هێندێک لە مێژوونوویسەکانی ئەرمەنی لە «دێرنیق»ی بنەماڵەی ئارجرونی کوڕی غاغیق (خاچیک - هایک)ی حوکمڕانی واسپۆرگان (وان - ئەردوباد - نەخچەوان) کە دواون دەڵێن: غاغیک لە دوای مردنی بابی بۆتە حوکمڕانی واسپۆرگان (ئەپوخریب) کە

سوپەهداری خۆی بوو. چونکو پیر و ئوفتادە بوو لە سوپەهداری خست و یەکێکی دیکەی لە جێگای ئەو دانا و کردیە سوپەهدار کە ناوی «سەرکیس» بوو. ئەوە لە «ئەبوخریب» گران هات و لە دڵی گرت. بەپەنهانی پیاوانی ناردە لای ئەبولهەیجای حوکمڕانی هیر (خۆی) و زاراوەند (سەلماس) و بۆ هەڵمەت بردنەسەر دێرنیق و خاکی ئەنجیواجیک (وستان) هانی دا.

ئەبولهەیجا لەشکری برد و چووە سەر خاکی ئەنجواجیک و هەڵمەتی بردە سەر واسپورگان و دەستی بەکوژتار و تالآن کرد. دێرنیق لە شەڕدا بەدیل گیرا، ئەبولهەیجا لەگەڵ خۆیدا بردیەوە لەهیر (خۆی) و لەوێ بەندی کرد.

ئەبوخریب کە ئەوەی کرد، خەڵکی ئەرمەنستان لێی تورەبوون و ڕقیان لێ هەستا و لە کلیسەکاندا لە ڕەحمەتیان نائومێدکرد و دەنگیان لێ گۆڕی. قەشەکان لەکلیسەدا جوێنیان پێ دەدا و تووکیان لێ دەکرد.

ئەبوخریب لە بەدکرداری خۆی پەشیمان بووەوە و بۆ ڕزگاربوونی دێرنیق تەقەلای دا. وەلآمی دایێ کە لەگەڵ ئەبولهەیجا بۆ شکار لە شار دەرکەوت. ڕکێڤ لە ئەسپ بدا و هەڵێ. ئەوانڵ لە کەلێن فریای دەکەون و دەیرفێنن.

لەو ڕۆژانەدا دێرنیق لەگەڵ ئەبولهەیجا لە هیر کە دەرکەوتن و ڕوو بەگۆلی ورمێ ئەسپی ئاژۆت و هەلآت. پیاوانی دەست و پێوەندی ئەبولهەیجا کەوتنەدووی. ئەبو خەریب بەشیری رووتەوە لەکەلێن بۆیان دەرپەڕی و بەکوژتار تێیان کەوت: گەلێکی لێ کوژتن. ئەبو لهەیجاو ئەوانەی لەگەڵی مابوون، گەڕانەوە نێو شار. ئەبوخریب بەدڵخۆشی دێرنیقی بردەوە ئەرمەنستان: (کیسرەوەی، بەخشی دووەم - تاریخی میکایل چامچیان جلدی دووەم لاپەڕە ٨٢٦ بەدوورودرێژی ئەوە دەنوویسن).

دێرنێک (دێرنیق) لە ساڵی ٣٣٢ تا ٣٤٩ی هیجری حوکمڕانی کردووە. کیسرەوی دەڵێ: لەو ساڵەدا ناوی ئەبولهەیجامان لە خاکی خۆی و سەلماسدا نەبیستووە. لەگەڵ ئەوەشدا نوویسراوانی «ابن حوقل» لە دەستدان کە ساڵانی ٣٤٤ حوکمڕانەکانی ئازربایەگان یەک بەیەک باجیان داوە بەمەرزەبان دەیلەمی.

مێژوونوویسەکانی ئەرمەنی هەرچەند «ئەهر» و «هیر» و «رزقان» و «زاراوەند»یان لێک جوێ نەکردوونەوە، بەلآم چووینی ئەبولهەیجا بۆ سەر ئەنحیواجیک و تالآنکردنی و هەلآتنی دێرنیق لە هیزەوە ڕوو بەدەریا، جگە لە شاری «خۆی» نەبێ جێگایەکی دیکە

نەبوونی، کیسرەوی باسی کردووە و دەڵێ: هیر - ئەهر «خۆی»یە و ڕزقان «سەلماس»ە.

بەڵام لێرەدا کیسرەوی دەڵێ: هەڵمەتی ئەبولهەیجا لەو ساڵەدا لەبەر بوونی سالار مەرزەبان ڕێک ناکەوێ. دەبێ لە نێوانی ساڵانی ٣٣٧ - ٣٤٢دا بووبێ کە مەرزەبان لە قەڵای «سمیرم»دا لە بەندی دا بووە و حوکمڕانەکانی ئازربایەگان لەو ساڵانەدا ئازاد و سەربەخۆ بوون؛ بۆیێ ئەبولهەیجا توانیویە بزوێتەوە.

## ١- پادشاهی ئەبولهەیجا

## لەسەر کوردستانی ئازربایەگان و ئاران و ئەرمەنستان

دەوری نێوانی ساڵی ٣٤٠ تا ٣٦٩هیجری دەورێکی تاریکە. ئەوەی لەو ساڵانەدا زۆر لەو خاکانە دوابێ، ئەویش «ابن مسکویە» بووە. بەدبەختانە لە ساڵی ٣٦٩دا تەئریخی «ابن مسکویە» دوایی دێت. بۆیە لاپەڕەی تەئریخی نێوانی ٣٢٠ و ٣٦٩ زۆر بێ سەروبەر و تاریکە و بێدەستڕەسە. ساڵی ٣٢٠ یێکەمین مێژوونووسێکی سەربهوردی ئەو ساڵەی دەست پێکردووە «ابن الاثیر»ە کە سەربهوردی ئەمیر وەهسودانی کوردی ڕاوادی باس دەکا کە پادشای ئازربایەگان بووە. ئەحمەد کیسرەوی لە بەخشی دووەمی «شهریاران گمنام» و لاپەڕە٤٠دا کەمێک ئاگادارمان دەکا و ئەو چەند ساڵەی بێژراو کە بەتاریکی ڕابووراوە لە مێژوونوویسانی ئەرمەنی (وەکو ئاسوغیک دارونیچی) وەرگرتووە. ئێمەش ئەوە دەکەینە سەرمایە و لێی دەدوێین کە ئەمەی هاتووە و دەینوویسینەوە.

لەو دەورە تاریکەدا گەلێک چتی زل و بەئەهەمیەت ڕوویداوە بۆ تەئریخی کوردی ئازربایەگان شایانی لێوردبوونەوە و پشکنینە کە ئەویش کەوتنی بنەماڵەی سالاریانی دەیلەمی و سەرکەوتنی کوردی ڕاوەندی و گورفتاری ئیبراهیم سالاری دوامینی سالاریان بوون و هێز و تەوانای و فرەبوونی کوردان لە ئازربایەگاندا.

ئەبولهەیجا کەی بۆتە پادشا نادیار و گومە، بەڵام هێندەمان بۆ ئاشکرا بووە کە ساڵی ٣٧٠ تا ٣٧١ ئیبراهیم سالار گیراوە؛ هەروەکو لەمەوپێش لێی دواوین. بەقسەی هێندێک مێژوونوویسان ئیبراهیم لە دەست ئەبولهەیجادا گرفتار و پووچ بۆتەوە. چونکو ئەمە چتێکە ئاشکرا و ڕووناک کە ئەبولهەیجا ڕاوەندی لە دەوری حوکمڕانی ئیبراهیمدا نەبەرد و زۆردار و بەدەستەڵات و خاوەند هێز و تەوانا بووە. لەو حوکمدارانەیە کە لە ئازربایەگاندا ئەودەمە یێکەمین سەرهات و گەورە بووبێ. هێز و تەوانای ئەبولهەیجا ئیبراهیم نەوەی سالاری گرت و بۆ خۆی لە جێگای ئەو بوو بەپادشای ئازربایەگان. ئەوانە

بۆمان وەدیار دەخا کە ئیبراهیم لە ساڵی ٣٧٠ یان ٣٧١ گیراوە و ئەبولهەیجا بۆتە پادشای ئازربایەگان و ڕیشە و بنەچەکەی دەیلەمیانی لەو خاکە دەرخستووە و فرێی داوە و بۆ خۆی لە جێی وان جێگیربووە.

یێکەمین ئاگاداری ئێمە لە پادشاهی ئەبولهەیجا ئەمەیە کە لەشکری بردۆتە سەر ئەرمەنستان و لەگەڵ ئەبودەلەف بەشەڕ هاتووە و شکاندوویە. لەپاش ئەوانە بەگژ «ئاشوود ئارجرونی» داچووە و بەسەریدا زاڵبووە. ئەوە پتر گەورەی کردووە و لە کیشوەرگیریدا دلێر بووە. پادشایانی ئەرمەنستان باجیان داوە بەئەبولهەیجا.

ئەبولهەیجا کە کاروباری پادشاهی لە ئازربایەگاندا ڕێک خستووە و پشێوی ناوخۆی دەرهەم و بەرهەم کردووە، بناغەی فەرمانڕەوایی لە خاکی ئازربایەگاندا توندکردووە. ساڵی ٣٧٧ بەلەشکرێکی جەنگی و ئازاوە چۆتە سەر ئەرمەنستان و باجی چەند ساڵەی پاک وەرگرتووە. سەری ئەبودەلەفی نەرم کردووە.

ئاسۆغیک مێژوونوویسی ئەرمەن دەڵێ: ئەبولهەیجا کوردی ڕوادی ئەمیری ئازربایەگان بە سەد هەزار لەشکرەوە لینگی دا سەر ئەبودەلەف. ساڵی ٣٧٧هـ شارەکانی لە دەست سالار دەرخست و خاکی گۆغدنی تالاّن کرد و چووە سەر شاری دوین و گرتی و باجی ساڵانەی ڕابردووی لە ئەرمەنییەکان ئەستاند.

پادشای سەنباد (پادشای باگراتۆنی، کە گەورەترین فەرمانڕەوایانی ئەرمەنستان بوو) خەرجوباجی بەدیارییێکی قورسەوە بۆ نارد و گەلێک پێشکەشی گرانی دایێ (ئاسۆغیک لاپەڕە ١٨٦).

دووەمین سەربهوردی ئەبولهەیجا ئەمەیە کە لەشکری بردۆتە سەر واسپوڕگان گرتنی دەست پێ کردووە. لە ساڵی ٣٧٨ هیجریدا مەرگ ئێخەگیری بووە و لەو ئارەزووەی پاش خستووە.

کیسرەوی لە بەخشی دووەم لاپەڕەی ٤٢ لە ئاسۆغیک وەردەگرێ و بەمجۆرە باس دەکا: کوڕێکی خاوەندی «خۆی» بەچەند کەسێکەوە چۆتە لای ئاباهۆنیک (ئەمە خاکێکە لەکن ئەرمەنییان بەو ناوە نوویسراوە؛ خاکی دیاربەکر و مووسڵی ئەمڕۆکەیە. ئەویش ناوی «باد» کوردی حوکمڕانی ئەو خاکە کە لە لایەن ئەرمەنییانەوە بەئاباهۆنێک ناوبراوە بۆیە بەو خاکەش گوتراوە ئاباهۆنیک). ئەو کوڕە ئەمیرەی «خۆی»ی چۆتە خاکی ئاباهۆنیک و گەڕاوەتەوە و لە نزیک شاری خۆی کە لە کەنار دێیەک منداڵانی جوان و قەشەنگی

ئەرمەنییان یاری و گەمەیان کردووە، ئەو کوڕە ئەمیرە لە ئەسپ دابەزیوە و ئەو منداڵانەی گرتوون و سواری کردوون و بردوونی.

سەرکیس ناو پیاوێکی ئەرمەنی کە ئەوەی دیوە، بەشیری ڕووت کەوتۆتە دوویان. کوڕی ئەمیری کوردانی کوژتووە و پیاوەکانی هەموو لەت و پەل کردووە، منداڵە ئەرمەنییەکانی ڕزگار کردووە و گەڕاوەتەوە و بردوونیە ماڵی خۆیان.

خاوەند شاری خۆی -کە بابی کوڕەکە بوو- پیاوانی ناردە لای ئەبولهەیجا کە تۆڵەی بۆ بکاتەوە، لەبری ئەو چاکەیە شاری «خۆی» پێ بدات.

ئەبولهەیجا ئەو خواهیشتەی پەسند کرد و لەشکرێکی قورسی هەڵگرت و چووەسەر واسپۆرگان. کە نزیک بۆوە، لەشکری کردە سێ بەش کە لە سێ لاوە هەڵمەت ببەن. ئەو شەوە نزیک بەیانی سوپاهیان کە هەستا ئەبولهەیجایان لە چادری خۆی بەمردوویی دیبەوە. ئەو ئارەزووە بەجێ نەهات.

ئەبولهەیجا زۆر ژیاوە و پیر و ئوفتادە ببوو، لە ساڵی ٣٤٤ھ بەحوکمڕان ناسراوە. نزیکەی سی و شەش ساڵ پادشاهی کردووە.

## ٢- مەملانی کوڕی ئەبولهەیجا

ئەحمەد کیسرەوی لە ئاسۆغیک وەردەگرێ، دەڵێ: مەملان لە دوای ئەبولهەیجای بابی بوو بەپادشای ئازربایەگان.

کیسرەوی لەو بابەتەوە گەلێک گفتوگۆی کردووە و لە مایەی ناوی مەملان دواوە کە ئەمە «محمد»ە و بەزمانی کورد (زەری) بۆتە مەمل و ئەلف و نوون زایدە. لە ڕەوشتی کوردان دایە «محمد» دەکەنە مەم یا مەمێ - مەمۆ. مومکینە ئەلفونوون بۆ جەمع و تەسغیر هاوێژرابێتە سەر مەمل و بووبێتە مەملان هەروەکو: فەزلان و سەهلان و هورمزان و فەیرۆزان و مرکریان و سۆران. مێژوونووسەکان ئەوەیان کردۆتە مایەی گفتوگۆیەکی زۆر، بەڵام قسەی هیچ کامێکی مێژوونووسەکانمان لەلا نەبووەتە دەستوور کە لاگیری یەکێکیان بکەین، بۆیێ لێدواندنی ئەوەمان بەبێدەنگی ڕابوارد.

## یێکەمین شەڕی مەملان

## لەگەڵ ئەرمەنی و گورجیان

سەربهوردی مەملان جگە لە دوو لەشکرکێشی نەبێ بۆ سەر ئەرمەنستان، چیدیکەمان لە دەستدا نییە کە لێرەدا بیکەینە سەرمایە. ئەو دوو شەڕەی مەملان لەگەڵ ئەرمەنستان و گورجستاندا زۆر سەربهوردێکی گەورەن؛ چونکو تەنها هەر لەگەڵ گورج و ئەرمەن بەشەڕ نەهاتووە، بەڵکو لەگەڵ تەرسا و ڕۆم و دراوسێکانیشیدا شەڕی کردووە و بەناوی جیهاد بەگژ چەلیپاییەکاندا چووە و موسڵمانی دوور و نزیک یارمەتیان داوە و بەهاوارییەوە چوون و بەچەک و ماڵ و سەرمایەی خۆیانەوە کۆمەگیان کردووە.

ئەو شەڕانەی مەملان بەشەڕی دینی ئەژماردراون لە ڕێی ئیسلامدا بۆ جیهاد چۆتە سەر ئەرمەنستان و گورجستان و ئەو شەڕانەی بەناوی غەزا و جهادەوە ناوبانگیان کردووە. بۆیە ئیسلامەکان لە هەموو لایێکەوە یارمەتیان داوە. نەک شەڕی کیشوەرگیری بووە. جا لەبەرئەوە مەملان لەنێو ئومەراکانی ئیسلامدا جێگای بەرزبووە.

بوێژی بەناوبانگی تەورێزی «قەتران» بەپارچە هەڵبەستێکی بەتایبەتی بەئەمیر ئەبولحەسەن شەدادی کوردی ڕاوەند، حوکمڕانی ئاران و گەنجەی هەڵگوتووە و باسی ئەمیر وەهسودانی کوڕی مەملان، حوکمڕانی ئازربایەگانیشی تێدا کردووە. ئەمە شیعرێکیە کە دەڵێ:

یکی بگیرد چندان کە داشتی مملان
یکی بگیرد چندان کە داشتی فضلون

یێکەمین جار لەشکرکێشی ئەمیر مەملان بۆ سەر ئەرمەنستان بەمجۆرە بووە: ساڵی ٣٨٠ ئەمیرباد کوردی کە سەرهات و پادشا بەناوبانگ و غاری و موجاهیدی ناوداری ئیسلام و حوکمڕانی دیاربەکر و لایێکی زلی ئەرمەنستان و لایێکی مووسڵ بوو. بناغەیێکی توندی حوکمڕانی لەو خاکەدا دامەزراندبوو. لەو ساڵەدا لە کەنار مووسڵ شەڕی دەکرد لە ئەسپ بەربۆوە و مرد (تەماشای کتێبی - پێشکەوتن - چاپکراوی ئێمە بکرێ لەوێدا دوورودرێژ لێی دواوین).

داویت (داوود) والی ئەرمەنستان کە دەستنیشانی ڕۆمیان بوو، چووەسەر شار و قەڵای منازگرد (مەلازگرد) -کە یەکە شار و قەڵایێکی باد کوردی بوو- دەورەیدا و تەنگەی بەدانیشتوانی قەڵا هەڵچنی و برسیەتی و نەبوونی میللەتەکەی پەرێشان کرد؛

لەدواییدا بە«ئەمان» خۆیاندا بەدەستەوە. ئەرمەنییەکان هەموویانی لە شار دەرکردن و ماڵ و ئەموالی موسڵمانانی خستە ژێر دەستەوە.

ئەو بەدڕەوشتی و خراپییەی داویت لە ئەمیرەکانی موسڵمانان گران هات؛ وەڵامیان بەداویت دا کە لە شار دەرکەوێ و بیداتەوە دەست موسڵمانان. داویت نەیویست و گوێی نەدایێ.

لە هەموولاییێکەوە موسڵمانان خرۆشان و لەژێر ئاڵای ئەمیر مەملاندا کۆبوونەوە. بەرقەوە ئەمیر مەملان لینگیدا سەر ئەرمەنستان لە ناحیەی «چاغگوید» -کە ناحیەییێکی ئارارات بوو- لەشکربەزیان کرد. لەو لاوە داویت [لە] ئەمیرەکانی چەلیپایی کە ئەمیری گورجستان و ئەرمەنستان بوون، بۆ یارمەتیدان کۆمەگی لێخوازتن. بەپشتیوانی غاغیق باگراتۆنی حوکمڕانی «ئانی» و «ئاباس» باگراتۆنی حوکمڕانی قارس و باگرات حوکمڕانی گورجستانەوە، لەشکرێکی قورسی کۆکردەوە لە شاری ولاشگرد «ئالاشگرد» -کە یەکێک بوو لە شارەکانی ناحیەی «باگراوەند»- ڕووبەڕووی لەشکری مەملان ریزیان گرت.

ئاسۆغیک لەلاپەڕە ۲۵۷ - ۲۵۸ کە لەم شەڕە دواوە دەڵێ: موسڵمانان ترسان و شەڕیان نەکرد. شەوێ بەناحیەی باگراوەندا بڵاوبوونەوە، هەموو ئاواییەکانیان سووتاند و هەڵاتن و گەڕانەوە. بەوجۆرە ڕوو بەخاکی خۆیان بەپەڕاگەندەیی بڵاوەیان کرد.

ماتیۆسی ئورفەیی کە مێژوونووسێکی دیکەی ئەرمەنییە و هەروا چامچیان لە لاپەڕە ۸۷۸دا دەڵێن: کارمراگیل سەرکردەیەکی داویت کەوتە دووی شکستەی ئیسلامان، گەلێکی کوژتن و ژنی مەملان لە شەڕدا بەدیل گیرا و و بردیە لای داویت.

ئێمە لەو شەڕەی مەملان و ئەرمەنییان جگە لە نوویسینی ئەو سێ مێژوونوویسانەی ئەرمەنی دەستمایەیێکی دیکەمان دەست نەکەوت. ئەحمەد کیسرەویش لەو شەڕە هەرچییەکی نوویسیوەتەوە لەوانی وەرگرتووە.

## دووەمین شەڕی مەملان

## و لەشکرکێشی بۆ سەر ئەرمەنستان

مەملان بۆ جیهاد و غەزا سالّی ٣٨٨ھ جارپکێشا و موسلّمانانی هەموو لایێکی بۆ یاریدەدان خوازتە لای خۆی. لە موسلّمانانی عیراق (مادان) و لە پارس (پارسیا) و خوراسان و جێگایانی دوور لە دەورەی کۆبوونەوە. هەموو ئەهالی ئاوربایەگانیش بەگەورە و بچووکییانەوە کەوتنە ژێر چەکەوە و ئامادە و سازی جیهاد بوون.

ئاسۆغیک مێژوونوویسی بەناوبانگی ئەرمەنی ئەو جاری جیهادە بەمجۆرە دەنوویسێ و دەڵێت: ئەمیر مەملان دەیەویست بەسەر هەموو خاکی ئەرمەنستان و گورجستاندا زالّ بێ و ئەو کیشوەرە بگرێ و بیخاتە ژێر فەرمانی خۆیەوە و ئارەزووی ئەوەبوو شاری گارنی (ئەرزەرۆم) لەوەپێش کە ڕۆم تێکیان دابوو و وێرانیان کردبوو، دیسان ئاوەدانی بکاتەوە و میللەتی خۆی تێدا دامەزرێنێتەوەو بەتۆڵەی مزگەوتی گەورەی ئایاهۆنیک (منازگرد – مەلازگرد) کە ئەرمەنییەکان تێکیان دابوو، خاک و ناحیەی «دایک» کە هی داویت بوو بچێتە سەری و تالاّنی کات و کوژتاریان لێ بکا.

بەئومێد و ئارەزووەوە جاری جیهادی کێشا و موسلّمانانی بۆ سەر ئەرمەنییان هاندا. لە تەورێز لەشکری کە پێکەوەنا، لە شار دەرکەوت و لە ڕێگای «خۆی»یەوە هەلّمەتی بردەسەر خاک و شارانی واسپۆرگان، لە ناحیەی ئاباهونیک دابەزی و لەشکربەزی کرد و دەستی بۆ گرتنی ئەو خاکە درێژکرد (گۆیا ئەودەمە واسپۆرگان و پادشایانی ئارجروونی لەژێر فەرمانی مەملاندا بوون).

داویت خاوەندی «دایک» چونکو پیر و ناتوان بوو، نەشیا بۆخۆی بچێتە مەیدانی جەنگ و شەڕەوە، هاواری لە پادشایانی خاچپەرستی دراوسێکانی کرد و یارمەتی لێخوازتن و بۆ شەڕی دینی هانیدان. غاغیک پاشای «ئانی» بە شەش هەزار لەشکری جەنگی ئەرمەنی و گورگینی کوڕی باگارت پادشای گورجستان بە شەش هەزار گورج و ئاباس ئەرمەنی پادشای قارس بەهێندێک پیاوانی یارمەتییان کردو بەچەک و پێویستەوە لەشکرێکی دوازدە، سێزدە هەزارکەسی بۆ کۆکراوە. داویت لەگەلّ هێزێکی کە بۆ خۆی هەیبوو لەژێر سەرداری جوبرائیل ناو پالّەوانێکی دلێری ئەرمەنییدا ئەو لەشکرەی بۆ پێش مەملان ئاژۆت. لەشکری تەرساکان لەسەر تەپەیێکی لە خاکی ئاباهۆنێک ڕووبەڕووی لەشکری ئیسلام ڕاوەستان.

تەرساکان کە [لە] پڕی و زۆری لەشکری مەملان وردبوونەوە و هێز و تەوانایی ئیسلامیان چاوپێکەوت نەیانتوانی خۆ لە شەڕ و کێشە بدەن و بچنە مەیدانی کوژتارەوە. جگە لەبەر خوداپاڕانەوە چارەی ڕزگاربوونیان نەدۆزییەوە. بەرەهبەری قەشەکان دەستی نیاز و لاوای کۆڕووزاندنەوەیان ڕوو بەبەرزایی بڵند کرد و پاڕانەوە و هەریێک لەسەرخۆی دانا کە لەم تەنگانەیە ڕزگار بن، ماڵێکی بێ ژمار بدەنە هەژاران و لە ڕێی خودادا دراوێکی قورسیان دا بەدەست تەنگ و نەدارەکان و خێر و خێراتێکی زۆریان بەخشییەوە.

ئاسۆغیک سەرکەوتنی ئەرمەنی لە دوامینی ئەو شەڕەیدا و شکان و هەڵاتنی ئیسلامانی لە ڕووی تەعەسووبی دینییەوە باسکردووە. ڕۆژی دووشەممەی نیوەی مانگی پایز لە هەردوو لاوە لەشکر ڕووبەڕووی یەکدی ڕاوەستان و بۆ شەڕ و کوژتاری یەک، ڕیزبوون. هەتا نیوەڕۆ چەند پاڵەوانێکی گورجی چوونە مەیدانەوە، زۆرچاک شەڕیان کرد و پێنج کەسیان لێ کوژرا. موسڵمان بەجارێک هەڵمەتیان برد و پەلاماریاندان. ئەرمەنی ناچار سواری ئەسپ بوون و چوونە پێشەوە و شەڕ و کوژتاریان دامەزراند.

ئاسۆغیک لە لاپەڕەی ٢٦١ و ٢٦٥دا گەلێکی بەئەرمەنییەکان هەڵگوتووە و ئەویش لەبەر دوعای خێروخێراتی کە کردیان سەرکەوتوون و دەڵێ: لە خوێن جۆگە پڕ ببوون و ئیسلام شکاندرا و کۆمەڵەیێکی زۆری ئیسلام لە دەست ئەرمەن و گورجیاندا پووچکرانەوە و کوژران.

لەو لەشکرە زلەی مەملان زۆر کەمی ڕزگار بوو و گیانی لە چنگ دلێرانی ئەرمەن و گورج بەدەربرد و هەڵاتن. پاڵەوانەکانی ئەرمەن و گورج هەتا نزیک دەروازەی ئەرگیش (ئەرجیش) لە دووی شکستەیان نەبوونەوە و هەتا ڕۆژاوا کوژتاریان لێ کردن. لە ئەسپ و ئێستر و چەک و گەنجینە تالانێکی بێ ژماری ئیسلام کەوتە دەست ئەرمەنییان. لەشکری جوبرائیل بەشادی و خۆشی گەڕانەوە جێی خۆیان.

جگە لەوە سەربهوردی ئەمیر مەملان لە دەستدا نییە و ناکەوێتە بەرچاومان کە لێرەدا بینوویسینەوە. بەڵام «ابن الاثیر» لە سەربهوردی ساڵی ٤٢٠دا لە ئەمیر وەهسودان ناو دواوە کە کوڕی مەملان بووە، کە ئێمە لە هاتوودا بەدرێژی لێی دەدوێین.

## ئەبو دەلەف ئەمیری گوغتن

ئەگەرچی ئەم ئەبو دەلەفە کورد نەبووە، بەڵام چونکو لەسەر گۆشەیێکی ئازربایەگان حوکمڕانی کردووە و هاوساڵانی ئەبولهەیجا و مەملان بووە، بەکورتی کەمێک لەم

لاپەڕەیەدا سەربهوردی دەنووسمەوە. هەرچەند سەربهوردی زۆر شپرزە و پشێو و نادیارە، بەڵام گۆیا ساڵی ٣٧٣دا چۆتە سەر واسپۆرگان و تاڵانی کردووە. ئاسۆغیک بەدرێژی لێی دواوە کە: لەشکری ئەو نۆسەد کەس بووە، ئەوانیش پیادەبوون.

ئاشوود پادشای واسپۆرگان لەشکرێکی لەژێر فەرمانی ئەبوخریبدا ناردە پێش ئەبو دەلەف لە ناحیەی «جواش» لە جێگاییێک کە بە«باگیار» دەناسرێ، دابەزیبوون. لەناکاو پیادەکانی ئەبودەلەف چوونە سەر ئەسپەکانی ئەرمەنییەکان و هەموویان لێگرتن. بەئامان ئەرمەنییەکان خۆیان بەدەستەوەدا. لە پاشان هەموو ئەرمەنییەکانیان کوژتن. ئەبوخریب و کریگۆریان بەدیل و دەست بەست برد.

لە دوای ئەوە ناوبانگی ئەبودەلەف لە «دوین» و ئەو دەوروپشتانە پەیدابوو و لەو خاکانەدا بەحوکمڕانی ناوی براوە، لە ساڵی ٣٣٧ ئەمیر ئەبولهەیجا چۆتە شەڕی دوین و ئەرمەنستانی بەزۆر لێی ئەستاندووە؛ هەروەکو لە پێشدا باسی کراوە.

ئەبودەلەف جارێکی دیکەش لە «دوین» و ئەو ناحیانەدا حوکمڕانی کردووە. لەگەڵ خاچیک کاتۆلیکۆس و سەنباد پادشای ئەرمەنستان پەیمانی ئاشتی و خۆشی بەستووە.

لەم ئەبودەلەفە چی دیکە ئاگاداری لە دەستدا نییە، بەڵام ئەبو دەلەف نەوەی ئەمە لە نەخچەوان پادشایەتی کردووە و لە هاتوودا بەدرێژی لێی دەدوێم.

### ٣- ئەبو مەنسوور وەهسودان کوڕی مەملان

هەرچەندە مردنی مەملان نەزاندراوە، بەڵام ئەمە ئاشکرا نییە کە ئەبو مەنسوور لەدوای بابی بۆتە پادشا. یێکەمین مێژوونووسێک لە وەهسودان دوابێ «ابن الاثیر»ە لە ڕیزی ساڵی ٤٢٠دا وەهسوودانی بەپادشای ئازربایەگان ناوبردووە؛ ئەویش بەهۆی غەزان و چوونیان بۆ خاکی ئازەربایەگان باس لە وەهسودان کراوە. کیسرەوی بەخشی دووەم «شهریاران گمنام» دەڵێ: ئەمیر وەهسودان ساڵی ٤١٠ لەسەر ئازربایەگان پادشا بووە. بوێژی بەناوبانگ «قەتران»ی تەورێزی سەنا خوانی وەهسودان بووە و لەگەڵێ جێگایاندا پێی هەڵگوتووە و لە سەربهورد و شەڕەکانی دواوە. لەبەرئەوەیە ناوی وەهسودان لەگەڵێک جێگایاندا براوە. بۆیە سەربهوردی دەست دەکەوێ لە دەوری ئەم پادشایەدا چتی زل لە ئازربایەگاندا ڕووی داوە. وەهسودان: ناوی سێ حوکمرانن: ١- وەهسودان جستان، ٢- وەهسودان کنگری (هەردووک دەیلەمی بوون) ٣- وەهسودانی ڕاوادی کە ئێمە لێرە لێی دەدوێین کوردی ڕوادی بوو.

ئەم سێ پاشایانە لە گەلێک کتێباندا ناوبراون. شاعیرێک لە قیتعە شیعرێکی دا ناوی وەهسودانی کوردی ڕاوادی بردووە، ئەمە شیعرێکییە:

ز عشقت بس زبان دارم و لاکن بس مرا سود آن

کە دیدم روی شاهنشاه ابو منصور وهسودان

لە پارچە شیعرێکی «قەتران»دا کە بەوەهسودانی هەڵگرتووە، ئەمە شیعرێکییە:

حبش از عجم و قدوەی شاهان عجم

نسبش از عرب و قبلەی میزان عرب

قەتران دیسان لە پارچە شیعرێکیدا بەوەهسوودانی هەڵگوتووە و دەڵێ:

ستودەاند بەفرزانگی ملوک عجم

گزیداند بەمردانگی ملوک عجم

کیسرەوی لە ناسر خوسرەو وەردەگرێ و دەڵێ لە خوتبەدا بەمجۆرە ناوی وەهسودان دەبرێ: «الامیر الاجل سیف الدولة وشرف الملة أبو منصور وهسودان ابن محمد مولي امیر المؤمنین».

یێکەمین سەربهورد و هەڵکەوتووی زلێکی لە دەوری وەهسوداندا ڕوویداوە، هاتنی غەزیان بوو بۆ ئازربایەگان. ئەم غەزیانە ڕاستەوڕاست دەتواندرێ بەپێشرەوی سەلجووقیان دابندرێن، ئەگەرچی سی ساڵ بەر لە توغروڵ بەگ و براکانی دەستیان بەو مهاجەرەتە کردووە و چوونە خاکی ئازربایەگان.

بەقسەی «ابن الاثیر» و «عماد الکاتب» و ڕاوەندی و «احمد کسروی» و مێژوونوویسی دیکەش، غەزیان هەواداری سوڵتان مەحموودی کوڕی سەبوکتەگین بوون. حەدداری لە سنووری خاکی خۆی دایڤابوون. لە خاکی خوڕاسان دانیشتن. بەڵام زۆری پێنەچوو لەگەڵ سوڵتان مەحموود نێوانیان تێکچوو، بەدڵگیری دەستیان کرد بەسەرکێشی. پۆل و دەستەیان لە خاکی ئازربایەگان و عیراق و ئەرمەنستان و دیاربەکر و مەملەکەتانی دیکەدا بڵاوبوونەوە و وەکو سێلاو و ئاوری بێ ئامان بەتاڵان و وێرانکردنی دێهات و ئاوایی ملیان پێوەنا، دەگەیشتنە هەر خاکێک خاپوور و خراپیان دەکرد.

بەرامبەر بەو سێلاوەی غەز، یەکێک لە پادشاکانی خۆجێیی نەشیان پێشی پێ بگرن. پادشای واسپۆرگان کە لە بنەماڵەی ئارجرونی بوون، لە ترسی بەدڕەفتاری و خراپی ئەو

تورکانە، دەستیان لە کیشوەر و خاکی نیشتمانی خۆیان بەردا و چوونە خاکی سیواس دامەزران. شەرفرۆشی و ڕەوشتی ناهەمواری ئەو تورکانە لە پایەیێکی وا دابوو، حکوومەتێکی چەند عەسرەی ئارجرونی لەبەریان هەڵاتن و دەستیان لە خاکی خۆیان بەردا، بەڵام ئێمە ئەوەی تایبەتی کوردستانی ئازربایەگان بێ، لێرەدا لێی دەدوێم کە مایەی هاتنی غەز و بەدکرداریان بێ لەم خاکەدا.

## جاری یێکەم هاتنی غەزان بۆ ئازربایەگان

بۆئەمەی کەمێک لە سەرەتای هاتنی غەزەکان ئاگاداری پەیدا بکرێ و بزاندرێ کەی و چۆن هاتوونە کوردستانی ئازربایەگان، لە مایەی هاتنیان لە هاتوودا دێتە گۆتن:

سوڵتان مەحموود کوڕی سەبوکتەگین بۆ بەخێوکردنی سنووری خاکی خۆی، دەستەیێک غەزیانی بردە خاکی خوراسان و لەوێ دانان. ئەو غەزانە لەو خاکەدا دەستی جەور و ئیستبدادیان بەسەر میللەتدا درێژکرد. سوڵتان مەحموود لەو بەدکرداریەیان ڕەنجیدە و دڵگیربوو.

غەز کە لەوە ئاگاداربوون، ڕوو بەخاکی کرمان هیجرەتیان کرد. مەحموود بۆ عەلائودەولەی کاکەوەی نوویسی کە خاوەندی سپاهان و هەمەدان بوو کە بیانگرێتەوە و مەیدان بەچوونیان نەدا. لە دوامینی ئیشدا کار کەوتە شەڕ و کوژتار.

«غەز»نەشیان لە بەرامبەر دلێرێکی وەکو عەلائودەولە ڕابوەستن، باریان کرد و ڕوو بەخاکی ئازربایەگان ڕۆیشتن، بەڵام بەسەر هەر شار و ئاوایی و خاکێکی سەر ڕێیاندا ڕۆیین، تالانیان کرد و خستیانە ژێر پێ و بەخراپی و بەدکرداری چوونە خاکی ئازربایەگانەوە. ساڵی ٤٢٠ و ٤٣٢ھ ئەو سەربەوردە بەژان و ئێشەی دڵکوڵێن، لاپەڕەی هەموو تەئریخەکانی دونیای پڕ کردووە.

وەهسودان پاشای ئازربایەگان بەئومێدی ئەمە کە غەز بکاتە کوتەکی دەستی خۆی و سەری دوژمنی پێ بکوتێ و نەیارانی خۆی بەوان ڕامکا و هێز و تەوانای پادشاهی پێ برازێنێتەوە، زۆرباش بەخێوی کردن و دڵخۆشی دانەوە و ئیحترامی بێ پایانی گرتن و لە خاکی ئازربایەگاندا بەڕەفاهییەتەوە دایمەزراندن.

دوژمنی گەورەی وەهسودان لەودەمەدا حکوومەتی کوردی شەدادی (فەزلانی) و ڕۆم و ئەرمەنی و گورج و هی دیکەش بوون. کە وەهسودان وا ناچار بوو کە تورکی غەز بباتە بن چەنگی خۆیەوە و بەگەرمی لە خاکی خۆیدا جێگیریان بکات و هێزیان پێ بدات؛ بوێژی

بەناوبانگ قەتران. هەڵبەستێکی دووردرێژی بەوە هەڵگوتووە کە وەهسودان پشتی بەغەزان توند و بەوانەوە پشتەستوور بووە کە لە خوارەوە شیعرە فارسیەکە بۆمان دیار دەکا:

آیا ز کف تو کار ولی همیشه قوی
آیا ز تیغ تو کار عدو همیشه تباه
نەباسپاه تو دارد درنگ هیچ حصار
نه با سنان تو گیرد قرار هیچ سپاه
بەدین مبارز خرگاهیان سخت گمان
شگفت نیست که بر آسمان زنی خرگاه
دل ولی بکمان دوتاه راست کنند
بەتیر راست روان عدو کند دوتاه
در آن زمین که تو یک روز رزم ساخته
پلنگ و شیر بەخون اندرون کنند شناه

کیسرەوی ئەو شیعرەی قەتران بەشاهید نیشان دەدا کە وەهسودان بەتیرەندازی و شەڕکەری ئەو تورکە خەرگاهیانە پشت ئەستوور بووە؛ قەتران بۆیێ بەو شیعرانە بەوەهسودانی هەڵگوتووە و باسی موباریزانی سەخت گومان و تیروکەمانی ئەوانی کردووە.

قیتعە شیعرێکی دیکەی قەتران هەیە کە لە گەنجە لەکن ئەمیر ئەبولحەسەنی لەشگری کوردی ڕەوادی شەدادی -کە بەفەزلوونیان ناودەبرێن- بووە و لەوی بەسەری بردووە. لەودەمەدا نێوانی لەشگری و وەهسودان ناخۆش بووە. وەهسودان بەپشتیوانی غەزان نازیوە. لەشگری حاجیبی خۆی کە بەئەبولیاسر ناسراوە و یەکێک بووە لە خۆشەویستانی قەتران، بەسوپاهێکەوە ناردە دەستەییێکی لەو غەزانە لەگەڵ خۆی بردۆتە خاکی ئاران. ئەمە چەند شیعرێکی قەترانە لەو بابەتەوەی گوتووە لەشگری و حاجیبی ئەو و غەز دواوە و لێرەدا دەینوویسم:

کەرا پشت کند گردون چه باشد پشت لشکر
چه باشد یار لشکر کەرا دولت بود یاور
ملک چون لشگری باید بەدار الملک آسوده
فرستاده بەهر شهری سری را مریکی همسر

نشـــــاط تـازه هر روزه بـروی لـشـکری تـازه

ســـر ره هر دمش دیر بـهعـــزم دشـــمـن دیگر

اگـر بگذشت از جـیـحـون گـروه ترکـمـانان را

ملک مـحـمـود کـاورا بـود زابل کـان در سنجـر

شگفـتی نیـست از مـحـمـود کـایشـان را بیـاورد او

بدان پیـــلان جنگ آرای و گـــردان جنگ آور

شگفت از حاجبی خسرو که بی پیلان و بی گردان

سـپـاهی را بهقـهـر آورد ازاین کـشـور بهآن کـشـور

کـجـا خسـرو چنین باشد نشـاید جزچنان حـاجب

کـجـا مـهـتـر چنین باشـد نشـاید جزچنان کـهـتـر

ایا شــاهی کــه برشــاهان همی زیبـد ترا نـازش

ایا مـیـر کـه بر مـیـران همی زیبـد ترا مـفـخـر

بهیک حاجب تو آن کردی که کرد ازبیست افریدون

بهیک چاکر تو آن کردی کـه کرد ازبیـست اسکندر

ســپـــاهی را کـــجـــا بودند پروبال دشـــمـن را

بیـاوردی بهقـهـر اورا شکسـتـهبال و کنده پر

زمـسـانی تـازش ایشـــان بهشـــروان اندرون بودی

زمـــانی حـــملهی ایشـــان بهآذربایـگـان اندر

نبـود از تـازش ایشــان کـسـی برچیـز خـود ایمن

نبـود از حـملهی ایشـان کـسی برمـال خـود سـرور

همـیـــشـــه تازش دشـــمن از یشـان بود بر هرکس

کنون از هیـبت ایشــان نیـارد برکـشــیـدن سـر

کنون شد یار دشمن غم، کنون شد روز دشمن شب

کنون شد نیک دشمن بد، کنون شد خیر دشمن شر

تو چون جـمـشـیـدی و حـاجب ترا مـانندهی آصف

تو چون پیـغـمـبری حـاجب ترا مـانندهی حـیـدر

لێرەدا وا دەردەکەوێ کە وەهسودان چونکو بەبردنی غەز، خۆی بەپشت زل و بەهێز زانیوە، بۆیە ئەبولحەسەنی لەشگری پادشای کورد، تێکۆشاوە و حاجیبی خۆی ناردووە

بەزۆر دەستە لەشكرێكی لە غەز بردۆتە لای خۆی تاكو بەرامبەری وەهسودان بكات و بەوان بیترسێنێ.

## هەڵمەت بردنی غەزان

## بۆ سەر واسپورگان

كیسرەوی لە مێژوونوویسی ئەرمەن چامچیان، دەگێڕێتەوە كەساڵی ۱۰۲۱ی میلادی (٤۱۱ - ٤۱۲ھ) توركانی غەز وەكو سێلاوێكی توند گەیشتبوونە ئازەربایەگان و روویان لە ئەرمەنستان كرد و گەیشتنە واسپۆرگان و دەستیان بەتاڵان و بردن كرد. هەر جێگاییەكی بەسەریدا چوون، پایەماڵیان كرد. بەڵام لە پێش ئەوەدا غەز بگەنە نزیک وەستان، سنگریم پادشای ئارجروونی كە لە وەستان یان لە «وان» دادەنیشت كە لەوە ئاگاداربوو بەشاپوور (شاپوھ)ی سپەهبەدی گوت: لەشكر پێكەوە بنێ و دەمێک زووتر بچێتە پێش و نەیەڵێ غەز نزیک بێتەوە.

شاپوور هەموو لەشكری واسپۆرگانی كۆكردنەوە و لەگەڵ داویت -كوڕە گەورەی سنگریم- كەوتنەڕێ. كە لە دوور چاویان بەو توركانە كەوت، زۆر ترسان. چونكو كۆمەڵەییێكی زلیان دی وەكو ژن پرچیان بەردابووەوە و كەوانی زل و سەختیان لە دەستدا بوو. ئەرمەنییان تاكو ئەو ڕۆژە پیاویان لەو شكڵەدا نەدیبوو. ترس و واهیمەیەكی قورسیان لێ نیشت. شاپوور دڵخۆشی ئەرمەنییانی داوە و بۆ شەڕ و كوژتار چیری كردن و هانیدان و لە پێش توركان ڕیزبوون.

تورک لە دوور ڕاوەستابوون و بەتیر شەڕیان دەكرد، كۆمەڵەییێكی زلیان لە ئەرمەنی نابوودكردن. هیچ تیرێكیان بەخۆڕایی نەدەچوو. ئەرمەنی ڕقیان هەستا و دەماری دلێریان بزووت و لینگیان دا سەریان و كەوان و تیری توركیان دەگرت و بەشیر لەتیان دەكرد و كۆمەڵەییێكی قورسیان لێ كوژتن.

ئەو ڕۆژە هەتا ئێوارە شەڕكرا، وەختی شێوان دەستیان لە شەڕ بەردا. چونكو لە هەردوو لا گەلێک كوژرابوون. هەریەک ڕوو بەخاكی خۆیان گەڕانەوە. (تاریخ چامچیان - جلد ۲ - لاپەڕە ۹۰۲).

كیسرەوی بەخشی دووەم لاپەڕە ٦٥ لە چامچیان و مارتان و چەند مێژوونوویسێكی دیكەی ئەرمەنی وەرگرتووە.

لەو ساڵەدا ئەو توركانە لە دەوروپشتی نەخچەوان و دوین بەگژ میللەتی خۆجێییدا

چوون. ئەگەرچی مێژوونووسەکان ئەو شەڕانەی تورکیان بەناوی توغروڵ بەگی سەلجوقی نووسیوە، بەڵام ئەو شەڕانە بیست ساڵ لە پێش هاتنی توغروڵ بەگ و برایانی دا ڕوویداوە.

وەکو لەمەوپێش گوترا، سنگریم پادشای واسپۆرگان لە شەڕ و فیتنەی تورکان لە هەراسدا بوو، بەڕاو مەشوەرەتی گەورەکانی ئەرمەنی لەگەڵ قەیسەری ڕۆم «واسیل - باسیل» موخابەرەی کرد کە دەست لە خاکی واسپۆرگان بەر دەدەن بەمەرجی ئەو خاکی «سیواس»یان بداتێ و حکوومەتی چەند عەسرەی ئارجرونی بگوێزنەوە سیواس. بۆ ئەوە داویت کوڕە گەورەی خۆشی بە سێ سەد باری ئێستر دیارییەوە نارده قوستەنتەنیە.

قەیسەر داویتی نوازشکرد. هەروەکو سنگریم ویستبووی، لە سیواس تا کەناری چۆمی فوراتی دایێ. داویت کە گەڕاوە لای بابی، سنگریم واسپۆرگانی بە چوار هەزار دێ و حەفتا و دوو دز (قەڵا) و دە شاری بەجێهیشت و دایە دەست قەیسەر. خۆی و کوڕانی و برایانی و خزم و خۆیش و گەورە و لەشکر و بڕێکی چوارسەد هەزار کەس لە میللەتی باریان کرد و چوونە خاکی سیواس. شهریاران گمنان، بەخشی دووەم، لاپەڕە ٦٦ - ٦٧ .چامچیان، جلدی دووەم، لاپەڕە ٩٠٢ - ٩٠٣).

بەوجۆرە پادشاهی ئارجرونییان لە واسپۆرگان دوایی هات و کەوتە خاکی سیواس. لەسەر هاتنی غەز و بارکردنی سنگریم بۆ سیواس و ئەو سەربهوردانە لەنێوانی مێژوونووسەکانی ئەرمەنی و غەیرەدا گفتوگۆ و کێشەیەکی زۆرکراوە.

## دەستەی دووەمینی غەزان بۆ ئازربایەگان

غەز لە «ڕەی» بوونە دوو دەستە. دەستەیەکیان کە ژمارەیان هەزار و پێنج سەد کەس بوون و پێشەوایان «قزڵ» بوو لە ڕەی مانەوە؛ دەستەی دووەم کە زۆر و بەهێز و زلبوون و پێشەوایانی ئەوان: «بوقا» و «گوگتاش» و «مەنسوور» و «دانا» و هی دیکەش بوون ڕوو بەئازربایەگان کەوتنەڕێ و ساڵی ٤٢٩ گەیشتنە ئازربایەگان و چوونە لای ئەمیر وەهسودان و بەخۆشی و کەیفوشادمانی ڕاگیران و لە ئازربایەگان داینیشاندن.

لەمەپێش باسکرا کە بۆیە غەزی بردنە ئازربایەگان تاکو بەهۆی ئەوانەوە بەسەر دوژمنیدا پشتەستووربێ، بەڵام لە دوای ئەوە کە غەز لە ئازربایەگاندا جێگیربوون، دەرکردنیان هێندە ئاسان و خۆش نەبوو. بەڵام کارێک بوو لە دەست چووبوو.

غەز هەر دەستەییکی لە گۆشەیەکی خاکی ئازربایەگاندا جێگیربوون. بەپێی

خوورەوشتی خۆیان -کە هەیانبوو- دەستیان بەبەدڕەفتاری و خراپی کرد. هەردەم بۆ تالان و ڕێگری و جەردەیی لینگیان دەدا سەر خاکی واسپۆرگان و ئەرمەنستان و جێگایانی دیکە و لە نزیک دەوروپشتی خۆیان تالان و جەردەییان دەستپێکرد.

لەوەدەمەدا باگارت پادشای ئەبخاز و غاغیق پادشای کاخت، تفلیس کە لە دەست ئەمیر ئەبولفەزل جەعفەردا بوو، دەورەیاندا بوو. برسیەتی لەنێو شاردا میللەتەکەی وەتەنگهێنابوو. موسڵمانانی ناردە ئازربایەگان و یارمەتی لێخوازتن. بەڵام کە غەز گەیشتنە ئازربایەگان، لە ئەرمەنستان واسپۆرگان و دەورپشت تالان و برینیان برووز پێدا حوکمداری گورجستان و ئەرمەنستان، ناچار لە ترسان دەستیان لە دەورەدانی تفلیس بەردا و گەڕانەوە. «ابن الاثیر» سەربهوردی ساڵی ٤٢٩)

وەهسودان کچێکی لە ئومەرایانی غەز خوازت، تاکو بەهۆی ئەوەوە ڕامیانکا و لە خراپەیان ڕاگرێ. بەڵام غەز هیچ دەمێک چاویان لە ڕامبوون و ئاسوودە دانیشتن نەبوو. بەهەموو لایەکدا بڵاو دەبوونەوە و تالانیان دەکرد و دەگەڕانەوە. لە دوامیندا ئەو بەدڕەفتارەشیان لە ئازربایەگان دەستپێکرد. هەر لەو ساڵەی ٤٢٩یەدا لینگیان دا سەر مەراغە و لە کوردانی هەزبانی کوژتارێکی قورسیان کرد. مزگەوتی گەورەی «ئادینە»ی شاری مەراغەیان سوتاند.

دەستەییێکی ئەوان کە لە ورمێ دامەزراندرابوون، لینگیاندا سەر کوردستانی هەکاری و دەوروپشت و لە کوژتار و تالان و زوڵم ڕانەوەستان و دەستیان نەکێشاوە. «ابن الاثیر» لە سەربهوردی ساڵانی ٤٢٠ - ٤٢٩ دەڵێ: دیل و تالانێکی زۆریان برد. لە هەموو لایەکەوە هاواری کورد لە دەست تورکی غەز و ناڵەی ئەرمەن و هی دی لە دەستیان بڵندبوو. ئێش و ژان و ئەزیەت گەیشتە پایەیەکی وا کەس تەواناى خۆگرتن و ڕاوەستانی نەبوو.

## دەرکردنی غەزان لە ئازربایەگان

ئەزیەت و ئازاری غەزەکان کە برووزی ئەستاند و ناڵە و هاواری کەوتە نێو خەڵکەوە، وەهسودان لەگەڵ ئەبولهەیجای کوڕی ڕەبیبودەولەی ئەمیری کوردانی هەزبانی و خوشکەزای وەهسوودان و فەرمانڕەوای ورمێ و دەوروپشتی ڕێککەوت و پێکەوە گرێی پەیمانیان بەست کە بەیەک دەستی و پشتیوانی یەکدی غەز لە ئازربایەگان دەرکەن.

وەهسودان تا ئەوەدەمە پشتیوانی ئەوانی دەکرد و بەوان خۆی بەپشتەستوور دەزانی. ئەوجا بێزاری و دڵگیری خۆی ئاشکرا ئەکرد و بۆ لابردن و نەبوونکردنیان تێکۆشا.

کورد له هەموو لایێکەوە بۆ شەڕ و کوژتن و پاککردنەوەی غەزان، خرۆشان و هەڵستانە سەر خۆیان. لە کوردستان و دەوروپشتی ئەو خاکانەدا ئەبولهەیجا شیری لە غەزان ناو گەلێکی بێ سەروشوێن و نابوودکردن. «ابن الاثیر» لە سەربهوردی ساڵانی ٤٢٠ – ٤٢٩دا بەدرێژی لەوە دواوە. لەم شیعرانەی «قەتران» دیاردەکەوێ کە لەنێوانی غەزان و وەهسوداندا شەڕێکی قورس ڕوویداوە و کوژتاریکی بێ ژمار کراوە. ئەمە ٥ پارچە شیعری قەسیدەکەیەتی کە دەڵێ:

تراخیل و رهی ای شاه بسیارند ومن دانم
رهی را که کم ازقلاش و خیلی کمتر از ترکان
بەجنگ اهنگ تو کردند با پیگان بساسرکش
بمردی باز گردانیدی بر آندامشان پیکان
کنون تا از سرایشان تو سایەبر گرفتستی
نگه کن تا چه آوردست گردون بر سرایشان
همیشه عزم ایشان بود بر تاراج و برکشتن
چو باشد عزمشان آن گونه باشد حالشان اینسان
هلاک آن گه شود عاصی که بالا گیردش قوت
چنان چون مورکر گردد هلاک آنگه کەشد پران

له قەسیدەی خوارەوەی «قەتران» دیاردەکرێ کە شەڕی کورد و غەز لە زستاندا بووە. وەهسودان سەرکەوتووە و غەزیان لە ئازربایەگان دەرکردووە و بەسەر گەورەکانی غەزدا زاڵبوون؛ بۆ نموونە تەواوی قەسیدەکە دەنووسم:

گوا بس است کریمت را عطای مدام
نشان بس است سواریت را نبرد غزان
بدان نبرد کە چونان کسی نداده خبر
وزان گروه نبرده کسی نداد نشان
همه تیرفشاندن بسان آرش و گیو
همه بەتیغ کشیدن چور ستم داستان
همی زد وز بتابید تیر چون آتش
همی زد وز بتابید تیغ چون سندان

سر سواران گشته علامت شمشیر
دل دلیران گشته نشانه‌ی پیکان
فروع تیغ بدید او میان گرد سپاه
چنا نکه در شت تاری ستاره‌ی رخشان
سنان گرفته‌واندر کمان نهاده خدنگ
مبارزان همه برتافته ز چنگ عنان
سپاه باز دهد جان به‌شاه روز نبرد
وزان نبرد سپه‌را توباز دادی جان
از آن زمان که جهان بود یک تن تنها
که ایستاده به‌جنگ هزار سخت کمان
بدان گهی که هوای تو سوی تورکان بود
زهیچ خلق بد یشان نبود ذل و هوان
کنون که رأی تو ز یشان بگشت یکباره
پدید گشت بدیشان عدو هم از ایشان
ترا به‌طبع ملکشان هه‌ی نهد گردن
ترا به‌طبع ملکشان همی برد فرمان
چو میر و مهتر ایشان به‌زیر حکم توا ند
چه باک باشد ازاین عصیان بر عصیان
خدای یگانه بر تو زیان رسید ولیک
چو تو به‌جائی کس ننگرد به‌سود و زیان
به‌سالها که به‌تلخیت زد فلک بنیاد
به‌سالها که به‌نقصانت زد جهان بنیان
دوصد خوشیت پدید آمد ازیکی تلخی
دوصد مهیت بدید آمد ازیکی نقصان
دلیل آنکه خدای جهان به‌فضل و کرم
نگاهدارتن و جان تست از حد و مکان

ز خـانـدانـت يكى را بـه‌جـان نبـود گـزند
ز چاكـــرانت يكى را بـه‌تن نبـــود زيان
بدين هوا كـه دم اندر هو افـسـرده شـود
زبخت گشت زمـسـتـان بـه‌سان تابسـتـان
خـدا يگانا سـال نو و بسـاط نو است
به‌شـاد كـامى بنشين و غم زدل نيـشـان
از اين سپس نبود كار جز نشاط و شراب
از اين سـپس نبـود كـار جـز كنار بتـان

هەروەکـو مـێـژوونووسـەکـان لێی دواون و «ابن الاثیـر» لە ڕیزی سـاڵی ٤٣٠دا نووسیویە، دەستەیێک لە غەز لەگەڵ بۆ قاروبەری و دەستەیەکی دیکە لەگەڵ مەنسوور و گـۆگـتـاش ڕوو بەهەمـەدان و دەسـتـەیەک لەگـەڵ ناسـغـڵ ڕوو بەقـەزوین لە ئازربایەگـان دەرکەوتن و چوون. بەڵام هێشتا دەستەیێکی دیکەشیان لە ئازربایەگان مابوونەوە و لەژێر فەرمانی وەهسوداندا بوون؛ بەڵام ئەمانەش زۆری پێنەچوو دەستی بێعارییان درێژ کرد.

لەو بابەتەوە «ابن الاثیر» لە ڕیزی ساڵی ٤٣٢ دەنوویسی: وەهسودانی کوڕی مەملان لە تەورێز کـۆمـەڵەیێکی زلی لە غـەز مـیـوانداری کـردنە لای خـۆی کـە خـواردیان و خواردیانەوە، سی کەسی لە گەورەکانی ئەوانی گرت و خستنیە زیندانەوە و کۆمەڵەیێکی زلیشی لێ کوژتن.

دیسـان دەنوویسێ کـە: ئەو غـەزانەی لە ورمێ مـابوونەوە، گـردبوون و ڕوو بەخـاکی هەکاری چوون، تا لەگەڵ کوردی ئەو جێگایەشدا بەشەڕ هاتن. خوێن ڕێژێکی زۆریان کرد و کـوردان شکان. غـەزان بەسـەر چادر و مـاڵ و ژن و منداڵیـاندا زاڵبـوون و ڕوو بەکـێـوان کوردیان هەڵبڕین. کوردان دووبارە گەڕانەوە سەریان و بەگژیاندا چوون و تەنگەیان بەغەزان هەڵچنی و شکاندیانن و هەزار و پێنج سـەد کـەسیـان لە غـەزان کـوژت. سـەد کـەس لە پیـاوانی ناودار و حـەوت ئەمـیـری ئەوانیـشـیـان بەدیل گـرتن. غـەزان بەکـێـوەکـاندا پەرشوبڵاوبوونەوە. ئەبولهـەیجـای کـوڕی ڕەبیـبـودەولە کە لـەوە ئاگـاداربوو، چوو هەمـووی کوژتن و لەناوی بردن.

## جاری سێیەم هاتنەوەی غەزان بۆ ئازربایەگان

ئەو غەزانەی ساڵی ٤٣٠ لە ئازربایەگان دەرکەوتن ڕوو بەقەزوین و ڕەی و هەمەدان چوون. ئەوانە لەو شارانە و لە سپاهان و دینەوەر و کنکوڕ و جێگایانی دیکەدا سەربهورد و داستانی زۆریان هەیە، کە «ابن الاثیر» و مێژوونویسەکان لێی دواون. دوامینی ئەو داستانانە و هەموو دەستەکانی غەز لە «ڕەی» لە دەوری قزڵ کۆبۆوە کە ئەمیری غەزان بوو. ئەویش لە ساڵی ٤٣٢دا مرد.

توغروڵ بەگی سەلجووقی و براکانی لەودەمەدا پادشاهی خۆیان لە خوراسان دامەزراندبوو. ئیبراهیم یەناڵ برای دایکی توغروڵ بەگ بۆ گرتنی «ڕەی» لەشکری کێشا.

غەزان لە ترسی ئیبراهیم کۆبوونەوە و ڕوو بەئازربایەگان کەوتنەڕێ. ساڵی ٤٣٣ گەیشتنە خاکی ئازربایەگان، بەڵام لەبەر بەدڕەفتاریێکی لەو خاکەدا کردبوویان نەشیان خۆبگرن. بەکۆمەڵە ڕوو بەئەرمەنستان و جزیرە و دیاربەکر ڕۆیشتن.

لەودەمەدا چتێکی کە لە ئازربایەگاندا غەزان ڕوویدابێ لە دەستدانییە. بەڵام کیسرەوی قیتعە شیعرێکی قەترانی نوویسیوە کە باس لە شەڕی وەهسودان دەکا لەگەڵ غەزان کە لە دەشتی سەراب ڕوویداوە و غەزان شکاندراون و کۆمەڵەیێکی زلیشیان لێ کوژراوە. قەڵاییێکی (دژ) لە دەستیاندا بووە و وەهسودان گرتوویە. وا دەردەکەوێ هەموو تورکان لە شەڕدا یارمەتی یەکدیان کردووە. تورکی مەسعوودی و مەحموودی و مەودوودی و داودی و هی دیکە بۆ شەڕی وەهسودان بوون بەیەک. (قەتران) دەڵێ:

کمر بستند بهر کین شهی تورکان بیکاری
همه یک رو بەخون خواری همه یکدل بجراری
بەسان کوه ازا نبوهی و چون ریگ از فراوانی
چو شیران ازگران زخمی و چون دیوان از سبکساری

لە شیعری ٧ مینیدا لە وەهسودان پادشای ئازربایەگان دواوە و دەڵێ:

چو مالی رایتی خسرو تاری گرد پیداشد
بر ایشان روشن شد بەکرداری شب تاری
بەاندک لشکر اندک کرد مر بسیار ایشان را
سپەرا شاه دانا بەزهم پشتی و بسیاری

لەدوای ئەوە کە کوژتاری لێکردوون و بەو شەڕەیدا هەڵگوتووە، لە شیعری ١١دا دەڵێ:

چه ارزد غــــدر با دولت چه ارزد مکر بادانش
اگــر چه کــار ترکــان هست غــداری و مکاری
خــداوندا پراکندی زهم پیــویســتــه خلقی را
چه اززنگان چه از گرگــان چه از آمل چه از ساری

دایر بەوە کە شەڕ لە سەراب بووە، ئەمە شیعری (١٣)یە:

ز تنشــان تل ها کردی بەصــحرای سراب

اندر

مـیــان تل ها کردی ز خـو نشـان جوی ها

جاری

کە گوتمان قەلاییێکی ئەوانیشی گرتووە لە شیعری ١٧یدا دەڵێ:

دژی را هجری گردون بکردی پشت با هامون
بەیک ســاعت چنان کــانجــا نبـود آن هرگــز

انگاری

لە دوای ئەوە چلۆنی کـوژتـار و گـرتـن و ئازایی دەکـاتە وێنە بەم شـیـعـرەی ٢٣ - ٢٤ بەوەهسودان هەڵدەڵێ و ستایشی دەکا و دەڵێ:

چو تو گـردون نیـاورده چو تـو گـیـتی نپـروەرده
توهسـتی حـاجت مـردم تو هسـتی حـجت باری
نـکـو روی ونـکـو رأی ونـکـو دیـن ونـکـودابـی
نکو فـر و نکو کـیشـی نکو فـال و نەکو کـاری

لە شیعری (٢٨)یشدا دەڵێ:

بمان اندر جهـان شادان کە در جسم جهـان جانی
بزی برمـسـندی شـاهی کـە شـاهی را سـزاواری

## جاری چوارەم هاتنەوەی غەزان بۆ ئازربایەگان

غـەزان لە جزیره و دیاربەکر ئاسووده دانەنیشتن و ئارامیان نەگرت و دەستـیـان بۆ تالان و کـوژتـار درێژ کرد. لەگـەڵ نەسرودەولەی کـورد خـاوەند و پادشـای ئەو خاکـانە سەربهـورد و

داستانی دوورودرێژیان هەیە (لە کتێبی ئێمەدا «پادشایانی کورد» کە هێشتا چاپ نەکراوە) (قراوش)یان شکاندووە.

ئەمیر قراوش چوو لەشکرکێشی دەست پێ کرد و لەشکرێکی قورسی لە کورد و عەرەب پێکەوەنا و مانگی ڕەمەزانی ساڵی ٤٣٥ لینگی دا سەر غەزان و کۆمەڵەیێکی زل و سێ سەرکردەشی لێ کوژتن. کۆمەڵەیێکی کەم گیانیان ڕزگار کرد و هەڵاتن.

غەزان لەو مەیدانەدا ڕزگاربوون و ئیدی لە خاکی جزیر و مووسڵ و دیاربەکر خۆیان پێڕانەگیرا و ڕوو بەئەرمەنستان چوون و لەوێوە گەڕانەوە ئازربایەگان، کە لانە و جێگای پارازتنی پێشوویان بوو. لەوە پتر سەر ڕشتەیێک لە دەستدا نییە. بەڵام فەتح نامەیێکی قراوش عوقەیلی بۆ ئەبولهەیجای کوردی کوڕی ڕەبیبودەولەی ناردبوو -کە خاوەندی ورمێ بوو- گوتوویە: «سێ هەزارم لە غەزان کوژت». ئەبولهەیجا لە پاسوخدا وتی: «ئەمە چتێکی زۆر گرانە، ئەویش ئەمەیە کە: غەزان وەختێک لە خاکی خۆم دەرکردن، پردێک بوو ناچار دەبوایە لەسەر ئەو پردە ڕابرن. من پیاوێکم لەسەر ئەو پردە دانا کە بیانئەژمێرن. سی و هیندە هەزار کەسە لەو پردە پەڕینەوە. بەڵام لە دوای شکان و گەڕانەوەیان، جاری دووەم کە ئەژماردران نەدەگەیشتنە پێنج هەزار کەس. لەوانە ئەوە دەبێ هەموو کوژرابن، یان بەمەرگی خۆیان مردبن.».

ئەو هێندە کە ئەبولهەیجا ئەژماردوونی هەموو لە ئازربایەگاندا کە چوون ئەوەی کە گەڕانەوە لە دەست قراوش و خەڵکی ئەرمەنستان و کوردانی جزیر و دیاربەکر ڕزگاربوون، هی دیکەیان هەموو کوژراون. کیسرەوی کە لەوە دەدوێ دەڵێ: ٣٠٠٠ کە قراوش کوشتوونی هی دیکە لە ئەرمەنستان تووشی ئاسیب و کوژتاربوون، کەوا ٥٠٠٠ یان دووبارە توانیویانە بگەڕێنەوە ئازربایەگان، لەوە پتر سەربهوردی غەزان و وەهسودان لە دەستدا نییە. لەمە بەملاوە شەڕی وەهسودان و موسڵمانان لەگەڵ ئەرمەنی و ڕۆم دێتە بەرچاو کە لەسەر شاری بەرگری ڕوویداوە.

## شەڕی موسڵمانان و تەرسایان

شاری بەرگری گۆیا لە شیمالی شەرقی دەریاچەی «وان» دابووە. دزێکی هەبووە، ئەو دزەش لە دەست ئەبولهەیجای کوڕی ڕەبیبودەلەی خوارزای وەهسودان و خاوەندی ورمێدا بوو. ئەبولهەیجا لەگەڵ خاڵۆی خۆی -کە وەهسودان بوو- نێوانیان تێکدرا و دۆستی و خزمایەتیان بوو بەدوژمنی. وەهسودان لەگەڵ ڕۆمیان پەیمانی بەست کە بچێتە سەر شاری

بەرگری. لەسەر ئەوە پادشای ڕۆم لەشکرێکی قورسی ناردەسەر ئەو خاکە و گرتیان. ئەو وەڵامە کە بەخەلیفە ڕاگەیاندرا، پیاوێکی نارد نێوانی ئەبولهەیجا و وەهسودانی ڕیکخستەوە و پێکەوە ئاشتبوونەوە و دەستیان دایە یەک و بۆ ڕزگاکردنی بەرگری لە دەست ڕۆمیان تێکۆشان. لە غازی و موجاهیدانی ئیسلامیان لەسەر کۆبووەوە و گەلێک تەقەلایان دا، بەڵام بەقسەی «ابن الاثیر» نەشیان بەرگری لە ڕۆم بستێننەوە.

ئەم ئەبولهەیجایەی کوڕی ڕەبیبودەولەی خاوەندی ورمێ و گەورە و سەرداری کوردانی هەدیانی (هەزبانی) بوو، لەسەر ئەو خاکە پادشا بوو. بەڵام سەرەتای بنەماڵە و حوکمڕانی ئەو ڕەبیبودەولەی بابی ئەو لە مێژووان دا سەر ڕشتەیەکی وا دەستنەکەوتووە. ئاگادارییێکی لەوانە لە دەستدا بێ. نووسراوی «ابن الاثیر»ە و کەسێکی دیکەش لە بنەچەکە و حوکمڕانیان نەدواوە. مودەقیقی بەناوبانگ سەید ئەحمەد کیسرەوی لە بەخشی دووەمی «شهریاران گمنام»، لاپەڕە ٨٤ دیسان دەڵێ: «لە سەرەتای کاری ئەبولهەیجا و بابی ئەو، بەهیچ کلۆجێک ئاگایی لەدەستدا نییە و نازاندرێ لە کام بنەماڵەیە و لە کەیەوە بەسەر ورمێدا دەستەڵاتیان پەیدا کردووە. هەروەها دەستەڵاتی ئەو بەسەر بەرگری، کە یەکێک بوو لە شارەکانی واسپۆرگان و ئەویش ئەرمەنستان بوو، دیسان نادیار و نەزاندراوە.

کیسرەوی دیسان کە لەوە دواوە و لە کتێبەکانی ئەرمەنی وەرگرتووە و دەڵێ: لە تەئریخەکانی ئەرمەنییاندا ئەم داستانە چاکتر شەرحکراوە لە هی «ابن الاثیر». مێژوونووسەکانی ئەرمەنییان خاوەندی «بەرگری» یان بە«خدریق» ناوبردووە، لە وەهسودان و ئەبولهەیجا هیچ نەدواون. بەڵام لە دوامینی داستان و سەربهوردی «خدریق»دا دەڵێ: «می توان پنداشت کە خدریق نام همین ابیلهیجا بودە است...» دەتواندرێ بگوترێ خدریق ناوی ئەو ئەبولهەیجایە بووبێ.

کیسرەوی کە لە چاپیان وەردەگرێ، ئەو سەربهوردە لە ساڵانی ١٠٣٨ -١٠٣٩ و ٤٣٠ - ٤٣١ھ ڕوویداوە دەڵێ: لەم ڕۆژانە یۆنانییەکان خریسلیۆس (نیکوغۆس قاوا سیلاس) ناوێکیان لەسەر خاکی واسپۆرگان کردە حوکمڕان. ئەو هەڵمەتی بردە گۆمی ئاختامار (وان). شاری بەرگری زەمانیکی دووربوو، موسڵمانەکان (کورد) لە دەست ئەرمەنییان دەرخستبوو گرتییەوە. ئەمیری بەرگری کە خدریق (ئەبولهەیجا) بوو خستیە دەست و بەندی کرد و هاوێژتییە زیندانەوە، لە سوپاهی خۆی بەپاسەوانی دەستەییێکی لەسەر بەرگری دانا.

له دوای چەندێک حکوومەتی یۆنان ئەو حوکمڕانەی لابرد و پیاوێکی دیکەی نارده سەر واسپوڕگان و کردیه حوکمڕان. ئەویش پاسەوانەکانی لەسەر بەرگری لابرد و ناردنیه جێگایەکی دوور که بۆ ئەسپ و چایەر و لەوەرگا بوو.

خدریق له زینداندا کەلێنی دەستکەوت، پیاوانی بەپەنهانی نارده لای ئەو پادشایانی خاکی ئێران که لەوێ نزیکبوون و هاواری لێکردن که فریای بکەون. ئەوانیش بەتالووکه لەشکریان گرد کردەوه و لینگیاندا سەر بەرگری. هەر چوار دەورەی شاریان گرت و باروویان شکاند و چوونه نێو شارەوه. بیست و چوار هەزار ئەرمەن و یۆنانییان کوژت و ئەمیر (خدریق)یان له زیندان دەرخست. لەولاوه «داجاد» ناو سەرکردەی ئەرمەنی لینگیاندا سەر بەرگری و ئەمیر خدریق پەنای بۆ «ئەرک» برد و هاواری له پادشایانی کوردانی دەوروپشت کرد.

ئەرمەنی لەوه نەزانبوون که ئەمیر خدریق یارمەتی خوازتووه. بەبێ ئەندێشه له کەیفوشادیدا ڕایان دەبوارد. هەر هێنده ئاگاداربوون لەشکری ئەمیرانی کوردیان له هەر چوارلاوه گەیشتەسەر و هەڵمەتیان برد و دەستیان کرده کوژتاریان. موسڵمانان هەبوو نەبووی ئەرمەنییان تاڵانکرد و شیری خوێن ڕێژیان تێنان و جگه له داجار و دەستەیەک ئەرمەنی -که هەڵاتن- کەسێک ڕزگار نەبوو. بەوجۆره ئەرمەنی شکان و کورد سەرکەوتن.

ساڵی دوایی قەیسەری ڕۆم لەشکری نارد، بەرگری له کوردان ئەستاندەوه. (چامچیان، جلدی دووەم، لاپەڕە ٩١٧ - ٩١٨ شهریاران گمنام، کیسرەوی).

له دوای ئەوه وەهسودان و ئەبولهەیجای خوارزای چوونه سەر بەرگری بەکوژتار گرتیانەوه (ابن الاثیر - ساڵی ٤٣٠ - ٤٣١ه).

## چووینی ئەمیر وەهسودان بۆ گەنجە

ئەمیر ئەبولحەسەن عەلی لەشگری دووەم کوڕی مووسای کوڕی ڕاوادی شەدادی له ساڵی ٤٢٥وه فەرمانڕەوای خاکی ئاران بووه لەگەڵ ئەمیر وەهسودان نێوانی ناخۆش و پشێوبوو، وەکو له پێشدا گوترا قەسیدەیێکی قەتران لەو بابەتەوه گوتراوه و لەو قەسیدەیەدا وا دەردەکەوێ ئەودەمە قەتران له گەنجە لەکن ئەمیر ئەبولحەسەن بووه. بەڵام له قەسیدەی هاتووی قەتراندا دیاره ئەم چووینەی ئەمیر وەهسودان بۆ گەنجە بەئاشتی و خۆشی و بۆ بیناغەی دۆستی بووه و لەودەمەشدا قەتران له گەنجە بوو. کیسرەوی دەڵێ: وا دیاردەکا ئەم چوونە بۆ گەنجە ساڵی ٤٢٧ - ٤٣٢ بووه.

ئەمە چەند شیعرێکی قەترانە:

مهی که سجده برد پیش او مەگردون

بەنیکوئی بر او نیکوان دیگردون

بدان دولاله مصقول دل کند مقتول

بدان دو سنبل مفتول دل کند مفتون

اگرنوان و نگونست زلف او چه عجب

که صد هزار دل است اندرو نوان ونگون

ایا بر وی جو گلنار خیز و باده بیار

ز باده ســـــاز رخ بود باده گلگون

اگر نبیذ بەهرجای وهر زمین نهی است

بەگنجه نیست بر من نبیذ نهی اکنون

از آن که گنجه کنون خلد عدن را ماند

نبیذ نهی نباشد بەخلد عدن درون

زمین بەدیبه وزر اندرون شده پنهان

هوا بەعنبر و مشک اندرون شد معجون

همان وصال پدیدار گشت در هجران

همان بهار پدیدار گشت در کانون

زبس نثار که کردند بر زمین گوئی

برون فگنده زمین گنج خانه قارون

کسی نماند ازاین فضل درجهان درویش

دلی نماند ازاین راد در جهان محزون

اگر بەخانه شیر آمد است شید روا است

بدانکه خانه شید است شیر بر گردون

لەم شیعرە وا دەردەکەوێ کە چووینی وەهسودان بۆ گەنجە لە مانگی دووەمی هاوین دابووە. لێرەدا ئەبولحەسەن بەشیر و وەهسودان بەرۆژ دادەنێ:

کنون که گشت دو خسرو بەیکدیگر موصول

کنون که گشت دو کوکب بەیکدیگر مقرون

دو شـهـريار قـديم و دو جـايگاه قـەديم
همان دو خسرو منصور و سيد و ميمون
امـيـر ابوالحسن و شـهـريار ابو منصـور
كه نصرت آيد و احسان ازآن و اين بيرون
يكى بەگـوهر شـداد و زو بەگـوهر بيش
يكـى ز تخنه راواد و زو بملك افـــزون
بەبخت اين كند آن خيل دشمنان مخذول
بەخـيل آن كند اين بخت دشمنان وارون
بەدلت اين بود آنرا همــيـشـه راه نماى
بەنعـمت آن بود اين را همـيشـه راه نمون
يكى بگيـرد چندان كـه داشـتى مملان
يكى بگيـرد چندان كـه داشـتى فـضلون

ئەم شيعرە و شيعرى سێيەمينى پێش ئەمە ديارى كردووە كە ئەميرى ئەبولحەسەن لە گەوهەرى شەدادى بووە و فەزلوون باپير يا مامى بابى لەشگرى بووە كە دامەزرێنەرى بنەماڵەى شەدادى فەزلۆونيان كوردى ڕاواديیە و لە كونيەشيان دواوە كە ئەبولحەسەن كونيەى عەلى لەشگرى و ئەبومەنسوور كونيەى وەهسودان بووە كە لە شيعرى دوامينى سێيەمينى دواى ئەم شيعرە نيشان دراوە و لەوە كە دەڵێ: «يكى بەگوهر شداد زو بەگوهر بيش» ديار دەكرێ. ئەمير ئەبولحەسەن زۆر دەوڵەمەند و خاوەند گەنج و ماڵ ودارا بووە و وەهسودان موڵك و خاكى لە ئەمير ئەبولحەسەن پتربووە. بەڵام بەگەوهەر و دراو و گەنج وەكو ئەمير ئەبولحەسەن نەبووە. شيعرەكانى يەک بەيەک ئاشكران.

## وێرانبوونى تەورێز بەبولەرزە

لە مێژوونووسەكان ئەوەى لەو بولەرزەيە دوابێ «ابن الاثير» و «حمدالله مستوفى» و «ناصر خسرو» بوون و بەدووردرێژى لێى دواون و قەتران بەقەسيدەش باسى كردووە. ئەويش لە دەورى ئەمير وەهسوداندا بووە؛ بۆيێ دەمەوێ لێرەدا كەمێكى لێ بدويم. بەبێ گرێ ساڵى بولەرزە لە ٤٣٤دا بووە، بەڵام كيسرەوى لەوە دەدوێ و قسەى مێژوونويسەكان بەراورد دەكا:

مستەوفى لە «مجمع ارباب الممالک» قازيى ڕوكنودينى خوئى دەگێرێتەوە كە لە ڕۆژى

چاردەی مانگی سەفەری ئەو ساڵەدا بووە. «ناصر خسرو» دەڵێ: شەوی پێنشەممەی حەڤدەی ڕەبیعی یەکەم و دوای نوێژی خەوتنان دەستی پێ کرد. بەڵام لەو دوانە وا دەردەکەوێ بولەرزە چەند جارێک ڕوویداوە، چونکو شیعرەکانی قەترانیش وامان بۆ دیاردەکا و لە سەرەتای بەهاردا بووە. یا خەزان بووە ئەویش بەقسەی کیسرەوی نیوەی خەزان بووە.

«ابن الاثیر» لە بابەت سەختی و توندی بولەرزەوە دەنوویسێ: «دزوبارووی شار و بازاڕەکان و خانوان و پتری سەرای پادشاهی وێرانکرد. لەبەرئەوە کە ئەمیر لە باغێکدا جێگای هەبوو هیچی بەسەر نەهات و زندوو ماوە».

«ابن المستوفی» لە قازیی ڕوکنودین وەردەگرێ و دەڵێ: هەموو شار وێرانبوو. بەڵام «ناصر خسرو» دەنوویسێ کە هێندێک لە شار وێرانبوو و هێندێکی تووشی خراپی نەبوو. کیسرەوی دەڵێ: ڕاستە کە قسەی ناسر خوسرەو بێ؛ چونکو لە درۆ و گەزاف دوورە. «ابن الاثیر» دەڵێ: لە دانیشتوانی شار ئەوی لەناوچوون و ئەژماردراون نزیک (٥٠) هەزار کەس دەبوون. قازی ڕوکنودین دەنوویسێ: «ابن الثیر» دەنویسێ کە لەچل هەزار کەم و پتری نەبوون. ئەو سەربهورده هێندە لە ئەمیر وەهسودان گران هات، وەکو ئەو مردووانە لە خۆی مردبێ بەرگی سوگواری ڕەشی پۆشی و لە ترسی ئەوە نەوەکو سەلجووقیان هەڵمەتی بەنەسەری، پەنای بۆ دزێکی لە دزانی خاکی خۆی برد. لە هەڵبەستی قەتراندا دەردەکەوێ کە ئەو سەربهورده لە وەهسودان و مەملانی کوڕی زۆرگران بووە و دەوریکی دوور، لەکەیف دووری کردووە ئەمە چەند شیعرێکە دەینووسم:

نبود شهر در آفاق خوشتر از تبریز

بەایمی و بەمال و بەنیکوئی و جمال

ز ناز و نوش همه خلق بود خوشا خوش

ز خلق و مال همه شهر بود مالا مال

لە شیعری هەشتەمیندا دەڵێ:

خدا پدید نیاورد شهر بهتر از این

فلک بەنعمت این شهر برگماشت زوال

قەتران لە لەرزینی زەوی و وێرانیی شار و ئەزیەتی خەڵک دەڵێ:

بەنیم چندان کز دل کسی بر آرد قیل

بەنیم چندان کسی نر آرد قیل

فـراز گـشت نشـیب و نشـیب گـشت فـراز
رمـال گـشت جبـال و جبـال گـشت رمـال
دمیـده گشت زمین و خـمیـده گشت نبـات
دمـیـده گشت بحـار و رمنده گـشت جبـال
بسـا سـرای کـه بامش همی بسـود فلک
بسـا درخت کـه شـاخش بسـود هلال
از آن درخـت نمـانـده کـنـون مـگـر آثـار
از آن سـرای نمـانده کنون مـگـر اطلال
کسی که رسته شد از مویه گشته بود چوموی
کسیکه جسته شد از ناله گشته بودچو نال
یکی نبـود کـه گـوید بەدیگری کـه مموی
یکی نبـود کـه گـوید بەدیگری کـه منال
همـه بدیده بدید چو روز رسـتـاخـیـز
زپیش رایت مـهـدی و فـتنه و جـال
کـمـال دور کناد ایزد از جـمـال جـهـان
کـمی رسـد بەجـمـالی کـجـا گـرفت کـمـال
چنـانکه باید بگذاشـتم همی شب و روز
بەناز و باده و رود و سـرود و غنج و دلال
بـەهـر بـود دل مـن ربـوده چـنـد نـگـار
بەفـضل بود دل من سـپـرده چند همـال
بدان همـال همی دادمی بەعلم جـواب
بدین نـگـار همی کـردمی بەبوسـه سـؤال
یـکـی گـروه بزیـد انـدر آمـد ز مـرگ
یـکـی گـروه پریشـان شـدند از اهوال
رفـتگـان نشـنیـدم کنون یکی پیـغـمـام
ز مـانـدەگـان نەبـینم کنون بهـا و جـمـال
قەتران لە بابەت بولەرزەی تەورێزەوە، گەلێک قەسیدەی هەڵبەستوون و لەو چەندجار دواوە، ئەمەش سەرەتای قەسیدەیەکە:

آن غـیـرت چندان نگر از قـدرت یزدان

ازقدرت یزدان چه عـجب غیرت چندان

لەوە کە بولەرزە دوایی هاتووە و بەماملانی کوڕی وەهسودان دەڵێ:

زمین نـگشــــتی لـرزان اگـــر نـسب کــــردی

بەحلم شــاه ســتـــوده دل و زدوده خــصـــال

چراغ شــاهان مملان کـــه پیش تیغ و کــفش

یکیست شیر و شکال و کیست سیم و سفال

ئەم چەند شیعرەی قەتران بۆ دڵخۆشی دانەوەی مەملانی هەڵبەستووە:

خــدایگانا کـــار جــهـــان چنین آمـــد

گهی نشاط و سرور و گهی بلاو ملال

از آن غمی که گذشته برتو یاد مکن

وزان بدی که بیاید بەسوی تو مسکال

غم گذشته کشیدن بود محال مجاز

غم نیـامـده خـوردن بود مـجاز مـحـال

بخـــواه باده بر آواز مطربان جــمـــیل

بگیـر سـاغـر بر یاد مـهـتـران جـلال

«ناصر خـسـرو» سـاڵی (٤٣٨) چۆتە تەورێز و شـارێکی گـەورە و ئاوەدان و خـۆشی چاوپێکەوتووە. ئەمیر وەهسـودان لە دوای بولەرزە کۆشاوە و شاری ئاوەدان کردۆتەوە. وا دیار دەکرێ نزیک چوار ساڵ لەگەڵ دامەزراندنەوە و ئاواکردنەوەی خەریکبووە. «حمدالله المستوفی» و «قاضی رکن الدین» بەدووروودرێژ لەوە دواون. کیسرەوی لەوانە وەردەگرێ.

## شەڕی وەهسودان لەگەڵ سپەهبدی موغان

کـیـسـرەوی لە بەخشی دووەم و لاپەڕە ٩٣ دا لەم شەڕە دواوە، ئەویش لە شـیـعـرەکـانی قـەترانی دەرخســتـووە: خـەڵکی موغـان مـیللەتێکی ئازا و دلێـر و دانیـشـتـوی کـێـوانی ئازربایەگـان و گـەلێـک شەڕکـەر و جنگجـۆبوون. لە سـەرەتای ئیـسـلامـەوە باری کـەسـیـان هەڵنەگـرت و بەئازادی دەژیان و سـپـەهـبـدیان لە خـۆیان هەر هەبووە. بەقـسـەی «ابن خردادبه»: کە لە سەرەتای قەڕنی سێیەمدا سپەهبەدیان ناوی «شکله» بووە و لە قەڕنی

چوارەمدا سپەهبەدیان «دلۆلە» بووە و لە دەوری وەهسوداندا فەرمانڕاوییەکیان بووە کە فەرمانبەری وەهسودانی نەکردووە. وەهسودان لەژێر فەرمانی کوڕە گەورەی خۆی ئەمیر ئەبونەسر مەملاندا لەشکرێکی ناردەسەر ئەو سپەهبو دە و لە دوامێنی شەڕدا سپەهبدە ڕامدەبێ و دەکەوێتە ژێر فەرمانیەوە. لە دوای ئەوە مەملان دزێک لە ئەردەوێڵ دروست دەکا. قەتران لەو لەشکرکەشیەدا لەگەڵیاندا بووە. لە دوای گەڕانەوەی ئەم چەند شیعرەی گوتووە:

من آن کشیدم و آن دیدم از غم هجران
که هیچ آدمی ئی نیست دیده در دوران
کنون وصال همه بر دلم فەراموش کرد
خوشا وصال بتان خاصە ازپس هجران
چو من بشادی باز آمدم ز لشگرگاه
گشاده طبع و گشاده دل و گشاده زبان
میان هنوز نبودم گشاده کآمده بود
زره بسومی من آن سرو قد موی میان
چو لاله کرده رخ اندر کنارم آمد تنگ
کنار من شد از آن چون شگفته لالەستان

قەسیدەیێکی بەرز و خۆشی بەئەمیر مەملاندا هەڵکوتووە و ستایشی دەکات و لە شەڕ و گرتنی ئەمیر موغان و دروستکردنی دژ و شکان و هەڵاتنی دوژمن باس دەکا. نزیک بیست و دوو شیعر ئێمە لە خوارەوە شیعری سەرەتا و شیعری نۆزدەمین و شیعری بیست و دووەمییە دەینوویسینەوە لە «داریووم» دواوە کە لەنێوانی ئاران و موغاندا بووە و سەرنواندنی سپەهبدی موغان و دروستکردنی دژ لە ئەردەوێڵە:

١- وغاش را بس بیکار اردبیل دلیل
هنرش را بس پیکار داریوم بیان
١٩- عدو شکسته و آواره باز گشته زجنگ
کمر بەطاعت بسته سپهبد موغان
٢٢- ئەمیر گفت ببايد بأردبیل دژی
بناکنند که جاوید ماند آن بنیان

## هاتنی توغروڵ بەگی سەلجووقی
## بۆ ئازربایەگان و دووامینی کاری وەهسودان

لە دوای ئەوە کە توغروڵ بەگ و براکانی خاکی خوراسانیان لە سولتان مەسعود گرت و لە شاری نیشاپوور بناغەی حکوومەتی خۆیان دامەزراند، لە دوای چەندێک بەسەرری و هەمەدان و سپاهان و زەنگاندا زاڵبوون. خاکی دەیلەم و دەوروپشت دیسان کەوتنە ژێر فەرمانیانەوە. بەڵام خاکی ئازربایەگان تا ساڵی ٤٤٦ لەسەر خۆی ماوە.

لەنێوانی ساڵانی ٤٣٤ تا ٤٤٦دا نێوانی وەهسودان و توغروڵ بەگ چۆن ڕابووردووە و چی کراوە نەزاندراوە و چ پەیمانێک لەنێوانیاندا گرێدراوە، کەوا ١٢ ساڵ دەوروپشتی ئازربایەگان کەوتە دەست توغروڵ بەگ و وەهسودان، هەروا ماوە. بەڵام لە ڕابردوودا لە بابەت بولەرزەوە لە «ابن الاثیر»م وەرگرت کە گوتوویە: تەنها وەهسودان لە بولەرزە ڕزگاربوو ئەویش لە ترسی سەلجووقیان پەنای بۆ دژێک برد. لەوە پتر ئاگاداری لە دەستدا نییە و دیسان نازاندرێ ساڵی ٤٤٦ بەبێ شەڕ و کێشە توغروڵ بەگ چۆن چۆتە ئازربایەگان و وەهسودان پێشوازی کردووە. دەبێ لەوەپێش نووسراو و پەیمان هەبووبێ. بەنووسینی «ابن الأثیر» دیاردەکا وەهسودان لە هەڵمەت بردنی سەلجووقیان بۆ سەر ئازربایەگان ترسی هەبووە.

«ابن الأثیر» دەڵێ: کە توغروڵ گەیشتە ئازربایەگان تەمای چوونە سەر تەورێزی هەبوو. ئەمیر ئەبو مەنسوور وەهسودان فەرمانی ئەوی قبوڵ کرد و خوتبەی بەناوی ئەو خوێندەوە و هەر دراو و پولێکی لێی ویستبوو بۆی نارد و کوڕی خۆشی بۆ دڵنەوایی دا بەو.

ابن الاثیر ساڵی (٤٤٦).

جگە لەوە دەنگوباسی وەهسودان نییە؛ بەڵام جگە لەمە لە ساڵی ٤٥٠ «ابن الاثیر» دەنووسێ: «لەم ساڵەدا سولتان توغروڵ بەگ مەملانی کوڕی وەهسودانی کوڕی مەملان، کە گەورە کوڕی بوو لە جێگای بابی لەسەر حوکمڕانی ئازربایەگانی دانا».

کیسرەوی دەڵێ: لەمەوە وا دیار دەکا تا ئەو ساڵە وەهسودان مردووە. ئەمەش زۆر جێگای ئەندێشە و بیرە لە دیوان و قەسیدەکانی قەتراندا باسێکی نییە؛ ئەگەرچی لە دوای وەهسودان بەچەند ساڵان قەتران هەر زندووبووە و بەکوڕانی وەهسودانی هەڵگوتووە، بەڵام باسی مردن یا سەر گوزشتە و بەسەرهاتێکی وەهسودانی نەکردووە. هێندە دەزاندرێ لەو ساڵانەدا بوو، وەهسودان دوژمنی زۆربوون و لێی ترساوە و لەنێوانیاندا شەڕ ڕوویداوە

ئەمە شیعرێکی قەترانە:

اگـر گـهی حـدثانی فـتـاده ملک ترا

چە بود بس نبـود مـلک خـالی از حـدثان

ئەوە قـیـتـعـەیەکی دوورودرێژە و ئەمـەش شـیـعـری قـیـتـعـەیەکی ١٥ شـیـعـرییـە کـە لە پێنجەمیندا دەڵێ:

گر گهی نگبت رسد ملک ترا چون عـادتست

سـینە بفـروزد زغم زین دشـمنت شـادان شـود

لەو قیتعیەدا شیعری هەشتەمی دەڵی:

هرچند اندر طابع تو نـگبـتی بود آن گـذشت

زین سپس ملک توبیش از ملک نوشروان شود

**٤- ئەمیر ئەبو نەسری مەملان کوڕی وەهسودان**

بەنوویسـینی کـیـسـرەوی کـە باوەڕی کـردووە وەهسـودان سێ کـوڕی هەبووە: ١- ئەبونەسر مەملان، ٢- ئەبولهەیجا مەنوچەهر، ٣- ئەبولقاسم عەبدوڵڵا. مەملان برای گەورە و لە دەوری بابیدا پێشکاری بووە و ڕەشتەی هەموو کارێکی لە دەستدابووە، هەروەکو قەتران دەڵێ:

بەدولت تو همـەکـار ملک نـیکو کـرد

نشـاط مـبـانت فـرزند مـهـتـرت مملان

پســر چنین بود آنرا کـەتو پدر باشی

گـهـر نـخـیـزد نیکو مگر ز نیکو کـان

ئەوەی بەوەهسودانـدا هەڵگوتووە و ئەمەش بەمەملاندا:

تو هستی پیشکار خسرو اما          ترا چرخ از شمار پیشکاران

وەکو گوترا توغروڵ بەگ ساڵی ٤٥٠ مەملانی لە جێگای وەهسودانی بابی کردە پادشای ئازربایەگـان، بەڵام جگە لەوەنـدە کـە «ابن الاثیـر» نـوویسـیـویە هیچ ئاگـاداریەک لە حوکمڕانی و چەند و چوونی مەملان نییە.

کـیسـرەوی دەڵێ: قـەتران هەرچـەند پتری شـیـعـرەکـانی بەمـەمـلاندا هەڵـگوتووە، بەڵام لە دەوری پێشکاری مەملان و حوکمڕانی مەملان لە دیوانی قەترانیشدا هیچ دەست ناکەوێ.

بەڵام لە هێندێک قەسیدەدا باسی شەڕ و کوژتارێک دەکا کە مەملان لەگەڵ دوژمنیدا بووە. ئەویش نازاندرێ لە دەوری خۆیدا بوو یان لە دەوری بابیدا بووە. ئەم شیعرەی خوارەوە وامان بۆ دیاردەکا، مەملان کە پادشا بووە بەگژ ئەرمەن و ڕۆمدا چووە و شکاندوونی:

ندانی چه آید ابر کافرستان ز تیغ و سنان شاهنشاه غازی
سر پادشاهان انصر مملان که صد بیشه شیر است در ترکتازی

لە دوای چەند شیعرێک دەڵێ:

گه از بهردین جفت جنگ و جهادی
گه از بەهر دل یار بکمان و نازی

لەم شیعرەی خوارەوەی قەتران، وا دەردەکەوێ کە مەملان شاعیر بووە:

گر کذارد نظم بارد لفظ او در نظیم
ور نگارد نثر آرد کلک او در منیر

لە قەسیدەیەکیدا کە ئەمە شیعرێکیە دیاردەکرێ لە دەوری وەهسوداندا مەملان کوڕێکی بووە، بەڵام ناوی چی بووە؟ کەی مردووە؟ نادیارە. شیعری چوارەم:

ناحشر بقای پسر وجد و پدر باد
کزهر سه جهان را شرف و مفتخر آمد

## ٥- ئەبولهەیجای مەنوچەهر

ئەمە گوایا کوڕی دووەمینی وەهسودان بووە و لە نوویسینی کیسرەویدا وا دەردەکەوێ وەهسودان کە کوڕێکی داوە بەتوغروڵ بەگ، ئەمە بووە. بەڵام لە سەربهوردی ئەم کوڕەش هیچ لە دەستدا نییە. کیسرەوی تەنها لە شیعرەکانی قەتران دواوە کە بەمەنوچەهریدا هەڵگوتووە:

شایدار گاه خطب همچون پدر اورا لقب
زآنکه دارد چون پدر کردار و گفتار و لقا
ای ترا عدل خوداوند فروختار عجم
زبیدت ملک خریداری خداوند سما

لە شیعرکانی قەتراندا ئەم شیعرە نیشان دەدا کە مەنوچەهر لە خوراسان بووە:

گر خوراسان خوشتر آمد از وطن اینست رسم

باز بحشادت وطن یزدان بیچون و چرا

چووینی مەنوچەهر بۆ خوراسان لەبەرئەوە بوو گوترا، بەلام کەنگی هاتۆتەوە ئازربایەگان، دیار نییە و بۆ گەیشتنە حوکمرانی چۆن تێکۆشاوە، ئەویش نەزاندراوە. ئەم شیعرەی قەتران خوازتنی بوونە پادشای مەنوچەهرە:

جد او را کرد والا کردگار اندر رهی

بس نماند تاجو جد خویشتن والا شود

گەلێک لەوانە دواون، بەلام هەموو نادیارە. بەلام لە شاری «ئانی» مەنوچەهرێکی کورد پادشا بووە کە «ابن الاثیر» لێی دواوە و ئێمەش لە داهاتوودا لەگەڵ سەربهوردی فەزلوون کوردی باسی دەکەین. دەبێ ئەم مەنوچەهرە کە قەتران پێیدا هەڵگوتووە هەر ئەو مەنوچەهرەی فەزلوونی شەدادی بووبێ. لەو شیعرانەی قەتراندا هیچ باسی مەملان و سەربهوردێکی نییە. دەبێ لەو دەمەدا کە قەتران ناوی مەنوچەهر دەبا، مەملان مردبێ و نەمابێ.

دوژمنی مەنوچەهر نادیارە داخۆ مەملان بووە یان یەکێکی دیکەیە.

لەم دەورەدا کە سەلجووقییەکان دەستیان هاوێژتە ئازربایەگانەوە، بەتاریکی ڕادەبرێ و تەئریخی ئازربایەگان ڕووناک و ئاشکرا نییە. لەو کتێبانەی لە دەستدایە، تا دەورێکی دوور باسی خاکی ئازربایەگان بەبێ دەنگی و تەئریخی ئەو زەوییە بەون و نادیاری بەسەردەچێ. لەبەرئەوەیە سەربهوردی مەملان و مەنوچەهر و ئەبو خەلیل جەعفەر کە ئەویش موددەتێک لەسەر ئەو خاکە پادشا بووە و قەتران لێی دواوە، بەجارێک بێ دەنگە و لە تاریکییەکی وا دایە دیار نەکراوە.

### ٦- ئەبولقاسم عەبدوڵڵا

لەم ئەمیرەش ئاگاداری و سەربهوردی تاریک و نادیار و داپۆشراوە. تەنها قەتران لە قەسیدەیەکیدا پێیدا هەڵگوتووە و دەڵێ:

باغ رنگین شده، گوئی که برو کرده گذر

میر أبوالقاسم عبدالله بن وهسودان

هەروەها لە قاقەزێکی کە بەنەزم بۆ ئەبولیوسر سوپەهداری ئارانی ناردووە لە دوای ناوبردنی وەهسودان و مەملان، لەم عەبدوڵڵایەش دواوە و دەڵێ:

دگر میر عبدالله ز بهر من | زبان برگشاید بهر انجمن
ازو هرچ خواهی ندارد گران | همان خلعتم خواهد از دیگران

لەم قەسیدەی هاتوودا باسی بەزم و کەیفی ئەمیر مەملان دەکا و لێرەشدا بەئەمیر عەبدوڵلا و ئەبولموعەمەری گەنجەییدا هەڵگوتووە. کە ئەم ئەبولموعەمەرە چۆتە تەورێز وادەردەکەوێ سەرکردە یا پیاوێکی گەورەی پادشایانی کوردی شەدادی حوکمڕانی ئاران بووە و بۆ پێکهێنانی هێندێک مەسائیلی نێوان دوو حکوومەتی کورد چۆتە تەورێز و بەڕووی ئەو مەجلیس گیراوە و بەزم و کەیف دامەزراندراوە. لەم شیعرانەشدا وادەردەکەوێ ئەمیر عەبدوڵلا تازە لە سەفەر گەڕاوەتەوە وقەتران لەو بەزمەدا بووە کە پێی هەڵگوتووە کە دەڵێت:

گر ندیدی بهشت و حور العین | اینک این مجلس امیر ببین
جام می را چو حوض کوثر دان | ساقیان را بسان حورالعین
مطربان نشسته در مجلس | زردو گریان چو عاشق مسکین
بر یکی سوی امیر عبدالله | آن خداوند مهتران زمین

## ئەبودەلەف - شاهی نەخچەوان

ئەبودەلەف جگە لەوەی کە پادشای گۆشەیێکی ئازربایەگان بووە، لە عیلم و ئەدەبیاتی ئێرانیدا ناوبانگی کردووە. قەترانی تەورێزی بەگەلێک قەسیدە پێیدا هەڵگوتووە. ئەسەدی تووسی «گرشاسبنامە» کە یێکەمین پیشە و کردەوەییێکی مامۆستایانەی باش و جوانە بەناوی ئەبودەلەف و بەفەرمانی ئەو دایناوە و ناوی ئەبودەلەفی زیندوو کردۆتەوە. ناوی لەمە چی چاکتر دەبێ کە گەورەیێکی وەک نیزامی لە دیباجەی «بهرامنامە»یدا لە سەخا و بەخششی ئەو و لەلەچەری مەحموودی غەزنەوی دواوە کە دەڵێ:

وزدگر سوی بوالمعمر کرد | هست خورشید علم و دانش و دین
تا برون آید از صدف لولو | تا بتابد از آسمان پروین
دولت و عز میر مملان یاد | او بشادی و دشمنش غمگین
او بدیدار میر عبدالله | بر نهاده بکیف می رنگین
تازمین باد شاد باد این از آن | تازمان باد شاد باد آن ازین
حاسد آن همیشه چون فرهاد | ناصح این همیشه چون شیرین

هەروەکو گوترا، سەربهوردی دوامینی ژیانی وەهسودان و مەملانی کوڕی و کوڕانی

دیکەشی بەتاریکی بەسەرچووە؛ ئەوەی دەستمان کەوت ئەوەبوو کەموکورت لە پادشا و ئەمیرانی کوردی ڕاوادیان دواوم و هەرچییەکی لە کتێبەکانی بەردەستماندا هەبوون نوویسیومانەوە و بەمەش دواییمان بەسەربهوردی ڕاوادیاندا.

بەڵام کەمێکیش لە سەربهوردی ئەبودەلەفی پادشای نەخچەوان دەدوێم. چونکو هاوساڵانی وەهسودان و مەملان و لەسەر لایێکی خاکی کوردستانی ئازربایەگاندا حوکمڕانی کردووە و دۆست و سوێندخۆری ڕاوادیان بووە.

نسبت عقربیست باقوسی　　بخل محمود و بذل فردوسی

اسدی را که بود لف بنواخت　　طالع و طالعی بهم در ساخت

بەڵام سەربهوردی بنەماڵە و ژیان و کردەوەی ئەبودەلەف لە هیچ لاپەڕەیێکدا ناکەوێتە بەرچاوان. تەنها ئەحمەد کیسرەوی لە بەخشی دووەمی «شهریاران گمنام»دا لە شیعرەکانی قەتران و ئەسەدی وەرگرتووە کە کەم تا کورتێک ئاگاداری دەدات. لەوێدا لە ئەبودەلەف و کوڕان و برایانی ئەو دواون و ناویان و ناوی بابی ئەبودەلەف باس دەکەن و گۆیا بەسەر نەخچەوان و گوڵتندا حوکمڕان بووە و لە قەرنی نیوەی پێنجەمدا ژیاوە. بەڵام ڕاستییەکەی لە دەستدا نییە. کیسرەوی بەڕووی خەیاڵ باسی دەکا. گۆیا ئەسەدی بابی ئەبودەلەفی بە«سەفەر» و براکانیشی بە«ئیبراهیم» و کوڕیشی بە«مەحموود» ناودەبات. کیسرەوی دەڵێت: لەمانەش ئاگاهی بەهیچ کلۆجێک لە دەستدا نییە.

کیسرەوی دەڵێت: بەقسەی قەتران ئەم ئەبودەلەفە لە دوامینی پادشاهی ئەمیر وەهسوداندا حوکمڕانی دەست کەوتووە و ئەم دوو حوکمڕانانە پێکەوە دروستبوون و بەڵکەم خزم و نزیکی یەکدی بوون. لە ڕۆژی شەڕدا لەگەڵ دوژمنیان پشت و هێزی یەکدی بوون. قەتران لەلای ئەبودەلەف بووە، بەقەسیدەیێکی درێژ لەو سەفەرە دواوە. وا دیار دەکات وەهسودان قەترانی بەپەیامبەر ناردۆتە نەخچەوان. لەو قەسیدەیەدا بیری شەڕ و کێشە کێش دەکات کە لەوەوپێش ئەمیر وەهسودان لە تەک دوژمنی خۆیدا کردوویە و ئەبودەلەف بەلەشکری خۆیەوە و بۆ یاریدەدانی ئەو، تالووکەی کردووە دوژمنیان تێکەوە پێچاوە و شکاندوویانە. بەڵام چونکە ئەو دوژمنە موسڵمان بووە و لەودەمەشدا ڕۆم و ئەرمەن هەڵمەتیان داوەتەسەر ئەبودەلەف و وەهسودان لەگەڵیان ڕێککەوتوون بۆ شەڕی تەرسایان پێکەوە هەڵمەتیان بردووە. ئەم دوو شیعرەی قەترانە لەو شەڕە دواوە:

هزیمت گرفتند کاغاز کردم　　بەجای فسون مدح میر مظفر

خداوند کامل شهنشاه عادل　　ملک بودلف خسرو بندە پرور

گۆیا قەتران لە پێش ئەوەدا بگاتە وەهسودان، لەکن ئەبودەلەف بووە و ئەمەش یەک دوو شیعری قەسیدەیێکی ئەوە کە لە شەڕی ئەبودەلەف دواوە و ویستوویە لە نەخچەوان بگەڕێتەوە. ئەم شیعرەی پێنجەمیەتی کە دەڵێ:

مرا کسل کن شاها که از نشستن من

مرا زیان بود و مر ترانباشد سود

بەڵام ئەسەدی «گرشاسبنامە»ی بۆ ئەبودەلەف لە ساڵی ٤٥٨دا گوتووە. ئەمە دەردەکەوێ کە ئەبودەلەف زۆر ژیاوە و چەند ساڵان حوکمڕانی کردووە.

ئەسەدی لەو ساڵەدا چۆتە نەخچەوان. محەمەدی کوڕی ئیسماعیل کە وەزیری ئەبودەلەف بوو لەگەڵ ئیبراهیمی برای ئەبودەلەف بەئەسەدییان گوتووە بەپەیڕەوی فیردەوسی بەناوی ئەبودەلەف داستانێک هەڵبەستێ و بنوسێتەوە.

ئەسەدی «گرشاسبنامە»ی بە سێ مانگ هەڵبەستووە کە نۆ هەزار شیعرە.

لە لایێکیدا باسی وەزیری برای ئەبودەلەف دەکات و گەلێک بەئەبودەلەف هەڵدەڵێ. لەوە دواوە کە وەزیر و ئیبراهیمی برای ئەبودەلەف لێیان خوازتووە، تاکو ئەم داستانە ڕێکخات. ئەمە سێ شیعرییە کە دەڵێت:

که تا جایگه یافتی نخچوان

بدین شاه شد بخت پیر جوان

سوار جهان پشت ایرانیان

مه تازیان تاج شیبانیان

ملک بودلف شهریاران زمین

جهان ویرانیی پاک دین

لە دوامینی ئەوەدا بەچەند شیعر لە تەئریخی کتێبەکەی دواوە:

ز هجرت زدور سپهری که گشت

شده چارصد سال و پنجا و هشت

بود بیت من سربسر نەهزار

سه مه اندرین کارشد روزگار

# فەسڵی چوارەم

## پادشایانی ئەحمەدیلیان لە کوردستانی ئازربایەگان

هەروەکو نووسیمان لە ساڵی ٤٤٦ دا هاتنی توغروڵ بەگەوە بۆ خاکی ئازربایەگان تا چل پەنجا ساڵ مێژووی ئەو زەوییە و سەربهوردی پادشایانی خۆجێیی ئەم خاکە تاریک و ونە و زۆرچاک دەزانین کە لەم ساڵانەدا گەلێک چتی زل لەم خاکەدا ڕوویداوە و لەم ساڵانەدا بنەماڵەیێکی گەورەی پادشایانی کوردی ڕاوادی لەناوچوون و کەوتوون. زۆرباش ئەمەشمان لێ ئاشکرایە ئەوە بەبێ کیشە و شەڕ و لێکدان و هەڵاتن و زاڵبوون نەبووەو دوایی پێی نەدراوە، لەگەڵ ئەوەشدا کەموکورت ڕشتەیەک لەو هەموو ڕووداوانە لە دەستدا نییە و لەو چەند ساڵەدا چ ڕوویداوە و پادشایانی خۆجێیی چۆن ژیاون و لەگەڵ سەلجووقیاندا چۆنیان بەسەربردووە و چییان بەسەر هاتووە و سەلجووقی چۆن بەسەر ئەو میللەتە و ئەو خاکە زاڵبوون؛ بێ ناونیشان و بێ دەنگ و زۆر تاریکە و لە ئێمە نادیارە و مێژوونووسەکان بازیان بەسەر داوە.

هەرچەند زۆرچاک دەزانین لەو ساڵانەدا ئەمیر ئەبولخەلیل جەعفەر ناو کوردێک لە خاکی ئازربایەگاندا پادشا بووە. کیسرەوی کە لە نەژادی ئەحمەدیلیان دەدوێ، قەترانی بوێژ نزیک سی قیتعە قەسیدەی ستایش و سوپاهی ئەمیر ئەبولخەلیل جەعفەری هەڵبەستووە و بەپادشای ئازربایەگانی ناودەبا و شەڕ و کوژتاری لەگەڵ گورجستان و ئەرمەنییان و چوونی بۆ سپاهان بۆ کن سوڵتان سەلجووقی باس کردووە. لەگەڵ ئەوەشدا لە کتێبی تەئریخەکاندا بەهیچ کلۆجێک ناوی ئەم ئەبولخەلیل جەعفەرە نەبراوە. ئەمە چاکترمان بۆ ئاشکرا دەکا کە کتێبەکانی تەئریخ تا چ پایەیێک، نادروست و کورت و کەم و بێ ئاگاداربوون و بەسەر تەئریخی کورداندا چلۆن بازیان داوە و چاویان لێ قوچاندووە.

لە سەربهوردی ئازربایەگانی ئەو ساڵانەدا ئەمەمان زۆرباش بۆ ئاشکرا بووە، کە بەگەرمی عێلاتی تورک چرژاوەتە ئەم خاکەوە و جێگایان بەکورد تەنگ کردووە. کیسرەوی دەڵێ: زۆری پێنەچوو کە عیلاتەکانی تورک وەکو سێلاو لە تورکستانەوە ڕوو بەو خاکە چوون و بە فرەیی و زۆریی هەر دەستەیێکی لەسەر خاکێکی هەڵبژاردوودا دانیشتن.

«ابن الاثیر» لە سەربهوردی ساڵی ٤٥٦دا دەڵێت: کە ئەلپ ئەرسەلان گەیشتە مەرەند یەکێک لە ئەمیرانی تورکمان کە ناوی تەغەدگین (تەغەنگین) بوو، بەکۆمەڵەیێکی زلی عەشیرەتی تورکمانەوە هاتە لای.

لەمە دیار دەکرێ کە لەو چەند ساڵە کەمەدا خاکی کوردی ئازربایەگان پڕبووە لە عەشیرەتی تورک؛ ئەگەرچی هێشتا دە ساڵ نەببوو، سەلجووقیان دەستیان هاوێژتە ئەو خاکەوە.

بەپێی نووسینی کیسرەوی لە قەسیدەکانی قەتران وەردەگرێ کە لەودەمانەدا گوتوویەتی؛ گەلێک جێگایانی خاکی ئازربایەگان لە ئەزیەت و ئازاری ئەوانە لە سکالا و گازندە و ناڵە و هاواردا بوون و لەو شیعرانەی قەتران دیار دەکرێ، سەلجووقیان زۆر بەسەختی ئەزیەتی کوردانی ئازربایەگانیان داوە و لە بەدڕەفتاری خودداریان نەنواندووە و بەزەییان بەدانیشتوان و میللەتی ئەو خاکەدا نەهاتووە. لە قەسیدەیەکیدا لەگەڵ ئەبولخەلیل جەعفەر پادشای ئەودەمەی ئازربایەگانیەتی کە کوردبووە و پێی دەڵێ:

گر چه امروز از تو ترکان هر زمان خواهند باج

باز فردا نعمت ترکان ترا گردد مرام

لە قەسیدەیێکی دیکەیدا بەئەبولخەلیل جەعفەردا هەڵدەڵێ:

اگر چه داد ایران را بلای ترک ویرانی

شود از عدلش آبادان چویزدانش کند یاری

لە قەسیدەیێکی دیکەیدا دەڵێ:

گر نبودی آفت تورکان بەگیتی در پدید

بستدی گیتی همه چون خسروان باستان

لە قەسیدەیێکی دیدا گازندە لە گوزەران و زەمانی خۆی دەکات و دەڵێت:

شده چوخانه زنبر باغم از ترکان

همی خلند بەفرمان ها چو زنبورم

بە نووسینی «ابن الاثیر» فەرمانڕەوایی ئازربایەگان لەلایەن ئەلپ ئەرسەلان یا مەلیکیشاوە دراوە بەئەمیر قوتبەدینی ئیسماعیلی کوڕی یاقووتی کە نەوەی برای توغروڵ بەگ بووە و خوشکی ئەویش زوبەیدە خاتوون خێزانی مەلیکشا بوو.

لەپاش ئەوەش مەودودی کوڕی ئەویش چەندێک حوکمڕانی ئەو خاکەی کردووە. بەڵام لە حوکمڕان و ئەمیر و پادشاکانی خۆجێیی کوردان ڕەشتەیەک لە دەستدا نییە. لەودەمەدا کێ زندووبووە و کێ پادشایی کردووە و گوزەران و ڕەوشتی ئەم سەلجووقیانە لەگەڵ ئەواندا

چۆن و له چ پایەیێکدا پێکیان هەلکردووە؟ نادیار و ونە.

له دوای هەڵمەتی سەلجووقیان بۆ سەر ئەم خاکە و دەست بەسەرداکێشانیان، ناوی پاشایەکی خۆجێیی و کورد کە برابێ «ابن الاثیر» لە ساڵی ۵۰۱دا لە ئەحمەدیل کورد دواوە کە باپیر و دامەزرێنەری بنەماڵەی پادشایانی کوردبووە کە ئێمە لەم فەسڵەدا مەبەسمان لە سەربهورد و دوانیانە و بەبنەماڵەی ئەحمەدیلیان ناودەبرێن.

«ابن الاثیر» ئەم ئەحمەدیلە بەخاوەندی مەراغە ناودەبات. سەربهورد و داستانی خۆی و چەند کەسی دوای ئەو کە لە «ابن الاثیر» و «کیسرەوی» و لە هی دیکەمان دەست کەوتووە دەینووسینەوە.

«ابن الاثیر» لە ڕیزی ساڵی ۵۱۰ جلدی ۱۰ و لاپەڕە ۲۱۷یدا کە ناوی ئەحمەدیل دەبا دەڵێ: «ئەحمەدیل کوڕی ئیبراهیم کوڕی وەهسودانی کوردی ڕاوادی، خاوەندی مەراغە و جێگایانی دیکەی ئازربایەگان».

ئەمە بۆمانی ئاشکرا دەکا کە: ئەحمەدیل نەوەی وەهسودانی ڕاوادییە کە لە فەسڵی پێشوودا بەدرێژی لێی دواین. بەڵام ئەمەمان بۆ ئاشکرا نەبووە کە ئەمیر ئەبو مەنسوور وەهسودان لە سێ کوڕ پتری هەبووبێ. بەڵکەم ئەم ئیبراهیمی بابی ئەحمەدیل، ئەو کوڕە بووە کە وەهسودان بەگرەو ناردیە لای توغروڵ بەگ، لە پاشان بەهۆی خزمەت و کردەوە کە لەو ئیبراهیمە ڕوویداوە، پادشای سەلجووقیان کوڕی ئیبراهیمی کە ئەم ئەحمەدیلە بووبێ، کردوویانە بەحوکمڕان.

ئەمەش و گوتەی کیسرەوی کە لە نەژادی ئەحمەدیل دواوە. لە ڕووی بیر و وێچوون و لێ وردبوونەوەیەوە؛ وەنەبێ چتێکی نووسراوی تەئریخی لەو بابەتەوە لە دەستدا بێ. تەنها ئەوەی ئێمە باوەڕیان پێ هێنابێ و سەرمایەی نووسین و گوتنمان بێ، نووسینی «ابن الاثیر»ە و یەکسەرە بەوەم باوەڕ کردووە و قسەکەی ئەوم لە هەموو قسان لەلا ڕاستترە؛ بۆیە ئەحمەدیل بەکورد و بەنەژادی کورد و بەبنەماڵەی ڕاوادیانی دەزانم و بنەماڵەی ئەمیر وەهسودان دیسان بەکوردی ڕاوادیم ناسیوون؛ چونکو «ابن الاثیر» چی وا لە عەسری ئەحمەدیل دوور نەبووە و بەهۆی بنەماڵەی ئەیووبیان و کوردانی هەکاری کە «ابن الاثیر» خۆی خەڵکی هەکاری و لەگەڵ ئەیوبیاندا بەسەری بردووە، تاکو بەچاکی لێی مەعلووم نەبووبێ و نەیبیستبێ و بەتەحقیقی نەگەیاندبێ، ئەو ئەمیرەی بەکورد و بەنەوەی وەهسودانی ڕاوادی کوردی نەدەزانی.

کەوابوو ئێمە یەکسەرە بەومان باوەڕکردووە و بەڕاستی دەزانین و نوویسینی مودەقیق و تەئریخ نوویسەکانی دوامین لە ڕووی خەیاڵ و تەسەورات بووە، کە لە بابەت نەژادی ئەحمەدیلیان گفتوگۆیان کردووە، دەنا کوردبوونیان بێ گومانە.

ئەگەرچی کیسرەوی لە بەخشی دووەمی «شهریاران گمنام» لاپەڕەی ۱۱۳دا دووردرێژ لەوە دواوە و دەڵێت: «تا ئەمە کە ئێمە ئاگادارین ڕاوادیان کوردی تیرەیەکی هەزبانیان بوون لە ئەرمەنستان و ئاران دانیشتوون و لە ئازربایەگاندا لەوانە سۆراخێکمان نییە».

بەتایبەتی لە بەخشی دووەمی «شهریاران گمنام، گفتار نخستین، پێشینیان خانەدان، لاپەڕە ۲۲»دا کە لە ڕاوادیانی کورد دواوە لە حاشیەی خوارەوەیدا دەڵێ: راوادی (ڕاوادیان) ئێلیکی گەورەی کوردبوون و لە شنۆ و ئەو ناحیانەدا دادەنیشتن و بەهەزبانی ناودەبران و ئەم ڕاوادیانی ئاران و ئەرمەنستان تیرە یەک بوون لەوانە کە لە ئەرمەنستان دادەنیشتن. بەفارسیش ئەمەیە: «ایل بزرگی از کردان در اشنویه و آن نواحی می نشستند و هذبانی خوانده می شدند. این راوادیان تیرەای از ایشان بودند و در ارمنستان نشیمن گرفته بودند» بەبێگومانە ئەم کوردانە لە خاکی موکریاندا بوون.

هەروەکو چەند جارێک لە فەسڵەکانی ڕابردووی ئەم کتێبەماندا گوتووە و دیسان دەڵێین: کوردی ڕاوادی مادام لە خاکی موکریانی ئەمڕۆکەدا بوون و تیرەییێکیان بۆ ئاران و ئەرمەنستان و تیرەیەکیان بۆ هەولێر و ئەو خاکانەی ڕۆیشتوون و لە تیرەی ئاران تیرەییێکی لێ جویبۆتەوە و چۆتە میسر و شام و بناغەی سەڵتەنەتی ئەیووبیانی دامەزراندووە، هەروەهاش لە خاکی ئازربایەگاندا تیرەییێکی بەهێزیان مابووەوە کە لە کەلێنێکدا حوکمڕانیان دەست خۆیان خستووە و ئەم پادشایانە لەم بەندەدا لێیان دواوین لەم تیرەی ڕاواند (ڕاوادیان) بوون کە لە خاکی ئازربایەگاندا مابوونەوە.

جێگای حیرەتە کە: کیسرەوی دەڵێ: لەو ڕاوادیانەی ئازربایەگان سۆراخمان نییە؛ ئەگەرچی ئەوەی لە سەرەوەمان باس کرد لە بەخشی دووەمی دایە و لە بەخشی یەکەمی و لە بەخشی دووەمدا گەلێک لە کوردانی هەزبانی و پێشەوا و گەورە و ئەمیرانی ئەوان دواوە. ئەمیر ئەبولهەیجای کوڕی ڕەبیبودەولە لەو کوردانە بووە. کیسرەوی بەدرێژی باسی ئەویشی کردووە.

بەپێی ئەوانەی گوترا و بەنوویسینی «ابن الاثیر» و بەبێ لێکدانەوە و گفتوگۆ، هیچ گومانی تێدا نییە کە ئەمیر ئەحمەدیل کورد و لە کوردانی ڕاواند - ڕاوادی - هەزبانی

بووە. بەڵام دوورنییە باب و باپیرەکانی پادشای ئازربایەگان و ئاران و ئەرمەنستان بوون و ئەو ڕۆژە بەخاوەندی مەراغە ناوبردنیان لە تەئریخی «ابن الاثیر»دا دەردەکەوێ کە: سەلجووقیان تا چ پایەیەک لەو خاکەدا کوردیان وەتەنگ هەڵێناوە و دووچار بەئەزیەتیان کردوون و بەدەستێکی نامیهرەبانانە بەسەریاندا زاڵبوون، کە تەنها مەراغە لە دەست پادشایانی چەند ساڵەی کوردیدا ماوە.

**ئەمیر ئەحمەدیل کوڕی ئیبراهیم کوڕی وەهسودانی کوردی ڕاوادی**

یەکەمین جار کە ناوی ئەم ئەمیرە کوردە لە تەئریخدا برابێ «ابن الاثیر» لە ساڵی ٥٠١هـ دا باسی کردووە. لەم ساڵەدا نێوانی سوڵتان محەمەدی کوڕی مەلیک شا و سەدەقەی کوڕی دەبیس ئەمیری حیللە تێکچوو، شەڕ و کوژتارێکی قورسیان لە یەکدی کردووە. لەو شەڕەدا یەکە پشتیوان و یارمەتیدەری سولتان محەمەد کە بووبێ ئەویش ئەحمەدیل بووە.

سەدەقە ئەسپێکی زۆر بەناوبانگ و هێندە چاکی هەبوو کە کەس ئەسپێکی وەکو ئەوی نەبووە و زۆر بێ مانەند و بێ وێنەبووە. لە شەڕدا ئەو ئەسپە بریندار کرابوو. لە دوای بەکوژتچوونی سەدەقە، ئەمیر ئەحمەدیل ئەو ئەسپەی دەست کەوت و سواری کەشتی کرد و ناردیە بەغدا. بەڵام لە ڕێگا ئەسپەکە تۆپی و لە دەست چوو.

«ابن الاثیر» جارێکی دیکە ساڵی ٥٠٥ لە ئومەرایانی ئیسلام دواوە کە بەیارمەتی ئەتابەک تەغتەکین، خاوەندی شام، چوونە شەڕی فرەنگان بۆ «بیت المقدس». کە ناوی ئەو ئەمیرانە دەنوویسی لە ئەمیر ئەحمەدیل دەدوێ.

«ابن القلانسی» ئەو سەربهوردە لە ساڵی ٥٠٤دا دەنوویسێ و دەڵێ: «ئەحمەدیل لە هەمووان پتر سوپاهی هەبووە».

لەو سەفەرەدا یەکێک لە ئەمیرانی -کە سەکمان قووتبی بوو- لە دوای ئیسماعیلی کوڕی یاقووتی و مەودوودی کوڕی، ئەوبوو بەخاوەندی تەورێز. دەنوویسن کە ئەو نەخۆش کەوت و ئەمیر ئەحمەدیل چاوی لەوەبوو کە بمرێ و تەورێز لە لایەن سوڵتانەوە بەم بدرێ و ئومێدی دەکرد شارەکانی دیکەی ئازربایەگانیشی دەست کەوێتەوە. لەبەرئەوە بوو بەلەز گەڕاوە ئازربایەگان کە ئەو ئارەزووەی بەسوڵتان بنوێنێ. «ابن الاثیر» ساڵی ٥٠٥ و کیسرەوی بەخشی دووەم لاپەڕە ١١٤ - چاپی تاران. ابن القلانس چاپی ئەوروپا لاپەڕە ١٧٤.

بەڵام دوامینی ئەو گەڕانەوە و بنەچەکەی کار لە چ پایەیەکدا بووە، نەیان نوویسیوە و

نەزاندراوە داخوا سوڵتان تەوریزی پێ داوە یا نە؟ یان دایەوە بەکەسێکی دیکە؟

لە هەموو کتێبی تەئریخەکاندا کە دێتەسەر باسی ئەمیر، یان پادشاییێکی کورد بەبێ دەنگی و بازدان بەسەردەبرێ نازانین لە موئەریخەکانەوە بووە یان زەمانە و دەوران نەیهێشتوون باس بکرێن.

مردنی ئەحمەدیل لە ساڵی ٥١٠دا بەدەست فیدایانی باتینی بوو. چونکو لەودەمەدا ئیشوکاری (باتینی) زۆر بەرزببوو و سەرکەوتبوو و دەیانتوانی هەموو چتێک بکەن.

مێژوو نوویسەکان ئەم داستانەی کوژتنی ئەحمەدیل بەدەست فیدایانەوە بەمجۆرەی دەنوویسنەوە کە لە مانگی موحەڕەمی ئەو ساڵەدا ئەحمەدیل لە بەغدا بوو ڕۆژێک چووە بارەگای سوڵتان مەحموود لە تەنیشت ئەتابەگی تەغتەگین جێگای گرت. لە ناکاو دادخواهێک بەگریان لە دەرگاوە هاتە ژوورەوە و قاقەزێکی لە دەستدابوو، دایە دەست ئەحمەدیل کە بیگەێنیتە دەست سوڵتان. ئەحمەدیل هەتا دەستی برد قاقەزەکەی لێ وەرگرێ، دادخواه -کە لە «باطنی»یان بوو- کێردێکی لە دەستیدا شاردبووەوە لە ئەحمەدیلی دا.

ئەحمەدیل بەو برینەوە باتینیەکەی گرت و خستیە سژێر پێی خۆیەوە، بەڵام لە دەرەوە «باطنی»یەکی دیکە زوو گەیشتە پێش، کێردێکی دیکەی لە ئەحمەدیل دا. دانیشتوانی بارەگا شیریان کێشا و هەردووکیان لەتوپەت کرد.

لەودەمەدا باتینیەکی دیکە گەیشتێ و کێردی سێیەمی لێدا و ئیشی ئەحمەدیلیان تەواو کرد، ئەویشیان لە مەجلیسدا کوژت.

«ابن الاثیر» بەدرێژی نوویسیتی و «ابن القلانس» دەڵێ: «خەڵک لەو سەربهوردە زۆر دڵگیربوون لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەحمەدیل هێز و لەشکر و سوپا و شەوکەتی بێ ژمار بوو».

## ٢- ئاقسنقەری کوڕی ئەحمەدیل

لە دوای بابی بوو بەپادشا. بەڵام یێکەمین جار کە ناوی ئەم پادشا کوردەمان چاوپێکەوتبێ، ساڵی ٥١٦ھ لە بەغدا لەکن سوڵتان مەحموودی سەلجووقی بووە. لەم ساڵەدا توغروڵ بەگی برابچووکی مەحموود لە ئاران، لەوەدابوو ڕووبەڕووی برای، سەرکێشی دەست پێ بکا و شۆڕش هەڵایسێنێت و هەڵمەت بباتە سەر خاکی کوردستانی ئازربایەگان.

لەو دەمەشدا «گونتغدی» ئەتابەگی توغروڵ بەگ مردبوو. ئاقسنقەر لە بەغدابوو کە

ئەوەی زانی و لە سەربهوردیان ئاگاداربوو، ویستی خۆی بگەیێنتە توغرولّ بەگ و لە جێگای گونتغدیدا دامەزرێ و خاکێکی کە لە دەست ئەودابوو بیگرێتەوە دەست خۆی.

ئاقسنقەر بەبهانەی ئەوەوە کە لە خاک و زەوی ئەودا سەرکێشی و شۆڕش دەست پێ کراوە، ئیزنی لە سولّتان مەحموود خوازت و سواربوو بەتالووکە بۆ ئازربایەگان گەڕاوە و لەوێوە چوو گەیشتە توغرولّ بەگ و بۆ سەر بلّندکردن و ڕووگەردانی پتری هاندا و دلێرتری کرد. پەیمانی لە تەکدا گرت کە گەڕانەوە و گەیشتنە مەراغە دە هەزار لەشکری شەڕکەری بۆ ڕێکخا و سوپاهێکی پڕ چەکی بداتێ.

توغرولّ بەگ قسەکانی ئاقسنقەری پەسندکردن و پێکەوە لینگیان دا سەر ئەردەوێلّ کە بیگرن. ئەردەوێلّییان دەرگایان لەسەر گرێدان و ڕێی چوونە نێو شاریان نەدانێ. لەوێوە ڕوو بەتەورێزیان ئاژۆت. لە نزیک شار بیستیان کە سولّتان مەحموود سوپاهێکی قورسی ناردۆتە سەریان و لە مەراغە لەشکربەزیان کردووە.

ئەو وەلاّمە ترس و ئەندێشەهێنەرە ڕەشتەی ڕاووتەدبیری لێ پساندن و ڕوو بە«خونا» کە بە«خونج» ناسراوە و لە نێوانی ئازربایەگان و زەنگاندا هەلّکەوتووە ئاژۆتیان تاکو لە خاکی ئازربایەگان دەرکەون.

ئەمیر ئانۆشتگینی شێرگیر خوداوەندی «ئەبهەر» و زەنگان -کە ئەتابەگی پێشووی توغرولّ بوو- لە ئەبهەر لەگەلّیدا کۆبوونەوە. بەبێ زانینی ئەو، قاقەزێکیان بۆ سولّتان نوویسی کە لە گوناهانی ڕابردوو ببوورێت و فەرمانبەرداری ئەویان کردووە. سولّتان مەحموود لە گوناهانیان بهورد و لە ڕابردوو نەدوا و دلّخۆشی دانەوە و دلّنیایی کردن.

لە دوای ئەوە ئاقسنقەر بوو بەیەکە نزیکانی و کار لە دەستهاتوو و خۆشەویست و گەلێک پایەبەرزی سولّتان مەحموود بوو و لە هەموو کاروباری سولّتاندا دەست و تەدبیری بەرەو ژوورترینی دەست و تەدبیران بوو.

«ابن الاثیر» لە سەربهوردی سالّی ٥٢٣دا بەهەلاّتنی دەبیس بن سەدەقەی ئەمیری حیللە لە هەمەدانەوە دەنوویسێ: «سولّتان گوتییە دوو ئەمیر کە ئەحمەدیلی و قزلّ بوون کە ئێوە بوون کە بوون بەکەفیلی دەبیس؛ من ئەوم لە ئێوە دەوێت. ئەحمەدیلی ڕوو بەعیراق چوو کە پێش بەدەبیس و بەدڕەفتاریی ئەو بگرێ و بیباتە لای سولّتان...» لەوە گەلێک دواوە و لە ئازایی و ڕەشیدی ئەحمەدیلی و کردەوەی سولّتان باس دەکا.

سولّتان مەحموود «داود» ناو کوڕێکی هەبوو کردیە وەلیعەهد و ئەتابەگی ئەوی دا

بەئاقسنقەر. ساڵی ٥٢٥ سوڵتان کە لە هەمەدان مرد، ئاقسنقەر داودی لە جێگای مەحموود لەسەر تەختی سەڵتەنەت دانا و لە هەموو خاکی عیراق و عەجەم و ئازربایەگان و ئاراندا خوتبە و سککەی بەناوی خوێندراوە و لێدرا.

مەحموود سێ برای هەبوون: «توغروڵ – مەسعوود – سەلجووق». ئەوانە هەریەک پادشاهیان بۆ خۆ دەویست. لەودەمەدا گەورە و پێگەیشتوو و سەرهاتی سەلجووقیان سوڵتان سنجەربوو؛ ئەویش لە خوراسان و ماوەرائونەهر و خوارزم پادشاهی دەکرد.

ئاقسنقەر بۆ ئەوە کە داود بپارێزێت و لە جێگایێکی ئاسوودەی دوور لە شۆڕشی دانێ، ئەوی هەڵگرت و ڕوو بەئازربایەگان ڕۆیشت. بەڵام مەسعوود لە پێش ئەوان گەیشتبوویێ و بەسەر تەورێزدا زاڵ ببوو. ئاقسنقەر لینگی دا سەری و تەورێزی دەورەدا و لە هەموو لایێکەوە تەنگەی پێ هەڵچنی و لە دوامینی ئیشدا، دوامینی مانگی موحەڕەمی ساڵی ٥٢٦ ئاشتی کەوتە نێوان و مەسعوود بەسوپاهێکی پێی بوو، لەوێوە ڕوو بەهەمەدان چوو.

سەربهوردی مەسعوود و توغروڵ و سەلجووق و خەلیفەی عەباسی و سنجەر گەلێک دوورودرێژ و بەلک و پۆپە و بەتایبەتی لە کتێبێکدا نەبێ ناگونجێت. بەڵام لە دوامینی کێشە و شۆڕشدا پادشاهی بۆ توغروڵ ماوە. مەسعوود بۆ گەنجەی پایتەختی کوردانی شەدادیان و سەلجووق بۆ پارس گەڕانەوە. لەو هەموو شۆڕشەدا، ئاقسنقەر و داود لە ئازربایەگان دانیشتبوون بۆ ئەستووری و توندی کار و لەشکر و سوپاهی خۆیان دەکۆشان و هەموو ئەمیر و پیاوە ناودار و ئومەرا بەناوبانگەکانی سوڵتان مەحموودیان لەسەر کۆببوونەوە و ڕۆژ بەڕۆژ هێز و تەوانایان ڕوو بەفرەیی دەچوو.

ساڵی ٥٢٦ی مانگی ڕەمەزان، ئاقسنقەر لەشکرێکی قورسی لە کوردانی ئازربایەگان کۆکردەوە بۆ بەگژ توغروڵ بەگدا چوون لینگی دا سەر خاکی هەمەدان و دەستی کردە کوژتار و تاڵان.

توغروڵ بەگ لەولاوە بەهێزێکی لە دەستیدابوو، پێشوازی کرد و بەپەنهانی لەگەڵ سەرکردە و سەرکۆمارەکانی ئاقسنقەردا دەرگای موخابەرە و دڵخۆشی دانەوەیانی کردەوە. بەڵام ئاقسنقەر لەوە ئاگادار نەبوو کە ئومەرا و سەرکردەکانی بەپەنهانی پەیمانیان لەگەڵ دوژمنیدا گرێداوە. بەبێ ترس چووەپێش و شەڕی دامەزراند. لە گەرمەی شەڕدا سەردار سوپاهەکانی جڵەویان ڕوو بەتوغروڵ بەگ وەرسوڕاند و پشتیان لە ئاقسنقەر کرد و لێی جوێبوونەوە.

ئاقسنقەر لەوە لە هێز کەوت و شکا و داودی هەڵگرت و هەڵات و چەند پیاوانی دلێر و

سەرکۆمارانی بەناوبانگیان کوژران و بەدیل گیران.

کیسرەوی لە بەخشی دووەمی «شهریاران گمنام» و لە لاپەڕە ۱۱۷دا لە قەسیدەییێکی دوورودرێژی عیمادی غەزنەوی دواوە کە لەو شەڕەدا بووە و لێی دواوە و هەڵمەتی زبان درێژی بردۆتە سەر پادشای کوردان و بەعەبیدە و زەرخەرید و نۆکەر بابەکانی تورکمان و گورجی نەژاددا هەڵگوتووە. ئەمە شیعری سەرەتاکەیەتی کە دەڵێت:

دیدی چه زره بود که از تیغ در شکست

کرده گلو خراش دم از جگر شکست

لەم قەسیدەیەدا سپاسی دوژمنەکانی ئاقسنقەری کردووە و پێیان هەڵدەڵێ و زبان درێژی و بەدگۆیی ئاقسنقەری کردووە، ئەمەش شیعرێکە لەگەڵ ئاقسنقەرییە:

آوازه رسید پیاپی بر آسمان

بازار آقسنقر آشوب خر شکست

ئەمەی خوارەوەش شیعرێکە کە بەئەمیر بیشگین گورجی نەژادی دوژمنی ئاقسنقەریدا هەڵگوتووە و سپاسی دەکا:

از بیشگین که پهلو گیتی است آگهم

کز حملەی دوکشور دریکدگر شکست

ئەمەش شیعرێکی دیکەیەتی بەقەراسنقەری عەبیدی تورکمانی و دوژمنی ئاقسنقەریدا هەڵگوتووە:

بی شبهتی سنان قراسنقر سترگ

آن روز بندچرخ حوادث شمر شکست

لەم شیعرانە وامان بۆ ئاشکرابوو شاعیرێکی غەزنەوی حەزی لە پادشای کوردی ئاریانی نەژاد نەکردووە، کەوا سپاسی عەبیدێکی گورجی و تورکمان نەژاد دەکات و هەڵمەت دەباتە سەر پادشایێکی بەناوبانگی ئیسلامی ئاری نەژادی کوردی خاوەند تەخت و جاه.

ئاقسنقەر کە لە مەیدانی کوژتار دەرپەڕی و هەڵات داودی لەگەڵ خۆی هەڵگرت و چوو بۆ بەغدا. توغروڵ بەگ بەوە دڵگەرم بوو ویستی کە هەڵمەت باتە سەر کوردستانی ئازربایەگان.

مەلیک مەسعوود لە گەنجە کە لەوە ئاگاداربوو، نەشیا خۆی بگرێت و هەستا ڕووی لە بەغدا کرد و لەگەڵ ئاقسنقەر ڕێککەوت و خەلیفەی عەباسی «المسترشد بالله» کە

دوژمنی توغروڵ بوو، پەیمانی لە تەکیاندا گرت. مەسعوودی کردە سوڵتان و داود وەلیعەهد و ئاقسنقەر ئەتابەگ بێ. بەڵام ڕشتەی هەموو ئیشوکارێکی ئەوانی خستە ژێر دەستی ئاقسنقەر و لەسەر مینبەران خوتبەیان بەناو خوێندرایەوە. بۆ چوونەسەر توغروڵیش لەشکرێکی بۆ ڕێکخستن و هەموو پێویستییێکی پێدان و بۆ هەڵمەت بردنیان تالووکەی کرد.

ئاقسنقەر ساڵی ٥٢٧ مەسعوود و داودی هەڵگرتن و لە بەغداوە ڕوو بەمەراغە لەشکریان ئاژۆت. کە گەیشتنە مەراغە، ئاقسنقەر لە کوردان و لەشکر و سوپا و پێویستی ڕێکخست و بۆ شەڕ و کوژتار سازبوو.

قەرەسنقەر و بیشگین کە لە لایەن توغروڵ بەگەوە لەسەر ئازربایەگان بوون، چوونە زەنگان. ئاقسنقەر بەلەشکری کوردانەوە لینگی دا سەریان و لەوێش خۆیان پێ نەگیرا و هەڵاتن و چوونە ئەردەوێڵ و قەڵابەندیان کرد. ئاقسنقەر بەتوندی و سەختی ئەردەوێڵی دەورەدا و تەنگەی بەقەرەسنقەر و دەستەبرایانی هەڵچنی و دوورودرێژ شەڕ و کوژتار دەست پێکرا. دەورەدانی قەڵا توندکرا. ئەردەوێڵی و ئەوانەی لەنێو شاردا بوون وەتەنگ هەڵێنران.

لەولاوە توغروڵ لەشکرێکی ناردە یارمەتی دەورە دراوان. ئاقسنقەر بەدەستە لەشکرێکەوە لە دەورەی ئەردەوێڵ پێیان گەیشت و شیری خوێنڕێژی تێنان و دەستی کردە کوژتاریان و دەستەییێکی زلی لێ بەدیل گرتن و هی ماوی شکاند و هەڵی بری و لە پاشا بەزۆر ئەردەوێڵی گرت و گەڕاوە سەر ئەو کەسانەی لە خاکی کوردستاندا هەواداری توغروڵ بەگ بوون و دەستی کردە کوژتاریان، هەتا بەتەواوی خاکی خۆی لەوانە پاککردەوە.

ئاقسنقەر کە لە خاکی خۆی ئاسوودە بوو، لەشکری هەڵگرت و چووەسەر هەمەدان و کوژتارێکی قورسی لە توغروڵ بەگ کرد و تەنگەی پێ هەڵچنی و شکاندی و بەسەر هەموو خاکی هەمەداندا زاڵبوو و خاکی دەوروپشتییشی هەموو گرت و بناغەیێکی توند و سەختی بۆ سەڵتەنەتی مەسعوود دامەزراند. بەو دەستوورە ئاقسنقەر هەموو دوژمنەکانی خۆی لەناوبردن و پووچیکردنەوە، بەڵام بەدەستی خۆی دوژمنێکی وەکو مەسعوودی پێگەیاند.

هەر لەو ڕۆژانەدا [لە] هەمەدان لەنێو چادری خۆیدا وەکو ئەحمەدیلی بابی فیداییانی باتینی چوونە نێو چادرەکەی و کوژتیان. بەڵام ڕاستەکەی «ابن الاثیر» دەڵێ: مەسعوود ئەو پیاوانەی هاندابوو کە ئاقسنقەریان کوژت. ابن الاثیر ساڵانی ٥١٦، ٥٢٣، ٥٢٥

٥٢٧، و تەئریخی (عماد کاتب) چاپی میسر لاپەڕە ١٤٦، ١٥١، ١٥٥، ١٦٠، ١٦١، بەدووروودرێژی لێی دواون. بەهائودین ئەبوتالیب مامی «عماد کاتب» کە وەزیری ئاقسنقەر و لەوێ بوو، زۆر ئاگاداری دەدات کە مەسعوود ئاقسنقەری کوژتووە.

## ٣- نوسرەتودین ئەرسەلان ئابەخاسبەگی کوڕی ئاقسنقەر

ئەم پادشا کوردە لە ناسراوان و بەناوبانگ و ئازا و دلێر و ڕەشید و نەیرومەندانی بنەماڵەی ئەحمەدیلیان بوو. ناوی ئەرسەلان ئابە شێرشکار و یان شێرگیر و لەقەبی خاسبەگ و کونیەی نوسرەتودین و نێوی ڕاستەقینەی «شێرگیر» بوو. لە چل ساڵ پتر پادشاهی کردووە و گەلێک بەڕێز و دەستڕۆیی بووە.

ئەم پادشاهە برایەکی دیکەی هەبووە کە ناوی بەکوردی ئەمیر شێرگیر بووە و ئەم دوو برایانە ناویان وەکویەک بوو؛ ئەمیان تورکی و برای بچووک کوردی بووە. یێکەمین جار ناوی ئەرسەلان ئابە لە کتێبەکانی تەئریخدا کە برابێ ساڵی ٥٣٠ لە بەغدا بووە. خەلیفەی عەباسی «الراشد بالله» لە هەمـوولاییێکەوە لەشکری کۆکردۆتەوە کە بەگژ سولْتان مەسعوود دا بچێ.

یەکێک لەو ئەمیرانە کە بەلەشکریەوە بەهاواری خەلیفەوە چووە، ئەرسەلان ئابەیە کە «ابن الاثیر» بە«ابن احمدیلی» لێی دواوە. بەڵام لەوەپاش لەم پادشا کوردە دەنگێک نییە تا ساڵی ٥٤٠ «عماد کاتب» لە داستانی لەشکرکێشی جاولیدا باسی ئەمیر شێرگیری کردووە.

ئوزبەگ تورکمانی کوڕی بالنیکار کە دۆستی سولْتان مەسعوود و دوژمنی ئەم پادشا کوردە بوو. ساڵی ٥٤١ چووە سەر مەراغە و دەورەیدا. ساڵی ٥٤٥ سولْتان مەسعوود بۆ خۆی بەلەشکرەوە چووە سەر مەراغە و بەکوژتار گرتی و قەڵاکەی تێکدا. بەڵام زۆری پێنەچوو کە لە نزیک قەڵای. ڕۆئین دز (ڕواندز) پێکهاتنەوە.

ئەرسەلان ئابە چونکو سەرەتای تەمەنی جەوانی و هەرزەکاری و یاری بوو، هێز و دەستەڵاتی تا ئەو ساڵانە لە پایەیێکی وادا نەبووە کە دەکەوێتە ڕیزی سەربهوردی گوتە و نوویسینی دێریکزانەکانەوە. بەڵام ساڵی ٥٤٨ بەپێی گوتەی «کیسرەوی» و «عماد کاتب» ئەرسەلان ئابە زۆر بەهێز و تەوانا و دارا و ناسراو بووە.

نێوانی ئەو و ئەتابەک یولْدز خۆش و بەئاشتی و دۆستی ڕایانبواردووە. ئەرسەلان ئابە لەو ساڵەدا هەڕەتی دەستڕۆیشتن و خۆنواندن و ناوبانگ کردنی بووە. خاسبەگی کوڕی

بلینکاری کە ئەمیرێکی نەبەرد و بەدەستەڵات ویێچووی سەلجووقیان بوو، مەلیکشای کوڕی محەمەدی لە تەخت هێناخوار و سوڵتان محەمەدی لە خوزستانەوە خوازت و لەسەر تەختی سوڵتانی دانا.

کە سوڵتان محەمەد بوو بەپادشا یەکە ئیشوکاری سوودمەند و چاکی کە خستبوویە دڵەوە، کوژتنی ئەم خاسبەگەی خاوەند چاکەیەی بوو. کە کوژتی و بەپەسند دیتراوی جەلالەدین دەرگەزێنی -کە وەزیری بوو- کەللەسەرەکەی خاسبەگی بەدیاری ناردرایە ئازربایەگان بۆ پێش ئەمیر نوسرەتودین خاسبەگی کوڕی ئاقسنقەر خاوەندی مەراغە و ئەمیر شەمسودین ئەتابەگ یوڵدز خاوەندی تەورێز.

وەزیری دەرگەزێنی وایدەزانی کە ئەم دوو ئەمیرانەی ئازربایەگان پێی دڵخۆش دەبن و سوپاسی زانین و تێگەیشتنی ئەو وەزیرە دەکەن کە چتی وای پەسندکردووە و ئەوجۆرە ڕێگایە بەسوڵتان دەنوێنێ.

بەڵام هەردوو فەرمانڕەوایانی ئازربایەگان بەدیتنی ئەو کەللەیە زۆر چاک دڵگیر و ڕەنجیدە بوون و وەڵامیان دا بەسوڵتان کە ئەو کارە پیس و بەقرێژبوو کە کردت. تۆ کەسێکت کوژت کە سوێندت بۆ خواردبوو پەیمانت لەتەکیدا گرێدابوو و خێرخواهی تۆ بوو. ئیدی لەمە بەملاوە ئێمە کارمان بەتۆ نەما و لێت دڵنیا نابین کە بتوانین نزیکت کەوینەوە و باوەڕت پێناکەین.

لەسەر ئەوە ئەرسەلان ئابە و یوڵدز پێکەوە ناردیانە دووی سلێمان نەوەی مەلیکشا کە بچێتە زەنگان، هەردوو ئەمیر بەسوپا و قۆشەنیانەوە چوونە لای و هەڵیانگرت و لینگیان دا سەر هەمەدان. سوڵتان محەمەد هێزی خۆگرتنی نەبوو ڕوو بەسپاهان (ئەسفەهان) هەڵات. سوڵتان سلێمان لە هەمەدان لەسەر تەختی سوڵتانی داندرا. بەڵام چونکو پیاوێکی بەدڕەفتار و خراپ بوو، کەسێک لێی دڵنیا نەبوو، هەموو کەسی دڵڕەنج کرد.

ئەرسەلان ئابە و یوڵدز زۆر لە کردەوەی بەگازندە بوون و تەمایان بوو سلێمان بگرن بەڵام هەڵات و یوڵدز گەڕاوە تەورێز.

ئەرسەلان ئابە ناردیەوە دووی سوڵتان محەمەد و بەپەیمان لەسەر تەختی دامەزراندەوە و ئیشوکاری پێکهێنانەوە. لەو ڕۆژەوە ئەم ئەمیرە گەورە و نەیرومەندە کوردە لایەنی سوڵتان محەمەدی بەرنەدا و پشتیوانی کرد. سوڵتان محەمەدیش دیسان ئەرسەلان ئابە و یوڵدزی لەلا بەرێز و پایەبەرزبوون و لە هەموو ئومەراکان بلندتر جێگای بۆ دانابوون و خوشی دەویستن و لە قسەیان دەرنەدەچوو.

جغری شا کە ئەمیرێکی سەلجووقیان بوو، لەگەڵ ئەتابەگی خۆیدا لە ئازربایەگان دانیشتبوو. ئەرسەلان ئابە لەگەڵیدا ناخۆشییان تێکەوت و ئیش لە زمان و قسەوە کەوتە شیر و کوژتار.

سوڵتان محەمەد بەلەز ناردی چغری شای هەڵگرت و بەئەتابەگیەوە بردنیە هەمەدان و نەیهێشت لە خاکی ئازربایەگاندا دەستیان هەبێ و هەموو خاکی ئازربایەگانی دا بەئەرسەلان ئابە و ئەویش وەکو برایان لەگەڵ یولدز بەشیان کرد و پێکەوە بەئاشتی هەرکەسە و بەشی خۆی خستەدەست. لەو بەشکردنەدا تەوریز بەر ئەرسەلان ئابە کەوت کە خرایە سەر مەراغە. (کیسرەوی و عماد کاتب دوورودرێژ لەوە دواون).

ساڵی ٥٤٩ ژنی سوڵتان محەمەد مرد. ئەتابەگ یولدز و ئەمیر شێرگیر برای ئەرسەلان ئابە بەلەشکریانەوە چوونە سوکواری سوڵتان و چەند ڕۆژێک لەوێ مانەوە. «عماد کاتب»ی مێژوونووس لەوێ بووە و دەڵێت:

«منیش لە جەرگەی مونشی و زانا و عولەمایاندا لە مەجلیسی سوڵتان دانیشتبووم کە دیم سوڵتان چەند نوازشی ئەو ئەمیرە کوردە و ئەتابەگ یولدزی کرد و لە چ پایەیێکی بەرزدا ڕێزی لێ گرتن».

سوڵتان محەمەد ساڵی ٥٥٤ لە مردندا بوو، کوڕێکی کە هەبوو دایە دەست ئەرسەلان ئابە. «ابن الاثیر» دەڵێت: «پێی گوت دەزانم کەسێک لە دوای من مل ناداتە پادشاهی منداڵێکی وا بچووک. ئەوە بەتۆ دەسپێرم کە ببیە ئەتابەگی و بیبەیە شاری خۆت و بیپارێزی». ئەوە نیشانمان دەدا کە سوڵتان محەمەد تا چ ئەندازەییێک باوەڕی بەو پادشا کوردە و لە چ پایەیێکدا لیی دڵنیابووە، کەوا کوڕێکی تاقانەی پێ ئەسپاردووە.

لە دوای مردنی سوڵتان محەمەد، لەسەر تەخت و تاج، شۆڕش و پشێوی کەوتە نێو شازادەکانی سەلجووقیانەوە. مەلیک شای برای سوڵتان محەمەد مرد و سلێمان بەدەست ئەمیرەکانەوە نابوودکرا و سوڵتان ئەرسەلان کوڕی توغروڵ بەپشتیوانی یولدز کە مێردی دایکی بوو لەسەر تەختی سەڵتەنەت دامەزراندرا، بەڵام پادشا و وەزیر و هەمەکاری ئەرسەلان هەر یولدز بوو، نەیار و دوژمن نەما و هەموو لەناوچوون.

ساڵی ٥٥٦ ئەتابەگ یولدز پیاوانی ناردە دووی ئەرسەلان ئابەی پادشای مەراغە کە بچێتە هەمەدان و فەرمانبەری سوڵتان بکات.

ئەرسەلان ئابە وەڵامی دانەوە کە: لێم بگەڕێن و دەستم تێنەدەن و منیش پادشاییێکم و

لە سەلجووقیانیش شازادەیەکم لەلایە. کە زۆر ڕقم هەستێ منیش ئەو دەکەم بەسوڵتان و شەڕی بۆ دەکەم.

وەزیری خەلیفە لە بەغدا کە دوژمنی ئەتابەگ یولدزبوو، قاقەزی بۆ ئەرسەلان ئابە نوویسی بوو، سوێند و پەیمانی دایە کە بەقسەی یولدز نەکات، کوڕەکەی سولتان محەمەد دەکەنە سولتان و لە بەغدادا بەناوی ئەو خوتبە دەخوێنێتەوە. لەولاشەوە یولدز تەنگەتاوبوو و وەڵامی داوە بەئەرسەلان ئابە و سوێندی بۆ خوارد، بەڵام بێ سوودبوو.

یولدز لەژێر سپەهداری پەهلەوان کوڕی خۆیدا لەشکرێکی نارده سەر ئەرسەلان ئابە. لەولاوە ئەرسەلان ئابە لەشکرکێشی کرد. شاه ئەرمەن خاوەندی واسپۆرگان کە نەوەی سەگمان قوتبی بوو، بەلەشکر و چەکەوە پشتیوانی ئەرسەلان ئابەی کرد. ئەرسەلان ئابە بەو هێزەی کە هەیبوو چووە پێش پەهلەوان لەسەر چۆمی سپید رود (قزل اوزان) ئامبازی یەکدی بوون. لە دوای کوژتار و خوێنڕێژیەکی قورس، پەهلەوان تەنگەتاو کرا و شکاندرا و هەڵات و تا هەمەدان خۆی نەگرتەوە.

کیسرەوی بەخشی دووەم «شهریاران گمنام» لە لاپەڕە ١٢٣دا دەڵێت: لەم شەڕەدا ئاشکرابوو کە ئەرسەلان ئابە تا چ پایەیەک بەهێز و نەیرومەندبوو؛ چونکە کوژتارێکی بێژماری لە پەهلەوان کرد و گەلێکی لەوان بەدیل گرت و ئەو لەشکرەی پەهلەوان پووچ کراوە.

هەر لەو ساڵەدا ئەتابەگ یولدز بەگژ ئەمیر ئینانج خاوەندی «ڕەی»دا چوو و گەلێک کوژتار ڕوویدا. ئەرسەلان ئابە پێنج هەزار پیاوانی سوارەی ئازا و شەڕکەری بەهەموو پێویست و چەکێکەوە نارده یارمەتی ئینانج و لەو شەڕەدا فریای کەوت و دوژمنی بۆ بەزاند و بەشادکامی لەشکرەکەی گەڕاوە.

لە دوای ئەوە زۆری پێنەچوو کە یولدز لەگەڵ ئەرسەلان ئابە ئاشتبووەوە و نێوانیان بەخۆشی پێکهاتەوە. ئەویش لەبەر ئەمەبوو کە لەو ساڵەدا گورجی بەهێز و جەوریانەوە، بەسەر کوردەکانی ئاران و ئازربایەگاندا ببوونە هەرەسێکی نەبری پیس، بەگەرمی هەڵمەتیان دەبردە سەر شار و ئاوایانی موسڵمانەکانی ئەو خاکانە. لە کوژتار و تاڵان و خراپی و سووکی دەستیان نەدەپارازت و لە بەدڕەفتاری ڕانەدەوەستان.

ساڵی ٥٥٨ پەلاماری تەختگای «دوین»یان دا کە چەند ساڵ لە دەست کوردە موسڵمانەکانی ڕەوەندا (ڕاوادی) دابوو. کوژتارێکی قورسیان لێ کردبوون، کۆمەڵەیێکی

زلیان لە ژن و منداڵ بەدیل بردبوو، ماڵ و دراوێکی بێ ژماریان بەتاڵان گرتبوو.

جا کە ئەو سەربهوردە دڵ و گیان هێنەری جگەرسۆزە، بەئەمیر و پادشایانی ئیسلام ڕاگەیشت، دڵیان سووتاو و هەناویان جۆشا و دەماری پیاوەتییان کەوتە بزووتن. یولدز لەشکری هەڵگرت و ئەرسەلان ئابە بەهێزێکی هەیبوو چووە یارمەتیدانی و لە هەمووولایێکەوە ئومەراکان لەشکریان برد و چوون. بەڵام یولدز و ئەرسەلان ئابە پێکەوە هەڵمەتیان بردەسەر گورجیان و شکاندیانن.

«ابن الاثیر» دەڵێت: لە پاش ئەوە گەلێک کوژتاریان لە گورجیان کرد و یەخسیرەکانیشیان ڕزگار کرد و بەشادمانی گەڕانەوە و هەموو موسڵمانان بۆیان دەناوران.

بەڵام چەند ساڵێک بەسەرنەچوو کە دیسان نێوانی ئەرسەلان ئابە و یولدز لە خۆشیەوە بووە ناخۆشی و دوژمنایەتییەکی سەختیان کەوتێ. ئیش بوو بەشەڕ و کوژتار و خوێنڕێژی.

مایەی ئەم بۆنەیە بوو کە ساڵی ٥٦٣ ئەرسەلان ئابە کوڕەکەی سوڵتان مەحموودی بەسوڵتانی ناوبرد و پیاوانی بۆ لای خەلیفە نارده بەغدا کە خوتبە و سککە بەناوی ئەم شازادەیەوە دەست پێ بکرێ. یولدز کە لەوە ئاگاداربوو، لەشکرێکی دا بەپەهلەوانی کوڕی و ناردیە سەر ئازربایەگان کە بەگژ ئەرسەلان ئابەدا بچێت.

لەم شەڕەدا ئەرسەلان ئابە بەبەراوەژوی هی پێشوو زۆر پیس شکا و ڕوو بەمەراغە هەڵات و گەڕاوە. پەهلەوان دەستی هەڵنەگرت و مەراغەی دەورەدا و تەنگەتاوی کرد. ئەرسەلان ئابە ناچاربوو کە داوای مامڵەت بکا و لەگەڵیدا پێک بێ بەمەرجی ئاشتبوونەوە پەهلەوان بەشادمانی گەڕاوە هەمەدان. (ابن الاثیر - ساڵی ٥٦٣).

لە دوای ئەوە دەنگێک لە ئەرسەلان ئابە و لە خاک و زەوی ئەو نییە؛ تەنها «ابن الاثیر» لە ڕیزی ساڵی ٥٧٠دا باسی مردنی ئەرسەلان ئابەی کردووە کە وەسیەتی کردووە: پادشاهی لە دوای ئەو بۆ فەلەکەدینی کوڕی بێت. بەڵام لەو چەندانەدا چ ڕوویداوە و ئەو شازادەی سەلجووقی کە لە لای بووە چی لێهاتووە. سەرمایەیەکی نە کەم و نە زۆر لە دەستدا نییە و بێ دەنگوباس ڕۆیشتووە.

## ٤- فەلەکەدین کوڕی ئەرسەلان ئابە

بەپێی وەسیەتی بابی وەکو گوترا ساڵی ٥٧٠ کە بابی مرد، بوو بەپادشا و لەسەر کورسی دانیشت. بەڵام دوژمنێکی ڕەگەزی و خاکی وەکو یولدز و کوڕی ئەو لە کەلێندا بوون و نەیانهێشت خۆی بگرێ و هەڵمەتیان بۆ برد و پەلاماریان دایە.

هەر لەو ساڵەدا یولدزیش مرد. پەهلەوانی کوڕی یولدز ویستی فەلەکەدین جێگیر نەبێت و خاکەکەی لێ بگرێت و شارەکانی ئەرسەلان ئابە بخاتە دەست خۆی. بۆ ئەوە بەلەشکرەوە لینگی دا سەر تەختگاهی فەلەکەدین کە مەراغە بوو. فەلەکەدین چووە قەڵای ڕوئین دز (ڕواندز) و قەڵابەندی کرد.

(کیسرەوی بەخشی دووەمی «شهریاران گمنام» لاپەڕە ١٢٥ و لە حاشیەیدا دەڵێ: ڕویندز هەر ئەم شارەیە کە ئێستا پێی دەبێژرێ ڕواندز. نیکیتین لە قاقەزێکی تایبەتی خۆیدا کە لێم پرسیبوو جوابی دامەوە و دەڵێت: «ڕویندز قەڵایەک بوو لە نزیک مەراغە؛ مومکینە ئێستا ئەسەری نەمابێ».

ئەمە دەستوورێکی پێشووی ئازەربیە کە دز یان بەدوز خوێندووتەوە، هەروەکو ئەرسەلان دوز و سولدز و قەڵادوز و ڕواندز بەڕاواندوز ناوبردووە.

پەهلەوان کە نزیک مەراغە بووە چووەسەر ڕواندز. چونکو قەڵایێکی زۆر سەخت و دژواربوو، هیچی پێنەکرا و ناچار ڕوو بەشاری مەراغە خۆی بزاوت. قزڵ ئەرسەلانی برای خۆشی نارده سەر تەورێز کە دەورەی بدات.

چەندێک ئەو دوو شارە گەورەی کوردان، لە ژێر تەنگەتاوی تورکماناندا تەنگانەییان کێشا و بەو دەورەدانە تووشی ئەزیەت و نەبوونی بوون، بەڵام لە دواییدا مەراغەییەکان کە کورد و ئازادی پەرست بوون، نەیاندەویست کە دوژمنی ڕەگەزی و تیرەیی بەسەریاندا زاڵبێ، دەماری میللەت پەرستیان بزووت و بۆ لەشکری پەهلەوان دەست بەشیر دەرکەوتن و کوژتارێکی قورسیان کرد و دەستەییێکی زلی لەشکریانی پەهلەوانیان بەدیل گرتن و بردیاننە نێو شارەوە.

قازیی مەراغە کە پیاوێکی تێگەیشتووی خێرخوابوو، ئەو هەموو سوپاهیانەی خەڵاتکردن و بەریدان و بۆ پەهلەوانی ناردنەوە. پەهلەوان بەوە زۆر کەیفخۆش بوو، بۆ ئەوە شادی و ئاشتی لەگەڵ فەلەکەدیندا هێنا پێش و بەمەرجی ئەوە کە تەورێز بۆ پەهلەوان بێ مامڵەت کرا. پەهلەوان قزڵ برای خۆی نارده سەر تەورێز و دەستی لە مەراغە بەردا و گەڕاوە.

ابن الاثیر - جلدی ١١، لاپەڕە ١٩١ ئەوەندە لەو ئەمیرە کوردە و کیسرەوی هی دیکەش هەروا دواون، لەوە پتر چتێکی دیکەیان لە سەربهوردی ئەو پادشایە دەست نەکەوتووە).

**٥- عەلائەدین گرپا ئەرسەلان**

ئەم پادشایە بەناوبانگترینی پادشایانی بنەماڵەی ئەحمەدیلیانی کوردبوو؛ بەدادگوستەری دستنەوازی و ڕەعیەت و میللەتپەروەری ناسراوە و لە ئەدەبیاتی فارسیدا پایەیێکی بەرزی هەبووە و لای بەرەو ژووری لاپەڕەی تەئریخی گرتووە. خواجە نیزامی کوردی گەنجی بەناوبانگ «بهرامنامە»ی بۆ ئەو داناوە و بەگرپا ئەرسەلان (شێری بچووک) ناوبراوە و یان بە«کۆرپەی شێر» مەعنای لێدراوەتەوە. چونکی بەتورکی ئەرسەلان یەعنی شێر و گورپا یەعنی چکۆلە یان نەگەییو و یان بەرخی کۆرپە هاتووە و بە«قەرەسنقەر»یش ناوبراوە.

«ابن الاثیر» و هێندێک لە مێژوونوویسەکان گوتوویانە: ئەرسەلان ئابە کە نزیک مردنی بوو، وەسیەتی کرد فەلەکەدین جێنشینی بێت و لەم شیعرەی نیزامیدا وا دەردەکەوێ کە عەلائەدین برای فەلەکەدینە و براییێکی دیکەشی هەبووە. کە نیزامی ناوی دەبات و دلێت:

از بلندی برادر فلک است
وز زرگی مقابل ملک است

کیسرەوی بەخشی دووەم لاپەڕە ١٢٧ و لە مێژوونوویسی بەناوبانگ «ڕاوەندی» وەردەگرێ و دوورودرێژ لە چوونی عەلائەدین بۆلای توغرول بەگی سەلجووقی و شەڕی توغرول بەگ لەگەڵ خەلیفە دواوە لە ڕیزی قسەدا دەلێت: **«چون آن مصاف شکسته شد، علاءالدین خداوند مراغه بەخدمت سلطان رسید و بهمدان دست بوسی کرد و سلطان اورا اعزام و تمام واکرام نمود و پسر خودرا بر کیارق بدو سپرد»**.

(کە لەو مەیدانەدا شکاندرا، عەلائەدین ئیعزاز و ئیکرامێکی تەواوی ئەوی گرت. بەرکیارقی کوڕی خۆی بەو ئەسپارد) لە شەڕ و کێشەی نێوانی خەلیفە و سولتان و ئەو سەربهوردانە کە بەدوورودرێژی دواوە، دەلێت:

ڕۆژی دووەم ئەتابەگ عەلائەدین گەڕاوە و چووە مەراغە و سولتان ڕوو بەئازربایەگان ڕۆیشت. (روزی دیگر اتابک علاءالدین بەمراغە رفت و سلطان رو بەجانب آذربایجان نهاد) و دیسان دەلێت: لەبەرئەوە کە سولتان کوڕی خۆی دا بەعەلائەدین و لەقەبی ئەتابەگی و خەلاتی پێدا و بەئەتابەگ ناونرا.

لەودەمەوە هەتا ساڵی ٦٠٢ عەلائەدین لە تەئریخەکاندا بەبێ دەنگی ڕابراوە. لەو ساڵەدا «ابن الاثیر» لێی دواوە کە لەگەڵ موزەفەرەدین کوردی بەگتەگینی خاوەندی هەولێر

ڕێککەوتووە و پەیمانی گرێداوە کە لەشکری بداتێ و بچێتە سەر ئەتابەگ ئەبوبەکر پەهلەوان و لە خاکی ئازەربایەگانی دەرکەن.

موزەفەرەدین بەسوپاهی کوردانی هەولێرەوە چووە مەراغە و پێکەوە لەشکریان هەڵگرت و بۆ سەر تەوریز هەڵمەتیان برد. ئەبوبەکر پەهلەوان هاواری لە «ئیتغمش» کرد کە یاریدەی بدات.

لەودەمەدا ئیتغمش لە «ئالموت» لەگەڵ ئیسماعیلیان لە شەڕدا بوو، دەستی بەردا و چووە ئازربایەگان پیاوانی نارده لای موزەفەرەدین وەڵامی دایێ کە: «ئێمە تۆمان بەپیاوی چاک و ڕەوشت باش و خێرخوا دەناسی، ئێستا چۆن هەڵمەت دێنیە سەر خاکی موسڵمانان، تۆ خاوەندی دێیەکی لەو پترت نییە، ئێمە لە خوراسانەوە تا هەولێرمان هەیە. ئەگەر هەر شارەی دە پیاومان بووبێت سێ چوار چەندانی تۆ لەشکرمان بۆ کۆ دەکرێتەوە. واچاکە تۆ لە ڕێگایێکی پێیدا هاتووی بگەڕێیەوە». موزەفەرەدین بەوە دڵی گۆڕا و گەڕاوە هەولێر و هەرچەندە تەقەلای دا و نوازشی کرد بێ سوودبوو، شەڕی تووش کرد و چووەوە. لە دوای ئەوە ئیتغمش و ئەبوبەکر چوونە سەر مەراغە و دەورەیاندا و عەلائەدین تینی بەرامبەری و هێزی شەڕی ئەوانی نەبوو، ئاشتی لێ خوازتن و قەڵایێکی پێدان. مامڵەتیان کرد و ڕێک کەوتنەوە و لە جیاتی ئەو قەڵایەش ئەبوبەکر شاری ورمێ و شاری شنۆی دایە عەلائەدین. بەوە شەڕ و کێشە بڕایەوە (ابن الاثیر - ساڵی ٦٠٢ و شهریاران گمنام بەخشی دووەم - لاپەڕە ١٢٨).

دیسان سەربهوردی عەلائەدین بێدەنگ بەسەر دەچێت. مێژوونووسی بەناوبانگی کورد «ڕاوەندی» کە لە دەوری عەلائەدیندا بووە و گەلێک سەربهوردانی عەلائەدینی لە کتێبە نایابەکەیدا (راحە الصدور) باسی کردووە و گەلێک بەعەلائەدیندا هەڵدەڵێت، بەڵام لە پێش مەرگی عەلائەدیندا دوایی بەکتێبەکە داوە؛ لەوێدا دەڵێت: «قورئان سیپارە»ی بەناوبانگ کە سوڵتان توغروڵ بەگی سەلجووقی بەدەستی خۆی نوویسیبوویەوە. ڕاوەندی بەو قورئانەدا هەڵدەڵێت و لە نوویسین و جوانی و خۆشخەتی دەدوێت و دەڵێت: «وآن مصحف بعضی پیش پادشاه عادل علاءالدین خداوند مراغه مانده است. بعضی پیش بگمتر پادشاه اخلات وبعضی پیش نقاشان» (ئەو قورئانە هێندێک جاران لەلای پادشاهی دادگەر عەلائەدین خاوەندی مەراغە ماوەتەوە و هێندێک جار لەلای بەگمتەر پادشای ئەخلات و هێندێک جار لە کن نەقاشکاران بووە).

## خواجه نیزامی کوردی گەنجەیی و عەلائەدین

خواجه نیزامی کە لە گەورە شوعەرا بەناوبانگەکانە و کوردە و لە گەنجە دانیشتووە، بەپێی شیعرەکانی دیباچەی «بهرامنامە»ی زۆرچاک ئاشکرایە کە عەلائەدین داوای لێکردووە «بهرامنامە»ی بۆ هەڵبەستێ، ئەمە شیعری سەرەتایەتی کە دەڵێت:

چون اشارت رسید پنهانی　　از سرا پەردەی سلیمانی

بر گرفتم چو مرغ بال گشای　　که کنم بردر سلیمان جای

لە دواییدا دەڵێت: کە داوایان لێکردم و من لە کتێبەکانی تەئریخ وردبوومەوە و پتر لە شاهنامە و تەبەری و هی دیکەدا گەڕاوە کە چتێکی شایان ڕێکخات و لە قسە و زبانانیش هەرچییەکی لەو بابەتەوە بووبێ گردی کردوونەوە و کتێبەکەی بەچوار فەسڵ داناوە. لەو فەسلانەدا لە خودا و پێغەمبەر و لە خوتبەی نەبەوی و لە دوعای پادشا و نەسیحەتکردن و نەسرەت بۆ پادشا خوازتن دواوە. لە دواییدا دەڵێت:

خسروی تاج نجیش تخت نشان
بر سر تاج تخت و گنج فشان

عمده الملکت علاءالدین
حافظ و ناصر زمان و زمین

شاه گرپه ارسلان کشورگیر
بەاز آلپ ارسلان بەتاج و سریر

مهدی کافتاب این مهداست
دولتش ختم آخرین عهد است

هم سر آسمان وهم کف ابر
هم بەتن شیر و هم بەنام هژبر

کز بلندی برادر فلک است
در بزرگی مقابل فلک است

نسل آقسنقر مؤید ازوست
اب و جدهم کمال ابجد ازوست

نظم اولاد او بسعد نجوم
در بەدر باد تا ابد منظوم

دو ملک زادەی سپهر سریر

این جهان جوی وآن ولایت گیر

نقشبند طراز افسر و جاه

نصرت الدین ملک محمد شاه

نام او بر فلک زراه رصد

گشته «من بعده إسمه احمد»

در دو قسمت که ملکشان بەهمست

احمدی و محمدی رقمست

له دوای گەلێک بەوانەدا هەڵگوتن ناوی یەکێکیان بە«نصرت الدین محمد» و هی دووەمیان بە«فلک الدین ملک احمد» دەبات. له کچێک دەدوێ که بەبلقەیس لەقەبی کردووه و شیعرەکان زۆر موهومن که دەڵێت:

چشم شه زیر چرخ مینایی

باد روشن بدین دو بینایی

باد محجوبەی نقاب شبش

نور صبح محمدی نسبش

این چرا باد چرخ باد بجود؟

چون شده ختم امهات وجود؟

در مفاظی خط سلیمانی

عرش بلقیس باد نورانی

بەوجۆره گەلێک بەکوڕان و بەو ژنەدا هەڵدەڵێ و سپاسیان دەکات. بەڵام شیعرەکان زۆر وردەکاری تێدا کراون و نادیارن که مەبەس کێن؟ هێندەمان بۆ ئاشکرا بووه که عەلائەدین دوو کوڕی هەبووه و نەیگوتووه. لەپاش ڕوو بەعەلائەدین گەلێک شیعری دیکەی هەیه که له دوامینیدا دەڵێت:

همه عالم تنند و ایران دل

نیست گوینده زین قیاس خجل

چونکه ایران دل زمین باشد

دل بەازتن بود یقین باشد

زمـان ولایت کـه سـروران دارند
بهـتـرین جـای بهـتـران دارند

دل تـوی وین مـثل حکایت تست
دلِ ممـلـکـت ولایـت تـسـت
هر ولایت کـه چون تـوشـه دارد
ایـزد ازهـر بـدش نـگـه دارد
ز آن سـعـادت کـه در سـرت دانند
مـقـبل هفت کـشـورت خـوانند
پنجـمین کـشـور ازتو آبادان
وز تو شش کـشـور دگـر شـادان

گەلێک لەو بابەتەوە دواوە و سپاس و سەنای عەلائەدین و کیشوەری پێنجەمین کە ئازربایەگانە دەکا و لەپاش لە ئەسکەندەر و ئەرستالیس و نەوشیرەوان و بوز رگمیهر و پەروێز و باربودی دەکا و لە خۆی و عەلائەدین دەدوێت و دەڵێت:

تو کـزن ایشـان بەافـسـری داری
چون نـظـامی سـخنوری داری
ای فـلک ها بەخـویشی تو بلند
هم فـلک رای و هم فلک پیـوند

لە دواییدا بەدەستوورەوە بەمەسنەوی خۆیدا چووە بەعەلائەدین و کوڕانیدا هەڵدەڵێت و لە قەڵای روئین دز (ڕواندز) دواوە:

چو من از قلعـەی قناعت خـویش
شـاه را کنج درکـشـیـدم پیش
درْ أدا کـردن زر جـایـز
وام دارِ منـسـت «روئـین دز»
وام داری نەکـز تهی شـکـمـی
دز روئـین بـود زبـی درمـی
مـیخ زرین کـه مـرکـز زمین است
نام «روئین دز»ش زو محکمی است

من كه هستم بەشهر و كشور خويش
بستەدارم كريز گە پس و پيش
نامە در مرغ نامە دربستم
كە رساند بەشاە و من رستم
از پس پانصد ونودو سە قرآن
گفتم اين نامەرا چو نامە وران
روز بر چارده زماە صيام
چار ساعت ز روز رفتە تمام

کیسرەوی لە بەخشی دووەم، لاپەڕە ١٣٤دا دەڵێت: نیزامی لەپاش تەواوکردنی کتێبەکەی بۆ عەلائەدینی ناردۆتە روئێن دز (ڕواندز) ساڵی ٥٩٣ی ١٤ مانگی ڕۆژوو سەعات چواری ڕۆژ بەپایانی گەیاندووە.

### ٦- نەسرەتودین محەمەد شای کوڕی عەلائەدین

لە شیعرەکانی نیزامیدا ئاشکرایە کە نەسرەتودین محەمەد شا وەلیعەهدی عەلائەدین بووە کە دەڵێت: «نقشبندی طراز افسر و جاە - نصرة الدين ملك محمد شاه» و لە شیعری دووەم و سێیەمی دووای ئەو شیعرەیدا دەردەکەوێ کە فەلەکەدین ئەحمەدی کوڕی بچووکترین بووە و عەلائەدین بۆ هەردووکیانی جێگا و موڵکی داناوە. کە نیزامی دەڵێ: «در دو قسمت كه ملكشان بەهمست» ئەوە ئاشکرا و دیارە، بۆیە ئێمە لەم جێگایەدا لە نەسرەتودین محەمەد دەدوێین.

«ابن الاثير» دەڵێت: ساڵی ٦٠٤ عەلائەدین کە مرد کوڕی ئەو منداڵ بوو کە بوو بەجێنشینی بابی، بێگومانە کە ئەم نەسرەتودین محەمەد شایە بووە. لەبەرئەوە کە پادشا منداڵ بوو، کاروباری فەرمانڕەوایی لە دەست سەردار سوپایەکی عەلائەدیندا دەسوڕا و ڕەشتەی گەڕان بەوبوو. «ابن الاثير» گەلێک لە دڵسۆزی و پاکی ئەو سەردارە دەدوێت و دەڵێت: ئەو سەردارە بۆ بنەماڵەی ئەحمەدێلیان بەکار و ڕاست و حەقناس و دڵسۆزبوو.

«ابن الاثير» دەنووسێ: کە یەکێک لە ئومەرایان لەشکری کۆکردەوە و سەرکێشی دەست پێکرد. سەردار سوپا کە دڵسۆزی ئەحمەدێلیان بوو، لەشکرێکی نارده سەر و بەگژیدا چوو و تەنگەی پێهەڵچنی و زار و زەبوون و پەرێشانی کرد و بناغەی فەرمانڕەوایی کوڕی عەلائەدینی توند دامەزراند. تین و هێزی بۆ پەیدا کرد و دوژمنی بۆ

نەهێشت. بەڵام زۆری پێنەچوو، لە سەرەتای ساڵی ٦٠٥دا ئەو کوڕە لەنێواندا چوو و مرد. لە دوای مردنی ئەو پادشایە، بنچینەی پادشایانی بنەماڵەی ئەحمەدیلیان ڕووی لە ڕوخان کرد و کەموکورتی و سستی بەسەردا هات و کەوتە لەرزین و لەناوچوون.

«ابن الاثیر» دەڵێت: ئەبوبەکری پەهلەوان کوڕی یولدز لە هەموو لایێکەوە دەستی هاوێژتە خاکی ئەحمەدیلیان و تەشقەڵە و خراپەی هێنا پێش. سەردار سوپا ڕاستەکەی ئەحمەدیلیان لە قەڵای ڕوئین دز (ڕواندز)دا خۆی گرت. مەراغە و گەلێک شارانی دیکەش کەوتنە دەست پەهلەوان. ئەبوبەکر پەهلەوان گەلێک کۆشا و تەقەڵای دا نەشیا ڕوئین دز بگرێ. کیسرەوی لە بەخشی دووەم «شهریاران گمنام»دا نوویسینی «ابن الاثیر» پەسند ناکات و بەدروستی نازانێ و دەڵێ: لە دوای ئەوەش بەچەند ساڵان ژنێک لەسەر مەراغە و ڕوئین دز پادشاهی کردووە. بەڵام «ابن الاثیر»یش لەوە دواوە و باسی ئەو ژنە دەکا.

## ٧- پاشەبەرە و دوامینی ئەحمەدیلیان (منهواداد)

لە دوای مردنی کوڕی عەلائەدین - هەروەکو گوترا - ژنێک کە گۆیا ناوی «منهواداد» و نەوەی عەلائەدین یا کچی و یان چتێکی ئەو بووە و گۆیا شیعرەکانی نیزامی کە بەژنێکی وا هەڵگوتووە وە بەبەلقیس ناوی بردووە ئەم ژنە بووە. دوامین پادشایانی ئەحمەدیلیان ساڵی ٦٠٥ ئەم ژنە بۆتە پادشا، بەڵام کچی کێ بووە؟ بەڕاستی ناوی چی بووە؟ لە ئێمە ونە.

«ابن الاثیر» و «کیسرەوی» و گەلێک لە تەئریخ نوویسەکان لێی دواون و ئێمەش لە تەئریخی «میرانی سۆران»دا باسمان کردووە. یێکەمین جار کە لەم مەلیکەیە دەنگ پەیدا بووبێ ساڵی ٦١٧ لە قەڵای ڕوئین دز (ڕواندز) بووە و هێندێک لە مێژوونویسەکان بە«مەلیکە منهواداد» ناویان بردووە و لە ڕواندزی ئێستاش لە نێو دانیشتووەکانیدا بەداستان لەو ژنە باس دەکەن کە گۆیا ناوی بولقیا (بولوقیا) بووە و لە ڕواندز پادشاهی کردووە و گەلێک کەس ئەو داستانە دەزانێ و ئەو ژنە شایە بەبولقیا دەناسن.

لە ساڵی ٦١٨دا مەغۆل هەڵمەتیان بردە سەر خاکی ئازربایەگان و تاڵان و کوژتار و ئەتک و سووکی کوردانیان دەستپێکرد و لینگیان دِا سەر شاری مەراغە و دەورەیان دا و خستیانە تەنگانی و سەختیەوە.

«ابن الاثیر» دەڵێت: پادشای مەراغە چونکو ژنێک بوو لە ڕواندز دادەنیشت، شاری

مەراغە بێ نیگەهبان و پاسەوان بوو. سوپایەک نەبوو لە شەڕی مەغۆلانی بپارێزێت و بەخێوی بکات. مەغۆلان بەئاسانی و سووکی ئەو شارەیان گرت و کوژتار و تالانێکی بێ ژماریان لێ کرد.

«ابن الاثیر» و «نورالدین محمد نسوی» مونشی سولتان جەلالودین خوارەزمشاه دەنوویسن و کیسرەوی لە بەخشی دووەم «شەهریاران گمنام»دا ئەوەش باس دەکات. جەلالەدینی خوارزم شا، بەسەر ئازربایەگاندا زاڵبوو و گرتی. ساڵی ٦٢٢ کوردی مەراغە قاقەزیان بۆ سولتان نارد لەوێدا سکالا و گازندەیان لە تالان و کوژتاری گورجیان و جەور و ئەزیەتی زۆرمەندان و پادشاهی ژنان کردبوو.

«سیرة جلال الدین» چاپی پارس و «ابن الاثیر» چاپی میسر دەنوویسن کە سولتان لە دوای ئەو قاقەزە چووە سەر مەراغە و گرتی و هەڵمەتی بردە سەر ڕوئیندز و چەند تەقەلای دا پێی نەگیرا؛ چونکو قەلاییێکی سەخت و دژواربوو. نسوی لاپەڕە ١٥٧ و «ابن الاثیر» ساڵی ٦٢٧: دوورودرێژ لەوە دواون، کە جەلالەدین شەش مانگ دەورەی ڕواندزی دا پێی نەگیرا. هەر لە دەست ئەو پادشا ژنەدا ماوە، هەتا چەندێک «سونج» ناو تورکمانێک بەبێ شەڕ ئەو قەلا سەختەی گرت و بنەماڵەی ئەحمەدیلیان دوایی هات.

ئێمە لەوە پتر کە گوتران لە بنەماڵەی پاشایانی ئەحمەدیلیان ئاگادار نین، چونکو هەر لەو ساڵەدا مەغۆل بەسەر هەموو خاکی کوردستاندا زاڵبوو و پیاوانی ناودار و بنەماڵەیان نەهێشت؛ بەتایبەتی کوردستانی موکریان بەجارێک ژێرپێی جەور و ئیستبدادی مەغۆل بوو.

لە سەربهوردان و کوژتارانی مەغۆل کە لە کوردانی ئازربایەگانیان کردووە، دیارە کە پادشایانی کورد ئەحمەدیلیان بەپادشاهی ئەو ژنە دوایی هاتووە و لە دوای ئەمە ئیدی هەتا نزیک سەد ساڵ و پتر نە کورد و نە پادشا و گەورانی کورد یەکێک لە خۆجێییان لە کوردستانی ئازربایەگاندا بەئاسوودەیی خۆیان نەدیوە؛ بەڵکەم یەکسەرە ئەو خاکە بەجارێک پڕبووبێ لە مەغۆل و عەشیرەتی تورکمان. چونکو مەراغە بوو بەتەختگای ئیلخانیان و لە هەموو لاییێکەوە تورکمان چڕژانە خاکی کوردستانی ئازربایەگانەوە.

**تەتەر و خوارزمیان لە کوردستاندا دوایی پادشایانی ئەحمەدیلیان**

خوارزم شا عەلائەدین محەمەد کوڕی تەکش لە ماوەرائونەهرەوە چووە سەر خاکی خوراسان و ڕەی و هێندێک خاکی دیکەی ئێران و گرتنی خستنیە ژێر فەرمانڕەوایی خۆیەوە.

ساڵی ٦١٤ چووەسەر جەبەل (عیراقی عەجەم) ئاتابەگ سەعد کوڕی نکلە خاوەندی خاکی فارس چووە پێشی و بەگژیدا چوو؛ لە دوامینی شەڕدا بەدیل گیرا و بەمامڵەت و پەیمان بەردرا و گەڕاوە فارس. لە دوای ئەوە خوارەزم شا چووەسەر ساوا و قەزوین و زەنگان و ئەبهەر و هەمەدان و لەوێوە چووە ئەسپەهان و قوم و کاشان، یەک لە دوای یەک هەمووی گرتن. لەگەڵ ئوزبەگی کوڕی پەهلەوان خاوەندی ئازربایەگان و ئاراندا موخابەرەی کرد بەمەرجی ئەمە پەیمانی لە تەکیدا گرت کە لەسەر مینبەران خوتبە بەناوی خوارزم شاوە بخوێندرێتەوە. بەوە لە چوونە ئازربایەگان دەستی هەڵگرت.

خوارزم شا ڕوو بەبەغدا لەشکری ئاژۆت، سێ چوار ڕۆژ لە هەمەدان دوور کەوتەوە. بەفرێکی قورسی بەسەردا باری، ناچاربوو بەر بەگەرمەسێر بڕوات. کوردانی هەکاری لەگەڵیدا بوون، خۆیان دزییەوە و بەپەنهانی لێی دوورکەوتنەوە. خوارزم شا گەڕاوە خوراسان، مانگی مەحەڕەمی ٦١٥ گەیشتەوە ماوەرانونەهر. (ابن الاثیر - جلدی ١٢ - لاپەڕە ١٤٥).

لەولاوە تەتەر لینگیان دا سەر سەمەرقەند و گرتیان. چەنگیزخان بیست هەزار سوارەی تەتەری ناردە سەر خوارزم شا و لەناکاو بەسەریان دادا. خوارزم شا بەچەند کەسێکەوە هەڵات و تەتەری بەدواوە بوو. چووە نیشابوور و تەبەرستان و چووە ڕەی و هەڵات بۆ هەمەدان و گەڕاوە مازندەران. لە بەحری تەبەرستاندا جزیرەیەک هەبوو، خۆی لەوێ کوتا و تێیدا شاردراوە. هەتا مرد تەتەر هەر لە دووی نەبوونەوە.

هەروەکو گوترا تەتەر کە بەدووی خوارزم شاوەبوون، گەیشتنە ڕەی و لەناکاو بەسەر شاریان دادا و گرتیان و تاڵان و کوژتاریان لێ کرد و ژن و منداڵیان ئەتک کرد. کە چوونە هەمەدان لەسەر ڕێگایان ئاوەدانی و شار نەما تووشی تاڵان و کوژتار نەبووبێ. لە هەمەدانەوە چوونە زەنگان و لەوێوە لینگیان دا سەر قەزوین، بەکوژتار شاریان گرت. نزیک چل هەزار کەسیان لە قەزوین کوژت و لەوێوە ڕوو بەتەورێزیان ئاژۆت.

ئوزبەگی کوڕی پەهلەوان لەبەر مەستی و کەیف، لەوە ئاگادار نەبوو. ژنەکەی کچی سوڵتان توغروڵ بەگ ماڵ و دیاری و دراوێکی زۆری دا بەتەتەران و لەسەر شاری لابردن.

تەتەر ڕووی لە موغان کرد و بەتاڵان و کوژتار بەو خاکەدا سووڕان. گورجیان لەگەڵ مەلیک ئەشرەف ئەیووبی و ئوزبەگدا ئاشتیان نواند و پێکهاتن. بەڵام گورجی فریا نەکەوتن، کە تەتەر کەوتە نێو خاکیانەوە کوژتار و تاڵانی دامەزراند. زستان لەوێ

جێگیربوون و بەکوژتار بەسەریان دەبرد.

سەر بەهاری مانگی سەفەر ساڵی ٦١٨ گەڕانەوە سەر ئازربایەگان و گەیشتنە تەورێز. ئوزبەگ لە ماڵ و لە دراو و لە پێویست گەلێکی پێدان و لەسەرخۆی لابردن. تەتەر لە تەورێزەوە هەڵمەتیان بردە سەر مەراغە بەکوژتار و تالآن و ئاوایی سووتاندن ڕۆیشتن و گەیشتنە مەراغە. وەکو لە پێشدا گوترا چونکو پادشای مەراغە ژن بوو لە قەڵای ڕوئین دز دادەنیشت. مەراغە لەشکر و سوپاهێکی وای نەبوو نیگەهداری و پاسی بکات. کوردانی نێو شار کۆبوونەوە و قەڵابەندیان کرد و بۆ کوژتار ئامادەبوون.

تەتەر چەند مەنجەنیقیان لە شار گرِدا و پاڵیان بەهەڵمەتەوە نا و بەکوژتار ڕۆژی چواری مانگی سەفەر بەشیر کەوتنە نێو شارەوە.

«ابن الاثیر» دەڵێت: هێندەیان لە ئەهالی کوژت کە لە ئەژمار بەدەربێ، ئەوەی بەکاریان هات بەتالآن بردیان و هی ماویان سووتاند. جگە لەوانەی خۆیان پەنهان کردبوو کەس نەما کە نەکوژرێن. بۆ شارێکی تەختگای کوردانی وەکو مەراغە جوان و خۆش هەموو کوردێک دەگریان. ئەو شارە گەورەیە بەجارێک وێران کرا.

تەتەر کە لە مەراغە وەحشەتکارانە ئیشی خۆی دی، ڕوو بەهەولێر هەڵمەتی برد. موزەفەرەدین خاوەندی هەولێر داوای یارمەتی لە بەدرەدین خاوەندی مووسڵ کرد و ئامادەبوو کە دەربەندە تەنگەکان و ڕێگا سەختەکانی سەرەڕێ بگرێ. لەودەمەدا لە خەلیفەوە وەڵام درا کە بگەنە داقووق و پێش بەتەتەر بگرن ئەوا لەشکرم بۆ ناردن، ئەگەرچی لەشکری خەلیفە ٨٠٠ کەسی نێرەمووک، «تواشی - خصی» بوون، تەتەر نەچوونە ئەو خاکە و ڕوو بەهەمەدان ڕۆیشتن و ئەو خاکەی سەر ڕێیان پووچکردەوە.

ئەهالی هەمەدان پێشیان پێ گرت و سێ ڕۆژ لەسەریەک کوژتاریان لێکردن. تەتەر لە مانگی ڕەجەبدا ڕۆژی چوارەم لینگیان دا سەر شار و بەکوژتار چوونە ژوورەوە و شیریان تێنان؛ نە ژن نە کچ نە منداڵ و پیاو ڕزگاربوون و هەموو کوژران و لەپاش تالآنکردنی شار، بەجارێک ئاوریان تێبەردا و گەڕانەوە ئازربایەگان.

کە هەمەدانیان سووتاند گەڕانەوە و چوونە سەر ئەردەوێل و بەشەڕ و کوژتار دەورەیاندا و گرتیان و تالآنیان کرد و میللەتەکەیان بەکوژتار بڕاندەوە و شاریان وێرانکرد و ڕوو بەتەورێز ڕۆیشتن.

ئەمیر ئوزبەگ لە بەدڕەفتاری و مەستیی، ئاگای لە شار و موڵک نەبوو، ژن و منداڵ و

گەنجینەی نارده شاری «خۆی» بۆ خۆشی هەڵات و چووە گەنجە و شەمسەدین توغرائی کە سەرهات و پێشکەوتووی تەورێز بوو بەنایبی خۆی لەسەر شاری دانا. شەمسەدین ئەهالی کۆکردنەوە و قەڵا و شوورەی شاری تونکرد و خەندەقانی پڕکرد لە ئاو و بۆ بەرامبەری ئامادەبوون.

تەتەر لەوە ئاگاداربوون و تێگەیشتن شار بەدەستەوە نادرێت و وەڵامیان دا بەشەمسەدین ماڵ و پێویستیان بداتێ. لەسەر هێندێک چت پێیدان بڕیانەوە و بۆیان ناردن.

تەتەر ڕووی کردە «سەراو» دوڕندایەتی خۆی نواند و تالاّن و کوژتاریان لێکرد و ڕوو بەشاری «بیلقان»یان ئاژوت. ڕۆژی مانگی ڕەمەزانی ٦٢٨ بەکوژتار کەوتنە شارەوە، نە ژن و نە پیاو و نە منداڵ ما، هەموو کوژران و زگدڕان و شار وێرانکرا. تەتەر لە دوای ئەوە لینگی دا سەر شاری «گەنجە» کە تەختگا و خۆشترینی شارانی ئاران بوو. میللەتەکەی ئازا و ئازاخوا بوون و قەڵابەندیان کرد و کۆبوونەوە و هەڵمەتیان بردە سەریان و کوژتارێکی قورسیان لە تەتەر کرد و ڕێگایان نەدان بکەونە نێو خاکییانەوە.

تەتەر لە خراپەکردن و وێرانی و کوژتاری ئازربایەگان و ئاران تێربوون؛ پەلاماری شێروانیان دا. شاری «شماخی»یان بەکوژتار گرت و شییری بێ ڕەحمیان لە ئەهالی کێشا و هەموویان پووچ کردەوە و لە دەربەند تێپەڕین و خاکی لان و لەگز و میللەتەکانی ئەو ناوەشیان بەو دەردە برد و چوونە قەپچاق. لە دوای ئەوە کە قەپچاقیشیان بەو دەردە گرفتارکرد، میللەتی قەپچاق هی ڕزگاربوو ڕوو بەشێروان هەڵاتن و پەنایان بردە بەر شێروان شا و لە دوایی بەفێڵ بەسەر ئەو خاکەدا زاڵبوون و ویستیان بکەونە خاکی ئارانەوە. ئەمیری «گەنجە» لە «کوشخرە» نایبی ئوزبەگ بوو، ڕاییکردن و کچی ئەمیرەکەشی لە خۆی مارەکرد. ئەوانیش وەکو تەتەر بەسەر کوردانی ئاراندا بوونە بار و بەڵا. (ابن الاثیر - ساڵی ٦١٩).

ساڵی ٦٢٢ گورجی لینگیان دا سەر گەنجەی تەختگای ئاران. ئەهالی چونکو ئازا و زرنگ و لە شەڕی گورجیان ڕاهاتبوون، بۆیان دەرکەوتن و لە دەرەوەی شار کوژتارێکی قورسیان لێکردن و شکاندیانن.

## جەلالەدین خوارەزم شا کوڕی محەمەد کوڕی تەکش لە کوردستانی ئازربایەگان

تەتەر لە خاکی هیندستان کە تەنگەیان بەجەلالەدین خوارزم شا هەڵچنی و هەڵیانبڕی. چووە «غەزنەین» لەوێش خۆی نەگرت و ڕۆیشتە کرمان و لەوێوە چوو بۆ ئەسپەهان کە لە دەست غیاسودینی برایدا بوو. لەوێشەوە ڕووی لە خاکی فارس کرد و لەگەڵ ئەتابەگ سەعدی کوڕی تکلە پێکهات و ڕۆییە خوزستان و لەوێشەوە بەتان هەتا نزیک بەسرە چوو و گەڕاوە باقووبە. خەلیفە لە ترسان بەغدای توند کرد. لە باقووبەوە چوو بۆ داقووقا.

کورد قەڵایان بەست و ئامادەی شەڕبوون. خوارزمییان بەزۆر شاریان گرت و کوژتار و تالانیان دەست پێ کرد و زۆرکەم لە ئەهالی ڕزگاربوون، ڕوو بەتکریت هەڵاتن.

خوارزم شا لە داقووقا دامەزرا و دەستە لەشکریکی ناردە سەر شارانی «ئەلب» و «ڕازان» (؟). کورد هەموو ڕوویانکردە تکریت و هەڵاتن. لە نێوانی موزەفەرەدین خاوەندی هەولێر و جەلالەدیندا ناردراوان هاتوچوونیان کرد؛ تاکو پێکهاتن و مامڵەتیان کرد. دوامینی مانگی ڕەبیعی دووەم ساڵی ٦٢٢ جەلالەدین لە داقووقاوە ڕوو بەئازربایەگان لەشکری هەڵگرت و گەیشتە مەراغە. زۆری پێ خۆشبوو تێیدا دانیشت و دەستی بەئاوەدانکردن و دامەزراندنەوە کرد.

جەلالەدین هێشتا لە خوزستان و ئەو ناوانەدا بوو، کە ئەمیر «ئەیغان» کە بە«تایسی» ناودەبرا و خاڵی غیاسودینی برای جەلالەدین بوو، بە پەنجا هەزار سوارەوە چووە سەر ئازربایەگان تالانی کرد و لینگی دا سەر ئاران و ئەو خاکەشی لووس تالان کرد. زستانی لە ئاراندا بەسەربرد و بەسەر ئازربایەگاندا گەڕاوە؛ دووبارە ئازربایەگانی تالانکرد و دەچووە هەمەدان کە دوو ڕۆژ جەلالەدین لە مەراغە بوو ئەوەی بیست. لەناکاو لینگی دا سەری و بەشەو دەورەی دا.

ئەمیر ئەیغان هەر وایدەزانی کە جەلالەدین لە خاکی داقووقایە و هیچ ئاگای لە خۆی نەبوو، تاکو دەورەی درا. کە چاوی بەسەیوان (چەتر)ی جەلالەدین کەوت دەستی لە کردەوە سست بوو؛ خێزانی کە خوشکی جەلالەدین بوو، بۆ تکا ناردیە پێش جەلالەدین و لێی بهورد و لەشکرەکەی تێکەڵ بەلەشکری خۆی کرد و گەڕانەوە مەراغە.

«ابن الاثیر» دەڵێت: خەلیفە ناسرەدین لیللا بۆی نوویسیبوو کە هەڵمەت بباتە سەر ئازربایەگان و ئاران و بگەڕێتەوە هەمەدان بۆ ئەو بێت. کە جەلالەدین لە مەراغە دامەزرا و دەستی بەئاوەدانکردنەوەی شار و دێهات کرد. ئوزبەگی کوڕی پەهلەوان -کە لە مەستی

بەولاوە شایستەی هیچ نەبوو- فەرمانڕەوایی ئازربایەگان و ئاران بوو؛ لە ترسان نەشیا لە تەورێز خۆی بگرێ و هەڵات چوو بۆ گەنجە.

هەرچەندە کوردستانی ئازربایەگان لە پەنجەی یولدزیان ڕزگاربوون، بەڵام تووشی موسیبەتی لەوە گەورەتر بوون کە خوارزم شایە؛ چونکو مایەی هاتنی تەتەر بۆ ئەو خاکە خوارەزم شابوو. وەکو گوترا و هەروەکو بەکورتی لە هاتوودا لێی دەدوێین، دێتە بەرچاو کە خوارەزم شا چەندی خراپی کرد و تەتەر بەچ جەور و دوڕندەیی بێ ڕەحمکارانە بزووتەوە و چ کوژتار و تالانی لە کوردستان کرد. (ابن الاثیر)

ئوزبەگ کە هەڵات و ڕوو بەگەنجە دەرچوو، جەلالەدین پیاوانی ناردە تەورێز و گرتی و گەنجینە و ماڵی ئوزبەگی خستەدەست. سوپاهیانی خوارزمیان دەستی جەور و تالان و خراپەیان درێژکرد. ئەهالی تەورێز بۆ جەلالەدینیان نووسی. ئەویش شانەی بۆ ناردن کە شار دامەزرێنی و نەهێڵێت لەشکریان ئەزیەتی میللەت بدەن.

ئەو شانەیە کە چوو چتی وای لێ خوازتن کە وێنەدەچوو و لە تین و تەوانادا نەبوو. میللەتی تەورێز هەستانە سەرخۆیان و قەڵابەندیان کرد و دەروازەی شاریان گرێدا و خوارەزمیەکانیان دەرکرد. خوارەزم شا بۆ خۆی هەستا ڕۆیشتە تەورێز و پێنج ڕۆژ شاری دەورەدا. ئەهالی بەمەرج و پەیمان ئامانیان خوازت.

ژنی ئوزبەگ کچی توغروڵ بەگی کوڕی سوڵتان ئەرسەلان کە بۆ خۆی پادشا و فەرمانڕەوابوو. ئوزبەگ لە مەستی و بەدڕەفتاری بەولاوە لە هیچ ئاگادار نەبوو. ئەو ژنە لەلای میللەت پەسند و خۆشەویست بوو. جەلالەدین دەستی تێنەدا و موڵک و ئەملاکێکی بەتایبەتی هی خۆی لە شاری «خۆی» و جێگایانی دیکەدا بهێڵێتەوە و دەست لە هیچ چتێکی ئەو ژنە نەدات. جەلالەدین مەرجی گرت و پەیمانی بەست و سوێندی خوارد و ڕۆژی ١٧ی ڕەجەبی ٦٢٢ چووە نێو تەورێز و بەسەر هەموو دەوروپشتیدا زاڵبوو. (ابن الاثیر)

ژنی ئوزبەگ بەماڵ و گەنجینە و ئەشیای خۆیەوە چووە «خۆی» و لەلایەن جەلالەدینەوە سوپا و لەشکری لەگەڵ خست و لە گەورە و ڕیش سپی شار چەند کەسێک سەرهات و هەڵبژاردەشی لە تەکا ڕۆیشتن و بردیانە «خۆی» و دایانمەزراند و گەڕانەوە تەورێز.

جەلالەدین کە لە تەورێز لەسەر کورسی دانیشت، فەرمانی دا لە میللەت بەبێ پەردە هەموو کەسێک بچنە کنی و هەرچیەکی داخوازیان بێ، بۆ خۆیان بخوازن. گەورە و

کەیخودا و سەرهاتی شار لەلای دانیشتبوون و پێی گوتن کە ئێمە دەمانەوێ مەملەکەتان ئاواکەین و دوژمنی موسڵمانان لەناوبەرین. وردبنەوە کە مەراغە چی بەسەرهات و چۆمان ئاوەدانکردەوە. بۆ ئێوەش چاکە و گەلێ چتی بەسوود دەکەین.

«ابن الاثیر» دەڵێت: لەو بابەتەوە دوورودرێژ دڵخۆشی ئەهالی داوە و مزگێنی چاکە و کاری زۆر بەسوودی دانێ و پێشی گوتن کە گورجی لەم خاکەدا دوژمنی ئیسلامانە و دەچمەسەریان و پووچیان دەکەمەوە.

چەند ڕۆژێک لەوە بەسەرچوو، جەلالەدین لەشکری هەڵگرت و هەڵمەتی بردە سەر گورجیان و بەکوژتار کەوتە نێویان و شکاندنی و شار و ئاواییانی لێگرتن و غیاسەدینی برای خۆی لەو خاکەدا کردە ئەمیر و بۆخۆی گەڕاوە تەورێز.

«ابن الاثیر» دەڵێت: ئەو هەڵمەتەی جەلالەدین بۆ سەر گورجیان، مەبەس دڵخۆشیدانەوەی ئومەرایانی ئیسلامی دەوروپشت و خۆ نواندن و بەناسیندان بوو، «ابن الاثیر» دوورودرێژ لەوە باس دەکات.

«ابن الاثیر» دەڵێت: جەلالەدین کە بەگژ گورجیان دا چوو، شەمسەدین توغرائی کە سەرهاتی تەورێزبوو، کۆمەڵەی بەست و دەرگای تەورێز لە ڕووی جەلالەدین گرێدەن و ئوزبەگ ببەنەوە تەورێز. شەرەفولمولک وەزیری جەلالەدین بەلەز ئەو سەربهوردەی نوویسی و ناردیە گورجستان و جەلالەدینی لەوە ئاگادار کرد.

جەلالەدین ئەوەی پەنهان کرد تا گورجیانی شکاند؛ ئەوجا بەتالووکە گەڕاوە تەورێز و شەمسەدین توغرائی و هاودەنگەکانی گرتن و خستنیە زیندانەوە و دەستی بەدامەزراندنەوەی ئازربایەگان کرد و توندی نواند.

هەر لەوساڵەدا لە دوای ئەوە کە سەرهات و گەورەکانی گرتن، بەهانە جویی کرد و وێیچواند کە ئوزبەگ جارێک بەتەڵاق سوێندی خواردبوو کە خولامێکی خۆی نەکوژێت و لە دواییدا کوشتبووی و بەوە تەڵاقی کەوتووە و عولەماکانی خوارزمی فەتوای تەڵاق کەوتنیان دا و ژنی ئوزبەگ کە کچی توغروڵ بەگ بوو لە «خۆی» دادەنیشت لە ئوزبەگیان بەردا و لە جەلالەدینیان مارەکرد.

لە پاش ئەوە جەلالەدین لەشکری ناردە سەر ئوزبەگ و خاکی ئارانیان گرت و هەڵمەتیان بردە سەر «گەنجە»ی تەختگای ئاران. ئوزبەگ قەڵابەندی کرد و قاقەزی ئامانی بۆ جەلالەدین ناردە تەورێز و ئامان درا. لە چاخی ئەو کێشە و هەرایەدا گورجی و تورکی

قەپچاق و لان و لەگز ڕێککەوتن و لە تفلیسدا کۆبوونەوە کە هەڵمەت بەرنە سەر خاکی ئازربایەگان. جەلالەدین بەلەشکرەوە لینگی دا سەر تفلیس و بەکوژتار دەورەی دا. ڕۆژی ٨ی ڕەبیعی ئەوەڵ ساڵی ٦٢٣ بەکوژتار تفلیسی گرت و کۆمەڵەی گورجیانی پەرشوبڵاو کردەوە.

«ابن الاثیر» دەڵێت: کوژتارێکی بێ ژماری کرد و گەڕاوە تەورێز. جەلالەدین مانگی جەمادی دووەم وەڵامی پێدرا کە نایبی ئەو لە کرمان سەرکێشی کردووە، هەستا چووە ئەسپەهان و لە نێوانیاندا نووسین هاتوچۆی کرد. جەلالەدین دڵنیابوو، لەودەمەدا قاقەزی وەزیری شەرەفولملکی پێگەیشت کە مەلیک ئەشرەفی ئەیووبی خاوەندی دیمەشق و جزیر و خەلات لەشکری خوارزمیانی شکاند، ئەگەر فریا نەکەوێت بۆ گورجستان و ئاران و ئازربایەگان باش نابێ.

«ابن الاثیر» دەڵێت: جەلالەدین ڕوو بەکرمان ڕۆیشت؛ لەشکری خوارزمیان لە تفلیسەوە بەتاڵان و کوژتار و ژن ئەتککردن و منداڵ زگدڕین ڕوو بەخاکی ئەرزەڕۆم هەڵمەتیان برد و بەسەر گۆشەیەکی خاکی «خلات»دا دەگەڕانەوە. ئەمیر حاجیب حیسامەدینی نایبی مەلیک ئەشرەف پێشی پێگرتن و هەموو تاڵان و دیلەکانی لێ ئەستاندنەوە. لەبەرئەوە وەزیر بۆ جەلالەدینی نووسی و ترسا حاجیب پێوە بچێت و ڕوو لە ئازربایەگان بکات.

جەلالەدین لە ئەسپەهانەوە گەڕاوە. مانگی ڕەمەزانی ئەو ساڵە گەیشتە تفلیس و هەڵمەتی بردە سەر شاری «ئانی» کە تەختگای دووەمی کوردانی شەدادیان و گەورەترین شارانی ئەو خاکەبوو. بەڕقەوە دەورەیدا و دەستە سوپاهێکی ناردە سەر شاری قارس مەنجەنیقیان لەو دوو شارە گەورە و سەختە گرداان. دانیشتووەکانی ئەو شارانە مەردانە شەڕیان کرد. هەتا نیوەی مانگی شەوال دەورەدران و بەتوندی و شەڕ بەگەرمی بوو، میللەت بەدەستیانەوە نەدا.

جەلالەدین ناچار بەری دا و چووە سەر شاری «ئەبخاز» و بەشەڕ و کوژتار گرتی. لەوێوە بۆ سەر خلات چوو و لینگی دا سەر «مەلازگرد» و ڕۆژی شەممەی ١٣ زیلقەعدە قەلایەکی سەختبوو: دوو ڕۆژی دەورە دا و ڕۆژی ١٥ی مانگ چووە سەر خلات و دەورەی دا.

میللەتی خلات نەبەرد و ئازادخوا و ڕەشیدبوون. قەلا و شاریان توندکرد و بۆ شەڕ ئامادەبوون و دلێرانە بەگژ خوارزمیان دا چوون و کوژتاریان کرد. لەشکریان تا ژێر شوورەی

قەلاّ هەڵمەتیان برد، بەلاّم لە لایەن میللەتەوە لاشەیەکی بێ ژماریان لێ خرا و بەکوژتار پاشەوپاشیان گێڕانەوە. جاری دووەم خوارزمیان بەگەرمی و یەک وچان شالاّویان برد و نەگەڕانەوە، تاگەیشتنە نزیک شار دیسان شکاندران.

جاری سێیەم لینگیان دا و بەکوژتار کەوتنە گۆشەیەکی شارەوە و دەستیان هاوێژتە ژن و منداڵ و ئەتک و سووکی کردن. میللەتی ئازادپەرست لەوە ڕقیان هەستا و دەماریان بزووت و بەکوژتار دوژمنیان لە شار دەرکرد.

جەلالەدین دەورەدانی توندکرد و میللەت بەدلێری شەڕیان کرد تاکو سەرما و بەفر پەیدابوو. ڕۆژی سێ شەممەی ٢٣ زیلحەجە جەلالەدین لە دەورەدانی خەلاّت دەستی هەڵگرت و ڕوو بەئازربایەگان گەڕاوە. هەروەکو لە هاتوودا باس دەکرێ.

لەودەمەدا کە جەلالەدین لە تفلیس و خلاّت بوو، میللەتی تورکمانی «ئەیوائی» زۆریان هێنابوو. بە سەر شارەکانی خاکانی کوردستانی «ئەشتەر» و «ورمێ»دا زاڵببوون و خراپە نەما بوو کە نەیکەن و داوای خەرجوباجیان لە «خۆی» دەکرد. بەوەش ڕانەوەستان بەنێو کوردستانی ئازربایەگانەوە بلاّوبوونەوەو ڕێگری و جەردەیی و تالاّنیان دەست پێ کرد. لە نزیک تەورێز توجاڕ و بازرگانیان ڕووت دەکرد.

ژنی جەلالەدین کە کچی توغروڵ و نایبی ئەو بوو؛ لە تەورێز قاقەزی بۆ نوویسی و لە سەربهوردی تورکمانانی ئاگادار کرد. جەلالەدین لە خەلاّتەوە لەناکاو لینگی دا سەریان و هیچ ئاگادار نەبوون، هەتا دەورەیان درا و شیریان لێ کێشرا و لاشەیان لێ کەوت. جەلالەدین کوژتارێکی بێ ژماری لێکردن و هەبوو نەبووی تالاّن کرد.

«ابن الاثیر» دەڵێت: پتر لە نیوەیەکی کوژران و هیماوی بلاّو و برسی و ڕووت کەوتن. جەلالەدین گەڕاوە تەورێز و لەبەر سەرما لەشکری بەشارەکانی ئازربایەگاندا بلاّوکردەوە.

مانگی ڕەبیعی ئەوەڵی ساڵی ٦٢٤ گورجی چوونە سەر تفلیس و گرتیانەوە. جەلالەدین چوو بەهاوارەوە؛ بەلاّم فریانەکەوت. ناچار چووە گەنجە. لەوێ بوو کە زانییەوە ئیسماعیلیان ئەمیرێکی ئەویان کوژت. جەلالەدین چووە سەریان قەلاّی (ئەلەمووت)ی گرت و بەکوژتار کەوتە ئەو خاکەوە.

لەودەمەدا پێی ڕاگەیاندرا کە تەتەر گەیشتنە خاکی دامغان کە نزیک خاکی «ڕەی»یە. چووەسەر تەتەران و بەکوژتار شکاندنی و گەڕاوە ڕەی. وەلاّمی درایێ کە تەتەر وەکو لێشاو هاتن.

## لەشکری مەلیک ئەشرەفی ئەیووبی لە کوردستانی ئازربایەگان و شەڕی جەلالەدین وشکانی

ژنی جەلالەدین کە کچی سوڵتان توغروڵ و لە دەوری مێردی پێشوویدا هەر خۆی پادشا و بەنابەدڵی لە مێردی ئەستاندرا و لە جەلالەدین مارە کرابوو، زۆر بەسەختی و ناگوزیری زیندەگانی دەکرد و دەیەویست ڕێگای ڕزگاربوون بدۆزێتەوە. بەپەنهانی لەگەڵ حاجیب حیسامەدینی نایبی مەلیک ئەشرەف لە خەلاتدا گفتوگۆیان هەبوو و لە دەرفەت دەگەڕان.

کە جەلالەدین کەوتە کێشەی ئیسماعیلیان و تەتەرەوە، مانگی شەعبانی ساڵی ٦٢٤ حیسامەدین بەلەشکری کوردانی خەلات هەڵمەتی بردە سەر گۆشەیێکی ئازربایەگان. شاری «خۆی» و قەڵاکانی و شاری مەرەند و دەوروپشتی و شار و قەڵاکانی نەخچەوانی هەموو گرت و ئەگەر پێوە بڕۆیشتبا هەموو خاکی ئازربایەگان و ئاران و دەوروپشتیشی زۆر بەئاسانی دەگرت. چونکو مەلیکە لەلای میللەتی ئەو خاکە زۆر خۆشەویست و قسەڕەوا بوو، بەهۆی ئەوەوە ئەو خاکانە زوو دەگیران. بەڵام زوو ژنەکەیان هەڵگرت و گەڕانەوە خەلات و لەبەرچی بوو؟ ئەو ژنە ئارەزووی لەوە پتر نەکرد و گەڕاوە خەلات، نەزاندراوە.

جەلالەدین کە لە شەڕی تەتەر دڵنیا و ئاسوودە بوو، وەکو دەگوترێ: کە کوڕی جەنگیزخان وەڵامی دابوویێ و دڵنیای کردبوو. «ابن الاثیر» دەڵێت: ساڵی ٦٢٥ گەڕاوە تەورێز و چووە سەر خەلات و لەشکری ڕێکخست و بەکوژتار و تاڵان ڕووی تێکرد، هەتا گەیشتە دەشتی «مووش» و شار و ئاوایی و دێهات و چیا و چۆڵ نەما تاڵان و کوژتار و ئەتک و سووکی بەسەر نەهێنی و وێرانی نەکا و نەیسووتێنێ. ژنی ئەتک کرد و منداڵی زگدڕی و ئاوایانی هەموو سووتاند و لەبەر بەفر گەڕانەوە تەورێز.

«ابن الاثیر» دەڵێت: جاری دووەم جەلالەدین لە مانگی شەوالی ساڵی ٦٢٦دا لینگی دا سەر خەلات و بەکوژتار و تاڵان دەورەی دا و بەدوورندەیی بزووتەوە. ئەهالی و لەشکری خەلات زۆرباش لە شەڕەوە چوون. جەلالەدین چەند مەنجەنیقانی لێ گرێدا، هەر لایێکی دیوار بکەوتبا، میللەت زوو فریای دەکەوتن و چاکیان دەکردەوە. بەوجۆرە هەشت مانگ شەڕوکوژتار ڕاگیراوبوو. میللەت گۆشتی هەموو حەیوانێکیان خوارد و شاریان بەدەستەوە نەدا. ڕۆژی ٢٨ی جەمادی ئەوەڵی ساڵی ٦٢٧ جەلالەدین بەشیر شاری گرت و قەتلوعامی کرد و بەجارێک شاری وێران کرد.

لەسەر وەحشەتکاری و دوڕندەیی جەلالەدین کە لەوسەر زەویەدا بەکاری برد و بەبێ ڕەحمانە میللەتەکەی بەدەستوورێکی جانەوەرانە کوژت و منداڵ و ژنی زگدڕین، مەلیک ئەشرەفی ئەیووبی و کەیقوبادی خاوەندی ڕۆم و پادشا و ئومەرایان و میللەتی ئیسلامی ئەو دەوروپشتە، هەموو سوێندیان خوارد و چوونە «سیواس» و لەشکرکێشیان کرد کە لینگدەنە سەر جەلالەدین.

ئەمیر عیزەدینی عومەر کوڕی عەلی کوردی هەکاری -کە سەردار سوپاهێکی بەناوبانگی مەلیک ئەشرەف بوو- بەسوپاهی حەلەب ڕوو بەجەلالەدین هەڵمەتی برد و گەیشتە «ئەرزنجان». بیست و پێنج هەزار شەڕکەری پێبوو، لەولاوە جەلالەدین بۆی چوو لە خاکی ئەرزنجان کە جێگایەک پێی دەڵێن: (باسی حیمار) لەگەڵ عیزەدین بەشەڕهات و شەڕ و کوژتارێکی قورس کرا. ڕۆژی شەممەی ٢٨ی مانگی ڕەمەزانی ساڵی ٦٢٧ھ عیزەدین سەرکەوت جەلالەدین شکا و هەڵات.

«ابن الاثیر» دەڵێت: خۆی و لەشکرەکەی خوارەزمیان وا هەڵاتن کە برا نەدەپەرژایە سەر برا. لەشکر و بار و بنە هەموو پەرشوبڵاو کرا و جەلالەدین بەچەند کەسێکی زۆرکەمەوە ڕزگاربوون و بەشپرزەیی خۆیان گەیاندە کەنار شاری «خۆی» و لەوێ دابەزین.

مەلیک ئەشرەف لە دوای ئەوە چووە خلات تەماشای کرد داری لەسەر بەرد نەماوە و چۆڵوهۆڵە. جەلالەدین قاقەزی بۆ نارد و پاڕاوە و ئاشتی لیێ خوازت. بەمەرجی ئەمە هەرکەس لەسەر ئەو خاکەی کە لە دەستی ماوە، بمێنێت. پەیمان گرێدرا و نێوانیان ئاشتی و دۆستی تێکەوت و باوەڕی و پەیمان کە دامەزراندراوە، مەلیک ئەشرەف ڕوو بەژەنگار «سنجار» و بۆ دیمەشق گەڕاوە و جەلالەدین لەسەر ئازربایەگان دامەزراوە.

هەر لەو ساڵەدا جەلالەدین چووە سەر قەڵای ڕوئیندز کە قەڵاییێکی سەخت و توندی مەراغە و تەختگای دووەمی پادشایانی ئەحمەدێلیان بوو (کە لە ڕابردوو باسکرا) نزیک شەش مانگ دەورەیدا و بۆی نەگیرا. جەلالەدین ناچار دیاری و خەڵات و پێشکەشیەکی قورسی بۆ ئەهالی نارده نێو قەڵاوە و دڵخۆشییانی داوە.

بەڵام میللەت بوو بەدووبەرەکی. دەستەیەک ویستیان قەڵا بەدەستەوە بدەن. دەستەی دووەم نەیانهێشت و ناردیانە دووی «سونج» ناو تورکمانێک کە چووبووە سەر قەڵای «ساروو» کە هی موزەفەرەدین خاوەندی هەولێر بوو. ئەمیر عیزەدینی کوردی حەمیدی کە لە لایەن موزەفەرەدینەوە لەسەر ئەو قەڵایە بوو کوژتی و بەسەر قەڵای سارووودا زاڵبوو.

ئەو سونج تورکمانە لە عەشیرەتی قشیالوو و جەردەیەک بوو، بەبێ شەڕ قەڵایەکی وا سەختی وەکو ڕوئیندزی دەستکەوت. لە دوای ئەوە برایەکی و لە دوای برای خوارزایەکی لەسەر دانیشت. «ابن الاثیر» دەڵێت: ئەو هەموانە لە دووساڵدا ڕوویدا. ساڵی ٦٢٩ تەتەر بەسەریدا زاڵبوو.

جەلالەدین کە تێگەیشت ئەهالی سونجیان بردە نێو قەڵاوە، دەستی هەڵگرت و گەڕاوە تەورێز.

## جاری دووەمینی هاتنەوەی تەتەر بۆ کوردستانی ئازربایەگان

جەلالەدین کە لە دەست ئەمیر عیزەدینی هەکاری لە ئەرزنجان هەڵات و پەرێشان کرا ئیسماعیلیان ئەو سەربهوردەیان بەتەتەران ڕاگەیاند و بۆ گرتنی خاکی ئازربایەگان تەتەریان هاندان. لەودەمەشدا خاکی ماوەرائەنەهر و خوڕاسانیان گرتبوو و پێ پەستو وێرانیان کردبوو.

ئەوە لەلایێکەوە تەتەری دڵخۆشی دەداوە و لەم لاشەوە بەدڕەفتاری و خراپی جەلالەدین دڵی هەموو ئۆمەرا و پادشاکانی دراوسێ و سەردار سوپا و خوێش و میللەتەکەی خۆشی شکاندبوو. سستی و پشێوی کەوتبووە نێوجەرگەی سوپا و مەملەکەتەکەیەوە. بەپەنهانی نە وەزیر و نە برا و نە سەرکردەیەکی سوپایی مابوو کە لێی دڵڕەنج نەبووبن و لەودەموچاخە پشێویە و بێ سەروبەرەشدا، هەتیوێکی نێرەمووکی لێ مردبوو. ئەهالی و سوپایی و ئومەرا و وەزیری بەپێیان خستبوو، جەنازەکەی لە کووچە و کۆڵانەندا دەیانگێڕا و نەیاندەناژت. لەسەر ئەوە شەرەفولمەلیکی وەزیری گرت و کوژتی.

بەوە پتر میللەت و سوپای وەڕەز و بێزار ببوون. بەڕاستی بەڵا و موسیبەتی جەلالەدین کە بەسەر کوردستانی داهێنا و پیسی و خراپەیەکی ئەو کردی بەچاکی پێشوازی تەتەری دەکرد و ڕەوشتی بەد و پیسی نیشان بەتەتەر دەدا و مەغۆڵی فێری جانەوەری دەکرد.

بەهۆی ئیسماعیلیانەوە تەتەر لە ماوەرائونەهر بەلێشاو ڕوو بەخاکی کوردستانی ئازربایەگان خشان. هەر ئاوایی و شار و دێهاتێکیان کەوتە پێش کوژتار و تاڵانیان کرد و سووتاندیان و چوونە پێش. ئەوەی لە کردەوەی هیچ دوڕندە و جانەوەرێک نەچێت، وەحشەت و وەحشی لەوان دەکرد. بەو دەستوورە بەسەر خاکی ئازربایەگاندا ڕۆیشتن، هەتا گەیشتنە مەراغە.

ساڵی ٦٢٨ دەوری مەراغەیان گرت و ئەهالی بێچارە لە ترسی گیان و ناموس و ماڵ،

قەڵابەندیان کرد. لەدواییدا ناچار بەمامڵەت و ئامان شاریان بەدەستەوەدا. تەتەر وەکو جاری پێشوو لەگەڵ مەراغە خراپەییان نەکرد و شانەیان لەسەر دانا و حکوومەتی خۆیان دامەزراند و دەستیان بەرێکی و پێکهێنانی شار کرد و کار ڕووی لە گەورەبوون نواند.

وا دیاری دا کە تەتەر بەدڵ دانیشتن و بۆ مانەوە لە مەراغەدا دەکۆشان. بەوە کوردی ئازربایەگان کەوتنە تەقەڵای ترس و لەرز و ئەندێشە و خۆپارازتنەوە لە شەڕ و کوژتار، لەگەڵیاندا ڕێککەوتن.

جەلالەدین کە تەماشای کرد تەتەر کەوتنە نێوەڕاستی ئازەر بایەگانەوە و شاری تەختگای ئازەربایەگانەوە کردە جێگای دانیشتن و ناوچەی بزووتنەوەیان و کوردستانی ئازربایەگانیان تێکوپێکدا. دەکوژن، دەبرن، تاڵان دەکەن و مەبەستی ڕاستییان جەلالەدینە و چیدیکە نا. جەلالەدین ترس و ئەندێشەی لێ نیشت و هەستا دەستی لە خاکی ئازربایەگان بەردا و ڕوو بەخلات هەڵات.

وڵامی دا بەنائیبی مەلیک ئەشرەف کە بۆ پەناهاتووە نەک شەڕ. کە گەیشتە خەلات، تەتەری بەشوێنەوە بوو. لەوێ خۆی نەگرت، ڕوو بە «ئامەد» تەتەری کەوتنە دووی؛ لە ئامەد دەورەیاندا. لەوێش خۆی نەگرت و هەڵات.

لەشکر و سوپاهی بڵاوبوونەوە و هەردەستەی بەلایەکدا هەڵاتن. دەستەیەکی بۆ حەڕان چوو، ئەمیر سوابی پێشکاری مەلیک کامیلی ئەیووبی پێشی پێگرت و ڕووتی کردنەوە.

دەستەیێکیش بۆ شەنگار و نوسەیبین و مووسڵ ڕۆیشتن و دەستەیەکیش چوونە هەولێر. پادشا و ئومەرا و ئەهالی ئەو خاکانە بەخێویان کردن و پارازتیانن. بەڵام زۆر ڕەزیل و پەرێشان و سووک و ڕزیو بوون؛ چونکو چاکەیان هیچ نەکردبوو، بەدی و خراپیەکی بەسەر خوزستان و داقووقا و ئازربایەگان و خلات و ئارانیان هێنابوو، لەبیر نەچووبوو. جەلالەدین لە ئامەدەوە ڕوو بەدیاربەکر هەڵات و بزربوو، کەس نەیزانی چی بەسەرهات.

کە جەلالەدین چووە ئامەد، تەتەر لە دووی نەبوونەوە و چوون دەوروپشتی هەموویانی بەدەردی خاکەکانی دیکە برد و ڕوو بەخاپووریان ئاژۆت. ئەویش بەو دەردە گرفتار کرا.

دەستە تەتەرێک ڕوویان لە مووسڵ کرد و گەیشتنە گوندی «مونسە» و هەرچیەکی تێدابوو، ورد و درشت و گەورە و بچووکیان کوژت. لەوانە دەستەیەکی بۆ سەر نوسەیبین گەڕاوە کوژتار و تاڵانیان کرد و چوونە سەر ئامەد و گرتیان و شیریان لە ئەهالی کێشا و

ژن و منداڵ و پیاویان نەهێشت و ڕوو بەبدلیس بەکوژتار و تاڵانکردن هەڵمەتیان برد.

میللەتی بدلیس قەڵابەند بوون و دەستیان هاوێژتە تەتەر کوژتن. بەڵام تەتەر بەکوژتار شاری گرت و شیریری لە ئەهالی کێشا و کەسی نەهێشت و هەمووی کوژت و شاری سووتاند. لەوێوە چوونە سەر «خلاط» و «باگیر» و دەورەیاندا. لەپاش شەڕ و کێشە بەزۆر گرتیان و هەموویان لەناوبردن. «ابن الاثیر» گەلێک بەم شارەدا هەڵدەڵێ کە چەند جوان و سەخت و گەورەبووە.

لەوێوە تەتەر پەلاماری ئەردیش (ئەرجیش)یان دا کە شارێکی زۆر گەورە و کۆن بوو. بەشییر و شەڕ ئەویشیان گرت و کوژتار و تاڵانیان کرد و شاریان سووتاند.

مانگی زیلحیجەی ئەو ساڵە دەستەیێکی دیکەی تەتەر لە مەراغەوە ڕوو بەهەولێر و بەسەر کوردەکانی «جوزقان»دا بەکوژتار ڕۆیشتن. موزەفەرەدین هاواری لەبەدرەدین خاوەندی مووسڵ کرد کە یاریدەی بدات. موزەفەرەدین چووەپێش تەتەر و بەکوژتار بەنێو ئەو کوردانە و کوردی دیکەدا چوون. نەچوونە هەولێر و لایاندا و گەڕانەوە ئامەدیان لووس تاڵانکرد و ئەهالیەکەیان کوژت و چوونەسەر «ئارزن» و «میافارقین» کوژتار و تاڵانیان کرد و چوونە شاری ئەسعرد (سیرتی) میللەتەکەی ئازا و ڕەشیدبوون و بەگژیاندا چوون و گەلێکیان لێکوژتن. تەتەر ئامانیان خوازت؛ کوردەکان باوەڕیان کرد و ئامانیان دان. تەتەر شییریان لێ کێشا و کەوتنە نێو کوردانەوە و کەمیان ڕزگاربوون.

«ابن الاثیر» دەڵێت: نزیک پازدە هەزاریان لە کوردی سیرتی کوژت و دەورەدانی شاری سیرت پێنج ڕۆژی کێشا.

تەتەرکە لە کوژتاری سیرتی دەستیان هەڵگرت و چوونە شاری «تەنزە» ئەویشیان بەو دەردە برد و چوونە سەر کوردی قەریش کە لە دەربەندی «وادی قەریشیە»دا بوون. ئەو دەربەندە ڕێگای بۆی دەچوو، تەنگ و سەخت بوو و پڕ لە ئاوایی و دێهات و باخ، ئاوی ڕەوان بوو. کوردەکانی ئەوێ چوونە پێش و ڕێگا سەختەکەیان لێگرتن و کوژتارێکی قورسیان لە تەتەر کرد و پاشەوپاشیان گەڕاندنەوە.

تەتەر لەوێ کە شکان ڕوو بەماردین چوون؛ هەر ئاوایی و شارێکیان کەوتە پێش تاڵانیان کرد و سووتاندیان و هەر گیانلەبەرێکیان دی کوژتیان. کەس نەبوو بتوانێ پێشیان پێ بگرێ. میللەتی هەموو دەوروپشتیشی هەڵاتن و لە قەڵادا کۆبوونەوە. تەتەر نەشیا بیگرێ و چوونە سەر نوسەیبین.

میللەتی ئەو خاکەش لە قەڵای نوسەیبین خزان. تەتەر لەوێش بەنائومێدی گەڕاوە، بەکوژتار کەوتە ئەو خاکەوە تا گەیشتە کێوەکانی ژەنگار ئازەربایەگان.

ابن الاثیر دەڵێ: دێهات و ئاوایی ئەو نێوانەیان نەهێشت و هەموویان پێ پەست کرد و گەڕانەوە. موزەفەرەدین نەکەوتە دوویان، گەڕاوە. هەر ئەو دەستە تەتەرە بۆ، چوونەسەر شاری «کەرخینی» و شاری «داقووقا» و شارانی دیکەی ئەو نێوانە تالان و کوژتاریان کرد و گەڕانەوە ئازربایەگان و کەسێک نەچووە پێشیان و کەس بەگژیاندا نەچوو.

«ابن الاثیر» بەدوورودرێژی و بەدڵێکی پڕ ئێش و ژانەوە لەوانەی گوترا و دواوە و دەڵێت: لە سەرەتای ساڵی ٦٢٨دا هەموو کوردستانی ئازربایەگان بەجارێک فەرمانبەری تەتەریان خستە گەردن خۆیانەوە و ئیتاعەتی ئەوانیان کرد و ماڵ و دراو و دیاری و پارچەی گرانبەهایان بەپێشکەش پێدان و سەریان بۆ چەماندن کە لە جەور و کوژتار و تالان ڕزگاربن.

میللەتی کوردی ئازەربایەگان کە وردبوونەوە و چاویان پێکەوت وا تەتەر چیان بەکوردەکانی خلات، سیرت، ئامەد، میافارقین، ژەنگار و دەوروپشتی مووسڵ، خاپوور، نوسەیبین، ماردین، هەولێر، داقووقا، کەرخینی، بدلیس، ئەردیش و ئەوان داهێنا و کەسێک لە پادشا و ئومەراکانی کورد و هی دیکەش پێشی پێیان نەگرت و بەرامبەریان ڕانەوەستان و ئەوانیش ناچاربوون کە گەردنیان بۆ کەچکەن و فەرمانبەریان بن.

میللەتی تەورێز لە پێشدا ئەو بیرەیان کردەوە لەگەڵ ئەمیری تەتەر کە لە نزیک تەورێزی هەڵدابوو، گفتوگۆ کرا و دیاری و پێشکەشێکی زۆریان بۆ ناردن. لە دوامینی قسەدا پەسندیان کرد و گەورە و سەرهات و کەیخودای شاریان خوازتە لای خۆیان. ئەوانیش لە پارچەی گرانبەها و ئاوریشم و چتی چاک پێشکەشێکی شایانیان هەڵگرت و قازیی شاریان وەپێش کەوت و چوون. شەمسەدین توغرائی لەگەڵیان نەچوو. قەرار درا و بڕاوە کە ساڵی میقدارێکی زۆر لە پارچە ئاوریشم و بەرگ و چتی گرانبەها بدەن و خەرگاهێکی نایاب بۆ پادشا دروستکەن. میللەت بەوە قەرارگیر بوون و پەیمان بەسترا.

«ابن الاثیر» دەڵێ: خەرگاهێکی ئازربایەگانی بۆ پادشای تەتەریان دروستکرد، ئەتلەسی زۆر نایابی زەرکێش و نیوەکەی پێستی سمۆرە بوو. گەلێک بەو خەرگاهە و دیاریەکان هەڵدەڵێ کە دایانە پادشای تەتەر بەو دەستوورە خاکی ئازربایەگان بۆ تەتەر دامەزرا.

«ابن الاثیر» جلدی ١٢و لاپەڕە ٢٣٤ دەڵێت: ئەو تەتەرانەی کە چوونە سەر ئەو خاکانەی کوژتار و تالانیان لێکرد، وانەبوو مەبەسیان تالان یا کوژتاری میللەت بووبێ، تەنها مەبەسیان تاقیکردنەوەی میللەت و پادشا و ئومەرایانی ئەو جێگایانە و زانینی خاک و ڕێگاکانی بوو. کە گەڕانەوە بەپادشای خۆیان گوت: مەملەکەتێکی بێ پادشا و سوپا و چۆڵە.

## مەغۆل لە کوردستانی ئازربایەگاندا

بەوجۆرە کە گوترا تەتەر بەسەر کوردستانی خاکی ئازربایەگاندا زاڵبوون و کردیانە ناوچەی بزووتنەوە و هەڵمەتیان. ساڵی ٦٥١ھ (١٢٥٣م) هۆلاکۆخان بەلەشکرەوە لینگی دا سەر خاکی هەموو ئێران و کوردستان و بەشەڕ و کوژتار دەستی بەکیشوەرگیری کرد. ١ی مانگی زیلحیجەی ٦٥٣ھ (کانوونی دووەمی ١٢٥٦م) هەموو ئومەرا و پادشایانی کورد و خاکی ئازربایەگان و ئارانی کەوتەژێر فەرمانەوە و ڕۆژی یەکشەممەی ١٤ی مانگی سەفەری ٦٥٥ھ (١ی کانوونی دووەمی ١٢٥٧م) بەغدای گرت و خیلافەتی ئیسلامی لەناوبرد. لە دوای ئەوە هەموو خاکی عیراق و جزیرە و سوریای گرت و پادشاکانی کوردی ڕاوادی ئەیوبی دیمەشق و حەمس و حەلەب و جزیرە و ئامەد و حەسنکیف و میافارقین و خلات و شارەکانی تێکوپێکدان و لە ناوی بردن و بەسەر هەموو کێو و قەڵاکانی کوردستاندا زاڵبوو. ساڵی ٦٥٧ گەڕاوە ئازربایەگان.

لە لایەن خواجە نەسیری تووسیەوە، هۆلاکۆخان هاندرا کە لە مەراغە بەناوی ئەوەوە ڕەسەد یێک و زیگ (زیج) داندرێ. ساڵی ٦٥٧ھ (١٢٥٩م) خواجە نەسیر عولەما گەورەکانی کوردی کۆکردەوە. فەخرەدین مەراغەیی کە هەڵاتبوو چووبووە مووسڵ، فەخرەدین ئەخلاتی لە تفلیس دادەنیشت، نەجمەدین کاتبی ساحێبی «المنطق» لە قەزوین بوو، لە مەراغەی کۆکردنەوە و دەستی بەڕەسەد (رِصد) دامەزراندن کرد.

بەڵام ساڵی ٦٦٣ھ (١٢٦٥م) ئەو ڕەسەدەی تەواو نەببوو کە شەوی یەکشەممەی ١٩ی ڕەبیعی دووەم هۆلاکۆخان مرد. بەدەستووری مەغۆلان دەخمەیەکیان بۆ کرد و لە مەراغە ناژتیان (تأریخی جهان شا و تأریخی تجربة الامصار وترجیة الاعصار).

«حمدالله المستوفی» دەڵێ: هۆلاکۆ لە کەنار گۆمی ورمێ لە شیمالی ڕۆژئاوای ئازربایەگان دادەنیشت و مەراغەی کردە پایتەخت. لە مەراغە «ڕەسەد» و لە ئەڵاتاغی سەرا، قەسر، کۆشک، دیوان و لە خۆی مەعبەدانی زۆری دروستکرد.

له دوای هۆلاکۆ «ئاباقاخان» حەوت ساڵ و لەپاش ئەو ئەحمەد تەکوار ٣ ساڵ و له دوای ئەو کیخاتو حەوت ساڵ و بایده چوار ساڵ و خانی خانان مەحموود نۆ ساڵ و لەلجاتیو خدابەنده سێزده ساڵ و ئەبوسەعید بهادر بیست ساڵ و له سەرەتای هۆلاکۆوه ٦٥١ھ (١٢٥٣م)تەنها ئەبو سەعید که ١٥ ساڵ له ڕەبیعی دووەمی ٧٣٦ (تشرینی دووەمی ١٣٣٥) بوو لەو بنەماڵەیه نۆ کەس نزیک شێست و دوو ساڵ فەرمانڕەواییان کرد که لەلایەن شێخ حەسەنی بوزرگەوه کرانه پادشا زۆریان ڕانەبوارد که لێکەوتن. بنەماڵەی مەغۆلی ئێلخانی نزیک عەسرێک لەسەر کوردستان پاشایەتییان کرد.

بەڵام پاشماوەی مەغۆل که جەلایری و قەرەقۆینلی و تەیمووریان و ئاق قۆینلی بوون، یەک له دوای یەکدی - وەکو بەکورتی له هاتوودا دێته گوتن - له ساڵی ٧١٦ھ (١٣١٦م) تا ساڵی ٩١٠(١٥٠٤) -که نزیک (٢٠٠) ساڵ دەکا- بەڵا و موسیبەتێکی گەورەبوون بەسەر کوردستانەوه و بەتایبەتی شەڕ و شۆڕ و هەڵمەتیان بۆ سەر یەکدا پترینی له خاکی کوردستانی موکریان (ئازربایەگان)دا بوو.

بەڵام لەم پشێویەدا کوردەکانی موکریان بەگەرمی چڕژانەوه نێو خاکی خۆیانەوه، له جنووبی ڕۆژهەڵاتی گۆمی ورمێ و له غەرب و شیمالی گۆمی ورمێدا دووسێ حکوومەتی بچووکیان دامەزراندووه (هەروەکو له هاتوودا بەدرێژای باسیان دەکەین). -١- حکوومەتی موکری -٢- حکوومەتی دونبلی -٣- حکوومەتی مەحموودی -٤- حکوومەتی برادۆست و بلیلا و له دەوروپشتی ئەو حکوومەتانەش گەلێک ئیمارەتی بچووک و گەورەی خۆجێیی کورد نەمابو که بێته باسکردن.

## پاشماوەی مەغۆلان له کوردستانی ئازەربایەگان

له دوای ئەبو سەعید بهادور، شێخ حەسەنی گەوره یاری بەو ده حوکمڕانەی مەغۆل دەکرد؛ تاکو ساڵی ٧٣٦ھ (١٣٣٦م) بۆ خۆی بوو بەپادشا و بەغدای کرده پایتەخت و کەم و زۆر بەسەر ئێران و کوردستاندا زاڵبوو.

ساڵی ٧٥٩ شێخ ئۆیسی کوڕی شێخ حەسەن چووه سەر کوردستانی ئازربایەگان و لەشکری «ئاڵتوون ئۆردوو»ی مەغۆلی دەرکرد و ئەو خاکەی گرت و له ساڵانی ٧٦٦ھ (١٣٦٤م)دا کێوەکانی کوردستان و دیاربەکر و ئەو دەوروپشتەشی گرت.

ساڵی ٧٥٨ھ (١٣٥٧م) موبارزەدین محەمەدی کوڕی شوانکاره (موزەفەریی) له ئەسپەهانەوه لینگی دا سەر ئازربایەگان و شاری تەورێز و موکریانی گرت، تا نزیک ساڵانی ٧٨٤ھ (١٣٨٢م) ئەو خاکەی له دەستدا مابوو.

حوسێنی کوڕی شێخ ئۆیسی جەلایری لەو ساڵەدا مرد؛ خاکەکەیان لەنێوانیدا بەش کرد. کوردستانی ئازەربایەگان و عیراق وەبەر سوڵتان ئەحمەد کەوت و دوو ساڵ لەسەر ئەو خاکە فەرمانڕەوایی کرد.

ساڵی ٧٨٦ تەیموری لەنگ بۆ سەر ئەو خاکە هەڵمەتی برد و گرتی. سوڵتان ئەحمەد بۆ دیاری ڕۆم و میسر هەڵات. تەیموور، عومەر کوڕی جەلالەدین میران شای لەسەر دانا کە کوڕەزای بوو.

ساڵی ٧٨٩هـ (١٣٨٧م) تەیموور ڕوو بەسەمەرقەند کە گەڕاوە، سوڵتان ئەحمەد گەڕاوە؛ بەڵام هیچی نەکرد. لە دوای عومەر ساڵی (٨٠٧) میران شای کوڕی تەیموور لەسەر کوردستانی ئازربایەگان دانیشت.

ساڵی ٨٠٧هـ (١٤٠٥م)ی مانگی شەعبان لە تەمەنی حەفتا ساڵدا تەیموور کە مرد، قەرەیوسف و سوڵتان ئەحمەد گەڕانەوە. قەرەیووسف چووە بدلیس و پەنای بردە بەر ئەمیری ئەوێ کە یارمەتی بکات و سوڵتان ئەحمەد چووە بەغدا.

ساڵی ٨٠٨ قەرەیووسف لەشکری لە کوردان پێکەوەنا. ساڵی ٨٠٩ لینگی دا سەر خاکی ئازربایەگان. ساڵی ٨١٠هـ (١٤٠٨م) لە نزیک تەورێز، میران شا و قەرەیووسف شەڕێکی پیسیان کرد و میران بەدیل گیرا و کوژرا. لە دوای ئەو ئەبوبەکری کوڕی میران شا بوو بەجێنشینی بابی و بەگژ قەرەیووسف داچوو، ئەویشی بۆ نەگیرا بەڵام شکا بەڵام هەڵات. هەموو خاکی کوردستانی موکریان (ئازربایەگان) کەوتە دەست قەرەیووسفەوە.

ساڵی ٨١٣ لە نزیک تەورێز چوو بەگژ سوڵتان ئەحمەدی دەستەبرای. شەڕ ڕوویدا و شکا و خۆی و جەلالودەولەی کوڕی گرتن و کوشتنی. قەرەیووسف بەئازادی بەسەر هەموو خاکی جەلایریاندا دەستی کێشا و بوو بەپادشا.

ساڵی ٨٢٢هـ (١٤٢٠م) شاهرۆخی کوڕی تەیموورلەنگ چووە سەر تەورێز. قەرەیووسف لە کوردان نزیک سەد هەزار شەڕکەری کۆکردەوە و لە نزیک تەورێز پێشی پێگرت. بەڵام مەرگ دەرفەتی نەدا و دەستی بەست و خستی. چونکو پیاوێکی خراپ و بەدئەندێش و نادروست بوو، هێشتا گیانی لە ڕەگ و پۆی دەرنەکەوتبوو کە ڕەگ و پۆی لەشکریان لەبەریەک پچرا و بڵاوبوونەوە.

شەرەفنامە دەڵێت: هێشتا لێوی سارد نەببوو کە ساردی کەوتە نێو لەشکرەوە. ئومەراکانی کورد هەریەک بەلایەکدا گەڕانەوە خاکی خۆیان. لاشەیێکی نیو سەعات

لەوەپێش لەسەر تەختی زێرنیگار فەرمانی دەدا، لەسەر خاکی بوار بەکەپو و لێو و گوێ بدراوی و ڕووت کەوتبوو. لاشەکەی بۆگەنی تێکەوتبوو و فڕێ درابوو. سەردار سوپاهێکی بەزەیی پێداهات و هەر لەوێ ناژتی.

لە دوای ئەوە ئەسکەندەر تا ساڵی ٨٤١ و جیهان شا تا ٨٧٢ و حوسێن عەلی تا ٨٧٢ و حەسەن عەلی هەروا. لە خاکی کوردستانی ئازربایەگاندا پێنج کەس لە تورکمانی قەرەقۆینلّیان فەرمانڕەواییان کردووە.

ئیدریسی بدلیسی لە هەشت بەهەشتدا دەڵێت: ئەسکەندەری کوڕی قەرەیووسف لەلایەن شاهڕوخی کوڕی تەیموور لە ئازربایەگان دەرکرا و بۆ خۆی لەسەری دانیشت. لە دوای ئەو جیهان شا، لە دواییدا حوسێن عەلی کوڕی ئەسکەندەر و لە پاشان حەسەن عەلی کوڕی جیهان شا بوونە فەرمانڕەوا. لە دەوری حەسەن عەلیدا نەیارێکی نەبەردی وەکو حەسەن درێژ (اوزون حسن) هەستا سەر قەرەقۆینلیان.

بەگەرمی کوردانی موکریانی ئەمڕۆکە لە «تورکەڕەشە» دەدوێن و لە باپیرە گەورەی هەر بنەماڵەیێک بپرسی دەڵێت: ساڵی تورکەڕەشە بۆ خەزا هاتینە ئەم خاکە و ماینەوە. هەر سەربهوردێک بێتەگێڕانەوە دەڵێن: ساڵی تورکەڕەشە وا بووە. لەوە بۆمان ئاشکرا دەبێ کە مەبەس لە تورکە ڕەشە «قەرەقوینلّیان» بووە و میللەتی کورد بەموسڵمانیان نەزانیون. دەبێ زۆر مەفرەت شیعە لەگەڵ کورداندا بەدڕەفتاریان گەلێک کردبێ کەوا هەتا ئەمڕۆکەش هەر بەخراپی ناودەبرێن.

حەسەن درێژ (اوزون حسن)ی ئاققوینلّوو ساڵی ٨٧١ (١٤٦٦) لینگی دا سەر خاکی ئازربایەگان و گرتی و تەورێزی کردە پایتەختی حکوومەتەکەی، ئەم حەسەنە درێژە هەرچەندەش تورکمان بوو، بەڵام میللەتی کورد زۆرخۆشیان ویستووە و بەپیاوێکی چاکیان زانیوە. پتر لە دەوری ئەمدا کورد گەڕانەوە نیشتمانی خۆیان کە ئازەربایەگان بوو. چوار پێنج ئیمارەتی خۆجێیی کورد لە پشێوی نێوانی مەغۆل و جەلایریاندا دامەزراندراوە و چاکتر خۆی گرت و پڕ هێزتر بۆوە. سوپا و ئومەرای لەشکری حەسەنە درێژ هەموو کورد بوون. لەم ساڵانەدا دەوڵەتی سەفەوی لە خۆ نواندندا بوو.

حەسەنە درێژ ساڵی ٨٨٢ (١٤٧٨) کە مرد، میرزا خەلیل بەگ بوو بەپادشا. ساڵێک بەسەری برد و لە دوای ئەو یەعقووب تا ساڵی ٨٩٦ و لە پاشا بایسنقەر تا ساڵێک ژیا. ئەوجا ڕۆستەم بەگ ساڵی ٨٩٧ بوو بەفەرمانڕەوا.

کوڕی ئەحمەدی کوڕی ئۆغزلوو محەمەد -کە خوارزای عوسمانیان بو- بەپشتیوانی عوسمانیانەوە لینگی دا سەر خاکی ئازربایەگان. ساڵی ٩٠٢ (١٤٩٦) بەگژ ڕۆستەمدا چوو و گرتی و کوژتی و بوو بەپادشا. ساڵێکی نەکێشا ئەویش کوژرا.

ئالوەندی کوڕی یووسفی کوڕی حەسەنە درێژ، ساڵی ٩٠٢ لەسەر خاکی ئازەربایەگان بوو بەپادشا. بەڵام لە مردنی حەسەنە درێژەوە تا مردنی ئالوەند لەنێوانی سەفەویان و ئاققوینلویاندا شییر نەچۆتە کالان و هەر شەڕ و کوژتار و لێکدان و وێران بووە. لەنێوانی ئەو دوو ئاگرەدا هەر کورد بەرکەوتوون.

ساڵی ٩٠٧ (١٥٠٢) شا ئیسماعیلی سەفەوی لینگی دا سەر ئالوەند و بەشەڕ شکاندی و هەڵات و چووە بەغدا؛ لەوێوە چووە دیاربەکر. ساڵی ٩١٠ لە دیاربەکر مرد. شا ئیسماعیل لە ساڵی ٩٠٧دا تەورێزی کە گرت کردیە پایتەخت تا ساڵی ٩٢٢.

ئاققوینلویان لە دوای ئالوەند کە هەڵات بەخاکی کوردستانی دیاربەکردا بڵاوبوونەوە. لە شێروان موراد و لە یەزد محەمەد میرزا، دوو کەسیان لە دوای ئالوەند تا ساڵی ١٤ فەرمانڕەواییان کردووە، بەڵام بەجارێک خاکی ئاققوینلو و لە ساڵی ٩١٤ھ (١٥٠٨م)دا کەوتە دەست سەفەوییان.

# فەسڵی پێنجەم

## پادشایانی کوردی شەدادیان لە ئاران و ئانی

نەژاد و بنەچەکە:

لە بەند و فەسڵەکانی ڕابردووی ئەم پەراویەدا، گەلێک جار گوتراوە کە لە سەرەتای ئیسلامیدا کوردانی ڕاوەند -کە تیرەییێکی هەزبانین- لە خاکی موکریانی ئەمڕۆکەوە چوونە ئەرمەنستان و لە نزیک شاری «دووین» جیگیربوون و دانیشتن و دەستەییێکی دیکەشیان چوونە خاکی هەولێر دامەزران.

«ابن الاثیر» دەڵێ: ئەو کوردانەی ڕاوەند باشترین تیرەیەکی کوردن. کیسرەوی بەخشی سێیەم «شهریاران گمنام»، لەلاپەڕە ٧دا دەڵێ: «در شیرکوه عمو و پدری صلاح الدین مینگارد: واصلها من الاکراد الراوادیة وهذا القبیل هم اشرف الاکراد».

پادشایانی کوردانی شەدادیان لەم کوردانەن کە چەند عەسران بەناوی کوردی ڕاوادی (ڕەوەند - ڕاوەند)ەوە ناوبانگیان کردبوو. «ئیبن خلکان» و «کیسرەوی» دەڵێن ئەو کوردانەی ڕاوەندی کە لە خاکی موکریانەوە چوونە ئەرمەنستان لە دەوروپشتی شاری «دووین» کە تەختگاهی ئەرمەنستان بوو، دامەزران و کردیانە نیشتمان. لەوەوە دەتوانین بڵێین کە ئەو خاکە بۆتە نیشتمانیان و لەو جێگایە بڵندبوون و هەستاونە سەرخۆ و دەستیان بەمەملەکەتداری کردووە.

بەهەرجۆرێک بووبێ با ببێت و ئێمەش لەپێش ساڵی ٣٣٦ هیجریەوە ئاگاداری ئەو بنەماڵە نەبووین کە لە خاکی دووین و ئاران و ئانیدا، ناوی پادشاهی و یا فەرمانڕەوایی لەسەر پیاوێکی ئەو کوردانە بووبێت.

### دامەزراندنی شاهی

کیسرەوی بەناوی شەدادیان و دامەزراندنی پادشایەتیان دوو سەرچاوەی هەیە کە لێیان وەردەگرێت:

١- «منجم باشی»یە کە محەممەدی کوڕی شەداد دەکاتە دامەزرێنەری بنەچەکەی شاهی، بۆ بنەماڵەی شەدادیان، ئەویش ساڵی ٣٣٧ کە سالار مەرزەبانی دەیلەمی گیرا و برایە دزی سیمیرۆم. محەمەد کوڕی شەداد کوردی ڕاوادی وەکو هێندێک ئومەرایانی دیکە، هێزی پەیداکرد و حکوومەتێکی کوردی دامەزراند. ساڵی ٣٤٠ خاکی ئاران و

ئەرمەنستانی گرت و لەسەر ئەو خاکە بوو بەپادشا و بنچینەی شەهریاری کوردی توند دامەزراند.

٢- «وارتان» مێژوونووسی بەناوبانگی ئەرمەنییە کە دەڵێ: مەرزەبان و لەشگری و فەزلوون -کە هەرسێیان کوڕانی محەمەدی کوڕی شەداد بوون- لە خاکی ئاران و ئەرمەنستاندا بناخەی شەهریاری کوردانی شەدادی ڕاودییان دامەزراند.

کیسرەوی لەو دوو سەرچاوانە «منجم باشی» بەڕاست دەزانێ و ئێمە لێی ورد دەبینەوە هەردووک ڕاستن. بەڵام محەمەدی کوڕی شەداد کە بناخەی دامەزراندووە و کوڕەکانی بەسەرکردەیی ناردۆتە سەر شارانی دیکە و گرتوویانە. بۆیە وارتان ئەو سێ کوڕانە بەدامەزرێنەر دەزانێت.

**١- محەمەدی کوڕی شەداد**

سەرهات و دامەزرێنەری شاهانی کوردی ڕاوادیان، محەمەدی کوڕی شەداد ساڵی ٣٣٧ هەڵیدا و ساڵی ٣٤٠ لە خاکی ئاران پادشاهی دامەزراند. لەبەرئەوە پادشاهانی ئەم بنەماڵە بە«شەدادیان» ناسراون و پێیان دەڵێن: پادشایانی شەدادییانی کوردی ڕاوادیان لە ئاران و ئەرمەنستان.

گەلێک لە مێژوونووسەکان ناوی ئەم پادشایەیان بە«مەمی» «مەم» «مام» نووسیووە. وەکو پێشت گوتراوە کە لە زمانی کوردی ئازەری دا و کوردانی ئێستاشدا (محەمەد) بەمەم و مەمێ و بەمامە و مەمۆ و بەمەملان ناودەبرێن.

ساڵی ٣٣٧ مەرزەبانی دەیلەمی کە سەرکێش و نەیاری دەیسەمی کوردبوو، دەستی سەرکێشی بەسەر خاکی ئازربایەگاندا کێشا بوو، گرفتاربوو و بەگیراوی برایە قەڵای سیمیرۆم هەروەکو لێی دواوین.

محەمەدی کوڕی شەدادی کوردی ڕاوادی لەمێژبوو لە خۆکۆکردنەوە و بڵندبوون دەکۆشا. لە گرتنی مەرزەبان دەرفەتی دی، بەو هێزەی کە لە دەستی دابوو، پەلاماری خاکی ئاران و ئەرمەنستانی دا و گرتی و بنچینەی پادشایەتی کوردی ڕاوادی دامەزراند. بەڵام ناکام و جوانەمەرگ بوو و ساڵی ٣٤٤ مرد. ئەو خاکەی گرتبوونی ڕۆژ بەڕۆژ لە دەست کوڕەکانی دەرچوو و لە میراتگرەکانی ئەستاندرانەوە.

وامان بۆ دیاردەبێ کە سالار مەرزەبان نەبەرد و بێڕەحم و دوژمنی کوردان بوو. لە قەڵای سیمیرۆم کە ڕزگاربوو و گەڕاوە ئازربایەگان، حکومەتی کوردانی شەدادیانی خستۆتە

گێژاو و شەپۆلی خوێن و کوژتارەوە.

بێگومان کە حکوومەتی وا تازەی دوو سێ ساڵەی وەکو نەمامی شلک و ساوا وایە، چۆن خۆی لەبەر لێشاو و هەڵمەتی دوژمنێکی زەبردەستی وەکو مەرزەبان دەگرێ. دەیسەم بەو هەموو هێزەوە پێی نەوێرا.

دەبێ حکوومەتی شەدادیان سەری فەرمانبەری پێ چەماند بن. وەکو ئەبولهەیجا بەجارێک پووچکراوەتەوە. کیسرەوی، بەخشی سێیەم، دوور و درێژ لەلاپەڕە ۱۰ لێی دواوە.

## ۲- ئەبولحەسەن لەشگری کوڕی محەمەد

ئەبولحەسەن لەشگری ساڵی ٣٦٠ هەستا سەرەخۆی و ئەو خاکانەی کە لە دەوری بابی دەست کەوتبوون و لە دەستیان دابوو، دیسان یەک بەیەک گرتیانەوە. لەشکر و حەشمەت و سوپا و داراییێکی قورسی پێکەوەنا و دوژمنەکانی داچڵەکاند و ئەمیرەکانی دەوروپشتی خستە لەرزینەوە. بەدەستوورێکی جوان هەشت ساڵ لەسەر خاکی ئاران و ئەرمەنستاندا بەئازادی و سەربەرزی بەسەربرد، ناوبانگی ئازایی و ڕەشیدی بڵاوببۆوە، دەنگی نەبەردی و جەنگجوویی داوە.

وارتان: کە لە مەرزەبانی کوڕی محەمەد دواوە دەڵێت: کوورەی «شۆت» کە پارچە خاکی گەورەی بەشی ئاران و دزی «شمیرام» کە گریگۆر خاوەندی «فاریسۆس» گرتبوونی و مەرزەبان بەفێڵ ئەو دوو پارچە خاکەی لە گریگۆر گرت و تێیدا دامەزرا و لەگەڵ ئەمیری گەنجەدا دۆستی و ئاشنایی نواند. لە دەرفەتێکدا ئەمیری گەنجەی کوژت و شاری گەنجەشی گرت. مەرزەبان بەو دەستوورە لەو خاکانەدا بناخەی پادشاهی شەدادیانی دامەزراند.

وامان بۆ ئاشکرا دەبێ کە ئەبولحەسەن لەشگری لەو خاکانەدا خۆی توند دامەزراندووە و مەرزەبانی براشی ناردۆتە سەر ئەو دز و شارانەی گوترا و بەناوی ئەبولحەسەن لەشگرییەوە گرتوویە. بەڵام «وارتان» لەوە ئاگاداربوو کە مەرزەبان تەقەلای داوە و ئاگاداری ئەبولحەسەن نەبووە.

## ۳- مەرزەبانی کوڕی محەمەد

لە دوای لەشگری، مەرزەبانی برای بۆتە پادشای ئاران و ئەو خاکانە. بەڵام لە ئیشوکاری

پادشاهیدا سست و بێ تەقەلا بووە. فەزلۆون کە برابچووکی بوو، کردەوەکانی پەسند نەکرد و لێی دلگیر و ڕەنجیدە بوو. نێوانی ئەو دوو برایە بەرقەبەری ڕادەبرا. سالی ٣٧٥ بەبۆنەی شکار و ڕاوەوە، فەزلۆون مەرزەبانی لە شار دەرخست و لە دەمی ڕاوکردندا کوژتی.

لە دەوری یەکێک لەم دوو برایانەدا شارانی «سکووری» و تەختگاهی ئاران کە بەردوا (بەردعە) بوو لە سالاری دەیلەمی ئەستاندرا و خرا دەست خۆیان.

## ٤- فەزلۆونی یێکەم کوڕی محەمەد

ئەم پادشاهە کوردە دووەمین دامەزرێنەری دەولەتی شەدادیان و پێکهێنەری پادشایەتی کوردانی ڕاوادیانە لە ئاران. ئەم پادشا ناودارە کوردە هەموو خاکی ئاران و دووین و بەشێکی زلی ئەرمەنستانی گرت و خستیە ژێر فەرمانیەوە و حکوومەتەکەی زلکرد.

فەزلۆون چل و حەوت سال پادشا بووە و لەگەل ئەرمەنیان و گورجیان و میللەتەکانی دراوسێی خۆیدا هەلمەت و شەڕ و کێشەی گەلێک کردووە و هەمووانی خستۆتە دەست و بەسەریاندا زالبووە و کردوونیە فەرمانبەری خۆی. کیسرەوی لە بەخشی سێیەمدا دەلێ: سالانە سێ سەد هەزار دەرهەم باجی داناوەتە سەر ئەرمەنستان.

کیسرەوی لە «منجم باشی» وەردەگرێ: میللەت و ڕەعیەت، فەزلۆونیان خۆش ویستووە و زۆر پێی دلخۆش و شادمان بوون. فەزلۆون لەسەر چۆمی ئاراس پردێکی گەورە و جوانی بیناکرد و سالی ٤١٨ بەشانوشەوکەت تەواوبوو.

## شەڕ و هەرا و کێشەکانی فەزلۆون

ئاران، شاهیان لە سەرەتای دامەزراندنی شەدادیاندا لەناوچوون. لە نەتەوەی میهران ئاران شاهیان یەکێک پەیدابوو لەملاو لەولاوە ئارانیان و ئەرمەنیان لەسەری کۆبوونەوە و لە جێگای میهرانیان دانا. فەزلۆون چووە سەریان و هەمووانی لەناوبرد و پووچی کردنەوە. ئەگەرچی شەڕ و کوژتارێکی قورس لەنێواندا ڕوویدا و گەلێک خوێن ڕێژرا بەلام لە دوامیندا فەزلۆون سەرکەوت و زالبوو.

یێکەمین جار شەڕی بەناوبانگی فەزلۆون لەگەل داویت (داوود بیخاک) دایە کە پادشای ئەرمەنستان بوو و برازای غاغیک پادشای ئەرمەن بوو. داویت بەپشتیوانی «سمبات»ی برای لینگی دا سەر گورجیان و بەسەر بەشێکی ئەو خاکەدا زالبوو.

کیسرەوی لە ئاسۆغیک مێژوونووسی ئەرمەنی وەردەگرێ کە فەزلوون پادشای ئاران لە گەنجەوە تالووکەی کرد، بۆ شەڕ و کوژتار لینگی دا سەر داویت. لەولاوە داویت بەهێزێکی هەیبوو، چووەپێشێ و کوژتار دەست پێکرا. فەزلوون تەنگەتاوبوو و هەلات و بەهەزار ئەزیەت گیانی لە شەپۆلی خوێناوی ڕزگارکرد. سوپای فەزلوون پتری بەشییری داویت و کەمی بەئاودا چوون و پووچکرانەوە.

کیسرەوی دەڵێ: وارتان زۆر کەم لە شەڕی گیورگی کوڕی داویت و فەزلوون و غاغیک خاوەندی جوور و گیدۆ دواوە و سەربهورد زۆر کەمە و درێژەی پێنەداوە کە ئێمە لێرەدا بیکەینە سەرمایە.

## خاوەندانی فاریسۆس

لە دەوری حوکمڕانی شەدادیاندا لە فاریسۆس بنەماڵەی حوکمدارانی «هایقازیان» هەبوون کە بەسەر لایەکی خاکی ئاراندا فەرمانڕەواییان دەکرد. پیاوە ناودار و ناسراوی ئەو بنەماڵەیە «سنگریم» ناوبوو کە لە پێش فەزلووندا فەرمانڕەوابوو. بەلام ئەم بنەماڵەیە کەنگی دامەزرابوو؟ لە ئێمە نادیار و ونە.

کە سنگریم مرد، گریگۆری برای بوو بەفەرمانڕەوا. گریگۆر ساڵی ٣٩٤ مردووە. فیلیپی کوڕی بۆتە جێنشین. فەزلوون ناردیە دووی فیلیپ و خوازتیە لای خۆی. کە گەیشتەجێ، گرتی و خستیە زیندانەوە شاشواغ (گولستان) و شۆت (زلیرت) کە دوو پارچە مەملەکەتی گەورەبوون لە فلیپی گرت و خستیە ژێر فەرمانی خۆیەوە. بەمردنی گریگۆر بنەماڵەی «هایقازیان» کوێربۆوە.

ئاسۆغیک مێژوونووسی ئەرمەنی دەڵێ: غاغیک پادشای ئەرمەنستان، هەموو خاکی خۆی کردە دوو بەش: بەشێکی دایە فەزلوون و بەشێکی بۆ خۆی هێشتەوە؛ تاکو لەگەڵیدا دۆستی و ئاشنایی ببەستێ.

وەکو کیسرەوی لێی دواوە، وا دەردەکەوێ بنەماڵەی هایقازیان دووبارە بووژاوە و بەگژ حکوومەتی شەدادیاندا چووە. لەوەش وامان بۆ ئاشکرا دەبێ کە فیلیپ لە بەندیی فەزلوون ڕزگاری بووە و هەلاتووە. دیسان بناخەی فەرمانڕەوایی دامەزراندۆتەوە، بەلام نادیارە.

وارتان مێژوونووسی ئەرمەنی دەڵێ: فەزلوون چووە سەر «دانجیانی کوڕی هەمام» و هەموو خاک و زەویەکەی بەشەڕ لێگرت و دانجیانی گرت و کوژتی و خاکەکەی خستە ژێر فەرمانی خۆیەوە. لە دوای ئەوە فەزلوون بەسەر هەموو خاکی غاغیکدا زاڵبوو و گرتی.

## شکانی فەزڵوون لە دەست گورجیان

یێکەشەڕێکی فەزڵوون لەگەڵ گورجیانی کردووە و لەو شەڕەدا شکاوە ئەمەیە کە «ابن الاثیر» و «وارتان» و «جوانشیر» و «کیسرەوی» ساڵی ٤٢١ لێی دواون کە ئەرمەنییان بوونە هاودەمی گورجیان و لەشکرێکی قورسیان کۆکردنەوە کە بەگژ فەزڵووندا بچن. فەزڵوون بەهێز و تین و تەوانایی و نەبەردی و جەنگاوەری خۆی و سوپاهەکەی نازی و هەڵمەتی بردە سەر گورجیان.

«باگارات»ی پاشای گورج و ئەبخاز بەغاغیک پاشای ئەرمەنی وەڵام دا کە بگاتە هاواری و یارمەتی بدات. غاغیک لەشکری برد و گەیشتێ. پێکەوە هەڵمەتیان بردە سەر شاری گەنجە و ئەزیەت و ئازارێکی قورسیان دا و بەتاڵانێکی بێژمار گەڕانەوە جێی خۆیان.

«ابن الاثیر» ئەم شەڕە بەم جۆرە لە ڕیزی ساڵی ٤٢١دا دەنوویسی کە: فەزڵوون کوردی کە لەسەر گۆشەیێکی ئازربایەگان فەرمانڕەوابوو (فأتفق ان غزا الجزر هذه السنة). فەزڵوون کە چووە سەر گورجیان کوژتار و تاڵانێکی قورسی لێکردن و گەلێکی بەدیل گرتن و گەڕاوە.

وایزانی کە دوژمن گێژ و سەرسام بووە. گورجیان لە دەرفەت بازیان نەدا و بەلەز کەوتنە دووی فەزڵوون و لەناکاو بەسەریان دادا و لە دە هەزار کەس پتریان لە فەزڵوون کوژت و هەموو ماڵ و چتمەکیان بوو بەرۆزی گورجی و ئەرمەنییان.

فەزڵوون لە دوای ئەو شکانە دوو ساڵ ژیاوە و ساڵی ٤٢٢ مردووە. وامان بۆ ئاشکرا بووە کە بۆ تۆڵە ئەستاندنەوە جارێکی دیکەش لینگی داوەتە سەر گورجیان و بەگژ ئەرمەنییاندا چووە.

قەتران شاعیری تەورێزی لە دەستە شیعرێکیدا بەلەشکری نەوەی ئەم فەزڵوونەیدا هەڵگوتووە. لە دواییدا لەم شەڕە و شکانی فەزڵوون دواوە و باسی مەملانی ڕاوادی خاوەن ئازربایەگانی کردووە کە لەشکری بەکینەی فەزڵوون و مەملان چۆتە سەر گورجیان و تۆڵەی لێ ئەستاندوونەوە:

لشکری فضلون همانجا گرفگنده در قضا

شاه خصمان را فگند و خصم یاران را فگند

یا:

خـــدايگان بزمـــانـی ز کـــافـــر بسند

بەتيغ كينەی فـضلون و كـينەی مملان

### ٥- ئەبولفەتح مووسا كوڕی فەزلۆن

کیـسرەوی لە بەخـشی سێـیـەم و لاپەڕە ١٧دا دەڵێ: فـەزلۆون لە پاش چل و حـەوت ساڵ پادشاهی، سـاڵی ٤٢٢ مرد و ئەبولفەتحی مـووسای کوڕی لەسەر تەختی پادشاهی ئاران دانیشت و سێ ساڵ پادشاهی کرد. لەوەپتر لەم پادشاهە سەربهورد و دەنگێک پەیدا نییە و هیچمان لێ نەزانیوە.

### ٦- ئەبولحەسەن عەلی لەشگری دووەم

لە دوای مـووسا ، ئەبولحەسـەن عـەلی کە بەلەشگری دووەم ناسـراوە و کـوڕی مـووسا بوو، لەسەر تەختی شاهی دانیشت و پازدە ساڵ لەسەر خاکی ئاران و هێندێک جێگایانی دیکە و ئەرمەنستان پادشاهی کرد.

ئەم لەشـگرییـە یەکـێک بووە لەو پادشـایانەی کـە قـەتران گـەلێک قـەسـیـدە و غـەزەلی پێداهەڵگوتووە. نزیک شازدە پارچە شـیـعری لە بابەت ئەو پادشاهەوە هەڵبەسـتووە. لەم شیعرانەی قەتران دیار دەکا کە لەشگری بەگژ گورجی و ئەرمەنییاندا چووە و شەڕەکەشی لە جەژنی قـوربـاندا بووە. گورجی و ئەرمـەنیـیـانی شکاندووە و کوژتارێکی قـورسی لێـیـان کردووە و تۆڵەی فەزلۆون و مەملانی لێکردوونەوە.

ئەمە پارچە شیعرێکی قەترانە کە دەڵێ:

لشکری را کـوشت کورا مـرگ نتوانست کوشت
قـلعـــەيی را کند کـــورا چرخ نـتـــوانسـت کند
ز آتش شـمـــشـيـــر و دارند جـان درتن چنانـکه
هست نـالان و طپـــان مـــانند بر آتش سـپـند
لشـگر فـضلون همـــانجـــا گـرفگنده در قــضـــا
شـاه خـصـمـــان را فگند و خـصم ياران رافـگند
بدرسـد گـــويند شـــاهی را از دســـتـــوران بد
جـز كنون اين داسـتـــان كس نيـــايد دلپـــسند
ای جـهـــانت پيـــشكار ای روزگـــارت زير دست

ای سـپـهـرت رهنمـا ای روزگـارت یارمند
گوسپند و گاو کشتن فرض هست این عیدرا
کـاندرین آمـد حـسـاب ایزدی بیـچـون و چند
ایزد از هر عــیـد هست امــروز راضی تر زتو
زانکه کـافر کشـتـه‌یی برجـای گـاو و گـوسـپند

لەم شـیـعرانە وادیار دەکا کـە سوپای کـورد، هەرچەندە لە هی گـورجیـان و ئەرمەنیـیـان کەمتر بووە، دیسان کورد زاڵبوون و سەرکەوتوون و پادشاکانیان بەدیل گرتوون.

## لەشگری و ئەمیر ئەبولفەزل جەعفەر

پێکە سـەربهـوردی شـایان و وێچـووی لەشگری پێکهـاتنەوە و ڕێککەوتنەوەیەتی لەگـەڵ پادشـایەکی خـزم و هاوڕەگـەز و هاوتیـرە و دراوسـێی خـۆی کـە ئەمـیـر ئەبومـەنسـوور وەهسـودانی کـوردی ڕاوادی پادشـای ئازربایەگـانە کـە بەدرێژی باسکرا. دووەمین: بردنی تورکمانی غـەز لە ئازربایەگانەوە بۆ ئاران. سێیەمین: پێکهـاتنەوەی لەشگری لەتەک ئەمیر ئەبولفـەزلی جەعـفـەری خاوەند خاکی تفلیس کە ناودارو پادشایەکی کوردبووە. قـەترانی شاعیر کە لە تەئریخی ئەوانەدا هونەری نواندووە و لەم کۆبوونەوەیە دواوە کە دەڵێت:

خــدای باز بیــفــزود دولت اســلام
هـهــرباز بکاهیــد قــوت کــفــران
کنون کە گـشت بیکجا هژبر و شـیـرقرین
کنون کـە کـرد بەهم آفـتـاب و مـاە قـران
«امیر ابوالحسن» آن فضل وجودرا بنیاد
«امیر ابو الفضل» آن دین و دادرا بنیان
دوشــهــریار کــریم و دونام دار کــرام
دو اخــتــیــار زمین دو افــتــخـار زمـان

لەم شـیـعـرانەی خـوارەوەی قـەتران دیاردەکـەوێ کـە لەشگری لە دوای مـردنی ئەمـیـر ئەبولفەزل کچی ئەوی مارە کردووە و گوێزتوویەتەوە کە قەتران پێیدا هەڵدەڵێ:

نشـسـتـە شـاە «شدادان» بەتخت ملک دلشـادی
رخش چون لالەی نیسان کفش چون ابر فروردین

ازاین پیمان فرخنده نگون شد رایت کفران
وزاین پیوستن میمون قوی شد پایه‌گاه دین
همانا نیکی کرد است بانیکو دهش جعفر
فرزندان او گشته است نیکو عاقبت چنین
[ـــ]در خلد پیمان بست باحورا
چوبا دلبندش اینجا بست خسروان کابین
گزیده بوالحسن کورا و فاطبع است شادی خوی
ستوده لشگری وه‌فا پیشه است ورادی دین

## کوڕانی لەشگری

لەشگری چوار کوڕی بوو: ١- مەنوچەهر -٢- ئانوشیرەوان -٣- گودەرز -٤- ئەردەشێر. ئەبولحەسەن لەشگری خوارزای مێهرانیانی ئاران شاهان و لە لایەن دایکی دیکەیەوە شێروان شاهان بوو کە لە نەژادی «بەهرام چووبین» بوون. قەتران ئەوەی کە ئاران شاهان بوو بەشیعر گوتوویە. ئەمە قەسیدەیێکی گەورەیە و دوو شیعری سەرەتایی و دوو شیعری دوامینی دەنووسین:

ای روان برشهر یاران جهان فرمان تورا
هەر چە باید خسروان را دادەیزدان آن تورا
همچو ارمن گشت خواهد نعمت سنگی تورا
همچو آران گشت خواهد ملکت شیروان تورا

ملکت ایران نیاگانی تورا بود از نخست
گشت خواهد چون نیاگان ملکت ایران تورا
ملک فرزندان بدادی و ببایـد دادهم
ملک فرزندان و فرزندان و فرزندان تورا

قەتران بەئاواتەخوازی قەسیدەیێکی سی و پێنج شیعری هەڵبەستووە، ئێمە نێوان پێنج شیعرمان لێ هەڵبژاردووە کە بەلەشگری دەڵێت:

این جــهــان بوداست دایم ملکت ســاســانیــان

خــواست ســالارش خـدا در ملکت ســاســانیــان

نیــست کس در گــوهر ســاســانیــان چون لشگری

تاپس آن همــچــون نیــاگــان شــاهی ایران کند

همـچــو آفــریدون بگیــرد ملک عــالم سـربەسر

وانگهی تدبیــر خـیــل و ملک فــرزندان کند

روم و گــورجــســتــان بەفــرمــان منوچهــر آورد

هند و ترکــســتــان بەزیر دست نـوشــروان کند

او بەتخت ملک ایران برنشــیند درســتــخــر

کــهــتــرین فــرزند خـودرا مــهــتــر آران کند

قەتران تەرکیببەندێکی زۆر بەرزی بەئەبولحەسەن لەشگریدا هەڵبەستووە و لە ئەبولیوسر ناو سپەهبدی ئاران دواوە، ئەمە شیعرێکییە کە دەڵێت:

قبلەی شدادیان پیرایەی بهرامیـان

آن بگردون بررساند پایەی شدادیان

تەرکیبەندی هەموو بەندەکانیشی ئەم شیعرەیە کە دەبێژێ:

روز بدخــواهی توشب باد شب تو روزباد

جــاودانە روز تو بــاعــیــد و با نوروز باد

قــەتران ئەو تەرکــیــبــەندەی لە تەورێز هەڵبـەسـتـووە و بۆ ئەبولحەسـەنی لەشگری ناردۆتە گــەنجــە و لە بەندی هاتوودا ئاشکرای کــردووە کــە پادشــایانی ڕاوادیانــی ئازربایەگــان و ڕاوادی ئاران لە یەک نیــاگــان و لە بنەمــاڵەیێکی گــەورەی یەک نەژادن و بەئاشکرا دەڵێ: کە هەردوو دەرگا بەیەک دەبینم.

مــهــتــر شــاهان گــیــتی را همــیــشــه کــهــتــرم

گــر بەخــدمت نامــدم مــعــزور دارد مــهــتــرم

من بەدیوان و ســـــرای پادشـــــاهی دیگرم

کــانچــەنگذارد کــە یک روز از در او بگذرم

هر دو درگــە را یکی بینم همی چون بنگرم

من چو ایدر باشم آنجــایم چو آنجــا ایدرم

ور بدولت روزگـــار از چرخ بگزارد ســـرم

خـــادم این درگـــهم جـــاوید آن خـــاک درم

روز بدخـــواهی تو شب باد و شب تو روزباد

جـــاودانه روز تو باعـــیـــد و با نووروز باد

ئەبولحەسەن لەشگری لە شاری گەنجە کۆشکێکی زۆر موهیم و جوانی بەناوی «لەشگری ئاباد» دروستکرد. قەتران بەو کۆشکەی هەڵگوتووە و بۆی ناردۆتە گەنجە:

یاد نیـــاری ز قندهار و ز نوشـــاد

نیـــز نگوی حـدث بصـره و بغـداد

نام و نشـان بهـشت و گنگ نجـوی

گـر بنشـینی مـیـان (لشگری آباد)

هست درونش پر از نگار چو دیبـا

هست زبیـرونش اسـتـوار و پولاد

همـچـو سـپـهـر برین بلند بەبالا

همـچـو که بیسـتـون درست بنیـاد

***

## دوو پیاوانی ناودار

لەکن لەشکری دوو پیاوانی گەورە و ناودار هەبوون: یەکێک ئەبولیوسر (ابوالیسر) کە سپەهبودی ئاران بوو، ڕێز و پایەی لەلای لەشگری لە هەموو کەس پتربوو. لەگەڵ قەتران بەبەخشش و خەڵات بوو کە قەتران چەند پارچە شیعر و قەسیدەی لە تەورێزەوە بۆ ناردووە و ئەمە پێنج شیعری قەسیدەییێکی گەورەیەتی:

ز نزدیک این کـهـتـر کـهـتـران

بەنزدیک آن مـهـتـر مـهـتـران

سـپـهدار آران «ابوالیسر» کـوست

جگرسـوز دشـمن دل افـروز دوست

بەجـــسم اندر از روح بایســـتـەتر

بەجـان اندر از عـقل شـابسـتـەتر

برائی چو ابر و بمردی چوببـــــر
ز تیغ و کـــفش رنج بربیـــر وابر
ز دریاگـــه‌ء جـــود بخـــشنده تر
ز آتش عــــدورا گـــــدازنده‌تر

سپـه‌هبـود ئه‌بولیـوسر هه‌تا ده‌وری فـه‌زلۆونی دووه‌م ژیاوه و هه‌ر سوپه‌هداری له‌شکری ئاران بووه. له‌لای پادشاکانی شه‌دادی و راوادی ئازربایه‌گان و له‌کن میلله‌ت و سوپا و ره‌عیه‌ت و سه‌رکردان زۆرخۆشه‌ویست بووه.

دووه‌مین پیـاوی به‌ناوبانگی که له‌کن له‌شگری بووه «استـاذ ابوالمعـمر قـاسم» بوو. هه‌رچه‌نده قـه‌تران لێی دواوه و به‌هه‌ڵبـه‌ست ئاسـایش و دڵنیـای مـوڵـک و مـیلله‌تی لێ خوازتووه و به‌دلێر و نه‌به‌رد و ئازا و زانا ناوی بردووه که ده‌ڵێ:

تیـره‌ی بوالمعـمـر کـوست جـان خلق را یاور
مهیا گشت زو ملک و معمر گشت زوکشور

کیسره‌وی له به‌خشی سێیه‌می «شهریاران گمنام»دا باسی کردووه. به‌ڵام ئه‌م پیاوه چی بووه و چی کردووه و له عوله‌مایان یان له پاڵه‌وانان و سه‌ردار سوپاهان بووه، له ئێمه ونه و جگه له شیعره‌کانی قه‌تران سه‌رچاوه‌یه‌کم له ده‌ستدا نییه.

«منجم باشی» و کیسره‌وی گوتوویانه که له‌شگری پازده ساڵ پادشایی کردووه. به‌قسه‌ی «منجم باشی» ساڵی ٤٤٠ یان ٤٤١ مردووه؛ که‌وابێ ده‌بێ ساڵی ٤٢٥ یان ٤٢٦ له‌سه‌ر ته‌ختی پادشاهی دانیشتووبێ. ئه‌وه‌ش ڕووناک و ئاشکرا نییه و تاریک و نادیاره.

### ٧- ئه‌نۆ شیروان کوڕی ئه‌بولحه‌سه‌ن عه‌لی له‌شکری

به‌پێی نووسینی کیسره‌وی که له به‌خشی سێیه‌م «شهریاران گمنام» له‌لاپه‌ڕه ٣٠ دایه. وادیاره که ئه‌م پادشاهه له‌پاش له‌شگری بابی له‌سه‌ر ته‌ختی شاهی دانیشتووه، چه‌ندێک به‌فه‌رمانڕه‌وایی به‌سه‌ری بردووه. به‌ڵام ته‌مه‌نی پادشاهی که‌م و زینده‌گانی ده‌وڵه‌تی کورت بووه؛ هێنده نه‌ژیاوه. به‌ڵام مـردووه وه‌یا چی به‌سـه‌رهاتـووه و له ده‌وری ئه‌م پادشـایه‌دا چ سـه‌ربهـوردێک ڕوویداوه، له ئێـمـه نادیاره و له‌م بابه‌ته‌وه چ سـه‌رمـایه‌یه‌کـمـان ده‌ست نه‌که‌وتووه که بیکه‌ینه مایه‌ی لێدوان.

### ٨- شاور ئەبولسوار کوڕی فەزلۆونی یەکەم

لە دوای ئەنوشیروان لەسەر تەختی پادشاهی دانیشت. ناوی ئەبوسوار کە بەعەرەبی تەرجەمەکراوە بە«ابوالفارس». ئەم ناوە کونیەیەک بووە لەلایەن خەلیفەوە دراوە بەپادشا و ئەمیرە ئازاکان. بەڵام نیوەی ئەو ناوە عەرەبی (ابول) و نیوەی دوامینی کوردییە کە «سوار»ە هەردووک گەیاندراونەتە یەک بۆتە ابوالسوار و بەوناوە ناوبانگی دەرکردووە. دەنا ناوی ڕاستەقینەی شاور (شاپوور) بووە.

شاور لە دەوری فەزلۆونی بابیدا لەسەر ئەرمەنستان و دووین فەرمانڕەوا بووە و لەودەمەدا چەند شارانی گرتووە و بەگژ گورجی و ئەرمەنییاندا چووە؛ کوژتاری لێیان کردووە و خاکی لێیان گرتووە. لە دەوری ئەبولحەسەن لەشگریدا هەروا ماوەتەوە و دەستی تێنەداوە. لەو دەورەشدا گەلێک ئیشی بەکاری کردووە. هەتا کیسرەوی لە سەرچاوەکانی ئەرمەنییان کە وەردەگرێ، شەڕ و هەراکانی دەوری لەشگری هەموو بەناوی شاورەوە نوبسراوە و داستانی کێشە و جەنگ و جیدالەکانی کە ڕوویداوە بەناوی «ابوالسوار شاور» لە کتێبی ئەرمەنییاندا باسکراوە. هیچ ناوی ئەبولحەسەن لەشگری نەبراوە. وادیاردەکرێ کە پێکەوە نەبووبن و هەریەک سەربەخۆ بووبن.

شاور کچی ئاشوود باگراتونی شای ئەرمەنستانی بۆ خۆی خوازتووە و مارەی کردووە. فەزلۆون و مەنوچەهر لەو کچە بوون. بۆئەوەی لە نێوانی کورد و ئەرمەنییدا چیدیکە شۆڕش و پشێوی ڕوونەدا ئەو خزمایەتییەی هێناوەتە پێشەوە. بەوە زۆر چاک شاور توانیوبە بەئاسوودەگی بەسەر خاکی ئەرمەنستان پاشایەتی خۆی ڕەوا بکا. هەتا ئاشوود مابوو، ئەو خزمایەتی و ئاسوودەگی و لێک دڵنیابوونەی هەردوو میللەت زۆر بەچاکی ڕاگیرابوو. یێکەمین ئیشوکاری چاک کە شاور کردوویە ئەوەبوو لەنێوانی شەدادیان و باگراتونیان ڕەنجیدەیی ڕووی نەداوە.

قەتران لە سەرەتای برووزی فەزلۆونی کوڕی شاوردا قەسیدەیەکی بەرزی بەشاور و فەزلۆوندا هەڵگوتووە. بەڕاستی وەکو لە هاتوودا دێتەگوتن، فەزلۆون وەکو شاوری بابی کیشوەرگیر و گەورە بووە. شاور لەنێوانی پادشایاندا بەپڕبیر و ئەندێشە و زانا و وردبین و دوورئەنیش ناوی کردووە. ئەمە ڕوباعیەیەکی قەترانە کە دەڵێ:

شاور عدیل مجد گردونی باد<br>
فضلون ز جهان جفت همایونی باد

عـــمــر و طرب هردو بافـــزونی بـاد
عــالم همـــه شــاور و فـضلونـی باد

## ئەمیر کەیکاوس

ئەم ئەمـیره کـه مـوئەلیـفی «قـابوسنامه»یه و چەند ساڵ له خزمـەت ئەبولسـوار له گەنجە دانیشـتووه و مەجلیس و هەمزەبانی شاوری زۆر پێخۆش بووه و له کتێبەکەیدا گەلێک سوپاسی شاور دەکا و بەستایش لێی دواوه و بەزانین و تێگەیشتن و وریایی و پیاوەتی شاوردا هەڵدەڵێت. ئێمەش کـه قسەکانی ئەو که له کتێبەکەدا له شاور دواوه، لێرەدا بەکوردی کەمێکی دەنوویسم کـه دەڵێت: «بزانه ئەو ساڵە کە له حەج گەڕامەوه له دەوری ئەبولسواری پادشای شەدادیاندا چوومه گەنجە. لەبەرئەوه کە له هیندستان غەزام گەلێک کردبوو، ویستم له ڕۆم غەزا بکەم؛ له گەنجەوه چوومه غەزا.

ئەبولسـوار پادشایەکی گەوره و خێرەدمەند و زانا و تێگەیشـتوو و دادخـوا و عـادیل و ئازا و زمـان فەسیح و پاکدین و پێشبین و دوور ئەندێش و زرنگ و وشیارێکی وابوو کـه هەموو پادشـایانی ئەودەمه پەسندیان کردبوو؛ ناچاری سپاس و ستایش و پێداهەڵگوتن و چاکه وتنی ببوون. ئەبولسـوار هەم جددی و ڕاست و هەم بەتەرانه و گەمـه و زار بەکەنین و لێو بەزەردەگرتن و ڕووخۆش و نێوچاوان گوشاد و قسەخۆش و زمان شیرین بوو.

که چاوی بەمن کەوت بەحـیشـمـەت و ئیـحـترام و ڕێزەوه پێشـوازی کـردم و له جێگای بەرزی دانام و لەگەڵم کەوته قسه و گفتوگۆ، له هەموو بابەتێکەوه قسه و پرسیاری دەست پێکرد. له هەمـوولایەکەوەی باسـوخـواس کـرد. دەیپـرسی، دەیگـوت، دەیگێڕاوه، وەڵامی دەداوه. منیش دەمبیـست و دەمگـوت و وەڵامیم دەداوه. قسه و گـوته و گفـتوگۆی منی لێ خۆش دەهاتن و هەمـووانی پەسندکـردن. ئیکرام و مـیهرەبانیێکی بێ ئەندازەی لەگەڵمدا نواند. نەیهێشت بۆ نیشتمانی خۆم بگەڕێمەوه.

لەبەرئەوه کـه ئیـحسـانێکی زۆر و چاکـەیەکی بێژمـار و پیـاوەتی و ئینسـانیـەتێکی سـپاسکـارانەی لەگەڵدا کـردم و وای دڵگرتبـووم لێی دوورنەکـەومەوه. چەنـد سـاڵ لەسـەر یەک له گـەنجـه مـامەوه بەبێ جوێبـوونەوه و دەمـێک بچـڕانەوه. هەمـیـشـه له دانیـشتن و سەفەردا، له مەجلیسیدا، له هەستان و دانیشـتندا، له خواردن و خواردنەوەدا و له هەموو بزووتنەوەیەکـیـدا لەگـەڵی بووم؛ له هەمـوو سـەربهـوردانی عـالیـم و پادشـایان و گـەورانی لێپرسیووم و منیش بۆیم بەیان کردووه».

## کوژتنی ئەبیرادی ئەرمەنی

سەردەتای ئیش و شەڕی شاور، کوژتنی «ابی راد»ی ئەرمەنی بوو. چلۆنی ئەم سەربهوردە کە کیسرەوی لە «ماتیۆس»ی مێژوونووسی ئەرمەنی و هیدیکە وەردەگرێ ئەمەیە کە ڕوویداوە: لە خانەدانی باگراتونی هۆهانیس یان یۆحەنا ناو لە سەر لایەکی خاکی ئەرمەنستان دانیشتووە و شاری «ئانی» کردبوو بەپایتەخت. برایەکی بچکۆڵەی بەناوی «ئاشوود» هەبوو کە هەواداری فەرمانڕەوایی بوو. یۆحەنا گۆشەیەکی خاکی خۆی پێدا.

ئاشوود هەموو دەمێ لەوە خەریکبوو کە یۆحەنا تووشی کۆسپەیەک بکات و لەناوی ببا. بۆ ئەو بەد ئەندێشەییە جگە لەوە ڕێگایەکی نەدۆزیەوە کە خۆی نەخۆش بکات و فێڵ بۆ یۆحەنا بخاتە دەست و بیگرێ. قاقەزێکی بۆ نوبسی کە لە گیانەلادام و با دیدار بەئاخیرەت نەبم فریام کەوە.

یۆحەنا بەبێباکی هەستا چوو سەری برا بدا بەگریان و سوکواری گەیشتە پێش و گرفتار بوو و کەوتە زیندانەوە. ئاشوود برای دا دەست ئەبیراد -کە سەرکردەیەکی بوو- تاکو بیبا خەفەیکا و بیکوژێت.

ئەبیراد بەزەیی بەیۆحەنادا هات و هەڵیگرت و بردیەوە لە «ئانی» لەسەر تەختی دامەزراندەوە، بۆ خۆشی لە ترسی ئاشوود هەڵات و پەنای بۆ شاور ئەبولسوار برد و چووە دووین.

شاور زۆر ئیحترامی گرت و بەرزی کرد جێگای بڵند پایەی دایێ، بەڵام زۆری پێنەچوو کە ئەبولسوار فەرمانی دا کە ئەپیراد بکوژرێت و کوژتیان. ماتیۆس دەڵێ: ئەپیراد چونکو خۆشەویستی شاوربوو پایەی بەرزی گرت، نزیکانی شاور پێشکەوتن و بڵندی ئەپیرادیان پێ ناخۆش بوو و لێیان گرانهات، لەلای شاور بەخراپی بۆیان ڕژت و بەدییان گوت، بۆیێ شاور کوژتی.

## شەڕی شاور ئەبولسوار و داوویت بیخاک

«شهریاران گمنام» لە بەخشی سێیەم و لاپەڕە ٣٥ - ٣٦ - ٣٧ بەدرێژی لەم داستانە دواوە. ئەبولسوار بە سەد و پەنجا هەزار شەڕکەرەوە چووە سەر داوویت بێ خاک و ئەمیش بە بیست و ئەوەند هەزار نەبەردەوە چۆتە پێش. ئینجیل و خاچ بەدەست کەشیشەوە لە پێش سوپای تەرسایاندا هەڵمەتیان دەبرد و خاچیان لەسەر ئاڵاکان دانا. بەو جۆرە

میللەتی تەرسایان بۆ کوژتاری ئیسلام هاندران و بەدڵێکی دینی ئەو شەڕە دامەزراندرا.

شاور لە پێش هەڵمەت بردنیدا کە وردبۆوە داویت ڕۆژ بەڕۆژ هێز پەیدا دەکات و قورس و ئەستوور دەبێ، زوو لەگەڵ توغروڵ بەگی سەلجووقیدا پەیمانی دۆستی و ئاشتی بەست و لەگەڵ ئومەرایانی ئیسلامدا نێوانی خۆشکرد و ئەوجا لەشکری کۆکردەوە و بەکوژتار و تالآن کەوتە نێو تەرسایانەوە و بەخۆشی و بەزۆری ئەو خاکانەی گرت و شار و مەملەکەتانی ئەولای ئارانی خستە دەست خۆی و دەستی بەکیشوەرگیری کرد.

داویت بێ خاک تین و تەوانای ئەوەی نەبوو کە بۆ خۆی بچێتە پێش ئەبولسوار. بەڵام پیاوانی ناردە لای یۆحەنای خاوەندی «ئانی» و «قەپان» کە بەشێکی خاکی ئاران بوون، پیاوانی ناردە کن پادشای گورجستان و ئەبخاز، وای بۆ نوویسین کە: ئەوا شاور ئەبولسوار بەغەزاکردن هەڵمەتی هێناوەتە سەر تەرسایان و دینی مەسیح لادەبات و شارانی بێژماری لێگرتوون. ئەگەر یاریدەم نەدەن، مامڵەتی لەتەکدا دەکەم و دێمە سەر ئێوەش و ڕووی کوژتار و تالآنتان تێدەکەم و شاران و ئاوایيتان لێ وێران دەکەم.

یۆحەنا سێ هەزار و خاوەندی قەپان دوو هەزار و خاوەندی ئەبخاز چوار هەزار شەڕکەریان بۆ نارد و بۆ خۆشی دە هەزاری ڕێکخست و نۆزدە هەزار کەسی شەڕکەریشی هەڵگرت و هەردەستە لەشکرێک چەند کەشیشی وەپێش دەخستن و خاچ و ئینجیلیان بەدەستەوە دەگرت و ڕوو بەئیسلامان چوون.

شاور لە کوژتار و تالآن و کیشودرگیری ڕانەوەستابوو، بەزۆر تەرسایەکی بێژماری ئیسلام کردبوون. هەرکەس ئیسلامی نەویستبایە دەیکوژت. هەر کلیسایەکی هاتە پێش لە بنەڕەتەوە تێکیدا و ڕوخاندی و وێرانی کرد و لە کوژتاری تەرسایان دەستی نەپارازت.

داویت بەو هێزەشیەوە خۆی بەنەبەردی ئەبولسوار نەدەزانی. وەڵامی دا بە«کاتولیکۆس»ی ئاران کەوا شاور ڕیشەی دینی مەسیحی لە بن دەرخست و بەبێ ژمار کوژت و تالآن دەکا: ئەوا من لە ڕێگای مەسیحدا چوومە پێش، ئەتووش بەهەموو کەشیشانتەوە ئینجیل و خاچ هەڵگرن و بمانگەنێ، یان بەجارێک لە ڕێی مەسیحدا گیان دەدەین یان دینی مەسیح لە دوژمن دەپارێزین و میللەت ڕزگار دەکەین.

کاتولیکۆس بەنێو هەموو تەرسایاندا جاری جیهادی کێشا و بۆ خۆی و هەموو کەشیشەکانی، هەریەک خاچێک و ئینجیلێکیان بەدەستەوە گرت و ڕوو بەمەیدان چوون. کۆمەڵەیەکی زلی تەرسایان ڕەگەل کەوت و گەیشتە داویت. لەشکری تەرسایان لە ڕێی

دیندا یەکدەست و یەکدڵ هەڵمەتیان برد. یەکدەستی و کۆمەڵەیەتی مەسیحیان بوو بەمایەی تێکدانی کۆمەڵەی ئیسلام و لەشکری شاوری سەراسیمە کرد و موسڵمانانی داچڵەکاند و ڕەشتەی یێکەتی و ڕێکیی لێ پچڕاندن.

موسڵمانان بەبێ خۆگرتن، هەریەک بەلایەکدا هەڵاتن و تەرسایان شیبیریان لێ کێشان و کەوتنە نێوانیانەوە و کوژتارێکی قورسیان لێکردن. چوار ڕۆژ یەکوچان بەدوای شکستەی ئیسلامدا چوون و بەکوژتار و تالآن ئاژوتیان و بەفیرەزمەندی و خۆشی گەڕانەوە.

کیسرەوی ئەو داستانەی لە ماتیۆس وەردەگرێ. چامچیانی مێژوونوویسی بەناوبانگی ئەرمەنی، ئەو شکانە لە ساڵی ٤٢٨دا دەنوویسێ. لەو ساڵەدا توغروڵ بەگی سەلجووقی کە ماتیۆس باسیکرد لەگەڵ شاور پەیمانی بەستووە، هێشتا لە خاکی خوراسان بەملاوە نەهاتبوو. وادیار دەکرێ کە ئەم لەشکرەی شاور غەزەکان بووبن، بۆیێ خۆیان نەگرت و بەدڵسۆزی شەڕیان نەکردووە و هەڵاتوون. قسەکانی ماتیۆس و چامچیان لە تەعەسووبی دینی و میللی خاڵی نین کەوا بەلەشکری تەرسایاندا هەڵگوتووە و ئەو سەرکەوتنەیان لە کەشیشەکانیانەوە زانیوە.

## پەیمانبەستنی شاور ئەبولسوار دەگەڵ ڕۆمییان

لەو ساڵانەی کە ئەبولسوار بەسەر خاکانی دووین و بەشێکی ئەرمەنستاندا پادشاهی دەکرد، لە نێوەڕاستی ئەرمەنستاندا هەوادار و ئازادخواهی سەربەخۆ نەمابوو. ئازادپەرستی ئەرمەنییان لە نەبوون و ڕشتنەی یەکدی گرتنیان پسابوو. شاهنشای بەهێز و تین و تەوانای ڕۆم، ددانی لە لاشەی کەوتووی نیوەگیانی دراوسێ هەم ئاینەکانی تیژکردبوو، بەڕوویکی گرژ و دڵێکی ڕەق و نامیهرەبانانە خەریکی ڕیشەکێشان و هەڵقەندنی بنەچەکەی داری ئازادی و برینی ڕەگوپۆی ڕێکی و یەکەتی و سەربەخۆیی خواهانی ئەرمەنییان بوو.

شاور لە جیاتی یارمەتی و دەستگرتنی هاوڕەگەز و هاونەژاد و خزمەکانی، لە ڕووی لێک نەدانەوە و بیر لێ نەکردنەوە و وزدنەبوونەوە، توندگری، بانیانی گرتبوو، بۆ چاڵاو و زیندانی مردن و لەناوبردنی ڕادەکێشان.

هەتا لەو ڕووەوە تووشی کێشە و ئەزیەت و گرفتارییێکی وابوون کە چی وای نەمابوو خۆی و بنەماڵەی بەناوبانگی شەدادیان دووچار بەکەوتن و پێپەستییێکی وابێن، تاکو هەتا هەتایێ پایەماڵ و گرفتار دەبوون کە هیچ ڕزگار نەبوونایە. لە قەڕنی سێیەمی هیجرییەوە بەشێکی زۆری ئەرمەنستان لەژێر فەرمانی پادشایانی باگراتونی (بقراطونی)دا بووە و

لەوەش هێندێک جار ئازاد و گەلێک جارانیش بەنیوە ئازادی بەسەریان بردووە. لەم دەمی دواییدا لەگەڵ ڕۆمیانی ڕۆژهەڵاتدا دووچار بەنەیاری و دوژمنایەتی ببوون و ڕۆژانی هاتوویان بەڕەشی ڕابوارد.

**هۆهانیس و ئاشوود:** دووبرا بوون کە پێکەوە فەرمانڕەواییان دەکرد. زۆری نەکێشا کە ساڵی ٤٣٢ھ هەردووک مردن و پشێوی کەوتە نێوانی سەرهات و گەورەی ئەرمەنییەکانەوە. ئەو پشێویە دوو ساڵی کێشا و بەوە بوونە دوو تیرە و لەبەر دووبەرەکانێ کەسیان بەپادشا دانەنا.

قەیسەری ڕۆم کە لێیان کەلێنگیر و چاوی لە دەرفەت بڕیبوو، هەستا سەرەخۆی ئەمەی کردە بیانوو کە هۆهانیس لە پێش مەرگیدا وەسیەتی کردووە خاکی «ئانی» بۆ قەیسەر بێ. بەو بۆنەیەوە کەوتە خۆ گردکردنەوە بۆ سەر ئانی.

بەوە دەماری غیرەتی ئەرمەنی کەوتە بزووتن و جۆشش. غاغیق کوڕی ئاشوودیان کردە پادشا و خۆیان سازکرد کە پێش بەڕۆم بگرن. ئیشوکار کەوتە لەشکرکێشی و سوپا ڕێکخستن.

ڕۆمیان دەرگای فڕوفێڵیان لەسەر ئەرمەنی کردەوە. لەنزیک ئانی ئومەرا و گەورەکانی ئەرمەنییان بزاوت کە ڕووبەڕووی غاغیق ڕاوەستن. قاقەزیان بۆ شاور نارد و داوای ئاشتی و دۆستیان لێکرد. ساڵی ٤٣٥ شاور بەمەرجی ئەمە ئاشنایەتی ڕۆمیانی پەسندکرد کە هەر شار و دزێکی لە خاکی باگراتونی بگرێ، بۆ خۆی بێ و هەتاهەتا ڕۆم داوای نەکات. قەیسەر هەموو مەرج و پەیمانەکانی شاوری پەسند کرد و مادە بەمادە خستیە سەر قاقەز و بەمۆرکراوی بۆ شاوری نارد و شاوریش ئەو ڕێککەوتن و پەیمانبەستنەی لەگەڵ ڕۆمدا بۆ دەوڵەتەکەی بەچاکزانی و زۆر پێ کەیفخۆش بوو.

شاور کە لە شەڕی ڕۆم دڵنیابوو، لەشکرێکی قورسی پێکەوەنا و هەڵمەتی بردە سەر خاکی باگراتونی و بەسەر گەلێک شار و ئاواییان و دزدا زاڵبوو. غاغیق کە لەوە وردبۆوە وای بەسوودمەند زانی کە جارێ نێوانی خۆیان شڵەژاوە و بەشۆڕشە، هەتا دادەمەزرێندرێتەوە ڕووی ئاشتی لە شاور بکات و دۆستی بنوێنێ. دیارییەکی قورسی بۆ نارد و داوای مامڵەت دۆستی لێکرد و هەر خاکێکی کە گرتوویە بۆخۆی بێ، بەڵام پتر نەچێتەپێش. بەوە مامڵەت کرا.

## شەڕ و هەرای شاور لەگەڵ ڕۆمییان

ڕۆمییان بەو هەموو هێزەیانەوە کە چوونە سەر ئانی چیان بۆ نەکرا. ئەوجار کەوتنە فێڵبازی و ڕووی ئاشتیان لە غاغیق کرد و پەیمانیان لەگەڵ گرێدا و زۆری پێ نەچوو بەهۆی ئەرمەنییە ڕۆم خوازەکانەوە غاغیق چووە قوستەنتەنیە و لەوێ دەست بەسەرکرا و ڕۆمییان پەیمانیان شکاند. لە هەموولایێکەوە لەشکریان بۆ سەر «ئانی» ئاژۆت و ئانییان گرت و سەرکردەیەکی بەناوبانگی ئەرمەنی کە ناوی «ئاسید» بوو کردیانە فەرمانڕەوای خاکی ئانی. هەر ئەو ڕۆژە لەگەڵ شاوریشدا پەیمانیان شکاند و قەیسەر بۆی نوویسی: کە ئەو شار و دزەی گرتوویە بیانداتەوە.

ئەبولسوار پەیماننامەکەی نواند. قەیسەر لە پەیمان و سوێندەکانی پەراوی نەکرد کە بۆ شاوریان دەرمیان کردبوو و لە قسەکانی خۆی شەرمەزاری نەکێشا و فەرمانی بەلەشکر دا کە هەڵمەت ببەنەسەر شاور و لەسەر ئەو خاکانەی دەرکەن کە گرتبوونی.

ئاسید لە ئەرمەنی و گورجی لەشکری پێکەوەنا و لینگی دا سەر شاور. بەڵام شاور کە لە لەشکرکێشیی ڕۆم ئاگادار بوو و لە دووین دانیشتبوو، ناچار شاری دووینی کردە لەشکربەز و قەڵابەندی کرد و لە پێش «ئازاد ڕوود» بەندی هەڵبەستن و ئاوی چۆمی وەرگێڕا سەر هەر چواردەوری شار و ئەو خاکەی کردە زنا و قوڕەچەق. کووچە باخەکانی کردنە مەتەرێز و سوپەر و پڕ لە لەشکربوون و بۆ خۆشی لەنێو شار دانیشت و ئامادەی شەڕ و چاوەڕێی دوژمن بوو.

لەشکری ڕۆم کە نزیک شار بوون تەماشایان کرد، نە سوپا و نە کەسێکیان لە پێشە، بەمە دڵنیابوون کە بەیەک هەڵمەت شار دەگرن و بێباکانە لینگیان دا سەر شار و لە مەتەرێز و سوپەری کوردان تێپەڕین و نزیک بەشار بوون. لەپڕێکدا شاور فەرمانی دا لە بووق و کەڕەنا هاواری بدرێ. قیژە و بگرە و بەردە پەیدابوو. ڕۆمی سەر شێواوبوون و واق مان. لە پشتەوە سوپایی و لە پێشەوە شارستانیی بەشیر لینگیان دانێ و کوژتاریان لێکردن ئەوەی لە شیری کورد ڕزگاربوون و هەڵاتن و لە قوڕگیران و دەرنەچوون. کورد ئەوانیشیان گرتن و کوژتیانن. بەوجۆرە لەشکری نەبەرد و قورسی ڕۆم پووچکراوە و پیاوێکی لێ ڕزگار نەبوو تا هەڵێت و مزگێنی بۆ قەیسەر ببا. کیسرەوی ئەو داستانە لە مێژوونوویسانی ئەرمەنی «چامچیان» و «ئەرسداگیس لادسدۆردچی» وەردەگرێ لە ساڵی ٤٣٨هـ (١٠٤٦ یا ١٠٤٤) ڕوویداوە.

## جاری دووەمین شەڕ و هەرای ڕۆمییان و شاور ئەبولسوار

قەیسەری ڕۆم کە لەو شکان و کوژتارە ئاگاداربوو، ڕقی هەستا و فەرمانی دا بەلەشکر کۆکردنەوە. لە ژێر سەرداریی «دیلارخی» ناو سەرکردەیەکی ڕۆمدا سوپاهێکی قورسی نارده شەڕی شاور. دیلارخی نزیک زستان گەیشتە خاکی دووین. لەبەر سەرما و توندی زستـان نەیتـوانی هیچ بکا. گەلێک لە سوپاهانی پووچ بوونەوە. ناچار لە دووین دوورکەوتەوە و لە دێهات و ئاواییانی دەوروپشتدا زستانی بەسەربرد.

لە سەرەتای بەهاردا هەڵمەتی بردە سەر دووین و دەورەیدا و وەتەنگی هێنا. لە خاکی کوردستانی ئازربایەگانەوە لەشکرێکی قورس ڕوو بەهاواری شاورەوە چوون. دیلارخی پێشی پێگرتن و کوژتارێکی قورسی لێکردن و ئەو لەشکرە، لەزەی کوردانی بڵاوکردەوە و گەلێکی لی بەدیل گرتن. دیلارخی کە لە گرتنی دووین نائومێدبوو، هەرچییێکی لە کوردەکانی بەدیل گرتبوون هەڵی گرتن و گەڕاوە قوستەنتەنیە.

شاور بەگرفتاری موسڵمانان و بەدیل چوونیان زۆر پێ دڵگیربوو و کەوتە ئەندێشە و ئەزیەتەوە. شیری ڕقی کێشا و لینگی دا سەر تەرسایان و هەتا نزیک ئانی بەکوژتار و تالان لەشکری ئاژۆت. بەزەیی بەکەسدا نەهات و تەرسایەکی نەبەخشی و هەرچییێکی هاتەپێشی کوژتی و هەر کلیسایەکی وەبەر قەڵەمڕەوی کەوت ڕوخاندی و تێکی دا. لە کوژتاری تەرسایان و وێرانکردنی ئاواییان دەستی نەپارازت. (کیسرەوی بەخشی سێیەم، شهریاران گمنام، لاپەڕە ٤٢).

## شەڕ و کوژتاری شاورو بەهرامی ئەرمەنی

واهرام (بەهرام) گەورە و دلێرێکی ئەرمەنی، لە تەمەنی هەشتا ساڵیدا لە «ئانی» خۆشەویست و جێگا ئومێدی ئەودەمەی ئەرمەنییان بوو. چاوی بەو کوژتار و تالانەی کوردان کەوت کە شاور هەڵمەتی بردە سەریان و دەماری غیرەت و میللەتپەرستی بزووت؛ بەو پیری و کەنەفتیەوە هەستا و لەشکرێکی لە ئەرمەنییان کۆکردەوە و لینگی دا سەر شاور و بەکوژتار تا نزیک دەرگای دووین، شاوری پاشەوپاش بردەوە. لەنێوانیدا گەلێک کوژتارکرا. لە دوامینی شەڕدا لە نزیک دووین گریگۆری کوڕی وەهرام لە دەست کورداندا کوژرا.

واهرام بەکوژتنی کوڕی ئاوری لە هەناو بەربو؛ دلڕەنج و خەفەتبار دەستی دا شیییر و لە زیندەگانی دەستبەردار بوو. بەبی ترس و ئەندیشە کەوتە جەرگەی مەیدانی شەڕەوە و

کوژتاری لە کورد کرد و خوێنی ڕژت، هەتا ئەویش لە ڕێگای کورددا گیانی دا و لە خوێندا گەوزا دەستی هەڵنەگرت.

ئەرمەنییان بەمردنی ئەو پاڵەوانە دلێر و بەغیرەتە گەلێک دڵگیربوون و ڕشتەی هێز و تینیان پساو و بڵاوبوونەوە و لاشەکانی هەردووکیان برد و گەڕانەوە ئانی.

لە دوای ئەوە سەربهوردی شاور ئەبولسوار بەبێ دەنگی دەڕوا تا ساڵی ٤٤١ کە مەرگی ئەبولحەسەن لەشگری و نەوشیروانی کوڕی دەبێتە پادشا و ڕەشتە و سەرمایەیەکی تەئریخی لە دەستدا نییە.

نەوشیروان بوو بەپادشا و بەکەم چاخیک بۆی دەرچوو. (گەنجە) کە دایک و تەختگای سوودمەندی شارانی شەدادیان بوو کەوتە دەست شاور ئەبولسوار.

بەڵام لێرەدا ئێمە ئاگادارنین کە دوامینی ئیشی نەوشیروان بەچ پایانی دا و بۆخۆی چی بەسەرهات. داخوا بەمەرگی خۆی مرد یان شاور گرفتاری کرد و لەناوی برد، یان لە لایەن کەسێکی دیکەوە تووشبووە؟ ئەمەشمان بۆ ئاشکرا نەبوو نەمانزانی کە مەنوچەهر و گودەرز و ئەردەشێر بۆچی لە تەخت و تاجی پادشاهی بێ بەهرە مانەوە؟

هەرچۆنێک بووبێت بووە. بەڵام ئەمەمان زۆرباش بۆ ئاشکرا بووە کە شاور لە هەموو شەڕ و کوژتار و هەراکاندا هەر سەرکەوتووە. لە شۆڕش و کێشە و کوژتار و ئامبازەکانی گورج و ئەرمەندا و لە جەنگ و جیدالەکانی ڕۆمدا فەیروزمەند و سەربەرز بووە. ناوبانگ و دەنگی ئازایی و ڕەشیدی و نەبەردی و نەیرومەندی بڵاوبۆتەوە و لەنێو پادشا و ئومەرا و میللەتی ئیسلامدا جێگای بەرزترینی گرتووە. کە بەسەر گەنجەدا زاڵبوو دووچەندان لە شان و شەوکەتی بەرزی پەیداکرد. حوکمڕان و ئەمیرێکی وەکو «کەیکاوس» چووەلای کە لە شەڕی تەرسایاندا یاریدەی بدات. کە چەند ساڵ لە خزمەتیدا ماوە و لە گەنجە دانیشت. کیسرەوی دەڵێ: لە نووسینەکانی ئەمیر کەیکاوس زۆر چاک ئاشکرایە کە شاور چەندجار گیرودار و کوژتار و شەڕی لەتەک ڕۆمییان و گورجیان و ئەرمەنییاندا کردووە و هەر فەیروزمەند و سەرکەوتوو و زاڵبووە.

## توغروڵ بەگی سەلجووقی و چووینی بۆ ئاران

سەربهوردی زل و گەورەی ئەو دەمانە کە ڕوویداوە، پەیدابوونی سەلجووقیان و پادشاهی و کیشوەرگوشایی توغروڵ بەگ بوو کە لە خاکی کوردستاندا لە دامەزراندندا بوو و لە ئێراندا جێگای خۆی دەچەسپاند و لە دوامیندا بوو بەدوژمنێکی گەورەی ڕۆم و یەک لەدوای

یەکدی بەسەر پادشاکانی کورداندا زاڵبوون. (وەکو لە فەسڵی سێیەم و لە فەسڵی چوارەمدا لە هەموو لاپەڕەکاندا لێی دواوین کە توغروڵ بەگ و جێنشینەکانیشی چۆن لەگەڵ پادشایانی کورد ڕایانبواردووە)

توغروڵ بەگ لە دوای ڕێکخستن و دامەزراندنی هەموو گۆشەکانی خاکی ئێران ساڵی ٤٤٦ چووە کوردستانی ئازربایەگان لەگەڵ پادشای کوردی ڕاوادی ئەو خاکە پێکهات. ئەمیر ئەبولمەنسووری وەهسودانی پادشای کوردی ئازربایەگان کەوتە پێشوینی و لەسەر مینبەران خوتبەی بەناو خوێندەوە و بەناوی توغروڵ سککەی لێدا.

توغروڵ لە ئازربایەگان بوو کە ویستی بچێتە سەر خاکی کوردی شەدادیان و شاوریش وەکو وەهسودان بخاتە ژێر فەرمانی خۆیەوە. تاکو گۆیا دەیەویست بەگژ ڕۆم و گورج و ئەرمەندا بچێ کە دوژمنی ئیسلامان بوون و بەکوژتار پووچیان کاتەوە. ئەویش بەوە نەبوایە پێک نەدەهات کە شاور ئەبولسوار نەکاتە فەرمانبەری خۆی.

دووچتی زۆر زل و دوو کۆسپەی زۆر گەورە شاوری ناچارکرد کە فەرمانبەری تورکمانی سەلجووقی بخاتە گەردنەوە: یێکەمین ئەمەبوو کە سەلجووقیان لە شاور بەچەندان پتر لە هێز و تین و سوپا زۆریدا بوون و لە شاور گەورە و بەهێزتریان چەماندبوو و زەبوونی خۆیان کردبوو. دووەمین: بۆ بەرامبەری و ئامبازبوونی دوژمنێکی نەبەردی زلی وەکو ڕۆم، پشتیوانی و یارمەتیدانی سەلجووقیانی پێویست و بەکەڵک بوو.

شاور بەتالووکە لەسەر مینبەران بەناوی توغروڵ بەگەوە خوتبەی خوێندەوە و لەشکری بۆ گردکردەوە و لەگەڵیدا چووە سەر ئەرمەنستان. کوژتار و تالانێکی بێژماریان لێکردن. لە سەرەتای هەڵمەتدا پەلاماری پارچەخاکی «شیراگ»یان دا کە ناحیەیەکی «ئانی» بوو و ڕۆم بەسەردا فەرمانڕەوابوون. کە ڕۆم لەوە گەیشتن میللەتەکەیان کۆکردەوە و بردیانن لە شاری ئانی خزان و دەرگایان لەسەرخۆیان گرێدا.

شاور شیراگی بەکوژتار و تالانکردن گرت و ڕوو بەئانی ئاژۆتی.

ڕۆژێک لەشکریانی کورد بەتالان و کوژتار کە تاکو شاری ئانی چووبوون، لە نزیک شار تووشی کۆمەڵەیەکی زلی تەرسای لادێیی بوون کە تەمای چوونە نێو شاریان بوو. دەستە لەشکرێکی شاور پێی گەیشتن. ئەو هەژارانە فریانەکەوتن خۆ باوێژنە نێو شارەوە، وەبەر شیبیری کوردان کەوتن و هەموو کوژران و لە دواییدا لەشکرەکەی شاور ڕوو بەلەشکربەز گەڕاوە.

ئەو سەربهوردەمان تا ئێرە بۆ ئاشکرا و دیاربوو کە گوترا. لەوە پتر لەو هاتن و هەڵمەتە ئاگادارنین و نازانین دوامینی ئەو شەڕە و توغروڵ لە ئاران چی لێهات. تا ساڵی ٤٥٦ لە نزیک دە ساڵێک، چمان لە شاور و سەربهوردانی نییە و نازانین لەگەڵ توغروڵ بەگ چیان کرد و لە دوای چوونەوەی توغروڵ شاور و ئەرمەنی و ڕۆم چۆنیان بەسەربردووە و چ سەرمایەیەک لە دەستدا نییە. چتێکی زۆر ئەندێشە ئاوەرە کە ئەو چەند ساڵە دووردرێژە لەو دەمە پڕ لە شۆڕش و پشێوی و هەنگامەدا مێژوونووسەکان لێی بێدەنگ بوون و لێی نەدواون. چونکە ڕۆژێک بێ هەنگامە بەسەر نەبراوە؛ سەرەتای هەڵمەت و جەنگ و جیدال و کیشوەرگیری سەلجووقیان بوو. ڕۆم لە تەقەلا و کۆشش و خۆڕێکخستنی پێش پێداگرتندا بوون.

## ئەلب ئەرسەلانی سەلجووقی و گرتنی ئانی

ئەلب ئەرسەلان تازە ببوو بەسولتان، بۆ شەڕ و کوژتاری ڕۆمییان و ئەرمەنییان ساڵی ٤٥٦ چووە «ئاران». لەنێوانی چەند مانگدا تەنگەی بەپادشای گورجستان هەڵچنی. ئیش گەیاندرا پایەیەک کە پادشای گورجستان و ئەبخاز سەری بۆ ئەلب ئەرسەلان چەماند و کچی خۆشی بەژنی پێ بەخشی و چەند شار و دزی ئەرمەنستان گیران. گەورەترین شارێکی کە گیرا، تەختگاهی بنەماڵەی باگراتونی ئەرمەن شاری ئانی بوو کە لەژێر پەنجەی ڕۆم دەرخرا.

لەبەر سەختی و دژواری قەڵا و توندی و ئەستووری شوورە و بارووی دیواری شاربوو کە بەتەختگاهی باگراتونیان هەڵبژاردرا بوو. هەتا لە دەست هاتبوو ڕۆژ بەڕۆژ خرابووە و سەر سەختی و توندی و دژواری شار. لە دوولایەوە چۆمی «ئاخوریان» و لەلایەکی دیکەوە چۆمی «جاغقاچاجور» دەڕۆن. سێ لای ئاو دەورەی داوە و تەنها لایەکی وشکانی و ئاوی نەبوو؛ ئەویشیان بەبورج و بارووی بەرز و ئەستوور و سەخت کردبوو. بەدەوری شاردا خەندەقیان لێدا بوو و پڕ کرابوو لە ئاو. شاری ئانی لەودەمەدا سەد هەزار ماڵ دانیشتووی هەبوو. کلیسای ۱۰۰۱ بوو، بەشاری ۱۰۰۱ کلیسا ناودەبرا. ئەو کلیسا و خانوانەش پتر ببوون بەقەڵا و شوورە بۆ سەختی شار و پشت و هێز و شوورە و بورجەکانی دەوری شاربوون. لە پێش ئەلب ئەرسەلاندا بەشییر بۆ هیچ پاشایەک نەگیراوە. «ابن الاثیر» دەڵێت: ئەلب ئەرسەلان بەمەنجەنیق بورج و بارووی شاری داگرتبوو و دەیکوتا، بەڵام لە گرتنی نائومێد ببوو. هەرهێندە دیترا لایەکی دیواری باروو بۆ خۆی بەربۆوە و کەوت.

مێژوونوسەکانی ئیسلام و ئەرمەنی زۆر لەوە دواون.

هەرچۆنێک بووبێ، شاری ئانی -کەچەندجار کوژتاری لەسەرکرا و نەگیرا- ئەمجارەیان گیرا و بوو بەتەختگاهی دووەمی شەدادیان؛ هەروەکو لە داهاتوودا باسی دەکەین. بەڕاستی ئیسلام شاری «ئانی»ی گرت و کوژتارێکی قورسی تێداکرد. «ابن الاثیر» دەڵێ: هێندە لە ئەرمەنییان کوژرا نەهاتە ئەژماردەوە و نەزاندرا چەندبوون؛ لەبەر لاشەی مردوو ڕێگا لە موسڵمانان بڕابوو. پتری ئەوانە کە وەبەر شیبیری موسڵمانان نەکەوتن، بەدیل گیران و ئەلب ئەرسەلان گەلێکی لەگەڵ خۆیدا بردن بۆ ئێران.

کیسرەوی دەڵێت: ئەلب ئەرسەلان کە شاری ئانیی گرت و دایمەزراند، بەشاور ئەبولسواری بەخشی. «عیماد ئەسپەهانی» دەڵێت: شاور خاک و شاری ئانیی بەدراوێکی زۆر لە ئەلب ئەرسەلان کڕی. فەزڵوونی کوڕی شاور کە زانیییەوە، بەدراودان گەلێک یارمەتی بابی دا و هەرچییێکی پێویستی بوو دای پێی.

لە دوای ئەوە کە ئانی کەوتە دەست شاور و دایمەزراند و ئیشوکاری میللەت و ڕەعیەتی ڕێکخست و ئاسایشی پێداوە، کوڕە چکۆڵەی خۆی کە «مەنوچەهر» بوو لەسەر ئەو خاکەی کردە فەرمانڕەوا و هەموو پێویستی حوکمڕانی دایێ و دایمەزراند و گەڕاوە سەرخاکی خۆی. (بۆ ئەوەی بەدرێژی لەو داستان و سەربهوردانە ئاگاداری پەیداکرێ، تەماشای بەخشی سێیەمی شهریاران گمنام، سەید ئەحمەدی کیسرەوی تەبریزی و ابن الاثیر و عماد اسپهانی و چامچیان و وارتان و ئەرسداگیس بکرێن)

لە دوای گرتنی ئانی و دامەزراندنی مەنوچەهری کوڕی شاور لەو خاکە پادشایانی بنەماڵەی شەدادیان بوونە دوو تیرەکە لە داهاتوودا لێی دەدوێم.

کیسرەوی لە بەخشی سێیەم و لاپەڕە ٤٦ کە لە دوامینی زیندەگانی شاور دواوە و دەڵێ: «شاور ئەبولسوار ساڵی ٤٥٩ی هیجری بەئامرزشی یەزدان چوو».

## ئەبولموزەفەر فەزڵوونی دووەم

## کوڕی شاور ئەبولسوار

سەربهورد و مێژووی ئەم پادشا گەورەی کوردە لە دێریک و کتێبەکاندا زۆر پەراگەندە و پشێو و بڵاو و نادیار و ونە و بەراستی گەلێک تاریک و ناڕەوشەنە. هەریەک بەپێی زانینی خۆی باسیان کردووە. گۆیا لە بابی ڕوو گەردان و تۆرابووە و سەرکێشی دەست پێکردووە و بەسەر بابیدا زاڵبووە و موڵک و پادشاهی لێ ئەستاندووە. بۆ خۆی بەئازادی

لەسەر تەخت دانیشتووە. پادشای ئاران و ئەرمەنستان بووە. قەتران لەم شیعرەی خوارەوەیدا فەزلوونی بەفەزڵ ناوبردووە کە دەڵێت:

ابو المظفر پر فضل، فضل بن شاور

که بر معادی بارد قضای بد بەقضیب

«ابن الاثیر» و «عیماد» و مێژوونووسەکانی دیکە گەلێک لەم فەزلوونە دواون و باسیان کردووە، بەڵام ئێمە بەکورتی قسە و نووسینەکانی کیسرەوی دەنووسینەوە کە باوەڕم پێی کردووە و بەڕاستی دەزانم کە لەم پاشایە دواوە.

فەزلوون چاکتر و بەناوبانگتری پادشایانی شەدادای و بنەماڵەی کوردی ڕاوادی و لە هەمووانیش پتر ئەزیەت و کێشە و ناگوزیری و گەردوشی گەردوون و چەرخ بەبێ ئارەزوو گەڕانی تووش بووە.

فەزلوون کە شاوری بابی مرد، لەسەر تەختی شەهریاری گەنجە و ئەرمەنستان و ئانی دانیشت. هەردوو برا پێکەوە بەنێوان خۆشی و تەبایی بەسەریان برد و لە تەک سوڵتانەکانی سەلجووقیاندا دۆست و ئاشنایی و ئاشتییان زۆرچاک بوو و بەدڵداریان دەکۆشان.

ساڵی ٤٥٩ یان ٤٦٠ کە ئەلب ئەرسەلان چووە ئاران کە هەڵمەت بباتە سەر گورجستان، فەزلوون ئەودەمە پادشا بوو. زۆرباش پێشوازی کرد و موحتەرەمانە لە پەرایدا ڕاوەستا. کە سوڵتان گورجستانی گرت، شاری تفلیس و هەموو خاکی گورجستانی بەفەزلوون بەخشی.

لە دوای ئەوە «پاگارت»ی پادشای گورجستان لەشکری کێشا و لینگی دا سەر فەزلوون. لە دوامینی کوژتارێکی بێژمار، گورجی سەرکەوتن و کورد شکان. فەزلوون خۆی و دوازدە پێشگوزاری تەنها گیانیان لە شەپۆلی خوێن ڕزگارکرد و هەڵاتن. گورجی لە ڕێگا پێی گەیشتن و ناسیان و چوونە سەری، بەشەڕکردن گرفتاری دەستیان بوو بەدیل گیرا و بردیانە کن «پاگارت». قەتران لە شیعرێکیدا لەوە دواوە و ئەمە بەسەرهەنگ ساوتگین دەڵێت:

او بەشمشیر، میر فضلون را

ستد از دست کافران کفور

گۆیا ئەو ساوتگین ناوە بەلەشکرەوە چووە و ئومەراییێکی سەلجووقیان بووە کە فەزلوونی

له پەنجەی گورجیان ڕزگار کردووه. هەرچۆنێک بووبێ، ئومەراکانی کوردی ئازربایەگان و دەوروپشت و پادشاکانی ئیسلام تەقەلایان داوه فەزلوونیان له دیل دەرهێناوه و گەڕاوەتەوه سەرتەختی شەهریاری.

## هەڵمەتی فەزلوون

## بۆ سەر ئەرمەنیان و کوژتنی سنگریم

له بنەماڵەی (هایقازیان) دووبرا مابوون که یەک ناوی «سەمباد» و دووەم «گریگۆر» بوو. ئەوانه دوامین پادشایانی ئەو بنەماڵەیەن؛ هەردووک وەچاخ کوێربوون. گریگۆر له بنەماڵەیێکی دیکه سنگریم ناو منداڵێکی بەخێوکرد و کردیه کوڕی خۆی. وەسیەتی کرد له دوای مردنی، بکرێ بەپادشا. ئەم سنگریمه پیاوێکی باش و لەسەر قایسۆس و سنیک - سیسگان که پارچەیەکی ئاران بوو پادشاهی کرد. فەزلوون پادشای کورد چاوی لەو خاکه بڕی که له دەست سنگریمدابوو. ساڵی ٤٦٧ لەشکری نارده سەر و سنگریمی گرت و کوژتی و هەموو شار و قەلا و دێهاتەکانی خسته ژێر فەرمانی خۆیەوه.

## دوامینی ئیشوکار و زیندەگانی فەزلوون

«ابن الاثیر» له ڕیزی سەربهوردی ساڵی ٤٨٢ دا دەڵێت: سوڵتان مەلیکشای سەلجووقی چوو، خاکی «ئاران»ی له فەزلوونی کوڕی ئەبولسوار کوردی ڕاوادی گرت و دایه سەرهەنگ ساوتگێن تورکمانی، که نۆکەری خۆی بوو و خاکی ئەستراباذی دا بەفەزلوون. بەلام فەزلوون له دوای چوونه ئەستراباد گەڕاوه سەر خاکی خۆی و بەزۆر گرتیەوه و بەجارێک له مەلیکشا ڕوو گەردان بوو.

مەلیکشا «بوزان» ناو تورکمانێکی نارده سەر و بەگژ فەزلووندا چوو. له دوامینی شەڕدا فەزلوون بەدیل گیرا و خاکی ئاران کەوته دەست نەیار و بیانی کوردانەوه. فەزلوون له بەغدا بەکوێری و بەپەرێشانی و نەبوونی و ڕووتی و برسی و له ئەزیەتدا له مزگەوتی کەنار دیجلەی بەغدا ساڵی ٤٨٤هـ بەئاخوداخەوه گیانی داوه و مردووه. قەتران گەلێک غەزەل و قەسیدەی بەفەزلووندا هەڵگوتووه. ئێمه لێره له ٧ پارچه قەسیدەکانی هەریەک چتێک وەردەگرین.

١- بود قطران نکتەدانی سحرباز

قطرای از کلک او دریای راز

بهر دریا بخشش فضلون لقب

گفت مدحی سربەسر فضل و ادب

طبع فضلون چون برآن اقبال کرد

دامنش از مال مالامال کرد

٢- نقرس از مال بود هست دروست این کەمرا

نقرسی کرد عطاهای شەه آرانی

بوالمظفر کە خداوند جهان فتح وظفر

وقف کرده است برو ما نعم روحانی

میر بی ثانی فضلون کە مراورا گردون

بەهمە فضل نیاورد و نیارد ثانی

٣- کە فەزلّوون لە ئەستراباد بووە، قەتران بەشیعر هەموو سەربهوردەکەی لە پارچە قەسیدەیەکدا باس کردووە. ئەمە شیعری ٧-٨-٩-١٠ بەیتی لێرەدا دەڵێ:

٧- کنون گشتیم بینا چشم و برنا جسم بازاز بس

کە باز آمد بدارالملک شادان خسرو برنا

٨- شهنشە بوالمظفر کوست یوسف روو یوسف خو

نکو منظر نکو مخبر نکو پنهان نکو پیدا

٩- ملک فضلون کە گستر واست فضل او وجود او

ز جابلقا بەجابلسا ز جابلسا بەجابلقا

١٠- بدستان خانەای آباد جدا کردند زو خصمان

بەمردی بازدست آوردخون رفتە از اعدا

دایکی فەزلّوون (وەک گوترا) کچی ئاشوودی باگراتونی بوو. قەتران لە پارچە شیعرێکیدا دوورودرێژ باسی کردووە. ئەمە شیعرێکیانە:

چراغ آل شداد است و شمع آل باگراتون

بەدانش نامەگم کرد است بقرات و فلاتون را

فەزلّوون جگە لەوە کە پادشابووە و خاوەندی هونەر و فەزڵ و ئەدەب و دانش بوو. قەتران دوورودرێژ لە پارچە شیعرێکیدا گوتوویە:

٥- شاه دانا دوستتر زو دوجهان هرگز نبوود
شاه دانا دوست و دوشمن گاه و روز فزون بود
بر زمین همچون پدر برهرهنر شد مشتهر
هرکجا باشد پدر چونان پسر ایدون بود
٦- بود بەفضل و أدب بر جیهانیانت فخر
چون تو شاهی هرگز نیامده است أدیب

قەتران لە شیعرێکی دووروودرێژدا لە فەزلۆون و مەنوچەهر دواوە کە ئەمە شیعرێکیانە:

همیشه شادان باشی بروی میر اجل
کتاب شادی باطبع هردو شاه کتیب

لەو شیعرەدا مەنوچەهر بە«میری ئەجەل» ناودەبا. ئەوە قەسیدەیەکی زۆر بەرزە و گەورەیە و بەپێویستم نەزانی لەم کتێبەدا بینوویسمەوە، بەوەم بەسکرد.

کە فەزلۆون لەسەر خاکی ئاران هەڵگیرا و برایە ئەستراباد، فەرمانڕەوایی خاکی فەزلۆون درایە نۆکەرێکی سەلجووقیان کە ناوی عمادودەولە ساوتگین بووە، کە پێشتر باسی کرا، بەڵام کێ بووە ونە.

بەگرتنی فەزلۆون بنەماڵەی شەهریارانی شەدادیانی کورد لەسەر خاکی ئەوان کە دووین و ئاران و ئەو خاکانەی دیکەبوون کە دوایی هات، بیانی بوونە حوکمڕان و لەو ڕۆژەوە کە فەزلۆون گیرا و غەزوتورکمانی سەلجووقی کە کەوتنە نێو خاکی کوردانەوە، پیت و پێز و سوود بۆ کورد نەما. بەڵام ڕیشەی ئەو دارە پیرۆزەی بنەماڵەی شەدادیان کە لە ئاران بڕا لە ئانی هەڵیداوە و سەرلەنوێ بووە دارێکی پڕ هێز و ئەستوور و ڕیشەی داکوتاوە. هەروەکو لە داهاتوودا بەپێی زانینمان لێی دەدوێین.

## شەهریارانی شەدادیان لە ئانی

بناخەی پادشاهی کورد:

پادشاهی ئەم تیرەی شەدادیانی کوردە، وەچڵەدارێک دەچێ کە لە تەنیشت کۆلکەیەکی گەندەڵ تازە چوزکەی دابێ و شین بووبێتەوە و خەڵفێکی شووش و باریک و ڕاستی لێ پەیدا بووبێ و کۆلکەدارە کۆنەساڵە پیرەکە لەناو چووبێ و ئەم نەمامە تازەی لێ هەڵدابێ و بووبێتە دارێکی وا کە لە جێی ئەو کۆنەدارە خۆی گرتبێتەوە. چونکو پادشاهی ئەم

تیرەیە لە دەموچاخێکی وادا جێگیربوو و خۆی نواند و دامەزرا و ڕیشەی چەقاند کە پادشاهی ئاران و دووین لە کەوتن و پووچ بوونەوە و لەناوچووندا بوو.

وەکو گوترا کە ئەلپ ئەرسەلانی سەلجووقی شاری (ئانی)ی گرت، دای بەشاور ئەبولسوار. ئەمیش مەنوچەهر کە کوڕی بچووکی خۆی بوو لەسەر ئەو خاکەی دانا. لەو سەربهوردە سێزدە یا چاردە ساڵ بەسەر نەچووبوو، کە فەزلۆون لە گەنجە گرفتاری دەستی بوزان بوو. ڕیشەی بنەچەکەی شەدادیان لە خاکی ئاران و دووین هەڵقەندرا و هاوێژترا. بەڵام پادشاهیەکی لە خاکی «ئانی»دا مەنوچەهر کە دایمەزراند سەد و سی ساڵ پتر ماوە و ڕاگیرا و پایەداربوو.

ئەمە چتێکی زۆر ئەندوهئاوەرە کە کوردی شەدادیان لەسەر خاکی ئەرمەنستاندا، پادشاهیان کردووە و مێژوونویسەکانی ئەرمەنی لێی نەزان ماون و نەپەرژاونە سەر نوویسینەوەی سەربهوردانیان. داستان و کێشە و هەرای دووسەد و سی [سەد و سی ساڵ]ساڵی ئەو پادشایانە کە لە ئەرمەنستاندا فەرمانڕەوابوون لە بیریان کردووە. بەڕاستی لێرەدا بەهێرچوون کەوا فەزلۆونی یێکەم و دووەمیان لێک جوێ نەکردوونەوە و مەنوچەهریان بەفەزلۆونی دووەم ناسیووە.

لە تیرەی شەدادیان «ئانی»مان ئاگاداری کەمترە لە هی پێشوو؛ ئەگەرچی دەوری پادشایانیان ژمارەی ئەمانە لەوان هێندە دوورنییە و خاکی ئەمان لە خاکی ئەوان بێ شان و شەوکەت و زیب و فرەتر نەبووە و مەنوچەهر و فەزلۆونی سێیەمیش وەکو پادشایانی ئاران ناسراو و بەناوبانگ بوون.

### ١٠- ئەبوشوجاع مەنوچەهر کوڕی شاور ئەبولسوار

وەکو گوترا مەنوچەهر لەلایەن شاور کرا بەپادشای ئانی لە تەمەنی منداڵیدا و زۆر بچووک بوو. کە پێگەیشت ڕشتەی هەموو کاروبارێکی خستە دەست خۆی. بۆ ئاسایشی مەملەکەت و ئاسوودەگی هەمووانی و ئاشتی و خۆشی میللەت و دڵنیایی ڕەعیەت تالووکەی کرد. دیوار و شوورەی ئانی لە هەڵمەتی ئەلب ئەرسەلاندا تووشی کەوتن و ڕووخان ببوو. مەنوچەهر هەمووی تازەکردنەوە و هەموو هێزی خۆی لەوە بەخت کرد کە پتر سەخت و دژواری بکا و تین و ئەستووری باوێتەسەر. کیسرەوی لە بەخشی سێیەم و لاپەڕە ٥٩دا دەڵێت: ئێستاش لەسەر لادیوارانی ئانی ماوە کە بەخەتی کووفی بەم عیبارەتە ناوی مەنوچەهری لەسەر نووسراوە: «شجاع الدوله ابوشجاع منوچهر بن شاور».

مەنوچەهر ئەو گەورە و ئومەرایانی ئەرمەن کە لە شەڕی ئەلب ئەرسەلاندا هەڵاتبوون بەلوتف و میهرەبانی دڵنیای کردن و هێنانیەوە لای خۆی و بەدوایدا ناردن و کۆیکردنەوە. یەکێک لەوانە گریگۆری کوڕی واساک بوو کە هاتەوە مەنوچەهر بۆ خۆی چووە پێشوازی و بەشادی بردیە شارەوە.

مەنوچەهر ئەگەرچی دایکی کچی ئاشوودی پادشای ئەرمەن بوو. بۆ خۆشی «قادا» ناو کچێکی لە بنەماڵەی باگراتونیان خوازت و مارەی کرد. جا لەبەر ئەو دوو ڕێیانە لەگەڵ ئەرمەنییاندا خۆشی ڕابوارد. کینە و ڕقی دین هێندە لە دڵیدا جێگیر نەبوو، زۆر بەئاسانی ئەرمەنییان ڕامی ببوون.

مەنوچەهر پادشایەکی تێگەیشتوو و زانا و وشیاربوو. ژێردەستەکەی لانی پتری تەرسابوون و زۆرباش گوزەرانی لەتەکدا دەکردن. هەر هەڵمەت و پەلامارێکی تورک و هی بۆ سەر تەرساکان ڕووی دابایە، مەنوچەهر زۆر بەلەز پێشی پێدەگرت. نزیک ۳۰ ساڵ و پتر پادشاهی کرد و موسڵمان و تەرسا وەکو برا لەژێر فەرمانێکدا بەئاسوودەگی و دڵنیایی ژیانی کەسێک لەتەک یەکێکی دیدا خراپەیەکی لێ ڕوونەدا.

مەنوچەهر لەشاری ئانی مزگەوتێکی زۆرگەورە و جوانی وای دروستکرد کە لەو دەورەدا بینای وا و دەستگای هێندە جوان پەیدا نەدەبوو. لەسەر کۆنە دیواری ئەو مزگەوتە بەخەتی کووفی زۆرجوان ئەم عیبارەتە هێشتا هەرماوە: «الامیر الاجلّ شجاع الدولة ابوالشجاع منوچهر بن شاور».

## شەڕ و هەراکانی مەنوچەهر لەگەڵ تورکان

وەکو بۆمان ئاشکرابووە، مەنوچەهر لە فەزلوون پەندی وەرگرتووە و نووسراوی بۆ هاتووە کە لەگەڵ سەلجووقیان چاک بێ و بەخۆشی و ئاشتی بەسەری ببات. سوڵتان مەلیکشا کە چووە ئاران و فەزلوونی بردە ئەستراباد و گەنجەی لێ ئەستاند، تەمای چوونەسەر (ئانی)ی کرد، مەنوچەهر چووە کنی و ئانی پێ بەخشی و کلیل و قفڵی دز و گەنجینەی لە پێش دانا. ئەوە لە مەلیکشا خۆشهات دیسان خاکی ئانی و پادشاهی پێ بەخشیەوە و خەڵاتی کرد و نیشانی دایە؛ بەوە مەنوچەهر لە شەڕدا پارێزرا.

هۆهانیس کوڕی غاغیق کە دوامینی پادشای ئەرمەنییان بوو، لە دوای مردنی بابی لە شاری قوستەنتەنیە دادەنیشت. کوڕی خۆی کە ناوی ئاشوود بوو؛ ناردیە لای مەلیکشا کە شاری «ئانی»ی پێ بداتەوە. لە پێش ئەوەدا بگاتە ئارەزوو نۆکەرێکی ئەو کە موسڵمان

بوو، ژەهری داین و کوژتی. وادیار دەبێ کە ئانی پێ درابوو.

ساڵی ٤٨٥ بەمردنی مەلیک شا نێوانی جێنشینەکانی تێکچوو و بوونە دووبەرەکانی. ڕشتەی ئاسوودەیی و ئاسایشی هەمـوولایەک پسا و کـێشە و هەرا بەرپاکرا. عەشایری تورک کە بەفرەیی چڕژابوونە کوردستان و ئێرانەوە، دەستەیەکی قورسیان هەڵمەتی بردە سەر ئانی. مەنوچەهر نەیویست بەشییر و خوێنڕێژی بیانگیرێتەوە، بەخواهیشت پێشی پێ گرتن. ساڵی ٤٨٥ یان ٤٨٦ ئێلغازی ئارتق ناو بە حەوت هەزار شەڕکەرەوە هەتا نزیک ئانی بەتالان و کـوژتار شـالاوی برد. مـەنوچەهر سـوپاهێکی پێکەوەنا و گـریگۆری کوڕی واساقی کردە سەرکردە و ناردیە پێش تورکان. لە دوامینی شەڕ و کوژتارێکی قورسدا برای ئێلغازی کە بەدلێر و ئازا ناوی دابوو، کوژرا. ئێلغازی تەنگەتاوبوو شکا و خراپ هەڵات.

تورکەکـان چەند ساڵێـک لە دوای ئەو شەڕە چوونە سـەرخاکی ئارارات و تالانیـان کرد. مەنوچەهر بۆ خۆی لەشکری بردە سەریان و گریگۆری کردە سپەهبود. بۆ مـردنی گریگۆر، چەند ڕۆژێـک مـیللەتی ڕەشپـۆش کرد. لە دوای ئەو شەڕە، گرانی و نەبوونی کەوتە شاری «ئانی»یەوە خەڵکێکی بێژمار لە میللەتی ئەو شارە بەبرسیەتی مردن.

## کوژتنی ئەبونەسری برای مەنوچەهر

کیسرەوی لە بەخشی سێیەم و لاپەڕە ٦٢ لە وارتان مێژوونووسی ئەرمەنی وەردەگرێ کە ساڵی ٤٩٨ یان ٤٩٩ قزلّ ناو تورکێک لە پشێوی کوردستان و شۆڕشی ئێران دەرفەتی دی و هەڵمەتی بردە سەر شاری «لورە» کە نزیک تفلیس بوو و لەسەر دووین و لە دەست ئەبونەسری برای مەنوچەهردا بوو. ئەبونەسر لە دووین لەشکری هەڵگرت و چووە سەر قزلّ لە مەیدانی شەڕدا ئەبونەسر کوژرا دووین و لورە کەوتە دەست قزلّ.

مەنوچەهر لەوە زۆر دڵگیر بوو هەستا چووە کن سوڵتان محەمەدی سەلجووقی، لەشکری لێوەرگرت و لینگی دا سەرقزلّ و بەشەڕ گرتی و بردیە سەر ئەو خاکە کە ئەبونەسری لەسەر کوژرابوو و کوژتی و خوێنی ڕژت و خاکی دووین و لوورەی لە تورک ڕزگارکرد و خستیە دەست خۆی.

مردنی مـەنوچەهر نادیارە و ڕابواردنیشی ئاشکرا نییـە. کیسـرەوی لە مـێژوونووسی ئەرمەنی «ئالیشان» وەردەگرێ کە ساڵی ٥٠٣ یان ٥٠٤ مردووە. لەوە پتر سەربهوردی لە دەستدا نییە.

## شاور ئەبولسواری دووەم کوڕی ئەبولشوجاع مەنوچەهر

مەنوچەهر کە مرد، شاور (شاپور)ی دووەم بەئەبولسوار لەقەب کردبوو،[بوو] بەپادشای ئانی. بەڵام لە دیندا زۆر بەتەعەسووب بوو. لەبەرئەوە نەشیا وەکو بابی دڵی ئەرمەنییان ڕاگرێ و لەگەڵیاندا نەسازا. مانگی نەو (هیلال) کە بەرامبەر بەخاچی تەرساکان نیشانەی ئیسلامی بوو. ناردی لە شاری خلاتەوە بردیە ئانی لە جێگای خاچی گەورە لەسەر گومبەزی کلیسای گەورەی «ئانی» دانا. بەو کارە وێنەچووە، تەرساکانی ڕەنجیدەکردن و ئەرمەنییەکانی لە خۆی دردۆنگ کرد.

لەودەمەشدا تورک دەوروپشتی ئانی وەبەر هەڵمەت و تالان و کوژتار و پێپەستی گرتبوو. شاور هێزی پێشگرتنیانی نەبوو و لە خۆی بێزاربوو. ویستی ئانی بداتە ئەمیری «قاریس» کە تورکێکی سەلجووقی بوو. ئەرمەنییەکان کەوتنە ئەندێشەوە، بەداوویت پادشای گورجستانیان ڕاگەیاند کە زۆر نەیرومەند و بەهێزبوو. بەگژ توغروڵ بەگی کوڕی مەلیکشادا چوو و شکاندبووی و پێنج سەد موسڵمانی بەسێدارەدا کردبوو. کە وەڵامی ئەرمەنییان وەرگرت، داویت بەتالووکە لینگی دا و بەبێ شەڕ ئانی گرت، ئەو کلیسایە کە کرابوو بەمزگەوت کردیەوە بەکلیسا و خاچی لە جیاتی مانگی نوێ دانا و سوپاداری خۆی کە ئەبولەیس بوو لەسەر ئانی داناوە و گەڕاوە گورجستان.

بەقسەی کیسرەوی و وارتان شاور و کوڕەکانی گیران و بەدیل برانە گورجستان و لەوێ دەستبەسەر کران و کەسێکیان نەگەڕاوە ئانی. فەزلوونی کوڕی شاور لەودەمەدا لە خوراسان بوو، نەکەوتەبەر ئەو کێشەیە. دوو کوڕی دیکەی شاور کە خوشچەهر و مەحموود بوون لە پاشان لە دەست گورجیان ڕزگاربوون و گەڕانەوە سەرخاکی خۆیان؛ وەکو لە هاتوودا باس دەکرێن.

## فەزلوونی سێیەم کوڕی شاوری دووەم

فەزلوون کوڕە گەورەی شاور بوو؛ کە بابی گیرا لە خاکی خوراسان ئاگاداری پەیداکرد کە برا و بابی بەدیل چوون. بەتالووکە ڕوو بەئانی گەڕاوە و بەپشتیوانی پادشاکانی کوردی ئازربایەگان و ئومەراکانی ئیسلامەوە، لەشکری کۆکردەوە و چووەسەر ئانی و توند دەورەی دا و تەنگەتاوی کرد. «ئیوائی» و «ئەبولەیس» و ئەرمەنییەکانی ئانی دلێرانە و پاڵەوانانە شەڕیان دەکرد و بۆ پارازتن و بەخێوکردنی ئانی پیاوانە بزووتنەوە. ژن لەگەڵ پیاوان لە مەیداندا ڕووبەڕووی کوردان ڕادەوەستان.

دەورەدان و تەنگە پێهەڵچنینی ئانی درێژەی پێدرا. دانیشتوانی نێو شار لە برسان و نەبوونی و بێ خواردەمەنی لە گیان بێزار و وەرزبوون. ئەوەی لە دەست برسیەتی لە شار هەڵدەهاتن لە دەرەوە کورد دەیکوژتن. لەشکریانی فەزلوون مەیدانی ڕزگاربوونیانی لێ بڕیبوونەوە.

مێژوونوویسەکانی ئەرمەنی ئەو سەربەوردانەیان بەئاخ و ئۆف و داخەوە نوویسیوە و دەڵێن: هەرکەسێک لە دەست برسیەتی لە شار هەڵدەهات و دەردەپەڕی لە دەرەوە موسڵمان بەشییر لەتوپەتیان دەکردن. هێندەیان لەو بێگوناهانە کوژتبوو، ڕووی زەوی و خاک بەخوێن و بەئێسقانی ئەوانە داپۆشرابوو.

دیمتری کوڕی داویت لەودەمەدا پادشای گورجستان بوو؛ هێز و تەوانای ئەوەی نەبوو پێی بکرێ کە یارمەتی ئەرمەنییان بکا.

دەورەدانی ئانی یەک وچان لە ساڵێکی پتر کێشا. خەڵکی ئانی لە گیان و زیندەگانی بێزاربوون. جگە لە زینهارخوازتن چارەیان نەما. وەلامیان دا بەفەزلوون کە بەم مەرجە ئەزیەت بەکەس نەدرێ و ئەو کلیسایەی کە کرابوو بەمزگەوت هەر کلسابێ و دەست لە موقەددەساتی دینی نەدرێ و گوناهانی پێشوو هەموو ببەخشرێن، لەسەر ئەو دەستووره پەیمان گرێ بدرێ، شار بەدەستەوە دەدەن.

فەزلوون هەموو مەرجەکانی پەسندکرد و پەیمانی بەست و بەبێ کێشە چووە نێو شارەوە. سەرەتای ساڵی ٥١٧ لە ئانی سەرلەنوێ پادشاهی کوردی بنەماڵەی شەدادیانی دامەزراندەوە و چووە سەر تەختی فەرمانڕەوایی و دەرگای دادخواهی لە ڕووی ڕەعیەت و میللەت کردەوە. میهرەبانی و نوازش و دڵنیایی میللەتی گەیاندە بەرزترین پایە و ئاسایش و ئاسوودەیی مەملەکەتی داناوە. کیسرەوی لە «سمۆبل»ی مێژوونوویسی ئەرمەنی وەردەگرێ کە: ئاسایش و ئاسوودەیی شار و مەملەکەت و دڵنیایی میللەت گەیشتە پایەیەک کە گەورە و بچووکی میللەت سپاسی فەزلوونیان دەکرد زبانیان ستایش خوویی بوو.

نێوانی سوڵتان محەمەد و مەحموود و توغروڵ بەگی سەلجووقیان لەودەمانەدا بەشەڕ و هەرا دەبەورد و پشێوی و شۆڕش کەوتبووە نێوجەرگەی بنەماڵەیانەوە و ڕێککەوتنیان نەدەبوو. پادشاکانی کوردی ئەحمەدێلیان یاریان بەپادشا و ئومەراکانی سەلجووقی دەکردن (وەکو لە سەربەوردانی ئەحمەدێلیان گوترا). فەزلوون لەو دەرفەتەدا کەڵێنی بەرنەدا و

نەسرەوت. لینگی دا سەرخاک و شارانی دووین و گەنجە و هەردووکی گرتن و خستنیە ژێر فەرمانی خۆیەوە؛ چونکو تەختگای بابوباپیرانی بوو، هێنایەوە دەستی لەلا پێویست بوو. بەوە فەزلۆون گەورەتر ماوە.

سالی ٥٢٤ یا ٥٢٥ کە حەوتەمین سالی پادشاهی فەزلۆونە. «ئەمیر قەرەنی» ناو تورکمان کە بەسەر بدلیسدا دەستی کێشابوو، هەلمەتی بردە سەر فەزلۆون و شاری دووینی لێگرت. فەزلۆون بەلەشکرەوە چووە سەری و لە شەڕدا فەزلۆون برینداركرا. لە دوای چەند ڕۆژێک مرد. کیسرەوی لە بەخشی سێیەم، لاپەڕە ٦٥ دا دەلێ: فەزلۆون بەو برینەوە نەمرد، بەلام لە لایەن هێندێک پیاوانی خاینەوە خەفەکرا و کوژرا.

### ١٣- خۆشچەهر کوڕی شاوری دووەم

لە دوای فەزلۆون خۆشچەهری برای بچووکی بوو بەپادشا؛ بەلام زۆرکەم ژیاوە و بەپادشاهی جوانەمەرگ بووە. کیسرەوی لە بەخشی سێیەمیدا گەلێک لەم پادشاهە دواوە و بەدرێژی سەربهوردانی دەنوویسێ.

### ١٤- مەحموودی کوڕی شاور

لە دوای خۆشچەهر، مەحموود کە لەو گەورەتر بوو، بەپادشاهی دانیشت. ئەو هەموو سەربهوردانە لە سالێکدا ڕوویداوە کە فەزلۆون بەسەردا مرد. کیسرەوی دەلێت: لەودمەدا کە فەزلۆون مرد، مەحموود کە براگەورە بوو لە ئانی نەبووە، کەوا خوشچەهر کە برای بچووک بوو کرا بەپادشا. مەحموود کە گەڕاوەتەوە ئانی، خۆشچەهر بەخۆشی و بەناخۆشی بووبێ تەختی بۆ برا گەورە بەرداوە. ئێمە نە لە دوامین و پایانی پادشاهی خۆشچەهر و نە لە سەرەتا و دەست پێکردنی گوزەران و کاری مەحموود ئاگادارین. بەلام لە کیسرەویمان ئەوەندە دەست کەوتووە کە ئەویش لە «وارتان»ی مێژوونوویسی ئەرمەنی وەریگرتووە کە گوتوویانە: «مەحموود کە بوو بەپادشا کاروباری پادشایی و حکوومەتی ئانی دووچار بەشپرزەیی و دژواری بوو» بەلام ئەم شپرزەیی و دژوارییە چۆن و بۆچی ڕوویداوە نەبێژراوە.

بەقسەی وارتان برا بچووکی فەزلۆون کە دایکی نێوی «قادا» بوو، وەکو لە لاپەڕەکانی پێشوودا باسکرا و کچی پادشای ئەرمەن بوو، لەبەر هەستان و تێکەلی دایکی کە زۆری خۆش دەویست بەهۆی دایکییەوە بۆتە مەسیحی. لە گۆشەی کلیسایەکی گورجستاندا بەڕەبەنی (راهب)ی ڕایبواردووە[ ؟]

## ١٥- فەخرەدین شەداد کوڕی مەحموود

بەپێی قسەی کیسرەوی کە لە (فاروقی) وەرگرتووە، شەداد چەند ساڵ لە پێش ساڵی ٥٤٩دا پادشا بووە و ناردوویە کچی «عیزەدین سەڵتق» خاوەندی ئەرزەڕۆمی خوازیێنی کردووە و پێی دراوە. بەڵام لە پێش گوازتنەوەیدا سەڵتق کچەکەی داوە بەپیاوێکی دیکە.

ئەو کارەی سەڵتق لە شەداد زۆرگران هاتووە و ڕقی لێ بۆتەوە. بۆ تۆڵەئەستاندنەوە دڵی پڕ کینە و ڕق بووە. وەڵامی داوە بەسەڵتق کە گورجی وەرەزیان کردووە و لە تەنگانەدایە و ناتوانێ ئانی لە شەڕی گورجیان بپارێزێ. ئەگەر ئێوە بێن شارەکە بگرنە دەست خۆتان شەداد بەگۆشەگیری دادەنیشێت.

سەڵتق بەوە فریوی خوارد و بەلەشکرەوە ڕووی لە ئانی کرد و چوو. بەڵام شەداد هەروەکو قاقەزی بۆ سەڵتق ناردبوو، قاقەزێکیشی بۆ «دیمتری» پادشای گورجستان نوویسی و بۆ پێشگرتن بەسەڵتق هانی دا.

دیمتری بەبێ ڕاوەستان لینگی دا سەر سەڵتق و کوژتارێکی قورسی لێکرد. سەڵتق و دەستە لەشکرێکی زلی بەدیل گرت و بەتاڵان و ماڵێکی قورسەوە گەڕاوە. فەرمانڕەوا و پادشاکانی ئیسلامی شام و جزیر و دیاربەکر کەوتنە نێوان و تێکۆشان. سەڵتقیان بە سەد هەزار دینار کڕیەوە و ڕزگاریان کرد و سوپاهەکانیشی یەک بەیەک کڕانەوە.

شەداد لە دوای ئەو سەربهورده بەساڵێک پادشاهی کرد. ساڵی ٥٥٠ کەشیشەکانی ئانی ڕوویان لە فەرمانی وەرگێڕا و سەریان بڵندکرد و لەسەر تەختیان هێنا خواروو فەزلوونی چوارەم کە برا بچووکی شەداد بوو لەسەر تەختی دانا و کردیانە پادشای خۆیان. شەداد ناچار لە ئانی دەرکەوت و ڕۆیی بۆ شام و پەنای بردەبەر ئەسەدەدین شێرکۆی مامی سوڵتان سەلاحەدین. چونکو «شادی» بابی شێرکۆ لە وابەستەکانی بابی شەداد بوو. لەبەر ئەو ناسینە شەداد پەنای بۆ شێرکۆ برد.

کیسرەوی لە بەخشی سێیەم و لاپەڕە ٦٧دا دەڵێ: سەلاحەدین ئەیووبی و باب و باپیری دیسان لە ئێل و عەشیرەتی کوردی ڕاوادی و لەگەڵ کوردانی شەدادیان هاوئێل بوون و بەقسەی فاروقی، باپیری سەلاحەدین وابەستە و یەکێک بوو لە پادشایانی شەدادیان. ئەوەی دیاری دەکا، شادی شاری «دووین»ی لەودەمەدا بەرداوە کە ئەمیر «قەرەنی» تورکمان چۆتە سەر دووین و گرتوویە؛ چونکو بۆ کورد دەورێکی پشێو بووە و شپرزە.

**١٦- فەزلوونی چوارەم کوڕی مەحموود**

وەکو گوترا فەزلوون لە دوای شەداد بوو بەپادشا و بەهۆی سەرکێشی کەشیشەکان شەداد لێخرا. بەڵام فەزلوون ٦ شەش ساڵ بەپادشایی ڕایبوارد. کەشیشەکان کاروباری حکوومەتیان بەدەست گرتبوو، لەسەر بوونەیەک کۆبوونەوە و فەزلوونیان لێ خست و لە تەختیان هێناخوار. ساڵی ٥٥٦ بوو کە ئەوە ڕوویدا و ناردیان گریگۆری پادشای گورجستانیان بردە ئانی و شاریان دایێ. فەزلوون ناچار لە ئانی دەرکەوت و پەنای بۆ دزی «بکران» برد کە نزیک «سەری ماری» بوو؛ لەوێ خۆی پارازت. لەوە پتر لە فەزلوون و دوامینی کاری و پایانی بەچی گەیشتووە، ئاگادار نین.

کەشیشەکان کە گریگۆریان بردە ئانی، شار و دز و ئاواییەکانیان دادەستی. ئەویش کردیە نامەردی و بەبێ ڕەحمی و نامیهرەبانانە لەگەڵیاندا بزووتەوە و تالانێکی قورسی لێکردن و هەرکەسێکی لە نەژادی شەدادیان دەست کەوت، گرتنی و ناردنیە گورجستان و «سەعدوون» ناو سەرکردەییێکی خۆی بەسوپا سالاری لەسەر ئەو خاکە دانا و بۆخۆی بەدیلەکانەوە چووە گورجستان.

**١٧- شاهنشای کوڕی مەحموود**

هەرکە دەنگی گرتنی ئانی و گرفتاری شازادەکانی شەدادیان و هەلاتنی فەزلوون و زاڵبوونی گورجیان بەسەریاندا بلاوبۆوە، هەموو موسلمانەکان و ئومەرا و پادشایانی ئیسلام ئەوەیان بیستەوە و پادشایانی کورد و ئەتابەک یولدز و ئومەرای دیکەش کۆبوونەوە و ئەمیر قوتبی شای خلات و هی دیش چوون بەهاواریان و لەشکرێکی قورسی ئیسلام گرداوەری کرد. هێشتا لە سەربهوردی فەزلوون پەنجا ڕۆژ تێنەپەڕیبوو کە ئەو لەشکرە زۆرەی ئیسلام گەیشتە سەر شاری ئانی و دەورەی دا و شەڕیان دەست پێ کرد. لەولاوە گریگۆری پادشای گورجیان هەلمەتی بردە سەریان و پاڵەوانانە و دلێرانە بەگژ ئیسلامدا چوو و کوژتارێکی قورسی کرد و موسلمانانی وەتەنگهێنا و شکاندنی. ئیسلام گەلێک شپرزە و پشێو و پەریشان کران.

ئەو شەڕە یەکە سەربهورد و هەرایەکی زۆر زلی تەئریخی ئیسلامە کە ڕوویداوە و لە چ شەڕێکدا ئیسلام وا شپرزە نەبووە و کوژتاری وای لێ نەکراوە و بەوجۆرە نەشکاندراوە، کە ئەمجارە لە دەست گریگۆردا تووشی بوو.

«سمۆیل» مێژوونووسی ئەرمەنی کە بۆخۆی لەو شەڕەدا بووە دەڵێت: هەشتا هەزار موسڵمان لەو هەنگامەدا شەڕیان دەکرد. ئەوەی لە دەست گورجی و ئەرمەندا بەکوژت چوو بیست و سێ هەزار موسڵمان بوون. جگە لەوانە کە مرد و کوژراوانی ئەملا و ئەولابوون کە لە کەناران کەوتبوون و بیست هەزار کەسی موسڵمان بەدیل گیران.

بەهەرجۆرێک بووبێ، ئەو شەڕ و هەنگامەیە زیانی ئیسلام بوو نەک سوود. لە دوای ئەوەش گەلێک جارانی دیکەش شەڕ و کوژتار و کێشە لەنێوانی ئیسلام و گورجدا ڕوویداوە. ساڵی ٥٥٩ کە ٣ ساڵ پاش هەنگامە گەورەکە، ئەتابەگ یولْدز جارێکی دیکەش لەشکری هەڵگرت و چووەسەر ئانی و بەکوژتار و خوێنڕێژی گرتی و دای بە«شاهنشای کوڕی مەحموود» کە ئەودەمە شاهنشا پێشەوا و سەرهاتی بنەماڵەی شەهریارانی شەدادیانی کورد بوو و لەسەر ئەو خاکە دامەزراندەوە.

کیسرەوی لە بەخشی سێیەمدا و لە لاپەڕە ٧١دا لە «ئالیشان»ی مێژوونووسی ئەرمەنی وەردەگرێ و دەڵێ کە: شاهنشا بە«ئەمیر شا» ناوبراوە. بەختەتی ئەرمەنی لەسەر دیوارانی ئانی کە ساڵی ٥٦٩هـ نووسراوەتەوە ئەم عیبارەتەیە: «ئەمیر سوڵتانی کوڕی ئەمیر مەحموود نەوەی مەنوچەهر» و لە گەلێک نووسراوان و نقووشاندا بە«سوڵتان» ناوبراوە. بەڵام لەنێو ئیسلام و تەئریخەکاندا بەشاهنشا ناسراوە.

ئەو نەقشەی کە لەسەر کاوڵە دیوارەکانی ماونەوە و «ئالیشان» باسی کردوون و کیسرەوی نوویسیوویەتیەوە ئەمانەن: «من کە سوڵتان مەحموودی کوڕی شاوری کوڕی مەنوچەهری شەدادی، بۆ جانفیرازی باپیر و فرزەندانی خۆم، وامان فەرموو کە ببینە دۆستی وەقتای ئەرسی مەسجەر ئەبولعەمران ئوستازگان. مەڕ و وشترکڕین و فرۆشتن هەم لێرەدا فەرمانمان دا کە نەکەن هەرکەس. تەعنە لەم فەرمانە بدات گرفتاری خەشمی خودای تەعالا بێت. في تأريخ سنة خمس وتسعين وخمسمائه». کیسرەوی دەڵێ: لەو فەرمانە وا دەردەکەوێ کە لە مزگەوتدا مەڕ و وشتر فرۆشتن قەدەغەکراوە. بەڵام عیبارەتەکە زۆر وێنەچوو و پشێوە و لەنێوانی «سوڵتان» کوڕی مەحموودە وشەی «کی» کە ئیملای کۆنی «کە»یە و حەرفی ڕەبتە و مێژوونووسەکان بەناویان زانیوە، بەڵام وامان بۆ ئاشکرا بووە کە ناوی «کی - کە - سوڵتان» بووە وەکو: کەیقوباد و کەیکاوس و کەیخوسرەو. هەروەکو ئێستا بەڕاستی لە سەربهوردی شاهنشا ئاگادار بووبین تا ساڵی ٥٧٠هـ پادشاهی کردووە.

کیسرەوی کە لە فاروقی وەرگرتووە دەڵێ: گورجیان مانگی ڕەبیعی یەکەمی ساڵی

(٥٧٠) لینگیان دا سەر ئانی و بەزۆر ئەو شارەیان لە شاهنشا گرت و تالانیان کرد و ویستیان بۆ خۆیان پادشایەکی لەسەر دانێن، بەڵام شاهنشا لینگی دا سەریان و هەڵمەتی برد و بەهێز و تینی خۆی شاری گرتەوە و گورجیانی بەکوژتار دەرکردن و ئانی دیسان هێناوە ژێر فەرمانیەوە. بەڵام نووسراوەکانی سەر دیوارانی ئانی کە مابوون و لە ساڵی ٥٩٥ دا نووسراون بەچاکی وشیارمان دەکاتەوە و تێمان دەگەیێنێ کە شاهنشا تا ئەو ساڵە پادشای ئانی بووە. بەڵام سی شەش ساڵ پادشاهیەی چۆن کردووە و چۆن ژیاوە و گوزەرانی لە چ پایەیەکدا بووە و پایان و دوامینی بەچی گەیشتووە، لە ئێمە نادیارە، لەوە پتر لەم پادشایە ئاگادارنین و وادەزانین کە ساڵی ٥٩٥ پایانی فەرمانڕەوایی شاهنشا و دوامینی بنەماڵەی شەدادیانی کوردی ڕاوادیان بووە لە خاکی ئانی و ئاران و دووین و ئەرمەنستاندا.

بەپێی نووسینی کیسرەوی بەخشی سێیەمی، «شهریاران گمنام» کە لە زەیلی ئەو تەئلیفەیدا بەدرێژی باسی کردووە و لە «ئالیشان» وەردەگرێ، ساڵی ٥٩٦ شاری ئانی لە دەست شاهنشا دەرکەوت و بنەماڵەی شەدادیانی کورد چیدیکە بەسەریدا فەرمانڕەواییان نەکرد. پادشاهی ئانی کەوتە دەست ئەرمەنییان. درێژەی پایانی کاری شاهنشا لە زەیلی بەخشی سێیەمی «شهریاران گمنام»دا دێتە بەرچاو. بەڵام لەلای من لەوساڵەدا شەدادیان لە پادشاهی کەوتوون و پایانی کاریان هاتووە و دوامینیان چی بووە و چۆن لەناوچوون، تاریک و نادیار وونە.

# فەسڵی شەشەم

## شەهریارانی کوردی ڕاودیان

## ئەیووبییان[1]

ئەم بنەماڵەی شاهنشای کوردان لە دووین لەلای کوردانی شەدادیان بوون. شادی لە دەوری مەحموودی کوڕی ئەبولسوار چووە مووسڵ و تکریت.

ئەیووب و شێرکۆی کوڕانی شادی لە نێوەڕاستی ساڵانی ٥٠٠ھ دا چوونەلای نورەدین زەنگی شۆڕش و پشێوی گەرمەی بوو. ساڵی ٥٥٩ھ (١١٦٤م) جارێک و ساڵی ٥٦٢ھ (١١٧٧م) جاری دووەم شێرکۆ و سەلاحەدین -کە جێگای سەربەرزی ئیسلام و کوردن- چوونە میسر. شێرکۆ بوو بەوەزیری «العاضد» و لەناکاو مرد و سەلاحەدینی برازای لە جێی دانیشت و بوو بەوەزیری «العاضد»ی خەلیفەی «فاطمیە» لە میسر و بە«الملک الناصر» لەقەب کرا. ساڵی ٥٦٤ هەموو خاکی میسری گرت. ساڵی ٥٦٥ھ (١١٧١م) «العاضد» لە گیانەلادا بوو، لە خیلافەتی عەزلکرد و خوتبەی بەناوی خەلیفەی عەباسی خوێندەوە و مەزهەبی شافیعی کردە بناغەی سەڵتەنەتی.

ساڵی ٥٦٩ھ (١١٧٤م) بەمردنی نورەدین زەنگی سەلاحەدین بوو بەشاهنشای خاکانی حیجاز و یەمەن و شام و فەلەستین کەوتە ژێر فەرمانییەوە. ساڵی ٥٨١ھ (١١٨٥م) جزیر و مووسڵ و خەلات و شارەزووری کەوتە دەست. ٢٧ی مانگی سەفەری ٥٨٩ھ (٤ مارتی ١١٩٣) سوڵتان سەلاحەدین لە دیمەشق مرد و تیرەی ئەیووبییان هەروەکو لە لیستەی هاتوودا باس دەکرێن دەستیان بەپادشاهی کردووە. مەلیک عادیلی برای سەلاحەدین لە ساڵانی ٥٩٦ھ (١١٩٩م) بەسەر هەموو تیرەکانی ئەیووبییاندا زاڵبووە و ناوی شاهنشاهی پێدرا.

هەروەکو بەڕیز لە لیستەدا دەخرێتە بەرچاوان و تیرەی هەزبانی لە هەولێر لە پێش ئەواندا کە دەستی پێکردبوو، ئەوانیش تیرەیەکی ئەو ڕاوادیانی کوردی موکریانن. ئەمەیە لە هاتوودا باسیان دەکەین کە لە هەولێر حوکمڕانیان کردووە.

---

(١) لێوەرگری ئەم فەسڵە «دول اسلامیە» قسمی چوارەم لاپەڕە ٨٨ - ١٠٦ تەئلیفی «ئستنلەی لەن پوول» بەتورکی تەرجەمەکراوی خەلیل ئەدهەم «دائرە المعارف الاسلامیە» جلدی ئەوەڵ و «ابن الاثیر» و «طبری»یە.

## کوردی ئەیووبییانی میسر

| | هیجری | میلادی |
|---|---|---|
| مەلیک ناسر سەلاحەدینی یووسف کوڕی ئەیووب | ٥٦٤ | ١١٦٩ |
| ......... سولّتان سەلاحەدینی ............ | ٥٦٩ | ١١٧٤ |
| ئەلعەزیز عیمادودین عوسمان ............ | ٥٨٩ | ١١٩٣ |
| مەنسوور محەمەدی عوسمان ............. | ٥٩٥ | ١١٩٨ |
| عادیلی ئەوەڵ سەیفودین ئەبوبەکری ............ | ٥٩٦ | ١١٩٩ |
| کامیل ناسیرودین محەمەدی ......... | ٦١٥ | ١٢١٨ |
| عادیلی دووەم سەیفودین ئەبوبەکری ............ | ٦٣٥ | ١٢٣٨ |
| ساڵح نەجمودین ئەیووبی کوڕی کامیلی .......... | ٦٣٧ | ١٢٤٠ |
| موعەززەم توورانشای مەنسووری خەلیلی ............ | ٦٤٧ | ١٢٤٩ |
| شەجەرەتوودوڕ (ژنی ساڵح نەجمودین ئەیووب)[١] | ٦٤٨ | ١٢٥٠ |
| ئەشرەف موزەفەرەدین مووسا ............... | ٦٤٨-٦٥٠ | ١٢٥٠-١٢٥٢ |

سەرنج: مەملووکانی میسر بەسەریاندا زاڵبوون

## کوردی ئەیووبییانی دیمەشق

| | هیجری | میلادی |
|---|---|---|
| فەزل نورودین عەلی ................. | ٥٨٩ | ١١٩٣ |
| عادیلی ئەوەڵ سەیفودین ئەبوبەکر .......... | ٥٩٢ | ١١٩٧ |
| (لەگەڵ میسر بوونەوە یەک) | ٥٩٦ - ٦١٥ | ١١٩٩-١٢١٨ |
| موعەززەم شەرەفودین عیسا ............... | ٦١٥ | ١٢١٨ |
| ناسر سەلاحەدین داود .................. | ٦٢٤ | ١٢٢٧ |
| ئەشرەف موزەفەرودین مووسا (میافارقین)ە | ٦٢٦ | ١٢٢٨ |
| ساڵح عیمادودین ئیسماعیل ............. | ٦٣٥ | ١٢٣٧ |
| کامیل محەمەد (لە ئەیووبییانی میسر)ە ........ | ٦٣٥ | ١٢٣٧ |

---

(١) بەناوی «شجرة الدر» لەسەر مینبەران خوتبە خوێندراوە و لەسەر دراو بەمجۆرە سککەی بەناوی لێدراوە: «المستعصمية الصالحية، ملكة المسلمين ووالدة الملك المنصور خليل».

| | | |
|---|---|---|
| عــادیلی دووەم (لە ئەیووبییــانی مــیســـر)ە | ٦٣٥ | ١٢٣٧ |
| سالْح نەجمودین ئیسماعیل (لە ئەیووبییانی میسر)ە | ٦٣٧ | ١٢٤٠ |
| سـالْح عـیـمـادودین ئیـسـمـاعـیل (جاری دووەم) | ٦٣٧ | ١٢٤٠ |
| ســالْح نەجــمــودین ئەیووب (جــاری دووەم) | ٦٤٣ | ١٢٤٥ |
| موعـەززەم تورانشـا (لە ئـەییووبییـانی میـسرە) | ٦٤٧ | ١٢٤٩ |
| ناسر سەلاحەدین یووسف (ئەیووبییـانی حەلەب) | ٦٤٨ - ٦٥٨ | ١٢٥٠-١٢٦٠ |

سەرنج: مەغۆل بەسەریاندا زالْ بوون

## کوردی ئەیووبییانی حەلەب

| | هیـجری | مـیلادی |
|---|---|---|
| زاهیـر غـیـاسودین غـازی کـوڕی سـەلاحـەدین | ٥٨٩ | ١١٩٣ |
| عـەزیز غـیـاسودین مـحـەمـەدی کـوڕی زاهیـر | ٦١٣ | ١٢١٦ |
| ناسـر سـەلاحەدیـن یووسـفی کـوڕی عـەزیز مـحـەمـەد (ئەیووبییانی دیمەشق) | ٦٣٤-٦٥٨ | ١٢٣٦-١٢٦٠ |

سەرنج (١): ناسر و زاهیر غازی، کوڕانی عەزیز، مانگی جەمادی ئەوەڵ (٦٥٩) هۆلاکۆ کوژتنی و عەزیز کوڕی ناسر بەدیل چوو

سەرنج (٢): مەغۆل بەسەریاندا زاڵبوون.

## کوردی ئەیووبییانی بەعلەبەک

| | هیـجری | مـیلادی |
|---|---|---|
| نەجـــمـــودین ئەیووب | ٥٣٣-٥٤١ | ١١٣٩-١١٤٦ |
| مـوعـەززەم تـوورانشـا کـوڕی نەجـمـودین ئەیووب | ٥٧٤ | ١١٧٨ |
| عیزەدین فەروخشا کوڕی شاهنشا ................ | ٥٧٥ | ١١٧٩ |
| ئەمجەد بەهرامشـای کوڕی فەڕوخشـا ............ | ٥٧٨ | ١١٨٢ |
| ئەشرەف مـوزەفەرودین مـووسای کوڕی عـادیلی ئەوەڵ | ٦٢٧ | ١٢٣٠ |
| سـالْح عـیـمـادودین ئیـسـمـاعـیل ............... | ٦٣٥ | ١٢٣٧ |
| سالْح نەجمودین ئەیووبی کوڕی کامیل (ئەیووبییانی میسر) | ٦٤٤ | ١٢٤٦ |
| والی ئەیووبیـیـان ......................... | ٦٤٧-٦٥٨ | ١٢٤٩-١٢٦٠ |

سەرنج: مەغۆل بەسەریاندا زاڵبوون.

## كوردی ئەیووبییانی حەما

| | هیجری | میلادی |
|---|---|---|
| موزەفەر تەقیودین عومەری کوڕی نوورودین شاهنشا | ٥٧٤ | ١١٧٨ |
| مەنسوور محەمەدی کوڕی موزەفەر تەقیودین ........... | ٥٨٧ | ١١٩١ |
| ناسر قلیج ئەرسەڵان کوڕی مەنسوور محەمەد .......... | ٦١٧ | ١٢٢٠ |
| موزەفەر تەقیودین مەحموود کوڕی مەنسوور محەمەد ..... | ٦٢٦ | ١٢٢٩ |
| مەنسوور محەمەدی کوڕی موزەفەر تەقیودین | ٦٤٢ | ١٢٤٠ |
| موزەفەری سێیەمی مەحموودی کوڕی مەنسووری دووەم | ٦٩٨-٦٨٣ | ١٢٩٨-١٢٨٤ |

**کوردی ئەیووبییانی حەما کە لەلایەن مەملووکانی میسرەوە کران بەپادشا.**

| | | |
|---|---|---|
| موئەیەد عیمادودین ئیسماعیل ئەبولفیدا | ٧١٠ | ١٣١٠ |
| ناسرودین محەمەد (ئەفزەل) . | ٧٤٢-٧٣٣ | ١٣٤١-١٣٣١ |

## کوردی ئەیووبییانی حومس

| | هیجری | میلادی |
|---|---|---|
| محەمەد کوڕی ئەسەدودین شێرکۆی کوڕی شادی | ٥٧٤ | ١١٧٨ |
| موجاهید شێرکۆی کوڕی محەمەد | ٥٧١ | ١١٨٥ |
| مەنسوور ئیبراهیمی کوڕی موجاهید شێرکۆ | ٦٣٧ | ١٢٣٩ |
| ئەشرەف موزەفەرودین مووسای کوڕی مەنسوور | ٦٤٤ - ٦٦١ | ١٢٤٥ - ١٢٦٢ |

سەرنج: مەملووکانی میسر بەسەریاندا زاڵبوون

## کوردی ئەیووبییانی میافارقین (جزیره)

| | هیجری | میلادی |
|---|---|---|
| ئەوحەد نەجمودین ئەیووبی کوڕی عادیلی کوڕی ئەیووب | ٥٩٦ | ١٢٠٠ |

---

(١) ئەبولفیدا موئەریخی بەناوبانگی کوڕی موزەفەری عەلی کوڕی موزەفەری دووەم کوڕی تەقیودین مەحموود کوڕی مەنسووری ئەوەڵ کوڕی موزەفەری ئەوەڵ کوڕی نوورودین شاهنشا برای سوڵتان سەلاحەدین بوو. کوڕی نەجمودین ئەیووب کوڕی شادی.

| | | |
|---|---|---|
| ئەشرەف موزەفەرودین مووسای کوڕی عادیلی ئەوەڵ | ٦٠٧ | ١٢١٠ |
| موزەفەر شەهابودین غازی | ٦١٧ | ١٢٢٠ |
| (زاڵبوونی مەغۆل بەیەکجاری نا ) | ٦٢٧ | ١٢٣٠ |
| کامیل ناسرودین محەمەد کوڕی موزەفەر شەهابودین غازی | ٦٤٢-٦٥٧ | ١٢٤٤-١٢٦٠ |
| سەرنج: مەغۆل بەسەریاندا زاڵبوون | | |
| خەلیلی دووەمی کوڕی سلێمانی ئەوەڵ | ؟ | ؟ |
| سلێمانی دووەمی کوڕی خەلیلی دووەم | ؟ | ؟ |
| خەلیلی دووەم (جاری دووەم) | ؟ | ؟ |
| حوسێنی کوڕی خەلیلی دووەم | ؟ | ؟ |
| سلێمانی دووەم (جاری دووەم) | ؟ - ٩٣٠ | ؟ - ١٢٥٤ |
| سەرنج: عوسمانی بەسەریاندا زاڵبوون. | | |

## کوردی ئەیووبییانی حەسەنکیف

| | هیجری | میلادی |
|---|---|---|
| ساڵح نەجمودین ئەیووبی کوڕی کامیلی کوڕی عادیلی ئەوەڵ | ٦٢٩ | ١٢٣٢ |
| موعەززەم تورانشای کوڕی ساڵحی نەجمودینی ئەیووب | ٦٣٥ | ١٢٣٧ |
| موەحەد تەقیودین عەبدوڵلای کوڕی موعەززەم تورانشا | ٦٤٨ | ١٢٥٠ |
| «مەغۆل بەسەریاندا زاڵبوون » | ٦٥٨ | ١٢٦٠ |
| کامیل ئەبوبەکری ئەوەڵ کوڕی عەبدوڵلا ......... | ؟ | ؟ |
| عادیل موجیرودین محەمەدی کوڕی ئەبوبەکر ....... | ؟ | ؟ |
| عادیل شەهابودین غازی کوڕی محەمەد ............. | ؟ | ؟ |
| ساڵح ئەبوبەکری دووەمی کوڕی غازی ١٣٨٨ | | ٧٨٠ |
| عادیل فەخرودین (عیزودین) سلێمانی کوڕی غازی | ٧٨٠ | ١٣٧٨ |
| ئەشرەف شرەفودین ئەحمەدی کوڕی سلێمان | ؟ | |
| ساڵح (لە دوای کامیل) سەلاحودینی کوڕی خەلیلی | ٨٣٦ | |
| کوڕی عوسمانی کوڕی ئەحمەد | | ١٤٣٤ |

| | | |
|---|---|---|
| ناسر کوڕی خەلیل کوڕی عوسمانی کوڕی ئەحمەد | ٨٥٦ | ١٤٥٢ |
| کامیل ئەحمەدی دووەمی کوڕی خەلیلی کوڕی ئەحمەد | ٨٥٦ | ١٤٥٢ |
| ٨٦٦ عادیل خەڵەفی کوڕی محەمەدی کوڕی ئەحمەد | ٨٦٦ | ١٤٦١ |
| سەرنج: ئاققوینلوویان بەسەریاندا زاڵبوون | | ١٤٦١ |

## کوردی ئەیووبییانی کەرەک

| | هیجری | میلادی |
|---|---|---|
| عادیلی ئەوەڵی کوڕی نەجمودین ئەیووبی ئەوەڵ | ٥٨٤ | ١١٨٨ |
| موعەززەمی کوڕی عادیلی ئەوەڵ | ٥٩٢ | ١١٩٥ |
| ناسر داودی کوڕی موعەززەم عیسا | ٦١٥ | ١٢١٨ |
| موغیسی فەتحودین عومەری کوڕی کامیل کوڕی عادیلی ئەوەڵ | ٦٦١ - ٦٤٨ | -١٢٤٩ ١٢٦٣ |

سەرنج: مەملووکی میسر بەسەریاندا زاڵبوون

## کوردی ئەیووبییانی یەمەن

| | هیجری | میلادی |
|---|---|---|
| موعەززەم شەمسودین تورانشای کوڕی نەجمودینی ئەوەڵ | ٥٦٩ | ١١٧٣ |
| سەیفولئیسلام تەغتگین ئەحمەدی کوڕی نەجمودینی ئەوەڵ | ٥٧٧ | ١١٨١ |
| موعیزودین ئیسماعیلی کوڕی تەغتگین | ٥٩٣ | ١١٩٦ |
| ناسر ئەیووبی کوڕی تەغتگین | ٥٩٨ | ١٢٠١ |
| موزەفەر سلێمانی کوڕی شاهنشای کوڕی موزەفەری کوڕی نورودین شای کوڕی نەجومدینی ئەوەڵ | ٦١١ | ١٢١٤ |
| مەسعود سەلاحودینی یووسفی کوڕی کامیل محەمەدی کوڕی عادیلی ئەوەڵ | ٦٢٦-٦١٢ | ١٢٢٩-١٢١٥ |

سەرنج: بەنی ڕەسووڵ بەسەریاندا زاڵبوون.

وێنەیەکی جوانی و شەنگی ژنی موکریان ساڵی
١٩٢٨م لە سابڵاخ وەرگیراوە

مەجید میرخان موکری

نموونەی عولەمایەکی موکریان (مەلا محەمەد سەعید سەدر ئەلعولەما) مانگی تەمووز ١٩٣٧ وەفاتی کرد

وێنەیەکی پەهلەوانی موکریان (میرزا فەتاح قازی و کوڕێکی) سالی ١٩١٤ وەرگیراوە. مانگی کانوون ١٩١٥ روس شەهیدی کرد

سەردار موکری (محەمەد عەلی خان) بە بەرگی پەهلەوییەوە ساتی ١٩٣٠ وەرگیراوە

نموونەیەکی بەرگی کوردیی موکریان (قەرەنی ئاغای مامەش)

## چەند ڕوونکردنەوەیەکی پێویست

ئەم بەرهەمە بەنرخەی بەردەست سێ بەش دەگرێتە خۆی، کە هەر بەشەی بەسەردێری یەکەم بابەتی دەبەستمەوە:

١) پشێوی ورمێ.

٢) ئێران بارزانییەکان دەردەکات.

٣) شێخ ئەحمەد بارزانی و خزم و براکانی لە سورگومیدا.

بەشی یەکەم و دووەم لەنێو توێی پەڕاوێکی سەربەخۆدا نووسراونەتەوە و بەدوا بەرهەمی بیری بەهەشتی داماو (حوسێن حوزنی) موکریانی مامم دەژمێردێت؛ چونکە پێشەکێکەی لە ١ی ئەیلوولی ١٩٤٧دا تەواو کردووە و لە ١٩٤٧/٩/٢٠دا لە بەغدا دوامالاوایی لە دونیای ڕۆشن کردووە.

لەم دوو بەشانەدا هێندێک باس هەن لێک دابڕاون بەهۆی هاتنە نێوەوەی هێندێک بابەتانی دی؛ وەیا هێندێک بابەت هەن دووپات کراونەتەوە؛ ئەویش لەبەر جیاوازی سەرچاوەکانی دووبارەی کردوونەتەوە. بەڵام ئێمە دەستکاریمان نەکردوون و هەروەکو خۆیان لە شوێنی تایبەتی خۆیدا بڵاومان کردوونەتەوە.

لە کۆتایی بەشی دووەمدا هێندێک زانیاری نهێنی لەشکری عیراقی تۆمار کردووە کە پێوەندی ڕاستەوخۆی بەبزووتنەوەکانی بارزانەوە هەیە. دەبێت سەرچاوەی زانیارییەکانی چەند ئەفسەرێکی کورد بووبن؛ نەک دەزگەکانی ڕاگەیاندن.

بەشی سێیەمی ئەم چاپکراوە بەشێکە لە دەستنووسێکی دی تایبەت، لە بارەی مێژووی«بارزان»ە، بەڵام بەداخەوە هەر ئەوەندەیان پارێزراوە وماوە.

نووسەری ئەم بەرهەمەی بەردەست لە ساڵی ١٩١٤دا چاپخانەیەکی لە ئەڵمانیا کڕیوە و لە ساڵی ١٩١٥دا لە شاری حەلەب دایمەزراندووە و لە ساڵی ١٩٢٥دا هێناویەتە ڕواندوز و لە دواییدا گوێزراوەتە شاری هەولێری دێرین و تا ئەمڕۆش هەر ماوە. ئەم ئامێرەی چاپە بەیەکەمین ماکینەی چاپ دەژمێردرێت کە لە لایەن کوردێکەوە کڕابێت و لە کوردستاندا دامەزرابێت و لە ڕاژەی ڕۆشنبیری کوردیدا بووبێت. بەهەشتیان حوسێن حوزنی مامم و گیوی باوکم بۆ یەکەمین جار ئامێری وێنەگرتنیان هێناوەتە کوردستان و وێنەی گەورەپیاوان و ڕۆشنبیرانی کوردی سەرتاپای کوردستانیان پێ گرتووە.

بەهەشتی حوسێن حوزنی بەیەکەمین مێژوونووس دەژمێردرێت کە مێژووی کوردی بەزمانی کوردی نووسیوەتەوە.

حوسێن حوزنی لەو زانا تاک و تەرایانەیە کە بۆ کورد ژیاوە و ڕاژەی ڕۆشنبیری کوردی نە بۆ پارە و پوول و نە بۆ پلەوپایە کردووە؛ بەڵکو بەپێچەوانە، ئەم ڕێڕەوەی ژیانی زۆرترین دەرفەتی کار و سەودا و ماڵداریتی لە دەست چوواندووە و دووچاری دەردەسەرێکی زۆری کردووە.

گرنگی ئەو بەرهەمە لەوەدا خۆی دەنوێنێت، کە لەلایەن مێژوونووسێک و ڕۆژنامەنووسێکەوە نووسراوە، کە نرخی ڕووداوەکانی سەردەمی خۆی زۆر لەلا گرنگ بووە، بۆیە ڕۆژ بەڕۆژ لەگەڵیاندا ژیاوە و بەئەمانەت هەموویانی تۆمار کردووە، ئەمە لە کاتێکدا لە کوردستان دوورخرابۆوە و لە بەغدا دەستبەسەر بوو، نووسینی ئەم جۆرە بابەتانەش قەدەغە بوون. یانی سزای دوورخستنەوە و دەستبەسەریش نەیانتوانیوە ڕستەی ڕاژەکردنی نووسینی مێژووی کوردی لێ بپسێنن.

بەرهەمی بەردەست لە بواری ڕۆژنامەگەریی کوردیدا بەیەکەمین بابەتی ڕۆژنامەنووسیی دەژمێردرێت، چونکە بەگشتی ژێدەرەکانی جگە لە خۆی دەستگەکانی ڕاگەیاندنی ئەوسا (ڕۆژنامە، کۆڤار و ڕادیۆ) بوون و هەروا لەوەشدا بەیەکەمین بەرهەم دادەندرێت کە بزووتنەوە و ڕووداوەکانی کوردی لە کاتی خۆیدا بابەتانە و زانستانە تۆمار کردووە.

ڕێزدار کاک مەسعود بارزانی لە ١٩٩٧/٧/١٧دا لەگەڵ من و د. جەمال دا بەم جۆرە لە بەهەشتی حوزنی دوا: لە ساڵی ١٩٧١دا لە لەندەن بووم. نازانم چۆن هاملتون زانی من لەوێم و هەولێدا من ببینێت. لەو باسانەی کە لە گەڵمدا کردی، باسی مامی تۆ بوو، خوشکە کوردستان! هاملتۆن گوتی: حوسێن حوزنی زۆر خزمەتی میللەتی کوردی کردووە؛ کورد قەرزداریتی. جا جەنابی ڕووی لە ئێمە کرد و فەرمووی: ئێوە چ دەخوازن تا بۆ ئەم ڕۆژنامەنووس و مێژوونووسەی بکەین؟

لە وەڵامدا گوتم مۆزەخانەیەک بەنێوی مامم و باوکم بکرێت و هەموو کەرەستەکانی چاپ، وێنەگرتن و بەرهەمانی بیری سەدان نووسەرانی کوردی و.... تێدا بپارێزرێت. جەنابی ئەو پێشنیازەی بەخۆشییەوە پەسند کرد و لەسەر داخوازییان لە ١٩٩٧/٧/١٩دا داواکارێکم پێشکێش بەوەزارەتی ڕۆشنبیری کرد بۆ دامەزراندنی ئەو مووزەخانەیە، بەڵام لەبەر هێندێک هۆی لاوەکی تا ئێستە نەتواندراوە هەنگاوێکی ئەوتۆ بۆ ئەم پرۆژەیە بنرێت.

د.کوردستان موکریانی
هەولێر ١/١/ ١٩٩٩

# بەکورتی هەڵکەوتی دیرکی لە کوردستاندا

## لە ڕۆژنامە و پەیمانەکاندا

تەئلیفی: حوسەین حوزنی موکریانی
لە بەغدا ١٩٤٧

بەکورتی ئەم هەڵکەوتانەی لە نێوانی یەک دوو ساڵدا کە لە کوردستان بەسەر کوردەکاندا هاتووە، وە لە ڕۆژنامە و زمان و قسەی پیاوانی باوەڕ پێکراوانەوەم کۆ کردوونەوە، وە هەرچیکی جێگای ئیعتیماد بێ، لەم نامەدا گەیاندوومنەتە یەک و کردوومەتە ئەم نامەیە. وە هەر بەسەرداهاتوو و ڕووداوێک کە وەرمگرتبێ، جێگالێ وەرگرتووەکەم نیشان داوە؛ بۆ ئەمەی ڕاست یا چەوت کە وەرگیرا بێ، بخرێتە عوهدەی جێگا لێ وەرگیراوەکەوە. چونکە من تەنیا هەر خەریکی وەرگرتن و نووسینەوەیێک بووم کە دواتر لە ڕۆژنامە و بەیانەکاندا ڕەسمی بڵاوکراوەتەوە. من خۆم وشەیێکم لە لایەن خۆمەوە نەخستۆتە سەر. وە مەبەستیشم لە نووسینەوەی ئەم نامەیە، تەنیا مانەوەی ئەم هەڵکەوت و سەربهوردانە بۆ لاپەڕەیێکی تەئریخییە بۆ چەندان سەدەی هاتوو؛ نەک بۆ ئەمڕۆ و سبەینێ.

موئەللیف:
حوسێن حوزنی موکریانی
بەغداد ١- ئەیلوول ١٩٤٧

## بەشی یەکەم

### پشێویی ورمێ(1)

ڕۆژی ٣٠ سێیەمی مانگی ئازەر تەشرینی دووەم ١٣٣٤ لە تەورێزەوە سەرهەنگ ئەحمەد زەنگنە و عومەر خان شکاک چوونە ورمێ.

### پاسگای قوشچی

دیموکراتەکان لە هەموو لایێکەوە خەریکی ڕێکی و دامەزراندنی نیزامی بوون؛ هەرواش لە ورمێ دەستیان دابوویێ. لە ڕۆژانی ٢٠ ی ئەسفەند (شوبات) دا یەکەم پاسگا کە لەلایەن دیموکراتییانەوە دەورە درابوو، پاسگای قوشچی بوو. دانیشتوانی ئەو پاسگایەکە مەئمووری حکوومەتی بوون، چەند جار هاواریان لە ورمێ کرد؛ یارمەتییان خواست؛ بێ سوود بوو. لە پاشان دیموکراتییەکان لە ژاندارمەی ورمێ دەخوازن کە ئوتمۆبیلی لۆری و ئەفسەرێک و چەند کەس نیزامی بنێرن با ئەوانە لە دەورەدان ڕزگارکەن.

لەسەر ئەوە فەوجی ژاندارمەیی لۆرییەک و ئەفسەرێک و سێ ژاندارمە ساز دەکا بیاننێرێ؛ بەڵام چونکە دوروپشت و دێهاتی شار زۆر پشێو بوو، ئەوەش پێک نەهات.

سەرهەنگ زەنگنە دوو پیاوی گەورە دەنێرێتە دوویان کە بگەڕێنەوە ورمێ و بەهەموو ئاوایی و پاسگاکان ڕادەگەیەندرێ چۆڵی کەن و خۆ بگەیننە نێو شارەوە.

لەم کاتەدا کە کاربەدەستانی حکوومەتی لە پاسگایەکان دەردەکەون بگەڕێنەوە ورمێ، لە پاسگادا ٦٧ کەس هەبوون، کە هەموویان مەئموور بوون، دەورەدرابوون وە تەنگەیان پێ هەڵچنرابوو. ئەوانیش بەرهەڵستیان دەکرد. سەرهەنگ زەنگنە بەلەز دوو پیاوانی ناردن کە فریاکەون. دوو تانک و دوو ئوتمۆبیلی زرێدار و چەند کەسێکی جەنگی ناردن. کە بەهاواریانەوە بچن.

ڕۆژی ٢٥ی ئازەری ١٣٢٤ هەردوو تانک و هەردوو ئوتمۆبیلی زرێدار لە ورمێ دەرکەوتن. کە نیو فرسەنگ لە شار دوورکەوتنەوە، تەماشایان کرد کەوا زێڕۆ بەگ و

(١) لە ڕۆژنامەی جیهانی پاک. ژمارە(...) وەرگیراوە.

هەزاران کوردی جەنگی دەست بەتفەنگ هاتن و پێشیان پێگرتن. شەڕ وگوللە و ئاگرباران دەستی پێ کرد. لە پایاندا تانکێک لە کارخرا و لە دوای ٢٤ سەعات تانکی دووەم و دوو زرێدارەکان بەشپرزەیی گەڕانەوە ورمێ.

بەڵام ئەو ٦٧ کەسی لە بالانش دەورەدرابوون، زۆر چاک شەڕیان دەکرد. لە ئەنجامدا ٢٨ کەسیان لێ کوژرا و پاسگای بالانش خۆی بەدەستەوە دا. زێڕۆ بەگ بەدەمانچە هەڵیکوتایە سەر حاجی عەلی خان شووشەوانی کە بیکوژێ، بەڵام دایکی زێڕۆ بەگ بۆی دەپارێتەوە و ڕزگاری دەکات لەوێوە هەموویان دەبەن بۆ ورمێ. لە ڕێی زەریاوە بۆ تەورێزیان بەرێ دەکەن.

## دەورەدانی ورمێ

کوردەکان لە هەموو لایێکەوە پاسگاکان داگیر دەکەن و پەلامار دەبەنە سەر ورمێ. سەرهەنگ زەنگنەی فەرماندەی پادگان و سەرهەنگ نووربەخش فەرماندەی ژاندارمە، کۆمەڵەیەک دەبەستن، لەم بابەتەوە قسە دەکەن. بەمە بڕیار دەدەن کە ژاندارمە تێکەڵ بەهێزی پادەگان بێ. لەسەر ئەوە ناوچەی هەنگی خۆیان چۆڵ دەکەن و گواستیانەوە و چوونە خانووبەرەی بێ سیم.

## سێ زرێداری پڕ چەک

لە دوای ئەوە کە ئەو دوو هەنگ بوون بەیەک، بەتێکەڵاوی هەموو دەروازەکانی شاریان پارازت و بەدانیشتوانی شاریشیان ڕاگەیاند کە هەر کەس غەیرە نیزامی و بێگانە ببینن، بیگرن و بیبەنە هەنگ؛ ئەگەر خۆیان بەدەستەوە نەدا، بیانکوژن. ئەوە بۆ ئەوە بوو کە هەر کوردێک بووە.

بەڵام بەبەراوەژووی ئەمر ڕوویدا؛ دانیشتوانی شار لە هەر لایەکەوە ژاندارمەیان بدیبایە دەیانکوژت. بەڕاستی ئازاری ژاندارمە زۆر درا، داخ و کوڵی کۆنەیان پێ ڕشتن. چونکە ژاندارمە میللەتی زۆر ڕەنجیدە و عاجز کردبوو لە حکوومەت.

ڕۆژی ٢٤ ی ئازەری ١٣٢٤ ژاندرمەکان -کە لەبەردەرگای زەنجیر (دەروازەی شار) پاسیان دەکرد- تەماشایان کرد کەوا سێ ئوتمۆبیلی زرێدار هاتن. هەموو پڕ کرابوون لە چەکی جەنگی. ڕایاندەگرن و بەسەرهەنگ زەنگنە ڕادەگەیێن. سەرهەنگ زەنگنە فەرمان دەدا کە بیانبەنە پادگان. بۆ ئەوە سێ کەس دەکەنە مەئمووریان. لە پاشان وەڵام دەردێ کە

ئەوانە لەشکری سوورن، کە ئەو کاتە لە ئێراندا بوون. ئەوانیش ناهڵێن زرێدارەکان ببەن.

سەرهەنگ تانکێک دەکاتە مەئموور کە لە پشت کووچەکانەوە بچێ پشت لە زرێدارەکان بگرێ و ناچاری کا خۆ بدەنە دەست زرێدارەکان ببەنە پادگان. لە دوای کێشە و هەرا، دوو زرێدار دەبرێنە پادگان و هی سێیەم ڕووسەکان بۆ خۆیان دەبەن. ئەو دوو زرێدارانە پڕ بوون لە چەکی جەنگی نیزامی.

دانیشتوانی شار کە ئەوەیان زانی بەجارێک وەرگەڕان، ڕوویان بەبەر حکوومەت نا. ڕووسەکان تا ڕۆژی ٢٥ ی ئازەری ١٣٢٤تێکەڵ بەهیچ کارێک نەدەبوون. بەڵام لەو ڕۆژە بەدوا، ڕووس تێکەڵ بەهەموو کارێکی هاتووەپێش بوون.

یەکێک لە مهاجیرانی قەوقاز لەلایەن مودیری شورتەوە گیرابوو؛ دەیانبردە مەرکەز. لە ڕێگادا چەکی پێ بوو شورتەکەی گوللەباران کرد. گوللەیەک لەناکاو دەرچوو لە پەنجەرەیەکی دا کە ڕووسی تێدا بوو. ئەوە بوو بەمایەی ئەمە، کە جەنڕاڵی ڕووس فەرمانی دا کە دەستەی لەشکر بەنێو شاردا بگەڕێن بۆ ئاسایشت. لەو ڕۆژەوە شار کەوتە دەست دیموکراتییانەوە. ڕووسەکان لە جێگاکانی خۆیان دەرکەوتن و هەموو دایرە و پۆستە و جێگاکان دەخەنە ژێر فەرمانەوە. باغی فەلاحەت -کە ناوچەی پادگان بوو- دەورە درا. ئەو شەوە تا ڕۆژ چەک لە کاردابوو؛ فیشەک ویزەی دەهات و تفەنگ و چەکە زلەکان شریقە و تەقەوتۆقی بەگرمە بوو. ئوتمۆبیل و تانک و زرێدار لە هاتوچووندا بوون. هەموو شار پڕ کرا لە فیدائی. بۆ سبەینێ زاندرا کەوا هەموو شار داگیر کرا و کەوتە ژێر فەرمانی دیموکراتییانەوە. ڕۆژی دووەم دەست کرا بەژاندارمە کوشتن تا نزیک چوار سەد و سی ژاندارمە کوژرا.

## گرتنی سەرهەنگ زەنگنە

سبەینێ دوو قاقەز بۆ زەنگنە و نووربەخش ناردران کە ئیمزای کەن. ئەوانیش بەناچاری ئیمزایان کرد. دەستبەجێ گیران و خرانە ژێر چاودێری دیموکراتییانەوە. ڕۆژی ٢ی دەیماه ٤ی کانوونی یەکەم، هەردوو سەرهەنگیان بەگرتوویی لە ڕێگای زەریاوە بردە تەورێز کە محاکەمە بکرێن. سەرهەنگ زەنگنە تا ڕۆژی گرفتاری هەر لە کۆششت و تەقەلادا بوو.

(٢) لە نامەی هەفتەی جیهانی پاک. ڕۆژی یەکەمی فەروەردین ١٣٢٦/ ٣١ی مارت ١٩٤٧ ژمارە /م ٧ (٦٩) وەرگیراوە.

## لەو کاتەدا کوردەکان چییان کرد

لە دوای ئەوە کە دیموکراتەکانی ئازەربایجان بەسەر ورمێدا دەستەڵاتیان پەیدا کرد، دەستە کوردە پڕ چەکەکان دەچرژانە نێو شارەوە و لە چەک و پێویستی جەنگ هەرچییان دەستکەوتبایە تالانیان دەکرد و خەریکی دەستوبرد و دەستەڵات پەیداکردن بوون بەسەر ئازەربایجانییەکاندا. لە هەموو لاوە تێیان ڕوودەهاتن و لە دەستەڵاتیان دەخستن و هەر چەک و ئامرازی جەنگییان کە پێ دەدرا و هی ماویان دەست کەوتبوو، کوردەکان لێیان دەستاندن.عەزیمی (عظیمی) دادگوستەری (عدلیه) لە تەورێزەوە دەچێتە ورمێ لە بەلەدیە خەڵکێکی زۆر لە فیدایی و دانیشتووی شار کۆدەکاتەوە؛ وتاریان بۆ دەدا. لەوددەمەدا دەستێکی کوردی پڕ چەک دەچنە ژوورەوە و فیدایی و ئەهالی هەریەکە بەلایەکدا هەڵدێن. ئاغای عەزیمی هەر ئەوەندەی پێ دەکرێ خۆی داوێتە پشت مێزی وتارەوە. کوردەکان هەرکەسی بەچەکیان دەکەوێتە چاو، دایدەپلۆسن و چەکی دەکەن. کە تەماشا دەکەن ئەوا وەزیر لە پشت مێز خۆی شاردۆتەوە و هاوار دەکا، کە من وەزیری عەدلییەم چتان لە من دەوێ. پێی دەڵێن ئێمە کارێکمان بەوەزیریی تۆ نییە، هەستە بگەڕێوە تەورێز و ئێرە بەجێ بێڵە. لەوێوە دەچنە یانەی فیدائییان لەوێش ڕادیۆ دەبینن کەوا هەر باسی ئازەربایجان و جەعفەر پیشەوەرییە. بەقۆنداغە تفەنگ لە ڕادیۆکە دەدەن و دەیشکێنن.

## شەڕی قووچکەکانی دمدم[٢]

ناگوزیری ئازەربایجان و کوردستان پایانی هات. دانیشتوانی زەنگان، میانە، تەورێز، ورمێ، لە شەڕ دەستیان کێشاوە، هی ماوی خۆیان دا دەست لەشکری تاران. لە مەهاباد (سابلاخ) وا سەران و گەورەکانی دەستەی ئازادیخوایان و ڕەئیسی جەمهووری کوردستان، کە قازی محەمەد و ئەندامەکانیان و سەیفی قازی و سەدری قازی، وایاندەزانی هەموو کاروباری جەمهوورییەتی کوردستانیان جێبەجێ کردووە و پێکهێنراوە و دروشم و ئاڵا و سپا و چەکی بەتایبەتی خۆیان پێکەوە ناوە، وا خراونەتە ژێر محاکەمە و لە زندان چاوەنۆڕی بەری کردەوەکانی خۆیان دەکەن.

مەفرەزەی ٣ی فەوجی ئاهەن بەسەرکردەیی ڕئیسولئەووەل عاسمی (عاصمی) و ڕەئیس شێخولئیسلامی لە مەهابادەوە ڕوو بەورمێ کەوتنە بزووتنەوە. لە کاتی چویندا وەڵامیان وەرگرت کە دەستە لەشکرێکی کوردەکان لە ژێر فەرمانی زێرۆ بەگدا لە نزیکی بالانوش، کە لە ٢٣ کێلۆمەتری ورمێدا هەڵکەوتووە ئامادەی جەنگن.

دەستە مەفرەزەی فەوجی ئاهەن بەتانک و پێویستی جەنگییەوە تا نزیک بالانوش پەلاماریان برد. لەوێوە بەپیادەیی ڕوو بەئاوایی بالانوش چوون و زەعیم (سەرتیپ) همایوونی لە پێش لەشکرەوە هێزی ئالییەی خستە بزاوتن. همایوونی گەیشتە بالانوش. زێرۆ بەگ دەیەوێ پێشوازی همایوونی بکا، لەوکاتەدا تەق و تۆقی چەک دەست پێ کرا و هەرا و پشێوی ڕوویدا. ئەویش ئەمە بوو کە لەشکر گەیشتە نزیک ئاوایی، دەستەی کوردان پێشیان بەلەشکر گرتبوو. هەردوولا یەکتریان گوللەباران کرد. ئەوە نزیک نیو سەعات بەگەرمە ئاگرباران بوو. ڕەئیسولعورەفایێکی لەشکر و سەربازێک دەکوژرێ. لەوکاتەدا زێرۆ بەگ بەهمایوونی ڕادەگەینێت، کە ئەمانەی گوللە داوێژن لە دەستە لەشکری من نین، بەڵام ناحەزەکانن بۆیە ئەمە دەکەن تاکو من بەدنام ببم. لەسەر ئەوە همایوونی فەرمان دەدا کە چیتر گوللە ناوێژرێ. شەڕ ڕاوەستا، سەرباز سواری ئوتمۆبیل و تانکەکانیان بوونەوە، ڕوو بەورمێ چوون.

## زێرۆ بەگ کێیە؟

زێرۆ بەگ بەهادوری لە عەشیرەتی هەرکییە کە لە دوروپشتی ورمێ دادەنیشت خەریکی مەڕداری بوونە. پیاوێکی ناسراوبوو کە وڵات پشێویی تێکەوت لە دوای ٢٠ ی مانگی یوور، کە هەوای نیشتمانخواهی لە هەموو میشکێکدا جووڵایەوە و خۆی نواند، ئەمیش گەلێک کەسانی لە دەوروپشت خۆی گردکردنەوە. بەسەر گەلێ ئاوایی و دێهاتی کوردستاندا دەستەڵاتی پەیدا کرد. لە دەورەی ورمێ نیروویێکی پێکەوە نا بەدرێژایی ڕێگای ورمێ و سەردەشتدا ئاواییەکانی خستە ژێر دەستەڵاتییەوە.

زێرۆ بەگ لە پێش مانگی یوور، بزنێک، مەڕێکی نەبوو؛ ئەمڕۆ ملیۆنێک دراوی هەیە. ئەم پیاوە گەلێ ماڵی بێ سەر و سامان کردووە. لە هاتوچوونی سەرتیپ همایوونی بۆ تەورێز ورمێ وای دەنواند کە مەبەست لە لەشکرکێشی بۆ ئەو لایانە کۆکردنەوەی چەک لە عەشایری کوردستان بوو کە لە هاتوودا دەبێ بخرێتە کارەوە.

ڕۆژی دووشەممەی ١٣٢٥/١١/٢٨ لەشکرێ لە پیادە و تۆپخانە و تانک و و بۆمبەهاوێژ و فڕۆکەی ڕووخێنەر و جەنگی بوو، کە لە دواییدا سوارەی نیزامیش تێکەڵ بوو، ڕێکخرا لە ژێر سەرکردەی عەقید فولادوەندا، کە بۆ خۆی سەرکردەی فەوجی پیادەش بوو لە ورمێ وە دەرکەوت ڕوو بەئاواییەکانی بالانوش و زەورەقاوا چوون.

لە ٢٢ - ٢٠ کیلۆمەتری ورمێدا دامەزران و دەستەلەشکرێکی سواریش چوونە

ئاواییەکانی نیولی دامەزران لە ڕۆژی ٢٨ی بەهمەن تا ڕۆژی یەکەمی ئەسفەندماه لە نێوانی ئەم سێ ڕۆژانەدا نووسراو بۆ زێرۆ بەگ نووسرا، ناردراو داوخوازی کرا کە بێت دەوڵەت خوایی بکا و چەک فڕێدا، بیداتە نێرووی حکوومەت؛ بەڵام وەڵامێک وەرنەگیرا.

ڕۆژی پێنج شەممەی ١٣٢٥/١٢/١ نەخشەی پەلاماردانە سەر زێرۆ بەگ لە لایەن عەقید زەنگنە و فولادوەندەوە ساز کرا. دەستووری خۆنواندن دەستەی سوارە داندران -کە لە جێگای خۆیانەوە کە لە گوندی نیولی بوون- بۆ لای شەیتاناوا و لەوێوە بۆ لای مەحموودئاوا بکەونە بزووتنەوە. لە پاش داگیرکردنی ئەو دوو ئاواییانە ڕوو بکەنە بەرزایی و قووچکەکانی ڕۆژاوای و جنووبی قاسلموو بۆ پێشەوە بڕۆن و بکەونە سەر کوردەکانی ئاوایی کووکیا و قاسملوو و قووچکەکانی باکووری ئەوبن وەبەر هەڕەشەی بدەن.

دەستەکانی ٢ی فەوجی بەهادور لە ژێر فەرماندەیی ڕەئیسوولئەووەل، سەرگورد فیرووز ئاوایی کرایە مەئموور کە لە جێگای خۆیەوە ڕووبە ڕوویەتی پەلامار ببات و گوندەکانی ئوزان، تەماتار، کووکیا، قاسملو داگیر بکەن.

گورانی ١ی فەوجی بەهادور لە ژێر سەرکردەی ڕئیس مەحموود یاسایی کرا بەمەئموور کە لە جێگای خۆیەوە ڕوو بەرەو ڕۆژهەڵات، ڕۆژئاوا و لای ڕۆژهەڵاتی بەرزی قووچکەکانی دمدم داگیر بکەن و لە لای ڕۆژهەلاتی ڕۆژاواییەکانی کووکیا و قاسلموو بەرزاییەکان- کە بەسەر ئەوێدا سوارن و لە دەست کوردەکاندان- بگیرێن و لە دوژمنیان پاکی کەنەوە، تاکو بۆ پێشڕەویی دەستەی لەشکر ئاسان بێ. تۆپخانە و خومپارە هاوێژەکان و تانکە کێوییەکان و هێزی ئالییە، پشتیوانی دەستەی لەشکری پیادە و سوارە بکات. بەو جۆرە تەدبیر کرا دوو تۆپ بۆ پشتیوانی گوردانی یەکەم لە قووچکەکانی دمدمەوە، دوو تۆپ بۆ پیشتیوانی گوردانی دوو لە بالانیش،تانکێکی جەنگی لەگەڵ گوردانی ٢و دوو تانکی جەنگی لەگەڵ گوردانی ١ لەلای ڕۆژهەڵاتەوە و خومپارە هاوێژ لەگەڵ گوردانی یەک کار بکەن (بە وێنەی نیشاندراو).

## دەستپێکردن

یەکەم: سەعات پێنج دوای نیوەشەوی ڕۆژی جمعەی ١٣٢٥/١٢/٢ هەریەک لە جیگای خۆیان کەوتنە جووڵانەوە. لە پاش جێگا گرتن پەلاماری گشتی دەست پێ کرا. یەکەم جار تۆپخانە ڕوو بەقووچکەی دمدم دەستی کردە گوللەبارانی یەک لە دوای یەکتر. تانک و ئوتۆمبیلە جەنگییەکان بەئاگربارانەوە بۆ پێشەوە دەچوون. لە پەنای ئاگریدا لەشکری

گوردانی ١ ڕوو بەقووچکەی ناوبراو دەستیان کرد بەپەلامار بردن و بەربەرەکانی و کێشەی هەرەزۆر بەرەو ڕووی دەستەی گوردانی ١بوو. چونکە دەبوایە قووچکەی دووەم کە بەرزترین قووچەیەکانی لە ژێر دەستەڵاتی کوردان دایە و قووچەکانی ڕۆژهەڵاتی ئاوایی قاسملو کە بەرزتر جێگایانی لە دەست کوردەکاندایە داگیرکرابان. کوردەکان بەجارێک ئەو هەموو قووچکە و جێگا سەخت و بەرزانەیان لە دەستدایە و بەپشتیوانی ئەو جێگایانەوە سەربلندییان دەنواند.

لە نێوان سێ سەعات شەڕ و کوشتاری نێوانی لەشکری ئێران و لەشکری کورداندا سپای ئێران گوردانی ١ توانی بەسەر قووچکەی دمدم و ڕۆژهەلاتی قاسملوودا زاڵ بێ. سەعات دەی سبەینێ لەشکری ئێران گەیشتە بەرزاییەکان. سەعات دە و پێنج دەقیقە گوردانی ٢ ئاوایی کووکیایان گرت. کوژتار تا پازدەی ئەم مانگە بێ بڕانەوە گەرمەی بوو.

بەڕاستی تانکە جەنگییەکان و تۆپخانە لەم جەنگەدا کاری زۆر بەنرخیان پێک هێنا و هۆی پێشکەوتنی لەشکری ئێران و بلاوکردنەوەی لەشکری کوردان لە سایەی ئەوانەوە بوو و چوونە پێشەوەی تانکەکان و سەرکەوتنیان لە جێگا سەخت و بەرزەکاندا زۆر دژوار بوو؛ گەلێک کۆسپە پێشی پێ گرتوون. بەلام فڕۆکە بۆمبەهاوێژەکان پشتیوانییان دەکرد بۆ هەلکەناندنی لەشکری کورد و بۆ پێشەوەچوونی تانکەکان، تا گەیشتنە قووچکەی دمدم. دەتواندرێ بێ ترس بووترێ لای بەشی هەرە ئازایی و مووەففەقییەتیان وەرگرتبووە لای خۆیان بەتایبەتی بۆ گەیشتنی لەشکر و پێش خستنی تۆپخانەش یارمەتیەکی قورسیان کرد. هەروەک فڕۆکە جەنگییەکان هەم پشتیوانی زلیان بۆ چوونە پێشەوەی تانکەکان بەجێ هێنا، هەتا لە پایەیەکدا کە لە ئەنجامدا ئەفسەرەکانی لەشکر دەست و سوورەتی ڕەئیس سەروان نعیمی فەرماندەی تانکی جەنگییان ماچ کرد.

تەواو لە سەعات ١٥ دا هەموو ئاواییەکانی مەحموداوا، کووکیا، قاسملوو، محەمەد ڕەحیم داگیران و لە هەریەکیاندا دەستە لەشکرێکی حکوومەتی تێدا داندرا. لەم ڕۆژانەدا پیکهێنراوە لە ڕووی نیزامییەوە کردەوەیەکی کلاسیک و نموونەیێک بوو هەرەبەرز و بەنرخ. هەرچۆنێک بوو، بایی ڕاستی لێدانێکی سەخت و ناوی بوو لە کوردان درا و لە کوردان کوژتارێکی زۆر قورس کرا.

عەزیزی برای زێرۆ بەگ، کە هەموو کار و ئیشگوزاری ئەو بوو، بریندار کرا. تەواو سەرانی کورد لەگەڵ فەرماندەی لەشکر دیدەنی دەکەن کە چەک بەدەستەوە بدەن. لە پاش

دوو ڕۆژی ئەو کردەوانە، لە وەزارەتی جەنگەوە ئافەرین بۆ ئەو ئەفسەرانە هات کە لەم کارەدا بوون.

دانیشتوانی شاری ورمێ چەندان هەزار تومانیان دراو کۆکردەوە و بەیارمەتی بۆ ئەو لەشکرەیان نارد و لە میوە و خواردەمەنی و جگارە و گۆرەوی و شیرینی و چتی دیکەشیان بۆ ناردن. لەوە وادەردەکەوێ کە دانیشتوانی ورمێ لە نێوانی ئەم ساڵەدا چەندان تەنگانەیان کێشاوە کەوا بەوجۆرە بۆ چووینی لەشکری ئێران شادمان بوون.

ئەفسەرانێ کە لەم جەنگەدا هاوڕێ بوون ئەمانەن: سەرهەنگی ستاد، زەنگنە فەرماندەی لەشکری لە ورمێوە چووە سەر کوردان. سەرهەنگی دوو عەقید فولادوەند فەرماندەی ئاتەشبار مێدفەع ۷۵ لای کێوستانی لەشکری یەکەم. سەروان نەعیمی فەرماندەی تانک و ئوتمۆبیلانی جەنگی و دەستە و دایرەی ئەفسەرانی دیکەش کە لێرەدا ناوبردنیان پێویست نەزاندرا.

ڕۆژی شەممە ۱۳۲۵/۱۲/۳ سەعات ۹، چەندان هەزار کەس دانیشتووانی ورمێ جەنازەی مردووە کوژراوەکانیان بردە سەرقەبران کە لەو جەنگەدا کوژرابوون. بەهەزاران ژنان و پیاوی ورمێ بەشین و گریان و قورپێوان لەگەڵ جەنازەکان کەوتن. شیرینی و میوە و چتی باشی بەتامی لە پایەبەدەریان بۆ سەربازە بریندارەکان برد و لە هەموو لایەکەوە دیاری و پێشکەشی بێ ژمار بۆ سەرهەنگەکان ناردرا.

**وەزیری جەنگ و ڕەئیسی ئەرکانی جەیشی ئێران لە بارەی جەنگی کوردەکانی بارزانەوە ئاگاداری دەدات بەڕۆژنامەنووسەکان(۳)**

لەسەر میواندارییێکی کە لەلایەن وەزارەتی جەنگەوە کرابوو، ڕۆژی چوارشەممە ۱۹ی فەروەردین، لە پشت ئەفسەرانەوە خاوەند مەتبووعات لەگەڵ مودیرەکان و پەیامنووسان و نوێنەرەکانی هەموو ڕۆژنامەکان بەرێز دانیشتبوون. وەزیری جەنگ لە پاش ئەوە کە لە پشت میکرەفۆن دانیشت، هەڵیدایێ و وتی:

ساڵی ڕابردوو نزیک ئەم کاتانە بوو، کە هەموو ئەم ئاغایانە، لەم خانووی سەربازییەدا کۆبوونەوە و من مەرجم لەگەڵیان بەست کە جاری دیکەش کۆمەڵە ببەسترێ و گرد ببینەوە. بەڵام لەبەر ڕوودراوییەکانی دڵ بریندارکەری غەمهێنەری کیشوەر کە هاتە پێش، پێ

(۳) لە نامەی هەفتەی جیهانی پاک، ژمارە ۱۰ سێشەمبە ۲۵ی فەروەردین ۱۳۲٦/۱٦ نیسانی ۱۹٤۷ وەرگیراوە.

ڕانەگەیشتم کە بەوە موفەفەق بم. بەڵام ئەمڕۆ من زۆر خۆشحاڵ و شادم کە بەتەن و ئەندامێکی گەلێک ڕوونترەوە بەرەوڕووی ئێوە دەبم.

لە پاشان گەورە و مەزنی ئێران دووانێکی دووروودرێژی دەست پێ کرد و گەلێک بەشان باهووی ئێرانیدا هەڵگوت و لە پاشان وتی کە چونکە سەرلەشکر پتر ئاگاداری دەدات، ئەوەتا ماوەی قسە بەو دەسپێرم کە بۆتان بڵێت.

لە پاش ئەو سەرلەشکر عەلی ڕەزمارا ڕەئیسی ستاد (ئەرکانی جەیش) چوو لە پێش میکرەفۆن ڕاوەستا. بۆ مودیران و نووسەر و پەیامنێری ڕۆژنامەکان سپاسی بەجێ هێنا و لە بارەی کوردەکانی بارزانەوە دووروودرێژ دوا و باسی کردن و وتی: بارزانییەکان تایفەیەکی کوردی عیراق بوون لە وڵاتی هەولێر لە کیشوەری عیراق دادەنیشن و سەرەکی ئەوان شێخ ئەحمەد و براکانییەتی. بارزانییەکان پتر لە دە هەزار کەس دەبن، بەلکەم لە دوو هەزار ماڵ پتر دادەمەزرێن.

جەنگجۆ و شەڕکەرانی ئەوانە یانی ئەو کەسانە کە لەوان چەک لەگەڵ خۆیاندا هەڵدەگرن، سێ هەزار کەسی جەنگی دەبن. بارزانییەکان مرۆڤی قانیع و نیک نەفەس و خۆگرن. باوەڕێکی یەجگار زۆریان بەشێخەکانی خۆیان هەیە. ناوی شێخ ئەحمەد بەخودانی بارزان دەبەن و هەروا مەلا مستەفا لەنێو ئەواندا ئەهەمییەتی زۆرە و بەڕێزە؛ بەڵام بەلانی پترەوە ئەهەمییەتی ئەو بەلای جەنگ و نیزامییەوەیە.

لەنێو بارزانییەکاندا تەنیا شێخ ئەحمەد تفەنگ هەڵناگرێ؛ ئەویش لەبەر باوەڕی ئاینییە کە دەست لە تفەنگ نادات. لە نێو ئەواندا سی چل کەس ئەفسەر هەن، کە لە دەرەوە خوێندوویانە؛ تەحسیلی بەرزیان هەیە.

بارزانییەکان خاوەندی هەوت تۆپ وسەد مەترلیۆز و چەندانێکی زۆر ئەتۆمات، بێ تێل و لاسلکی و چرای مخابەرات وچەکی تازەن. ئەم کوردانە تا پێش جەنگی دووەمی جیهان و لە کاتی ئاسایشت و ئاشتیدا کارە موهیمەکان، کە تەوەجوهی مەوەحافیلی سیاسی بەلای خۆیاندا بکێشن، ئەنجامیان نەداوە و بەحاڵەتی ئاسایشت و سەلامەتی خەریکی زندەگانی و گوزەران و ڕابواردنی خۆیان بوون. سەرکردەکانی ئەوان ساڵانی درێژ لە تەبعیدگاهەکانی سلێمانییەدا لەژێر چاودێری حکوومەت بوون.

ساڵی ١٩٤١/١٣٢٠ لە شۆڕشی ڕەشید عالیدا چتێک هێنرایە پێشەوە کە بۆ ئەم دوورخراوانە دەرفەتێ دەست کەوت، کە لە تەبعیدگاهەکان دەرخرێن و بچنەوە نێو

عەشایرەکانی خۆیان. کە گەڕانەوە نێو عەشایر و جێگاکانی خۆیان، دەستیان کردە کۆکردنەوەی ئەوانەی پەیڕەویانن، دەرفەتیان وەرگرت و دەستەیان پێکەوە نا و دەستیان کردە داوخوازی خودموختاری کوردستان. حکوومەتی عیراق لەو کاتەدا لەگەڵ مەلا مستەفا -کە لە هەموویان پتر خۆشەویستە- قسەی کرد و وەعدەی دڵنەوازەی پێدا؛ بەڵام لەو دەمەدا کابینەی عیراق گۆڕدرا و وەزیرانی تازە ئەو پێشنیهادەیان پەسەند نەکرد.

ئەوە ڕوو بەهەرا و جەنگێک کێشرا. لە دوای شەڕ و هەرا و کێشە، ناچاری ئەوە کران لە عیراق دەرکەون. چونکە چلۆنی ئێران شپرێو بوو، ئاشفتە و پشێو بوو، حکوومەتی تارانیش لە خاکی کوردستاندا دەستەڵاتی هیچ نەبوو، کوردانی بارزان مانگی مهر ١٣٢٤ ئەیلوولی ١٩٤٥ هاتنە نێو خاکی ئێرانەوە.

لە دوای هاتنە نێو ئێرانەوە، چونکە خاکی کوردستان (مەهاباد و ورمێ) لە ژێر دەستەڵاتی نیرووی دەوڵەتی ئێراندا نەبوو، دەوڵەتی ئێران نەیتوانی بارزانییەکان بخاتە ژێر مەرج و بەرنامە تۆڕێکی زانداروی ئاشکراوە. ئەوانیش چونکە ئێرانیان بێ بەند و بەست و بەرهەڵست چاوپێکەوتبوو، بەپێی هەڵکەوتی سیاسەت و جێگا خۆیان بەفەرمان و ئەوامیری قازی محەمەد -کە داوای خودموختاری کوردستانی ئێرانی دەکرد- نزیک کردەوە. بۆ یارمەتی و پشتیوانی لە هیچ بارێکەوە ڕانەوەستان و هەرچییێکی پێویست و بەکەڵک بوو بەکاریان برد بۆ دەست دانە دەست لە دەوروپشتی سەقز لە گەرمەی کردەوەدا بەنەیاری و بەربەرەکانی هێزی دەوڵەتی ئێران دەجەنگین و گیانبازییان لە ڕێی ئازادیدا دەکرد. بەپرشنگی ئارەزووەکانی قازی محەمەد، خۆیان بەهێز و تینتر دەکرد. لە مانگی ئازەری ١٣٢٥، تەشرینی دووەمی ١٩٤٦ کە نیرووی لەشکر بۆ لای ئازەربایجان کەوتە بزووتنەوە، مەلا مستەفا هات بۆ تاران و پەزیرایی و میوانداربییەکی گەرمی بۆ کرا و ڕێز و حورمەتێکی بێ ژمارەی لێ نرا. دەوڵەتی ئێران بەمەرجی زانداروی ئاشکرا ئەوانی ناچار بەچەک فڕێدان دەکرد، مەرجەکان ئەمانە بوون:

١- ئەگەر بارزانییەکان تەبەعییەتی ئێران قبووڵ بکەن، دەوڵەتی ئێران ئامادەیە لە دەوروپشتی تاران ئەرازی ئەمیرییە بەوان بدا، بەمەرجێ چەک بەدەستەوە بدەن وە هێندێک لە ئەرازیش تەعیین کران.

٢- ئەگەر خۆ بیانەوێ لە ئێران نەمێننەوە، دەوڵەتی ئێران جێگا و ڕێگای بەئارەزوو دەداتە ئەو ١١٥ کەسانەی پەنایان هێناوە و لەلایەن حکوومەتی عیراقەوە مەحکوومییەتیان سادیر کراوە. بەڵام لە خاکێکیان دادەمەزرێنێ کە دوور لە سنووری

ئێران و عیراق بێ، تێدا دانیشن.

٣- کەوا نەکەن دەبێ تا ڕۆژی یێکەمی مانگی بەهمەن ٢١ی کانوونی دووەم، هەموو بارزانییەکان خاکی ئێران بەجێ بێلن و دەرچن.

بەڵام مەلا مستەفا ئەو پێشنیهادانەی پەسەند نەکرد لەسەر ئەمە بوون کە خاکی ئێران بەردەن و بگەڕێنەوە خاکی عیراق. بۆ ئەوە بوو کە ماڵ و خێزانی خۆیان لە نەغەدە، قەڵاپووخانە، سۆفیان، جەلدیان دادەنیشتن بۆ لای شنۆ باریان کرد. بەڵام لە نیانیدا کار وانەبوو؛ سەرکردەکانی بارزانییان لەگەڵ سەرانی عەشایرانی هەرکی و شکاک و زێرۆ بەگ و تاهیر ئاغا و ڕەشید بەگ و مەندی بەگدا گەیشتنە یەکتریەکی تەواویان هەبوو و ئەوانەیان هان دەدان، کە بەرانبەر بەهێزی ئێران بەربەرەکانی بکەن؛ بەڵام چونکە بارزانییەکان بەلێخۆشبوون (موسامەحە) ڕایاندەبوارد، لە ڕۆژی ١٣٢٥/١١/٢٤ فەرمان بەلەشکری ٤ و لەشکری ٣ درا کە بۆ چەک ئەستاندن لە هەموو تەوایفی باکوور و جنووبی ورمێ و بارزانییەکان لەشکرەکانی کە لە خوارەوە ناو دەبرێن دامەزراندران و سازکران:

١-لەشکرێ لە ورمێوە لە ژێر فەرماندەی سەرتیپ زەنگنەدا بۆ سام بەسەر کورداندا کردن لە دۆڵی قاسملووەوە بۆ داگیرکردنی ئاخ بلاخ.

٢- لەشکرێ لە مەهابادەوە لە ژێر فەرماندەی سەرهەنگ ئەنساریدا بۆ گرتنی نەغەدە.

٣- لەشکرێ لە ژێر فەرماندەی سەرگورد کلاشیدا بۆ داگیرکردنی قەڵای پەسوێ.

٤- لەشکری عەشایری مامەش و مەنگوڕ بەفەرماندەی لەشکری ٢ بەهادەری بۆ دەرکردنی کوردەکانی بارزان بۆ لای باکووری خانە.

بڕیار لەسەر ئەوە درا و لەلایەکی دیکەشەوە، کە لەشکری یەکەم سەرتیپ زەنگنە بگەنە ئەو جێگایە هەرچەند زووتر دەست پێ بکا درەنگترە بۆ لەناوبردنی تاهیر ئاغا و زێرۆ بەگ تاکو نەتوانن پشتوانی و یارمەتی بارزانییەکان بکەن.

لەشکری سەرتیپ زەنگنە ڕۆژی ١٣٢٥/١٢/٢، ١٢ی مارتی ١٩٤٧ لە دۆڵی قاسملوو لەگەڵ هێزی زێرۆ بەگدا کەوتنە گیروبەردە و شەڕ و کوژتار بەگرتنی ١٥ کوژرا و پتر لە ٥٠ کەس بریندار ئاوایی قاسملوو، کووکیا، حەمەڕەحیم کەندی، شیرکەندی، بەرزاییەکان ڕۆژهەڵاتی ئەوێیان داگیر کرد. تەلەفیاتی لەشکری ئێران پیاوێکی سەرباز، دوو کەسی غەیری نیزامی کوژران ٧ کەسی سەرباز و پیاوێکی غەیرە نیزامی بریندار بوو. تا ڕۆژی ١٣٢٥/١٢/١٠، ٢٠ ی مارتی ١٩٤٧ لەشکرەکانی دیکە توانیان بێ شەڕ و

کوژتار نەغەدە و قەڵای پەسوێ، خانە، جەلدیان، سوفیان، قەلاچوخ، هەنهەنە، شیناوێ، داگیر بکەن.

بارزانییەکان بەپێی ئەو تەنگە پێ هەڵچنینەی لە ڕۆژهەڵات و نیوەڕووەوە پێیان کرا وایان بیرکردەوە دەبێ بچنە باکووری شنۆ؛ واتا ناحیەی مەرگەوەڕ، دەشتی تەرەگەوەڕ، تاکو لە بابەت خواردەمەنی و گوزەرانەوە ئاسوودە بن، بەڵام لەشکر ئەوەی بۆ ئاشکرا ببوو پەی پێ بردبوو، بڕیاری دا کە نێوانی ئەوان و بەشی باکووری دابڕکات. جا لەبەرئەوە دەستبەجێ فەرمان بەلەشکر درا کە لە ژێر فەرمانی سەرهەنگ (عقید) ئەنساریدا لە ورمێوە بۆ لای دۆڵی ئەنهورچای بکەونە ڕێ و موان داگیر بکەن و نێوانی عەشرەتی ڕەشید بەگ و نووری بەگ لە بارزانییەکان ببڕن.

ئەو لەشکرەی بێژرا ڕۆژی ١٣٢٥/١٢/٢١ (١٣ ی مارتی ١٩٤٧) لە بەرزاییەکانی لونیدا زەدوخورد دەست پێ کرا. بەرزاییەکانی لونی، قزلبەند، شێخ شیرینی کە لە دۆڵی ئەنهورچای دان خرانە دەست. لە سەرۆکانی عەشیرەتی شکاک، نوری بەگ و ڕەشید بەگ لە ورمێ حازربوون و خزمەتگوزاری خۆیان بۆ دەوڵەت نواند.

هێزی ئێرانی «موان»ی خستە دەست. لەو شەڕ و کوژتارەدا لە کوردەکانی بارزانی و کوردانی عەشیرەتی شکاک هەشت کوژرا و نۆ کەس بریندار بوون. لە لەشکری ئێران تەنیا سەربازێک کوژرا و دوو برینداربوون.

ڕۆژی ١٣٢٥/١٢/٢٤، چونکە تاکو ئەو دەمە بارزانییەکان جێگا پێویستەکانیان چۆڵ نەکردبوو و لەگەلێک جێگایانەوە لەگەڵ لەشکری ئێراندا شەڕ و کوژتاریان دەکرد و لە کوژتار ڕانەوەستان، جا بۆیە دەستوور بەلەشکری جنووبی درا کە بەهەر جورێک بێ، دەبێ زووتر پەلامار ببەنە سەریان و دەربەدەریان کەن.

ئێوارەی ڕۆژی ٢٤ی مانگ یەکێک لە لەشکرانی جنووبی لە ژێر فەرماندەی سەرهەنگ ئەنساریدا لە «قەڵاچوخ»ەوە پەلاماری بردە سەر ئەرنە. شەڕ و کوژتارێکی قورس لەگەڵ بارزانییەکاندا دەست پێ کرا. لە بارزانییەکان و ئاوایی ئەرنە ٧ کەس کوژرا و لەشکری ئێران خودی ستوونی ١ سەردار جەلال ڕەحیمی حاجی ئاوایی بوو. لە ئەنجامی پەلامارەکان لەگەڵ تەنگەوتاوێکی قورسا بارزانییەکان ڕۆژی ١٣٢٥/١٢/٢٥ بڕیاریان دا کە دەست لە بەشی لای باکوور هەڵگرن؛ لە خودی شنۆدا جێگیر بن و ڕوو بەجنووب پەلامار ببەن.

یەکەم پەلاماری ئەوانە ڕۆژی ١٣٢٥/١٢/٢٥ بۆ سەر گرووهانی پادەگانی نالس

(نەلوس) بوو، کە لە ژێر سەرکردەی سەرگورد(ڕەئیس ئەوەل) کلاشیدا بوو، لە دوای شەڕ و لێکدانێکی زۆر ئاوایی نەلووسیان داگیر کرد.

لە ئەنجامی کوژتاردا سەرگورد کلاشی بەنۆ کەس سەربازەوە کوژران و نۆ کەسیش بریندار بوون؛ ٦٩ کەسیش بەدیل چوون. لە دوای ئەوە ڕۆژی ١٣٢٥/١٢/٢٧ لەشکر بۆ پێشەوەچوونی هەر ڕۆیی، ڕوویان لە شاری سوفیان کرد. لەشکر پشتیوانی دەستە سپای سوفیاتی کرد. بەربەرەکانی و تێکچرژانێکی قورس ڕوویدا. لە دوای ١٢ سەعات لێکدان و کێشە هێزی دەوڵەتی بەرزایی سوفیاتی گرت. لەو شەڕەدا لە بارزانییەکان ٨ کەس کوژرا و ١٢بریندار ڕوویدا. لە سپای ئێران سەروان ڕەئیسی پیادە ڕەزا قەرەباغی کوژرا و سێ سەرباز بریندار بوون.

لەم جێگایەدا، ڕۆژی ١٣٢٥/١٢/٢٩ لەشکر بڕیاری خۆی دەدا کە دەستە لەشکرەکانی ئەو جێگایانە یارمەتی بدرێن و ڕازاندنەوەشیان بکرێ کە وەکو هەڵقە لە باکوورەوە و جنووبەوە و جنووبی ڕۆژهەڵاتەوە بارزانییەکان تەنگەتاو بکرێن و بەبۆمبەبارانی هەوایی ئەوانە بەجارێک قڕ بکەن و پووچیان کەنەوە. جا ڕازاندنەوە بەپێ هاتووە هەروەکو نەخشە کێشراوە دەست بەکردار و تێکۆشین بکرێ:

١- لەشکر لە موانەوە لە ژێر فەرماندەی سەرهەنگ نیساریدا بۆ نزیکی ڕزگارا ببزوێتەوە.

٢- لەشکرێ لەژێر فەرماندەی سەرهەنگ پەرتەوی لە دەربەندەوە بۆ داگیرکردنی سیلوانە و ئاسانکردنی دەستوبردی سەرهەنگ نیساری بکەوێتە ڕێ.

٣- لەشکرێک لە دۆڵی «باران دوز - بەرەندەیزەوە» لە ژێر فەرماندەی سەرهەنگ فولادوەنددا بۆ داگیرکردنی بەرزاییەکانی ئاخ بلاخ، گرکەل، کەوەرەزەرد، قولقولە، ببزوونەوە.

٤- لەشکرێک ناردرایە دۆڵی قاسملوو بۆ پارێزگاری چوونە نێو ئەو دۆڵەوە.

٥- لەشکرێک لە دیزج(؟) داندرا تاکو نێوانی ورمێ و مەهاباد نەپچڕێ و کەوتنە کاری هێزی لەشکری قاسملوو ئاسانتر بێ.

٦- دەستە لەشکرێ لە ژێر فەرماندەی سەرهەنگ مەجیدی لە نەغەدەوە بۆ داگیرکردنی کێوی دۆڵی نەلوس داندران.

٧- لەشکرێک لەژێر فەرماندەی سەرهەنگ ئەنساریدا لە سۆفیان بۆ داگیرکردنی کێوی دۆڵی نەلوس داندرا.

لەشكرانی یەكـەم و دووەم لە ڕۆژی ١٣٢٥/١٢/٢٩دا لە پاش لێـدان و كـوژتـارانی قـورسی پەی دەرپەیەكـان بەبـارزانیـان ڕاو زیانێكی زۆر لەوان دا، لە سیلوانا بۆیان دەستی داكـە پێككگەیشـتنێ وەدەسـتـخـەن و هەردوو لەشكر بۆ لای نركی و ڕزكـارا بكـەنە ڕێ و بچن. ئەو لەشكرانە لە ڕۆژی ١٣٢٦/١/٤دا توانیان كە بەربەرەكانییەكانی بارزانییەكان تێك بشكێنن و بەسەر نركی و رزكاردا زاڵ بن. لە بارزانییەكان شەش كەس كوژرا و ١٢ بریندار ڕووی دا.

لە دوای داگـیـركـردنی ئەو ئاواییـانەی بێـژرا و ڕۆژی ١٣٢٦ /١/١٥ ئەو لەشكرە بۆ چوونە پێشـەوەی خۆی هەر لەسـەری چوو. لە «خلج و ئورست» لەگـەڵ كوردەكـانی بارزان ڕوو بەڕووبوون. لێرەدا كوژتارێكی قورسی سەخت ڕووی دا. لەو ئاواییانەدا خوێنێكی زۆر ڕێژرا. سـوارانی پێشـمـەرگـانی ئێـرانی بۆ سـەر خلج و ئورست كـرانە مـەئمـوور. بەڵام بەربەرەكـانییەكان و پێشپێگرتنی بارزانییەكـان و پەلامارەكانیان بەگەرمە و یێك لەسەر یێك وای دەنـواند تا دوامین هەناسـە شـەڕ بكەن. لە ئەنجـامی كـوژتـاردا سـتـوان یەكـەمی سواره (ملازم أول) سەید محەمەد ئیمامی كوژرا و ستوان دووەم (ملازم ثانی) سووارە جیـهانبانی بەپازدە سەرباز و هی دیكەوە لە خلج، بەدیل كەوتنە دەست كوردەكان و ستوان دووەم هاتفی لە پێكدادانی «ئورست» كوژرا.

لە درێژایی ئەو هەمـوو كـوژتـار و كـێـشـە و بەربەرەكـانیـیـەدا فـڕۆكـە بۆمـبـەهاوێژەكـانی حكوومـەتی ئێـران، ئاواییـەكـانی شنۆ، مـەرگـەوەڕ و دەشـتی گـەورەی بەسـەخـتی ئاگـر و بۆمبەباران دەكرد. لەو كـاتەدا لەشكری سەرهەنگ مـەجیدی ستوونـی ٢ دەكرێتـە مەئمـوور كە بەزووترین كـاتێ و بەهەر چەند گـیـان و مـاڵ بـێـتـە دەست، بەرزاییـەكـانی بەهۆی تانكە ناسر و كێوی بادرا بخەنە دەست .

ئەو لەشكرە ڕۆژی ١٣٢٦/١/٥بەهۆی تانكە گـەورە كـێـوییـەكـان و ئوتمۆبیلە زرێدارە جەنگییەكانەوە [توانییان] بگەنە بەرزایی و كۆمەڵەی كوردەكان بڵاوكەنەوە. بەدە كوژراو و پەنجـا بریندارەدان بارزانی گـەیشـتـنە بەرزایی. شـەش سـەرباز كـوژران و سـتـوان یەكـەم (ملازم أول) ڕەئووفی بریندار و هەژدە كەس سەرباز دیسان بریندارکران.

ڕۆژی ١٣٢٦/١/٨ لەشكری باراندوز (بەراندیز) سـتـوونی سێ بەپێ كـرووكی، كـەمـەرەزەرد كـە هەرچەند زووتـر و چەند لە دەسـتـدان دەبێ بەرزی ئاخ بڵاخ، گـرگل، قـەڵا داگـیـر بكرێ. ئەو لـەشكرە ڕۆژی ١٣٢٦/١/٩ كـەوتە بزووتنەوە ڕوو بەو بەرزاییـە سەختەی پێداچوونە گران و پڕ كۆسپەیە كەوتنە ڕێ.

بارزانییەکان هەنگاو بەهەنگاو بۆ شەڕ و کوژتار بەدڵگەرمی و گیانبازییەوە بەربەرەکانی و شەڕیان دەکرد و دلێرانە دەجەنگین. بەڵام لەشکری ناوبراوی ئێران بەپشتوانی تانک و ئوتمۆبیلە جەنگییەکانەوە و بەسایەی فرۆکە بۆمبەهاوێژەکانی جەنگی کە سەر قووچکە و دۆڵ و شیوەکانی وەکو تەرزە بۆمبەباران دەکرد و تانکە کێوییەکان بەگەرمە ئاگربارانی نەدەبڕاندەوە، توانیان یەک لە دوای یەک شیوو دۆڵەکان و بەرزاییەکان بخەنە دەست و بارزانییەکان بەدوا وەرگێڕنەوە. لەو بەرزاییانەدا زیانێکی قورسیان دا و بەنووکە شەڕ و پشتاوپشت دەگەڕانەوە.

لە لەشکری ئێران شەش کەس ڕەئیسولعورەفا و سەرباز کوژران و ئەفسەرێک و دوو کەس سەرباز بریندار بوون «ستوونی یەکەم» پیادە، تاج فر لە دوای ئەوە کە سەرقووچکەی کەمەرەزەردە، قولقولە و گرگل داگیرکران، دەستوور درا کە لەشکری سەرهەنگ ئەنساری و سەرهەنگی ۲ غەفاری (ستوونی ۸ تێبقی نەخشە) لە ڕۆژی ۱۳۲٦/۱/۱۳ بەرزایی کێوی دۆڵ و نەلوس و سینگان داگیر بکەن. ئەگەرچی بارزانییەکان لە هەموو ئاوابیەکاندا زۆر بەگەرمی بەربەرەکانیان دەکرد و پەلاماریان دەدا بەڵام لەشکری دەوڵەتی لە ژێر سپەری فرۆکە بۆمبەهاوێژەکان و فرۆکە جەنگییەکانی کەسانێک لە بۆمبەبارانی بارزانییەکان ڕانەدەوەستان توانییان هەر کەموکورت بۆ پێشەوە هەنگاوباوێژن و بارزانییەکان بەدوادا بگێڕنەوە و سەد و پەنجا گوندیان لێ بستێنن و بیخەنە ژێر دەستەڵاتیانەوە. «ستوونی ٥ تێبقی نەخشە» لە ژێر فەرمانی کوردەکانی حکوومەتی تارانپەرستدا لە گوندەکانی تارزاس، ناناس، دڵی، ڕووبەڕووی لەشکری کوردی دیموکرات بوون کە لە ژێر فەرمانی زێرۆ بەگ و تاهیر ئاغادا بوون و بەگژیەکدا چوون، بەڵام توانییان کە پەلامارەکانی بارزانییان ڕاگرن و بەسەر بەرزاییەکانی دلیدا زاڵ بن.

کوردەکانی ژێر فەرمانی زێرۆبەگ و تاهیر ئاغایە بەر بەسێ ئاوان بەدوادا کشانەوە و گەیشتنە ئەو بارزانییانەی، کە لە گەلاس بوون. بەو جۆرە ڕۆژ بەڕۆژ هەڵقەی دەورەدانەکەی بارزانییان تەنگتر کراوە، تا ڕۆژی ۱۳۲٦/۱/۱٤ شنۆ لە دەست بارزانییان دەرخرا و کەوتە ژێر دەستەڵاتی هێزی ئێرانەوە.

بارزانییەکان لەبەر ئاگربارانکردنیان بەفرۆکەی جەنگی و پەی دەرپەی بۆمبە بەسەردا باراندن، ناچاری بڵاوبوونەوە بوون لە دۆڵی گەلاس و ڕوو بەخاکی عیراق بەرەو پاش گەڕانەوە. هەموو لەشکرەکان بەجارێک لە باکوور و جنووب و ڕۆژهەڵاتەوە دووی بارزانییەکان کەوتن، بەجارێک هەموو عەریف و ڕئیسولعورەفا و نایب عەریف و ئەفسەر

و پیاوە گەورەکانی بەدیل کەوتبوونە دەست بارزانییەکانەوە لە پشێوی و سەرلێشێواوی بارزانییەکان دەرفەتیان وەرگرت و هەڵاتن خۆیان گەیاندەوە لەشکرەکانیان.

ڕوو بەهەم زیانی بارزانییەکان لەو هەموو جەنگ و هەرایەدا نزیک ١٥٠ کەس کوژرا و ٤٠٠ کەس بریندار بوو. لە لەشکری ئێران ٥ زابت کوژران و ٤٥ کەس گوللەیان خواردووە، ٧ کەس عەریف و ڕەئیسولعورفا کوژران و ٨ کەس بریندار و ٤٢ کەس خاوەند وەزیفە کوژران و ٨١ کەس بریندار و دوو ژاندارمە کوژران و یەکێک بریندار بوو. لە تفەنگچییانی کوردی هەواخوای تاران ٤٣ کەسیان بریندار و ٥٣ کەسیان کوژران.

وتەی سەرلەشکر عەلی ڕەزمارا بەوە پایانی پێدرا و چوونە ژووری چا و میوە خواردن. لە دوای پەزیرایی دووبارە لە هەیوانی دانیشتنا کۆمەڵەیەکی دیکەیان بەست، پرسیاری لەشکری دەست پێ کرا. سەرلەشکر بەهەر پرسیارێک وەڵامێکی داوە. تا نزیک سەعات هەشت بەپرسیار و وەڵام ڕایانبوارد. بەو جۆرە کۆبوونەوەی ڕۆژنامەنووسەکان پایانی هات (ی).

## مستەشاری ڕووس لەنێو کوردەکاندا

لە لایەن ڕووسەکانەوە «سەمەدۆف» ناو قەوقازێکی کردبووە مستەشار هەر کاروبارێک هەبووایە بەو مەشوەرەت دەکرا، بێ ئەو کەس چی نەدەکرد. بەرگی کوردی و خۆی نیانی بوو.

## گەڕانەوەی ئەفسەرەکانی کورد لە مەهاباد

ئەفسەرەکانی کورد کە چووبوونە مەهاباد، لە پاش ئەوە کە قازی محەمەد ویستی لەگەڵ حکوومەتی ئێران پێک بێ، یەکەم کاروانی کە سەردەقی هەڵاتنی شکاند هەکوو (سەید ئەحمەدی کوڕی سەید تەها کە حاکمی نەغەدە بوو) و دڵشاد ڕەسوولی کوڕی میرزا غەفوور، کە لە کۆیێوە چووبوو و عەبدوڕەحمان زەبیحی ناو سابڵاغییێک کە ئەندامی کۆمەڵە بوو و سەدیق حەیدەری سکرتێری کۆمەڵە، چوار ئوتمۆبیلی حکوومەتی جەمهووری کوردستان و گەلێک چەکی وەکو تفەنگی دیموکراتی و شێست تیر و کەلوپەلی دیکەیان هەڵگرت و دەستێکیان بەسەر دارایی نەغەدە و دەوروپشتیاندا هێنا و لە خانێوە بۆ زینوێ شێخ و لەوێوە بۆ باپشتیان و لەوێشەوە هاتنە باتاس. هەر ماڵ و نەقدییەیەکی کە هێنابوویان لەملا و لا شاردیانەوە. پێنج تفەنگ، دوو شێست تیر و چوار ئوتمۆبیلەکەشیان تەسلیم بەحکوومەتی عیراق کرد. لە دواییدا گرتنیان هێنایاننە بەغدا. ئوتمۆبیلەکان

دوویان لە بەغدا لەبەر دایرەی مدیری شورتەی بەغدا، چاوم پێیان کەوت. یەکیان ژمارە ٢٩ و دووەم ژمارە ٣٠ بوو، لە سەریان نووسرابوو «حکوومەتی میللەتی کوردستان».

لە پاش چەند ڕۆژ لە مەکتەبی شورتە مانەوەیان، هەکوو، عەبدوڕەحمان زەبیحی و یەکی دیکەیان بردنە ناسریە و دڵشادی ڕەسولییان بردە ئەربیل و گێڕایانەوە کۆی و بەرەڵایان کرد.

دڵشاد ڕەسووڵی و عەبدوڕەحمان زەبیحی کاتێکی لەگەڵ کوردانی جەمهووری خوادا هاوڕێی قازی محەمەدیان دەکرد، هەمیشە عومەری حاجی مستەفای کۆیی قاچاقچی لە هاتوچوونیاندا بوو. دەستە بەدەستە تفەنگی حکوومەتی کوردستان لەلایەن دڵشاد ڕەسوولی و عەبدوڕەحمان زەبیحییەوە بۆیان دەشاردەوە، بۆ عیراقیان دەنارد، دەی فرۆت بەنیوەیی. بەدرێژایی ساڵێک و پتر ئەوە هەر کێشەوەی تفەنگ و فیشەک بوو بۆ عیراق و فرۆتنی ماڵی ئەو حکوومەتە بوو بەهۆی ئەو دوو کەسەوە بۆ خاکی عیراق دەناردرا و دەفرۆشرا.

لە دوای ئەوان بەچەندێک ڕەئیسی ئەفسەر مستەفا خۆشناو لە سنووری لۆلان و شنۆوە خۆی دا بەدەست سەید عەلی سەرەک نیرووی شورتەی سنووری عیراق، هێنرایە بەغدا و لە پاش چەند شەوێک لە دایرەی شورتەی بەغدا بردیانە سجنی عامە و لە ژووری ئیعدام زنجیر کرا. لە دوای ئەوە بەچەند ڕۆژێک ڕەئیسی ئەووەلی ڕوکن لە ٢١ نیسان ١٩٤٧ عیززەت عەبدولعەزیزی خەڵکی عیمادییە و ملازم مەحموودی خەڵکی سلێمانییە و ڕەئیس خێروڵلا خەڵکی هەولێر وملازم نووری خەڵکی سلێمانییە بەرەوە دوا خۆیان دا بەدەستەوە. لە سنووری ڕەواندزەوە هێنرانە بەغدا و خرانە سجنی ئیعدامەوە و لەپاش ئەوان چەند موعەللیمانی هەولێر و کۆی و سلێمانی هەریەک لەلایەکەوە ژنی خەڵکی سابڵاغیان هەڵگرت و بەماڵێکی زۆرەوە گەڕانەوە خاکی عیراق. عەبدولوەهاب کوڕی حاجی محەمەد عەلیاغای ڕواندز بەبریندارى خۆی بەدەستەوە دا. بردیانە هەولێر؛ لەوێوە بردیانە سجنی مووسڵ، لە موستەشفا تەداوی کرا. لە پاش چەند ڕۆژێ بردیانەوە بەندیخانەی هەولێر. ئەوانە و کەسانی دیکەش، کە هەروا بەرەو دوا هاتوونەوە هەموو هەریەک ژنێکی لە خەڵکی سابڵاخ هەڵگرتووە، لەگەڵ خۆی هێناویە. بەو جۆرە هەریەک لە لایەکەوە خۆیان کوتاوە خاکی عیراق و لای زۆرتریان پیاوانی چاک، دڵسوز، ڕاست نین، هەموویان بۆ خواردن و کیسەبوون.

## شێخ ئەحمەدی بارزان و دەستە و پێوەندی

شێخ ئەحمەد ڕۆژی ١٧ ی نیسانی ١٩٤٧ بەدەستە و کەسان و عایلە و ژن و منداڵەوە، کە ٥٤٦٧ کەس پیاو و ژن ومنداڵ بوون، بێ قەید و شەرت خۆیان بەدەستەوە دا. سەید عەلی سەرکردەی پۆلیس لەو سنوورەدا دەوری گرتن. شێخ ڕەشیدی برادۆست کە لە لۆلانەوە چەندێکە بەهۆی حەرەکەتی بارزانەوە مانگێ نزیک چوار هەزار و پێنج سەد دیناری مفتە لە حکوومەت وەردەگرێ ویستبووی ئەو بارزانییانە بۆ خۆی وەریان گرێ، بۆ ئەوەی قڕانیان تێخا و بیانکوژێ. بەڵام سەید عەلی مەیدانی نەدا و نەیهێشت نزیکیان بکەون. هێنایاننە دەشتی دیانە ڕواندز، شێخ ئەحمەد و پیاوەکانیان بردنە هەولێر. لەوێ، ڕۆژی ٢١ بردیاننە بەندیخانەی مووسڵ. چەند ڕۆژ لەوێ بوون. فەخامەتی سەرەک وەزیری عیراق لە مەجلیسی پەرلەماندا لەوانە دووا، وتی: وا بەڕاستی شێخ ئەحمەدی بارزان و بەشێکی دیکەش لەو کەسانەی کە بەئیعدام مەحکووم کرابوون، بێ قەید و شەرت دەخالەتیان بەحکوومەتی عیراق کرد و حکوومەتیش لیێی قبوولکردن، ژمارەی عایلەیان ٥٤٦٧ ژن و منداڵ و پیاون.

حکوومەت بۆ دامەزراندنی ئەوانە تەدابیری پێویستی کردووە. بەڕێ چوون و گوزەرانیان دەدا. تا بەتەواوی دادەمەزرێندرێن و جێگیر دەبن. هەتا لە دەست بێ، ئیشێکی وایان بۆ دەکرێ تا دووبارە بخرێنەوە سەر کاروباری بەڕێچوون، تا بەئازادی بژین و بەئاسوودەیی بەسەری ببەن. ئەوانە برای ئێمەی عیراقین. لە سەرمان پێویستە کاروباریان بەخۆشی پێک بێنین و بەڕێیان ببەین. بڕواشم وایە کە هەموو عیراقییێک بەرەو ئەوان هەستی خۆشەویستی هەبێ و بەبرای خۆشەویستی خۆیان بزانن.

ڕۆژی ١٩٤٧/٤/١٩ لە مدیری دیعایەی گشتییەوە بەیانێکی ڕەسمی درا لە بارەی بارزانییەکانەوە دەڵێت: بارزانییەکان ساڵی ١٩٤٥ چوونە ئێران. لەولاوە هەڵیانچنین و خزاندرانەوە عیراق، ناچاربوون بێ قەید و شەرت، خۆ بدەنە دەست حکوومەتی عیراق.

ڕۆژی ١٧ و ١٨ نیسانی ١٩٤٧ ئەمانە خۆیان بەدەستەوە دا و ١٥٥٠ پیاو و ١٦٧٦ ژن و ١٣١٩ منداڵ. حکوومەتی عیراق ئەوانەی بۆ چوونە جێگایانی بەتایبەتی ناردووە کە گوزەران بکەن. لە دوای ئەوە ڕۆژی پێنج شەممە ئێوارەی شەوی جومعەی ٢٤ ی نیسان، بەقەتاری شەو لە ڕێگای کەرکووکەوە شێخ ئەحمەد و شێخ خالیدی کوڕی شێخ بابۆ، شێخ عەبدوڵلای کوڕی شێخ مەلا مستەفا، شێخ سادقی کوڕی شێخ بابۆ، شێخ ئیسماعیلی

کوڕی شێخ عەبدوسەلام، شێخ ئیبراهیمی کوڕی شێخ عەبدوسەلام، شێخ محەمەد سدیقی برای شێخ ئەحمەد، حاجی تەها عەبدولعەزیزی خەڵکی عیمادییە، مەلا حەسەن مەلا ئەمین، نەعمان ئەمین، ساڵح مستەفا، ئەحمەد خالید، ئیسماعیل جەجو، محەمەد بابەکر مامەڕەش، سبەینە زوو گەیاندرانە بەغدا، لە سجن دایانبەزاندن. ئێوارەی جومعە بەشەمەندەفەر بردیانە بەسرە لەوێ خستیاننە بەندەوە. حاجی تەها و شێخ بابۆیان گێڕانەوە بەغدا. لە دایرەی شورتەی سەییار حەبسیان کردوون و شێخ ئەحمەد و هاوڕێیەکانیان هەموو لە ژوورێک داناون و زنجیریان کردوون.

ڕۆژی ٢١ی نیسان، مدیری شورتەی عام لە بەغدا تەلگرافێکی لە سەرکردەی بەرزی شورتەی شیمالەوە وەرگرتووە کە مەلا مستەفا و نزیک دوو سەد کەسێکی کە لەگەڵە، لە کێوەکانی عیراق لەنێو ئەشکەوتێکدا دەورە دراون.

## لە ئێراندا هەرای ناوخۆیی

تاران، ٢٩(ر) هەرای ناوخۆیی لە ئێراندا لەسەر تێزەیە. لە ئەنجامی پێکهاتنی هێزی کوردستان و ئازەربایجان بۆ بەپاشدا گەڕاندنەوەی داوخوازی حکوومەتی تاران هەرا گەرمەیەتی. قازی محەمەد سەرەکی کوردستان بەقەواموسەلتەنەی ڕاگەیاند کە خۆی خاوەند دەسەڵاتە سەرپەرشتی هەڵبژاردن بکات.

تاران، ٢٩ (ر) لە تەڵگرافی ئازەربایجان وادیار دەکرێ کە ئازەرییەکان سەنگەر و جێگا بەربەست دروست دەکەن بەدرێژایی سنووری خۆیاندا، بۆ بەرهەڵستی و پێش بەنێرووی تاران بگرن. قەوامسەلتەنە جاری دووەم تەلگرافی بۆ حاکمی تەورێز لێداوە کەوا هێزی تاران بۆ ئازەربایجان بزووتەوە لەلایەن دانیشتووەکانەوە بەربەستێ ڕووبدات، ئەنجامی خراپە. هەڵبژاردن ڕۆژی شەشی کانوونی یەکەم دەست پێ دەکرێ.

حکوومەتی ئازەربایجان جاڕی دا و بەحکوومەتی تارانی ڕاگەیاند کە هەموو ئیتتیفاق و پەیمانی نێوانیان مولغایە. ڕادیۆی تەورێز هەڕەشە دەکا دەڵێن بۆ ئازەرییەکان ڕۆژێکی نزیک هەیە، پرس و خواسی ئەمانەی ڕوودرا و لە قەوامسەلتەنەی کۆنەپەرست بکات. ڕادیۆی تەورێز بڵاوی کردەوە کە ئەو هێزی تارانە کە چووەتە زنجان هیچ خراپیێک نەماوە لە بارەی ژن و منداڵ و عولەمایانیدا نەکرد بێ. دەستی درێژی ئەوان لە دەورەی مەغوولەکانیشەوە نەبووە. سەرکردەی دینی ئیمامی زنجان حوجەتولئیسلام محەمەد عەلیشیان کوژتووە.

تاران، ۲۹ (ر) خاوەند ئاگایان ئاگاداری دەدەن کە سەفیری ڕووس چۆتە لای خاوەند شکۆ شاهەنشای ئێران و ئەمەی نواندووە کە بزووتنەوە و کردەوەکانی قەواموسەلتەنە بەرانبەر بەحکوومەتی ڕووس دۆستانە و خۆشەویستانە نییە. بەڵێنی دابوو کە ئیشی ئازەربایجان بەخۆشی پێک بێنێ و ئێستا حکوومەتی ڕووس ئەو بزووتنەوەیە بەخۆشەویستی ناژمێرێت. لە دوای دوو سەعات هەڕەشەییێکی داوەتە قەواموسەلتەنە.

قەواموسسەلتەنەش وەڵامی داوە کە نابێ کەسێک خۆ تێکەڵ بەئیشی ناوخۆی ئێران بکات و ئەگەر هەڵبژاردن زوو بەپایان نەگەیندرێ، حکوومەتی ئێران بێ بڕیاری مەجلیسی پەرلەمان ناتوانێ هیچ ئیمتیازێک بداتە ڕووسەکان.

سەفارەتی بەریتانیا لە تاران ئەو دەنگوباسەی وەدرۆ خستەوە کە گوترابوو سەفیری بەریتانیا لە ئێرانی خوازتووە کە هێزی لەشکر بۆ هەموو پارچەکانی ئێران بنێرێ تاکو هەڵبژاردن زوو تەواو بکرێ.

## قیواموسسەلتەنە جاڕی دا

تاران ٤: قەواموسسەلتەنە جاڕی دا کە ڕۆژی شەممەی ۷ی مانگ لە هەموو ئێراندا هەڵبژاردن دەست پێ دەکرێ.

مۆسکۆ: حکوومەتی ناوچەیی ئێران نیرووی جەنگی نارده سەر ئازەربایجان بەسەر هەڵبژاردندا زال بێ.

تەوریز٤: ڕادیۆی ئەم شارە جاڕی دا کە لە هەموو شارەکانی ئازەربایجاندا بۆ بەبەربەرەکانی و پێش گرتن بەنێرووی تاران، دەستیان دایە چەک و جەعفەر پیشەوەری ڕوو بەهەموو ئازادیخوازهان وتارێکی گەرمی دا و ڕۆژنامەی ئازەربایجان سەروتارەکەی بەم وشە بوو کە ئێمە دووامین وتەی خۆمان دا کە کۆنەپەرستەکانیش لە تاران باشی دەزانن کە ئێمە لە هیچ جۆرە چەکێکی تاران ناترسین و داچڵەکینمان نییە.

لەندەن٤ (واع): وا دیارە کە قەواموسسەلتەنە دەڵێت ئەگەر مەیدان بەنیرووی ئێران نەدرێ بچێتە ئازەربایجان کە سەرپەرشتی هەڵبژاردن بکات، نمایندەکانی ئازەربایجان ناخوازرێن لە پەرلەمانی تازەدا دانیشن. بەوە ڕووسەکان لە مەجلیسدا پشتیوانی ناکرێن، کە بۆ پێکهاتنی داوخوازیان دەنگ وەرگرن.

## تاران جاڕ دەدا

تاران ٤ (ر): جاڕ درا کە هەڵبژاردن لە ڕۆژی شەممەوە خرایە ڕۆژی شەممەی هەوتی مانگ، کە ئەو ڕۆژە لە هەموو ئێراندا هەڵبژاردن دەست پێ دەکرێ؛ بەڵام بێجگە لە وڵاتی ئازەربایجان.

لەندەن هەروا (ر): ڕادیۆی تەورێز جاڕی دا کە پەنجا هەزار کەس کۆبوونەوە بڕیاریان دا کە پێویستە هەموو کەس لە ئازەربایجاندا دەست بەچەک بچێتە مەیدانەوە، پێش بەنیرووی تاران بگرێ.

لەندەن٦(ر): ئێوارەی دوێنێ کە ڕادیۆی تەورێز جاڕی دا کە نێرووی حکوومەتی تاران پەلاماری ئازەربایجانی دا، بەڵام لە تارانەوە ئەوە وەڕاست نەگێڕراوە.

لەندەن ١: تاکو ئێستا ئەو دەنگوباسەی ڕادیۆی تەورێز بڵاوی کردبۆوە، کە نێرووی حکوومەت پەلاماری بردە سەر ئازەربایجان، تاکو ئێستا چتێکی لێ پەیدا نەبووە. هەروا ڕادیۆی تەورێز دەڵێت: حکوومەت تانک و تۆپی زلی بەکاربردوون و زیانێکی زۆر دراوە، بەپێی نووسراوێکی لە تارانەوە هاتوو بێ دەنگی لە جێ خۆیەتی و سەربازێکی ئێرانی نەچوەتە ئازەربایجانەوە.

## ئێستگەی ڕادیۆی تاران هاواری کردە نەتەوەی ئێران

ئێستگەی ڕادیۆی تاران هاواری کردە نەتەوەی ئێران بۆ فەرمانبەری و دڵسوزی و نیشتمانپەرستی خواستنی فەرمانبەری حکوومەتی ناوچەیی بکەن و وتی کە سەرەک وەزیران هەر داوخوازییەکی مەشرووعی هەبووە داویە بەکۆمەڵەی دیموکرات لەو خاکەی وا بزووتنەوەی تێدا دەست پێ کراوە.

تاران، (ی. ب): ڕۆژنامەکانی لای چەپ پەلاماری سەرەک وەزیری ئیرانیان دا لەسەر ئەوە کە نیرووی بۆ سەر ئازەربایجان ناردووە و لەلایەکی دیکەشەوە ڕۆژنامەکانی لای ڕاست نەتەوەی ئێرانی هان دەدەن بۆ جەنگی دینی و جیهاد و غەزا بەرەو ڕووی ئازەربایجانییەکانی لە دین دەرچووی دوژمنی ئیسلام.

بەپێی ئەوانە کە لە ئازەربایجانەوە هاتوون هێز و ئامادەبوون بۆ جەنگ لە پایە بەدەر، کە لە سنووردان.

ڕۆژنامەی دیموکراتی ئێران نووسیویە کە هێزی ژاندارمی ئێران کوژراون و هێزی کارگەرانی توودە لە هەرێمی ساری پەلاماری ژاندارمی ئێرانیان بەدوادا گیراوە.

## لیژنەی حزبی دیموکراتی تاران

تاران (ی.ب): لیژنەی حزبی دیموکراتی تاران، ڕوو بەنەتەوەی ئازەربایجان، بانگی کردن و لە جەنگی وە پاش دەدان. ڕادیۆ دەڵێت:

عەشیرەتی شاسەیوان کە بەندەی حکوومەتە لەلای ئارەدوێلەوە پەلاماری بردە سەر هێزی ئازەربایجان. دوای زیان لێکەوتنێکی زۆر و بێ ژمار بەپاشدا گێڕایاننەوە و لە تازەکەند شەڕێکی دیکەش ڕووی دا، بەڵام سەرکێشەکان شکاندران و ئەفسەرێکی ئازەربایجان لە ڕوتبەی عەقیددا کوژرا. لە وڵاتی خەمسە، دە دەقیقە لە نێوانی نیرووی ئازەربایجان و عەشیرەتی زولفەقاردا شەڕێک ڕووی دا.

نیویۆرک، ٧(ر) حوسێن عەلا باڵیۆزی ئێران لە واشنتۆن، لە دەست ڕووس شکایەتی بردە بەر مەجلیسی ئاشتی کە مسیۆ ئیفاساد چیکۆڤ باڵیۆزی سۆڤیات لە تاران، حکوومەتی ئێرانی پەند داداوە بۆ ئەمە لەشکر نەنێرێتە سەر ئازەربایجان. مستەر دین ئەشیسۆن نوێنەری وەزیری دەرەوەی ئەمریکا ئاشکرای کرد کە حکوومەتی ئەمریکا پشتیوانی حکوومەتی ئێران دەکا لە ناردنی نیروو بۆ سەر ئازەربایجان کە بۆ ئاسایشی وڵات پێویست بێ.

## تاران ئاتاجێکی زۆری بەلەشکر هەیە

تاران: ئەفسەرێکی بارەگای سپایی لە تاران ئاشکرای کرد کە تاران ئاتانجێکی زۆری بەلەشکر هەیە؛ چونکە هەر هێزێکی کە هەیان بوو بەپەلەترین بۆ بەندەری پەهلەوی ناردراوە تا لە ئەستەرەوە پەلامار ببەنە سەر ئازەربایجان. لە تاراندا بێجگە لە هەزار و چەند سەربازێک پتر نەماوە، سەرەکی نێرو و سپاییەکان کۆبوونەوە کە بەتوندی پەلاماری ئازەربایجان بدەن.

تاران (ر): تاران جاڕی دا کە هەڵبژاردن پاش خرا تا موفەتیشەکان دەگەنە هەرێمی. بەئاشکرا جاڕ درا، کە لە هەرێمی باکوور شەڕ و کوژتار لە ناوچەی کارگەکاندا لە نێوانی نیرووی ئێران وتووودەدا گەرمە.

## هەڵگێڕ و وەرگێڕی دووامینی ئێران

تاران ١٨ : پەیامنێری دێیلی تەلگرافی لەوێوە دەڵێت: هەڵبژاردن لە ئازەربایجاندا وەپاشکەوت تا لە جێگای دکتۆر جاوید -کە ئێستا لە ماڵی خۆیا دەست بەسەرە-

حاکمێکی دیکەی دیموکراتی دادەندرێ و هەروا حاجی عەلیی شکستاری سەرەکی مەجلیسی خۆجێ خراوەتە زندانەوەو ئەم دوو پیاوانە بۆ تاران دەنێرن. تا نووسینی ئەم نامەیە هێز و ونیرووی ئێران نەگەیشتووەتە هیچ نوختەیەکی سنووری ڕووسییەوە؛ بەڵام هەر جێگایەکی نیرووی ئێران کە داگیری کردووە، دیوانی عورفی عەسکەری تێدا داناوە.

پەیامنێر دیسان پێیدا هەڵدەڵێ ئەم بەسەرداهاتووی دوایە لە هەموو گۆشەیەکی ئێراندا هەستێکی بۆ ڕووس ئافەریدە کرد. دامەزراندنەکان و نیقابەتەکانی کارگەرانی شیوعی داخران. بەدەستە لە هەموو لایەکەوە پەلاماری جێگاکانی حزبی توودەیاندا کە هەواخوای سۆفیات بوون و لە ئەندامەکانی ئەم حزبە درا.

موسکۆ: لە پەیامی ئێرانەوە ئەوانەی کە لە تەورێز کوژراون، ژمارەیان گەیشتۆتە ٦٠٠ کوژراو. لاشەی مردووەکان لەم لاولا فڕێ دراون.

## ئازربایجان دەگەڕێتەوە سەرباری خۆی

لەندەن: کۆورای ئیکۆنۆمیست لە ژمارەی دووامینی بەم ناونیشانە «ئازەربایجان دەگەڕێتەوە سەر باری خۆی» وتارێکی نووسیبوو و لە چلۆنی ئێستاکەی ئێرانیش دوابوو لەو وتارەدا ئەمە هاتبوو کە قەواموسسەلتەنەی سەرەک وەزیری ئێران لە ئازەربایجاندا، هێندێک لە چواریەکی لە بردنەوەدایە. بەشێوەییێکی سیاسی دەستوبردێکی تێدا کرد، بەڵام لە ئەم دەستپێکردنەی وا وەدەردەکەوێ، کە لەو سەربهوردانەی لە تەورێز ڕووی دابوون بۆ هەڵکەوت کە وردبینی و تەڕدەستی تێدا واند.

چەند هەفتەیەکی پێشوو نیشانەی پشێوی و کەوتن لە حکوومەتەکەی جەعفەر پیشەوەریدا لە ئاشکرابووندا بوو. جارێ مالییەی لە شپرزەییدا بوو.

هەروا لە هێندێک پیاوە دەست و پێوەندەکانیشی گومانی دزی، بەدبینی، بڕینیش ڕوویدا بوو. بەڵام کۆمەڵەکانی کە پشتیوانیان دەکرد و لە ڕادیۆی تەورێز بەناونیشانی «نمایشاتی بەگەرمە» کە بانگ دەکرا، ئەوەش بەڕاستی وەنەبوو پتر لە چەند کەسێکی کەم بەولاوەتر بووبێ. کە دانیشتووی خۆجێیی ئەمیان زانی و لە ڕاستییەکەی ئاگاداربوون، دەستیان کردە لێکۆڵینەوە و وردەکاری. جا وتیان کە هەڵبژاردن بەلایەن قەواموسسەلتەنە دەبێ نموونەی ئاشکرای بۆ کەوتنی حکوومەتی ئازەربایجان لەو دەمەوە دەستی دایە کە لە مانگی تشرینی دووەمی ڕابردوودا ملکەچی بۆ نیرووی حکوومەتی مەرکەزی ئێران کرد کە لە لای مەحالی زەریای خەزەرەوە ڕێ دایە بچێتە نێو خاکی ئازەربایجانەوە. جا ئەوەبوو کە

قەواموسسەلتەنە سەرەتای مانگی کانوونی یەکەم بۆ هەڵبژاردن بڕیاری دا و ڕۆژی شەشی ئەو مانگە دەستەیەکی نیرووی بۆ ئازەربایجان بنێرێ تاکو چاودێری هەڵبژاردن بکات.

قەواموسسەلتەنە لە پێش دەست بەهیچ کارێک بکا و ببزوێتەوە، چاوی بەنماینده‌کانی بەریتانیا و ئەمریکا و ڕووس کەوت. وادیارە کە لەو بابەتەوە قسەی لە گەڵیانا کردووە، لە چلۆنی ئازەربایجان دواوە و وتوویە کە لەوێ دوو فەرمان هەن: یان دەبێ بگوترێ کە ئازەربایجان لەتێکی ئێرانە کەوابێ هەر بیرەوەرییێکی وێچوو چاک بێ بۆی بکرێ و یان بگوترێ لە ئێران جیاوازە، بەوەش دەوترێ ئەوە چتێکی تازەیە دەستی پێکراوە.

نماینده‌کانی بەریتانیاو ئەمریکا لەوەدا پشتیوانیان کرد، بەلاّم نمایندەی ڕووس پەندی دایە، کە نێروو بۆ ئەوێ و بۆ باکوور نەنێرێ. بەلاّم قەواموسسەلتەنە مەسئوولییەتی ئەوەی لە پێش کۆمەڵەی ئاشتی خستە سەرخۆی و دەستی کردە نیروو بەرێکردن بۆ ئازەربایجان.

هەرا و کێشە لە تەورێز یەک دوو ڕۆژی کێشا و جەعفەر پیشەوەری و وەزیرەکەی مەعاریفیشی هەڵگرت و بەفرۆکە و زۆر بەپەلە خۆی گەیاندە خاکی ڕووسیە لە پاشان دیموکراتییە ئازەربایجانییەکان ئەمجارەیان ڕەخنەدار کرد کە دەیانوت دەمانەوێ بڕیاری ئیشوکاری ئێمە تەنیا مەجلیس بیدات، نەک لە هیچ لایەکی دیکەوە.

ئێستا ڕادیۆی تەورێز وتنەکانی بەشێوەی ئێرانی و ئازەربایجانی بلاّو دەکاتەوە. ئا ئەوە دوواین هەڵکەوتی خۆجێیی بەڕاستی بوو ڕوویدا، لەو جێگایەدا بەڕاستی هیچ نەگۆڕادراوە؛ چونکە منافەسەی دوەلی زۆر بەهێز لە ئێران دایە. هەر چیکو ڕووسەکانە بەچاوێکی زۆر موهیمەوە تەماشای دەکا، بۆ هەر جۆر بەرئاوەژوویەکی دیپلۆماسی، یان هەر جۆرە بیرمەندێک لەلایەن نیرووی بەربەرەکانیکەرەوە لەو ولاّتەدا کە پڕە لە نەفت و بردنی بۆ زەریای قەزوین نە ڕۆژنامەکانی ڕووسیە و نە ڕادیۆکانی هیچ جۆرە وردەکارییەکیان لەو ئازەربایجانەی نەکرد کە بەچی جۆرێک بوونی ئازەربایجان پێ بەپایان گەیاندرا. ڕادیۆ و ڕۆژنامەکان هەر لەوە دەدوێن کە زۆر چاک بوو بەخۆشی پێکهێنرا.

بەلاّم ئێستاکە ڕووس لە بەرانبەر دوو فەرماندایە: یان یارمەتدانی دیکە بداتە جەعفەر پیشەوەری و یان لەسەر ئەو ڕووداوانە بڕیار بدات. بەلاّم وا دیار دەکا، کە هی دووەمیان هەڵبژاردووە و پەسندیان کردووە، بەلاّم هەرا و کێشەی دیپلۆماسی نەگەیشتە پایان. ئەوەتا وەزارەتی دەرەوەی ڕووسیە لەوانە کە نمایندەی ولاّتەکانی ڕۆژاوا دەکەن پتر بەپەلە و بەزاتترە لە گۆڕینی، ئەو وەزارەیە جیاوازبوونەوەیی لە ئازەربایجاندا ئێستا بێ گومانە

دەبێتە هاوسازی بۆ سەرکێشی هەست کە بەنەیاری ڕووسە. بەڵام چاوەنۆڕی دەکرێ و جێگای ئومێدە کە مۆسکۆ دەرەقەت دەستخا، کات ڕابگرێ و چاوەڕوانی مەجلیس بێ لە بارەی ئیمتیازەکانی نەفتەوە. جا ئەوجار کەوا بوو نفوزی خۆی دەگرێتەوە؛ چونکە ئەوە زیانێکی دەمییە بۆ تەقەلادانی نزیک بوونەوەی بەئێران لەسەر بەرێچوونێکی وەنەبێ ئاسان بێ لە نواندندا بۆ دیموکراتییەتی ڕۆژاواییەکان.

## تەلگرافی سەرەک وەزیری ئێران

تاران: نامەی هەفتەگی کوهستان، لە ژمارەی ٧٢ یدا ڕوونوسی ئەو تەلگرافە دەنووسێ کە جەنابی قەواموسسەلتەنە بۆ قازی محەمەدی ناردووەتە مەهاباد:

جەنابی ئاغای قازی محەمەد، بەم جۆرە کە ئەم لایە تەسمیمی کردووە، هەڵبژاردن لە ژێر چاودێری ئەو نیرووی تەئمینییەدا پێک دێندرێ کە لە مەرکەزەوە ڕێک دەخرێ و دەنێردرێ و دەبێ لە وڵاتی کوردنشینی ئازەربایجاندا هەڵبژاردن بەهاوڕێیی سەمیمانە و دڵسوزی تەواو عیلاقەمەندی ئێوە ئەنجام بدرێ و پێک بێندرێ. جا لەبەرئەوە لە خۆی، شاپوور، ڕەزایییە، مەهاباد -کە وڵاتی کوردنشینن- پێویستە کە ئێوە تەعیین بکەن لەگەڵ نێرووی تەئمینییە بەچی جۆرێک هاوڕێیی سەمیمانە و دڵسۆزی و عیلاقەمەندی تایبەتێکی کە لەم موودەتەدا لە شەخسی ئێوە مولاحەزە کراوە. ئەوە چاوەنۆڕی و ئینتزار دەکەین کە لەو جێگانەدا کەوا مەوزووعی کوردەکان لە نێوانیدایە عیلاقەمەندی کامیلی خۆتان بۆ پێشکەوتنی ئەو کارەی لە دەستدایە بەکردن عەمەلی بنوێن.نوخوست وەزیر. قەواموسسەلتەند.

## وەڵامی قازی محەمەد بەتەلگراف بۆ سەرەک وەزیری ئێران

ڕۆژنامەی تۆفان ژمارە ١٠٩ کە ئەمە دەڵێت کە قەواموسسەلتەنە بەتەلگراف لەگەڵ قازی محەمەد مخابەرەی کردووە. ئاغای قازی محەمەد بەتەلگراف لە وەڵامی قیواموسسەلتەنەدا دەستبەجێ لە ڕووی ڕاستییەوە مخابەرەی کرد. لەوێدا وتبووی کە ئێمە بۆ خۆمان ئامادەین پێش بەهەموو جۆرە بێ نەزمێک بگرین و هەڵبەت دەوڵەت نابێ ڕەوا بدێرێ کە هێزی تەئمینییە بچێتە نێو وڵاتی کوردنشینەوە.

## وەڵامی قازی محەمەد بۆ سەرەک وەزیری ئێران

تاکو ئەو کارەی لە دەورەی چاردەم کە سەرلەشکر ئەرفەع کردبووی لە کاتی هەڵبژاردندا دڵی کوردەکانی بریندار کردبوو، دووبارە نەکرێتەوە و لەسەر ئەوە دووبارەی کردەوە کە ئێمە بۆ پارازتنی ئینتیزامات لە کاتی هەڵبژاردندا بەهێز و توانایان و لە مادەی ٤ی قانوونی هەڵبژاردن ئیستفادە دەکەین. لەو بابەتەوە خاتری جەنابی عالی ئاسوودە بێ و لەبارەی خۆی و شاپوور و ڕەزاییە و مەهاباد و چەند جێگایێکی دیکەش کە لە تەلگرافەکەدا ئیشارەتان فەرموو بوو، خودی جەنابی ئەشرەف بۆ ئەو جێگایانە فەرماندارتان هەڵبژاردووە. بێ گومان هەر جۆرێکی بەچاکی بزانن و دەستوور سادیر بکەن، ئەوە بەتەواوی ئیجرا دەکرێ.

تاران: سەرکردەی لەشکری ئێران ئاشکرای کرد کە دیموکراتییەکانی ئازەربایجان دەیانەویست بەزۆر بەسەر ئێراندا زاڵ بن، بەڵام سپای ئێران زوو ئارەزووی ئەوانی شکاند لەندەن: لەتاران دەنگ دەرچوو کە عەلی مەنسوورکراوە بەحاکمی وڵاتی ئازەربایجان لە جێگای دکتۆر سەلامولڵاهی جاویدێکی کە لەگەڵ دیموکراتییەکان بوو بەدەست بەسەری برایە تارانەوە. هەڵبژاردنیش لە ئازەربایجان پاش دەخرێ تاکو ئاسایشت دامەزرێندرێتەوە.

## قازی محەمەد بەخێرهاتنی سپای ئێرانی کردووە

٢٣ ک١ تاران، (ر) ١-ب: بەلاغی ڕەسمی لەلایەن سەرلەشکری ئێرانەوە دەگەیەنێ کە قازی محەمەد بەخێرهاتنی سپای شاهەنشای کردووە. وەکو بەنیانی ئاگاداری دراوە بەتاران، هێشتا لە کێوەکاندا زەدوخورد هەر ڕاگیراوە.

## خۆبەدەستەوەدان

هەروەکو بڵاوکراوەتەوە و زاندراوە، سەید ئەحمەد تاها -کە بە«هەکۆ سەید تەها» دەناسرێ- کوڕی مەرحووم سەید تەهای شەمدینییە لە قەزاری ڕەواندز موڵک و دێهاتیان هەیە و پێنج برای لەسەر دانیشتوون و برای سەعادەتی شێخ محەمەد سدیق تاهایە بۆ سەرپەرشتی موڵک و ئەملاکێکی لە ئێرانیان هەیە، گۆیا چووبوو و ئیلتیحاقی دەستەی دیموکراتییەکانی کوردی ئەولای کردبوو؛ هەڵاتووە، لە سنووری عیراق خۆی تەسلیم بەهێزی حکوومەتی عیراق کردووە.

## کوردستان لە رۆژنامەکانی تاراندا

نامەی هەفتەگی کۆهستانی تارانی لە ژمارەی ٧٤دا لە وتارە سەرەکییەکەیدا بەم جۆرە هاتووە: وەختی ئەوەیە کە دەوڵەت بۆ کوردستان بەرنامەیەکی ئەساسی بگرێتە پێش چاو.

لە کاتی یەکەم تەلگرافی سەرەک وەزیر بۆ ئازەربایجان لە رۆژنامەکاندا بەراوەژوو وەرگیراوە کە دەوڵەت دەیەوێ هێز بۆ ئەو ولاتە بنێرێ. مرۆڤ ئەوەی لە ئازەربایجانی دەبیست و ئەوەی کە لەلایەنی دیموکراتی ئەو جێگایەوە بەهۆی سیاسەتی دەرەوەی دەزانی ئەو دەستپێکردنانەیان خالّی لە ئیشکال نەزانیوە. هەموو بەدوودڵی و نیگەرانییەوە لە خۆیان دەپرسی کە داخۆ ئەنجامی ئەم ئیشە چۆن دەبێ. توندیی ئارەزووی دەوڵەت و تووڕەیەکی لە رادیۆی تەورێزدا بوو پتر گومانی خستبووە چلۆنی ئیشەوە. بەلام ئەوانەی هەموو بزووتنەوەیەکی چلۆنی گێتییان هێنابووە پێش وردەکارییەوە لەوێ چوونی چتێکی چاوەنۆڕی نەدەکرا. لە نێوانی نەتەوەکاندا بۆنێکی ئومێدیان دەکرد و بەهاتوویەکی سەرکەوتنی دەوڵەت هێندێک بەئومێدبوون. بەلام دەستپێکردنی دەوڵەت بەبڕەبوو، دەبوایە ئازەربایجان خۆبەدەستەوە بدا؛ یان هەروا کێشە و لێکدان ناچاری خۆبەدەستەوەدانی بکا.

یەکێک لەوانەی کە لە ئیشی لەشکرکێشیدا پسپۆڕ بوو بڕیاری ئەمەبوو کە دەبێ لە سێ لاوە دەست پێ بکرێ: یەکیان لە رۆژهەلاتەوە بۆ جێگری و خەریککردنی هێزی ئازەربایجان و یەکێکیش لە رۆژاوای بانە و سەردەشتەوە. ئەوەش بۆ سەرگەرمکردنی نیرووەکانی دیموکراتی کوردستان و دەستەیەکش لە سنووری پچڕاندنەوەی کوردستان و ئازەربایجان؛ یانی لە خەتی «تەکاو»، پەلاماری بەتین وتوند بەرێ تاکو نەهێلێ هێزی ئازەربایجان و کوردستان یارمەتی یەکتر بکەن و زۆر بەپەلە ڕوو بەلای میاندواو مەراغە و تەووریز بچنە پێش.

## میوانداریکردن بۆ نوێنەرەکانی عەشایر و ئیلاتی کورد و مەشایەخەکانیان

تاران: کوردستان ژمارە ٨١ هەفتەی ڕابردوو دەستەیەک لە مشایخ و ڕوئەسایانی کورد لەلایەن ستادی ئەرتش بۆ تاران میوانداری کرابوون کە لە جەژنی سەدەی لە دانیشکەدەی ئەفسەریدا کە لە پێشگای خاوەند شکۆی شاهەنشایدا پێک دێندرێ لە ڕوودابوون. ئەو ئاغایانەی کە میوانداری کرابوون ئەمانەن:

لە مەهابادەوە: مام عەزیزی ئەمیری عەشایری مامەش، مەحمود ئاغای ئیلخانی دیبوکری، عەبدوللا ئاغای ئیلخانی زادەی دیبوکری، بایەزید عەباس دیبوکری، عەلی

عەباس دیبوکری، ئیسماعیل عەباس دیبوکری، ئیبراهیم سالاری مەنگوڕ، عەبدوللا بایەزیدی مەنگوڕ، سەلیم ئاغای ئاجاق مەنگوڕ، عەلی ئاغا جوانمەردی مەنگوڕ، ڕەحمان تەیموری مەنگوڕ، بایەزید عەزیزی گەوورک، کاکەللا حوسنی گەوورک، پیرۆت محەمەدی گەوورک، ڕەسوول محەمەدی مەنگوڕ، عەبدوللا قادری مامەش، قادر قارەمانی شارویران، ئیبراهیم قادری شارویران.

بۆ نوێنەرەکانی عەشایر و ئێلاتی کورد و مشایەخەکانیان. لە مشایخ و تاجیر: ئاغای شێخ ئاغای، مەلا خەلیل گۆڕەمەری، شێخ عەبدوڕەحیم شەمسەدینی، قازی موکری، سەید ڕەئووف قازی موکری، میرزا ڕەحمەت شافیعی بازرگان.

لە سەقزەوە: ئاغای قادرخانی ئەنۆ شێروانی، عەبدوللا ئەنۆ شێروانی، حاجی محەمەد وەکیلی، محەمەد سوڵتانی، ڕەزا کەلهوڕ، محەمەد سوڵتان پەنا، ساڵح سوڵتان پەنا، ڕەشید دیوانی، محەمەد سوڵتانی.

لە بانەوە: عیزەت ئەحمەدی، ڕەحمان ئەحمەدی، ڕەشید ئەحمەدی.

لە تێلەکۆوە: محەمەد حەبیبی، موزەفەر حەبیبی، عەلی حەمە وەیسی، محەمەد فاتیحی.

لە کۆماسییەوە: فەرەج بەگ زەنووی، فایەق بەگ شابازی، محەمەد ساڵح ڕەشیدی.

لە هەورامانەوە: ئاغای محەمەد شەریف ئەڵمانە، عەبدوللا بەگ دزلی.

لە مەریوانەوە: عەبدوللا بەگ وەلەژێری، سەید ئەحمەد شێخ ولئسیلامی، شێخ ئەحمەد کونەپووشی، محەمەد عەلی بەگ بێلە.

لە گەلباغی: ئاغای یەحیا ئەمینی، محەمەد عەلی ئەمیر حوسنی، ئەحمەد پیشاری.

## ڕووئەسایانی کورد لە ئێران

تاران (ر): ئەو ڕووئەسایانەی کورد کە خزمەتی حکوومەتی تارانیان کردبوو لە کاتی هەرای کوردستانی ئازاد لە مەهاباددا و یارمەتی سپای تارانیان دابوو و بەربەرەکانیان لەگەڵ کوردەکانی ئازادیخوادا کردبوو، خوازترانە تاران لە کولیەی ئەفسەری میوانداری کران. ڕۆژی ٣ ی شوبات چەند ڕۆژنامەنووسێکی تاران چوونە لایان و پرسیاریان لێیان کرد.

ئەو ڕۆژە بۆ نانی نیوەڕۆ لە ئەرتش میوانداری کران. دوای نان خواردن عەلی ڕەزم ئارا وتەیەکی دوورودرێژی خوێندەوە لە ئازایی و نیشتمانپەرستی ئاغاکان دوا. سەرکردەی

لەشکری ٤، ئاغـای حـوسێنی لە ئازایی سـپـا و تێکۆشـینی دلێـرانەی ئەفـسـەران و میهەنپەرستی ئاغایانی کوردستان دوا کە لە بەرانبەری کوردەکانی ئازادیخوازی مەهابادا بۆ حکوومەت چی خزمەتێکی شایانیان کردووە و لە چی پایەیەکدا بەماڵ و گیان هاوڕێی و پشـتـیـوانی لەشکریان کـردوە بۆ سـەرکـەوتنیـان بەسـەر کـوردە ئازادیخـواهەکـانی جەمـهـوریـیـەتخوازاندا و لە خـاوەند شکۆ خـوازترا بەرانبـەر بەو خـزمـەتانەی کـردوویانە عەواتیف و مـیـهرەبانی بفەرمووێ. لە دوای ئەوە خاوەند شکۆ شاهەنشای ئێران دوازدە پارچە شاڵی کشمیری بەخەڵات دا بەدوازدە ئاغایانی سەرکردەی ئەو کوردانە.

## مەلا مستەفا لە تاران

«الخبار» ١١ شوبات: مەلا مـسـتـەفـا بارزانی لە تاران خەریکی مـوفـاوەزات بوو لـەگـەڵ حکوومەتی مەرکەزیدا: یان لە ئێران بمێننەوە، یان بۆ عیراق بگەڕێنەوە.

١٠ تاران: ئێـران بـوو بەپەناگـا بۆ کـوردەکـانی بارزان. مـەلا مـسـتـەفـای زەعـیـمی ئەو کوردانە لە تاران گەڕاوە کە لەگەڵ هاوڕێیەکانی خۆیدا پرس و باسی ئەمە بـکا داخوا لە ئێـران دانیـشـن و چەک فـڕێ دەن و خـەریکی کـشـتـوکـاڵ بن یان بگەڕێنەوە عـیـراق. حکوومەتی ئێران وای بڕیاردا، کە مەلا مستەفا و سەد کەس لەو کوردانەی کە حکوومەتی عـیراق حوکمی مەرگ و زندانی داون، لە ئێران بن و هی دیکە بگەڕێنەوە عـیراق. ئەگەر یەک لەو دوانە پەسەند نەکەن حکوومەتی ئێران دەست بەدەرکردنیـان دەکا، بەمـەرجێ ئەمە نەچەکیان لێ وەرگرێتەوە و نە بیانداتەوە بەعیراق.

## کوردی مەهاباد

تاران، ٣ ی شوبات (ر): عـەشـیـرەتی قـادری -کـە هەواخـوای کـوردسـتـانـی ئازاد بـوو- ڕووئەساکانی گیران و دران بەمەحکەمەی عەسکەری حکوومەتی تاران؛ لە شاری بۆکان محاکەمە کران. کوردەکانی فەیزوڵلا بەگی لاگیری حکوومەتی جەمهووری کوردستانی ئازادبوون و عەبدوڵلا بەگی و هی دیکەش لەلایەن حکوومەتی مەرکەزییەوە گیران و درانە مەحکەمەی عورفی عەسکەری و مەحکووم کران.

لەندەن، ڕۆیتەر تاران (ر) ٧ ی شوبات: لە نێوان نیرووی هەواخواهانی جەمهوورییەتی کوردسـتـان و هێزی حکوومـەتی مەرکەزیدا هەرایەکی سووک ڕووی دا. چەند ئاواییەکی کـوردەکـان تالان کـران. فـەرمـاندەی تاران لە سنووری سـەقـزدا وای بلاو کـردەوە کـە چەند کەسێکی کوردی مەحکووم لە سەقز و جێگایانی دیکە بەدار کران و خنکاندیانن.

## یازده کوردی ئازادیخواز له قه‌ناره‌دران

«السجل» ژماره ۱۱۷ ، ۱۷ی شوبات تاران: په‌یامنێری ڕۆیته‌ر ده‌ڵێت: له کوردستاندا شۆڕش و هه‌را به‌رپا بووه. ده‌سته‌یه‌ک له کورده‌کانی جه‌مهووری کوردستان به‌پڕ چه‌کییه‌وه یه‌ک له‌سه‌ر یه‌ک په‌لاماریان برده سه‌ر ناوچه‌ی هێزی حکوومه‌تی تاران له کوردستاندا. کوژتارێکی زۆر قورس کرا؛ خانوو و چاندن و کرداری چه‌ند دێهاتێک وێران کرا. ده‌نگوباسێکی، که هێشتا به‌ره‌سمی وه‌ڕاست نه‌گه‌ڕاوه ئه‌مه‌یه که حکوومه‌تی تاران ده‌یه‌وێ له‌شکرێکی پڕ چه‌ک بنێرێته هاواری ئه‌و له‌شکره‌ی خۆی له هێندێک جێگایانی کوردستان. چونکه هێزی تاران له‌و وڵاته‌دا بێ تین و که‌مه.

له تاران سه‌ره‌ک ئه‌رکانی سپای ئێران ئاشکرای کرد که یازده که‌س له کوردی جه‌مهووری که په‌لاماریان هێنابوو، به‌خنکاندن حوکم دران و له‌و وڵاته له قه‌ناره دران و کوژران. دایره ئاگاداربووه‌کانی سیاسی له‌سه‌ر ئه‌وه‌ن که به‌هۆی له قه‌ناره‌دانی ئه‌و کوردانه، پشێوی و شوڕش و هه‌رایه‌کی قورس له کوردستاندا ده‌ست پێ کراوه. ئه‌وکاره هه‌موو کوردی کوردستانی دڵگیر و ناگوزیر کردووه.

## کوردی بارزان ده‌مێنن یان ده‌رده‌که‌ون

تاران، (ر) ۱۱: مه‌لا مسته‌فا بارزانی له تاران خه‌ریکی موفاوه‌زات بوو بۆ مانه‌وه‌یان له ئێران، یان ده‌رکه‌ون.

تاران، (ر): ئێران بوو به‌په‌ناگای کورده‌کانی بارزان که ساڵی پار به‌نه‌یاری عیراق ده‌ستیان کرد به‌شۆڕش و له پاشان په‌نایان بۆ ئێران برد. مه‌لا مسته‌فای زه‌عیمی ئه‌و کوردانه له تارانه‌وه ڕوو به‌نێو کورده‌کان گه‌ڕاوه تاکو پرس به‌هاوڕێیه‌کانی بکا، داخوا دامه‌زرێن، یان بۆ عیراق بگه‌ڕێنه‌وه، له سه‌ر یه‌ک له‌و دووانه بڕیارێ بده‌ن و حکوومه‌تیش به‌ماڵ و دانه‌وێڵه و پێویست ده‌ستیان بگرێ و خه‌ریکی جووت و گا بن و ئه‌گه‌ر ویستیان بگه‌ڕێنه‌وه عیراق، ده‌بێ مه‌لا مسته‌فا و سه‌د که‌سی هاوڕێی له کورده‌کانی بارزان که له حکوومه‌تی عیراق مه‌حکووم کراون نه‌چنه‌وه و ئه‌گه‌ر یه‌ک له‌و دووانه نه‌که‌ن، حکوومه‌تی ئێران له ئێران ده‌ریان ده‌کا. به‌ڵام نه چه‌کیان لێ ده‌ستێنێته‌وه نه‌ده‌شیانداته‌وه به‌عیراق.

## حکوومەتی ئێران کوردەکان سەری شک دەکا

## لە ئێران دەمێننەوە یان بۆ عیراق دەگەڕێنەوە

لەندەن،٢٣(ی): ڕادیۆی تاران بڵاوی کردەوە کە هێزی تاران شاری شنۆی گرت، کە شارێکی کوردستانی عولیایە بەسنووری تورکیە و عیراقەوە هاوسنوورە. ئەو شارە ناوچەیەکی سەرەتای چەندان هەزار کورد و کوردانی بارزان بوو کە لە دوای شۆڕش هەڵایساندنیان لەعیراق ساڵی پارەکە پەنایان بۆ کوردستانی ئێران بردبوو.

دەگێڕنەوە گۆیا شار بێ کێشە و هەرا و بەربەستی گیراوە. نوێنەری پەیامنێری ڕۆیتەر دەڵێت: کە ژمارەی ئەو کوردە چەکدارانە پازدە هەزار پیاوی جەنگین. حکوومەتی ئێران سەرپشکی کردوون لە نێوانی مانەوەیان لە خاکی ئێراندا، وەیان گەڕانەوەیان بۆ خاکی عیراق. بەڵام بەبێ زەعیمەکانیان کە لەلایەن حکوومەتی عیراقەوە پاشملە بەخنکاندن و بەزندانی و بەندی و هەموو جۆرە سزایک حوکم دراون، بەڵام هی دیکەیان دەتوانن بۆ عیراق بگەڕێنەوە؛ یان لە ئێران دامەزرێن. خۆ ئەگەر مانەوەیان لە ئێران هەڵبژارد، لە سەریان پێویست دەبێ کە چەکەکانی بەدەستیانەوەیە فڕێدەن. کە وایان کرد ئەوجا حکوومەتی ئێرانیش بەماڵ، بەدانەوێڵە، بەقوماش و کشتوکاڵ و پێویستی کشتوکاڵ یارمەتییان دەکا؛ دەستیان دەگرێ و پشتیوانییان دەدا. خۆ ئەگەر یەک لەو دووانەیان نەکرد، حکوومەتی ئێران لە خاکی ئێرانیان دەردەکا، بێ ئەوەی چەکیان بکاو بیانداتەوە بەعیراق.

## بەشی دووەم

## ئێران بارزانییەکان دەردەکا

تاران، ٢٤(ی،ب) (ر): سەرەک ئەرکانی جەنگی ئێران ئاشکرای کرد کە ئەمە بوو بەسێ ڕۆژ هێزی ئێران ڕوو بەکوردستان لە چوویندایە؛ لە سنووری ئێرانی و عیراقییەوە دەچێتە پێش. وەزارەتی جەنگی ئێران بەبەراژووی ئەو دەنگوباسەوە جاڕی دا. هێزی ئێران بەسەر شنۆدا زاڵ نەبوو و بەسەر هیچ شارێکی دیکە لە شارەکانی کوردستاندا دەسەڵاتی پەیدا نەکردووەو کوردەکانیش تا چەند ڕۆژی پێشوو دەستیان بەهیچ بەربەرەکانییەک نەکردووە.
پەلاماربردنی هێزی ئێران بۆ سەر کوردستان لەبەر دوو چتە:

**یەکەم:** پاککردنەوەی کوردستان لە سەرکێشی.

**دووەم:** نەهێشتنی بارزانییەکان، لەسەر نەخشەیێکی دایانناوە بڕۆن، کەوا چەک بەدەستەوە نادەن، یان دەرکردنیان لە ئێرانەوە بۆ عیراق.

زەعیمی کوردەکان فەتحوللا داوودی -یەکێک لە سەرکردەکانی کوردی بوشیر- گەیشتە تاران؛ کە بوشیر لەسەر خەلیجی فارسە. ئەو شارە لە کاتی سەرکشی قەشقاییاندا، کوردەکان داگیریان کردبوو، حکوومەتی ئێران تاکو ئێستا نەیگرتبۆوە.

تاران: سەرەکی لەشکری ئێران بڵاوی کردەوە کە دەستەیەک لە ئەرمەن و ئاسووری گەیشتنە کوردەکان و پشتیوانییان دەکەن. دیسان وتی کە کوردەکان لە جەنگی دوایی پازدە کوژراو و پەنجا برینداریان داوە.

## شۆڕش لە کوردستان نەبڕاوەتەوە

ڕۆژنامەی «السجل»ی بەغدایی، ژمارە ١١٧ی شوبات: دەڵێ: تاران و پەیامنێری ڕۆیتەر بڵاویان کردەوە کە لە کوردستاندا هێشتا شۆڕش هەر بەرپایە. دەستەیەک کوردی پڕ چەک پەلاماری یەک لە دوای یەکیان دایە سەر دێهاتەکان، وێرانیان کرد و کردار و شینایییان هەموو سووتاند. بەڵام هێندێک شۆڕش هەر ڕاگیراوە، کە هێشتا وەڕاست نەگەڕاوە، ئەویش لەوەوە دیار دەکرێ حکوومەتی تاران دەیەوێ بۆ کوژاندنەوەی ئەو شۆڕشە، لەشکرێکی بەتین و پڕ چەک لە تارانەوە بۆ کوردستان بەرێ کا تاکو پشتیوانی ئەو لەشکرەی تارانە بکەن کە لە کوردستانن و بێ هێزن.

سەرەکی ئەرکانی جەنگی ئێران لە تاران بڵاوی کردەوە کە یازدە کەس لە کوردە پەلامارهێنەرەکان لە لایەن مەحکەمەی عەسکەرییەوە بەخنکاندن مەحکووم کران؛ دەمودەست لەسەر دار دران و کوژران. ئەو ئیشە بوو بەمایەی ناگوزیری و دڵگیری هەموو کورد.

## سەرۆکەکانی کورد لە تاران

ئەنقەرە، (ر) تاران ١٨ی شوبات: سەرەک وەزیری ئێران بڵاوی کردەوە کە لە وڵاتی فارس و جێگایانی دیکە کە عەشایر چەکەکانیان نەداوەتە دەست هێزی حکوومەت تا چەک بەدەستەوە نەدەن لەو جێگایانەدا هەڵبژاردن دەست پێ ناکرێ. ناسرخان قەشقایی وەڵامی داوەتەوە کە چەک بەدەستەوە نادات.

## عومەرخان ڕەئیسی عەشیرەتی شکاک

تاران، ١٩ (ر): کە عومەر خانی ڕەئیسی عەشیرەتی شکاک -کوردی ورمێ- لەگەڵ چەند ڕەئیسی دیکەی کوردەکانی ورمێ ڕۆژی سێ شەممەی شوبات گەیشتنە تاران، چوونە ئەرتش خۆیان نواند و بۆ بەیانی سەرفرۆیی هاتوون.

تاران، ١٩ (ر): بڵاوی کردەوە کە ڕەئیسەکانی کوردی مەهاباد و سەقز و بانە و مەریوان -کە هاتبوونە تاران- بەڕێز و حورمەتەوە نوازشت کران و خاوەند شکۆ شاهەنشا بەدەستی خۆی خەڵاتی پێدان و نوازشتی کردن.

لە پاش میوانداری، هەریەک بۆ جێگای خۆیان گەڕانەوە. ئەو سەرانی ئێلات و عەشایری کوردان بەئێمەڕا هاودەردی و هاوزەحمەتیان کرد لە کاتی ئاشوبپەرستەکانی ماجەراجۆیانی کە ئاوازەی خودسەری و خودپەرستییان بەناوی ئازادیخواهی بەند کردبوو؛ هەناوی ئێمەیان لە سوتیی ئازەرپاتەگان لە ئاگری ئازەریدا پاتبوو. ئەو سەرانەی کوردی شاپەرستی و میهەندۆست هاوسۆز و نیازی ئێمە بوون وا بۆ وەڕاست گەڕانی شاپەرستی و ئێران دۆستی هاتنە تاران و پەزیرائی کران و چونکە ئەوسا لە ڕابووردووە پشتیوانی لەشکرییان کردووە بۆ ڕزگاری ئازەرپاتەکان لە ئاشوب خوازان؛ بۆیە لە ئەرتش هەرچییێکی شایان بوو بۆیان کردن و بەحورمەتەوە بەڕێیان کردن.

ئێران هەتا ئەو جوامێر و دلێرانەی هەبێ، ئێران هیچ ناگوزووریەکی تووش نابێ و هیچ ئەهریمەنێک ڕەخنەداری ناکا. هەروا درێژەی بەوتن دا و وتی کە ئازەری ئازەرپاتەگان ئازەری پێغەمبەری ئێرانییە؛ نەک ئازیری تەتەری و جەنگیزی بێ. هەروا وتی کە زەمزمەی کورد و لوڕ و تورک چییە، زەمزمەی ئێران و ئێرانی پەرستییە و لە تەبرێز و ڕەزاییە دوا. لە میهەنپەرستی کوردانی ڕەزاییەی باس کرد کە کوردی ڕەزاییە ڕەزامەندی بەشاهەنشادا.

## ناسر قەشقایی چەک بەدەستەوە نادا

تاران، (فرانس پرێس): قەواموسەلتەنەی سەرەک وەزیری ئێران ئاشکرای کرد: عەفووی عام دەرخستن لە بارەی ئەو عەشیرەتانەی، کە لە نیرووی ئێراندا سەرکێش بوون، تا ئەو عەشیرەتە چەک بەدەستەوە نەدا، ئەو عەفووەی بەرناکەوێ. لە دوای ئەو ئاشکراکردنە چاوی بەناسر قەشقایی کەوت و بەخاوەند ڕۆژنامەکانی وەڵام دا کە ئەو مەرجانە بەهیچ کارێک جێبەجێ ناکرێن.

تاران: حکوومەتی ئێرانی لە تاران، دەستە تۆپێکی «برنی» شێست تیری دا بەنەوەد و هەوت کەس لە گەورە و سەرۆکەکانی کورد: شا سەیوان، زولفەقاری. چونکە ئەوانە لە کاتی شۆڕشی ئازەربایجاندا سەریان بۆ حکوومەتی مەرکەزی چەماندبوو؛ خزمەتیان کرد.

## حکوومەتی ئێران تەقەلا دەدات قەشقاییەکان بێ چەک کات

لە پەیامنێری ڕۆژنامەی فەرەنسە -فرانس پرێس-دا باسی کردووە دەڵێت:

ناسر قەشقایی، سەرەک عەشیرەتی قەشقایی -کە بەرامبەر بەئێران سەرکێشی کردبوو- چاوەنۆڕی دەکرێ بگاتە تاران. ئەو چوونەشی لەسەر خواستنی قەواموسسەلتەنەی سەرەک وەزیری حکوومەتی ئێرانە، کە دەیەوی گفتوگۆی پێکهاتن لە گەڵ ناسر قەشقاییدا دووبارە بکاتەوە لە بابەت چەک فڕێدانی عەشیرەتی قەشقایی؛ تاکو بتواندرێ هەڵبژاردن دەست پێ بکرێ.

حکوومەتی ئێران بڕیاری دا کە لە دوای دامرکاندنەوەی ئازەربایجان، لە وڵاتی فارسدا هەڵبژاردن دەست پێ بکا، بەلام بەمەرجی ئەمە کە عەشیرەتی ئەو وڵاتە لە چەک ڕووت کاتەوە. بەلام مانگێک لەمە پێش ناسر قەشقایی ئاشکرای کرد، کە ئەگەر حکوومەتی ئێران بێت و هەڵبژاردن بەچەک وەرگرتنەوە گرێ بدات، ئەوا لە وڵاتی فارسدا هەڵبژاردن دەست پێ ناکرێ.

## کوردەکانی بارزان لە گەڵ حکوومەتی ئێران موفاوەزە دەکەن

تاران ٤ی ئادار: نوێنەری ڕۆژنامەی فەرەنسە ئەمرۆ بڵاوی کردەوە کە هێزی ئێران هەروا خەریکی دەرکردنی کوردەکانی بارزانە. زەعیمی ئەو کوردانە وەفدێکی ناردۆتە لای جەنەڕاڵ همایوونی سەرکردەی هێزی ئێران؛ کە ئەوان دەنوێنێ، بۆ ئەوەی قسە لە گەڵ خاوەند دەستەلاتی ئێراندا بکا بۆ گرێدانی هودنە لە نێوان هەردوولایاندا.

## داخوا بارزانییەکان خۆیان دایە هێزی ئێرانەوە

نامەی پەیامنێری نوێنەری ڕۆژنامەی فرەنسە لە تارانەوە وتوویە: کە ئەمە بوو بەچەند ڕۆژ نیرووی ئێران دەستی داوەتێ مەلا مستەفای بارزانی دەردەکات. پەیامنێری نوێنەری بێژراو لە جێگایانی باوەڕپێکراوانی بیستووە کە مەلا مستەفا لە حکوومەتی ئێرانی هودنە و موفاوەزەی خواستووە کە خۆی بداتە دەست هێزی ئێران.

هەروا دەڵێت ئەو کوردانە لە دەست سپای عێراق هەلاتوون، دەردەکرێن. بەلام

حکوومەتی ئێران لە بارزانییەکانی خوازت، کە چەک بەدەستەوە بدەن؛ بەڵام ئەوان نەیان کرد و خوازیاری ئێرانی بەدوا دابوو. لەسەر ئەوە حکوومەتی ئێران بەهەموو هێزییەوە پەلامارێکی قورس و بەتوندی بردە سەر بارزانییان کە توانی تەنگەیان پێ هەڵچنێ. لە تەلگرافی دوامیندا کە لە تارانەوە هاتووە دەوترێ کە قسەکردنی نێوانی حکوومەتی عیراق و ئێران بۆ بەدەستەوەدانی بارزانییان تازە کراوە. بەڵام ئەنجامی قسە تا کوێ چووە، نەزاندراوە.

## کوردەکان لە ئێران

ڕۆژنامەی «الحوادث»ی بەغدا لە ١١ی ئادار بڵاوی کردەوە کە حکوومەتی مەرکەزیی تاران نیروویێکی پڕ چەکی ناردە سەر ئەو کوردانە کە لە هەرێمی کوردستاندا جەمهوورییەتێکی زاتی کوردستانیان دامەزراند بوو.

کوردەکانیش بۆ پارازتنی ئەو جەمهوورییەتە، بەربەرەکانیان دەکرد. بەڵام لەبەر سەختی جێگا و تەنگی ڕێگا کێو پارەکان، ئەو پەلامار بردنە هێندە کارگەر نەبوو. ئەوە پتر کوردەکانی بەهێز کرد و نیروویانی پتر کرد. بەڵام حکوومەتی تاران نێروویێکی بەتانکە کێوییەکان و ئوتمۆبیلە زرێدارە بچووکەکانی کە تازە[...] بۆیان هاتووە پڕ چەکی کردن، تاکو لە کێوەکانیش بتوانن پەلامار ببەن. لەو ڕووەوە کوردەکان چەند کەسێکیان بۆ ڕۆژهەڵات و ڕۆژاوا و باکوور کشانەوە؛ هێندێکیان بۆ سنووری تورکیا و بۆ عیراق و چەندێکیان بۆ ئازەربایجانی سۆفیاتی کشانەوە.

## مەلا مستەفا بارزانی لەسەر تخووبی ئێران و عیراقە

لەندەن ،١٨ :بەغدا بڵاوی کردەوە کە لەم دواییەدا لە تخووبی ئێران و عیراقدا لێکدانێکی سووک لە نێوانیدا ڕووی داوە کە هێزەکانی کوردیی هی مەلا مستەفای بارزانی دەیەویست پێ بنێتە عیراقەوە. جێگا باوەڕپێکراوەکان ئەوەی دەڵێن کە پێکهاتنی مەلا مستەفای بارزانی و حکوومەتی ئێران سەری نەگرت.

لە دوای ئەوە کە لەشکری ئێران بەنەیاریی زەعیمی کوردان کەوتە بزووتنەوە، هێندێک لەو کوردانە خۆیان دا بەدەست عیراقەوە. هەروا ئەو خەریکبوونەی، کە لەگەڵ حکوومەتی ئێران بۆ عەفووی عام وەدەستخستنی لە عیراق و دەستووردانی گەڕانەوەیان بۆ نیشتمانەکەیان، دیسان سەری نەگرت و ئەو حوکمەی حکوومەتی عیراق کە لە بارەی ئەواندا دابوویان، هەروایە.

جێگا بڕوایەکان بڵاویان کردەوە کە ئێستا ڕێککەوتنی مەلا مستەفای لەگەڵ حکوومەتی ئێراندا سەرگرتووە نەبوو، بڕیاری لەسەر ئەمەدا کە دەست و پێوەندەکەی خۆی کۆکاتەوە، بەچەکەکانیانەوە لە هەرێمە چیاییەکانی کەوا بەسەر تخووبی سێ دەوڵەتاندا دەستەڵاتیان هەیە -کە ئێران و تورک و عیراقن- دەستەڵات پەیداکەن و تێکۆشن بۆ وەدەست خستنی عەفووی عام لە حکوومەتی عیراق.

ئەو هەرێمی کە کوردەکانی تێدا خزاوە نزیک دوو هەزار عائیلە لە دەست و پێوەندی مەلا مستەفا تێدا گوزەران دەکەن. وا دەگێڕنەوە کە مەلا مستەفای بارزانی بەسەر پازدە هەزار پیاوی جەنگی فێرکراوی پڕ چەکی جەنگاوەری دلێردا دەستەڵاتی هەیە؛ بەڵام چلۆنی ئابوورییان چاک نییە.

وەزارەتی جەنگی عیراق تەقریرێکی وەرگرتووە کە لەوەدا هاتووە هەرچێکو دەست و پێوەندی مەلا مستەفای باررزانین، ئامادەی جەنگ و بۆ پارازتنی هەرێمی چیایی، سازی بەرهەڵست بوونن. هەروا ژن و منداڵەکانیان دەستە بەدەستەی بچووک لە تخووبی عیراق دەپەڕنەوە، پەنا بۆ ئەو ماڵە کوردانە دەبەن کە دۆست و ئاشنایانن. هەروا لەشکری عیراق لە ئێران تەقریران وەردەگرێ کە هەرچێکو لەشکری ئێران و ئەو کوردانەی بەندەی ئێرانن، تێدەکۆشن کە مەلا مستەفا و پیاوەکانی پاڵەپەستە بدەن بۆ سەر تخووبی عیراق یان تورکیە.

## ئیستدعای عەفووی عام بۆ کوردەکانی بارزانی

ڕۆژی ١٨ی مانگی ئادار ڕۆژنامەکانی پایتەخت بەجارێک ئەو تەلگرافانەیان بڵاوکردەوە کە لە لیواکانی کوردنشینەوە ناردراون؛ بەتایبەتی «الاخبار - الزمان» ئەم تەلگرافەیان بڵاوکردەوە کە لەسلێمانییەوە هاتووە. ئیسترحامیان لە حکوومەت کردووە کە حکوومەت بۆ کوردەکانی بارزان عەفووی عام ئیسدار کا و بیانبەخشێ و لێیان بگەڕێن لە نیشتمان و جێ و شوێنی خۆیان دامەزرێنەوە.

ڕۆژنامەی «السیاسة» ١٨ی ئادار: لە ژێر عینوانی «بۆ بارزانییەکان عەفووی عام دەخوازێ» تەلگرافێکی لە سلێیمانیەوە و بەئیمزای ٥٣ گەورە و عولەما و سادات و سەرەک و میر و بەگ و بازرگان و ئاغایانی کوردی سلێمانییەوە لێدراوە ئەمەیە:

بەمە کە عەفووی عام بۆ کوردەکانی بارزان سادیر بکرێ، نەتەوەی کورد پتر و چاکتر پەیوەندییان بەعەرشی موفداوە دەبێ.

١٨ی ئادار: هەمیسان لە سلێمانییەوە ئیسترحام دەکەین بۆ عەفووی عام ئیسدارکردن و گەڕانەوەیان بۆ نیشتمان و جێ و شوێنی خۆیان موشکیلەی بارزانییەکان پێک بنێن. ئیمزای ٦٢زوعەما و سەرەک و گەورە و محامی و ئودەبا و بازرگانانی کوردی سلێمانییە.

١٨ی ئادار: لە کۆیسنجەقەوە هەرچییێکی لە وتارەکەی دکتۆر جەعفەر محەمەد عەبدولکەریم دایە کە ڕۆژی ١٩٤٧/٣/١٠ لە ژمارەی ١٣٥١ی ڕۆژنامەی «صوت الاهالی»دا بڵاوکراوەتەوە پشتیوانی دەکەین و لەبەر حکوومەتی خۆشەویستمان دەپاڕێنەوە کە بەچاوی عەتف و شەفەقەت و میهرەبانییەوە کاروباری بارزانییە هاونیشتمانەکەمان جێبەجێ بکەن و بیانگێڕنەوە سەر ڕێ و شوێن و نیشتمانەکەی خۆیان تاکو لە ژێر سێبەری عەرش موفدادا بژین و دڵنیابن. ئیمزای ٦٢ ئاغا و گەورە و مەزن و عولەما و بازرگان و کەسەبەی کوردی کۆیسنجق.

٢٠ی ئادار «صوت الاهالي» لە بابەت کاروباری کوردەکانی بارزانی نووسیوە کە لە سلێمانییەوە چەند تەلگرافیان بۆ ناردراوە داوخوازی کاروباری بارزانییەکان کراوە کە بەمەرجێ حقووقیان تێدابێ، جێبەجێ بکرێ و لەگەڵ عەدالەتدا ڕێککەوێ و هەروا ئیسداری عەفووی عامیان خوازتووە.

٢٠ی ئادار «الاخبار» لە ژێر عینوانی «هەمیسان بارزانییەکان» بڵاوی کردۆتەوە کە تەلگرافێکی لە برا کوردەکانەوە بۆ ناردراوە، کە تیایدا باس لە پێکهێنانی موشکیلەی بارزانییەکان کراوە کە بەجۆرێک پێک بێندرێ کە لەگەڵ عەدالەتدا ڕێککەوێ و بەجۆرێک بێ کە خۆشەویستی و برایەتی دوو نەتەوەی عەرەب و کوردەوە تاکو ئیخلاس و فەرمانبەریی پتر بکا بەعەرشی موفدا و لە تەلگرافەکەدا داوای عەفووی عامیان کردووە بۆ بارزانییەکان.

ڕۆژی ٢٢ی ئادار ڕوونووسی ئەو تەلگرافەیان بڵاوکردەوە کە کوردەکانی خانەقین لە بارەی دەرخستنی عەفووی عام بۆ بارزانییەکان، تکایان لە حکوومەت کردووە وتویانە: کاروباری بارزانییەکان بەجۆرێک پێک بێندرێ کە لەگەڵ عەدل و مەسالیحی موشتەرەکەی نێوانی دوو نەتەوەی کورد و عەرەبدا ڕێککەوێ.

٢٣ی مارت، «صوت الاهالي» بڵاوی کردەوە. کە لە کەرکووک و سلێمانی و خانەقینەوە گەلێک تەلگرافانی بۆ چووە. لەوێدا تکای عەفووی عامیان بۆ بارزانییەکان کردەوە، خواهیشت کراوە بەجۆرێک ئیشی بارزانییان پێک بێندرێ کە لەگەڵ عەدالەت و

مەسلەحەتی موشتەرەکەی هەردوو نەتەوەی عەرەب و کورداندا ڕیککەوێ. لە جێگای باوەڕپێکراومان زانیوە، کە حکوومەتی دڵسۆز و بەمەرحەمەتی عیراقی خۆشەویست دەیەوێ ڕووی لوتف بداتە کوردەکانی بارزان کە بگەڕێنەوە نیشتمانەکەیان و لە جێ و شوێنی خۆیان دامەزرێنەوە و خۆباوێژنە باوەشی عەدالەتی حکوومەتەوە. بەدڵنیایی و ئاسوودەیی دانیشن و چاوەنۆڕی عەدالەت و لوتف و ڕەعیەتپەروەیی حکوومەتی خۆیان بکەن.

## ئێران لە جەنگی کوردەکاندا چەکی زل بەکار دەبا

تاران، ۲۹ی مارت: پەیامنێری «یونایتید پرێس» نووسیووە و دەڵێت: لەم جەنگە خوێناوی و کوژتارەی کە گەرمەیەتی، نێرووی ئێران ڕوو بەکوردەکان لە مەیدانی جەنگی -کە لە تخووبی لای عیراقەوە دەستی پێ کراوە، لەگەڵ بارزانییەکاندا- فڕۆکە، تانکی زل، تۆپە قورسەکان بەکار دەبەن.

ڕۆژنامەی «اطلاعات» وێنەی ڕەسمی لە تەلگرافێکی کە بۆی ناردراوە بڵاوی کردەوە کە ئەو جەنگ و کوژتارە گەرمەیە، کەوا بەم جۆرە دەستی پێ کراوە، لەم ڕووەوەیە کە نێرووی کورد بەتوندی پەلاماری لەشکرگاییکی هێزی ئێرانیان دا لە نزیک شنۆ، ئەفسەرێکی گەورەی ئێرانیان کوشت و چەندێکیشان برینداركرد. جا بەو هۆیەوە جەنگ هەڵایساندراوە، کوژتار و خوێنرێژی دەستی پێ کراوە. بەڵام نابێ لەبیر بکەین کە ئەو کوردانە لەم ڕۆژانەی دواییدا موافەقەتیان کردبوو کە لە ئێران دەرکەون و بڕۆن.

لەندەن، ۲۹ (ر): لە نیوانی نێرووی کورد و هێزی ئێراندا بوو بەچاردە ڕۆژ پتر جەنگ و کوژتار زۆر بەگەرمە لە کاردایە. تخووبی شنۆ بۆتە مەیدانی کوژتار. کوردەکان هێزێکی لەشکری ئێرانیان دەورەداوە. سەرکردەی لەشکری ئێران لە حکوومەتی خوازتووە کە بەو سپایەی بۆ ئازربایجان ناردراوە، یارمەتی بکرێت بۆ ڕزگارکردنی هێزی دەورەدراوی ئێرانی. لەو جەنگە خوێناوییەدا ئێرانیان فڕۆکە و تانکی گەورەو تۆپ، بەگەرمە بەکار دەبەن و لە هەردوو لا کوژراو و بریندار زۆر هەن.

## بەپارانەوە تەلگراف بۆ عەفووی عامی بارزانییەکان

لە سلێمانییەوە ئەم تەلگرافەی خوارەوە بۆ جێگا هەرەبەرزەکان لێ دراوە بەئیمزای ۷ کەسی کاسیب و ٤ کەسی خاوەند گاراج و ۲۹ کەسی ئوتۆمبێلەوان، سایق سەیارە و ڕۆژنامەکانی پایتەخت بڵاویان کردەوە کە دەڵێن: هەرچیکو پێکهێنانی مشکلەی بارزانە

پێکهێنانێک بێ کە لەگەڵ عەدالەت ڕێککەوێ و یارمەتی و پشتیوانی برایەتی و خۆشەویستی نێوانی نەتەوەی کورد و عەرەب بکا؛ تاکو بەوە کوردەکان پتر بەدەوری عەرشی موفدادا هەڵسووڕێن و ئیسترحام دەکەین عەفووی عام بۆ مەحکوومەکانی بارزان ئیسدار بفەرموون.

**پێویستە کاروباری بارزان بەڕەوانێکی پاکی عەدالەت و عەتفەوە جێبەجێ بکرێ**

لە قەزای کفرییەوە تەلگرافێک بەئیمزای ۲۱ پیاوە گەورە گەورەکانەوە بۆ جێگای هەرەبەرز لێدراوە و ڕۆژنامەکانی پایتەخت بڵاویان کردەوە. لەوێدا خوازتراوە کە بەڕۆحی عەدالەت کاروباری بارزانییەکان پێک بێندرێ و بەرهەڵستە شەڕاوی و خراپەکان لابدرێن و عەفوی عام بۆ گەڕانەوەی خۆیان و عائیلەیان ئیسدار بکرێ و ببەخشرێن. ئومێدمان وایە کە ئەو موشکیلە بەچاوی میهرەبانی تەماشای بکرێ و لە پایە پتر ئیهتیمامی پێ بدرێ. ئیمزاکان.

## جەنگی لە کوردستان ئێراندا هێشتا هەیە

ئەنقەرە، ٥ی نیسان شەوی شەممە، سەعات ۹ی دوای نیوەڕۆ: ڕادیۆی ئەم شارە کە لە پەیامی ئێرانی وەرگرتبوو، بڵاوی کردەوە کە جەنگ لە نێوانی کورد و ئێرانییەکاندا زۆر توندە؛ دەڵێت:

حکوومەتی تاران ئەمە بوو بەچەند هەفتەیێ زۆر بەگەرمی لەگەڵ کوردەکانی بارزان، لە نێوان سێ شاری میاندواو و مەهاباد و ورمێدا شەڕیانە.

کوردەکان هەموو تەرزە چەکی تازەیان هەیە؛ تۆپ و هاوەن و شێست تیر بەکار دەبەن. عەشیرەتی بەهادور -کە نزیک سێ هەزار شەڕکەریان هەیە- لە کوردەکانی دەوروپشتی ورمێن؛ پاڵیان داوەتە پاڵ کوردەکانی بارزانەوە. لەملاولاوە کوردە دیموکراتییەکان و ئازەربایجانییە دیموکراتییەکان هەروا دەچن و دەبنە پشتیوانی کوردە شەڕکەرەکان.

حکوومەتی ئێران پەی دەرپەی هێز بۆ ئەو لەشکرەی ئێران دەنێرێ کە شەڕ دەکەن؛ فڕۆکەش بێ وچان جێگای کوردەکان بۆمباران دەکا.

لە پەیامی ڕەسمی ئێران وەرگیراوە کە عەلی ڕەزم ئارای سەرکردەی لەشکرێ ئێران دووجار لە تارانەوە هاتووە بەفڕۆکە بەسەر مەیدانی جەنگا سووڕاوەتەوە. جاری دووەم لەگەڵ هاوسایەکانیا پێک هات کە تێکۆشن بەهەر چەند ببێ بەماڵ بارزانییەکان ناچاری خۆبەدەستەوەدان بکەن. ئەگەر ئەمە ڕاست بێ ئەوە دوامین ژیانی کوردانە.

ئەنقەرە، ٣١ی مارت، شەوی ٥ی نیسان: دووبارەی کردەوە، کە تاران ڕەسمی بڵاوی کردەوە و دەڵێت: قازی محەمەد سەرەک دیموکراتی و دامەزرێنەری جەمهووری کوردستان لە ئازەربایجاندا و دوو برا و هاوالآنی کە لە لایەن مەحکەمەی عەسکەرییەوە بەخنکاندن حوکم درابوون، شەوی یەکشەممەی ٣٠ی مارت، بەدارا کران و خنکاندران.

## سەرلەشکر عەلی ڕەزم ئارا لە کۆبوونەوەی خاوەندڕۆژنامەکانی ئێراندا بەوتارێک باسی کوردەکانی بارزانی کردووە

تاران ئێوارەی ١٩٤٧/٤/١١ لە بەشی تورکیدا، ٥٠ و ٥ی دوای نیوەڕۆ، بڵاوی کردەوە، کە عەلی ڕەزم ئارا بەرەو خاوەند ڕۆژنامەکانی تاران ئەم وتارەی دا. لەبەرئەوە کە ڕۆژنامە و کۆوارەکان و ئێستگەکانیش بەچەوتی بڵاو دەکەنەوە، ناچاربوون کە بۆ ڕوونکردنەوەی ڕاستییەکەی ئەو جۆرە مەعلووماتەی لە بارەی کوردەکانی بارزانەوە تاکو ئێستا دراوە، ئەم وتارە بۆتان ڕوون کەمەوە، بڵێم:

بارزانی نزیک ١٠ هەزار کەسن بەژن و منداڵ و پیریانەوە. سێ هەزار کەسی ئەوان پڕ چەکن. لە هەموو هۆزەکان پتر وابەستەی شێخ و ڕەئیسی خۆیانن. شێخی هەرە گەورەیان شێخ ئەحمەدە و لە پایە بەدەر تەقدیسی دەکەن و بەئیمانەوە خۆشیان دەوێت. بارزانییەکان جەنگاورێکن کە دەتوانم بڵێم لە گێتیدا شەڕکەری وەکو ئەوان تاکو ئێستا هەڵنەکەوتووە.

بارزانی لە جەنگدا ئەوەندە وریا و زانان کە زۆر زوو نوختەی زەعیفی بەرانبەرەکەی خۆیان دەدۆزنەوە و تێدەگەن و دەستبەجێ لەو ڕووەوە بەپێ ئەوە دەکەونە جەنگەوە و تەلەفیاتێکی یەکجار زۆر لە دوژمنی خۆیان دەدەن. لە ٢٠٠ مەتر دوورتر گوللە بەدوژمنەوە نانێ. وە کە گوللە باوێژێ لەوانە نییە کە نەی ئەنگێوێ. هەروا قسە دووبارە دەکەمەوە و دەڵێم کە لە هیچ هۆزێک و هیچ عەشایرێکدا شەڕکەر و دلێر و ئازای وەکو بارزانییان نەبیندراوە و نابیندرێ. بارزانییەکان لە جەنگدا ئەوەندە خوێن سارد و لە سەرخۆن کە هەزاران گوللەی تۆپ و بۆمبایان تێ گیرێ و هەزاران ئاگرباران بکرێن، لە جێگای خۆیان نابزوێن و ناجووڵێنەوە، هەتا لێیان نزیک نەبنەوە و لە خۆ ونکردنا زۆر تەڕدەست و چوستن و زانان. ئەوەندە شارەزان لە پەناگرتنا چاو نایانبینێ و هەستی پێ ناکا.

قازی محەمەد کە جمهوورییەتی کوردستانی ئیعلان کرد لە بنەچەکەدا بەپشتیوانیی و ئومێدی بارزانییەکان بوو؛ بەهێز و دلێریی بارزانییان دەنازی. بەڵام نەمزانی چی هۆیەک بوو کەوا دەستی یاریدەدانیان لەسەر هەڵگیرا لە پاش ئەوە کە سپای ئێران چووە کوردستان و قازی محەمەد خۆی دا بەدەستەوە، ئیتر شەڕیان نەکرد و لەسەر خواستن بوو کە مەلا مستەفا هاتە تاران. لە پاشان لێی ویسترا کە چەک بەدەستەوە بدات بەم مەرجە کە جێگا و شوێنی بدرێتێ و بۆ دانیشتن یارمەتی بکرێن بەهەرچۆنێک کە بوو. کە دانی بە چەک بەدەستەوەداندا نەهێنا و دەبوایە لە ئێراندا نەمێنی و دەرکەوێ. کە گەڕاوە نێو عەشیرەتەکەی، ماوە. ناشزانم بۆچی تاکو ئێستا لە ئێران دەرنەچووە. لە پاش ئەوە کە لە تارانەوە گەڕایەوە، ئەو جێگایانەی کە ئێستا لێیەتی، هێندێک ناگوزیری و خراپە لەو ناوەدا ڕوویدا و لەگەڵ چەند عەشیرەتێکی ئەو لایە کەوتە هەرا و کێشە و ئەوەبوو بەهۆی ناخۆشی و حکوومەت ناچارکرا دووبارە نیروو بنێرێتە سەرێ. لەم کاتەدا داوای موتارەکەی لە حکوومەت کرد. بەڵام حکوومەت دەرفەتی نەدایە.

ئیستاش لەگەڵ سپا و لەشکری ئێمەدا هیچ شەڕ و کوژتاری نەبووە. هەرکە ئێمە بۆ پێشەوە دەچین، ئەو بەپاشا دەکێشێتەوە. درێژایی هێزەکەی ١٥ کیلۆمەترە. بڕوام ئەوەیە کە تا ڕۆژی شەممەی داهاتوو هیچ تاکێکیان لە خاکی ئێراندا نەمێنێتەوە و بەرەو عیراق بکشێنەوە. سەرکردەی هەرە مەزنی ئەو هێزە مەلا مستەفای برای شێخ ئەحمەدە کە لە سەردارێکی زۆر بەرزی لەشکر بەمەعلووماترە و لە سەرکردەیەکی شارەزا پتر شارەزای جەنگە.

## عەفووی عام خوازتن بۆ کوردەکانی بارزان

لاوەکانی کەرکووک بەتەلگرافێک لەبەر سمووی وەسی پاڕانەوە کە عەفووی عام سادیر بفەرموێ. ئێمە کە لاوانی کەرکووکین لەبەر سمووتان دەپاڕێینەوە بەناوی یەکێتی نیشتمانی نێوانی نەتەوەی عیراق، عەفووی عام بۆ بارزانییەکان سادیر بفەرموون. ئیمزای ٦٦ لاو (گەنجی) کەرکووک.

## خۆبەدەستەوانی شێخ ئەحمەدی بارزانی بەنیرووی عیراق

ئەنقەرە شەوی چوارشەممەی ١٦ی مانگ. نورەدین ئاتام بەڕادیۆ بڵاوی کردەوە کە شێخ ئەحمەدی بارزانی دوێنێکە بێ قەیدو شەرت خۆی و دەستە پیاوەکانی خۆیان خستە باوەشی عەدالەتی نیرووی حکوومەتی عیراقەوە. بەڵام لە مەلا مستەفای زەعیمی کوردی

بارزان هیچ دەنگوباسێک نییە. هەر هێندە دەگوترێ کە بریندارە و خۆی و دەستەوپێوەندەکەی ونن. تاکو ئێستا نەزاندراوە لە کوێیە.

## لە بابەت خۆبەدەستەوەدانی بارزانییان

خۆ بەدەستەوەدانی شێخ ئەحمەد و ئەحمەد ئاغای مێرگەسوور هەروا لە کاردایە. بەڵام وەکو زاندراوە چوار زابتی کە چووبوون گەیشتبوونە مەلا مستەفا، لە سنووری عیراق خۆیان دایە دەست هێزی عیراقی. لەوانە یەکیان بریندارە و هەروەک زاندراوە رئیس ئەوەلی ڕوکن عیزەت عەزیز خواستوویە کە خۆبەدەستەوە بدا، بەڵام خاوەند دەستەڵات لێی ویستووە کە بێ قەید و شەرت بێ. شێخ بابۆی برای مەلا مستەفا بەبریندار هێناویانەتە موستەشفای ئەربیل. بەڵام لە بارەی مەلا مستەفا و چوار زابتی ماوی، هیچ ئاگادارییێک لە دەستدا نییە.

## لە بارەی کاروباری بارزانییەکانەوە

ڕۆژی چوارشەممەی ١٦ی مانگ نمایندەکانی عیراق کە لە پەرلەماندا لە بەرنامەی وەزارەت دووان، جەنابی سەعید جەعفەر بەدر بۆ بارزانییەکان عەتفی لە حکوومەت خوازت. جەنابی سەید عەبدولوەهاب مەرجان پشتیوانی داوخوازی ئەوەی کرد و ڕجای لە حکوومەت کرد کە بەڕوویێکی میهرەبانەوە تەماشای بارزانییەکان بکا و عەتفی هەبێ. جەنابی سەید جاسم موخلیس پشتیوانی وتەکەی نایب سەید جەعفەر بەدری کرد.

لە بارەی بارزانییەکانا مەعالی سەید بابا عەلی، ڕجای لە حکوومەت کرد کە بەچاوی لوتف و میهرەبانییەوە تەماشای بارزانییان بکات.

سەماحەتی عیزەدین مەلا، نایبی ئەربیل وتی کەوا لە سنووری خۆماندا دەنگی کوژتار و برینمان گوێ لێیە کە لە بارەی ئەولادی نەتەوەدا دەکرێ و دەکوژرێن و سەر دەبڕدرێن. وەنەبێ لەم گوناهباریانەوە بێ، بەڵام لە ڕووی جەهل و نەخوێندەوارییەوەیە، بۆ ژان و ئێش و ئازاریان دەناڵێنن کە کات بەزەیی پێیاندابێ و دایکیان هەردوو باسکی بکاتەوە و ئەو لاوانەی خۆی بگرێتەوە باوەشی دڵسۆزی و مەرحەمەتەوە و هەروا دووا و لە فەخامەتی وەزارەتی داخلییە ڕجای کرد کە ئەو موشکلەیە زلە حەل بکات و ئەوەشی بەبیردا نەبێت کە بۆ پیاوخراپیان دەپارێتەوە و ئەگەر پیاوخراپیش بن، عەدل و مساواتیان بۆ دەخوازێ.

## له بابەت عەفووی عام بۆ کوردەکانی بارزان

ئەو تەلگرافانەی بۆ جێگا بەرزەکان و ڕۆژنامەکانی پایەتەخت لێدراون لە ڕەواندزەوە بەمۆری ٦ کەس ئەشراف و عولەما و بازرگان، لەبەر حکوومەت پاڕانەوە، کە بۆ کوردەکانی بارزان عەفوو سادیر بفەرمووێ بەوە پەیوەندی برایەتی نەتەوەی کورد و عەرەب جوانتر پێک دێ.

لاوەکانی عەرەب لەبەر سمووی وەسی مەزن دەپاڕێنەوە و دەڵێن: ئێمە کە لاوانی عەرەبین و لە خوارەوە مۆرمان کردووە، عەفووی عام دەخوازین بۆ کوردەکانی بارزان و تکا دەکەین بۆ گەڕانەوەیان و دامەزراندنەوەیان لە نیشتمانەکەی خۆیاندا، دەستوور بفەرمووێ و ئەمر سادیر بکرێ. مۆری ٦٤ لاوی عەرەب.

لاوەکان لە بەغدا هی فەخامەتی سەرەک وەزیر، هی جەنابی مەعالی وەزیری داخلییە، هی مەعالی سەرەکی مەجلیسی پەرلەمان، هی خاوەند فەخامەتان و مەعالیان، ئێمە کە بەناوی خۆمان خوارەوەمان مۆر کردووە بۆ خۆشەویستی یەکێتی عیراق (وحدة العراق) و بۆ ئاسایشی وڵات بەڕێ بردن و بۆ دڵنیایی نەتەوەی ئەم نیشتمانە، پشتیوانی و یاریدەدانی برا کوردەکانمان دەکەین کە عەفووی عام بۆ کوردە بارزانییەکان سادیر بکرێ و بگەڕێنەوە نیشتمانەکەیان و بەئاسوودەیی دامەزرێندرێنەوە. مۆری ٨١ لاو.

لە دیوانییەوە بەمۆری ٣٢ گەورە و ئەشراف و شیوخ تکا لە حکوومەت دەکەن و عەفووی شاهانە سادیربوون بۆ کوردەکانی بارزانی پشتیوانی و یارمەتی دەکەن و لەو تەلگرافەدا ئەمە هاتووە کە مانای پەیوەندی و خۆشەویستی دوو نەتەوەی کورد و عەرەبن و دەستی یێکتر دەگرن و یاریدەی یەکتر دەدەن بۆ ئاسایشت و هەرزانی و خۆشی و ئازادی وڵات.

### له سلێمانییەوە:

لەسلیمانیەوە جەنابی خاوەند عیففەت حەفسەت خانی نەقیب تەلگرافی لێداوە. لەوێدا بۆ سادیرکردنی عەفوو عامی کوردەکانی بارزان و لە ڕووی عەدالەت و میهرەبانییەوە کاروباری ئەوانە پێکهێنان لە حکوومەت تکا دەکات.

وتارێکی کە بۆ ڕۆژنامەکان ناردراوە، ئێمە کە لە خوارەوە مۆرمان کردووە پشتیوانی ئەو وتارانە دەکەین کە بۆ عەفووی کوردەکانی بارزان بڵاوتان کردووەتەوە.

## مەلا مستەفای بارزانی

هەروەکو زاندراوە نیرووی حکوومەتی عیراق مەلا مستەفا وهاوڕێیەکانی -کە لە دوو سەد کەس پتر نابن- دەورەی داون. مەلا مستەفا و هاوڕێیەکانی لە سنووری لای تورکیاوە لە ناکاو خۆیان گەیاندوەتەوە نێو خاکی عیراق و لە حکوومەتیان خوازتووە کە بەسەلامەتی حەیاتیان دڵنیایان بکا. بەڵام حکوومەت هەر لە سەر ئەوەیە کە بێ قەید و شەرت دەبێ خۆ بەدەستەوە بدەن.

لەولاشەوە گۆیا شێخ ئەحمەدی براشی قاقەزی بۆ ناردووە. لەنێو قاقەزەکەیدا لە لوتف و میهرەبانی حکوومەت دواوە، کە لە بارەی خۆی و عایلەکانی بارزاندا کردوویانە و باسی ئاسوودەیی و دڵنیایی و لە خۆشیدا بوونیانی نواندووە و هەروا نووسیویە کە بێ خۆگرتن، هیچ ڕانەوەستێ، خۆ باوێژێتە باوەشی عەدالەت و دڵسۆزی حکوومەتەوە.

## خۆبەدەستەوەدانی ڕەئیس ئەووەلی ڕوکن عیزەت عەزیز

٢٤ی نسان: ڕۆژنامەی «البلاد»ی بەغدایی بڵاوی کردەوە کە سەرکردەی لەشکری مەلا مستەفای بارزانی، ڕەئیسولئەووەل ڕوکن عیزەت عەزیز، بێ قەید و شەرت خۆی دا بەدەستەوە و دوێنەکە بەگیراوی گەیشتە بەغدا. وەکو زاندراوە ڕۆژی ٢٥ ی نیسان برایە بەندیخانەی گشتی.

## لە بابەت کاروباری بارزانییان و عەفووی عام

٢٦٤ کەس لە عولەما و شێخ و سۆفی و حاجی و محامی وئەشراف و بەگ و بازرگان و کاسبی شاری کۆیسنجق عەرزو حاڵێکیان مۆرکردووە، داوای عەفووی عامی بارزانی و گەڕانەوەیان بۆ شوێن و جێگای خۆیان و دامەزراندنەوەیانیان کردووە و بەیەک دەنگ هاوار لە هەموو نەتەوەی عیراق -چی کورد و چی عەرەب- دەکەن و بانگی هەموو پڕ بیرێکی موخلیسی نەتەوە دەکەن، کە بەدەستوورێکی لەگەڵ عەدالەت و مەسلەحەتی نیشتمانی هەموو عیراقیدا ڕێککەوێ تێکۆشن و یاریدە بدەن کە حکوومەت عەفووی عام بۆ بارزانییەکان سادیر و ماڵ و منداڵیان لە برسیەتی و مردن و سەرکێشی و نەخۆشی و لە ئاگربارانی تۆپی بێگانە ڕزگارکەن. ئەوە لە ڕۆژنامەی «السیاسة» دا، ڕۆژی ٢٢ی نیسان بڵاوکراوە.

ئەمەش عەریزەیێکی دیکەیە کە ٣٤٢ کەس لە گەورە ئەشراف و عولەما و سادات و مشایخ و ئاغا و بەگ و ڕووئەسا و بازرگان و کاسبی سلێمانییە مۆریان کردووە بۆ

ڕیاسەتی دیوانی مەلەکی و ڕیاسەتی مەجلیسی ئەعیان و ڕووئەسایەتی مەجلیسی نواب و جێگا بەرزەکانی دیکە و ئەحزابەکانی عیراق ناردراوە و بۆ ڕۆژنامەکانی پایەتەختیش ڕوونووسی هاتووە و لە ڕۆژنامەی «السیاسة» بەدرێژی بڵاوکراوەتەوە کە حکوومەت بەڕووی میهرەبانییەوە کاروباری بارزانییەکان بەجۆرێکی دڵنیایی و عەدالەت جێبەجێ بکات و عەفووی عامیان بۆ دەرخا و بیانگێڕنەوە نیشتمانەکەیان. بەوە هەموو نەتەوەی عیراقی نەجیب، چی کورد و چی عەرەب شادمان بکا. بەناوی نەتەوەی کوردی عیراقی تکا دەکەن کە پایان بەو کارەساتە بدەن کە نەتەوەی عیراقی لە بەرانبەر گوللەی بێگانە گیان بدات.

## بارزانییەکان خۆیان بەدەستەوە داوە

بۆ بەسرە ناردران؛ لەوێ دانیشتن. ڕۆژی پێنج شەممەی ٢٤ی نیسان، بۆ شەو ئەم شازدە بارزانییانە لە مووسڵەوە هێنرانە بەغدا، ئێوارەی جومعە ٢٥ی مانگ بۆ بەسرا بەڕێ کران کە لەوێ دانیشێندرێن، ئەمانەن:

شێخ ئەحمەد، مەحمەد خالید کوڕی شێخ ئەحمەد، شێخ عەبدوڵڵا کوڕی شێخ مستەفا، شێخ بابۆ، شێخ سادق کوڕی شێخ بابۆ، شێخ ئیسماعیل کوڕی شێخ عەبدوسەلام، شێخ ئیبراهیم کوڕی شێخ عەبدوسەلام، شێخ محەمەد سدیق، حاجی تەها عەبدولعەزیز. لە نۆکەران: مەلا حەسەن مەلا ئەمین، نەعمان ئەمین، سالح مستەفا، ئەحمەد خالید، ئیسماعیل ججو، محەمەد بابەکر، مامەڕەش.

## مەلا مستەفا بارزانی

ڕۆژنامەی «البلاد»ی بەغدایی، ڕۆژی ٢١ی نیسان، بڵاوی کردەوە دەڵێت:

مدیریەتی شورتەی عام لە سەرکردەی بەرزی شیمالەوە تەلگرافێکی وەرگرتووە کە مەلا مستەفای بارزانی لە چیاکانی عیراقا لە نێو ئەشکەوتێکی قووڵ و زلا خۆی پەناداوە. هێزی پڕ چەکی شورتە دەورەی ئەشکەوتەکەیان گرتووە.

بۆ مەلا مستەفا مەفەڕی هەڵاتن نەماوە. بەڵام شێخ ئەحمەد لە دوای ئەوە، کە خۆی بەدەستەوەدا، بردیانە بەندیخانەی مووسڵ و چەند کەسێکی دیکەش لە دەستەوپێوەندی لەگەڵ کاربەدەستە ڕەسمییەکان بۆ دامەزراندنیان و خواردەمەنی و جێگا و پێویستیان خەریکی جێبەجێکردنی ئارەزوون. چەند ڕۆژێک لەمەوبەر شورتەی بەغدا نۆ کەس لە دەست و پێوەندی مەلا مستەفایان وەرگرت.

## ئیعلانی ئەحکامی عورفی

لە قەزاکانی ڕەواندز و زێبارا، ڕۆژی یازدەی مایس، بۆ ئیعلانی ئەحکامی عورفی لە قەزاکانی ڕەواندز و زێبار و هەموو دەوروپشتەکەیان -کە وابەستەیی بەقایدولقوواتی عەسکەرییەوە هەیە- ئیرادەی مەلەکی سادیربوو.

تا کاتی ئیرادەی مەلەکی سادیر دەبێ بەپایان پێدانی، مەرجەعی بەرز لە داخیلی ئەو دوو قەزایانەدا بەهەموو ئیدارەیەک قایدولقوواتی عەسکرییە.

## فەخامەتی سەرەک وەزیر

## ئەحکامی عورفی بۆ داندراوە نیشانی دەدا

فەخامەتی سەرەک وەزیر وەڵامی ئەو پرسیارەی داوە کە ڕۆژی سێ شەممەی ١٣ی مانگ، لە بابەت ئەحکامی عورفی دانان لە قەزایانی ڕەواندز و زێبار -کە عەبدولهادی بچاری کردبوونی- دایەوە و وتی:

لەو کۆبوونەوەی لەمە پێشتاندا پێشدەستیم کرد، خۆبەدەستەوەدانی ژمارەیەکی قورسی بارزانییەکانم پێ وتن، تەنیا مەلا مستەفا و دەستەی لە گەڵی دایە، ماون. ئەوانە بێ قەید و شەرت هێشتا خۆیان بەدەستەوە نەداوە.

ئەو دەستەیە لە دەستیان هات کە خۆ باوێنە خاکی عیراقەوە. مەلا مستەفا و دەستەکەی بۆ مەخفەری شورتەی عیراق دەستدرێژییان کرد و تەنیا شورتەیەکیان کوشت.

حکوومەت لە کاتی هاتنیان بۆ عیراق، خەریکە پێویستی بەکاربردنی و تەدبیران پێک بێنێ؛ ئەوا یەک لەو تەدبیرانە ئەحکامی عورفی دانانە. دەبێ ئێوەش لە ڕۆژنامە خۆجێیەکاندا ئاگاداریتان وەرگرتبێ، کە حکوومەت ئەم بڕیارەی دا مەجلیس نەبوو. لە پێش ئەوەدا ئەم پرسیارەم لێ بکرێ ئامادەبووم پێتان بڵێم ئەوا بەو ناونیشانەدا دەلایلم بۆ هێناوە، ئومێد دەکەم بەو تەدبیرانەی کەوا حکوومەت لەسەری عازمە بۆ پایان دان بەو قەزیە و قەزییەکانی دیکەش کە کەوتوونە سەر، بەس بێ و وڵات لە چنگیان ڕزگار بکرێ و پترینی ئەو پیاوانەی کە بەئاگری ئەو پیاوە سووتاون وریا بکرێنەوە.

## بەیانی ڕەسمی

لە دوای ئەو خۆبەدەستەوەدانە بێ قەید و شەرتەی بارزانییەکان کە تەواوبوو، هێندێکیان بەسەرکردەیی مەلا مستەفای بارزانی بەراوەژوویان کرد و وتیان تا حکوومەت عەفووی

عام بۆ هەموویان بەجارێک سادیر نەکا خۆبەدەستەوە نادەن. لەو کاتەدا ئەوانەی خۆیان خزاندە خاکی عیراقەوە، بەجێگایانی سنووری تورکیا لەگەڵ مەخفەرێکی عیراق نزیکی ئەو سنوورە بەگژێیکداچوون. لە ئەنجامدا تەنیا شورتەیەکی ئەو مەخفەرە کوژرا. جا لەبەر ئەوەو لەبەر ڕکەگرتنی ئەوانە بەخۆبەدەستەوە نەدان، حکوومەت دەستی کرد بەپێکهێنانی کردنی پێویست لە بارەیاندا.

## عەتفی حکوومەت

وەزارەتی داخلییە هەموو موتەسەڕیفەکانی لیوایانی سلێمانی و کەرکووک و هەولێر و مووسڵی ڕادەسپاردن و تێی گەیاندن کە هەرچەندی لە دەسەڵاتیاندا بێ، بۆ بارزانییەکانی کە پەنایان هێناوە، هەموو ئەسبابی ڕەحەتی و خواردەمەنییێکی فراوانیان بۆ ڕێکخەن تاکو بەسەر مەنتیقەکانی خۆیاندا دادەمەزرێندرێنەوە و بکۆشن بەچاکی یاریدەیان بدرێ و بەهەموو مووەزەفەکانی تابیعی خۆیان بڵێن و ڕایان دەسپێرن کە بەچاکترین معامەلە لەگەڵ ئەو بارزانییانە ببزوونەوە تا کاروباریان وە هاتوویان دەخرێتە بڕیارەوە.

## چەند ئاگادارییێکی بزووتنەوەی لەشکری عیراق لەگەڵ بارزانییەکان

هەروەک لە جێگایانی گەورە و پیاوانی باوەڕپێکراو و موستەنەداتی وێچووی ڕاستمان وەدەست کەوتووە، بۆ ئەمەی لاپەڕەی دێریکەکەمان ڕەخنە و کورتی تێدا نەبێ. ئەم ئاگادارییانەش لێرەدا تۆمار دەکەین. کە لە پاشان لە ڕەسمیاتی حکوومەتی و بەیانەکان بڵاوکرانەوە، ئەمانەی پێ دروست و ڕاست دەکەینەوە. چونکە گەلێ مەعلووماتی ئەم هەرایانەمان لە ڕۆژنامەکانی ئێران و عیراق و لە بەیانە ڕەسمییەکانی هەردوو حکوومەتانمان دەست کەوت. هێندە خەریکی قسە و وتەی ئەم و ئەو نەبووین؛ چونکە لە دە، دووی ڕاست بێ یان نەبێ. بەڵام ئەمانەی لە خوارەوە بەیانی دەکەم، وام بڕوایە کە هەمووی ڕاست بێ؛ هەرچەندە بۆ وتار و بڵاوکردنەوەش نابێ، بەڵام مەبەست لە لاپەڕەییێکی دێریکی ئەو هەرایەیە کە تۆمار بکرێ:

ڕۆژی پێنج شەممەی ١٩٤٧/٢/٢٠ بەهۆی تەوەتتوری پێوەندی حکوومەتی ئێران و کوردی بارزان، لە عیراق ئەمر درا بەئینزاری جەحفەل لیوای چوارەم بۆ بزووتنەوە.

١٩٤٧/٢/٢٢ فەرمان بە بەتەریەی ٢ک ٣ درا، کە بەچوار سەعات بکەوێتە بزووتنەوە.

١٩٤٧/٢/٢٦ بەتەریە گەیشتە ڕەواندز.

١٩٤٧/٢/٢٧ موفەتیشی جەیشی عیراقی وتارێکی بۆ فەوجی دوو، لیوای سێ خوێندەوە، دوورودرێژ لە دەست بەئیشکردن و هەستانە سەر واجباتی عەسکەری کرد، دڵخوشی و هان و ترسی نیشان دان.

ڕۆژی شەممەی ١٩٤٧/٣/١ فەرمانی ئینزار درایە دەستەی بەتەریە بۆ چوونە چامە، کە هاوکاری شورتەکانی ئەوێ بکەن.

١٩٤٧/٣/٦ فەوجی یەکەم، لیوای سێیەم لە کەرکووکەوە گەیشتە باپشتیان.

١٩٤٧/٣/٧ دەستەی هەندەسەی چوارەم، بۆ دروستکردنەوەی ڕێگاوبان گەیشتە باپشتیان.

١٩٤٧/٣/٨ دەستەی سپای ماوی جەحفەلی سێیەم و کەتیبەی شەشەمی کێوی گەیشتنە باپشتیان.

١٩٤٧/٣/١٠ ئەمر دەرچووە کە فەوجی یەکەم، لیوای سێیەم بۆ چامە بکەونە بزووتنەوە.

١٩٤٧/٣/١٣ حکوومەتی ئێران ڕێگای خواردەمەنی و دانەوێڵەی لە کوردەکانی بارزان بڕی.

١٩٤٧/٣/١٦ لە نێوانی کوردەکانی بارزانی و حکوومەتی ئێران، لەنێو خاکی ئێراندا کوژتار دەست پێ کرا.

١٩٤٧/٣/٢٢ لە نێوانی دەستە سپاییێکی عیراق و دەستە کوردێکی، کە لە خاکی تورکیاوە لە ژێر سەرۆکی پیاوێکی حوسێن ناو کوردێکدا بوو، لە سنوور کوژتار دەست پێکرا. دوو سەعات شەڕ دەوامی کرد.

١٩٤٧/٣/٢٥ موفەتیشیەی جەیشی عیراقی بۆ پشکنینی دەستەی لەشکرانی عیراق و ڕێکخستنیان چوو گەیشتە چامە.

١٩٤٧/٣/٣٠ قایدی فرقەی عیراقی و موفەتیشی دەستەکانی سوپا، چوون گەیشتنە چامە.

١٩٤٧/٤/١ مودیری حەرەکات، موفەتیش، موفەتیش تۆپ، چوونە لەشکرگا و هەموو لەشکرگا و چەکەکانیان تەماشاکردن بۆ ئەمە لە شەڕا ساز بن.

١٩٤٧/٤/٤ دەنگوباس بڵاوبۆوە کە ئەحمەد ئاغای مێرگەسووری، بەهەشت سەد ماڵ

بارزانییەوە، خۆیان بەدەستەوەدا و بێ قەید و شەرت تەسلیم بەهێزی حکوومەتی عیراق بوون.

١٠/٤/١٩٤٧دەنگوباس بڵاوبۆوە کە قایدولقوواتی شورتەی عیراق، سەید عەلی حیجازی، دیدەنی شێخ ئەحمەدی بارزانی کرد و پێکهاتن.

ڕۆژی شەممە ١٢/٤/١٩٤٧ دەنگ دەرکەوت کە تەلگرافێک لە مەخفەری خرێنە لە سنووری عیراق و ئێران، لە ناحیەی برادۆست هاتووە کە ئەحمەد ئاغای مێرگەسووری پەیمانی بێ قەید و شەرت تەسلیم بوونی خۆی و هەشت سەد عایلەی بارزانی عیراقی مۆر کرد.

١٣/٤/١٩٤٧ بارزانییەکان دەستە دەستە دەستیان بەهاتن کرد و لە مەخفەری خرینە تەسلیم بەحکوومەتی عیراق دەبوون.

١٤/٤/١٩٤٧ جەنەڕاڵ هومایوونی سەرکردەی لەشکری ئێران تەلگرافێکی بۆ شێخ ئەحمەدی بارزانی لێدا. بەفڕۆکە لە گەلی گادەر بۆ شێخ ئەحمەدیان بەرداوە کە دەبێ هەموو چەک و ئامرازێکی جەنگیی کە بارزانییەکان لە سپای ئێرانیان بەتاڵان گرتووە، بیدەنەوە بەهێزی ئێران. ئەگەر بەپەلە بەدەستەوە نەدەن، فڕۆکەکانی ئێران ئەو هەموو ژن و منداڵە بارزانییانەی چڕژانەتە گەلی گادەرەوە بۆمبەباران دەکەن.

١٥-١٦/٤/١٩٤٧ بارزانییەکان لە ترسی بۆمببارانکردنیان لە لایەن هێزی فڕۆکەی ئێرانەوە ناچاربوون بەپەلە لە خاکی ئێران بارکەن و هەڵێن، خۆ بگەیەننە خاکی عیراق و پەنا بۆ حکوومەتی عیراق بێنن.

١٦/٤/١٩٤٧ دەنگوباس بڵاوبۆوە کە ڕەئیسی ئەووەلی ئەرکان عیزەت عەزیز، خەڵکی عیمادیە -کە لەگەڵ شێخ ئەحمەدی بارزانیدا چوو بووە ئێران- لە حکوومەتی عیراقی خواست کە میهرەبانی عەواتیفی بەڕوویەکی تایبەتییەوە لەگەڵ بکات و ئیشوکارەکەی بەچاوێکی عەدالەتەوە تەماشا بکات.

٢٠/٤/١٩٤٧ شێخ ئەحمەدی بارزانی و شێخ خالیدی کوڕی و ئەحمەد ئاغای مێرگەسووری و شێخ محەمەد سەدیقی برای شێخ ئەحمەد و ڕەئیس ئەووەل عیزەت عەزیز، کە خۆیان بێ قەید و شەرت تەسلیم بەسەید عەلی قایدولقواتی شورتە کردبوو، گەیشتنە لەشکرگای باپشتیان.

٢١/٤/١٩٤٧دەنگ بڵاوبۆوە کە تەلگرافێک دراوە لە لەشکرگای باپشتیان، کە

مامەند مەسیح بەسەد کەسی جەنگیی پڕ چەکەوە لە خاکی ئێرانەوە هاتە نێو خاکی عیراقەوە و لە سنوور ئاوابوون. لەگەڵ هەریەک لەوانە دوو تفەنگ هەیە و لە چوونیاندا ڕوو بەئەرگوش دەچن و ئێستا و لەم دەمەدا بزووتنەوە لە نێوانی مەلا مستەفای بارزانی و حکوومەتی عیراقدا بەتین و توندترین ڕوودان و قەومان دایە.

ڕۆژی سێ شەممەی ١٩٤٧/٤/٢٢ سەرکردەی تۆپخانەی لەشکری عیراقی و ئامیری تۆپخانەی فیرقە و سەرکردەی کەتیبەی لەشکری عیراق -کە بۆ پشکنین و لێ وردبوونەوەی تۆپخانە چووبوون -گەیشتنە لەشکرگای چاما و کاروباری پێویستی تۆپ و تۆپهاوێژەکانیان دامەزراند.

١٩٤٧/٤/٢٣بەپێی دیدەوانی و ئاگاداربیەکی کە فرۆکەکانی حکوومەتی عیراق دەستیان کەوتبوو، دەستە شەڕکەرەکانی کوردی بارزانی کە لە ئێرانەوە دەگەڕانەوە عیراق پۆل بەپۆل هەر بیست و سی کەسی دەبوونە دەستەیەک و لە سنووری ئێرانەوەی شیمالی خرێنەوە بەگەرمە دەهاتن و لە سنووری ئێران بۆ خاکی عیراق ئاوا دەبوون و هەمووشیان پڕ چەک و پۆشتەبوون لە ئامرازی جەنگی.

١٩٤٧/٤/٢٤ مەلا مستەفای بارزانی کە لەولاوە هاتبوو کەوتبووە نێو خاکی عیراقەوە، بەهێزێکی ٥٠٠ کەسی پڕ چەک، سەرلەبەیانی پێش ڕۆژهەڵات، سەعات پێنج، مەخفەری زێتیان دەورە دا کە شورتەی عیراقی تێدا بوو. دەورەدان تا سەعات هەوتی کێشا. دوو کەسی شورتە، کوژران و دوو کەسیشیان بەدیل گیران.

١٩٤٧/٤/٢٥ دەنگی بەڕاستی درا کە بێ گومان مەلا مستەفا بارزانی گەیشتە ئەرگوش. حکوومەتی عیراق موفەووەزی شورتە عەلی مەحموود ناو، خەڵکی سلێمانی، ناردە لای، لە لوڤانده چاوی بەمەلا مستەفا بکەوێ و قسەی لەگەڵا بکات و تێک بگەن و نوازشت بکرێ بۆ ئەمەی خۆبەدەستەوە بدا.

١٩٤٧/٤/٢٦ سەرکردەی بەرزی هێزی شورتەی عیراق، سەید عەلی حیجازی، لە شێروان مەرنەوە بەنائومێدی گەڕاوە لەشکرگای خۆی؛ چونکە نەتواندرا لە گەڵ مەلا مستەفا پێک بێن و تێک بگەن و ڕامی حکوومەت بکرێ.

١٩٤٧/٤/٢٧جەحفەلی لیوای چواری لەشکری عیراق کە لە باپشتیان بزووتبوو، گەیشتە مەزنە؛ ڕۆژێک لەوێ پشووی دا. ئەملا و لای خۆی تاقی کردەوە. ڕۆژی ٤/٢٨ گەیشتە مێرگەسوور. لەوێش پشووی دا و ڕێ و بان و کێو و لێرەوارەکانی پشکنی.

ڕۆژی ٤/٣٠ گەیشتە شێروان مەزن. ئەو هێزە بۆ پێش بەمەلا مستەفا گرتن و چوونە سەر بارزانییە جەنگییەکان، کەوتە کارەوە.

ڕۆژی پێنج شەممەی ١٩٤٧/٥/١ فەوجی هەشتەمی شورتەی عیراق، بەهەموو تین و هێزییەوە کەوتە ڕێ و گەورە و سەرکردەکانیشی لەگەڵ بوو، بەرەو زێتی کەوتنە بزووتنەوە و چوون.

١٩٤٧/٥/٨ جەحفەلی لیوای پێنجەم لە لەشکەرگای خەلیفان کەوتنە بزووتن، بەرەو شێروان مەزن وەڕێ کەوتن. ڕۆژی ٥/١٢ ئەو هێزەی عیراق گەیشتە چاما لەشکرگای کرد.

١٩٤٧/٥/١٣ دەستە لەشکری کوردەکانی کە مریدی شێخ ڕەشیدی لۆلان برادۆست بوون، لە ژێر سەرۆکی حاجی بەگی کوڕی خەلیفە سەمەد -کە برای مەحموود بەگە- لە برادۆستەوە چووبوون گەیشتنە چامە کە یاریدەی جەیشی حکوومەت بدەن و هاوکاری بکەن بەرانبەر بەبارزانییەکان؛ چونکە ئەمانە بەشورتەی غەیرە نیزامی قەید کرابوون. شێخ ڕەشید بەو ناوەوە چوار هەزار و پێنج سەد دینار مانگانەی لە حکوومەت وەردەگرت. هەموو دەستە و مریدان و خزمەکانی کردبوو بەشورتەی غەیرە نیزامی و هەمیشە ئەم کوردانەی مریدی شێخ ڕەشید پێشمەرگەییان دەکرد.

١٩٤٧/٥/١٨ هەژدە فڕۆکەی تەرزی «ئینسنت» بۆ پشکنینی بزووتنەوەی بارزانییان و جێگا و شوێن و چلۆنییان ئاگاداری کەوتنە هەوای ئەو شاخ و کێو و دارستانانەوە. هەموو لایانی تاقی کردەوە.

١٩٤٧/٥/٢٠جەحفەلی لیوای چوارەم، بەهەموو هێز و دەستەڵاتییەوە بۆ سەر مەلا مستەفای بارزان بزووتنەوە و بەرەو گوندی لێرەبیر کەوتە پەلاماربردن. لەودەمەدا نووسراوێکی بەتوند لەلایەن مەلا مستەفاوە بۆ سەرکردەی ئەو دەستە لەشکرەی عیراق نووسرابوو، گەیشتە دەست جەحفەل. مەلا مستەفا لە نووسراوەکەیدا وتبووی: تکام هەیە بۆ پێشەوە نەبزووی و نەییێ ؛چونکە ناتوانم دەستەڵات بەسەر لەشکرەکەی خۆمدا بکەم، کە نەیەڵم شەڕ نەکەن. بێ گومان پیاوەکانی من بێ خۆگرتن لە جەیشەکەت دەدەن و خراپەتان بەسەردێ.

ڕۆژی پێنج شەممەی ١٩٤٧/٥/٢٢ محەمەد ئەمین ئاغای شێروانی کە لاگیر و هەواخوای حکوومەتی عیراقە و بەربەستی بارزانییەکانی کردبوو، بریندار کرابوو؛

گەیاندرایە مستەشفای عەسکەری چامە. چونکە چوو بوو. کە مەخفەرەکانی بارزان بگریّ، گوللەیەکی لەلای کەپووی درابوو، کونی کردبوو. لە چاویّکی دابوو، دەری خستبوو.

١٩٤٧/٥/٢٣ هەینوو. لە مەلا مستەفاوە نووسراویّک گەیشتە دەست ڕەفیق عارف سەرکردەی جەحفەلی چوارەم؛ لیّی خوازتبوو کە چیدیکە نەییّتە پیّشەوە، چونکە نایەویّت لەگەڵ لەشکری حکوومەتی عیراق شەڕ بکا و دڵی حکوومەت بڕەنجیّنیّ. خۆ ئەگەر گویّ نەدەیە ئەم پەندەم و بەقسەم نەکەی و بییّتە پیّش لەگەڵتاندا دەکەومە جەنگیّک، مەعرەکەییّکەوە کە تەئریخ لەسەر ئیّوەی تەسجیل بکا.

١٩٤٧/٥/٢٤ لە پایانی زەدوخوردیّکی لە نیّوانی بارزانی و شورتەی عیراقدا لە چیای سەرپوتین ڕووی دابوو، چوار شورتەی بریندار گەیاندرانە نەخۆشخانەی چامە (مستشفی اخلاء الخسائر فی چامه).

١٩٤٧/٥/٢٥ تەلگرافیّک لە تورکەکانەوە بۆ هیّزی لەشکری عیراق لیّدرا کە مەلا مستەفای بارزانی لە ڕووباری ڕوود کوچک پەڕییەوە. لە ئارەزوویدا بۆ خاکی سووریە تیّپەڕیّ؛ چونکە بەدرخانییەکانی کە لە سووریەن تەرتیباتیّکیان بۆ کردووە، کە خۆ بگەییّنیّتە سووریە.

١٩٤٧/٥/٢٦ وەڵامی ڕاست و دروست درا بەحکوومەتی عیراق کە مەلا مستەفا ڕوو بەسنووری ئیّران تیّپەڕی (ڕەسمی بوو).

١٩٤٧/٥/٢٧ دەنگی ڕاست پەیدا بوو کە مەلا مستەفا لە مەخفەریّکی تورکەکانی داوە لە نزیک زیّتیّ، لە نیوەشەودا ئامیری فەسیل مـلازم عومەر و هەموو ئەفرادی لەشکرەکەی، کە لەویّدا بوو، بەبۆمبە کوشتنی. سیّ دانە شیّست تیری پڕاویّژ و هەموو چەک و دانەویّڵەیەکی لەویّ بوو، بەتاڵانی گرت.

دەنگەوباس بڵاوبۆوە کە دوو لیوای عەسکەری تورک چوونە پیّشی لە خاکی تورکیەدا مەلا مستەفا هەمووی دڕین و تیّپەڕی.

١٩٤٧/٥/٢٨ سەرکردەی بەرزی حەرەکاتی جەیشی عیراق لە شیّروان مەزنەوە بۆ باپشتیان گەڕاوە.

١٩٤٧/٦/١ جەحفەلی لیوای پیّنج بۆ خەلیفان گەڕاوە. ئیتر پیویستی مانەوەی نەما لە بارزان.

١٩٤٧/٦/٣ فەوجی هەوتەمی شورتەی عیراق لە کانی لینجدا گەڕاوە، چووە چاما.

١٩٤٧/٦/٤ عومەر عەلی و جەماعەتی دەستەی خۆی لە ئەرگوشەوە بۆ باپشتیان گەڕاوە.

١٩٤٧/٦/٧ (مستشفی اخلاء الخسائر) لە چامە بۆ لەشکرییان داندرابوو، حکوومەتی عیراق لەوێی گوێزتەوە و هێنایە مێرگەسوور و جەحفەلی چوارەمیش گەڕاوە مێرگەسوور.

١٩٤٧/٦/١١ فەرمانی بەرز درا کە فەوجی یەکەم و لیوای سێیەم، بەتەریەی دووەم و لیوای شەشەم، لە چامەوە بگەڕێنەوە مێرگەسوور ئەبەوە قەتاعاتی جەیشی عیراقی لەو جێگایانەدا نەما. ڕۆژی ١٩٤٧/٦/١٣ ئەو دەستە لەشکرە بەتۆپ و تۆپخانە و چەک و هێزەوە گەیشتە مێرگەسوور.

١٩٤٧/٦/١٦ وەسی و وەلیعەهدی مەزن گەیشتنە لەشکرگان باپشتیان. هەموو زابت و سەرکردەکانی جەیش لە بابەت حەرەکاتەوە خوتبەیان خوێند.

١٩٤٧/٦/٣٠ هەموو لەشکر لە مێرگەسوورەوە ڕوو بەباپشتیان کەوتە بزووتنەوە.

١٩٤٧/٧/١ لە خاکی بارزاندا هیچ قەتەعاتێکی لەشکری عیراق نەما؛ هەموو گەڕاوە.

١٩٤٧/٧/٣ سەرکردەی بەرزی لەشکری عیراق گەڕایەوە جێگای خۆی.

## بەشی سێیەم

## شێخ ئەحمەدی بارزان وخزم و براکانی لە سڕگومیدا

مەسەلەی شێخ ئەحمەد و میللەتی بارزان لە هەموو کەس ئاشکرا ببوو. ساڵی ١٩٣٣ لە نێوانی شێخ ئەحمەد و حکوومەتی عیراقدا هەرا ڕووی دا. لە پاشان بەهۆی حکوومەتی تورکەوە عەفووی عام دەرچوو. شێخ ئەحمەد و برا و برازا و خزم و دەستە و پیوەندەکانی بۆ مووسڵ و یەک لە دوای یەک بۆ گەلێک لە لیواکانی عیراق سڕگوم کران. هەر ڕۆژە بۆ لایەکیان دەبردن. زۆر نەرمی سەرفەرووی ئەوامری ئومەرایانی حکوومەتی عیراق بوون. چەند ئەزیەت و ئازاریان تووش دەکرا هیچ ڕووگرژییان نەدەنواند و چاوەنۆڕی لوتف وعەدالەت بوون. لە جێگای خۆیان نەدەبزووتن و خۆیان تەنگەتاو نەدەکرد. بەقەزا ڕازی بوون. لە هەرای مانگی مایسی عیراق کە ڕەشید عالی گەیلانی بەرپای کرد و پشێوی کەوتە نێو عیراقەوە و هەزاران سڕگوم کراوان گەڕانەوە ماڵی خۆیان، ئەوان هەر چاویان لە مەرحەمەتی حکوومەتی عیراق کردبوو. بەلایەکدا نەڕۆیشتن لە شاری سلێمانی دانیشتبوون. پەرێشان و ڕووت و تەنگدەست و شپرزە بەسەریان دەبرد. نە جیرەیێکی وایان لەلایەن حکوومەتەوە پێ دەدرا کە موحتاج نەبن و نە میللەتی کورد دەیوێرا چاودێرییان بکا و نەهێڵێت پەرێشان بن. لە دەرەجەیێکی زۆر پەستدا دەژیان. هەرچەندە لەبەر حکوومەت دەپاڕانەوە و عەریزە و شکایەتی خۆیان دەدا، کەس نەبوو لێیان بپرسێتەوە و کەس نەبوو چارەسەرێکیان بکا. هەتا بەمە دڵخۆش دەبوون ئەگەر حکوومەت لە دایرەی ئەشغال بیانکاتە عەمەلە، هەر هێندە نەمر و نەژی خۆ بەرێ ببەن و ماڵ و منداڵیان ڕووت و ڕەجاڵ نەکەونەوە. ئەوەشیان پێ ڕەوا نەدەدیتن.

لەساڵی ١٩٤٣دا زۆر تەنگەتاو کرابوون؛ شپرزەو نەبوو و پەرێشان ببون. چەندجار عەریزە و شکایەتی حاڵیان بردە لای موتەسەڕیف؛ هیچ نەبیستران و چارەیەکیان نەکردن و هەتا گەیشتنە پایەیەکی وا کە دەیانەویست و تەشەبوسیان دەکرد کارکەری بکەن، کەس ئیشی پێ نەدەکردن. هەرچەند تەقەلایان دەدا کارێکیان بۆ هەڵنەدەسووڕا. نە حکوومەت و نە میللەت یارمەتی نەدان و پشتیوانیان نەکردن[٤].

---

(٤) لە ڕاستیدا میللەت لە سلێمانی زۆر پشتیوانییان لە بارزانییەکان دەکرد، بەڵام قسەکانی نووسەر لە بارەی هەڵسوکەوتی حکوومەتەوە زۆر دروستە. بلاوکەرەوە.

مەلا مستەفا ڕۆژێک شێخ ئەحمەدی بردە ماڵی خۆی و دەرەی دەروونی پێ گوت و ڕووتی و نەبوونی ژن و منداڵی نیشان دا. شێخ ئەحمەد بەسەری داهات و پێی گوت سەبر و تەحەمول پێویستە. حکوومەت ڕۆژێک دەبێ ڕەحمی ببزوێ و ئیشەکەمان بۆ پێک بێ.

مەلا مستەفا زانی، کە لە گەڵ شێخ ئەحمەد قسەکردن بێ سوودە؛ بەنیانی خەریکی خۆ ڕێکخستنی هەڵاتن و پێکهێنانی کەموکورتی ماڵ و منداڵەکەی بوو. دوو کەس لە پیاوەکانی کردە هاودەنگی خۆی کە دەرفەتیان بوو بڕۆن.

لەودەمانەدا من لە ڕواندز بووم. مانگی تەمووز دەنگ دەرکەوت کەوا بارزانییەکانی زێبار و شێروان و دۆلەمەڕی کەوتوونەتە کێوەکانی ڕیزە چیای برادۆستەوە. ژن و پیاو لە ئەشکەوتەکاندا کۆبوونەوە دەڵێن لەم ڕۆژانەدا مەهدی زهوور دەکات.

حکوومەت کەوتە تەقەلاوە. قایمقامی زێبار، سەعید فەندی غەفووری خەڵکی سلێمانی، کردیە هاوار و نوویسین و ڕاپۆرت دان کە ئەمانە خەریکی چتی خراپ و بێ ئەدەبین و بۆ ئەمە دڵی کوردەکانیان لێ پیس بکات. بەهۆی ئیدارەی قایمقامی ڕواندز شێخ حەمید ئەترووشی کوردی بادینانەوە، بەچاکی و خۆشی پێشی گرت و ناردی نەسیحەتی کردن و دڵخوشی دانەوە و هێندێک گەنم و جۆی بۆ ناردن و گێڕانییەوە. لە دوای چەند ڕۆژێکی دیکە نزیک چل کەسی دیکە کەوتنە چیای برادۆستەوە. ئەوانیشی دڵخۆشی داوە.

مدیری پۆلیسی هەولێر هاتە ڕواندز، ناردی لەو پیاوانە چوار کەس گیران و هێنایاننە ڕواندز هەر یەک دوو ساڵیان حوکم دانێ و ناردیاننە مووسڵ.

## مەلا مستەفای بارزان و هەڵاتنی لە سلێمانی

هەروەکو گوترا مەلا مستەفا بێزار ببوو؛ دەیەویست ڕێگای ڕزگاربوون دەست خات. هەتا ڕۆژێک دەرفەتی دی و لە سلێمانی دەرپەڕی بەکێوەکانی پشدەردا ئاوابووە خاکی موکریان. دووپیاوی خۆشی لەگەڵ بوو. هێندێک لە سەرهاتەکانی کوردی موکریانی یارمەتییان دا و چووە لاجان. مامەند ناو پیاوێکی خۆی، کە لە کۆلیج بوو لەگەڵ چوار کەسا هەلیگرتن و چووە بارزان. لە دێهاتەکانی دەوروپشتی مێرگەسوور خۆی گرت.

حکوومەت کە زانی ڕوو بەخاکی موکریان هەڵاتووە، کەوتە تەقەلاوە؛ هەموو ڕێگاکانی خستە ژێر چاودێرییەوە و لەم لاولا پیاوانی نیانی دانان کە ئاگادار بن هەر مەلا مستەفا لە لایەکەوە سەری هەلکرد بیگرن.

مەلا مستەفا لەو دێهاتانەدا سێ ڕۆژێک خۆی پەنهان دا. حکوومەت لێی دەگەڕا؛ بەڵام خەریکی هێز پەیداکردن و میللەتەکە هوشیارکردنەوە بوو.

حکوومەت لە پاش پێنج ڕۆژ زانی کە مەلا مستەفا هاتۆتە دەوروپشتی مێرگەسوور و چل نەفەر شورتە لە ڕواندوز و دەوروپشتەوە چووە مێرگەسوور کە پێنج کەس لەو دێهاتانەدا خۆیان شاردۆتەوە بچن بیگرن.

هەرکە لە نیوەشەودا گەیشتنە نزیک ئەو ئاواییە کە مەلا مستەفای لێ بوو، دەوریان دا بەو خەیاڵە کە پێنج کەسی بارزانی وەکو کەسەکانی پێشوو لەوێ زوو دەیانگرن و دەیانبەنە ڕواندز. بەڵام لە نزیک ئاواییەوە دەنگ گەیشتە گوێی ئەحمەد ئاغا و شورتەکان کەوا مەلا مستەفا بەمامەندەوە لێرەیە. ئیدی نە پۆلیس و نە ئەحمەد ئاغا و کورد خۆیان گرت. هەموو هەر یەک بەلایەکدا هەڵاتن و بڵاوەیان تێکەوت. هێندێک لە شورتەکان لە پێش تاو هەڵاتا بەلۆری گەیشتنە ڕواندز.

مەلامستەفا کە ئاشکرا بوو قاقەزێکی بەپاڕانەوە بۆ مدیری ناحیەی مێرگەسوور و یەکێک بۆ قایمقامی ڕواندز و قاقەزێکیشی بۆ موتەسەڕیفی هەولێر مستەفا یەعقووبی خەڵکی کەرکووک نووسی کە لە سلێمانی برسی و تونوو پەرێشان کەوتبوونەوە؛ لە تاوان هەڵاتووە و هاتۆتەوە نێو میللەتەکەی بەئاسوودەیی دادەنیشێ و لێی گەڕێن با خەریکی ئیشوکارێک بێ لەنێو میللەتەکەی خۆیدا. بەو جۆرە دووجار قاقەزی نارد و لەبەر مەرحەمەت و عەدالەتی حکوومەت دەپاڕاوە.

حکوومەت بەزبان جوابی دەداوە کە بێ خۆ تەسلیم بەحکوومەت بکاتەوە. دەستەیەک پۆلیس لە دەوروپشتی خەریکی گرتن و تەنگەتاوکردنی بوون. ئەویش هەر لەبەریان هەڵدەهات و مخابەرەی لەگەڵ دەکردن کە شەڕی پێ نەفرۆشن. بەڵام ڕۆژ بەڕۆژ هێزی پەیدا دەکرد.

لە سەرەتای مانگی ئاغستۆسدا قاقەزێکی دوورودرێژی نوویسی، وتی من و عایلەم، خزم و برا و قەومم ئەمە نزیک دوازدە ساڵە لە شارانی عیراق سرگوم کراوین و بەپەرێشان و شپرزەیی هەر چاوەنۆڕی عەدالەت و مەرحەمەتی حکوومەت بووین. ئەگەر هەر نەبوایە، دەبووایە حکوومەت لەگەڵ ئێمەدا وەکو ئەو شێخە عەرەبانە معامەلەی بکردایە کە لەگەڵیان کردن.

شێخ خوام و شێخ موحسینی ئەبو تەبیخ و گەلێکی دی لە شێخە عەرەبەکان

سەرکێشییان کردووە و دوو مانگ پێنەچوو بەخشراون و کراونە نایب و کراونە ئەعیان.
هەر نەبێ با ئەو مەرحەمەتەش لە حەق ئێمەدا بەجێ بهێنرێ و ئەوانەی سرگوم و ئەوانەی زندانی و لە بەندا دەرزێنەوە، بەر بدرێن و عەفووی عامیان بۆ دەرچێ و هەموو بگەڕێنەوە ماڵی خۆیان و گەلێک چتی گەورەتریشی داواکرد.

ڕۆژی ٧ی مانگی ئاغستۆس، مەلا مستەفا چووە گوندی شێخان کە نزیک شێتنەیە و وەلامی دا بەئامیر مەخفەری شورتەی شێتنە کە قادر بەگی کوڕی سەعید بەگی سۆفی عوسمانی ڕواندزی بوو، بچێتە لای چاوی پێ بکەوێ و هێندێک قسەی هەیە بۆ حکوومەت ڕایبسپێرێ.

ئامیر مەخفەر لەگەڵ قایمقامی ڕواندز و معاونی شورتەی ڕواندز بەتەلیفۆن قسەی کرد و وتی بچێت، یان نەچێت. قایمقام ئەمری پێ دا بەبێ چەک بچێتە لای.

قادر بەگ هەر ئەو ڕۆژە بەدوو شورتەوە هەستا چووە شێخان، چاوی بەمەلا مستەفا کەوت. لەو بابەتەوە کە لە قاقەزەکاندا وتبووی و داوای بەردانی سرگومەکان و بەندییەکانی کردبوو بەزبان وتی و قاقەزێکی بۆ قایمقامی نووسیبوو پێیدا و ڕاسپارد بۆ خۆی بچێتە ڕواندز، چاوی بەقایمقام بکەوێت و قاقەزەکەشی بداتێ و بەزبان زۆر چاک تێی بگەیەنێ و مەتلەبەکانی پێ بڵێ.

قادر بەگ گەڕاوە شێتنە بەتەلیفون چۆنی قسەکانی بەمعاون و قایمقام وت و تێی گەیاندن کە هێندێک قسەش هەن بەزمان بۆیان دەگێڕێتەوە.

معاون و قایمقام ئیزنیان دا بچێتە ڕواندز، ڕۆژی ٨ی مانگ هاتە ڕواندز. لەو دەمەدا منیش لە گێژاودا بووم؛ تەشقەڵەیان پێ دەکردم. قادر بەگ گەیشتە لای معاون. قایمقامیش هاتە دائیرەکەی معاون تەلیفۆنی هەڵگرت کە لەگەڵ موتەسەریف هەولێر مستەفا یەعقووبی قسە بکا و تێی بگەینێ. موتەسەریف تووڕە بوو تەلیفۆنەکەی دانا و جوابی نەداوە.

بەو جۆرە ئیش کەوتە سەختییەوە حکوومەت لەسەر ئەمە ڕقەی گرت کە دەبێ مەلا مستەفا خۆبەدەستەوە بدات و هیچ عوزر و پەیمان نەخاتە پێشەوە. بۆ ئەوە دەستەیەک شورتە داندران بچنە سەر مەلا مستەفا و بیگرن.

مەفەوەز شورتەی مێرگەسوور، پەترۆس خەڵکی ئەنکاوە و مەفەوەزی شورتەی شێروان محەمەد عەلی بەهێزە شورتەیەکەوە بۆ ئەوە داندران کە نابێ ڕاوەستن هەتا مەلا مستەفا دەگرن.

مەلا مستەفا نزیک نەوەد کەسێکی لەسەر کۆبێوە. ڕۆژی ١٠ی مانگ بەشەو چووە چیای برادۆست، پێنج ڕۆژ خۆی لە شورتەکان پەنادا. محەمەد عەلی و پەترۆس بەسەد کەس شورتەوە کەوتنە دووی.

مەلا مستەفا هەر لەم تەقەلایەدا بوو بەخۆشی و بێ خوێنڕژتن حکوومەت بیبەخشێ و برا و برازا و خزمەکانیشی بۆ بەردا. لەبەر ئەوە هەر خۆی دەپارازات و شورتەشی بەدووەوەبوو. ڕۆژی پازدەی مانگ بێ دەنگ لە چیای برادۆست چووە خوار و پەڕییەوە چوو لە گوندی وێرانە کە نزیک گوندی مووسح کاوەیە خۆی پەنادا؛ چەند ڕۆژێک لەوێ ماوە. حکوومەت پێی نەدەزانی.

عیزەت بەگ عەزیز ڕەئیسی ئەووەل، خەڵکی عیمادیە بۆ کەشفی ڕێگای سیدەکان بەوێدا چووبوو، دیبوونی. کە گەڕاوە بەحکوومەتی ڕاگەیاند و جێگاکەی ئاشکرا کرد، کە مەلا مستەفا لە وێرانەیە.

محەمەد عەلی و پەترۆس بەسەد کەس شورتەی ئازاوە کەوتنە دووی مەلا مستەفا. بەڵام مەلا مستەفا نەیهێشت شورتەی بگاتێ؛ بەگەردن حوشتردا سەرکەوت و ڕووی کردە چیای برادۆست. لە سەر تەپۆلکەی چیا لە کونەبەفردا خۆی شاردەوە، دوو شەو لەوێ ماوە.

مەبەسی هەر ئەمە بوو کە خوێن نەڕژێ، بەڵکم حکوومەت جوابی قاقەزەکەی بەعەفوو دەداتەوە و ئیش نەکەوێتە دژوارییەوە، هەتا بەپاڕانەوە پێک بێت چاکترە لە خوێنڕژتن، بەڵام لەم چەند ڕۆژانەدا دەنگ دراوە، هەموو کوردەکانی عیراق کەوتنە هەرا، هەرکەس لە ڕاستی خۆیەوە دەیگوت حکوومەت بۆچی دەبێ مەلا مستەفا و بارزانییەکان عەفوو نەکات.

ئەم قسە لە زاری هەموو کوردێکی بەغدا و کەرکووک و هەولێر و مووسڵ و سلێمانی و هەتا کوردی خانەقین و شارەبانیش موتەئەسیر ببوون و حەقیان بەمەلا مستەفا دەدا و بەئاشکرا هاواریان دەکرد و لە مەجلیسە گەورەکاندا مدافعەی مەلا مستەفا و بارزانییەکان لە کاردابوو و هەتا لە کوردی ئێران و سووریەشی کار کردبوو.

لەو دەمانەدا حکوومەت شێخ ئەحمەد و عایلەی و خزم و برا و برازاکانی بەماڵ و منداڵانیەوە لە سلێمانی خستبووە تەنگانییەوە. جیرەیەکی کەمی کە پێ دەدان، بڕی و نەیدانێ. کوڕی مەلا مستەفا لە سلێمانی عەریزەیەکی دا بەموتەسەڕیفی سلێمانی تێیدا نووسیبوو: ئەمە دوو مانگە بابی من لە برسانا سەری خۆی هەڵگرتووە، ڕۆیشتووە و

جیرەیەکی حکوومەت بۆی دانابووین بڕیویانە؛ ئێستا یان مەبلەغێک دراومان بدەنێ پێی بەرێ بچین، وە یان ئەمرکەن سرگومان کەن و یان بمانخەنە زندان؛ دەنا ئێمەش سەری خۆمان هەڵدەگرین و بۆ لایەک هەڵدێین. ئیتر کەیفی خۆتانە.

شێخ مستەفا قەرەداغی لە پاش ئەوە بانگیان کردن و بەجوێن و هەڕەشە جوابی دانەوە، عەرزوحاڵەکەی حەواڵەی مدیری شورتە کرد. بۆ ڕۆژی دووەم، شێخ ئەحمەد و ژن و منداڵی خۆی، برا و برازاکان و پیاو و عایلەکانی دیکەشیان سواری لۆری کردن.

من لە سلێمانی بووم لە ئوتێل ئومەرا لە هەیوانەکە ڕاوەستا بووم. جەرگم کزەی لێوە دەهات کە دیم لە بەر سوورە هەتاو بەو گەرمایە سێ سەعات ڕایان گرتبوون. نزیک نیوەڕۆ بردنیاننە کەرکووک، لەوێوە بۆ حیللەیان سرگومکردن.

مەئموورانی ئیداری و شورتەی لیواکانی شیمال لەو دەمانەدا ئیشوکاری وایان دەکرد کە میللەت بێزار بێت و هەڵێت؛ هەروەکو ئەمە کە دانەوێڵە لەسەر زەوی هێشتا نەدروابۆوە تەخمین دەکرا. پارچە زەوییەکی تەنێکی دەربینابایە بەپێنج تەن و پتر لە سەر میللەت تەخمین دەکرا و لە وەختی نوخشەدا بەپێی تەخمین دەغڵی لێ دەستاندن، میللەت هەرچییەکی هەیبوایە بیفرۆتایە و بیدایە بەحکوومەت لە ژێری دەرنەدەکەوت، ئەوەش میللەتی ناچاری هەڵاتن کرد.

## ناچاربوونی مەلا مستەفا بۆ بەرانبەریکردنی و هەڵمەتبردنی

هەروەکو بەکورتی لێی دواین، مەلا مستەفا دەیەویست بەپاڕانەوە و لە ڕێگایەکی بێ هەراوکێشەدا مەبەستی خۆی بەجێ بێنێت و مەغدوورییەت و پەرێشانی خۆی و میللەتەکەی بەحکوومەت و بەگەورە و بچووکی کورد بگەیەنێ و هاواری شپرزەیی خۆی و معاملە نابەجایەکانی مەئموورانی ئیداری کوردستان بخاتە پێش هەموو پیاوێکی بەویجدان و بەشەر پەرستەوە و هەموو عیراقییەک وشیار بکاتەوە کە مەئموورە ئیدارییەکانی شیمالی عیراق لەچی پایەیەکدا میللەت دەڕووتێننەوە و ئازاریان دەدەن و بیانوویان پێ دەگرن و تووشی هەرا و کێشەیان دەکەن.

جا بەڕاستی ئەوە لە مێشکی هەموو کوردێک کاری کردبوو و هەتا لە بەغدا گەورە و بچووکی کورد بەئاشکرا کەوتبوونە مودافەعەوە و بەجارێک لە هاواردا بوون و مراجەعەتی هەموو جێگا بەرزەکانیان دەکرد و شەو نەبوو لە بەغدا لە لیواکانی کوردستاندا بەیاننامە بەدیوارانەوە نەدەن و بۆ مەغدوورییەتی بارزانییان و شێخی بارزان هاوار نەکەن. وزەرا و

پیاوە گەورە سیاسییە دبلۆماسییەکانیان بێزار کرد لە هاوار و پاڕانەوەیان. میللەت بەجارێک شڵەژا و هەراسیان لێ هەڵگیرا و دەیانوت بۆچی دەبێ حکوومەت بارزانیان عەفوونەکات؟ بۆچی دەبێ لە گەڵیان بە لوتف و مەرحەمەت نەبێ؟ بۆچی مەلا مستەفا و شێخ ئەحمەد وەکو شێخە عەرەبەکان تەماشا نەکرێن؟ بەو جۆرە بەیەک دەنگ و بەیەک ڕوح میللەت بزووتەوە.

مەلا مستەفا هەر ڕۆژە بەلایەکدا خۆی دەشاردەوە و لە دەست شورتە هەڵدەهات و لە شیو وکێوە بەرزەکاندا خۆی پەنهان دەکرد کە تووشی خوێنڕژتن نەبێ و کورد بەکورد بەکوژت نەدا؛ چونکو شورتەکانیش هەموو کورد بوون و لە قاقەز نوویسین و پاڕانەوە لەبەر حکوومەت ڕانەدەوەستا و بۆ مەخفەرەکان و مدیری ناحیەکان و بۆ قایمقامەکانی قاقەز دەنارد؛ داوای عەفووی عامی دەکرد. حکوومەتیش بۆ سەرکوتی و گرتنی ئەمری دەدا و موتەسەڕیفی هەولێر مستەفا بەگ یەعقووبی و موتەسەڕیفی مووسڵ مەجید یەعقووبی بەتوندی فەرمانیان دەدا کە بچنە سەری بیگرن.

شورتە لەدووی نەدەبۆوە. فەوجی حدوودی ڕواندز بەهەموو هێزیەوە هەستا چووە مێرگەسوور. لە مووسڵەوە فەوجێک هەستا چووە ئاکرە و بلە. دوو فەوج لە هەولێر و کەرکووکەوە چوو بۆ ڕواندز. دوو فەوج شورتە بۆ بارزان ناردرا. حکوومەت هەموو عەشایرەکانی دەوروپشتی بارزانی دڵخوشی دانەوە. هەر پیاوەی بەشەش دیناری بۆ قەیدکردن و چەکی دانێ کە لەگەڵ شورتە بچنە سەر مەلا مستەفا. مەحموود بەگی خەلیفە سەمەد ڕەئیسی برادۆست، سەد تفەنگی وەرگرت و سەد پیاوی بەشورتە قەید کرد و پوشۆی کوڕی سەید تەها سەد و خدری حەمەدەشینی سەد و قادر ئاغا سی و شووشەی زێباری و کوڕی فارس ئاغا سێ سەد تفەنگیان وەرگرت. بەڵام ئەوانە هەموو بۆ حکوومەت بەگژ مەلا مستەفادا نەدەچوون.

مەلا مستەفا لەو هەموو هاوارەی کە نەتیجەیەکی باشی لە حکوومەت دەست نەکەوت، ڕۆژی ٢٢ی مانگی ئاغستۆس هەستا چوو بەسەر مەخفەری شورتەی شانەدەری دادا و گرتی. پیاوە شورتەکانی ڕووت و چەک کرد؛ هەموو کەلوپەل و دانەوێڵە و تفەنگی لێ ئەستاندن و بەرەڵایکردن. تەنیا پۆلیسێک خۆی بەپیاوی مەلا مستەفا نویسی و هی دیکەش بەردران.

ڕۆژی ٢٥ی مانگ مەلا مستەفا لنگی دا سەر مەخفەری شورتەی بیدارون. ئەویشی

گرت و شورتەکانی چەک کرد و بەری دان. بیدارون گوندێکە لە نزیک چیای پوورەفات لە نێوانی ڕێزان و مێرگەسووردا هەڵکەوتووە دانەوێڵەیێکی باش کەوتە دەست بارزانییان.

حکوومەت لەو بزووتنەوەی مەلا مستەفا کەوتە ئەندیشەوە. ڕۆژی ٢٥ی مانگ، مەخفەری شورتەی کوورانی چۆڵ کرد، دانەوێڵە و ئەشیایەکی تێیدابوو بەجێهێشت و شورتەکانی کێشاوە و مەخفەرەکەی بەجێهێشت.

مەلا مستەفا لە پاش ئەوە هەستا چووە دەوروپشتی چامە و ژاژۆک. ڕۆژی ٢٧ی مانگ، ئەو دەورەپشتەی گرت. لەو دەمەدا حکوومەت فەوجێکی شورتەی لە ژێر فەرمانی ئامیر فەوجی شورتە جەواد بەگدا نارده سەر مەلا مستەفا، ئەو هێزە گەیشتبووە شێروان مەزن. ڕۆژی ٣٠ی مانگ ئەو هێزەی شورتە لەو جێگایانەدا دامەزراندرا بوو، لە جێگا سەختەکاندا سوپەریان گرتبوو.

مەلا مستەفا چووە سەر مەخفەری شورتەی خێرەزۆک لە پاش دوو ڕۆژ دەورەدان و تەنگەتاوکردن، ڕۆژی ٣٠ مانگ مەخفەری خێرەزۆک گیرا و شورتە چەک کران، دانەوێڵە و تفەنگ و بەرگی پۆلیسییان لێ ئەستاندن.

چونکو لە هەموو لایەکەوە تەلیفۆن بڕدرابوو، جەواد بەگی ئامیر فەوجی شورتە لە مەخفەری خێرەزۆک ئاگادار نەبوو، هەستا بەفەوجێک شورتەوە لە شێروان مەزنەوە هەڵمەتی بردە سەر مەلا مستەفا کە مەخفەری خێرەزۆکی لە دەست ڕزگار کا. [مەلا مستەفا] لەوە ئاگادار بوو. زوو هێزێکی هەڵگرت و چووە دەوروپشتی گوندی بیرسیا. لە جێگا سەختەکاندا سوپەری گرت و دانیشت؛ چاوەنۆڕی هاتنی جەواد بەگ بوو. هەموو گەلی و تەنگەکانی خستە ژێر چاوەدێری هێزەکەیەوە.

جەواد بەگ ئاگای لە مەلا مستەفا و هێزەکەی بارزان نەبوو کە هەموو ڕێگا و جێگا بەرز و دەربەندەکانی خستە ژێر هێزی خۆیەوە؛ بەبێ باک و ترس بەفەوجێک شورتەوە هات. ڕۆژی ٢ی مانگی ئەیلوول کەوتە نێو ئەو جێگا تەنگانەوە کە هێزی مەلا مستەفا بۆی لە بۆسەدا دانیشتبوون. لە پڕێکا بارزانی بۆیان دەرپەڕین و دەست کرا بەتەقە و شەڕ. لە جەواد پازدە کوژرا و بیست بریندار و سی ٣٠ کەس بەدیل چوون. لە هێزی مەلا مستەفا تەنیا یەک پیاو کوژرا؛ ئەویش موعەللیمی حکوومەت بوو، لە شێروان بوو، لە زوڵم و ئیفترای شورتە هەڵاتبوو گەیشتبووە مەلا مستەفا؛ لەو شەڕەدا کوژراو هێزی شورتە بەشپرزەیی هەڵات.

مەلا مستەفا گیراو و بریندارەکانی بەحورمەتەوە ڕاگرتن و لە پاشان هەمووی بەڕێکردنەوە و ناردنیەوە تەسلیم بەحکوومەتی کردنەوە. لەو شەڕەدا چەک و دانەویڵەیەکی زۆری پێ برا.

مەلا مستەفا لە دوای ئەو سەرکەوتنە هێزێکی هەڵگرت و ڕوو بەشێروان مەزن و مەرکەز ناحیە هەڵمەتی برد. لەوددەمەدا لە هەولێر فەرمان درا بەسەبری عەبدوللا مدیری شورتەی هەولێر کە بچێت سەرکردەیی فەوجی شورتە بکا و بەهێزێکەوە بچێتە سەر مەلا مستەفا. سەبری عەبدوللا لە چووین خۆی گرت. حکوومەت لە مەئمووریەتی دەرکرد. هەستا هاتە بەغدا، لە ئوتێل زەورا دابەزی.

مەلا مستەفا دەورەی شێروان مەزنی دا و هەموو دەوروپشتی تەنگە هەڵچن کرد. لە پاش دە ڕۆژ دەورەدان ڕۆژی ١٢ی مانگی ئەیلوول شێروان مەزن و مەرکەز ناحیە گیرا نزیک دوو شێست تیر (مەترلیوز) و تفەنگێکی زۆر و دانەویڵە و بەرگ و بەتانیە و وڵاغیان دەست کەوت. مدیری ناحیە و هەموو مەئموورەکانی بەدیل گرتن. لە پاش دوو ڕۆژ بەری دان و ناردنیەوە بەحورمەتەوە تەسلیم بەحکوومەتی کردنەوە.

ڕۆژی ١٤ی مانگی ئەیلوول دەستە شەڕکەرێکی لە ژێر فەرمانی ئەحمەد ناز شێتنەییدا ناردە سەر مەخفەری شورتەی چامە. لە پاش دوو سەعات دەورەدان و شەڕ و کوژتار، ئامیر مەخفەر کوژرا و دوو پۆلیس بریندار بوو؛ مەخفەرەکە گیرا.

مەلا مستەفا ڕۆژ بەڕۆژ هێزی ڕوو بەپتر بوون بوو. نیرووەکەی لە چوارسەد کەسی شەڕکەری ئازا پتر ببوو و هەر لە پتربوونیشدا بوو، بەڵام لەگەڵ کەس معامەلەیەکی وانەدەکرا، کە ڕەنجیدەیی تێدابێ. هەر دیلێک بگیرابایە زۆر حورمەتی دەگیرا. هەر پارەیەکی خۆی پێ بوایە پێی دەدراوە، بەڵام بەرگ و چەکی حکوومەت و وڵاغی حکوومەتی لێ دەستاندرا و لە پاشان ئەگەر بەئارەزووی خۆی بکەوتایەتە نێو لەشکری بارزانەوە دەبەخشرا و چەکی پێ دەدرا و لە ڕیزی شەڕکەران دەدرایە ژێر فەرمانی سەرۆکێکەوە؛ دەنا بەحوومەتەوە بەڕێ دەکرا و تەسلیم بەهێزی حکوومەت دەکراوە. بریندارەکان زۆر بەدڵسۆزی تیمار دەکران و بەسواری بەڕێ دەکران هەتا لە نزیکترین جێگایەک دەدرانەوە دەست حکوومەت. نە بە برینداران و نە بە دیل و کوژراوان سووکییێک وە یان بێ حورمەتییێک بەکەس نەکراوە. بەڵکم وەکو برایان تەماشا کراون و حورمەت گیراون. بێجگە لە ماڵی حکوومەت تەنیا فلووسێک چییە لە کەس

وەرنەگیراوە. بەڵام هەرچییێکی عاید بەحکوومەت بووبێ ئەستاندراوە.

حکومەت کەوتە ئەندێشە و بیرەوەرێوە. مەلا تاهیری خەتێ، کاتبی مەحکەمەی ڕواندز، پەسەند کرا کە بینێرنە لای مەلا مستەفا و داوای مامڵەتی لێ بکەین. مەلا تاهیر هەستا چووە مێرگەسوور. لەوێوە پیاویان ناردە لای مەلا مستەفا، کە داوای کاتە لای خۆی. مەلا مستەفا لەودەمەدا شێروان مەزنی دەورەدابوو، مەلا تاهیر چوو چاوی پێکەوت و قسەکانی حکوومەتی پێ گوت. مەلا مستەفا هەروەکو لە پێشدا کەمێکی لێ دوام هەر ئەو گفتوگۆیەی کرد کە بەقاقەز بۆ حکوومەتی نووسیبوو؛ بەڵام لێرەدا هێندێکی زیاد کرد کە دەبێ حکوومەت موتەسەریفی هەولێر نەهێلێت و دەبێ هەموو پیاوەکانی کە لەگەڵیا ڕێککەوتوون ببەخشرێن. عەفوویێکی عام دەربخرێت. مەلا تاهیر گەڕاوە و بێ سوود بوو.

حکوومەت ناچاربوو هێزێکی زلی ناردە سەر بارزان. فەوجێکی ناردە مێرگەسوور، لیوای ڕابیع باپشتیانی کردە لەشکرگاه و چووە مەزنە دامەزرا. چوار فەوج شورتە لە ژێر فەرماندەی وەجیهـ بەگدا نارد جێگا پێویستەکانی توند کرد و دامەزرا. لە بەغدا و کەرکووک و مووسڵەوە سەرباز و چەک ناردران. فەوجی هەولێر چووە ڕواندز لە ئەکنە دامەزرا و فەوجێک لەشکر لە خەلیفان جێگیر بوو. کوردەکانی بەشورتە نوویسرابوون، بۆ پێشەوەی ناردن کە نزیک ببنەوە هەموو ڕووئەساکانیان پڕ چەک کرد و دراوێکی زۆریان پێدان.

مەلا مستەفا کە لەوە ئاگادار بوو، لە هەموو لایەکەوە دەستی بەهەڵمەت و پەلاماردان دا. ڕێگا و پردەکانی تێکدا و خەتی تەلیفۆنەکانی بڕی. هێزێکی خستە لای ڕواندزەوە لە هەموو لایەکەوە تەنگەی بەسەرباز و شورتەی حکوومەت هەڵچنی لەسەر ڕێگای خەلانی دۆلەمەری گردی هەرما و سەنگەری گرت ئەو هێزە کە بۆ مێرگەسوور دەچوو کە قافڵە ئۆتمۆبیل و دەبابە و لۆری بوون، لە ڕواندز و لەشکرگاوە دەچوون، ئاگادار نەبوون کە ڕێگاکان تێکدرابوون و لەسەرە ڕێگادا بەرد کەڵەکە کرابوون. هەرکە ئەو قافڵە نزیک بۆوە کرا بەشەڕ. دەستە بارزانییێک خۆیان گەیاندە دوا ڕێگای قافڵە پردەکەیان تێکدا و ڕێگایان خراپ کرد و لەسەر ڕێگا بەردیان قووچکە کرد کە قافلە ئۆتمۆبیل و دەبابەکان نەتوانن بگەڕێنەوە، حکوومەت پێی نەکرێ هێزێکی دیکە بنێرێ بۆ یارمەتی ئەو قافڵەیە.

ئەو هێزەی حکوومەت لە ژێر فەرمانی عوسمان بەگی ئامیر فەوجی ڕواندزدا بوو. ئامیر فەوج لەنێو دەبابەیەکدا خۆی گرت. لە لەشکری حکوومەت زۆر کوژران و سەیارەیەک

سووتاندرا و یەکیش شکاندرا. دەبابەکان پەسێویان گرت. لەو شەڕەدا دوو شێست تیر (مەترلێوز) کەوتە دەست کوردی بارزان.

بەڕاستی کوردەکانی بارزان لەم شەڕەدا زۆر ئازایی و ڕەشیدییان نیشان دا. لە مێرگەسوورەوە شێخ قادر ڕەئیسی ئەووەل خەڵکی سلێمانی بەدەستە لەشکرێکەوە لە کێوی برادۆستەوە بەهاواری لەشکری حکوومەتەوە چوو. بارزانییەکان، چونکو لەگەڵ کوردەکاندا شەڕیان نەدەکرد، کە چاویان بەشێخ قادر کەوت، دەستیان لە دەورەدراوەکان بەردا و کشانەوە.

بەڵام لەو دەمەدا چونکو تەلیفۆن نەمابوو ئاگایان لەو کێشە و شەڕە نەبوو، قافڵەیەکی دیکەی ئوتمۆبیل لە مێرگەسوورەوە دەرکەوت بچێتە ڕواندز. هەر لەبەر مێرگەسووردا جێگایەکی پێی دەڵێن گەرەگۆمی، بارزانیان پێشیان پێ گرت و کردیانە شەڕ. لەم شەڕەدا لە حکوومەت لەشکرێکی زۆر کوژرا و شێست تیر و تفەنگ و ئەشیا و خواردەمەنییێکی زۆر کەوتە دەست کوردەکانی بارزانەوە. لەشکریانی حکوومەت ئەوەی ڕزگار بوو بۆ مێرگەسوور هەڵات و دەرگای خۆی گرێ دا.

مەلا مستەفا لە دوای ئەم دوو شەڕە بیستریای کردە جێگای دانیشتنی خۆی و بۆ شەڕ و هەڵمەت دەستە لەشکرێک و سەرۆکێکی دەناردن و فەرمانی پێ دەدان کە بۆ هەرامە جێگا بچن و هەرامە ڕێگا بگرن. بەو جۆرە دامەزرا و هێزەکەی گەیشتبووە حەوت سەد کەسی شەڕکەر.

لە دوای ئەو شەڕە لەشکری حکوومەت لە ژێر فەرمانی نوورەدین بەگی مەحموودا لە مێرگەسوور دەرکەوت، کە بچێتە کووران و چامە. لە سەرۆکەکانی بارزان مستەفا ساکۆ خەڵکی گوندی کانی لینج و مامەند مەسیح لەوە ئاگاداربوون. بەهێزێکی لە دەستیاندا بوو چوون پێشیان بەلەشکری حکوومەت گرت. دەست بەتەقە و شەڕ کرا و ئەو لەشکرە ناچاری گەڕانەوە بوو، بەقوونە شەڕ و کوژتاردان پاشەوپاش گەڕانەوە. لە دوامیندا شکا و هەڵات خۆی خستە نێو مێرگەسوورەوە.

گردێکی نزیک مێرگەسوور -کە لە نێوان مێرکەسۆر و بیستریادا هەڵکەوتبوو- دەستە شەڕکەرێکی بارزان لەو گردە سەنگەری گرتبوو. لەشکری حکوومەت لە مێرگەسوور لەنێو تێل دڕوو دەرکەوتن ڕوو بەو گردە چوون کە بیگرن. سوڵتان ئاغا سەرۆکی مەلا مستەفا لەو گردەدا بوو. لەشکری حکوومەت هەڵمەتی بردە سەر سوڵتان ئاغا، بەفڕۆکەش لە

سەرەوە هەڕەشەیان کرد. سولْتان ئاغا بەبێ شەڕکردن بەرەو دواوە کشاوە؛ بەڵام دوو پیاوی بارزان بریندار کرا، ئەوەش بەساچمەی بۆمبەی فڕۆکە بریندار بوون. لە پاش نیو سەعاتێک هێزی مەلا مستەفا فریاکەوت و گەیشتە سولْتان ئاغا و هەڵمەتیان دا و لەشکری حکوومەتیان ناچار کرد، کە گرد بەربدات و بۆ مێرگەسوور بگەڕێتەوە. بارزانی بەکوژتار کەوتە دوایان لەو شەڕەدا شێست تیرێک و چەند تفەنگێک کەوتە دەست بارزانییان.

لەو دەمانەدا لە مووسڵ موتەسەڕیف مەجید یەعقووبی لە ڕۆژنامەی مووسڵدا بڵاوی کردەوە، هەر کەسێک مەلا مستەفا چی بەزیندوویی و یان بەمردوویی بگرێ، حکوومەت هەزار دیناری پێ دەدات و هەر پیاوێکی بارزانی بگرێ پەنجا دیناری پێ دەدرێ.

حکوومەت لەو دەمەدا بینای مامڵەتی لەگەڵ مەلا مستەفا دامەزراند. جارێکی دیکەش مەلا تاهیریان نارده لای مەلا مستەفا و چلۆنی شرووت دەست پێ کرا. مقەددەم ئەحمەد فەخری ئەمینی خەڵکی سلێمانی چووە لای. قسەی مەلا مستەفا هەر ئەوەبوو کە دەگوترا. مەلا تاهیر بەبێ سوود گەڕاوە و شەڕ نەختێک سووک بوو. هەردوو لا سستییان کرد. مەلا تاهیر دیسان بەبێ گەیشتنە ئارەزوو، لەگەڕانەوەدا مەلا مستەفا یەک دوو قسەشی پێ گوت.

حکوومەت فەوجێکی کە لە مێرگەسوور دانابوو، دەورەی بەتێل دڕوو توند گرت و خواردن و پێویستی شەش مانگی بۆ دانان و پێی گوت هەتا بەهارێ با دانیشێت.

لەو دەمە تەنگەدا حکوومەت پووشۆی کوڕی سەید تەهای نارده لای مەلا مستەفا کە بەسەری(؟) دابێ و لەگەڵ حکوومەت پێکی بێنێ. پوشۆ و نووری باویل پێکەوە چوون. هەرچەندە کۆشان ئەو هەر قسەی پێشووی خۆی کرد؛ مەرج و پەیمانی هەر ئەوە بوو. لە گوندی بیستریان دوو ڕۆژی مانەوە و گەڕانەوە. لە دوای ئەوان ئەمجا سەرکردەی لەشکری عیراق نوورەدین مەحموود، پووشۆ و نووری باویلی لەگەڵ خۆی بردن و چوونە لای مەلا مستەفا. نورەدین مەحموود لە پێشدا قادر بەگ ڕەئیسولعورەفای شورتە -کە ئامیر مەخفەری شێتنە بوو- ناردیە لای مەلا مستەفا کە جێگای یەکتر دیتنی(جێ ژوان) دابنێن. مەلا مستەفا گوندی خەلانی کردە ژوانگە.

نورەدین مەحموود چوو لەو گوندە چاویان پێک کەوت. قاقەزێکی ڕەئیسولوزەرای پێ بوو، دایە. لەو قاقەزەدا نوویسرابوو کە ئیتاعەی حکوومەت بکات، لە پاش دوو مانگی

دیکە حکوومەت عەفووی عام بۆ بارزانییان دەردەخات. مەلا مستەفا بەنورەدین مەحموود دەڵێت: ئێوە لە لایەکەوە دڵخۆشیم دەدەنەوە کە ئیتاعەت بکەم و لە لایەکی دیکەوە موتەسەریفی مووسڵ دەمخاتە هەڕاجەوە، بەمردوویی یان بەزیندوویی بەهەزار دینارم دەفرۆشێ. ئەوە دەڵێت و جەریدەکەی مووسڵ دەردەخا و نیشانی دەدا. لە پاش کەمێک گلە و گازاندە، مەلا مستەفا دەڵێت: من لە حکوومەت عاسێ و سەرکێش نیم، بەڵام مەئموورانی ئیداری مللەتیان ڕزاندۆتەوە و نە ناموس، نە ماڵیان بەمیللەت نەهێشتووە. مەئمووری مەرکەزی مێرگەسوور، ڕۆنی هەموو بارزانی بۆ خۆی تەرخان کردووە. هەر تەنەکەیەکی ڕون، کەبە «سەری» پازدە کیلۆیە دەبێ بەپێنج درەم بیفرۆشن. ئەگەرچی ئەمرۆ تەنەکەی ڕون پێنج دینارە. لە پاشان فلان مەئمووری مەرکەز چوار کچی باکیرەی بەزۆر ئەتک کردەووە و ئێستاش ئەو کچانە ماون و تەماشای خاکی بارزان بکرێ، ئاوایی نەماوە؛ هەموو چۆڵ و وێرانە. ئەوە هەموو لە دەست جەور و زوڵمەوەیە.

دیسان شێخ مستەفا وتی من باوەڕ ناکەم هەتا پیاوێکی ئینگلیزی نەکەوێتە پێشەوە و وەعدە نەدات، دڵنیایی من بەئێوە نایە. بەڵام نەفەرێکی ئینگلیزی هەرچییێکی بڵێت باوەڕی پێ دەکەم.

نورەدین مەحموود قسە و شرووتەکانی مەلا مستەفای هەموو خستە سەرقاقەز و مەلا مستەفا قاقەزیشی بۆ ڕەئیسولوزەرا نووری سەعید پاشا نووسی و وتی: ڕۆژی یەکەمی جەژنی قوربان شێخ ئەحمەد وسرگوم و بەندییەکان دەبێ بچنەوە بارزان. لەسەر ئەوە نورەدین مەحموود گەڕاوە.

مەسەلە عەرزی وەزارەت کرا. هەروەکو لەوە پێش قسەکانی مەلا مستەفا سەعید بەگ تکریتی قاید فیرقەی کەرکووک مەتالیبەکانی مەلا مستەفای گەیاندە بەغدا. لە مەجلیسی نەوابدا بوو بەهەرا، کە سەرکێشێک چۆن سوڵح لەگەڵ حکوومەت دەخاتە پێش. مەتالیبەکانی مەلا مستەفا پەسند نەکران.

نورەدین مەحموود لە بارزانەوە گەڕاوە بەغدا و شرووتەکانی دا بەوەزارەت و لێرەدا ئەفکاری خۆشی تێدا بەیان کرد. کە گەڕاوە بەغدا نووری باویل و سمکۆی کوری نووریشی لەگەڵ هاتە بەغدا. ڕۆژی ٣١ی تشرینی دووەم هاتە بەغدا، دەستبەجێ خرایە ژێر چاودێری شورتەوە کە گۆیا تەرەفداری مەلا مستەفایە، بەڵام مەسەلە شەخسی بوو. مستەفا قەرەداغی موتەسەریفی هەولێر ئەمری دابوو موراقبە بکرێ.

لە پاش گەڕانەوەی نورەدین مەحموود بۆ بەغدا، شەڕ و هەرا لە بارزان نزیک دە ڕۆژ ڕاگیرا. نورەدین و حکوومەت قەراریان دا کە لەوەدەمە تەنگەدا شەڕ بێ سوودە. بەهەر جۆرێک بێت بیخەنە بەهار؛ چونکو بزووتنەوەی لەشکر بۆ سەر بارزان زۆر سەخت و دژوارە.

مەلا مستەفا، کە وردبۆوە ئەمە خەڵەتاندنە، ناچار دەستی بەکێشە و هەڵمەت کردەوە لنگیدا سەر مەخفەری شێتنە و گرتی چووە سەر مەخفەری ڕێزان و گرتی. لەشکرگای مێرگەسووری دەورەدا و خستیە ژێر تەنگانی و ڕێگای مێرگەسوور و ڕواندزی بڕی، کوژتار گەرم بوو. دەستە لەشکرێکی ناردە سەر مەرکەزی بارزان و دەورەی دا دەستە شەڕکەرێکی ناردە سەر مەخفەری کانیەڕەش کە نزیک سەد کەس شورتە و عەشیرەتی بەچەکی تێدابوو دەورەی دا و ئاوی لەسەر بڕی. ڕۆژی دووەمی جەژنی قوربان، لەشکرێکی ناردە سەر ڕێی سیدەکان. لە سەرێ بەردی پێشی بەهێزی شورتە گرت. مفەوەزێک و دوو شورتە کوژران و چەند کەسێک برینداربوون و هی ماوی خۆیان بەدەستەوەدا. معاونێکی شورتە و مفەوەزێک بەدیل گیران. دەستە لەشکرێکی نارد کە گەلی عەلی بەگ بگرن و پردەکان تێکدەن. لێرەدا ڕەنگ گۆڕدرا.

لەلایەن هێزی بەریتانیاوە هەڕەشەیەکی پێ درا کە ڕێگای هەولێر و ڕایات ڕێگایەکی ڕەسمی و عەسکەرییە. ئەگەر دەست لەم ڕێگایە درێ، حکوومەتی بەریتانیا مداخەلەی ئیش دەکات. ئەگەر ئەو هەڕەشە نەدرابایە، شاری ڕواندز لە گرتندا بوو.

حکوومەتی بەریتانیا دەستە لەشکرێکی ئینگلیزی نارد لە دیانا و لە هەودیان دامەزراندران بۆ ئەمەی تەعەروز نەکرێتە سەر ڕواندز و بۆ پارازتنی ئاسوورییەکان مێجەر ئەستەبنگ، زابتی ئیرتیباتی بەریتانیا، چووە دیانا دانیشت.

مەلا مستەفا ئەوجا ڕووی لەلای ئاکرە کرد و بیرەکەپران و بلە و ئاکرەی خستە ژێر هەڕەشەوە. ئەگەر دەستە و لەشکری ئینگلیزی نەچووبانایە دیانا، ناحیەی سیدەکان و باڵەک لە گرتندا بوو و ڕێگای ڕواندز لە هەولێر دەپچڕاندراوە.

لەم ڕۆژانەدا لە بەغدادا بەیاننامەیەکی زۆر بەدیوارانەوە درابوون و لە هەموو لیواکانی کوردستاندا ئەو بەیاننامانە بڵاوکرابوونەوە دوو نسخە بوون. حکوومەتی بەریتانیا کەوتە ئەندێشەی ئەمەوە کە نەک لە هەموو لایەکەوە سەرکێشی کورد دەست پێ بکرێ و دوژمن دەرفەت وەرگرێت و دەستی خۆی بگەیەنێت.

پشێوی کەوتە وەزارەتەوە. وەزارەت کەوت و دووبارە دامەزراندرایەوە. ماجید بەگ مستەفا خەڵکی سلێمانی کرا بەوەزیری بیلاوەزارە و هەموو ئومووری کوردستان بەو درا. عومەر نەزمی بەگ بوو بەوەزیری داخیلیە و ئەحمەد موختار بەگ بابان وەزیری عەدلیە. بەوە گەلێک ئیشوکار ڕووی لە گۆڕین کرد. هەتا نایبەکانی جنووب لەسەر ئەوە کردیانە هەرا کە ماجید بووە وەزیری بیلاوەزارە و وەزیری داخلیەی پێشوو و ساڵح جەبر لە مەجلیسدا هاتە جواب و ئیعتیرازی گرت و نووری سەعید پاشا جوابی داوە.

وەکو لە بەغدا لە گەلێک بیاوانی ماقووڵم بیست، گۆیا ئەمیر عەبدولئیلا وەسی و وەلیعەهدی عیراقیش موعتەریز بوون بۆ ماجید بەگ، بەڵام مەسڵەحەتی عامە وای پێی دەوەیست کە دەبوایە لەودەمەدا ماجید ببێتە وەزیر بۆ دامەزراندنەوەی مەسەلەی کوردەکان؛ چونکو کورد هەموو شڵەژابوون و یارمەتی مەلا مستەفایان دەکرد.

گەورە پیاوەکانی کورد لە مراجەعەت بۆ عەفووی بارزان ڕانەدەوەستان. مستەفا یەعقووبی موتەسەڕیفی هەولێر و مەجید یەعقووبی موتەسەڕیفی مووسڵ هەر لەسەر ئەوەبوون بەشەڕ و کێشە ئیش پێک بێنن. حکوومەت لە پاش ئەوە وەزارەتی گۆڕی، مستەفا یەعقووبی بردە کووت و مەجید یەعقووبی ئیستیعفای کرد و مستەفا قەرەداغی ناردە هەولێر.

ماجید بەگ کەوتە ئیش و تەقەلاوە. ڕۆژی دەی مانگی کانوونی یەکەم، یەکەم ڕۆژی جەژنی قوربان بوو. شێخ ئەحمەدیان لە حیللەوە هێنا بەغدا لە ئوتێلی شەتولعەرەبیان میوانداری کرد. ڕەئیسولوزەرا و وەزیری داخلیە و ماجید بەگ چاویان پێی کەوت و پێیان گوت کە خەبەر بداتە مەلا مستەفا با چیدیکە شەڕ نەکات. بۆ بەهارێ عەفووی بۆ دەردەخرێ؛ بەڵام ماوەی سێ مانگ لە بارزان دوورکەوێتەوە بچێتە پشدەر دانیشێ.

شێخ ئەحمەد وەڵامی دا ئەمڕۆ ئەو پیاوە سەربەخۆیە، جوابی من ناداتەوە. منێکی یەخسیر چم لە دەست دێت. ناچاریان کرد و قاقەزێکی بۆ مەلا مستەفا نووسی. ماجید بەگ و وەزیری داخیلیە و مستەشاری داخلیە و سەفیری بەریتانیا هەریەک قاقەزێکیان بۆ نووسی بەخالیدی کوڕی گەورەی شێخ ئەحمەددا ناردیانە بارزان. ڕۆژی دووەمی جەژن شێخ خالید بۆ ڕواندز و لەوێوە بۆ لای مەلا مستەفا چوو. شێخ ئەحمەدیش هەر ئەو ڕۆژە گەڕاوە حیللە.

لە پاش بیست ڕۆژ، خالید گەڕاوە بەغدا. ماجید بەگ ناردی نووری باویل ئاغای

ڕواندزی کە لە بەغدا لە ژێر چاوەدێری شورتەدا بوو، لەگەڵ ڕەئیس ئەووەل عیزەت عەزیز خەڵکی عیمادیە ڕۆژی جومعەی ناردنیە حیللە و چاویان بەشێخ ئەحمەد کەوت و هەموو سەرۆکانی بارزانییان دی و هەر ئەو ڕۆژە گەڕانەوە بەغدا.

ڕۆژی ٣١ی کانوونی یەکەم، مەسەلە لە گفتوگۆدا بوو. ئەو ڕۆژە نووری و سمکۆی کوڕی بەر بەڕواندز ناردرانەوە کە ڕۆژێک پێش چاویان بەمەلا مستەفا بکەوێ و بۆ سبەینێ ماجید بەگ دەچێت کە حازربن بۆ دیدەنی مەلا مستەفا.

ڕۆژی جومعە شەوی شەممە، یەکی مانگی کانوونی دووەمی ١٩٤٤ ماجید بەگ و عیزەت ڕەئیس ئەووەل و ملازم سەید عەزیز کوڕی سەید عەبدوللای شەمدینان، بەقیتار بۆ کەرکووک چوون، لەوێشەوە مقەدەم ئەمینی ڕواندزییان هەڵگرت و چوونە ڕواندز. هەتا ئەوان گەیشتنێ، نووری چاوی بەمەلا مستەفا کەوتبوو.

کە ئەمین ئەفەندی و عیزەت و سەید عەزیز چوونە مێرگەسوور و ماجید بەگیش چووە مووسڵ، مەلا مستەفا هاتە مێرگەسوور سەعاتێک دیدەنی کرد و گەڕاوە جێی خۆی. ماجید بەگ ڕۆژی ١٢ی مانگ گەڕاوە بەغدا. مەسەلە کەوتە مەجلیسەوە هەرا کرا. ماجید بەگ لە مووسڵ لە ماڵی ئەحمەد بەگ جەلیلی بوو، شەوێ تەلگرافێکی مەلا مستەفای لە مێرگەسوورەوە بۆ چوو کە ئەوا بەبێ قەید و شەرت خۆم تەسلیم بەحکوومەت کرد و هەرچۆنێکی ماجید بەگ بیەوێت من دڵنیام.

# وێنەگری و کۆڵین

زەنگۆغرافی

بەزانین و تاقی کردنەوە، وێنە کۆڵان بەتیشکی ڕووناکی

کردەوەی خێوی زاری کرمانجی
حسین حزنی موکریانی
رواندز لە مەرکەزی زاری کرمانجی دامەزرا ١٩٣٤
پەرتی زاری کرمانجی ٢٠

# وینه گه ری و كولین

زه نگوغرافي

به زانین و تاق کردنه وه وینه کولان به تیشکی روناکی

✻ ✻ ✻

کرده وه ی

خیوی زاری کرمانجی

حسین حزني موکریاني

✻ ✻ ✻



هه ر دا نه یك به ٤٠ فلسه

✻ ✻ ✻

رواندز له مه زرکه ی زاری کرمانجی دا مه زر ١٩٣٤

په رتي زاری کرمانجي ٢٠

# وینەگەری و کوپین

بە کردن و کوشین و دیتن

١٥ کانونی یکەم ١٩٣٤

بەناوی خودای بێ هەمتا

## مەبەس لەم کتێبە

مەبەست لە نوویسین و دانانی ئەم پەڕاویەیە، لە وەختی گەڕان و سووڕاندنەوەم بەدیاری بیانییاندا ورد دەبوومەوە، خۆمانی و بیانییانم دەکەوتە بەرچاو. بەدبەختانە خۆمانم لە سەنعەت و فەن پاشکەوتوو دەدی. پیشەی منیش چونکە مۆرکۆڵان بوو، لەسەر خۆم بەپێویست زانی فەنی کلێشە کۆڵین بەڕووناکی فێربم. بۆ ئەوە گەلێکم تەقەلا دا و کۆششم کرد کە دیارییێکی بۆ دیاریم دیار بێ وە دەستی خەم.

یێکەمین جار لە ئەستەمبوولَ لە لای ئەلَمانەکان بەهۆی کوردەکانەوە ڕێگای قیل و فۆتۆلیتۆغراف فێربووم. لە حیجاز و شام و حەلَەب بەو جۆرە کارم دەکرد؛ بەلاّم ناتەواوبوو. لە مەتبەعەی مارۆنیەی حەلەب لە لای مودیرەکەی -کە سەلیم مەتەر ئەفەندی بوو- کۆششم کرد و نزیک ٣٠ لیرە دراوم خەرج کرد و ڕێگای قیلم سەرخست.

بەهۆی چەند کوردێکی میسرەوە ئوستاز شەریف، ئوستازی بەیروت، نزیک ١٠٠ لیرە ئیستیفادەی لێ کردم. ڕێگای دووەمینی کۆلۆدیۆن و هەستی فێرکردم. بەوەش کار نەکەوتە پێش. لە بەیروت لە لای تاهیر تەنیر و لە شام لە لای حەناوی و لە میسر لە لای وەرشەنەی ئەلمیسریە و لە پاریس خاوەندی «دی پاریزیان» لەم فەننەدا پێیان گەیاندم و منیش بەزانین و تاقیکردنەوە، کردمە کتێب. بەبێ ئەزیەت شاگرد فێر ئەکا و بۆ میللەتەکەم بەکار دێ.

## پێشەنگ

### مێژووی پەیدابوونی زەنگۆغرافی

ئەو پیشەیە لە وێنە (فۆتۆگراف) جوێبۆتەوە و لە کردنا هەروەکو یەکترن. ئەو کەسەی ئەم دوو ئیشە بەکار و چاکەی پەیدا کرد و هێنایە ڕوو، پیاوێکی فەرەنگ ناوی «شاریل» لە فەرەنگسە و یەکێکی ئینگلیز ناوی داوود (داڤید) بوو. یێکەمین وێنەییێکی بەتیشکی ڕۆژ وەرگیرا ناویان نا «نیپسۆتیپ» کە دروستکەرەکەی ناوی «نیبس» بوو، لەبەرئەوە بەناوی ئەو پیاوەوە کرا. ینبس لەگەلَ شاریل بوون بەهاوالَ و ڕێککەوتن. یێکەمین وێنەیان لەسەر مسی سوور کێشا کە بە«قیل» بیتومیان ڕووکێش کردبوو. هەروەکو لە ڕێگای سێیەمدا دێتە گۆتن.

ئەو دوو پیاوانە زەمانێکی دوورودرێژ بەبێ سوود ڕەنجیان کێشاوە و خەریکبوون. لە ساڵی ١٨٢٩دا هەردوو لێک جوێبوونەوە؛ شاریل بەتەنها دەکۆشا و دەستی هەڵنەگرت، بەڵام داڤید لە ڕێگای قیل بەکاربردن دەستی بەردا و لەگەڵ ڕووکێشکردنی زیو لەسەر مس و تووتیا تەقەڵای دەدا و لە دوای پاککردنەوە و سواندنەوەی ئەو دوو مەعدەنە، بەزیو ڕووکێشی دەکردن و بەر دووکەڵی «یۆد»ی دەدان و لەوەوە یۆدووری زیوی دەستخست.

لە پاشان ئالەتێکی بۆ دروست کرد و ناوی نا «گەنجینەی تاریکی» و تیشکی ڕووناکی لەنێو خەتی وێنەدا دەبردە سەر پارچەکە و کۆی دەکردەوە. بەو تیشکە یۆد دەگۆڕا و لەسەر پارچەکە وێنەی پەیدا دەکرد و دەزبەجێ گەنجینەی دەردەخست و نیشان بەدووکەڵی جیوەی دەدا و وێنە زۆر بەچاکی دەردەکەوت و لە دواییدا دەیخستە نێو تواوەوەی «هیپۆکبریتیت سودایۆد» دەچوو وێنە ڕادەگیرا.

ساڵی ١٨٣٩ داڤید بەیاناتێکی لەو فەننە، دا بەکۆمەڵەی زانستی. نێوی ئەو فەننەیان بەناوی داڤید (داڤید یۆتیپ) کرد و دراوێکی قورسیان بۆ کۆمەگی داپێی و بەبەرزیان یارمەتی کرد. داڤید گەلێک ئەو فەننەی بەرز کرد و لە دنیادا بڵاوی کردەوە. بەڵام زۆر پێ نەچوو ئەو فەننە گەلێک گۆڕا و دەستیان لە مس و پارچە زیو بەردا و وێنەیان خستە سەر قاقەز و بە١٥ دەقیقە وێنەیان دەگرت و لە دواییدا بەچەند سانیە و هەتا گەیشتە حاڵێکی وا کە ئەمڕۆ تێیدایە.

یێکەمین کەسێکی وێنەی خستە سەر قاقەز «تالپۆ» ناو پیاوێکی ئینگلیز بوو. ئەو فەننەیان بەناوی ئەوەوە کردە «تالپۆتیپ» هەتاکو گەیشتە نیهایەتی تەرەقی.

## فێربوون و ئاگاداری

هێندێک چتی بەکار و پێویست هەنە کە بۆ پیاوی کارگەر بەیانکردنی لەوانەیە گەلێک سوودمەند بێت، لێرەدا ئاشکەرای دەکەم.

لەسەر پارچە زەنگ و مس وێنە هەڵقەندن لە زبانی فرەنگاندا بەپیشەی «زەنگۆگرافی» و لە زبانی عارەبی «حفرالفوتوغرافي» و بەکوردی «کۆڵانی بەتیشک» و لە فەننی ئەوروپاییدا «فۆتۆگراڤیۆر»ی پێ دەڵێن. هەرچێکو وێنە کۆڵان و وێنە وەرگرتن «فۆتۆگراف»ە و ئیشکردنی گران نییە و بەراوەژووی ئەمە زۆر شیرین و خۆش و پیشەیەکی گەلێک جوانە و هەتا لەو ئیشەدا کار بکرێ، شیرینتر دەبێ و لە دووبارەکردنی و تەجرەبەییدا ماندووبوون نادات. لە هەموو بزووتنێک و وردبینی و لێرامینێکیدا زانین

و تێگەیشتن فرە دەکا و زووتر بۆ پێشەوە بازدەدا و تێیدا سەردەکەوێ. لەبەرئەوە هەر تەماشاکردنی وردی و ناسکی نیشان ئەدا و خەیاڵ و فیکر دەپاڵێویت. بشەی وێنەبازی هێندە سوودمەند و بەکار و پڕ فایدە و جوان و خۆشەویست و شیرین و دڵبەرە، لە کارکردن و تێیدا تەقەلادانیا تێربوونی بۆ نییە و بەهیچ جۆرێ لێی ماندوو نابی و دەستت لێ بەر نابێ.

بۆ کارگەر وردبینی، چاوەدێری، ئیعتینای تەواو، سەبر، فیکرێکی فرەوان، تەماشاکردنێکی زۆر و ڕاوەستان، گەلێک پێویستە. دەبێ لە هەر کردەوەیەکدا سابیت و لە هەر کۆشەوەیەکدا وردبین و لە کاردا سست ڕەوش و توند فیکر و فراوان بیت. نابێ جڵەوی عەقڵ لە دەست بدا. کەوابوو کارگەر لە کۆشەوەیدا سەردەکەوێ و بەچاکی فێربوون وەپێش دەخا. هەرکەسێک دەست بەوێنەکۆڵین بکا دەبێ زۆر چاک فۆتۆگراف بزانێ؛ چونکە کۆڵانی بەتیشک و وێنەگەری (فۆتۆغرافی) زادەیەکن و لە ڕێگای وێنەگەرییەوە بۆ وێنە کۆڵان دەچێت و ئاڵەت و ماشینە و کردەوەیان وێکدەچێت و نزیکی یەکترن.

## چتی پێویست

هەر کەسێکی ئارەزووی پیشەی وێنەگەری و کۆڵانی بەتیشک بکا و بیەوێ و هەوەسکار بێت کە لەوەدا بگاتە دڵخوازی و ئیشوکاری ڕوو لە چاکبوون و فرەیی بکا، دەبێ ئەمانەی دەگوترێ ئامادە بکا:

بۆ جێگەی کار سێ خانوو و سێ ژووری دەوێ: ژوورێک بۆ دانیشتن و میوانداری، ژوورێکی دیکە بۆ کار و ئیش و ژوورێکیش تاریک.

ژووری کار دەبێ چەند ڕەفەییێکی هەبێ بۆ شووشە و تەرازوو و بۆ دەرمان و ئالەتی پێویست. تەرازوو، بەردی غرام، دەرمان کە پێویستە، پارچە تەختە بۆ کلێشە، مشارێکی تەنک و تیژ بۆ تەختە بڕینەوە. مشارێک بۆ پارچە زەنگ و مس، دوو تەختە مێز یەکێک بۆ شووشە و زەنگ و چوارچێوە و کاشی و ئاوەنگ، بۆ دەرمان کوتان و کلێشە. مێزی دووەم بۆ تەرازوو و دەرمانی گیراوەوە.

خانووی تاریک دەبێ ڕۆچنە و کونی تێدا نەبێ کە ڕووناکی بدا. دوو ڕۆچنەی بەتایبەتی تێی دەکرێ: یەکێک شووشەییێکی زەرد، دووەم شووشەییێکی سووری تێی دەگیرێ. زەردەکە بۆ هەست بەزەنگ دان و هی سوور بۆ دارێژتنی کۆلۆدیون و شووشتنەوەی شووشەی بەهەست.

لەنێو ژووری تاریکا دەبێ چەند شووشەیەک بۆ «بانیۆ» شووشتنەوە و بۆ هەستی دەرمان، لە ڕەنگی شین و سوور. ڕەحەتی شووشە بۆ پالاوتن (پارزاندن) تواوەوە و کاشی بۆ شووشتنەوە. پارچە شووشەی خاوێن و پاک بۆ دارژتنی کۆلۆدیون، کاشی و ئیستیکانی بەنمرە بۆ دەرمان پێوان، دوو سێ کاشی و گلاس و ڕەفەیەک لە پێش پەنجەرەی سوور و یەکێک لە بەردەمی پەنجەرەی زەرد دەبێ هەبێ، بۆ شووشەی دەرمانی تواوەوە و بۆ پارچە زەنگ و شووشەی کۆلۆدیون لەسەردانان و لە پشتەوەش دوو ڕەفەی دیکە پێویستە هەبێ کەچتومەکی وەکو شووشەی کۆلۆدیون و زەنگی بەهەستی لەسەر دادەنرێ.

لێرەدا هێندێک پێویستیمان نیشاندا کە بەبێ ئەوانە ئیشکردن زۆر بەدژوار دەبێ. بەلام جگە لەو چتومەکانە بەولاوە، پیشەگەر بەکردن تێدەگا کە چی دیکەشی دەوێ و دەتوانێ سازی کا. لە هەمووان پێویست و بەکارتر ماشینەی وێنەگر و دووربین (ئەبجەکتیف)ی زۆر چاک و باشە. ئەگەر ئەوانە چاک نەبن، ئیش خراپ و پووچ دەبێتەوە. لە ماشێنە و دووربینی چاک وردبینی حەلە و تاقیکردنەوە تێی دەگەیەنی کە بێ ئەوان نابێ.

## نیشاندان و وشیاری

پیشەی وێنەگرتن چتێکی وایە کە وێنەگەران بەکاربردنی هێندێک دەرمانی کیمیایی و ڕووناکی ڕۆژ، یاخود ڕووناکی کەهرەبا و ماشێنە و چوارچێوە وەرگرتنی وێنە دەخەنە دەست. نابێ لەبیر بکرێ کە وێنەگەری سێ کردەوە و زانستی گەرەکە کە بتوانێ ئیش بکات:

١- لە ماشێنەی وێنە (فۆتۆگراف)دا بەڕووناکییێکی زۆر وێنەگرتنی چتێکی خەیاڵی و کێشانی بۆ سەر لەتە مەعدەنێک.

٢- بەشووشتنەوە و ڕۆهێنانی ئەو وێنەیە کە لەنێو چوارچێوەی ماشینە دایە و خراوەتە سەر لەتە مەعدەنێک، دەبێ لە ژووری تاریکا و لە پێش ڕووناکی سوور ئەو لەتە هەست پێدراوە دەرهێنرێ و بخرێتە دەرماناوی دەرهیز (مظهر) تاکو بەراوەژوو ڕەشی بەسپی و سپی بەڕەش وێنەییێکی زۆر ڕوون و خاوێن پەیدا دەکرێ. لە دوای ئەو بەئاو دەشۆرێ و دەخرێتە ناو دەرماناوی ڕاگیر (مثبت). ئەو پارچە شووشە وێنەدارە بەزوبانی فەننی مەنفی وەیا سەلبی پێ دەلێن، دەشۆرێ و هەلدەگیرێ بۆ بەکاربردن.

٣- چاپکردنی ئەو پارچەیە لەسەر قاقەزوە یاخود لەسەر مەعدەن کە بەراوەژووی پێشی پەیدا دەبێ، ڕەش و سپی وەکو هەبوو.

## ماشێنه و دووربین

ماشێنەیەکی لە وێنەگرتن و کۆڵێندا بەکار دەبرێن وەکو یەکن؛ جگە لە ترام و مەنشوور و چوارچێوە نەبێ، هەموو ئالەت و چتومەکیان وێک دەچن، هەروەکو لە وێنەی ژمارە (١)دا دێتە بەرچاو. چوار چێوەی کولین لە هی وێنەی قووڵترو ئەستوورترە. ماشێنە لە دوو پارچە ڕێکخراوە و یەکیان بێ ئەویتریان نابێ. یێکەم فەنەرێکی تاریکە و هەر چوار لای گیراوە و ڕێگای ڕووناکی چوونە نێوی نییە ئەویش دوو چوارچێوەی دار و فەنەرێکی پارچەی ڕەشە و بەڕەنگی ڕەش نێوەکەی ڕەنگ کراوە.

١- وێنەی فەنەر و چوارچێوەی وێنەگر

دووەم دووربین (ئەبجەکتیف) ئەستوانەیێکی مسی زەردە و دوو پارچە شووشەی زەڕەبینی تێدایە. ئەو شووشانەش ئەستوور و پشتکووڕن و زۆر پاک و ڕووناک و

٢- ئیستوانەی دووربین

گەورەکەرن. یەکیان لەپێش ئەستوانەکەوە چەسپ کراوە و دووەمینیان لە نێوەڕاستدایە. دووربین گەلێک جۆری هەیە و بەهەمووان کار دەکرێت. بەڵام چاکتر و پڕ فایدەتریان (زایس)ە دووردبینەکانی دیکەش بۆ ئیش دەبن.

هەرچیکو ماشێنەیە زۆر جۆرە وێنەی هەن، لەم کتێبەدا ناوی ئەوانە یەک بەیەک بردن کاتەلۆکێک دروست دەکا. بەڵام ماشێنەی دەست بۆ وێنە وەرگرتن ئەم جۆرەیان کە لە ژمارە ٣دا دەکەوێتە بەرچاو، سووکتر و ئەرزانترە بۆ

٣-ماشینەی دەست بووینە

وێنەگرتنی زوویی و ماشێنەی کۆڵانی بەتیشک بەتایبەتی بۆ ئەو ئیشە دروست کراوە و لە نێوەوەی ئەو ماشێنەدا و لەبەردەمی شووشەی سەهۆڵاوییەدا جێگای تۆڕ (ترام - شبکە) هەیە. لە پێش دەمی دووربین مەنشوور

٤- ماشینەی وێنەگرتن بۆ کولاَن

گرێ دەدرێ، لە کیلەکەی دەستەڕاستیا و لە نزیک شووشەی سەهۆلاَوی دوو پشک بەمیلیمەتری پێوەیە تاکو بەو دوو پشکە تۆڕەکە لەنێویدا بێت و بچێت، ئەویش بۆ وێنەی بەسێبەر دەبێ. ئەو ماشێنەش لەسەر تەختەمێزێکی درێژ و چوارپێدا دەبەسترێ تاکو لە کارکردنا نەجوولێتەوە و شووشەی کۆلۆدیون تێکنەدا و خراپی نەکا.

## پریزم - مەنشوور

٥- پریزم - سیە گوشە

سێگۆشە کە کارگەرەکانی فەڕەنگ بەپریزم و میسرییەکان بەمەنشووری ناو دەبەن، بۆ وێنەی سێبەرداری بەکار دەبەن و لەبەردەمی دووربین گرێ دەدەن. ئەویش لە تەختەوە یاخود لە مەعدەن بەسێگۆشە دروستکراوە و شووشەیێکی دووربینی بەئاوێنە تێدا چەسپ کراوە بۆ وەرگەڕانی وێنە.

بەکاربردنی ئەو ئالەتە ناچاریە؛ چونکە ئەگەر پریزم نەخاتە بەر دووربین وێنە بەراوەژوو دەکەوێتە سەر کۆلۆدیون و لەوێوە بەڕاستەقانی دەهاوێژرێتە سەر زەنگ. لە چاپکردنی زەنگا وێنەکە بەراوەژوو دەبێ و ڕاستی چەپ و چەپی ڕاست چاپ دەکرێ. ئەگەر پریزم بەکار نەبرێ بەناچاری دەبێ لە دوای وێنەگرتن کۆلۆدیون وەرگەڕێندرێ و ئەوەش دەبێ زانا بێ.

## تۆڕ - ترام

تۆڕ وەکو هێلَەگ وایە، بۆ ڕاگرتنی سێبەری وێنە دەهاوێژرێتە سەر کۆلۆدیون تاکو سێبەر و ڕووناکییێکی کە لەسەر وێنەکەیە بەخێو بکرێ. ئەگەر ئەو تۆڕە نەبێ نەزاکەتی وێنە دیار نابێ، وردە بابەتی جوان ناکەوێتە پێش چاو.

زانا و کارگەرە خاوەند هەوەس و وردبینەکانی ئەم پیشەیە، گەلێک کۆشاون و تەقەلایان داوە کە بەبێ ترام وێنە بکۆلَن نەشیاون. ئەگەر دەستیشیان خستبێت و لە بری ترام وردە جغز و دێریشیان کێشا بێ، نەگەیشتوونەتە ئارەزوویێکی وا کە لە ترامیان

دەسکەوتووە. تۆڕ لە سێ چت دروست دەکرێ:

١- لە ئاوریشم کە بەکشتی تەنرابێ.

٢- لە تێل کە باریک و وردە و وەکو بێژینگ تەنرابێ.

٣- لەسەر شووشە ڕاست و چەپ خەت دەکێشرێ و دەخرێتە سەریەک و لە نێوانی دوو خەتا نوختەیێکی چوارگۆشە پەیدا دەکرێ. بەڵام چاکتریان شووشەیە، ئەویش لە ئەوروپا بەدروستکراوی ئەفرۆشرێ.

تۆڕ لە ماشێنەکەدا کە لە پشت شووشە سەهۆڵییەوە لێی ورد دەبی، لە دووربینەوە بەتێپەڕینی ڕووناکی بەسەر ئەو خەتانەدا لە ڕووی وێنە یا نوقتەی ڕەنگاوڕەنگ دەبینرێ. ڕووناکی لە لەت و نێوانی نوقتەوە بەجێگای باریک و ئەستوورا پەرش دەبێ و چلۆنی وێنە دەخاتە سەر کۆلۆدیون.

## دووری و نزیکی نێوانی شووشەی وێنەگر و تۆڕ

| ژمارەی جغز | | دووری تۆڕ لە شووشە |
|---|---|---|
| | هەر پۆستەیەک کە بۆ چاپی وێنە | |
| ٢٥ | لە ڕۆژناماندا بەکار بێ | ١٠ ملیم |
| ٤٠ | بۆ ئیعلاناتی گەورە | ٧ ملیم |
| ٣٠ | لەسەر قاقەزی گڕنی | ٨ ملیم |
| ٤٨ | بۆ ئیعلاناتی زۆر گەورە | ٣,٥ ملیم |
| ٤٥ | لەسەر قاقەزی نیمچە | ٥ ملیم |
| ٦٠ | لەسەر قاقەزی لووسی چاک | ٥ ملیم |
| ٧٠ | لەسەر قاقەزی ورد و سواوەی نازک | ٢ ملیم |
| ٨٠ | لەسەر قاقەزی زۆر لووس | ١ ملیم |

## لە پێش دەست بەکارکردن

هەرکەسێک لە وێنەگرتن و لە پیشەی وێنەگەریدا تەقەلا بدات و کۆشەوە بکات، دەبێ چوار چت بزانێ و لەبیر نەکات و بەپێی ئەو چوار چتانە بەڕێوە بڕوات؛ بۆ ئەمە کە دووچار بەڕاوەستان نەبێ و بیکاتە دەستوور:

١- دووری و نزیکی ترام چاککردن و نوختەکانی دیتن و زانینی.

٢- دیافراگم کردنەوە و زانینی هێز و تەواناى دووربین.

٣- چەندی ڕووناکی نیشاندان و هێز و تینی هەتاو و جێگا زانین.

٦- دیافواگم و بووربین

٤- دەم و چاخ و وەزعیەت و زەمان تەعیینکردن، بۆ ئەوە کە بگەیژرێتە شووشەی وێنەگر و بەچاکی وێنە لەسەر شووشەی کۆلۆدیون بەجوانی وەربگیرێت، دەبێ سێ دیافراگم بەکار ببات هەروەکو لە وێنەی ٦دا دێتە بەرچاو.

هی چکۆلەترین کە کونەکەی لە دوانەکەی دیکە بچووکترە، موددەتی ڕووناکی نیشاندان، یێکەمین جار لەسەر قاقەزی سپی بێت نەک لەسەر وێنە. دیافراگمی دووەم کە لەوی بچووکتر، گەورەترە، بۆ پەیداکردنی وردەیی وێنەیە لە نێوەڕاستا. موددەتی نیشاندان بەو دیافراگمە دەبێ لەسەر وێنە بێ نەک لەسەر قاقەز. بەراوەژووی دیافراگمی یێکەمین، هی سێیەم کە کونەکەی لە هەردووکان گەورەترە. ئەویش بۆ پوختە گەورەکانی وێنەیە تاکو لەسەر سپی و ڕەش پێکەوە بچەسپن و لەتەک یێکا ڕێککەون.

ئەوانەی لە سەرەوە گوتران ئاسان و نەرمی دەداتە ئەو ئیشوکارانەی کە بگاتە چتێکی لێت خۆش بێت و پێی دڵشاد و هەوەسناک بی.

دووری ترام کە گەورە بێت، نوختە لەسەر جێگای ڕەش، زۆر بچووک و ورد دەبێ و لەسەر سپی بەچاکی ڕێک دەکەوێ و دەکەوێتە سەر یەکتر و پێکەوە دەچەسپی و لەحیم دەبێ.

موددەتی نیشاندان بەدیافراگمی یێکەمین کە کەم بێت، نوختە لەسەر جێگای ڕەش گەلێک ورد دەبێ و موددەتی نیشاندان بەدیافراگمی کون گەورە لە هی یەکەم دوورودرێژتر دەبێ و نوختە لەسەر ڕەش گەورەتر دەبێ.

ئەگەر ئەو تۆڕەی کە بەدەستمانەوەیە کاری پێ دەکەین ورد بێت و جغزەکانی باریک و نوختەکانی زۆر بچووک بێت و مەسافە کورت و نیشاندان دەبێت ئەگەر وێنەی ڕەنگاو ڕەنگمان پێ بێت و سێبەردار بێ، دەبێ مەسافە کورت و نیشاندان درێژ بێ.

ئەگەر وێنە نازک نەبێ و وردی و جوانی تێدا نەبێ، مەسافە گەورە و نیشاندان دەبێ

کورت بێت. بۆ نیشاندانی یێکەم دەبێ دیافراگم ١٧ فوگاس، بۆ نیشاندانی ٢ دیافراگم ٢٥ فوگاس، بۆ نیشاندانی ٣ دیافراگم ١٨ فوگاس.

## وێنەی ئاشکەرا وەرگرتن بەکۆلۆدیون

ئەگەر شووشەیێکی سەلبی چکۆلە لە وێنەیێکی ئیجابی گەورەتر وەیاخود ئەوەندەی خۆی وەرگیرێ، ئەم ڕێگایە دەگیرێ:

دوو پشکی تۆڕ ٣ ملیمتر دیافراگم ١٧ نیشاندانی ١ لەسەر قاقەز ٢٥ سانیە.

دوو پشکی تۆڕ ٣ملیمتر دیافراگم ٢٥ نیشاندانی ٢ لەسەر وێنە ٧٠ سانیە.

دوو پشکی تۆڕ ٣ملیمتر دیافراگم ١٨ نیشاندانی ٣ لەسەر وێنە ٣٠ سانیە.

## وەرگرتنی نیو ئەوەندەی وێنەکە هەیە

دوو پشکی ٢ و چارەگ دیافراگم ١٧ نیشاندانی ١ لەسەر قاقەز ٢ سانیە.

دوو پشکی ٢ و چارەگ دیافراگم ٢٥ نیشاندانی ٢ لەسەر وێنە ٣٥ سانیە.

دوو پشکی ٢ و چارەگ دیافراگم ١٨ نیشاندانی ٣ لەسەر وێنە ٢٥ سانیە.

## وێنەگرتنی سێ بەشی ئەوەندەی کە هەیە

دوو پشک ٢ و نیو دیافراگم ١٧ نیشاندانی ١ لەسەر قاقەز ٢٠ سانیە.

دوو پشک ٢ و نیو دیافراگم ٢٥ نیشاندانی ٢ لەسەر وێنە ٥٠ سانیە.

دوو پشک ٢ و نیو دیافراگم ١٨ نیشاندانی ٣ لەسەر وێنە ١٥ سانیە.

## وەرگرتنی وێنە بەشووشەی فۆتۆمیکانیک

ئەگەر قاقەز زەرد بێ وەکو هەیە وەردەگیرێ دەبێ دەستووری هاتوو بێ:

دووپشک ٣ دیافراگم ٢٥ نیشاندانی ١ لەسەر وێنە ١٢٠ سانیە.

دووپشک ٣ دیافراگم ١٨ نیشاندانی ٢ لەسەر وێنە ٦٠ سانیە.

بۆ ئەو کارە دووری تۆڕ و مودەتی زۆر نیشاندان و درێژەپێدانی، لەبەر مەوادی هاتووە:

١- هەرچیکو دووری تۆڕە چوارگۆشەکان گەورە دەکا لەسەر ڕەشی تاکو بۆ وەرگرتنی لە چاپکردنا سپی بێت.

٢- چونکە وێنەکە زەردبووبێ، دەبێ شووشەکە ڕووناکی زۆر ببینێ.

٣- بۆ ئەوە کە نوختەی ڕەش لەسەر نوسینی سپی دەرکەوێ، دیافراگم بچووک دەکرێ و نیشاندانی نیگاتیف لەسەر قاقەزی سپی دەدرێ.

## وەرگرتنی وێنەی ناوەنجی هەروەکو هەییتی

دوو پشک ٣ دیافراگم ١٧ نیشاندانی یێکەم ١٥ سانیە لەسەر قاقەز.

دوو پشک ٣ دیافراگم ٢٥ نیشاندانی دووەم ١٣٠ سانیە لەسەر وێنە.

دوو پشک ٣ دیافراگم ١٨ نیشاندانی سێیەم ١٣٠ سانیە لەسەر وێنە.

## وەرگرتنی وێنەی نویسراو

وێنەی نوسین و وەرگرتنی نویسراو وەکو وێنەی بە سێبەر نییە؛ بەڵام لە وەرگرتنا ترام بەکار نابرێ. بۆ کاری بچووک و نویسراوی ورد یاخود نیگاتیف، دیافراگم نزیک سانتیمەترێک دەکرێتەوە و مودەتی نیشاندانی بەڕووناکی ٥٥ سانیەیە و بۆ کلێشەی بچووک، دیافراگم سانتیمەتر و نیوێک دەکرێتەوە و مودەتی نیشاندانی ٣٠ سانیەیە.

چەند جۆر نویسراوێک بەمەرەکەبی ڕەش لەسەر قاقەزی سپی وەکو یێک بچووک وەرگیرێ. نیشاندان ٥٠ سانیە و دیافراگم یەک سانتیمەتر و نیو دەکرێتەوە.

## ڕێگای نێگاتیف بەشووشەی فۆتۆمیکانیک

لەسەر قاقەزی زەرد ئەوەندەی کە هەیە وەربگیرێ، دیافراگم سانتیمەترێک و مودەتی نیشاندان بەڕووناکی ٧٠ سانیە، نوسین هەرچەندە گەورەتر بێت، مودەتی نیشاندان هێندە زیاتر دەبێ و ئەگەر بچووک بێت، بەراوەژوو دەبێ.

## دووری و نزیکی ترام لە ماشێنەدا

وێنە لە بەرامبەر دووربین ڕادەگیرێت، لەپشت ماشێنەوە جەڕووپێچی تۆڕ دێت و دەچێت، هەتا زۆر چاک نوقتەی ترام وردە بابەتی وێنە ئاشکەرا بێت دەکەوێتە بەرچاو و بەخاوێنی دەبینرێ.

## ماڵین و پاککردنەوەی ترام

خاوێنکردنەوەی ترام زۆر پێویستە؛ ئەویش بەدوو پارچە دێتە دەست: یەکەم بەپارچەیەکی ئاوریشم؛ دووەم بەپێستی نەرم کە بەئەلکول تەڕ دەکرێ. بەئاوریشم کە دەماڵدرێ بەپێستیش خاوێن دەکرێتەوە و لە پاش خاوێنکردنەوەی ترام دەخرێتە جێگای خۆی کە لە

ماشێنەدا و لە نزیک شووشەی سەهۆڵاوییەوە جێگای بەتایبەتی هەیە؛ هەروەکو گوترا. چونکە شووشەی ترام دوو پارچەی پێکەوە چەسپاوە و دەبێ ئاگاداری بکرێ کە ئەلکول وە جەمسەری نەکەوێ دەنا لێک دەبێتەوە.

## وەرگرتنی نویسین و نەقشە

مودەتی ڕووناکی نیشاندان لەسەر دەستووری هات و ڕۆیشتن چاوەدێریکردنی ئەوە نویسراو و نەقشەی جوان وەردەگیرێ:

نیو هێندەی کە هەیە دیافراگم ٥ ڕووناکی ١٠سانیە.

سێ تەقسیم چواری کە هەیە دیافراگم ٢٥ ڕووناکی ١٥ سانیە.

دوو تەقسیم سێی کە هەیە دیافراگم ٢٥ ڕووناکی ١٣ سانیە.

یێک تەقسیم چواری کە هەیە دیافراگم ٢٥ ڕووناکی ٥ سانیە.

لەسەر هەرچۆنێکی کە هەیە دیافراگم ٢٥ ڕووناکی ٢٠ سانیە.

ئەو دەستووورە زۆر چاک و ڕاستە، بەڵام دەبێ هێزی تواوەوەی زیو و تەوانایی و توندی دووربین بزاندرێ و لە دواییدا بەپێی ئەوە ڕەفتار بکرێ.

## تەماشاکردن و لێوردبوونەوە

ئەوانەی وێنەگرن و بەکۆلۆدیون کار دەکەن، تووشی گەلێک چتی وا دەبن کە دەبێتە مایەی نیگەرانی. بۆ مەیدان بەوە نەدان و تێگەیشتن، چەند مادەی خوارەوە عەرز دەکرێن:

١- لە وەختێ کە کۆلۆدیون دەردەخرێ، ئەگەر لۆچ وگنجی لێ پەیدابوو، ئەوە نیشانەی ئەوەیە کە چاک نەپالاوتراوە و خاوێن نییە.

٢- ئەگەر شووشەی کۆلۆدیون ڕەش هەڵگەڕاوە یا کەناری لە شووشتنەوەی یێکەما ڕەش بوو، ئەوە نیشانەیە کە کۆلۆدیون لەپێش خستنەوە نێو زیواوەوە وشک بۆتەوە.

٣- شووشە لە دوای هەستپێدان، ئەگەر بێت و دەقیقەیەک بیهێڵێتەوە بەکاری ئیش نایەت و دەبێ دووبارە بکرێت.

٤- لەسەر کۆلۆدیون تنۆک پەیدابوون لە دوای دەرکەوتن شووشە پاک نەکراوەتەوە.

٥- مایەی زەردبوونی شووشە ئەوەیە لە دوای شووشتنەوە و لە دەرکەوتن چاک نەشۆراوەتەوە و دەرمانی لەسەر ماوە.

٦- شووشەی بەترام ئەگەر دیترا هێندێک جێگای لە هێندێکی ڕووناکترە، لەبەرئەوە بووە

که شووشه بەڕاستی و چاکی نەخراوەتە نێو چوارچێوەوە.

٧- ئەگەر چوارچێوە بەئەسپایی نەبزێورێ و لەسەرخۆ نەبرێتە لای ماشێنی کۆلۆدیونەکە، تەڕە و دەهەژێ یا بەردەبێتەوە یا دەژاکێ و ئیش خراپ دەبێ.

٨- تنۆکەی دەرمانێک بکەوێتە سەر یێکێکی تر لە کار دەکەوێ و ئیشی پێ ناکرێت.

٩- وێنەگر بەتواوەوەی دارژان دەستی ڕەش دەبێ، بەهێندێک سیانۆری پۆتاسی بشوات ڕەشی دەبات.

١٠- دەبێ هەموو جارێ ترام بەچاکی بماڵدرێ و خاوێن بکرێتەوە، تاکو وێنە پەردەو تنۆکە پەیدا نەکات.

١١- ئەگەر کون و تنۆکە لەسەر کۆلۆدیون پەیدا بێ، ئەوە لە وەختی کارکردنا تنۆکەی کۆلۆدیون کەوتۆتە نێو زیواوەوە.

١٢- لە زیواو (مەحلوولی نیترات دارژان)دا ئەگەر زەردی وەیا ڕەنگ گۆڕانێک پەیدابوو، گیراوەوەی هاتووی بۆ سازکە:

یۆدوری چاک ١ غرام.

ئیسپرتۆی دەرەجە ٩٦ - ١٠٠ غرام.

لەو گیراوەوە دوازدە تنۆک دەکرێتە نێو هەزار سانتیمەتر موکەعەب. «گرد»ەوە و دوو ڕۆژ لەبەر هەتاو دادەندرێ و بەقاقەزی مژۆک دەپالێورێ و بەچاکی ڕەنگی دێتەوە سەرخۆی.

٧- رەحەتی بۆ پالاوتنی تواوە

## وێنە وەرگرتن بۆ زەنگوغرافی

وەرگرتنی وێنە بۆ کولانی بەتیشک دوو ڕێگای هەیە: یێکێک بەشووشەی وشک (فۆتۆمیکانیک): دووەم بەکۆلۆدیونی تەڕ.

بۆ پیشەی وێنەکۆلین، کۆلۆدیونی تەڕ لە فۆتۆمیکانیک چاکترە و هەرچۆنێکی وێنە هەیە دەردەکەوێ. ڕەشی بەچاکی ڕەش و سپی بەجوانی سپی و زۆر خاوێن و ڕووناکە. هەموو پیشەگەرەکانی وێنەکۆلین، کۆلۆدیون بەدەستی خۆیان ساز دەکەن و لەسەر شووشەی دادەڕێژن و نایەلن وشک بێتەوە و بەتەڕی وێنەی پێ دەگرن. لە دەرهێنان و ڕاگرتنا دەیشۆنەوە و کۆمەگی و هێزی پێ دەدەن هەروەکو دێتە گوتن.

جا کەوابوو هەموو دەمێک دەبێ شووشەی پاک وخاوێن هەڵگری کە پێویست بەکاری بەریت. ئەو شووشەی لە پێشدا بەئاو و لە دواییدا بەتواوەوەی هاتوو پاک دەکرێ.

ئاو ١٠٠ غرام. سانتیمتر گرد. هێدراتی سۆدیۆم (١٥) غرام.

شووشە چەندێک لەنێو ئەو دەرمانەدا دەمێنێ و خاوێن دەکرێتەوە و لە پاشان دەخرێتە نێو ئەم دەرمانەوە:

ئیسپرتۆ ٥٠٠ سانتیمر گرد.

یۆدی مەعدەنی ١ غرام.

لە دوای ئەوە شووشەکە بەپارچەیەک جاو دەماڵدرێ و زۆر جوان خاوێن دەکرێتەوە و بەدەسماڵێک وشک دەکرێ و ئەم دەرمانەی خوارەوەیی لە هەر چوار کەناری دەدرێت:

جیر (لاستیک)ی خاو ٥٠ غرام.

کلۆرفۆرم ٤٥٠ غرام.

بەنزین ١٠٠ غرام.

ئەوەی بووییە کە ئەوەندەی قەیتانێک لە کەنار بدرێ تاکو کۆلۆدیون نەڕژێتە خوارەوە و نەژاکێت و لۆچی پەیدا نەبێ.

ئەگەر ئەوانەی لە سەرەوە بێژران بۆ شووشە خاوێنکردنەوە بەکارنەبران، دەرمانی هاتوو دەبێ بەکار ببرێ؛ چونکو دەبێ لەپێش هەموو کارێکدا شووشەی خاوێن هەبێ تاکو بتواندرێ وێنە بخرێتە سەر کۆلۆدیون؛ تاکو بۆ خستنە سەر چینکۆ ساز بێ. بۆ ئەوەی شووشە خاوێن بێ، شەش سەعات لەنێو ئەم دەرمانە دەخرێ: بیکرۆماتی پۆتاسیۆم ٢٠٠ غرام، ئاوی تەنها ٢٥٠ سانتیم گرد، ئەسید نەتریک ٥٠ سانتیم گرد. ئەوەش بەپێی ئیش، کەم یا زیاد دەکرێ.

شووشەکە شەش سەعات لەو دەرمانەدا ماوە دەردەخرێ و لەنێو ئاوی خاوێنا دەشۆردرێتەوە و بەپارچە پەڕۆیێکی پاک دەماڵدرێ و بەدەسماڵێکی بەئیسپرتۆ تەڕکراو خاوێن دەکرێت و تۆز و تەڕایی لەسەر لادەبرێ و هەڵدەگیرێ، هەتا پێویست دەبێ. ئەودەمەش دووبارە بەدەستماڵ دەماڵدرێ و بۆ بەکاربردن ئامادە دەکرێ.

## دروستکردنی لۆکەی بارووی (کۆتۆن ئۆزۆتیک)

ڕێگای دروستکردنی لۆکەی باررووتی، سازکردنی دەرمانی هاتووە:

ئەسید کبریتیکی پاک و بێ دووکەڵ ٣٠ غرام.

نەتەراتی پۆتاسی وشک و ورد کوتراو ٢ غرام.

ئەم دوو دەرمانە لەنێو کاشی شووشە، یان چینیدا دادەنرێ و لۆکەی خاوێنی بێ چڵک کەم کەمە دەهاوێژرێتە ناویەوە، هەتا هەمووی تەڕ دەبێ و نزیک هەشت دەقیقە لێی دەگەڕێی؛ لە پاش ئەوە بەشولکە شووشە دەردەخرێ و لۆکەکە دەخرێتە نێو کاشیێکی دیکەوە و بەئاوی دووبارە زۆر چاک دەشۆردرێ، هەتا بۆنی ئەسید و نەتراتی پێوە نەمینێ. ئەوجا بەقاقەزی مژۆک وشک دەکرێتەوە و دوو سێ جار قاقەزەکەی لێ دەگۆڕدرێ و بۆ پێویستی هەڵدەگیرێ. دەبێ زۆر چاک لە دروستکردنیا وشیار بیت و لە پێشدا ئەسید لە دوایی نەترات. لە پاش زەمانێک لۆکەی تێهەڵدەکێشرێ.

## ڕێکخستنی کۆلۆدیونی یەکەمین

دروستکردنی کۆلۆدیون گەلێک تەرزە؛ هەر وێنەگەرێک بۆ خۆی ڕێگاییێکی گرتووە. بەڵام ئێمە لەم کتێبەدا هەر کامێکی پێویست و چاک بێ و بۆ خۆم لە کاردا باوەڕم پێ هێنابێ و لە تاقیکردنەوەدا بۆم ڕێککەوتبێ، لێیان دەدوێم و باسی دەکەم.

### ١- کۆلۆدیون کۆداکس

ئیسپرتۆی دەرەجە ١٠٠ و ٤٠٠ سانتیم گرد.

ئەتیر کبریتیک دەرەجە ٦٢ و ٦٢ غرام.

لۆکەی باروودی ١٢ غرام.

### ٢- دروستکردنی یێکەم لیکۆرسن سیبل

ئەلکول دەرەجە ٩٦ - ١٠٠٠ سانتیم گرد.

یۆدور ئامۆنیۆم ١٠٠ غرام.

یۆدۆر کادمیۆم ١٠٠ غرام.

کلۆرۆر سترانتیۆم ٢٠ غرام.

پرۆمۆر کادمیۆم ١٠ غرام.

**٣- ئەوەی سەرەوە ساز دەکرێ و بەهی هاتووش ئیش دەکرێ**

کۆلۆدیون کۆداکس ٦٥٠ سانتیمەتر گرد.

لیکۆرسن سیبل ٥٠ سانتیمەتر گرد.

یۆدی مەعدەنی ٠,٥ غرام.

## کۆلۆدیونی مژراو

بۆ ئەو وێنەیانەی کە لەسەر قاقەزی ڕەنگاوڕەنگ کێشراون هەتاکو جوان بخرێتە سەر چینکۆ، دەبێ ئەم کۆلۆدیونە بەکارببرێ.

تواوەی یێکەم کۆلۆدیۆنی ڕۆژ:

ئایەئۆزین ٠,٥ غرام.

ئەلکول دەرەجە ٩٦ - ١٨٠ سانتیمەتر گرد.

تواوەی دووەم:

پرۆمۆر کادمیۆم ١٢ غرام.

ئەلکول دەرەجە ٩٦ - ٣٠٠ سانتیمەتر گرد.

تواوەی سێیەمیش:

لە قسمی ٣ کۆلۆدیون هەزار تەقسیم پازدە ٧٥ سانتیمەتر گرد.

لە قسمی ١ لە تواوەی دووەم ٢٥ سانتیمەتر گرد.

لە سەد سانتیمەتر گرد قسمی ٣ و لە مەحلوولی سێیەم یەک و لە تواوەی یێکەم پێنج تێکەڵ دەکرێ.

## ئاوی زیو بۆ کۆلۆدیون لیکۆرسن سیبل

ئاوی دووبارە ١٠٠ سانتیمەتر گرد.

نەتەراتی دارژان ٨ غرام.

سۆلۆدیون ئیدۆر پۆتاسیۆم سێ و لەسەدا ، ١٠ سانتیمەتر گرد.

ئەسیدی نەتریک ٤٠ ف ٤ تنۆک.

تواوەی زیو دوو ڕۆژ لەبەر هەتاو دادەندرێ و لە دواییدا دەپاڵێورێ و بە ١٥ دەقیقە شووشە هەست دەکا.

## ئاوی زیو بۆ کۆلۆدیونی مژراو

ئاوی دووباره ۱۰۰ سانتیمەتر گرد.

نەتەراتی زیو۲۰ غرام.

بۆ ئەمەی پەلە پەیدا نەکات دەهاوێژرێتە هی هاتووەوە:

ئاوی پاڵاوتووی دووباره۱۰۰ سانتیمەتر گرد.

نەتەراتی زیو ٥ غرام.

## هینەر

ئاوی پاک۱۰۰ سانتیمەتر گرد.

سلفاتی ئاسن (قەرەزاخ) ٦۰ غرام.

سلفاتی مس مۆرووەشینە ۱۰ غرام.

ئەسیدی ئەستیک (سرکەی دووباره) ۳۰ سانتیمەتر گرد.

ئەلکول ٤۰ سانتیمەتر گرد.

## ڕاگر

هیپۆسلفیت دیسود ۳۰ غرام.

بیی سلفیت دیسود ۱۰ غرام.

ئاوی خاوێن ۱۰۰ سانتیمەتر گرد.

له دوای هینەر بەئاوی خاوێن دەشۆردرێ و دەخرێتە نێو ڕاگرەوە و له پاش ئەویش زۆرچاک بەئاو خاوێن دەکرێ. ئەو شووشەیە کە تەماشا کرا وێنەکەی زۆر چاکە وردە بابەتەکانی هەموو دیاره، بەم گیراوەیە پشتیوانی دەکرێ:

## پشتیوانی زەردکەر

فیری سیانور دی پۆتاسی سوور ٦۰ غرام.

ئاوی پاڵاوتوو ۱۰۰ سانتیمەتر گرد.

ئەسید ئەستیک ٥۰ سانتیمەتر گرد.

نەتراتی قورقوشم ٦۰ سانتیمەتر گرد.

## ڕەشکەر

ئاوی پاڵاوتوو ۱۰۰۰ سانتیمەتر گرد.

ئەسید نەتریک ۳۰۰ سانتیمەتر گرد.

لە پێش شووشتنەوە بەئاو پێداکردن دەخرێتە نێو تواوەوەی هاتوو تاکو زۆر چاک ڕەش بێ و وردەی ئاشکەرا بێ.

مۆنۆسلفیت دی سۆدیۆم ۱۰ غرام.

ئاوی پاڵاوتوو ۱۰۰ غرام.

شووشەی کۆلۆدیون کە ئەو هەموو کۆشەوەی لەگەڵ کرا دەخرێتە نێو ئاوێکی ساردەوە و زۆر چاک لە دەرمانانی بەسەری داهاتووە، خاوێن دەکرێت و بەتواوەوەی سمغی عەرەبی کۆلۆدیونەکە لەسەر شووشە ڕادەگیرێ و بۆ خستنە سەر چینکۆ ئامادە دەکرێت.

## ڕێکخستنی کۆلۆدیونی دووەمین و تواوەوەی یێکەم

یودۆر کادمیوم ۲۰ غرام.

ناتریۆم سۆدیۆم ۱۲,۵ غرام.

پرۆمۆر کادمیۆم ۱۷,۵ غرام.

یۆدۆر پۆتاسیۆم ۵ غرام.

ئیسپرتۆی دووبارەی دەرەجە ۹٦ - ۲۲۵ سانتیمەتر گرد.

## تواوەی دووەم

لە تواوەی یەکەم ۳۰۰ سانتیمەتر گرد.

کۆلۆدیونی نیسبەت بیستی تەقسیم سەد ۱۰۰۰ سانتیمەتر گرد.

## ئاوی زیو بۆ ئەو کۆلۆدیونە

ئاوی دووبارە ۱۰۰ سانتیمەتر گرد.

نەتراتی زیو ۱۰ غرام. لەبەر هەتاو دادەندرێت هەتا دەترشێ و دەپاڵێورێت.

## هێنەر

سلفاتی ئاسن ٥٠ غرام

سلفاتی مس ٤٠ غرام.
ئاوی خاوێن ١٥٠٠ سانتیمەتر گرد.
ئەسید ئەستیک ٢٥ سانتیمەتر گرد.
ئیسپرتۆ ٣١٠ سانتیمەتر گرد.

## ڕاگر

سیانۆر پۆتاسیۆم ٤٥ غرام.
ئاوی پاڵاوتوو ٥٠٠ سانتیمەتر گرد.
١- زەردەکەری یێکەم:
سلفاتی مس ١٠٠ غرام.
پرۆمۆرپۆتاس ٩٠ غرام.
ئاوی خاوێن ٢٠٠٠ سانتیمەتر گرد.
٢- ڕەشکەری یێکەم:
نەتەراتی زیو ٥٠ غرام.
ئاوی دووبارە ١٠٠٠ سانتیمەتر گرد.
لە پێشدا دەخرێتە نێو زەردەکەوە و دەشۆردرێتەوە و دەخرێتە سەر سێپا هەتا پاک دەبێتەوە. لە دوای ئەوە دەخرێتە نێو تواوەوەی ٢ و ئەو تواوەوەی بەسەردا دەکرێ هەتاکو ڕەش دەبێ و بەئاو پاک و خاوێن دەشۆردرێ و دەخرێتە نێو تواوەوەی هاتوو.
٣- زەردکەری دووەم:
یۆدی مەعدەنی ٢٥ غرام.
یۆدۆر پۆتاسیۆم ٢٥ غرام.
ئاوی پاڵاوتوو ١٠٠٠ سانتیمەتر گرد.
بەو تواوەوە کە زەرد کرا بەئاو دەشۆرێتەوە و بەتواوەوەی هاتووی ڕەش دەکەن.
٤- ڕەشکەری دووەم:
سلفۆردی سۆدیۆم ١٠ غرام.
ئاوی پاک ٣٠٠ غرام.

شووشەی کۆلۆدیون کە بەو تواوانە کە هێنەر و ڕاگر و ڕەشکەر و زەردکەری یەکەم و دووەم تەواوبوو، لە ڕەشکەری دووەم کە دەرخرا، لە دوای شووشتنەوە بەئاو دەخرێتە نێو ئەم دەرمانە کە لە خوارەوەیە:

ئەسید کلۆرهێدریک ١٠ سانتیمەتر گرد.

ئاوی دووبارە مقطر ١٠٠ سانتیمەتر گرد.

## ڕێکخستنی کۆلۆدیونی سێیەمین

یۆدۆر ئامۆنیۆم ٥ قمحە.

پرۆمۆر ئامۆنیۆم ٦ قمحە.

ۆدۆر کادمیوم ٥ قمحە.

یۆدی مەعدەنی ٠,٥ قمحە.

ئەوانە لەنێو ئاوەنگدا زۆر چاک دەکوترێن و لە پاشان ئەم دوو دەرمانەشی تێ دەکرێ:

ئیسپرتۆی دەرەجە ٩٦ - ٥٠ سانتیمەتر گرد.

کۆلۆدیون ١٠٠ سانتیمەتر گرد.

کە ئەوانە کوتران ئیسپرتۆی تێ دەکرێ و دەکرێتە نێو شووشەیێکی دەم توند و لە پاشان کۆلۆدیونی دەکرێتە سەرێ.

## ئاوی زیو بۆ ئەو کۆلۆدیونە

نەتراتی زیو ٣٣ غرام.

ئاوی دووبارە ٣٠٠سانتیمەتر گرد.

ئەسید ئەستیک ٥ سانتیمەتر گرد.

ئەوانە کە تێکەڵ کران دوو ڕۆژ لەسەر یەک لەبەر هەتاو دادەندرێ، هەتا بەتەواوی دەترشێت و لە دواییدا دەپاڵاوترێ و دەکرێتە نێو کاشیێکی شووشەوە. شووشەی کە کۆلۆدیونی لەسەرە دەخرێتە نێو ئەو زیواوەوە، بەڵام بەشەرتێ بەیەکجاری بخرێتە ناویەوە و بەپارچەیەکی ڕەش سەری دادەپۆشرێ و چوار دەقیقە لێی دەگەڕێیت. لە دواییدا ئەوە دەردەخرێ و دەخرێتە نێو چوارچێوەوە و بەئەسپایی دەبرێتە لای ماشێنە و دەرگای شووشەی سەهۆڵاوی دەکرێتەوە و دەمی دووربین دادەخرێ. چوارچێوەیەکی کە کۆلۆدیونی

تێدایە دەخرێتە جێگای شووشەی سەهۆڵاوی. لەسەر خوزاری چوارچێوەکە بەرەو ڕووی دووربین و لەنێو ماشێنەدایە دەکرێتەوە و بەهێندەی کە لەپێشدا دەستوورمان بۆ داناوە ڕووناکی نیشان دەدرێ و چاوەدێری دەستوور دەکرێت. لە پاش ڕووناکی دەمی چوارچێوە گرێ دەدرێ و دەست بەهێنەر و ڕاگری وێنە دەکرێ.

## کۆلۆدیون دارژتن لەسەر شووشە

هەروەکو گوترا کۆلۆدیون کە ئامادەبوو ئەوجا لەسەر پارچە شووشەییێکی کە لەپێشدا خاوێن کراوەتەوە و بۆ ئەم ئیشە ئامادە کراوە، دادەڕێژرێ. بەڵام دارژتنی کۆلۆدیون زۆر موهیمە و وردبینی پێویستە.

٨- دارشتنی کولودیون

پارچە شووشەکە بەدەستی چەپەوە دەگیرێت و شووشەی کۆلۆدیون بەدەستی ڕاست دەگیرێت و کۆلۆدیونەکە لە گۆشەییێکیەوە ڕوو دەکرێت. هەروەکو لەوێنە ٨دا نیشاندراوە و لە گۆشەی خوارەوە پان دەبێتەوە و لە گۆشەیکەوە دەکرێتە نێو شووشەکەوە، دەبێ زۆر بەئەسپایی ئەو کارە بکرێ تاکو لۆچی نەکەوێتە سەر کۆلۆدیون.

کە کۆلۆدیون دارژترا پشتی شووشەکە لە هایدرۆجین خاوێن دەکرێتەوە و دەرگای خانووی تاریکیش ئاواڵە دەکرێتەوە تاکو بۆنی ئەتیر و ئیسپرتۆی نەمێنێت. دەرگا گرێ دەدرێت و شووشە دەهاوێژرێتە نێو ئاوی زیوەوە. هەروەکو ڕێکخستنی ئاوی زیو لە پێشدا گوترا، لە پاشان لە ئاوی زیو دەردەخرێ و لە ماشێنەدا وێنەی پێ دەگیرێ و چوارچێوەکەی کۆلۆدیون دەبرێتە نێو ژووری تاریکەوە و دەرگا گرێ دەدرێ و لەبەر ڕووناکی سوور، دەخرێتە نێو دەرمانی هێنەرەوە.

## هێنەر

سلفاتی ئاسن (قەرەزاخ) ٣٥ غرام.
ئاوی خاوێن ٨٠٠ سانتیمەتر گرد.
ئیسپرتۆی دەرەجە ٩٦ - ٤٠ سانتیمەتر گرد.
ئەسید ئەستیک ٢٥ سانتیمەتر گرد.
هیلمی ماسی ١٢ سانتیمەتر گرد.

شووشـەی کۆلۆدیون لە چوارچێـوە دەردەخـرێت و لەنێـو ئەو کـاشـیـەی کـە بۆ ئەم کـارە دروسـتکراوە، دادەندرێ و هێندەی کە ڕووی کۆلۆدیون دابپـۆشێت، لە هێنەر و بەسـەریدا دەکرێ و یەکجار و دووجار کاشیەکە دەبزێورێ و وێنە زۆر بەچاکی دەردەکەوێ و دەزبەجێ لەو دەرمـانە دەردەخرێ و دەخرێتە نێو کاشـیـەکی کە ئاوی تێدایە و بەئاو زۆر باش ئەو دەرمانەی لێ دەکرێتەوە و لە دەست سلفات ڕزگار دەکرێ و دەخرێتە نێو دەرمانی ڕاگرەوە.

## ڕاگر

هیپۆسلفیت دیسود ۳۰ غرام.
و ئاو ۱۰۰ سانتیمەتر گرد.

شووشەی کۆلۆدیون هێندە لەنێو تواوەوەی هیپـۆدا دەمێنێ هەتا زیوی لەسەر لادەچێ و وێنە زۆر چاک ئاشکەرا دەبێ وردیەکەی دەردەکەوێ؛ ئەوجا هیپـۆ دەردەخرێ و لەنێـو ئاوی سـارد دادەندرێ و چەند جـار دەشۆردرێتـەوە، هەتا بۆنی هیپـۆی لێ دەبڕێ و کزر دەکـرێ؛ ئەوجا دەخرێتە نێو پشتیوانەوە.

## پشتیوان

ئاوی خاوێن ۵۰۰ سانتیمەتر گرد.
سلفاتی دیکۆڤەر ۲۵ غرام.
پرۆمۆر پۆتاسیۆم ۱۰ غرام.

پارچە شووشەکە لەنێو کاشی دادەندرێ و لە تواوەی سەرەوە کەم کەمە بەسەریدا دەکرێ و دەشلـەقێندرێ و کاشی دەبزێورێ. بەمودەتی ۳ سانیە ڕووی کۆلۆدیون وەکو زەردوویی زەرد هەڵدەگـەڕێ. لە دوای ئەوە بەئاو خاوێن دەکرێتـەوە و دەخـرێتـە سـەر سێـپـاو وشک دەبێتەوە و بەدەرمانی ڕەشکەر ڕەش هەڵدەگیردرێ.

## ڕەشکەر

نەتەراتی زیو ٦ غرام.
ئەسید لەیموونیک (جەوهەری لەیموون) ۱ غرام.
ئاوی دووبارە ۱۰۰ سانتیمەتر گرد.

لە دوای زەردکردن کە خرایە نێو ڕەشکەرەوە، لە پاشان بەئاو دەشۆردرێ و دەخرێتە نێو تواوەوەی هیپـۆسلفـیت دیسـۆدی زۆر سـووک و تێـیـدا ڕادەگیـرێ هەتا بەچاکی زیوەکەی

لەسەر لادەچێ بەئاو دەشۆردرێ. ئەگەر مەنشوور بەکار نەبرابێت کۆلۆدیون وەردەگیرێ و شووشەیێکی دیکەی خاوێن ڕووی بەسمغی عەرەبی تەڕ دەکرێ و ڕووی کۆلۆدیون دەخرێتە سەر ڕووی سەمغدار و پێکەوە دەچەسپێندرێ و هەردووکیان دەخرێنە نێو کاشییەکی پڕ لە ئاو و شووشەی کە کۆلۆدیونی پێوە بوو بەئاسانی لە کۆلۆدیون دەبێتەوە و دەکەوێتە سەر شووشەی سەمغدار. بەبێ ژاکاندن هەڵدەگیرێت و وشک دەکرێت و بۆ خستنە سەر چینکۆ ئامادە دەبێ.

٩- سیەپا بۆ شووشە وشککردنەوە و وەرگەڕاندنی کولودیون

لەوەش چاکتر ئەمەیە کە شووشەی بەسمغ لەپێشدا دەخرێتە نێو ئاوەکەوە و شووشەی کۆلۆدیون ڕووی کۆلۆدیونەکەی لەسەرخۆ لەسەر ئاو دادەندرێ و کەم کەمە کۆلۆدیونەکە کە تەڕبوو شووشەکە بەردەدات و دەکەوێتە سەر ئاو و بەهێواشیەک شووشەکە لادەبرێ و شووشەی سمغ لە ژێرەوە بلند دەکرێ، هەتا دەگاتە کۆلۆدیون. بەبێ ژاکاندنی کۆلۆدیون ڕووی چەپی دەخرێتە سەر شووشەکە و بەدەمی چەقۆیەکی دەم پان دەخرێتە سەری. وەکو لە ژێرەوە وێنە چەقۆ هەیە.

١٠- چەقۆ بۆ کولودیون

ئەگەر بەئەسپایی نەکرێ کۆلۆدیون دەژاکێ و بۆ ئیش بەکار نایەت، گەلێک وردبینی و نەفەسدرێژی و زانین و تەڕدەستی گەرەکە.

کۆلۆدیون ئەگەر کەناری وشک بووبێت لەبەرئەوەیە کە کەناری شووشە جیری لێ دراوە و دەبێ بەری نەدا، پێویستە لەپێش تەڕکردندا بەچەقۆکە ناوەکەی ببڕدرێ.

## شووشەی فۆتۆمیکانیک

هەروەکو دواوین و لە پێشدا بێژرا کە وێنە هەڵکەن و کارگەری ئەم پیشەیە بەدوو جۆر کاردەکەن؛ یێکەمینیان بەکۆلۆدیون، ئەویش بەدرێژی گوترا و دووەمینیشیان بەشووشەی فۆتۆمیکانیک کار دەکرێت. ئەو جۆرە شووشەیەش لە ئەورووپا بەدەستە بۆمان دەنێرن و ئێمەش دەکرین و ئیشی پێ دەکەین و لە دوکان و کارخانەی وێنەگەرەکانا زۆرن. بەڵام ئێمە بۆ تێگەیاندن و زانینی فەن و پیشە و کار پاش نەکەوتن. دەبێ چلۆنی دروستکردنی ئەو شووشە فۆتۆمیکانیکە کە بەوشکی بۆمان دێ وەکو کۆلۆدیون بزانین بۆ خۆمان ڕێکی خەین و دەبێ بەچاکی باسی بکەم:

## تواوەوەی ژمارەی یێکەم

ئازۆت دارژان ۳۰ غرام.

ئاوی دووبارە ۲۰ غرام.

ئامۆنیاک (نۆشادر) هێندە کە تلتەو کەف بیتوێنێتەوە.

## تواوەوەی ژمارەی دووەم

پرۆمۆر دی پۆتاسیۆم ۲٤ غرام.

یۆدۆر دی پۆتاسیۆم ۱ غرام.

جەلاتینی ڕەق (هێلمی ماسی) ۲ غرام.

ژمارەی یەکەم و دووەم لە دەرەجەی گەرمایی ۳٥ سانتیغرادا دەتوێندرێتەوە و لە حەمامی ماریدا ٤٠ دەقیقە بەو گەرمیە ڕادەگیرێ و لە دواییدا تێکەڵ دەکرێت و بەجارێک لێک دەدرێ و لە پاشان تواوەوەی ژمارەی سێیەمی دەکرێتە سەری.

## تواوەوەی ژمارەی سێیەم

جەلاتینی ڕەق ٤٥ غرام.

ئاوی دووبارە ٥٠٠ غرام.

کە ئەو تواوەوەش تێکەڵ بەهەردوو ژمارە کرا، زۆر چاک دەشلەقێندرێ و تێکەڵی یەکتر دەکرێت؛ بەوە هەموو دەبێتە کەف. پێویستە دوازدە سەعات بخرێتە نێو کاشی و سەری داپۆشرێت، هەتا لەدواییدا تەماشا دەکرێ کە بەستوویەتی. ئەوجا بەچەقۆ هەڵدەکەندرێ و لە کاشیەکە دەردەخرێ لەنێو ئاودا دەخووسێنرێ و بەدەست هەڵدەپشێورێ و چەند جار ئاوی لێ دەگۆڕدرێ تاکو پێکەوە نەنووسێ و بەئاوی سارد چەند جار خاوێن دەکرێتەوە و لەسەر بێژینگ دادەندرێ و بڵاو دەکرێتەوە.

لە دوای ئەو هەموو شوشتنەوەیە دووبارە لە حەمامی ماریدا ٦٠ دەرەجەی گەرمایی دەدرێتێ، بەڵام ناشلەقێندرێ هەتا دەتوێتەوە؛ ئەوجا بەئەسپایی تێکەڵ دەکرێ. بەڵام نابێ بهێڵدرێ کەف بکات.

بۆ ئەوە هێزی زیاتر بێ و لە تۆز و خۆڵ بپارێزرێت، دەبێ لە خانووی تاریکا دابندرێت و هێندی ئیسپرتۆشی تێکەڵ بکرێ. لە هاویندا سێ و لە زستانا هەشت ڕۆژ دادەندرێ،

ئەوجا بۆ بەکاربردن ئامادە دەبێت.

بۆ کار کە دەرمانەکان سازکران، شووشەی پێ هەست دەدرێ و لە ژووری تاریکا لەسەر سێپا دادەندرێ. لە زستانا ٤٥ و لە هاوینا ٤٥ دەرەجەی گەرمی بەشووشە و بەتواوەوەش ٥٠ی دەدرێتێ. ئەوجا تواوەوە بەسەر شووشەدا دەکرێ و شەش دەقیقە لەسەر سێپا دادەندرێ و هەرچییەکی زیاد بێت بەردەبێتەوە. دەبێ کارگە گەرم بێ؛ چونکە ئەگەر شووشە بە١٢ سەعات وشک نەبێتەوە خراپ دەبێ.

## ڕانەسپاردن

ئەگەر کارگە و ئیش لە خۆڵ و تۆز و ڕووناکی نەپارێزرێ و لە تەڕەشوع و ساردی بەخێو نەکرێ و هەمیشە گەرم ڕانەگیرێ، بەئارەزوو نابێ. ئەو شووشەیە ٤٠ دەرەجە گەرمی دەدرێتێ و وشک دەکرێ و هەڵدەگیرێ و بۆ پێویست بەکار دەبرێ.

## شوشتنەوەی شووشەی فۆتۆمیکانیک

هێنەر ژمارە ١

ئاوی دووبارە ١٠٠٠ سانتیمەتر گرد.

هیدرۆکینۆن١٠ غرام.

پرۆمۆر پۆتاسیۆم ٢غرام.

میتابی سلفیت پۆتاس ١٠ غرام.

هێنەر ژمارە ٢

ئاوی دووبارە ١٠٠٠ سانتیمەتر گرد.

پۆتاسیۆم هیدریک ٢٠ غرام.

بۆ کارکردن ٢٠ لە ژمارەی یەکەم و ٣٠ لە ژمارەی دووەم تێکەڵی یەکتر دەکرێ وێنەی پێ دەشۆردرێ هەتا دەردەهێنرێ، بەمە دەڵێن بانیۆی یێکەم.

## ڕاگر

ئاوی خاوێن ١٠٠٠ سانتیمەتر گرد.

هیپۆسلفیت دیسود ٢٠٠ غرام.

میتابی سلفیت پۆتاس ٣٠ غرام.

## پشتیوان

### تواوەوەی یێکەم

ئاوی خاوێن ۱۰۰۰ غرام.

بۆ روسیات دیفێر ۵۰ غرام.

### تواوەوەی دووەم

ئاوی پاک ۱۰۰۰سانتیمەتر گرد.

هیپۆسلفیت دیسود ۲۰۰ غرام.

کامینۆم میتابی سلفیت ۲ غرام.

هێندێک لە هی یێکەم لەگەڵ هێندێکی دووەم تێکەڵ دەکرێ و شووشەی پێ ڕادەگیرێ و دەشۆردرێتەوە.

## جوانی و پاکی

تواوەوەی یێکەم

ئاوی خاوێن۱۵۰ سانتیمەتر گرد.

سلێمانی وردکراو ۱۰ غرام.

تواوەوەی دووەم

ئاو ۱۵۰ سانتیمەتر گرد.

یۆدی مەعدەنی ۱۵ غرام.

تواوەوەی سێیەم

ئاوی دووبارە ۱۵۰ سانتیمەتر گرد.

هیپۆسلفیت دیسود ۲۰ غرام.

۵۰ لە هی یەکەم و ۵۰ لە هی دووەم و ۱۰۰۰ غرام لە سێیەم لە کاشیێکدا تێکەڵی یەکتر دەکرێ و شووشەی فۆتۆمیکانیکی هەستداری تێهەڵدەکێشرێ کە هەموو وردەیی وێنە بەجوانی دەرکەوت بەئاو دەشۆردرێتەوە.

## کۆڵان و هەست بەزەنگدان

بۆ زەنگ و مس و پۆلا کۆڵین سێ ڕێگای هەنە:

یێکەمین- لە پاش نیشاندان بەڕووناکی مەرەکەبی لێ دەدرێ و لە ئاودا هێنەر پەیدا دەکا.

دووەمین- لە دوای ڕووناکی بەئاو و بەڕەنگی ئەنلینی شینی بنەوشەیی دەردەکەوێت.

سێیەمین- لە دوای ڕووناکی بەنەفت پێداکردن دەردەهێندرێ و ئەو ٣ ڕێگایانەش چەند جۆرێکیان هەیە کە لە پێویستدا کاریان پێ دەکرێ.

لەپێش هەموو چتێکا دەبێ زەنگ و مس و پۆلا کە بەکار دەبرێن، خاوێن بکرێتەوە و زۆر چاک بەقاقەزی سمارتە (سنغارە)و تەلق بماڵدرێ و مەوادی چەوری و ڕەنگ و پیسیان لەسەر نەمێنێت و بەقاقەزی سپی و لووس پاک دەکرێنەوە و بۆ بەکاربردن ساز دەکرێن.

## ڕێگای یێکەمین بۆ هەستی

لەتە زەنگ (١٠) سانیە لەنێو تواوەوەی هاتوودا ڕادەگیرێت.

ئەسید ئەستیک ٥٠ غرام.

ئەسیدی کلۆر هیدریک ١٠٠ غرام.

ئاوی دووبارە ٥٠٠ غرام.

لەو دەرمانە کە دەرخرا بەئاوی پالاوتوو خاوێن دەکرێ و دەرگای ژووری تاریک دەژەنرێ و بەدەرمانی هاتوو هەست دەدرێ:

تواوەوەی یێکەم

سپێنەی هێلکەی وشک ٢١ غرام.

بیکرۆماتی ئامۆنیۆم ٩ غرام.

ئاوی دووبارە ٩٠٠ سانتیمەتر گرد.

نۆشادری ڕوون ٣-٩ تنۆک.

بۆ ئەو دەرمانە دوو شووشەی شین ڕادەگیرێ و تواوەوە لە یەکێکدا دروست دەکرێ و ڕەحەتی لەسەر هی بەتاڵ دادەندرێ و شووشەکە کە هیچی تیا نییە، لە ژێر ڕەحەتی

دادەندرێ (هەروەکو لە وێنەی ٧ نیشان دراوە) و لۆکەی لە سەرەوە دەخرێتە لوولەی ڕەحەتییەکەوە و ئەو تواوەوەی تێ دەکرێ و دەپاڵێورێتە نێو شووشەی دووەمەوە.

ئالەتی ڕەحەویە ئامادە دەکرێ و لەتە زەنگی پێویست لەسەری دادەبەسترێ و ئەو دەرمانە بەسەر زەنگەکەدا بڵاو دەکرێتەوە و ئالەتی ڕەحەویە بۆ سووڕانەوە بەر دەدرێ و بەدەست چەرخەکەی بادەدرێ و ئەوی زیاد بێ، فڕێ دەدرێ. بەڵام لەژێر ئالەتی ڕەحەویەدا ڕووبەڕووی زەنگەکە ئاورێکی زۆر سووک هەبێ تاکو زوو وشک بێتەوە.

١١- ئامێری رەحەویە

ئەو ئالەتە (وەکو لە وێنەی ١١ نیشان دەدرێ) بەتایبەتی بۆ زەنگ هەستپێدان دروست کراوە. کە زەنگەکە بەچاکی وشک بووەوە، ئالەتی ڕەحەویە ڕادەگری و زەنگەکەی لێ دەکەیەوە و لێی دەگەڕێی هەتا سارد دەبێتەوە و چوارچێوەی وێنەی ١٦ ساز دەکەی و شووشەی وێنەی لە پشتەوە دادەنێی و ڕووی کۆلۆدیون وەیا جەلاتین دادەنێی و دەزگای چوارچێوە گرێ دەدەی و لە ژووری تاریک دەری دەخەی و ٤ دەقیقە لەپێش تیشکی هەتاو بەجۆرێکی وا دایدەنێی کە تیشک بەکۆمەڵە بکەوێتە سەر ڕووی وێنەیێکی کە لە چوارچێوە دایە.

دەبێ چوارچێوە ڕوو بەڕۆژ و پشت لە سێبەر وا دابنرێ کە نیوەڕاستی وێنە لەنێو چاوی ڕۆژ بێت و تیشک بەتوندی و پڕ بکەوێتە سەری.

١٢- وێنەی بەفلچەی بیتوم لە زەنگ پاککردنەوە

کە ئەوە تەواوبوو، چوارچێوە دەبرێتە نێو ژووری تاریکەوە لەبەر ڕووناکی زەرد لە چوارچێوە دەردەخرێ و بەتیرۆک سێ چوار جار مەرەکەبی لیتۆغرافی بەسەر ڕووی زەنگی کە دەرمانی پێوەیە، لێ دەدرێ و ڕووی دەرمان کراسێکی تەنکی ڕەش لە مەرەکەب هەڵدەگرێ و ٢ دەقیقە لە خانوودا ڕادەگیرێ و دەخرێتە نێو کاشییەکی کە پڕە لە ئاوی سارد و بەلۆکە پێداهێنان،

ڕووەکەی دەماڵدرێ. وردە بابەت و نەزاکەتی وێنە کە بەچاکی دەردەکەوێ، بەئاو پێداکردن خاوێن دەکرێ و وشک دەکرێتەوە و هێندێک لە بیتۆمی وردی والآبێژی بەسەردا دەکرێ و بەفلـچەییێکی نەرم ڕووی دەماڵدرێ تاکو ئەوەی زیادە نەمێنێ و ئەوەی بەمەرەکەبەوە نووساوە بۆ پشتیوانی بمێنێتەوە. لە پاشان کەمێک گەرم دەکرێ و بۆ کوڵێن و کردنە کلێشە ساز دەبێ و پشتی بەمێو هەنگوین دەگیرێ.

## تواوەوەی دووەم

ئاوی دووبارە ۱۰۰۰ سانتیمەتر گرد

ئەلبۆمین سنیش (سپێنەی هێلکەی وشک) ۵۰ غرام.

بیکرۆماتی ئامۆنیۆم ۷ غرام.

ئامۆنیاک ۱۰ تنۆک.

## تواوەوەی سێیەم

ئاوی دووبارە ۱۰۰۰ سانتیمەتر گرد.

سپێنەی هێلکەی وشک ۸۰ غرام.

بیکرۆماتی ئامۆنیۆم ۸۰ غرام.

ئامۆنیاک ۱۰ تنۆک.

لەو دوو تواوەوە هەر کامێک بەکار ببرێ، ۱۰ سانتیمەتر ئەگەر بخرێتە سەری زۆر چاک دەبێ. لەتێ مەعدەنی دەخرێتە سەر ئالەتی ڕەحەویە و لە تواوەوەی دەکرێتە سەری و ڕەحەویە بادەدرێت هەتا دەرمانەکەی وشک دەبێتەوە و لەسەر شووشەی وێنەدار لەنێو چوارچێوە دائەنرێ. لەبەر چرا ۱۰ دەقیقە و لەبەر ئەلەکتریک ۵ یا ٦ دەقیقە و لە بەرهەتاو ۲ دەقیقە نیشان بەڕووناکی دەدرێت. بەڵام ئەگەر هاوین بێ؛ بەڕووناکی ڕۆژ لەبەر سێبەر ٤ دەقیقە و لە بەرهەتاو نیو دەقیقە بەسە.

## تواوەوەی چوارەم

ئاوی پاک ۵۰ سانتیمەتر گرد.

بیکرۆماتی ئامۆنیۆم ۰٫۵ غرام.

ستراد دیفیر ئامۆنیاک ۲ غرام.

سپێنەی هێلکە ۱ دانە.

ئەوەش هەروەکو زانراوە پارچە زەنگی پێ هەست دەدرێ و لە بەرهەتاو لە ٢ هەتا ٤ و لە بەرسێبەر نیو سەعات نیشان بەڕووناکی دەدرێ.

تواوەوەی پێنچەم

ئاوی دووبارە ١٠٠ سانتیمەتر گرد.

بیکرۆماتی ئامۆنیۆم ٣ غرام.

ئامۆنیۆم ٦ غرام.

ئەلکول ٩ غرام.

سپێنەی هێلکەی وشک ٥٠ غرام.

لە دوایی پارچە مەعدەنی هەستپێدان نیو هەتا یەک دەقیقە لە بەرهەتاو و لە بەرسێبەر لە چوار هەتا شەش دەقیقە بەبەر ڕووناکی دەدرێ.

تواوەوەی شەشەم

بیکرۆماتی ئامۆنیۆم ٠,٥ غرام.

ئاوی پاک ١٠٠ سانتیمەتر گرد.

سپێنەی هێلکەی شلەقاو ١ دانە.

ئەوانەی بێژران و تواوەوەی لە سەرەوە گوتران، لە پاش نیشاندان بەڕووناکی وەکو لە تواوەوەی یەکەمدا باسکرا، بەتیرۆک مەرەکەبی لێ دەدرێ و لەدوای چەندێک دەخرێتە نێو ئاوی خاوێنەوە و بەلۆکە دەردەهێنرێ.

## دروستکردنی سپێنەی هێلکە

### ئەلبۆمین (زولال)

هێلکەی تازەی ڕۆژی دەشکێندرێ و لەنێو کاشیێکی خاوێنا ڕوو دەکرێ و بەتێل -کە بەتایبەتی بۆ ئەو ئیشە سازکراوە- دەشلەقێندرێ هەتا بەتەواوی دەبێتە کەف (وەکو لە وێنەی ١٤دا نیشان دەدرێ). کەفەکە کاشی پڕ دەکا و تەڕی لە هێلکەکەدا نامێنێ و پارچە تێلەکە دەردەخرێ و کاشییەکە لە جێگاییێکی بەتەڕەشوع دادەندرێ

١٣- تیرۆک بۆ مەرەکەب

١٤- کاشی و کەفی هێلکە و تێل و فلچە

و سەری دادەپۆشرێ و بە١٢ سەعات دێتە ساز بوون. کە تەماشا کرا ئاوێکی زەرد و زۆر ڕوون و جوان لە بنی کاشییەکەدا و لەژێر کەف دایە. بەئەسپاییەک ئەو زەرداوە بۆ کارکردن پێویستە و ئیشی پێ دەکرێ.

ئەگەر ئەلبۆمین سیش پێویست بێت، ئەو زەرداوە لەنێو ژوورێکی گەرم بەکەم گەرمی وشک دەکرێ و هەڵدەگیرێ و بۆ چاخی پێویست بەکار دەبرێ. ئەگەر سپێنەی هێلکە بێ، ئەو زەرداوە بەکاشی سانتیمەتر دەپێورێ و تێکەڵ بەدەرمان دەکرێ، هەروەکو لە وێنەی ١٥نیشاندراوە. بەو کاشییە هەموو تواوەوەیەک دەپێورێ، ئاو و سپێنەی هێلکە و ئیسپرتۆ و ئەتیر و ئەو جۆرە دەرمانانەی کە ڕوونن.

١٥- کاشی بۆ پیوان

## ڕێگای دووەمین بۆ هەستی تواوەوەی ییکەم

لە دوای پاککردنەوەی زەنگ بەئاو دەشۆردرێتەوە و لەسەر ئالەتی ڕەحەویە دادەندرێ و تواوەوەی هاتووی بەسەر دادەکرێ بۆ هەستپێدان:

ئاوی دووبارە ٣٠٠ سانتیمەتر گرد، هێلمی ماسی تواوەوەی نیسبەت ٣٣/١٠٠ - ١٠٠ سانتیمەتر گرد.

بیکرۆماتی ئامۆنیۆم ٧ غرام.

لە پاش هەست بەزەنگدان دەخرێتە سەر شووشەی بەوێنە و لەنێو چوارچێوە دادەندرێ و ٤ دەقیقە نیشان بەڕووناکی دەدرێ و لەنێو ژووری تاریکا دەهاوێژرێتە نێو تواوەوەی ڕەنگی ئەنیلینی بنەوشەیی نیسبەت ٣/١٠٠. لە دوای ئەوە دەخرێتە نێو ئاوی ساردەوە و بەلۆکەیەکی نەرم دەماڵدرێ، هەتا بەچاکی وێنە یا نویسراوەکە دەردەکەوێ و لە دوایيدا بەئاوێکی خاوێن دەشۆردرێتەوە و بەتواوەوەی هاتوو پشتیوانی دەکرێ:

١٦- چوارچێوەی وێنە بۆ ڕووناکی

ئاو ٥٠ سانتیمەتر گرد.
بیکرۆماتی ئامۆنیۆم ٥ غرام.
زاخی سووتاو (کروم) ١ غرام.

چەندێک کە لەنێو ئەو دەرمانەدا مایەوە دەردەخرێ و بەئاو دەشۆردرێ و وشک دەکرێتەوە و لەسەر ئاور دادەندرێ و زۆر چاک گەرم دەکرێ هەتا ڕەنگی بنەوشەیی دەگۆڕێ و گوم دەبێ و هەر لەسەر ئاور ڕادەگیرێ. دووباره کە بزربوو دەگۆڕدرێتەوە و ڕەنگێکی زەرد پەیدا دەکات. دەستی لێ هەڵمەگرە و ئاورەکەی بۆ خۆشکە هەتا ڕەنگی وەکو زێڕی لێ دێ، ئەوجا لەسەر ئاوری لابەرە و پشتی پارچەکە بەمێوی هەنگوین بگرە و ئەگەر رتووشی بوێت بەقەڵەمی تووکی سمۆرە چاکی کە و ئەگەر زیادی هەبێ، بەنووکی قەڵەم رتووش کە سەری ئاسنە بیکرێنە و لای بەرە تاکو بۆ کوڵین ئامادە ببێ. بۆ وێنەی سێبەردار ١٠ تنۆک ئەکرێتە سەر تواوەوەی هێلم.

١٧- قامی روتووش

### تواوەوەی دووەم

ئاوی دووباره ٣٥٠ سانتیمەتر گرد.
نیشاستەی تواوەوە ١٧٠ سانتیمەتر گرد
بیکرۆماتی ئامۆنیۆم ١٢ غرام.
ئامۆنیاک ١٠ تنۆک.

### تواوەوەی سێیەم

ئاوی دووباره ٥٠٠ سانتیمەتر گرد.
نیشاستەی تواوەوە ٢٠٠ سانتیمەتر گرد.
سپێنەی هێلکەی وشک ئەلبۆمین سیش ١٠ غرام.
بیکرۆماتی ئامۆنیۆم ١٥ غرام.

ئەو دوو تواوەوە هەر کامێکی بەکاربرێ لەپێش کارا بەرەحەتی ژمارە ٧ دەپاڵێورێ و لە دوای دوو ڕۆژ پالاوتن، ئامادە دەبێ. کە ڕەنگی پێ هەستدار کرا بەرووناکی چرا ٢٠ هەتا ٣٠ دەقیقە و بەرووناکی رۆژ ٣ دەقیقە و بەهەتاو دەقیقەیەک نیشان دەدرێ و بەڕەنگی ئەنیلین دەردەهێنرێ و بەئاو دەشۆردرێتەوە و پشتیوانی گەرم دەکرێ.

ئاوی دووبارە ۳۵۰ سانتیمەتر گرد.

نیشاستەی تواوەوە ۳۰۰ سانتیمەتر گرد.

بیکرۆماتی پۆتاس ۱۵ غرام.

ئەو تواوەوە بە٤٨ سەعات ۳ جار دەپالێورێ، ئەوجا بۆ بەکاربردن شایستە دەبێ. کە ۳ جار پالاوترا و ڕەنگی پێ بەهەست کرا، هەروەکو لە پێشا درێژەمان بەچلۆنەتی دا ئەوجا بەئاوی سارد لە دوای نیشاندان بەڕووناکی دەشۆردرێ و ڕەنگی ئەنیلینی بنەوشەیی بەسەردا دەکرێ و لە تواوەی هاتووا پشتیوانی پێ دەدرێت.

ئاوی پاک ۱۰۰ سانتیمەتر گرد.

بیکرۆماتی ئامۆنیۆم ۲ غرام.

ستراد دیفیر ئامۆنیاک ۳ غرام.

ئەو تواوەوە لەپێشدا ساز کراوە و پالاوتراوە و لە شووشەیێکی شیندا هەڵگیراوە و بۆ ڕۆژی پێویست داندراوە. هەرکە زەنگی پێ پشتیوان کرا، دەکرێتە نێو جێگای خۆی و بۆ جارێکی دیکە هەڵدەگیرێ و خراپ نابێ.

کە زەنگ هەستدرا و نیشان بەڕووناکی درا و خرایە نێو تواوەی ڕەنگ و پشتیوانەوە، زۆر چاک بەئاور گەرم دەکرێ هەتاکو ڕەنگی شین وەکو زێڕ سوور هەڵدەگەڕێ، ئەوجا ئامادەی کوڵین دەبێ و پشتی پارچەکە بەمێوی هەنگوین چەور دەکرێ تاکو ئەسید لە پشتەکەی کاریگەر نەبێ. ئەوە بۆ هەموو پارچەیەک دەکرێ بەدەستوور.

## ڕێگای سێیەمین بۆ هەستی

ئەم ڕێگایە لە ڕێگاکانی پێشوو ناچێت و هێنەر و ڕاگر و هەستپێدان و دەرمانەکانی جودایە. لە بری دەرمان، قیل (بیتوم) بەکاردەبرێ. بۆ ئەمە چلۆنی دروستکردنی بزاندرێ، لەپێش کاردا لەوە دەدوێم:

قیل کە بەزمانی فەننی ئیسفەلت و بەفرەنگی «بیتوم دیجودیا»ی پێ دەڵێن، چاکترینی ڕەشی مایل بەسوورە کە بیشکێنی وردەی سووری تێدایە و زوو ورد دەبێ.

ئەو قیلە پارچە و لەت دەکرێ و دەخرێتە نێو ئاوی گەرمەوە و لەسەر ئاور دادەندرێ و دەکرێتە نێو ئاوی ساردەوە. تا چوار جار بەوجۆرە گەرم دەکرێ و دەخرێتە نێو ئاوی

ساردەوە و هەموو جارێ ئاوی ساردی لێ دەگۆڕێ تاکو هەر خڵتوخاکێکی هەیبێ بەگەرمکردن لێێ جوێ دەبێتەوە و بەئاوی سارد دەشۆردرێتەوە و تەنها قیلی خاوێن دەمێنێت. بەڵام هەر جارێک کە خرایە ئاوی ساردەوە ڕەق دەبێ و لە دوای وشکبوونەوە، دەکوترێ و دیسان گەرم دەکرێ و هەروەها هەتا بەچاکی خاوێن دەکرێتەوە و بەکوتراوی هەڵدەگیرێ و بۆ وەختی پێویست بەکار دەبرێ. بۆ کاربردن بە٣ جۆر تواوەوە ئامادە دەکرێ، هەروەکو لە خوارەوە یەکەیەکە دێتە بەرچاو:

١- ئەگەر خەتی گەورە و حەجمی بچووک بێ:

(بەنزینی چاک ٥٠٠ غرام.

قیل ٤٠ غرام.

٢- ئەگەر حەجمی گەورە و خەتی ئەستوور بێ:

(بەنزینی چاک ٥٠٠ غرام.

قیل ٢٠ غرام.

٣- ئەگەر حەجمی بچووک و خەتی ورد بێ:

بەنزینی چاک ٥٠٠ غرام.

قیل ١٢ غرام.

قیل لەنێو شووشەیێکی زارتونددا بەنزینی بەسەردا دەکرێ و دەمی توند دەگیرێ تاکو بەنزینەکە نەفڕێ و بە٢٤ سەعات لێگەڕان بۆ کار ئامادە دەبێ. زەنگ دەسوێتەوە و خاوێن دەکرێ و بەڕەوشتی کۆلۆدیون تواوەوەی بەنزین و قیل بەسەر پارچە زەنگەکەدا دەکرێ و هی زیادی لە گۆشەیەکەوە دەخرێتە نێو شووشەکەی خۆی و دەمی شووشەکە دەگیرێ و لە دوای چەند دەقیقەیەک بەنزین دەفڕێ و کراسێکی نازکی قیل لەسەر زەنگەکە دەمێنێ و وشک دەبێ.

لە دوای وشکبوونەوە لە پشت شووشەی وێنەدار دادەندرێ و دەخرێتە نێو چوارچێوە و لەبەر هەتاو دادەندرێ. ئەگەر لە ژمارەی یەکەم بێ ٣٠-٤٠ دەقیقە بەهاوین و بەزستان سەعاتێک. ئەگەر ژمارەی ٢ و ٣ شووشەی چاک بێ و هەتاویشی تیژ بێ، بیست هەتا سی دەقیقە نیشان بەڕووناکی دەدرێ.

## هێنەر

کە نیشان بەڕووناکی درا لەبەر سێبەر کەمێک لێی دەگەڕێی هەتا لە گەرمای هەتاو سارد دەبێتەوە و لە چوارچێوە دەردەخرێ و لەنێو کاشی دادەندرێ کە لەپێشدا پڕ لە نەفت کرابێ. دوو سێ جار کاشییەکە دەبزێودرێ تاکو نەفتەکە بشلەقێ. ئەوجا زەنگەکە بەلەز دەردەخرێ، ئەگەر وێنەکە زۆر جوان و ئاشکەرا بوو، بەپەلە و بەهێواشی ئاوی بەسەردا دەکرێ و بەجارێک دەردەکەوێ. جێگاییێکی لە ژێر سێبەر مابێتەوە بەنەفت هەڵدەستێ و ئەوەی لە خەتی سپیەوە تیشکی لێدابێ بەزەنگەوە دەچەسپێ، کەوا بەجوانی وێنەکە دەردەکەوێ. دوو سەعات زەنگەکە لەبەر هەتاو دادەندرێ و بەوە پشتیوانی پەیدا دەکا. لە دوای دانانە بەر هەتاو لەسەر ئاور گەرم دەکرێ، ئەویش گەرمیەکی وا کە دەست لە زەنگ بدرێ جزەی لێ دێ. لە دواییدا لەسەر ئاور لادەبرێ و بەمێوەی هەنگوین پشتی زەنگ چەور دەکرێ و بۆ کۆڵین ئامادە دەبێ.

ئەوانەی کە گوتران هەموو بۆ ئەوەیە کە خۆمانی پێ دڵخۆش کەین و بەئیشکردنەوەی شادمان بین؛ بەڵام ئەو هەموو کێشە و ڕەنجە بۆ ئەوەیە کە چۆن خۆمانی دڵخۆش کرد، کڕیار و بیانیش منەتدار و شوکرانە بژێر کا؛ ئەویش بەچی دەبێ؟ بەکۆڵینی کلێشەی جوان لە چاپکردندا. چونکە ئەو هەموو کۆشەوەی کە ئێمە بەکارمان برد بۆ ئەمەیە کە لەبری ڕەنج، گەنج وەدەست خەین. ئەویش بەدڵ وەدەستهێنانی کڕیاران دەبێ کە دراومان بدەنێ تاکو پێی دارا بین و بتوانین لە پیشە و کارماندا هەوەسناک و لە کردەوەمانا شادکام و بەتێکۆشینمان دڵخۆش بین.

کلێشەیەکی کڕیار پێی دەوێ، دەبێ هێندە بەجوان و چاکی بۆ بکۆڵین کە بەدڵێکی خورسندەوەمان لێ وەرگرێ و بەپێکەنین و کەیفەوە دراومان بداتێ. کەوابوو دەست بەکۆڵین و هەڵقەناندنی کلێشە دەکەین؛ هەم خۆمان مەمنوون و هەم هی دیکەش منەتداری خۆمان بکەین.

## وێنەکۆڵین لەسەر زەنگ

کۆڵین لەسەر هەموو مەعدەنێک دوو ڕەچەیە: یێکی نوبسراو (خط)، دووەمین وێنەی بەسێبەرە. لە کۆڵانا هی چوویی ناگەڕێتەوە و هەرکە کۆڵدرا لە دەست دەردەچێ. بەڵام ئەوەش بەتواوانی ترش (ئەسید) دەبێ؛ هەروەکو بۆ تووتیا (چینکۆ) تیژاوێک و بۆ مس تیژاوێکی دیکە و بۆ پۆڵا تیژاوێکی دوور لەوانە و بۆ شووشە تیژاوێکی تر بەکار دەبرێن،

هەریەک لەوانە تیژاوێکی بەتایبەتیان هەیە کە پێی هەڵدەکەندرێ. ئێمە هەریەک لەوانە لە جێگای خۆیا درێژەی چلۆنایەتیان دەڵێین.

## کۆڵانی نویسراو لەسەر زەنگ

پارچە زەنگ بەهەریەک لەو سێ ڕێگایانەی کە لەپێشدا لێی دواین هەست دەکرێ و لە دەرمان و کردەوەکانی لە جێگای خۆیا گوتراون و بەکار دەبرێن و ٢ دەقیقە دەهاوێژرێنە ژێر کۆشی تیژاوەوە کە ئەمەیە:

ئەسید نەتریک ٢ سانتیمەتر گرد.

ئاوی دووبارە ١٠٠ سانتیمەتر گرد.

لە دوای ئەوە کە ٢ دەقیقە کلێشە وەبەر زۆری ئەو تیژاوە کەوت، بەئاو دەشۆردرێتەوە و بەئەسفەنج (هەور) تواوەی هاتووی لێ دەدرێت.

١٨- تیرۆگ بۆ مەرەکەب لە کلێشەدان

ئاوی خاوێن ٨٠ سانتیمەتر گرد.

سمغی عەرەبی ٤٠ غرام.

لە دوای ئەوە کە بەهەور ئەو تواوەی لێ درا بەتیرۆک کراسێکی تەنکی مەرەکەب لە ڕووەکەی دەدرێ. بەڵام دەبێ مەرەکەب جگە لە ڕووی نویسراو نەکەوێتە سەر زەوی بەتاڵ. لە پاشا بەهەورێکی دیکە کە بەئاو تەڕ کرابێ بەسەر ڕووی کلێشەدا دەماڵدرێ و هەر سمغ و مەرەکەبێکی کە لەسەر خەتەکە بێ، هەڵدەگیرێ و بەئاو دەشۆردرێ. کەمێک بەگەرمی وشک دەکرێ و کوتراوی ئەسفەلت و بیتو قەلفونیای بەسەر دادەکرێ و بەفلچەی نەرم ڕووەکەی خاوێن دەکرێ و هەرچەندە مەرەکەبێکی پێویست بووبێت، هەڵی دەگرێ و هی پێنەویست لەسەری لادەبرێ.

کە بەفلچە ڕووی پاککراوە و کوتراوی ئەسفەلتی لەسەر نەما بەئاور پارچەکە هێندە گەرم دەکرێ هەتا ئەسفەلت و لە قەلەفونیەکە دەبروسکێ و لە دوای ساردبوونەوە، هەر ڕتووشێکی بیەوێ چ بەفلچەیەکی باریکی تووکی سمۆرە و چ بەقەڵەمی ئاسنی ڕتووشی ژمارە ١٧ چاک دەکرێ و دووبارە کوتراوی ئەسفەلتی بەسەردا دەکرێ و بەفلچە خاوێن دەکرێ و بەئاور گەرم دەکرێ و هەروەکو پێشوو کاری لێ دەکرێ و بەمێو پشتی چەور دەکرێ و دەخرێتە نێو کاشی ژمارە ١٩ کە پڕ لە تواوەی ئەسیدی هاتووە:

١٩- کاشی بۆ کوڵینی کلێشه

ئەسـیـد نەتریک ٤ سـانتـیـمـەتر گرد.

ئاو ١٠٠ سانتیمەتر گرد.

کـە کلـێشـە خـرایە ژێر زۆری ئەو تیژاوەوە بە ڤلچەی کەم کەمە رووی کلـێشـەکـە دەمـاڵدرێ، تاکـو تـیـژاو لە کردەوەی پاش نەکەوێ و ڕێگای چوونی کراوە بێت.

کە مودەتێک لەنێو زۆری ئەو تیژاوە ماوە دەردەخرێ و بەئاو خاوێن دەکرێ و دەخرێتە سەر ئاور. لە دوای گەرمبوون بەپەڕۆییێکی خاوێن مەرەکەبی لەسەر لادەبرێ و بەنەفت و فلـچـە زۆر چاک لە مـەرەکـەب ڕزگـار دەکرێ و بەپەڕۆییێکی خـاوێن دەکـرێتـەوە. ئەگـەر کـەمـوکـورتییـێکی هەبێ، بەقـەڵەمی کـوڵین ڕێک دەخـرێ و دووبارە بەتیـرۆکی ژمـارە ١٨ مـەرەکـەبـێکی ئەسـتـوور لە ڕووی نوسـراو دەدرێ و ئەسـفـەلت و قـەلەفـونیـەی کـوتراوی بەسەردا دەکرێ. هەروەکو گوترا لە دوای خاوێنبوونەوە گەرم دەبێ و پشتی بەمێو دەگیرێ و دەخرێتە ژێر زۆری تیژاوەوە:

ئەسید نەتریک ١٠ سانتیمەتر گرد.

ئاو ١٠٠ سانتیمەتر گرد.

نزیـک ١٠ دەقـیـقـە لەژێر ئەو کـۆشـەوەی تیـژاوی سـەرەوەدا دەمـێنێت و دیسـان بەئاو دەشۆردرێ. ئەگەر تیژاو بۆ کەناران وەیا بۆ ژێر نوبسـراوان ڕێگای کردەوە، بەلەز فلـچەی باریـک لە مــەرەکـەب وەردەدرێت و ئەو جـێـگایانە لە هەڵـمـەتی تیـژاو دەبەسـتـرێ و بەئەسفەلت پشتیوانی دەکرێ و لە دوای گەرمکردن دووبارە دەخرێتە نێو تیژاو و لە دوای ٣ دەقـیقـە دیسـان تەمـاشـا دەکرێ و ڕوتووش دەکـرێ و بەتیـرۆک مـەرەکـەبی لێ دەدرێ و بەئەسفەلت پشتیوانی دەکرێ و دەخرێتە ژێر تیژاوی هاتووەوە:

ئەسید نەتریک ٢٥ سانتیمەتر گرد.

ئاو ١٠٠ سانتیمەتر گرد.

٢٥ دەقـیـقـە لەژێر ئەو هێـزەدا دەمـینێ. بەڵام وردبینی و چاوەدێرییـێکی زۆری پێ دەوێت؛ چونکە ئەو تیژاوە زۆر بەهێزە و دەبێ لە نێـوانی هەر دەمـێکا کلـێشـە لەژێر ئەو هێـزە دەربخـرێ و بەئاو بشـۆردرێ و وشـک بکرێ و کـەناری خـەت بەمـەرەکـەب بگـیـرێ و

ڕووی بەتیرۆک مەرەکەبی لێ بدرێ و بەئەسفەلت و قەلفونی پشتیوانی بکرێ. لە دوای گەرمکردن و پشتی بەمیو گیران سارد بکرێتەوە و دیسان بخرێتە ژێر هێز و کۆشەوەی تیژاو.

لە دوای ئەوە کلێشە گەرم دەکرێ و بەپەڕۆیەک مەرەکەب و ئەسفەلت لە ڕووی کلێشە لادەبرێ و بەنەفت زۆر جوان خاوێن دەکرێ و بەپەڕۆیێکی خاوێن دەسترێ. ئەگەر لە خەت بەولاوە زیادێکی هەبێ، هەڵدەگیرێ و دیسان بەتیرۆک مەرەکەبی لێ دەدەرێ. بەڵام مەرەکەبێکی زۆر تەنک و جوانی لێ دەدرێت و ئەسفەلتی کوتراوی بەسەردا دەکرێ و بەبەراوەژوویی پێشوو دەخرێتە ژێر تیژاوەوە و لەپێشدا ٤ دەقیقە بۆ تیژاوی گران و ٨ لەهی نیونجی و ٢٤ دەقیقە لە سووکدا دادەندرێ. هەموو جارێ وەکو بێژرا مەرەکەب و ئەسفەلت و قەلفونی لێ دەدەرێ هەتا ئیشی تەواو دەبێ و کلێشە لە مەرەکەب و ئەسفەلت ڕزگار دەکرێ و کەنارێکی کە زیاد بێ بەمشار دەبڕێتەوە و بەچەکووچ و لەسەر سندان کلێشە لە تەختە گرێ دەدرێ و بۆ چاپکردن ئامادە دەبێ. کە کلێشەی نویسراو و کۆڵدراو ئامادە کرا، بۆ چاپکردن ساز دەکرێ؛ ئەوە بکڕ (مشتری) دڵخۆش دەکا.

٢٠- سندان و چەکوچ

## وێنەی سێبەردار بەترام لەسەر زەنگ

وەکو زانراوە کلێشەی بەسێبەرداری ترام دەخرێتە سەر پارچە زەنگ، جا لەو ٣ ڕێگایانەی کە گوتران، بەهەر کامێک بێ ساز دەکرێ و٢ دەقیقە دەخرێتە ژێر هێزی تیژاوی خوارەوە:

ئەسید نەتریک ٥ سانتیمەتر گرد.

ئاو ١٠٠ سانتیمەتر گرد.

لە پاشان دەردەخرێ و بەئاور گەرم دەکرێ.

لە دوای وشککردنەوە و ساردبوونەوە ٦ دەقیقە دەخرێتە ژێر کۆشەوەی هاتوو:

ئەسید نەتریک ٤ سانتیمەتر گرد.

ئاو ١٠٠ سانتیمەتر گرد.

لە دواییدا دەشۆردرێ و گەرم دەکرێ و سارد دەبێتەوە و ١٠ دەقیقە دەخرێتە تیژاوی خوارەوە:

ئەسید نەتریک ٦ سانتیمەتر گرد.

ئاو ١٠٠ سانتیمەتر گرد.

لە هەمووان‌دا وەکو لە وێنەی ١٩دا نیشاندرا، بەفلچە هێواشێک دەماڵدرێ تاکو تیژاو لە کار نەکەوێ کە ئەو کلێشەیە بەچاکی لە تیژاو کۆڵین ڕزگار کرا، بەمشار کەناری زیادە دەبڕدرێ و بەڕەندە ڕاست و جوان دەکرێ.

٢١- ڕەندە

بە ڕەندە کە کەناری ڕێکخرا بەبزمار لەسەر تەختە گرێ دەدرێ و بۆ چاپکردن ئامادە دەبێ.

## وێنەی سێبەردار بەترام لەسەر مس

هەروەکو لە پێشدا گوترا دیسان بەهەر کامێک لەو ٣ ڕێگایانەی هەستپێدران ساز بکرێ لە دوای گەرمکردن و پشت بەمێو گرتن سانیەیەک دەخرێتە تیژاوی هاتوو:

ئاو ١٠٠ سانتیمەتر گرد.

ئەسیدی هیدرۆکلۆریک ١٥ سانتیمەتر گرد.

لە دواییدا بەئاو دەشۆردرێت و گەرم و سارد دەکرێتەوە و چوار دەقیقە دەخرێتە تواوەوەی خوارەوە:

ئاو ١٠٠ سانتیمەتر گرد.

کلۆرینیریک ٣٥ سانتیمەتر گرد.

لە دوایی بەئاو و لە پاشان گەرم دەکرێ و دووبارە دەهاوێژرێتە نێو تیژاوی ئەسید هیدرۆکلۆریکی سەرەوە و نزیک سانیەیەک تێیدا دەمینێ و بەئاو دەشۆردرێ و گەرم و سارد دەکرێتەوە و ٢ دەقیقە دەخرێتە نێو تیژاوی کلۆریرفیرێکی کە لە سەرەوە گوترا، دووبارە دەشۆردرێ و دەخرێتە نێو تیژاوی هاتوو:

ئاو ١٠٠ سانتیمەتر گرد.

پۆرکلۆر دیفێر ٣٥ سانتیمەتر گرد.

لە دواییدا ٢ دەقیقە کە لە ژێر هێزی ئەو تیژاوە توندەدا ماوە، دەشۆردرێت و گەرم دەکرێ و دەخرێتەوە نێو تیژاوی کلۆرهیدرۆکی بێژراوەوە و ٢ دەقیقە کە مایەوە، دەشۆردرێ و هەروەکو گوترا دەخرێتە نێو تیژاوی پرکلۆردیفێرەوە و ٤ دەقیقە تێیدا دەمێنێت، کە تەماشا کرا نوختەکانی جوان دەرکەوتن کۆڵانی تەواو دەبێ.

## وەرگرتنی وێنەیێکی لەسەر مەعدەن بەترام کۆڵراوە

ئەو وێنەیە لەبەر ئێبجەگتیف ڕاناگیرێ و لەسەر هێندێک مێوی گەرمکراودا دەبەسترێ و لە بەرابەری ماشێنە ڕادەگیرێ و بۆ وێنە وەرگرتن بەدەستووری هاتوو ڕووناکی پێ دەدرێ:

تۆڕ لە شووشەی وێنە ۳و سێ تەقسیم چوار دیافراگم و ۱۷ ڕووناکی و ۲۵ سانیە.

تۆڕ لە شووشەی وێنە ۳و سێ تەقسیم چوار دیافراگم ۲۵ ڕووناکی ۲۰ سانیە.

تۆڕ لە شووشەی وێنە ۳و سێ تەقسیم چوار دیافراگم ۱۸ ڕووناکی ۳۰ سانیە.

لە دوای وشیاری و وردبینی شووشەی وێنەدار دەبێ زۆر سووک و لە هێنەردا کەم ڕابگیرێ.

## کۆڵانی پۆڵا

پۆڵا یان ئاسن پاک دەکرێتەوە و بەیەکێک لەو دەرمانانەی کە گوتران، هەستی پێ ئەدرێ. بەڵام چاکترین هەستی بەمەرەکەبە و بەتیژاوی هاتوو دەکۆڵرێ:

ئەسید نەتریک ٦٠ سانتیمەتر گرد.

ئەسیدی هیدرۆکلۆریک ۲۰ سانتیمەتر گرد

ئاو ۱۰ سانتیمەتر گرد.

هەر چۆنێکی لە کۆڵینی زەنگدا گوترا لە پۆڵا و ئاسنیشدا ئەوە دەکرێ؛ بەڵام لە تیژاودا جوێ دەبنەوە. لەبری هەست لەپێشدا دەنوسرێ و مێوی تواوەوەی بەسەردا دەکرێ و بەقەڵەم مێوەکە لەسەر خەت لادەبرێ و بەئەسید دەکۆڵرێ.

## کۆڵانی شووشە

شووشەیێکی بۆ کۆڵین ئامادە کرابێ، بەهەستی یەکەم و تواوەوەی سێیەم هەست دەدرێت و لە هێنەردا مەرەکەبی ئەستووری لێ دەدرێت و لەبری قەلفونیا، ئەسفەلت و مێوی وردی لێ ئەدرێ و لە دوای گەرمکردن، ۳ جار ئەسفەلتی پێدا دەکرێ و لە دواییدا دەخرێتە نێو تیژاوی هاتوو:

کبریتاتی باریۆم ٤ غرام.

ئەسید کبریتێکی توند ٤ غرام.

فلۆر کەلیسیۆمی ورد ٤ غرام.

ئەو کلێشەیە ١٢ سەعات لەژێر هێزی ئەو تیژاوەدا دەمینێ و هەردەمێ تواوەوە وشک بوو، بەسەریدا دەکرێ، هەتا خەت بەجوانی دەکۆلرێ.

## نویسینی زێر لەسەر پۆلا و ئاسن و شووشە

هەر کامێک لەوانە کە کۆلران دەرمانی هەستی لەسەر لانابرێ و تواوەی هاتوو بەسەر کۆلراوەکەدا دەکرێ:

کلۆر و زێڕ ١ غرام.

ئەتیر کبریتیک ١٠ غرام.

ئەو دووانە لەپێش ئیشا لەنێو شووشەیێکی دەم گیراوی شین یا سوورا ئامادە دەکرێ و لە چاخی پێویستا بەسەر جێگای کۆلینی یەکێک لەو سێ پارچانەدا بکرێ و چەند دەقیقەیەک لێ ڕادەوەسترێ. ئەتیر دەفڕێ و زێڕەکەش لەسەر جێگای کۆلراوەکە دەمینێ، مەرەکەبەکە لەسەر پارچە لادەبرێ و بەچتێکی لووس دەسووێرێتەوە.

## کۆلانی پارچە مسی گەورە بۆ دەرگاکان

هەر پیتێکی پێویستە لەسەر قاقەز دەنویسرێ یا ڕەسم دەکرێ و لەتە مسی پێویست لە پاش لووسکردن و مالین بەهەستی یێکەمین هەست دەدرێت و قاقەزەکە لەنێو چوارچێوە دادەندرێ و پارچە مسەکە دەخرێتە سەر دەرگای چوارچێوەکەو کە گرێدرا نیشان بەڕووناکی دەدرێ. هەروەکو لە پێشا گوترا لە پاشان بەئاو دەردەهێنرێ، کە لە پێشا بەتیرۆک مەرەکەبی لێ درا. ئەگەر لە دەرهێنەر درەنگ ئاشکەرابوو، دوو سێ تنۆک نۆشادر لە ئاو دەکرێ. کە دەرکەوت ئەسفەلتی وردی بەسەردا کراوە، ٤ دەقیقە لەژێر وردەیی ئەسفەلتدا دەمینێ و بەفلچەی نەرم خاوێن دەکرێ و لە پاش گەرمکردن دەخرێتە ژێر تیژاوی هاتووەوە:

ئەسید نەتریک ٢٠ سانتیمەتر گرد.

پرۆ کلۆر دیفێری دەرەجە ٣٦، ١٠٠ سانتیمەتر گرد.

چارێگە سەعاتێک لەژێر ئەو کۆشەوە توندەدا دەمینێ و لە دوای شووشتنەوە بەسمغی عەرەبی تەڕ دەکرێ و بەتیرۆک مەرەکەبی کە لێدرا ئەسفەلتی پێدا دەکرێ و لە دوای گەرمکردن و ساردبوونەوە، دەخرێتە ژێر تیژاوەوە هەتا دەگاتە دلخواز. بەو جۆرە لەتەکیا دەکۆشرێ و لە دواییدا تواوەوەی خوارەوە بەسەریدا دەکرێ:

ئیسپرتۆ ۱۰۰ سانتیمەتر گرد.

کۆمەلەکا ۱۵ غرام.

دووکەڵی نەوتی ڕەش ٦ غرام.

ئەوە لەپێشا ئامادە کراوە کە لە کوڵین تەواوبوو، ئەوەی بەسەرا دەکرێ و لە دوای گەرمکردن بەپەڕۆییێکی خاوێن، مەرەکەب و ئەسفەلتەی لەسەر لادەبرێ و نێو خەتەکە بەو تواوەوە ڕەش دەمێنێ.

## داڕژتنی زیو لەسەر هێندێک مەعدەن

ئەگەر حەز بکرێ هێندێک زیو بخرێتە سەر مەعدەنان، مەعدەنەکە خاوێن دەکرێ و پاک دەماڵدرێ و لە جێگاییێکی ڕاست دادەندرێ و تواوەوەی هاتووی بەسەرا دەکرێ:

سیانور دی پۆتاس ۱ غرام.

نەتەراتی داڕژان ۱ غرام.

کاربۆناتی سۆد ۱ غرام.

ئاوی دووبارە ۱۰۰ غرام.

ئەوەی بەسەرا کرا زیوەکە دەنیشێ و دەشۆرێ و دەسۆڕێ.

## پێکەوە نووساندنی کاشی شکاو

لە کارا گەلێ جار کاشی دەشکێ. بۆ ئەوەی پەک نەکەوێت، پارچەکان بەتێکەڵاوی هاتوو بچەسپێنە:

پەنیری سپی ۱ غرام.

سپێنەی هێلکە ۱ غرام.

قسڵی کوژاوەوە ۱ غرام.

ئەوانە هەرسێک لە هاوەنگدا دەکوترێن و دەبنە ماچووم. بەدەمی چەقۆ لە جێگا شکاوەکە دەدرێ و پێکەوە دەچەسپێ.

## دروستکردنی کاشی گەورە بۆ کار

لە ئیشی کوڵانا کاشی گەورە گەلێک پێویستە، ئەویش لە چینی و شووشە دەست ناکەوێ. لە تەنەکە یا لە تەختە لەسەر وێنەی دڵخواز دروست دەکرێ و هەموو دەورەیەکی

بەهیلم دەگیرێ و تواوەوەی هاتووی بۆ ساز دەکرێ، ئەویش لەپێش ٦ ڕۆژ بەکاربردنا:

قەتران ٢ غرام.

مێوی هەنگوین ٢ غرام.

کلۆرفۆرم ١ غرام.

تەربەتینا ٥ غرام.

لە دوای ئەوە کە تەختە بەرۆنی زەیتوون چەور کرا، ٤ یان ٥ جار بەوێرنیشە ڕووکێش دەکرێ و بۆ کار ساز دەبێ.

## دروستکردنی لوباز

## هێلمی ماسی تواوەوە

١٠٠ غرام هیلمی ماسی (جەلاتین) لە ١٠٠ غرام ئاوی گەرما دەتوێنرێتەوە و لەسەر ئاورێکی سووک دادەندرێ و بەدارێک لێک دەدرێ هەتا دەتوێتەوە. شووشەیێکی خاوێن لەنێو کاشییەکا ئامادە دەکرێ و ٢٢ غرام ئەسیدی نەتریک و پارچەیەک مەڕمەڕی ورد تێکەڵ بەهێلمەکە دەکرێ و پاش تێکەڵدان کە ئامادە کرا و هێلمە تواوەکە لەنێو ئەو کاشیەدا و لەنێو شووشەیێکی کە لە کاشیەکەدا داندراوە دەکرێ و ئەسید نەتریکی دەرژێنرێتە سەرێ و ئەو تواوەوە لە شووشەکەدا دەست بەکەف و کوڵێن دەکا و هەموو لە شووشە دەردەکەوێ (بنوارنە وێنەی ژمارە ٢٢ کە چۆن دەرژێتە نێو کاشییەوە).

٢٢- شووشە لۆباز

بەدار کەم کەمە لێک دەدرێ، هەتا ئەسید هەمووی دەفرێ و ئاوێکی زەرد لەنێو کاشیا دەمینێ. ئەوە لوباژوە یا هیلمە بۆ پێویست.

## ڕووکێشی مس

لە ئاوروپا بەتەواوی لە کلێشەیەک چەند دانەیێکی زیاد دەردەخرێ. هەروەکو ئەمڕۆ لە عێراقا چاومان پێ دەکەوێ کە لەسەر قاقەزی جگارە نویسراوێک هەیە یان ڕەسمێک چاپ کراوە، ئەگەرچی تەبەقەیەک قاقەزی گەورە لە ١٠٠ لاپەڕە زیاتر بەجارێک چاپ

دەکرێ و ١٠٠ کلێشە بەجارێک لەنێو چوارچێوەی ماشێنەی چاپ دادەندرێ و چاپ دەکرێ و هەمووانیش یەک جۆرن. ئەوەش لەپێشا کلێشەیەک یان بەزەنگ یان بەقەڵەم دەکۆڵرێ و لەو کلێشەیە قاڵب وەردەگیرێ و بەکارەبا لەو قاڵبە مسە ڕووکێش دەکرێ و بەبێ ژمارە چەندە پێویست بێ کلێشەی لێ وەردەگیرێ.

## قاڵب وەرگرتن

کلێشەی کۆڵراو لەنێو چوارچێوەیەک دادەندرێ و لەنێو چوارچێوەیێکی دیکەی مێوی تواوەوە ئامادە دەکرێ و بلۆمباجینی لێ دەدرێت و کلێشەی بەسەردا دەکرێ هەردوو چوارچێوە لە جەڕ و مەنگەنە دەدرێ. هەروەها هەتا بەهێندەی دڵخوازە، قالبی کلێشەکە دەخرێتە سەر مێو و بلۆمباجینی بەسەردا دەکرێ، بەڵام قالبی چوارچێوەکە مێوی تێدایە دەبێ مسی سوور بێ تاکو ئەلکتریک کاری لێ کا و شایانی ئیش بێ.

٢٣- بەتاریەی ئەلکتریک و تواوەوەی رووکێش

قالبی مێوە کە لە تێلی ڕاگر کە سەری لە تێلی کۆک گرێدراوە و بە«+» ئیشارەتی پێدراوە گرێ دەدرێ و پارچەیەک مس لە تێلی دیکە دەبەسترێ و سەری لە پارچەی توتیای بەتاریەکە گرێ دەدرێ کە بدەر (منفی)ی پێ دەڵێن. هەردوو پێکەوە دەخرێنە نێو تواوەوەی هاتوو و بەرابەر یەکتر ڕادەگیرێن هەروەکو لە وێنەی ژمارە ٢٣دا نیشاندراوە.

## تواوەوەی مس بۆ ڕووکێشی

مووروە شینە ١ غرام.

ئاوی دووبارە ٥ غرام.

ئەوانە دەتوێنرێنەوە و دەپاڵێورێن و هێندێک سیانۆر دەخرێتە سەری تاکو زۆر چاک خاوێن بێ و چەند تنۆک ئەسید کبریتێکی تێ دەکرێ تاکو ڕووکێش ورد و نەرم بێ.

ئەو تواوەوە هێزی ئەلکتریکی زۆر دەوێ و دەبێ لەباتی بەتاریەیەک، ٣ بەتاریە لە یەک گرێ بدرێ تا کاریگەر بێ.

## تواوەوەی دووەم بۆ ڕووکێشی

لە دوای تاقیکردنەوە تواوەوەی هاتوو چاکترە:

(مۆرووە شینە - خەڵاتی نوحاس ١ غرام.

توحت کاربۆناتی دیسود ١ غرام.

کبریتاتی دیسودی دووەم ١ غرام

سیانور دی پۆتاس ١ غرام.

ئاوی دووبارە ٥ غرام.

٢٤- هاوەنگ

مووروە شینە لە دوای وردکردن بەهاوەنگ دەکرێتە نێو کاشی ئیشەوە و هێندێک ئاوی تێ دەکرێ و دەتوێنرێتەوە و تەحت کاربۆناتی دیسودی دەهاوێژرێتە سەر و تێکەڵ دەدرێ، هەتا ڕەنگی ئاو سوور هەڵدەگەڕێ. کبریتاتی دووەمی دەخرێتە سەر و دەشڵەقێنرێ و ڕەنگی ئاو زەرد هەڵدەگەڕێ. ئەوجا ئاوێکی کە مابێ تێ دەکرێ و سیانوری پۆتاسی داوێژرێتە نێوی و ڕەنگی ئاو ڕوون و خاوێن هەڵدەگەڕێ. ئەگەر زەردی مابێ سیانوری بۆ زیاد دەکرێ، هەتا ئاوەکەی ڕوون دەبێتەوە و لە کارکردنا بەدارێک تواوەوە هەموو دەمێک دەشڵەقێنرێ.

## ڕووکێشی قەڵای بەمس

تواوەی یەکەم:

کبریتانی سودا ١٠٠ غرام.

سیانور پۆتاس ١٦٥ غرام.

ئاوی خاوێن ١٨ ئۆقە.

تواوەی دووەم:

مووروە شینە ١١٠ غرام.

ئاوی دووبارە ٢ ئۆقە.

تواوەوەی نۆشادر ٦٥ سانتیمەتر گرد.

ئەو دوو دەرمانانە هەریەک بەتەنها دەتاوێنرێنەوە، دووەم دەکرێتە سەر یەکەم و لێک دەدرێ و ئاوێکی ڕوون و خاوێن پەیدا دەبێ. ئەگەر ڕوون نەبوو سیانوری پۆتاسی تێ دەکرێ.

## ڕووکێشی توتیا بەمسی سوور

کبریتاتی مس (مۆرووە شین) ١ غرام.

ئاو ٥٠ غرام.

ئەسیدی نەتریک ٢ تنۆک.

بەشوڵکە شووشە تێکەڵ دەدرێت، هەتا هەموو دەتوێتەوە. پارچە توتیایەکە کە خاوێن کرایەوە دەمێک لەو دەرمانە هەڵکێشرێ و پەردەییێکی تەنکی لە مسی سوور دەکرێتە سەری.

## ڕووکێشیی بەمسی زەرد

هەرچیکو مسی زەردە لە مسی سوور و توتیا دروست کراوە؛ دەبێ تواوەوەی هاتووی بۆ ساز بکرێ:

تواوەوەی یەکەم:

کاربۆناتی مس و توتیا (٣٢) غرام.

ئاوی پاک ١٠٠ غرام.

تواوەوەی دووەم:

تەمت کاربۆناتی سوور ٢٨ غرام.

ئاو ٨٠٠ غرام.

ئەو دوو دەرمانە بەتەنها دەتاوێنرێنەوە و لە دواییدا تێکەڵ بەیەکتری دەکرێن. لە دوای چەند سەعاتێک حەوت ئۆقە ئاوی دەکرێتە سەر و تێکەڵ دەکرێ و ٧٥ سیانۆری دیپۆتاسی تێ دەکرێ. ئەمە لە ئۆقەیەک ئاوی گەرما دەتوێندرێتەوە و نیو درەم ئەسید زەرنیخۆسی دەکرێتێ و ڕەنگی ئاو ڕوون دەبێتەوە. ئەوە بۆ بەکاربردن ئامادە دەبێ و بەبەتاریەی ئەلکتریک ڕووکێشیی پێ دەکرێ. هەروەکو سەری تەختی نوستن و کلیۆنی دەرگاکانمان چاو پێ دەکەوێت، بەم جۆرە ڕووکێشن.

## دەرخستنی وێنەی وەکو یەک بەڕووکێشیی

هەروەکو لە پێشدا گوترا، هەر قاڵبێکی ئارەزوو بکرێ وەردەگیرێ و بەبلۆمباجین ڕەش دەکرێ و تێلی ڕاگری ئەلکتریک گرێ دەدەرێ کە بەکۆکەوە بەستراوە و لە بەرامبەر مێوەکە پارچەیەکی مس لە تێلی بدەر دەبەسترێ کە لە توتیای ئەلکتریک بەستراوە. هەردووکیان دەخرێنە نێو تواوەیەک کە بۆ ڕووکێشکردن کراوەتە نێو کاشییەوە هەروەکو لە وێنەی ژمارە ٢٣ نیشان دراوە. هەرچەندە پارچەی قاڵب و بدەر لێک نزیکتربن ئەلکتریک بەهێزتر کار دەکا.

تواوەی مس دەبێ هەمیشە تێر بێ و مووروە شینەی تێ بکرێ، هەتا بێ هێز نەمێنێ.

## ڕووکێشی گوڵ و گیانداران

گەلێک کەس حەز دەکەن قاڵۆچە و دووپشک و ئەو جۆرە گیاندارانە و گیاوگۆڵ ڕووکێش بکەن. بۆ ئەوەی ئەوانیش بەئارەزووی خۆیان شاد بن. ڕێگای هاتوو بگرن.

هێندێک مێوی هەنگوین لە بەنزیندا بتاوێنرێتەوە و بە٢٤ سەعات ئامادە بکرێ. ئەوەی ڕووکێشکردنی دڵخواز بێ، لەوە هەڵدەکێشرێ و بەزوویی دەردەخرێ و پەردەیەکی تەنکی مێو دەکەوێتە سەری. کەمێک لێی دەگەڕێی هەتا بەنزین دەفڕێ و مێو بەتەنها دەمینێ و وشک دەبێ و کەمێک تۆزی بلومباجینی بەسەرا دەڕژێ و لە تێلی ڕاگر دەبەسترێ. وەکو گوترا لەنێو تواوەوەی مس هەڵدەکێشرێ و بەکەم دەمێک کراسێکی تەنکی مس بەسەریا دەکێشرێ.

## ڕەنگگردنی توتیا

پارچەیەک زەنگ لە پێشا خاوێن دەشۆرێ و لە پاش وشکبوون و گەرمکردن لە تواوەوەی هاتوو هەڵدەکێشرێ:

هیپۆسلفیت دیسود ١٠٠ غرام.

ئەسیدی سولفۆریک ٣٠ غرام.

ئاوی دووبارە ١٠٠٠ غرام.

کە لەوە کێشرا ڕەنگی توتیا شین دەکا.

## ڕەنگی توتیا بەبنەوشەیی

ترتریتی مس (١٠) غرام.

سود کوستیک ٢ غرام.

ئاوی دووبارە ١٥٠ غرام.

## ڕەنگی ڕەش

کوریت و پۆتاس و کبریتات لەنێو ئاودا دەتاوێنرێنەوە و هەر یەک بەهێندەی یەکتر بێت توتیای تێ هەڵدەکێشرێ.

## دروستکردنی مەرەکەبی لیتۆغرافی

چونکە لە هەموو کردەوەیەکی زەنگوغرافیدا ئەو مەرەکەبە بەکار دەبرێ و مەرەکەبێکی بەتیرۆک لە ڕووی کلێشە دەدرێ، مەرەکەبی لیتوغرافییە و بۆ نوسین و چاپ لەسەر بەرد بەکار دەبرێ. بەپێویستم زانی ئەوەش لەم کتێبەدا بخەمە بەرچاوان تاکو ئارەزوومەندان لە پیشەی کۆڵین نەزان نەبن.

مەرەکەب دوو جۆرن: یەکێک ڕۆن [تەڕ] و دووەم وشکە. هەرچێکو مەرەکەبی تەڕە لە کلێشەی مەرەکەب لێدانا بەکار دەبەن و مەرەکەبی وشک لەسەر قاقەزی لیتۆغراف هەر نویسراوە و وێنەیێکی دڵخواز بێت لەسەری دەنوبسن و دەیخەنە سەر چینکۆ و بەتیژاو دەکۆڵن.

١- دروستکردنی مەرەکەبی تەڕ:

مێوی هەنگوینی سپی ٢ غرام.

قشرلەک ٢ غرام.

سابوونی ڕەقی حەلەبی (١) غرام.

کاربۆناتی سۆدا ٠,٢٥ غرام.

پیوی ڕەشەوڵاغ ٠,٥ غرام.

ڕەشی پاریزیانی کوتراو ١ غرام.

ئەم هەمووانە دەکوترێن و تێکەڵ بەیەکتر دەبن و بەتەربەنتین نەرم دەکرێت و بەکار دەبرێت.

٢- دروستکردنی مەرەکەبی وشک:

مێوی هەنگوینی سپی ٣ غرام.

سابوونی ڕەقی ٢ غرام.

قشرلەک ١ غرام.

مەستەکی ٠,٥ غرام.

پیوی ڕەشەوڵاغ ١ غرام.

ڕۆنی کونی بەراز یا بزن ٠,٥ غرام.

تەربەنتینای توند ٠,٢٥ غرام.

کاربۆناتی سود ٠,٢٥ غرام.

ڕەشی پاریزیان ١,٥ غرام.

ئەوانە کە تێکەڵ بەیەکتر کران لەسەر ئاور دادەندرێت و دەکوڵێ، هەتا نزیک تواوەوە دەبێ. ئاوری بۆ خۆش دەکرێ هەتا بەچاکی دەسووتێ. ئەوە دەبێتە مەرەکەبی وشک و لەوە قەڵەم دروست دەکرێ و لە ئاودا دەتوێنرێتەوە، کە کەمێک گەرم بکرێ بەو مەرەکەبە لەسەر قاقەزی لیتۆغراف دەنویسرێ و دەخرێتە سەر زەنگ. بەهەوری تەڕ و بەسمغی عەرەبی ڕووی زەنگ تەڕ دەکرێ و بەتیرۆک مەرەکەبی تەڕی لێ دەدرێ و بەئاو دەشۆرێ و وشک دەکرێ و ئەسفەلت و قەلفونیای کوتراوی بەسەرادا ئەکرێ. لە دوای گەرمکردن و ساردبوونەوە دەخرێتە ژێر هێزی تیژاو و دەکوڵێ.

## دروستکردنی قاقەزی لیتۆغرافی

لە پێشا قاقەزێکی سواوەوەی لووسی تەنک ئامادە دەکرێ و بەتواوەوەی هاتوو ڕووی قاقەزەکە چەور دەکرێت و:

کاربۆناتی قورقوشمی پاک ١ غرام.

هیلمی ماسی تواو(جەلاتین) ١ غرام.

ئەوانە لەسەر ئاور دادەندرێن و بەکەمێک کەمبوج ڕەنگ دەکرێ و بەقاقەزی مژۆک (ترشیح) دەپاڵێورێ و بەفرچەیێکی نەرم ڕووی قاقەزەکە تەڕ دەکرێ. بەڵام دەبێ زۆر چاک تێهەڵسووڕێ و بۆ نویسین ساز دەبێ.

## وێنە نوسین و خستنە سەر زەنگ

بەمەرەکەبی وشک هەر وێنەیێکی دڵخواز بێت بەقەڵەم لەسەر قاقەزی لیتۆغراف دەنوسرێ. لە پاش وشکبوونەوە ئەو قاقەزە دەخرێتە نێو دوو قاقەزی تەڕەوە. پارچە زەنگ گەرم دەکرێ و قاقەزی لیتۆغراف بەئەسپایی لەنێو دوو قاقەزەکە دەردەخرێ و ڕووی نویسراوی لەسەر زەنگ دادەندرێ و دەخرێتە نێو جەڕ و مەنگەنە و قاقەزی تەڕی لەسەر دادەنرێ و جەڕەکە بادەدرێ. هەر بەو جۆرە بەکار دەبرێ، هەتا نویسراو دەکەوێتە سەر زەنگ و بەئەسپایی قاقەز هەڵدەگیرێ و تەماشا دەکرێ کە نویسراو بەچاکی کەوتۆتە سەر زەنگ. بەتواوەی سمغ تەڕ دەکرێ و بەتیرۆک مەرەکەبی لێ دەدرێ و بۆ کۆڵان ساز دەبێ.

## کۆڵین بەدەستووری لیتۆغراف

### ١- نویسینی سادە

کەمێک جەلاتین لەنێو ئاوی دووبارە دەتوێنرێتەوە و کراسێکی سووک دەخرێتە سەر پارچەی زەنگ هەتا وشک دەبێتەوە و دادەنرێ. کەمێک زاخی سپی لەنێو ئاودا دەتوێنرێ و پشتی قاقەزێکی وێنە یا نویسراوی لەسەر بێ بەزاخاو تەڕ دەکرێ و ڕووی نویسراو دەخرێتە سەر زەنگ و قاقەزێکی دیکە بەزاخاو تەڕکراوی لەپشت قاقەزی نویسراو دادەندرێ و دەخرێتە نێو جەڕ و مەنگە و با دەدرێ. زاخاو لەنێو نویسراو کار ناکات و جێگای بێ زاخ دەخووسێ و زاخ دەکەوێتە سەر جەلاتین و جەلاتینەکە دەڕزێنێ. لە پاشان لە جەڕ و مەنگە دەردەخرێ و بەئاوزەنگ خاوێن دەکرێ، هەر جێگایێکی نویسراوی لەسەر نەبووبێ، جەلاتینەکەی لەسەر هەڵدەستێ. لە دوای ئەوە کە بەتەنها نویسراو لەسەر زەنگ مایەوە، ڕووی زەنگ بەسمغی عەرەبی تەڕ دەکرێ و بەتیرۆک مەرەکەبی لێ دەدرێ و بەئەسفەلت و قەلفونیا کۆمەگی دەکرێ و لە دوای گەرمی و ساردبوونەوە دەکۆڵرێ.

ئەوە بۆ کاریگەری وێنە و نویسین و کۆڵان گەلێک ئاسانی و تەڕدەستی تێدایە و بێ مەسرەف و ئەزیەتە.

## فۆتۆلیتۆغرافی

پارچە قاقەزێکی لیتۆغرافی ئامادە بکرێ و ڕووی لووسی بەنیشاستە چەور بکرێ، ئەویش لەپێش نیشاستە لەسەر ئاور دەتاوێنرێ و دەکرێتە نێو کاشییەکی چوارگۆشەی گەورەوە. بەدەست زۆر بەئەسپایی قاقەزەکەی لەسەر پان دەکرێتەوە، بەڵام دەبێ

بەدەستووریٚ کە لە ویٚنەی ژمارە ٢٥دا نیشان درا بەکار ببریٚ. لە پاشان لە گۆشەییٚکەوە قاقەز هەڵدەگیریٚ و پشتی قاقەز لەسەر مژۆک دادەندریٚ هەتا وشک دەبیٚ.

٢٥- کاشی و قاقەز تیٚهەڵکیٚشان

ئەو قاقەزە لە ژووری تاریکا بەتواوەوەی بیکرۆماتی پۆتاس هەستی پیٚ دەدریٚ و وشک دەکریٚ و لە پشت شووشەی ویٚنە دادەندریٚ و نیشان بەهەتاو ئەدریٚ، هەتا ویٚنەییٚکی قاوەیی دەکەویٚتە سەری، بەئاو دەردەهیٚنریٚ.

ئەگەر ڕەسمەکە زوو ئاشکەرا نەبوو، لە بری ئاوی سارد ئاوی گەرم بەکار دەبریٚ لە دوای ئەوە قاقەزەکە لەسەر شووشە پان دەکریٚ، هەتا وشک دەبیٚ.

کە قاقەز وشک بووەوە بەمەستەکییەکی کە لە ئەلکولا تواندراوە بەسەر ڕووی قاقەزەکەدا دەکریٚ. لە دوای وشکبوونەوە، بەمەرەکەب و تیرۆک ڕووی قاقەزەکە ڕەش دەکریٚ. مەرەکەب لە نوختەی نوسراو و ویٚنە بەولاوە جیٚگای بەتاڵ ناکریٚ. ئەگەر دەجیٚگای بەتاڵ کەوتبیٚ بەهەوری تەڕ لادەبریٚ.

ئەوە بەچاکی کە دەست خرا بەدەستووریٚ کە لە پیٚشا گوترا قاقەزەکەی دەخریٚتە سەر زەنگ و پشتی تەڕ دەکریٚ و زەنگ کەمیٚک گەرم دەکریٚ و لە جەڕ و مەنگەنەدا دەخریٚتە سەر زەنگ. هەروەکو لە پیٚشەوە گوترا.

ئەگەر ویٚنە کەوتە سەر زەنگ بەدەستووری زاندراو مەرەکەبی لیٚ ئەدریٚ و ئەسفەلت و قەلفونیای بەسەرا دەڕژیٚ و لە دوای گەرمی و ساردبوونەوە دەکۆڵدریٚ.

کاروپیشەی ویٚنەگەری و کۆڵان بەدووروودریٚژی تەواو کرا. بەپشتیوانی یەزدانی پاک هەرچییەکی لەو فەننەدا پیٚویست و بەکار بوو گوترا و دوایی پیٚ درا. لەبەرئەوە کە هیٚندیٚک گەورە و خاوەن هەوەس ئارەزووی فیٚربوونی پیشەی جوان جوانیان هەیە، ئەم دوو سیٚ چتە جوانانەی هاتووم کردە دوامینی ئەم پەڕاوییە هەتاکو فیٚری بن.

١- ویٚنەی شین لەسەر قاقەز:

پرۆسیاتی پۆتاسی سوور ١٢ قمحە.

ئاوی پالاوتوو ١٦ درەم.
ئەو دەرمانە لەنێو شووشەیەکدا کە تواندرایەوە هەڵدەگیرێ.
ستراتی ئاسنی نۆشادری ١٤٠ قمحە. ئاوی پالاوتوو ١٦ درەم.
ئەو دووانە لە پاش سازکردن ئامادە دەکرێن و قاقەزی پێ ڕەنگ دەکرێ و لە چاخی چاپدا دەخرێتە بەر ڕۆژ و بەئاو دەشۆردرێ.

٢- وێنەی شینی ئاسمانی لەسەر قاقەز:
فیری سیانور دیپۆتاسی سوور ٢ غرام.
ئاوی خاوێن ١٥ غرام.
ئەوانە بەتەنها دەتوێنرێنەوە و هی هاتووی بۆ ساز دەکرێ:
(سترات دی فیری ئامۆنیا کال (٢) غرام.
ئاوی پاک ١٥ غرام.
وەکو لە سەرەوە گوترا قاقەز ئامادە دەکرێ و ئەو دوو تواوە تێکەڵ بەیەک دەبێ و ڕووی قاقەزی پێ ڕەنگ دەکرێ و لەبەر هەتاو دادەندرێ و لە ٨ دەقیقە بەرەو ژوورتر لە پێش هەتاو ڕادەگیرێ و بەئاو دەردەخرێ.

٣- وێنەی سوور لەسەر قاقەز:
کبریتاتی باریوم ٢ غرام. سمغی عەرەبی ٢ غرام. ئاوی پاک ٣٠ غرام.
ئەو دەرمانانە لە ڕووی قاقەز دەدرێ و لە ژووری تاریکا وشک دەکرێ. لەبەر هەتاو کە داندرا دەبرێتە ژوورەوە.، هەور (ئیسفەنج) بەتواوەوەی هاتوو تەڕ دەکرێ و لە ڕووی قاقەز ئەدرێ:
فیری سیانوری دیپۆتاسی سوور ١,٥ غرام.
ئاوی پاک ٣٠ غرام.

٤- وێنەی سەوز لەسەر قاقەز:
وێنەی سوور وەکو گوترا کە خرایە سەر قاقەز وشک دەبێ و دەخرێتە نێو دەرمانی خوارەوە و ڕەنگی سەوز دەبێ:
سکویت کلۆریدی ئاسن ٣٠ غرام.
ئاوی خاوێن ١٤ غرام.

٥- وێنەی بنەوشەیی لەسەر قاقەز:

(کلۆروری زێڕ (٢) قمحه.

ئاوی دووباره ١٦ قمحه.

قاقەز ٤ دەقیقە لەسەری دادەندرێ و لە دوای وشکبوون، ١٥ دەقیقە لەبەر هەتاو دادەندرێ. بەئاو و لە پاشان بەئاوی کلۆرۆریتە وشک دەبێ.

## وێنە لەسەر قاقەزی پرۆمۆری ڕەنگی قاهوەیی

ئاوی پاک ١٠٠ غرام.

هیپوسلفیت دیسود ١٠ غرام.

لەسەر ئاور گەرم دەکرێ و وێنەکەی دەخرێتە نێو و دەشڵەقێندرێ، هەتا ڕەنگی دەگاتە دڵخواز، دەردەخرێ و بەئاوی خاوێن دەشۆردرێتەوە.

١- بۆ چەند چتێکی بەکار:

کونکردنی شووشە: هێندێک کەس دەیەوێ شووشەیێک کون بکا و زۆری پێویستە، بەدەستووری خوارەوە دەگاتە ئارەزووی:

(تەربەنتین (٢٠) غرام، ئوکسلاتی پۆتاس ٤١ غرام.

سییری سپی کراوی کوتراو ٢ غرام.

ئەوانە دەخرێنە نێو شووشەیەکەوە و زاری توند دەگرن هەتا ٨ ڕۆژ. لە دوای ئەوە تواوەوەی هاتووشی بۆ ساز دەکرێ:

کافور هیندیک، تەربەنتین هیندیک.

ئەوەش کە ئامادە کرا لە تواوەوەی سەرەوە تنۆکێک و لە هی دووەم تنۆکێک دەخرێتە سەر ئەو جێگایەی کە کونکردنی دڵخوازە بەمیتکەب کە دار و ئاسنی پێ دەسمن لەسەرخۆ دەست بەکونکردنی دەکەن. وەکو دارێک یا ئاسنێک زۆر بەئاسانی کون دەبێ.

٢- دوو پارچە ئاسن یا مس پێکەوە نووساندن:

گەلێک لە پیشەگەرەکان دەیانەوێ دوو پارچە مس یا ئاسن یا تۆتیا یا پارچە ئاسنێک و مسێک پێکەوە بنووسێنن، تواوەی هاتوو بەکار ببەن دەگەنە دڵخوازیان:

تەربەنتین ١ غرام.

کۆمەڵەکای کوتراو ٢ غرام.
جەلاتینی تواوەوەی لە ئاوا (٢) غرام.
ئیسپرتۆ ١ غرام.
لاستیک (جیڕ) ٢ غرام.
لەنێو شووشەییێکی زار توندا هەڵدەگیرێ بۆ دەمی پێویست.

٣- تێکەڵی جیوە:
(ئاوی خاوێن ١٠٠٠ غرام.
ئەسید کبریتیکی گران ٢٠ غرام.
نەتەراتی دووەم ئۆکسیدی جیوەی تواوە و نەتەراتی زیو.
هێندێک زیو لەنێو پیاڵەیەکی چینیدا لەگەڵ کەمێک ئەسیدی نەتریک دەخرێتە سەر ئاورێکی سووک هەتا ئەسید دەفڕێ. لە پاشان چەند تنۆک ئەسید کبریتیکی دەخرێتە سەرێ هەتا وەکو شووشەی لێ دێ و دەبێتە بەردی جەهەننەم (نەتەرات داڕژان).

٢- ئاوێنە دروستکردن:
پیشەی ئاوێنەگەری زۆر بەسوود و کارە. لە ئەورووپا دەورێکی گەورەی وەرگرتووە و خاوەند ئارەزووەکان دەتوانن بەبێ ئەزیەت لەسەر دەستووری هاتوو ئاوێنەی زۆر چاک و خاوێن دروست بکەن و بیکەن بەپیشە و پێ بەڕێ بچن:
أ-
نەتەراتی داڕژان ٦,٥ غرام.
ئاوی دووبارە لە کیلۆیەک هێندێک.
نەتەرات داڕژانەکە لەنێو هێندێک ئاوی دووبارەدا دەتوێنرێتەوە و دوو سێ تنۆک ئامۆنیاک (نۆشادری تواوە)ی تێ دەکرێت، ئەو تواوە کەمێک ڕەنگی دەگۆڕدرێ. کە کەمێک تێکەڵ کرا دوو سێ تنۆک ئامۆنیاکی تێ دەکرێ، هەتا ڕوون دەبێتەوە.
ب-
سود کوستیک ٥ غرام.
لە ئاوی دووبارەکەی کیلۆکە کەمێک.

سود کوستیک لەنێو کەمێکی دیکەی ئەو کیلۆ ئاوە دەتاوێنرێتەزە و لە پاشان تواوەوەی «أ»ی دەخرێتە سەری و تێکەڵ دەدرێ، دیسان ڕەنگی تێکدەچێ و چەند تنۆکێکی دیکەشی ئامۆنیاک دەکرێتە سەر و تێکەڵ دەدرێت. هەتا ڕەنگی دەگەڕێتەوە سەر خۆی. کە هەردوو تواوەکە لێکدران و ڕەنگیان بەئامۆنیاک گەڕاوە و جوان بوو، دەکرێتە نێو شووشەییێکی خاوێنی زار توندەوە.

ج-

قەندی شەکر ٤٠ غرام.

ئاوی لە کیلۆکە ١٠٠ غرام.

ئەسید سلفریک ٤٠ غرام.

لە پێشدا ئاوەکە لەسەر ئاوردا دادەندرێ و قەندەکەی لەنێوانیدا دەتاوێندرێتەوە و لە دواییدا دادەگیرێ و لێی دەگەڕێت هەتا سارد دەبێتەوە. لە پاشان تنۆکە تنۆک ئەسید سلفریکەکەی تێ دەکرێ و تێکەڵ دەدرێ هەتا هەمووی لێک دەدرێ، کە ئەوەی تەواو کرد لەسەر ئاورێکی سووک دادەنرێ و کەم کەمە دەکوڵێ و دەهێنرێتە خوارێ هەتا سارد دەبێتەوە و دەکرێتە نێو شووشەییێکی بەتایبەتی و بۆ دەمی پێویست ئامادەی بەکاربردن بێ.

شووشەییێکی بۆ کردنە ئاوێنە وەکو لە بابەت دارژتنی کۆلۆدیونەوە گوترا ساز دەکرێ و بەپانی کە لەسەر جێگاییێکی ڕاست دانرا لە تواوەی هاتووی «د» دەکرێتە سەر.

د-

لە تواوەی أ و ب ١٠٠ غرام.

لە تواوەی ج ٣٠ غرام.

ئەو دووانە کە تێکەڵ یەکتر کران دەبێ دەسبەجێ بکرێتە سەر ئەو شووشەی کە بۆ ئاوێنە سازکراوە و هەتا هەموو ڕووی شووشە دەگیرێ و کە شووشەکە گەورە بوو تواوەوە فرەتر دەکرێ و دادەڕژێتە سەر شووشەکە.

لە پاش چەندێک تەماشا دەکرێ زیو بەرێکی نیشتۆتە سەر شووشەکە. بەهێواشییێک ئاوەکەی دەکرێتە نێو شووشەیەکەوە و بۆ چاخێک هەڵدەگیرێ. شووشەی ئاوێنە هەڵدەپەسێررێتە چتێک هەتا وشک دەبێتەوە. لە پاشان بەفرچە وێرنیشی لە پشت دەدرێ و لە چوارچێوە دەگیرێت.

## لێ وردبوونەوە

لەم کتێبە (پەڕاوییە)دا نێوی هێندێک بەردی تەرازوو بەزیانی فرەنگستانە. بۆ ئەوەی ئاگاداری پەیدا بکرێ و خوێندەواران تێدا دانەمێنن، لەسەر دەستووری بەکاربردن لە خوارەوە نیشان دەدرێت:

| ناو | غرام | درهەم |
|---|---|---|
| جالون | | ١٣٦٣ |
| ڕەتڵ | ٢٥٦٢ ٢/٣ | ٨٠٠ |
| ئۆقیە | ٢١٣ ٢/٣ | ٦٦ ٢/٣ |
| ئۆقە | ١٢٨١ ١/٣ | ٤٠٠ |
| درهەم | ٣ ٨/٣٩ | ١ |
| قمحە | ١/٢٧ | |
| کیلۆغرام | ١٠٠٠ | ٣١٢ |
| ئۆقیەی توبییە | ٣٧ ٦٠/١١٠ | ٨ |
| لیبرە | ٤٤٨ | ١٤٠ |
| سەنتیگرام | ١/١٠٠ | ١/٣٠٢ |
| پنت | ٥٤٤ | ١٧٠ |
| میکتۆلیتر | ١٠٠ لیتر | |

لیترە ١٠٠ مەتر گرد (مکعب) بەپێوان.

# مێژووی
# دوو ساڵەی کوردستانی جنووبی

لە نویسراوان: ژۆناڵ سێزاڵی ئینگلیزی لە ساڵی ١٩٢٨ فۆرم ٣ چاپ کراوە
لە دوقتور: ج. م. لیز

لە کتێبی م. س. د. ف. س
لە ئینگلیزییەوە کراوە بەکوردی بەدەستی نویسراو
مودیری مەتبەعە و مەجەللەی زاری کرمانجی لە ڕواندز

**س . ح . حوسێن داماو موکریانی**

٢٢ جیمادی یەکی ساڵی ١٣٤٧هـ. ٦ تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٢٨م. وەرگێڕدراوە بەکوردی

# پێشەنگ

لەبەرئەمەی کە میللەتی نەجیب و ئازای کورد، لە ئەفکاری پیشووی یاریدەدەرەکەمان ئاگادار نین، وە چەند مەسئەلەیێکی موهیم رووی دابوو، هەموو بیر تیژەکانی کورد تێدا واق مابوون، بلێندبوونی شێخ مەحموود و شەڕکردنی لەگەڵ دەوڵەتی بەریتانی لەبەرچی بوو. تەرغیب و تەرویجی نوبسراوی کوردی و جەریدە بەزبانی میللەت چی هەوێنێک بوو نەدەزاندرا. وە گەلێک کار و بزووتنێکی کورد و ئینگلیز هەبوون، ئاشکرا نەبوون. بەڵام ئەم ئەسەرە چاکەی «دوقتور لیز»ە کە نائیب حاکمی سیاسی بوو لە هەڵەبجە و گەلێک بۆ قەزیبەی کوردستان و ئامالی کوردان کۆشابوو وە لەگەڵ کورد بەتەواوی تێکەڵی هەبوو، بەڕاستی زۆریشی حەق خستبووە سەر کوردان، فەزڵ و هونەری میجێر سۆن - کە دە پازدە ساڵ لە کوردستاندا بەجلی کوردەوارییەوە مابووەوە و لە پاشان بوو بەحاکمی سیاسی کوردستانی جنووبی - پیاوەتی و ئەفکاری ئەو گەورە تێگەیشتووەی لە بابەت کوردستانەوە بەیان کردووە. وە چەند ماددەیەکی سیاسی - کە ئێمەی کورد تێی نەگەیشتبووین - ئاشکرای کردووە. جا من لەوانەم بیرکردەوە و بە واجیب و فەریزەی زەمتی کوردییەتی خۆزانی کە لە ئینگلیزییەوە وەریگێڕمە کوردی. تاکوو لە هەموو کوردێک ئاشکرا بێ کە میجێر سۆن و دوقتور لیز چەندە بۆ وەتەنی خۆشەویستمان کۆشاون و چەندە حەزیان لە بلێندی و بەرزی و ئازادی کوردستان و سەربەخۆیی کوردان کردووە. بەخوسووس دوقتور لیز زۆر خۆشی لە جاف و بەگزادە هاتووە و گەلێک بۆ پێشکەوتن و ئازادی و مەنفەعەتی جافی گەلێک تەقالای داوە و هەروەکوو لە گەلێک جێگای ئەم سیپارەدا بەچاکی باسیان دەکا.

چەند نوکتەیێکی زۆر گەورە لەم ئەسەرەدایە کە ئەو زاتە خرِی کردوونەوە، وە زۆر جار زانا و تێگەیشتووەکانی کورد، تێدا سەرگەردان ببوون، وە چەند چاولێخشاندنێکی مەسائیلی دیکەش هەن کە لەمەدا ئیستیفادەیەکی ماددی و مەعنەوی لێ بکەین.

مودیری مەتبەعە و مەجەللەی زاری کرمانجی لە ڕواندز

س. ح. حوسێن حوزنی موکریانی

# دوو ساڵ لە کوردستانی جنوبیدا

لە دوقتور ج. م. لیز لە کتێبی س. د. ف. س دا دەڵێت: زۆر شت هەنە کە بلێیم، بەڵام ئەمەندە دەڵێم کە کوردستان موڵکێکە بە قەومێکی سەرکێش و مەغروور ئاواکراوە، لە مودەتێکی گەلێک زۆری وا کە نایێتە زانین لەگەڵ عەرەب شەڕدەکەن.

کوردستانێک کە خاکی کوردانە و کوردستانی پێ دەڵێن، حودوودی ئەو کوردستانە بەسەرخاکی تورک و ئێران و عێراق دابەش دەکرێ.

بەڕاستی عەشیرەتێکی زۆری ڕەوەندن؛ لە وەختی زستاندا دێنە خاکی عێراق و لە هاویندا دەچنە خاکی ئێران. چونکو ئاوی سارد و گیای زۆر و لەوەڕی چاکی هەیە.

تاکوو ئێران و تورک لەگەڵ ئێمە دۆست بن و بەخۆشی ڕابوێرن، زەرەرێک بە ئێمە نادرێ؛ بەشەرتێکی هەر میللەتێک لە ژێر ئەمری خۆیاندا ڕابگیرێن و عادات و ڕەوشت و خوویان لێ تێک نەدرێ. ئەگەر تورک وەیا ئێران کوردەکان بکەنە تەرەفداری خۆیان، بۆ عێراق چاک نییە و گەلێک زەرەر و خەتەرە. جارێکی کە عەراقمان بەردا، لەبەر عەشیرەتێکی کوردی ئێران بوو هەڵمەتیانداینیە نییە و لنگیان دا سەرمان؛ دووەم لەبەر ئەمە بوو کە تورک خۆیان خستە نێو کوردانەوە و ئێمەیان دەرکرد.

کە سەفەر بەرەو حەربی عموومی دەست پێکرا، ئێمە تەمامان بوو کە کوردستان بخەینە دەست خۆمان؛ بەڵام چەند زابتێکی ئێمە نەیانهێشت کوردەکان بێنینە ژێر پەنجەوە.

ئێمە لەبەر چەند چتێکی پێویست دەمانەویست کە کوردستان بکەینە حکوومەتێکی (بافەر) نیوە ئازادێکی چاک، بۆ ئەمە کە پێش بەحکوومەتەکانی دەوروپشت بگرێ. بهێنینەجێ. وە بۆ ئەوە کە لەشکر لەوان بگیرێ و مەشقیان پێ بکرێ، ئێمە چەند زابتێکی خۆمانیان بۆ بنێرین بۆ ئەوە کە بگەینە دڵخوازمان، بێجگە لەمە کە حکوومەتێک دروست کەین هەر چەندە کۆشاین ڕێگاییێکی دیکەمان دەست نەکەوت بەناچاری ئەوەمان کرد. بۆ بەجێ هێنانی ئەو فیکرە کەسێکی لە کوردستاندا قابیلیەتی ئەوەی بووبێ کە بکرێتە حوکمدارو ئەو فیکرە کۆمەگی بکا، شێخ مەحموود کوڕی شێخ سەعید بوو. ئێمەش لەبەر ئەوانە شێخ مەحموودمان کردە حاکم و ناومان لێی نا حوکمدار

و مەعاشێکی زۆریشمان بۆ بڕییەوە.

میجێرنوێل لەگەڵ چەند ئەفسەرێکی دیکەی بەریتانی بۆ ئەوەی کە لە کاروباری سیاسی و موڵکیدا بن، ناردرانە سلێمانی.

چونکە ئێمە لەگەڵ شێخ مەحموود لە مەنفەعەتدا موافیق ببووین، هیچ ترسی ئەوەمان نەبوو کە لە تەکمانا خیانەت بکا. وە لەبەر ئەوە کە ئێمە و ئەو ڕێک کەوتبووین لە امیددا خیانەتی ئەومان بیر نەدەکرد. بەهەموو جۆرێک بۆ گەورە بوونی کۆشاین و بەئازادی و سەربەستی خۆشەویستیمان کرد. وەپووڵێکی کە وەری دەگرت، کردمانە سەرپشک هەر جۆرێک دڵخوازی بێ، ئازادە لە خەرج کردنیدا.

شێخ مەحموود چونکە بە ناکاو دەوڵەمەند بوو و دراوێکی زۆری دەست کەوت، خودسەری و مەغرووری پەیدا کرد. ئەوە بوو بە سەبەبی خۆی لێ گۆڕانی شێخ مەحموود. پەردەی دەماغی تەوانایی ڕاگرتنی پەروانەی هەواڵی نەبوو، بەلەز دەستی بەفڕین کرد و خۆی پێ ڕانەگیرا. لە خەیاڵی خۆیدا وای لێک دابۆوە کە بۆتە حوکمداری کوردستانی موتەحید «یەکیەتی» هەموو کوردستان رەعیەتە و ئەویش پادشاییێکی موستەقیلە.

چەند مانگێکی پێ نەچوو کە کۆمەڵەییێکی زل لە زابتانی تورک چوونە کن شێخ مەحموود. لە دەوروپشتی کۆبوونەوە. ئەویش ئەوانی لە وەزیفاتی حکوومەتدا دامەزراند، لەنێو نیە دەوائیراندا جێگیری کردن. وەلە نێو عەسکەری لیڤی کە لە ژێر فەرماندەی (فەرمانی) زابتانی ئینگلیزیشدا بوون، کردینە مەئموور.

ئەو زابتانە لەگەڵ شێخ مەحموود سوێندیان بۆ یەک خواردبوو کە پێکەوە بکۆشن هەتا حکوومەتی بریتانیا لەنێو لادەبەن.

وابوو کە شێخ مەحموود لە نێو هەموو کوردستاندا خۆشەویست بێ، لەبەر زوڵم و ئەزییەت و ئیستبدادی هەموو کوردستان نەفرەتیان لێ دەکرد؛ بێجگە لە چەند کەسێکی - کە نۆکەری بوون - کەسێکی دیکە حەزیان لێی نەدەکرد. لەگەڵ ئەوەش هەمووکەس لێی دەترسان. لەبەر ئەزییەت و ئازاری نەیاندەتوانی لێی جویێ بنەوە. هەمیشە نفووسی دەرەوەی و قسەی ڕەوابوو.

شێخ مەحموود چونکە لە بنەماڵەی بەرزەنجیان بوو، هەموو کوردێکیش وابەستەی بوون، بەو موناسەبەتەوە ببوە سەردارێکی گەورە و کوردیش هەموویان لەدیندا نەپژاون و پوختە نین و گەلێک سادە زوو خەڵەتاو و فریوخۆرن. هەرکەسێک بێت و بڵێ من شێخم، زوو باوەڕی پێ دەکەن و خۆی لە دەست دەنێن.

شێخ مەحموود ئەو پیاوانەی لە ژێر فەرماندەیدا بوون، هەموو نۆکەری جووت بەندەی خۆی و خزمانی بوون. بەڵام عەشیرەتە ڕەوەندەکان بەهێندیان نەدەزانی نەدەکەوتنە ژێر فەرمانیەوە و حەزیشیان بەبڵندبوونی نەدەکرد. شێخ مەحموود لەوە ئاگاداری کە پەیدا کرد، وە تێگەیشت کەوانە، لەسەر خۆی فەرزکرد چتێکی وابکا، خۆی بەو ڕەوەندانە بناسێ. وە بۆ گەیشتن بەئومێدێک کە حوکمدارییە - بیانخاتە ژێر پەنجەوە و هێزێکی چاکیان پێ پەیدابکا.

شێخ مەحموود گەلێک کۆشا کە بیناسن و بەحوکمداری بزانن، وە بۆ خستنی ئەو ڕەوەندانە تەقەلای دا. هەتا زۆر کەسی خستنە دەست و حوکمداری خۆی پێ قبووڵ کردن.

لە ساڵی ١٩١٧ هەتا ١٩١٩م. لە کوردستاندا گرانیێکی قورس بوو. لە قەزای پێنجوێن و شیمالی سلێمانی عەسکەری عرووس بەسەریدا هاتبوو هەمووی وێران کردبوو. لەشکری تورکانیش دەغڵ و دانی نەهێشتبوو. عەشیرەت لەبەر هەژاری و دەست تەنگی ڕێک کەوتن کە بۆ پووڵ دەست خستن، بینە یەک قسە و لەگەڵ شێخ مەحموود پێک بێن. ئەو ژیانە ناچاری کردن کە حوکمداری شێخ مەحموود پەسند بکەن و بکەونە ژێر فەرمانییەوە.

شێخ مەحموود چەندەی چاووڕاو (بڕوبوهانە)ی دەکرد کە کوردستان بکاتە یەکێک و حکوومەتێکی ئازادی تێدا ڕێک خا بەموستەقیللی بیانژینێت لە ئەهالیدا بزووتنەوەیێک دیار نەدەبوو، هەرچەندە دەکۆشا ئەسەرێک لە میللەت خۆیان نەدەبوو. بناغەی ئازادی لەو دەمەدا نەبوو، سەربەستی نەدەکەوتە بەرچاوان. لەبەر دوژمنی خۆی و نەیاری دێهاتی لەگەڵ شارستانی و شارستانی لەگەڵ دێهاتییەوە تۆڵە ئەستاندنەوەی کۆن لە یەکتر، چی بوونی قەومییەت و میللەت بزربوو. لەبەر لێک دوان و خراپی کردنی یەکتر، نەدەپەرژانە سەر ئەمە پێکەوە ئیتحاد بکەن. بەڵام بوونی یەکەتی و ئستیقلالی کوردستان لەو زابت و مەئموورانە ڕووی داو کەوتە کارەوە کە کورد بوون لەکن تورکەکان بوون و بێکار مابوونەوە. ئەوانە کەوتبوونە هێنانە پێش فیکری ئیستیقلال و ئازادی.

ئەهالی چونکو لە دڵخوازی ئێمەیان نەدەزانی وە لە خەیاڵی ئێمە ئاگادار نەبوون کە ئێمە چەند چتێکی چاکمان بەدەستەوە بوو بۆ کوردستانی بەجێ بێنین، ئەو بێ ئاگاداری و نەزانییە بووبە سەبەبی کۆمەگ و یاریدەدانی شێخ مەحموود. وە ئەوانەی لە کوردستاندا باوەڕیان بەئینگلیز کردبوو وە لە حەقی ئینگلیزدا ئیعتیمادیان پەیداکردبوو، بەمە کە

ئینگلیز لەبەر بێ تەدارەکی و ئەسباب ڕێک نەکەوتن، وە هەندێک چتی دەست بەجێیی کە ڕوویدابوو لە ساڵی ١٩١٨ دا کەرکووکیان بەردا و گەڕانەوە تکریت. کوردەکان وایان زانی کە ئێمە بەیەکجاری ڕۆیشتین. ئەوەبوو بە سەبەبی بێ ئیعتیمادی کوردەکان وە باوەڕ پێ نەهاتنیان بەئینگلیز.

لە مانگی مایسی ١٩١٨دا بوو کە ئێمە کەرکووکمان گرت. تورکیش هەموو کوردستانی جنووبی بەردابوو ولێی دەرکەوتبوو. کە ئێمە گەڕاینەوە کەرکووک، هەموو شێخەکانی کوردستان لەگەڵ گەورەکان پێشوازییان کردین.

شێخ مەحموودیش پیاوانی هەڵبژێردراوی خۆی نارده کنمان، بەخێرهاتنیان کردین. وەختێکی ئێمە لە کەرکووک دەرکەوتبووین و گەڕابووینەوە پاشێ، وە کەرکووک کەوتبووە ژێر دەستی تورکەکان، چەند پیاوێک کە لەگەڵ ئێمە کەوتبوون، تورکەکان گرتبوونیان لە بەندددا بوون. ئەو دەرکەوتنەی ئێمە لە کەرکووک بوو بە سەبەبی زەرەر و زیانێکی بێ ژمار. ئەمما لەدەست ئێمەدا نەبوو، ناچاری پێ کردین کە ئەو گەڕانەوە ئیختیار کەین.

ئێستاش ئەو عەشیرەتانەی کە فیکریان هەبوو لەگەڵ ئێمە ڕێک کەون، یان لەگەڵ شێخ مەحموود دەست پێک بگرن، وە ئەو عەشیرەتانەی باوەڕیان کردبوو کە ئینگلیز دەمێنێت و ببوون بەهەواخواهی ئینگلیز، کە ئینگلیز دەرچوون گەڕاوە پاشەوە، ئەوانە گوتیان کە ڕۆیشت و ناگەڕێتەوە. لە وەوە وا فیکریان گۆڕی و بەجارێک بوون بەهەواخواهی شێخ مەحموود و کەوتنە ژێر فەرمانییەوە.

شێخ مەحموود بەچاوەڕوانی ئیستیقلال قووەتێکی تەواوی دەست خستبوو؛ لەشکری زیاد ببوو. لە مانگی شوباتدا خۆی دەنواند و نمایشی دەکرد وە هێزی پەیداکردبوو ڕۆژ بەرۆژ قورس دەبوو. کە لەوە وردبووینەوە ناچارماین بێجگە لەمە کە شێخ مەحموود بخەینەوە دەست خۆمان، چارەیەکمان دەست نەکەوت: کەوتینە ڕا و تەدبیری ئەوە.

لە مانگی مارتدا مەندوبی سامی لە بەغدا جەمعییەتێکی لە ئینگلیزەکان دامەزراند. ئەوانیش لە ژێر چاودێری خۆیدا «کارمان لیچمان» و «میجێرسۆن» و «میجێرنویل» و چەند کەسێکی مەئموورانی ئینگلیز کۆکرانەوە و لە چۆنیەتی کوردستان و شێخ مەحموود دوان. لە پاش گەلێک گفتوگۆ ڕێک کەوتن هەموو لەسەر ئەمە قەراریان دا کە مێجەرسۆن لەباتی میجێر نویل بچێتە سلێمانی و لە جێگای ئەودا سیاسەت بگێرێ؛ بەهەموو جۆرێک بۆ ئەمە بکۆشێت کە زۆر بەنەرمی قووەتی شێخ مەحموود کەم بکا و لێکیان

بڵاوکاتەوە؛ بەشەرتێک هەتا لەدەست بێ بە ئاشکرا شۆڕش پەیدا نەکا. بەڵام لە ژێرەوە بەگژ یەکیان داکا و تەفرەقەیان بخاتە نێوانێ. یەکێک لەو تەدبیرانە ئەمەبوو کە شاری هەڵەبجە و عەشیرەتی جاف لە حوکمەتی شێخ مەحموود جوێ کرێتەوە؛ لە ژێر گەڕانی نائیب حاکم سیاسەتدا بێ. ئەویش لە ژێر ئیدارەی حاکمی سلێمانی، مێجەرسۆندا بمێنێت، ئەو ئیدارەیان بکا. ئەمن - کە دوقتور لیزم - ئینتیخاب کرام کە ببمە نائیب حاکم سیاسی مێجەرسۆن لە هەڵەبجە.

بۆ پێکهێنانی ئەو وەزیفە تازە لە مانگی مارتدا لە جەبەل حەمرینەوە کەوتمە ڕێ. لەو وەزیفەیەدا مومکین بوو کە بەزۆر زوویی قابلییەتێکی چاک دەست کەوێ، کە شێخ مەحموود بێ دەست کەین وە قووەتی لابەرین و بیخەین. وە مومکینیش بوو بەکەم زەمانێک سلێمانی لە دەست دەین. کوردستانی جنووبی بەردەین و هەڵێین.

کە لە جەبەل حەمرینەوە ڕێ کەوتم و گەیشتمە کفری، تەماشام کرد عەشیرەتی جاف لە گەرمێن بوون کە زستان لێی دەبوون. چەند ڕۆژێک لە نێویاندا مامەوە. چەند سەرکۆمارانی عەشیرەتم کۆکردنەوە. لە پێشدا کە هەواداری شێخ مەحموود بوون، کردمنە تەرەفداری خۆمان و هەریەک لەوانە مەعاشێکم بۆ گرێدان و کردمنە جیرەخۆر. بەو جۆرە ئەوانەم خستە دەست . بەڵام ئەو مەعاشەم لە حکوومەتی بەریتانی نەدا، بەڵکو لە مەعاشی شێخ مەحموودمان کەم کردەوە و دامان بەوانە. هێندەی مەعاشی شێخ مەحموودمان هێنا خوارێ هێندەشمان دا بەو گەورەی عەشیرەتانە دابەش کردن. ئەوە یەکەم عەلامەتێک بوو کە سیاسەت وەرچەرخا و ئەحواڵ ڕووی لە گۆڕان کرد. چونکە لە پێشدا ئەوان مەعاشخۆری شێخ مەحموود بوون؛ ئەمجا بوون بەمەعاشخۆری ئێمە. وە لە پێشدا پیاوی شێخ مەحموود بوون و خزمەتیان دەکرد، ئەمجا بوونە پیاوی ئێمە. وە لە پێشدا شێخ مەحموود ئەوەندە دراوی وەردەگرت، ئەمجا لێی کەم کرا. بەوجۆرە هەموو گەورەکانی جاف لەگەڵم بوون بەیەک. لە کفرییەوە حازر بووم بچمە هەڵەبجە. هەموویان سواربوون و لەگەڵم هاتن بوون بە هاوەڵم.

چۆنیەتی عەشیرەتی جاف و زەوی و خاکیان وە مەوقیعی جوغرافی

عەشیرەتی جاف چونکە لە باب و باپیریانەوە لەگەڵ بەرزەنجەییەکان دوژمنایەتییان لەنێودا بوو، بەمە کە حکوومەت وە قووەت کەوتە دەست شێخ مەحموود گەلێک دڵگیر بوون.

شاری هەڵەبجە جێگاییێکە کەوتۆتە نێو باغ و باغچەییێکی زۆر خۆشەوە. لە دۆڵێکی شارەزووردا دێیێکە نزیک بەهەزارماڵێک دەبێ. دوو خانووبەرەی دوو سێ نهۆمی زۆر بڵند و خۆشی تێدایە؛ یەکێک هی عوسمان پاشا و دووەم هی مەحموود پاشای جافە.

شارەزوور جێگایێکە ساڵێ دووجار جافی پێدا دێت و دەچێ. جارێک لە بەهاردا عەشیرەتی جاف کە دەچنە کوێستان مانگێکی تەواو، وە لە پاییزیش مانگێک کە دەچنە حودوودی ئێران و دەگەڕێنەوە کفری و ئەو دەور و پشتە پڕ لە چادر دەبن. موددەتێک هەتا کێوانی بانە و سەقز دادەپۆشن. بەبەهاردا مانگێک وە لە پاییزیشدا لەو هەموو چیا و دەشت و دۆڵانەدا باڵەی مەڕ و بزن و فیتەی شوان و دەنگی بێری و حیلەی ئەسپ و بۆڕەی گا دێتە بیستن.

ژیانی ڕەوەندان لە فیکر و خەیاڵ ئازاد و لە تێگەیشتندا بەئاسانی پەسند دەکرێن. بۆ ئەوانە ئەسپێکی خۆش ڕەوی زرنگ و چەک و دوو تفەنگێکی زۆر چاکیان لە هەموو چتێک خۆشتر دەوێ وە بەچاکتری دەزانن. ڕەوەندەکان خۆیان لە دانیشتووە[کان] بەگەورەتر دەزانن و لە کنیان ئەوەی ڕەوەند نەبێ بەکەمتری دەژمێرن. ئەوانەی لە دێهات دادەنیشن، پێیان دەڵێن گۆران و بەڕەوەندەکانیش دەڵێن کورد؛ بەڕاستیش کەمێک لێک جوێن.

وادی شارەزوور لە شیمالی شەرقیەوە دەبێتە سنووری کێوی هەورامان. ئەو کێوە، نزیک دوو هەزار تا سێ هەزار گەز بڵیندە. درێژی ئەو کێوە دەبێتە حدودی ئێران. لە هەردوو لای ئەو کێوە عەشیرەتێکی قورسی کێوی شەڕکەری تێدایە. لە دێهاتەکانی ئەو کێوەدا زۆرن. دێهاتەکانیش لەنێو دۆڵ و دەرە و تەنگی ئەو کێوەدان. لە هەرلاییێکەوە دۆڵ دەست بەگوشادی دەکا، ڕوو بەپانایی فرە دەبێتەوە. بەباغ و باغچە و بێستانیان جوان کردووە. بەداری سێو و قەیسی و هەڵووچە و خۆخ و هەرمێ و ترێ و گێلاس و هەناریان ڕازاندۆتەوە.

عەشیرەتی هەورامان لە کورد کەمێک دوورن؛ چونکو بەزبانێک قسە دەکەن کە کورد بەئەزییەت تێی دەگەن. ئەوانە هەموو وەختێک لەگەڵ تورک چۆن بوون، بە چ جۆرێکیان بەسەر بردووە، لەگەڵ ئێمەش هەروەهان. ئەو پیاوانە دوو بەشن: یەکێک جافرسان؛ دووەم مەحموود خان دزڵی. ئەو دوو عەشیرەتانەش یەکێک لەلای عێراقەوەیە و دووەم لەلای ئێرانە. بەڵام حکوومەتی ئێران لە هیچ دەمێکدا ئەوانی نەخستۆتە ژێر پەنجەوە و حوکمداری بەسەریاندا نەکردووە؛ چونکە هەم ئازان و هەم جێگایان سەختە. کە من لە

کفرییەوە دەهاتم و نزیک بەهەڵەبجە بووم، کە تەماشام کرد سەد سوار جاف و بەگزادە هاتنە پێشوازیم. کە گەیشتمە هەڵەبجە، بۆ ناسین منیان بردە خزمەت «عەدلە خانم» کە ببووە ژنی عوسمان پاشا.

«عەدلە خانم» لەبەر ئەخلاقی چاکی و گەورەیی، هەموو کوردستانی جنووبی لێی دەترسا، وە بەگەورەشیان ڕادەگرت و ئیحترامیان دەگرت و لە هەموو کاریدا قسەی ڕەوابوو. ئەو ژنە کەمێک کورتەبالای نازک بەدەن بوو. لەگەڵ ئەوەش زۆر بەهێز و زەبر بەدەست بوو. گەلێک جوان و قەشەنگ و دڵڕوبا ڕێک کەوتووبوو. خەت و خاڵ و چاوی ڕەشی بێ سورمەی ئیزهاری قووەتی باتینی دەکرد. بۆ دڵکێشان بەیەک جار دیتن دڵی دەڕفاند، بەگریشمەیەک پیاوی ئەسیر دەکرد. لە چاوپێکەوتنیا وا دەکەوتە بەرچاو کە ژنێکی زۆر بەدەعیە و تەشەخوسە و توند و بەهەیبەتە. هەموو بزووتنی لە پیاوێکی دلێر دەچوو؛ بەڵام کە پێدەکەنی، ڕەنگی ژنی و خودی ژنایەتی لێی وەدەر دەکەوت. کە من ئەوەم دی بە شێست ساڵ گەیشتبوو. بەڵام لەبەرچاو نموودی لی نەبوو، وادەزاندرا لە چل ساڵ گچکەترە. لە ڕەنگ و درەخشانی سەری کوڵمە و ڕووی وە ژنە فەرەنگی پاریسی دەچوو. بۆ جوانی و قەشەنگی پەرچەم و زولف و ئەگریجە و پرچە سەری ڕەش و ڕاست و درێژ و بێ عەیب بوو. لە پاش دوو ساڵێک کە ڕۆیشتم و گەڕامەوە هەڵەبجە، کە دیم لە نەخۆشی ڕزگار ببوو. تووکە سەری لە نزیک گۆشت بەهەشتییەکی ئەچنیک دەستی بەسپی بوون کردووە بۆ ئەوە سەرسامی کردم. بەگزادەکانی جاف لەو دەمەدا ببونە دوو لەت: ئەحمەد بەگ و عیززەت بەگ لەگەڵ عەدلە خانمدا ببوونە یەک. حامید بەگ کوڕی عوسمان پاشا - کە لە ژنێکی دیکە بوو - لەگەڵ داوود بەگ و بەگزادەکانی دیکە ببوون بەیەکێک. شێخ مەحموود لە نێوان ناخۆشی و یەکنەبوونی ئەوان، کەلێنی بۆ هەڵکەوت بۆ کۆششی هێندێکیان وەعدەی دا بەحامید بەگ و کردییە هەوادار و خستییە لای خۆیەوە. حامید بەگ چونکو لەگەڵ عەشیرەتی هەورامان خزمایەتییەکی لە ژنەوە هەبوو، هێزێکی تەواو و دەستێکی درێژی هەبوو. شێخ مەحموود، حامید بەگی بەهەموو قووەتیەوە خستە دەست خۆی. عەشیرەتی جاف کە دەچوونە کوێستان، خانم بێ قووەت دەماوە و حامید بەگ بەهێزتر دەبوو؛ چونکە هەورامانییەکانیش خزمی بوون. جا کە من چوومە هەڵەبجە خانم و هاواڵەکانی، منیان بەچاکی قبووڵ کرد و ئەمری ئێمەیان گوێداری دەکرد. بەڵام کە حامید بەگم دی بەساردی و بێ ئیلتیفاتی قسەی لەگەڵ کردم، هێندە ڕووی نەکردمێ بەهێندەی نەزانیم.

لە ئەوەڵی مانگی مایسدا هیچ چتێک ڕووی نەدا. لەو دەمەدا من هەموو دەوروپشتی شار و عەشایەر گەڕام. لەگەڵ گەورە و سەرکۆمارانی عەشیرەت یەکترمان دی، بووینە ناسراو. لە زۆر شتدا ڕێک کەوتین لەولاشەوە مێجەر سۆن لە سلێمانیدا دەکۆشا کە بەچاکی سیاسەتی خۆی تەعقیب بکا. لەودەمەدا کە ئێمە واماندەرانی کە شێخ مەحموود زۆر بەقووەت و زل بووە، تەمای ڕزگاری و ئازادی کوردستانی دەکرد. بەڵام ئێمە بەمە کە عەدلە خانمان لێی جوێ کردەوە، شێخ مەحموود ئەوەندە سست و بێ قووەت بوو. نەدەیتوانی ببزوێ، نەدەشیا کارێک بکا.

شێخ مەحموود لە کۆشش و تالۆکەی خۆڕزگارکردن و ئازادیدا بوو، کە مێجەرسۆن سیاسەتی خۆی بەکار دەبرد و ئێمەش خەریکی ئەوە بووین کە شێخ مەحموود چەندە قووەتی پێ بدرێ و هەرچەندە بەهێزبێ نەتوانێ خۆی ئازادکا.

لە یەکی مانگی مایسدا لە مودیری خوڵەمبار ئاگادار کرام کە مەحموود خانی دزڵی بە سەد سواری هەورامانەوە بەنیەتی دیتنی شێخ مەحموود تەمای چوونی هەیە، بچێتە سلێمانی وە لە سنوورەوە دەربازبوو. منیش دەمزانی کە مەحموود خان دراوی لە شێخ مەحموود وەرگرتووە و جیرخۆرێتی. لەبەرئەمە منیش کۆشام کە نەهێڵم بگاتە شێخ مەحموود و ببینێ و دەستیان لێک گیربێ.

ئەمن لەودەمەدا پەنجا سواری لیفیم هەبوو، خستوومنە ژێر فەرماندەی «سدقی بەگی جافە»وە. کە ئەفسەرێکی زابتی تورکان بوو لەپێشدا. بۆ چووینە خو لمبار و پێم گوت کە خۆی و سوارەکانی سازکا. ئەمنیش ئەحمەد بەگی جاف و پەنجا سوارەکەم هەڵگرت و کەوتمە ڕێ.

مەحموود خانی دزڵی وانەبوو بەدۆستایەتی بچێتە سلێمانی ؛ تەمای شۆڕش و تێکدانی هەبوو، وە ئەمنیش لەسەر ئەمە نەبووم کە بەگژیدا بچم؛ چونکە لە سوارەکانی جاف قووەتێکی وام نەبوو کە بتوانم بەرابەری بکەم. چونکە ئەو لەشکرێکی زۆر ئازای پێ بوو جێگاشی لەسەر کێوێکی گەلێک بڵند و سەخت بوو. سوارەکانی من ناپوختە و خاو و مەشق پێنەکراو و فنوونی شەڕ نەزان بوون. بەو لەشکرە کەمەی «لیفی»یەوە لەگەڵ عەشیرەتێکی بێ ترس و دڕندەی کێوی - کە هەریەک پڵنگێکی چیایی بوون - شەڕکردن و بەگژیانداچوون و هەڵمەت بردنە سەریانم بەچاک نەدەزانی، بەڵکو لە بەرابەری ئەوان بزووتن قابیل نەبوو.

که لەو حاڵەدا وردبوومەوە تەماشام کرد، چارەییکم لەمە چاکتر پەیدا نەکرد کە بۆخۆم بچمە کنی و قسەی لەگەڵ بکەم. بەڵکوو لە فیکری خراپی بگێڕمەوە پاش. بۆئەوە پیاوێکی وریام بەوەڵام ناردە کنی کە حەزدەکەم چاوم پێ بکەوێ و دوو سێ قسەی لەگەڵدا بکەم. مەحموود خانیش بۆ چا خواردنەوە میوانی کردم.

مەحموود خان پیاوێکی زل و بەهەیکەل و گەورەبوو. لەنێو چاوانیدا نیشانەی زرنگی و تێگەیشتن و وریایی دیار نەبوو؛ بەنەزانی تێگەیشتم. پیاوەکانی هەموو بلند باڵا و زل بوون؛ بەڵام گەلێک وەحشی بوون. بەکۆمەڵە لە دەوری من کۆبوونەوە؛ تەماشای منیان دەکرد. بەیەکتریان دەوت کە ئەو پیاوە فەرەنگییە. چی بەیەک لەگەڵیان سرتەی دەکرد. بەچاوێکی عەجایبەوە لە من دەفکرین. پیاوەکانی هەموو زل و بەشکڵ و بە تفەنگی ماهووزەری تورک و فیشەکەوە ڕازابوونەوە. گەلێک بەهەیبەت و جوان و ڕێک کەوتە و بەئەندام بوون. لەبەر ئەمە کە کورد ڕەوشتیان وایە لە کاتی چا خواردنەوەدا لە سیاسەت و مەملەکەتداری نادوێن، هەر لە ئەدەبیات و مەجلیس خۆشکردن قسەدەکەن، ئەمنیش لەسەر ڕەوشتی کوردان لە مەسایلی سیاسی نەدوام؛ دەستمان بەگەمە و پێکەنین کرد، وە لە چتی دیکە باس دەکرا. مەحموود خانی دزڵی هەر لە دانیشتنمەوە هەتا هەستانم چاوی لە من نەقووچاند. هەر بەوردی چاوی تێم بڕیبوو. بە هەموو بەدەنمیدا دەڕوانی. ئەمنیش بەجۆرێکی سەراسیمەوە تەماشای ئەوم دەکرد کە من تەنها پیاوێکی ئینگلیزیم؛ چۆن کەوتمە نێو ئەوانەوە. بە چ جۆرێک دەتوان [دەتوانم] کۆششێکی وابکەم ئەوان لە فیکرێکی تێدان وە پاشیان بخەم. وە بەچ ڕەنگ و دەسسیەیەک خۆشمیان لە نێو ڕزگارکەم. بەو خەیاڵەوە هەر تەماشای مەحموود خان و نۆکەرەکانیم دەکرد و بیرم لێ دەکردنەوە.

کە چا خوراوە دەستم بەگوتنی سیاسەت کرد. ڕووم لە مەحموود خان کرد، بەیەک جارە وتم کە حکوومەتی بەریتانیا تەماشای لەشکری پڕ چەکی ئێوەی کرد، تێگەیشت کە لەم ڕێگایەدا ڕابردنتان بۆ هەڵمەت بردن پەلامارێکی زۆر زلە. تەمای چتێکی چاکتان نەکردووە. ئەوەیش بەبەغدا ڕاگەیشتووە کە تۆ بەم هەموو چەک و ئالەتەوە هەڵمەتێکیان بەدەستەوەیە. ئێمە بەغداکمان لەوەش ئاگادار کردووە کە بەتەمای چی هاتوون.

مەحموود خان لەو قسانە کەوتە بیرەوە؛ لە چوونە سلێمانی پەشیمان بووەوە و لە هەموو فیکرێکدا لەگەڵم ڕێک کەوت. لەسەر ئەمە قەرارمان دا بگەڕێتەوە جێی خۆی و

لەشکرەکەشی بڵاوکاتەوە. [وە] جارێکی تر نەکەوێتە هەوڵی چوونە سلێمانی. وە ئەگەر تەمای کرد بچێتە سلێمانی، لە من ئیزن وەرگرێت. ئەگەر پێم خۆش بوو، ئەوجا بڕوا؛ وە ئەگەر نا، نەچێ. کە گەلێک لەو جۆرە قسانەمان کرد، دەستی یەکترمان کوشی و لێک جوێ بووینەوە. مەحموود خان بەرەو جێگای خۆی گەڕایەوە. ئەمنیش چوومە «خوڵەمبار»، لەوە ئاسوودە بووم کە مەحموود خان بزوێ.

لەو مەسئەلە شەوێک بەسەرداچوو، سدقی بەگ بەگوللە بریندار کرا. لەوەدا گەلێک کۆشام نەمزانی کە کێ بریندار کرد و لە کوشتنی ئەودا چ قازانجێک ڕوو ئەدا. مەحموود خان ڕۆیشتبوو. کەسێک لەگەڵ ئێمە نەیار بوایە، لە مەیداندا خەیاڵ نەدەکرا. دیسان وام فیکر کردەوە کە ئەویان لە باتی من کوشت. وایان زانیوە کە من لەو جێگایەدا نووستووم؛ چۆن بەگوللە لێیان داوە. کوشتنی «سدقی بەگ» بوو بەپەشێوی فیکرم. بەڵام لە پاشان کە بیستم و وە ڕاستم گێڕا. لەسەر ئەمە بوو کە من لەگەڵ پەنجا سوار لیفی کە ناردمە پێش مەحموود خان، لە ڕێگا سدقی بەگ بە بەگزادەیەکی جاف دەڵێ کە لەگەڵ مەحموود خانی دزڵی کەوتینە شەڕەوە، بۆ ئێمە واچاکە تێپەڕین و بچینە لای مەحموود خان. ئەو بەگزادەش لەوەدا لەگەڵی پێک نایێ. سدقی بەگ پێی دەڵێ کە تۆڵەی ئەوەت لێ دەکەمەوە. ئەو بەگزادەیەش لەبەرئەوەی لە ژێر فەرماندە و قسەی سدقی بەگدا بوو بەعەشیرەتیش لێی دەترسا، بەهیچ کلوجێک نەیدەتوانی بەرابەری بکا. بەناچاری شەوێ دەچێتە جێگا خەوی بەگوللەیەک دەیکوژێ.

بۆ سبەینێ منیش گەڕامەوە هەڵەبجە. بەڵام هەموو ئەهالی سلێمانی و دەورو پشتیانم لەوە ئاگادار کرد کە لەشکری مەحموود خانم بڵاوکردەوە و لەگەڵی ڕێک کەوتووم و جارێکی دیکە بەبێ ئەمری من نابزوێتەوە و منیش بەوە کە لەگەڵی پێک هاتووم، باوەڕم کردبوو.

دوور و نزیکی پێ نەچوو محەمەد عەلی جاف، مودیری خوڵەمبار لێی گێڕامەوە کە مەحموود خانی دزڵی بەپێنج سەد سواری مەریوان و پێنجوێنەوە لە سنوور هاتە ئەم دیوە و بەتە مای چوونی سلێمانی دێتە پێش. لە ڕێگای شار بازێڕەوە دەڕوا تاکوو شارەزوور پێ نەزانن. من دەستبەجێ لەزمکرد تلغرافێکم بۆ سلێمانی لێدا؛ ئەمما بێ فائیدە بوو، پێ ڕانەگەیشتن. ئەگەر دوو ڕۆژ لەوەپێش ئاگادار بوومایە، وە سلێمانیم تێ بگەیاندبایە، دەبوو کە بۆ بەرابەری فریا بکەوتبایەن، وە بیانتوانیایە خۆ سازکەن. بەڵام ئەو تێلغرافە

بەدوو سێ سەعات لە پێش گەیشتنی مەحموود خاندا گەیشتە سلێمانی. حکوومەت نەپەرژا کارسازی بکا و بۆ بەرابەری چتێک ڕێک خا. کە ئەوە بەسلێمانی ڕاگەیشت، مێجەرسون بەئۆتۆمبێل چووە بەغدا، «مێجەرگرین هاوس» ببووە وەکیلی. ئەویش بۆ ڕاگرتنی مەحموود خان لەشکرێکی لیڤی ڕێکخست و ناردیە پێش مەحموودخان کە نەهێڵن بگاتە سلێمانی. ئەو لەشکرە نەیتوانی پێشی پێ بگرێ؛ هەموو هەڵاتن و گیران و بڵاوبوونەوە. مەحموودخان بەقووەتەکەیەوە چووە نێو شار؛ سلێمانی کەوتە دەست مەحموودخان. شێخ مەحموود لەو هەموو کەشمەکەشەدا خۆی نەبزاوت، بەم فیکرە کە ئەگەر مەحموودخان شکا و کارێکی پێ نەکرا، بەئێمە دەڵێ: ئەگام لێ نەبوو؛ نەمتوانی بەرابەریان بکەم. کە لیڤی شکا و مەحموودخان بردیەوە، شێخ مەحموود حوکمدارە و بەدڵخوازی خۆی گەیشت. لەبەر ئەوە شێخ مەحموود بەکەنارگیر و بێدەنگی بەسەری دەبرد.

مەحموودخان هەموو زابتەکانی ئینگلیزی گرتن؛ لە دائیرەی سیاسەتدا حەبسی کردن. تیلغرافی نێوان سلێمانی و کەرکووکیان پساند. مێجر گرین هاوس پیاوێکی بەقاقەزەوە ناردبووە دەرەوە؛ دەست مەحموودخان کەوت و گیرا. هەموو دەوروپشتی دەرەوە گیرا بوو کە کەسێک نەچێتە دەرەوە ئەحواڵی سلێمانی ئاشکرا نەکرێ.

شێخ مەحموود دەستبەجێ جارێدا کە پادشاییەکی ئازادی کوردستانە. ئەو پیاوانەی هەواداری ئینگلیز بوون، گرتنی. مەحموودخان و پیاوەکانی دەستیان کرد بەتاڵانی میللەت.

تێلغرافی نێوان هەڵەبجە و سلێمانییان لە بیر چووبوو کە بیبڕن، بەڵام کەوتبووە سەر زەوی کەمێک کاری دەکرد. ئەگەر هەوا چاک وشک بایە قسەی پێ دەکرا. بەشەو کە گوێم بەتەلفوونەوە گرت، دەنگی مێجەرگرین هاوسم کەوتە گوێ. کە قسەم لەگەڵی کرد، هەموو سەربەووردی سلێمانی تێگەیاندم، وە لەوەدا ئاگاداری پێدەدام کە یەکێک لە پیاوانی شێخ مەحموود کە پاسەوانە؛ بەوەی زانی کە لەگەڵ ئێمە قسە دەکا. بەقووونداغی تفەنگ لە مەکینەی تلیفوونەکەی دا و شکاندی. لێی نەگەڕا جارێکی دیکە قسە پێکەوە بکەین. دەستبەجێ ئەوەم بەخانەقین ڕاگەیاند. لەوێشەوە بەدوو ڕۆژ بەغدایان ئاگادار کرد.

من کەوتمە تەقەلای ئەمەی کە سەروبەرێک بکەم بەلەز کۆمەکی بنێرمە سلێمانی. بەیاریدەدانی [عادلە] خانم و عەلی بەگ و ئەحمەد بەگ قاسیدم ناردە نێو عەشیرەتی

جافەوە کە لەشکرێکی چاک لە عەشایەرەکانی شارەزوور کۆکرێتەوە و ئێمە کە بچینە سلێمانی ئامادەبن. ڕۆژێک بەسەرچوو؛ نزیک سەدو پەنجا سوار ئامادەبوون. ئەمنیش کەوتمە ڕێگا کە بچمە شارەزوور، بکۆشم سواری دیکەش کۆبکەمەوە. بەتەئەسسوف کە تەماشام کرد لە دێیەک [کە] بە «عەبابەیلێ» ناودەبرێ، لە ژێر فەرماندەی شێخ کەریمدا گەلێک لەشکر کۆبوونەوە کە بچنە سەر هەڵەبجە و تاڵانی کەن؛ وە ئەسبابی حکوومەت زەوت کەن.

ئەمن نەمویست [ببنە] مایەی فتنە و سەبەبی وێرانی شار و پەرێشانی ئەهالی. بەناچاری گەڕامەوە هەڵەبجە کە لە خراپی و تاڵان کردنیان بپارێزم. بەڵام گەیشتمە شار، بیست و چوار سەعات لە نێو ماڵی خۆمدا خوم بەگیراو، چاو پێ کەوت. دەنگێک پەیدا بوو کە ئینگلیز لە هەموو خاکی «میسوپوتامیا - عیراق» دەردەکەوێ، عەشایەری عەرەب تەنگی «فاو»ی گرتووە. کورد وایان دەزانی کە ڕێگای میسۆپوتامیا لە تەنگەی فاو زیاتر چووین مومکین نییە. ئەگەر تەنها پیاوێک ئەو تەنگەی گەلوەی گرتبێ، نایەڵێت لەشکرێک تێپەڕی. خەبەری چایخانە لە ڕۆژ زیاتر ترس دەدەن. لەبەرئەوە کە چەند کەسێک لە خانەقینەوە هاتبوون و چاویان بەعەسکەر کەوتبوو کە دێن و دەچن وە بار و گران باریان پێیە، لەوە خەیاڵ دەکەن ئەوانە هەموو ڕوو لە هەڵاتنن؛ وە ئینگلیز میسوپوتامیا بەجارێک بەردەدەن.

شێخ مەحموود پیاوانی نارده هەڵەبجە قاقەزی لە حامید بەگ نووسی کردییە قایمقام وە ئاڵای کوردستانی بۆ نارد لە سەرای حکوومەتدا هەڵیان دا. بۆ شێخ کەریم و پیاوەکانی ئەو جێگای خۆش کرد و دایمەزراندن؛ چونکە تەرەفداری شێخ مەحموود بوون. ئەو سەدوپەنجا سوارانەی کە لەکن من بوون گەڕانەوە ماڵی خۆیان و بڵاوەیان کردو هەموو بوونە پیاوی حامید بەگ. لیفی نەمابوو. ئەمنیش چاوەڕێی عەشیرەتی جاف بووم بەهاوارمەوە بێن. لەودەمەدا چەند کەسێک خۆیان سازکردبوو تەمای تاڵان کردنی منیان هەبوو. هەرچەندە خانم و بەگزادەی ئەو لەگەڵم یەک بوون ئەوانیش بێ دەسەڵات بوون؛ هەتا لەشکری جاف نەهاتبایە و قووەتیان نەکەوتبایەتەوە دەست و نە دەشیان یاریدەم بدەن؛ چونکو لە هێز کەوتبوون. عەلی بەگ کوڕی مەحموود پاشای جاف؛ بەپازدە پیاوی شەڕکەرەوە هاتنە کنم و منیش دە تفەنگدارم بوو کە بەهەموو ببوونە بیست و پێنج چەک بەدەست. حامید بەگ لە نێو شاردا لە چوارسەد کەس زیاتر قووەتی لە دەستدا بوو. ئەو پیاوانەی ک حامید بەگ لە دەور و پشتی ماڵی منی دانابوون، پەلاماریان نەدەدامێ و

ئەزیەتیان نەدەدام. ڕۆژ بەڕۆژ بەو جۆرەم ڕادەبوار. ڕۆژی سێیەم، نزیک ئێوارە دەنگێکم کەوتە گوێیەوە کە فڕۆکە (طیارە) هات. حامید بەگ و پیاوەکانی بەدەور و پشتمدا بڵاوبوونەوە. پیاوەکانی من بانگی خۆشی و نەعرەی شادییان بڵند کرد. کە تەماشام کرد فڕۆکە هاتە سەرماڵی من کیسەیەک ئەخباراتی بۆ هاویشتمە خوارێ. منیش بەچالاکی لنگم دا نێو حەوشە و کیسەکەم هەڵگرت. کە تەماشام کرد نووسراوی مەندووب سامی بوو. نەمخوێندەوە بەپەلە خۆم سازکرد. هەمیشە ئەسپم زینکراو و ڕاگیرا بوو. سواربووم؛ چوومە دەشت فڕۆکان کە لە دەری شار بوو. نیشانەی تەیارەم بەفڕۆکەوان نواند؛ هەرچەندم کرد نەنیشت، بەڵام لە بزووتندا دەستێکی لە نێو فڕۆکە دەرخست، بەدۆستایەتی ڕایوەشاند و تێپەڕی. منیش لەوە زۆر دڵگیر بووم و گەڕامەوە ماڵێ.

لە گەڕانەوەدا حامید بەگم دی. تەماشام کرد زۆر ڕوو خۆشە و بەپێکەنینەوە قسەی لەگەڵ کردم. منیش پێکەنیم. قسەکردنی حامید بەگ بۆ ئەمە بوو کە تێبگا ئەو فڕۆکە بۆچ هاتبوو. دووەم بۆ زانینی حەوادیس و قاقەزێک [کە] فڕۆکە بۆی فڕێدام. بەڵام بەڕاستی مەندووب سامی خراپترین حەوادیسی دونیایی نووسیبوو. کە گەڕامەوە ماڵێ قاقەزەکەی مەندووب سامیم خوێندەوە تێیدا نووسرا بوو کە! «قووەتێکی زۆری ئێمە چوو بووە کەرکووک شکا و بەپەرێشانی بڵاوبۆوە. کەریم فەتاح بەگ و پیاوانی شێخ مەحموود لە «قەرەهەنجیر» گەیشتنە قووەتی ئینگلیز؛ هەموویان کوشتن و فەوتاندنیان. ئێستاش لەشکرێکی زۆرمان لە کەرکووک کۆکردۆتەوە، وە لە کۆکردنەوە داین. بەڵام کە کۆبووە یا نەبووە، دەکۆشین بۆ کۆکردنەوە، وە دەیاننێرینە سلێمانی. وە ئەگەر ناتوانی لە هەڵەبجە خۆت ڕاگری و دانیشی، بەجۆرێک خۆت ڕزگار کە، بچۆ بۆ خانەقین.

ئەو شەو و ڕۆژێکی دیکەش بەبێدەنگی بەسەرچوو. ڕۆژی دووەم دیسان کەوتنە هەوڵی تاڵانکردنم. لە کۆمەکی ناردنی جاف بێ خەبەر مام. نەمدەزانی دێن یا نایەن. کەوتمە سەر ئەمە کە تاریکی شەو بەسەر داهات، ڕوو لە هەڵاتن کەم؛ چونکو ترس و لەرز زۆر بوو. وەخت بەپێچ و پەشێوی دیار دەکرد. ئیلچی شێخ مەحموود هەمیشە لە هاتووچووندا بوون. ئاڵای شێخ مەحموود لە هەموو جێگایەکدا بڵند کرابوو. حامید بەگ بەلەز لە ڕێکخستن و کۆششدا بوو. ئەو ئیلچییانە بەهەموو کەسیان ڕاگەیاندبوو کە ئەمشەو مەحموودخان دزڵی لە ڕێگادایە بگاتە هەڵەبجە؛ بەزیندوویی یان بەمردوویی من بگرێت و بۆ شێخ مەحموودم بنێرێت. بەڵام ئەو خەبەرە لە حامید بەگ خۆش نەدەهات؛ چونکو ماڵی منیان بۆ خۆیان دانابوو. ئەگەر مەحموود خان بهاتبایە حامید بەگ چی دەست نەدەکەوت.

حامید بەگ لە بەرابەر مەحموود خاندا نموودێکی نەبوو. مەحموودخان و شێخ کەریم و پیاوەکانی هەموو زل و ئەستوور و ئازا و بەقووەت و شەڕکەر بوون.

حامید بەگ ئەو ڕۆژە قەراری دابوو لە پێش گەیشتنی مەحموود خاندا من تالآن کا، نەهێلێت بۆ مەحموود خان بێ. ئەمنیش قەرارم دابوو بەهەر جۆرێک بێ لە چنگیان دەرپەڕم و خۆ ڕزگار کەم. لەو دەمەدا فیکرێکی سیاسیم هاتەوە بیر کە بیکەم. گرتم قاقەزێکی نووسراوم لەگەڵ باڵگەیەک خستە نێو پاکەتەوە ناردمە کن «عەدلە خانم» و ڕامسپارد کە بیداتە دوو سواری چوست و توند؛ بەتەنهایی بچنە دەری شار؛ دوو سەعاتێک دوورکەونەوە. لەولاوە ئەو پاکەتە بەدەستەوە بگرن بەلینگدان ڕوو بەهەڵەبجە بگەڕێنەوە. هەر بەڕیف کوت ئەسپ ببەزێنن هەتا دەگەنە کنم و بیدەنە دەستم.

«عەدلە» خانم بەڕاستی و دڵسۆزی ئەو کارەی بۆ ڕێکخستم، وە بەچاکی بەجێی هێنا. ئێمەش بەدڵخوازی خۆمان گەیشتین کە ئەو پیاوانە بەتاڵووکە پاکەتەکەیان بۆ هێنام. کە منیش قاقەزی نووسراوی خۆم تێ خستبوو کە لەوێدا نووسیبووم. کە پاکەتەکەم کردەوە بەنۆکەرەکانی خۆمم گوت کە ئێستاکە هەشت تەیارەمان بۆ دێن کە کۆمەکیمان بکەن. هەواخواهانەکانی ئێمە گەلێک شاد و دڵخۆش بوون. بەپەنهانی ئەو قسەیان بەشاردا بڵاوکردەوە، وە هەموو تەرەفدارەکانمان شادمانییان تێ کەوت.

من گوتم کە لە دەشتی هەڵەبجەدا جێگایەکی وا نییە هەشت فڕۆکەی لێ بنیشێتەوە. دەبێ چەند ڕەنجبەرێک بەداروبگرین؛ پاچ و پێمەرە و قوڵنگیان بدەینێ جێگای فڕۆکان ڕاست بکەن. بۆ ئەوە پیاوەکانی خۆم نارد پیاویان بە مز گرتن و ئەوانیشیان لەگەڵ چوون دەستیان بەکارکردن کرد. ئەمنیش سی هەزار ڕوپیە دراوم هەبوو. بیست و حەوت هەزاری قاقەزی نوت و سێ هەزاریش پوولی هیند بوو. ئەو بیست و حەوت هەزارەکەم لە نێو قاسە سندوقی پۆڵادا سووتاند و سێ هەزارەکەشم بەسەر ڕەنجبەر و نۆکەراندا بڵاوکردەوە.

بەڵام من کە جاری هاتنە فڕۆکەم کێشا، پیاوەکانی حامید بەگ لەدەور و پشتی خانووی من دانیشتبوون و منیان دەورە دابوو کە تالآنم بکەن و لە هەموو لایێکمەوە تۆپیان دابەستبوو کە ها ئێستا یا دەمێکی تر پەلامارم بدەنێ. ئەوجارە دەور و پشتیان بەڕەڵلا کردم و کشانەوە. من کە ئەوەم زانی کە کەسێکم لە دەورە نەماوە، جوابم لە عەلی بەگ و ئەحمەد بەگ نارد، هاتنە کنم. پێم گوتن ئەوانە کە چوونە مەیدانی فڕۆکان کاردەکەن، کوردن؛ سەرپەرشتی کردنیان پێویستە؛ چونکو نازانن بەچاکی زەوییەکە ڕێک کەن. بۆ

خۆم دەچم لەگەڵیان خەریک دەبم و پێیان نیشان دەدەم کە زۆر بەلەز باشی چاک بکەن. ئەم ئەمەم گوت و سواربووم. ئەحمەد بەگ و عەلی بەگ بەبیست سوارەوە لەگەڵم کەوتن، چووینە دەشتی فرۆکان. نەختێک سەرپەرشتیم کردن و بەبەهانەی سەرئاو، ڕوو بەخانەقین ئەسپم بەزاند.

لەو دەمەدا بەحامید بەگیان ڕاگەیاند کە ئەوە هەموو فرۆفێڵ بوو لە تەکیان تا کردی کە خۆی ڕزگارکا. بەڵام ئەو چاخە من دوو سەعات لە شار دوور کەوتبوومەوە. حەمید بەگ نەیکرد بکەوێتە دووم؛ چووە سەرماڵ تالانکردن. چونکو مەجەرێکی پۆڵا لە ماڵێ بوو، وەیانزانیبوو لە ملیۆنێک هەتا دە ملیۆنی تێدایە لەبەر ئەو تەمایە نەپەرژانە سەر ئەمە بەدوومدا بێن. چوون ماڵیان تالان کردم. سندووقەکەیان دەست کەوت. پێیان نەکراوە. ناردیانە دووی ئاسنگەر، پێیان کردەوە. کە تەماشایان کرد تۆزێ خۆڵی تێدایە. ئەویش تۆزی قاقەزی نۆتەکان بوو کە تێمدا سووتاندبوون.

لە پاش هەلاتن، دوو شەو و دوو ڕۆژ بەئەزیەت گەیشتمە خانەقین. لە وشەوەدا بەئۆتۆمبێل چوومە بەغدا. لەودەمەدا کە من لە هەڵەبجە دەرکەوتبووم، لە عەشیرەتی جاف هەزار سواریان بۆ کۆمەکی من دەگەنە هەڵەبجە. کە زانیبویان من هەلاتووم، هەموو دەگەڕێنەوە جێگای خۆیان. وایان تێگەیاندبوون کە ئینگلیز هەموو عیراقیان بەردا و هەلاتن.

گەورەکانی جاف و سەرکۆمارەکانیان مەزبەتەیەکیان دروست کرد و مۆریان پێوەنا و ناردیانە بەغدا بۆ کن من. لەوێدا نووسیبویان کە: «ئەگەر ئینگلیز لە کوردستان بمێنێت و بەجێمان نەهێڵێ، ئێمە لە هەموو گۆشەیێکی دونیادا بۆ هەموو خزمەتێکی ڕاوەستاوین و لە ڕێگای ئینگلیزدا بۆ شەڕکردنی هەموو کەسێک ئامادەین».

لە پێشدا وا لە خەیاڵدا بوو کە لە کەرکوک و خانەقینەوە لەشکر بنێردرێتە سەر شێخ مەحموود. کە من گەیشتمە بەغدا و تەماشام کرد وام لێ ئاشکرا بوو هەتا لەشکر لە خانەقینەوە نەنێردرێ، لە کەرکوکەوە هیچ دەست نادا. بۆ سازکردنی کەرکووکیش لە نیو مانگ کەمتر ساز نەدەبوو. ئەمنیش ناچار بووم هەتا ئەو لەشکرە ڕێک دەخرێ، بچمە فرۆکەخانەوە.

عەسکەرێکی بۆ کۆمەگی لەشکری سلێمانی قەرار درابوو لە ژێر فەرماندەی «جەنەڕاڵ فریزەر»دا ڕێک خرابوو. جەنەڕاڵ فریزەریش بەتێگەیشتنی خۆی لێکی دابۆوە، قووەتی

دوژمنیان بەچاکی ئەندازە نەگرتبوو، وە نەکەوتبووە سەر ئەمە کە هەتا لەشکر بەتەواوی ڕێک نەخرێ، نەچێتە سلێمانی بەبێ فیکر شەڕی کرد. ئەووەڵ شکستی بەریتانی و سەبەبی بڵاوی و پەرێشانی لەشکری ئینگلیز لەوەوە ڕووی دا.

لەودەمەدا چەند جاێک چوومە سەر سلێمانی. لە فڕۆکە سواربووم چەند جاران لە ئاسمانی سلێمانیدا گەڕام مێجەرگرین هاوس و هاواڵی گوم کر بوون؛ نەدەکەوتە بەرچاوانم. ئێمە لە بۆمبە هاوێتن و ئاگرباری ماندوو بووین. بۆ ئەمە دەکۆشاین کە ئەو بەخسیرانە دووچار بەئەزیەت و سەختی نەبن. لە هەڵەبجە دیسان بەخەیاڵی ئەمە کە «عەدلە خانم» زەرەردرار و ڕەنجیدە نەبێ، بۆمبە هاوێژیمان نەدەکرد. بەڵام چەند بۆمبەیەکمان بەگوندی «عەبابەیلێ»دا دا. خانووبەرەی شێخ کەریم و هاواڵانی ئەومان وێران کرد.

شێخ مەحموود بەڕاستی گەلێک بەئازای و زرنگی و توندییەوە شەڕی دەکرد. بەجۆش و خرۆش و دڵسۆزییەکی تەواوەوە دەبزووتەوە. پیاوەکانی خۆی خستبوونە هەوەسێکی وا کە زۆر بەگورجی و ڕەشیدی بۆ ڕزگاری و ئازادی بکۆشابان. بەهەموو کەیفێکەوە لە ڕێی ئازادیدا گیانفیدا بوون. هەموو پیاوەکانی بەسەرکەوتنی شەڕی ئەووەڵ دڵخۆش بوون و بەهەوەسترەوە شەڕیان دەکرد. بەڵام لە بەرابەر لەشکری فێرکراو و ماشینەناس و تۆپچی و ئالەت چاک و شێست تیر و سواری فڕۆکە و ئەوانە، ڕەشید و ئازایی وان وەپاش دەکەوت.

١٨ حوزەیران لە دەوری بازیان لەشکری ئێمە شاڵاویان بردە سەر شێخ مەحموود. بەدەرەجەیێکی موهلیک بریندار کرا. لە مەیدانی شەڕدا دەستگیر بوو. لەشکریشی هەموو بڵاوکرانەوە. هەموو لێک جوێ کرانەوە. هێندێک بەدیل گیران و هێندێک کوژران و هێندێک هەڵاتن. لە پێش هەموو چتێکدا مەقسەدی ئینگلیز ڕزگاری گیراوەکانی خۆی بوو کە لە سلێمانی بوون. لە پاش گرتنی دەرەوەی بازیان، هەموو لەشکر و سوپامان ناردە پێشەوە. کۆمەڵێک لە تۆپچیانمان ناردە سەر دەرگای «تاسلووجە». چوون ئەویان گرت. سپاهەکەی دیکە ڕوو بەسلێمانی ڕۆیشتن. نزیک ئێوارە گەیشتنە سلێمانی. ئەوانە کە چوونە سلێمانییەوە لەشکری هیندی بوون. بەگەیشتنیان مەحبووسەکانیان ڕزگار کرد.

ئەگەر لە شکاوی و گرتنی شێخ مەحموود ئاگاداریبیان بەسلێمانی ڕاگەیاندبا، مەحبووسەکانمان لە دەست دەردەچوو. یا دەیانکوشتن وەیا بەگرەوی شێخ مەحموود،

دەیانبـردنە جێگایەک دەیانشـاردنەوە، هەتا شـێخ مـەحـموودمـان بەرنەدابایە، ئەوانـیـان بەرنەدەدان. کە هیندییەکان دەگەنە پێشەوە لەگەڵ پاسەوانەکانی پیادەی شێخ مەحموود شەڕ دەکەن و دەیان شکێنن. لە هەموو لایێکەوە پاسەوان شکان و هیندی چوونە پێشەوە؛ هەتا گەیشتنە نێو شار و مێجەرگرین هاوس و هاوالاکانیان ڕزگارکردن و بەریان دان.

لە پاش دوو ڕۆژ شەڕی بازیان، ئێمەیان خواستە خانەقین کە لەگەڵ عەسکەرێکی کەم بچمە هەڵەبجە. ئەمن ئەو ڕۆژە گەیشتمە هەڵەبجە. جەنەڕاڵ فریزەر گەیشتبووە سلێمانی. حـامـید بەگ هەڵات، پەنای بردە چیـای هەورامـان. «عـەدلە»خانم لە جێی خۆی مـابۆوە. بەموقابیل خزمەتەکانی کە بۆ ئێمەی کردبوون، دەوڵەتی بریتـانی «بەدرخان بەهادور»یان لەقەب کرد. لە دونیادا ئەوە یەکە ژنێکە کە بەو لەقەبەو ناوە ئیمتیازی درابێتێ.

بۆ ڕێکخـسـتنی مـەملەکەت و ئاسوودەگی وڵات، کـارێکی زۆر گەورەمان لە پێش بوو. یەکێک ئەمـە بوو کە هەمـوو گەورەی سـەرکێشـەکان. بخەینە دەست و بینایەکی چاک لە کوردستاندا دامەزرێنین. ئەویش بینایەکی وا کە ئەهالی پەسندی کەن و شادمان بن کە ئەو بینایە ببێتە مایەی ئاسوودەگی کوردستان.

حامـید بەگ و داوود بەگ خۆیان بەدەسـتەوە دا. «مەحمـوود خان دزڵی» و «مەحمـوود خان کانی سانان» بەتەحریکی «کاپیتان وارن» لە سنەی کوردسـتانی ئێران دەردەست بوون و گیران. شێخ عەبدولقادری سەنگاو لەگرتن ڕزگاربوو. «کاپیتـان بۆند» لە چەمچەماڵ و منیش لەگەڵ لەشکرێکی ڕێککەوتوو کۆشاین کە دەورەی لێ بگرین بیخەینە ژێر پەنجەوە. هەرچەندمان کرد، نەهاتە دەست.

گیراوەکانی دەستمان کەوتن بەئەزیبەتی ڕەنگاوڕەنگ و بەجەزای هەرەمان گورفتارکردن. شێخ مەحموود بە حەبسی بێت سـاڵە ناردمانە هیندسـتان. لە مانگی تشرینی دووەمدا ساڵی ١٩١٩ مێجەرسۆن وەڵامی نارد کە ئینتیزام مەملەکەت بەلێ خۆش هاتنی میللەت و شادی ئەهالییە ئەگەر ئەوان لێیان خۆش نەهات. ئێمەش بەخۆشی ڕایدەبوێرین. جاوا چاکە کە بۆ ئینتـیـزامی مـەملەکەت و ئیجـرای قـانـوون لەشکرێکی لە سلێمـانـیـیـە، بگەڕێتەوە، دوایی لە ژێر ئیدارەی «فیـزکی بنس» و «مـەکـانت»دا لەشکرێکی تازەمـان ڕێک خست. بەخۆشی سەرکەوتنی میللەت دەست پێکرا. مالیەی ساڵانەی سلێمانی بوو بە سێ ملیۆن و دوو سەد هەزار ڕوپیە.. سلێمانی لە هەموو جێگاکانی کوردستان بەماڵتر و بەپارەتر بوو. سلێمانی کەوتە خۆشییەوە؛ جووت بەندە و توجار بەبێ ترس لەکاروباری

خۆیاندا دەکۆشان و لە کردەوەیەکی چاکدا بوون. مێجەرسۆن هەرچەند سەخت و توندبوو، ئینتیزامێکی بەدرشت و قورسی هەبوو. بەڵام عەدالەت و داد خواهیشی دەستی سەرکێشانی لە تالان و دزی کورت کردبووەوە. هەموو بەدخواهێک لە کردەوەیان نائومێد بوون. تفەنگ و چەک هەڵگرتن مەنع کرابوون.

حدوودی ئێران هەمیشە لە ژێر گرانییەکی بەشۆڕشدا بوو. ئێمە لە هەڵەبجە بە ئەزیەت دەژیاین. سنوور پڕ لە فیتنەو شۆڕش و کشاکەش و ئاورباراندا بوو. ئێمە بەچاو و ڕاوو ئافەرین و توندی و خۆش خۆمان ڕادەگرت و ئیدارەمان کردبوو. کورد میللەتێکی گەلێک قابیلن. بۆ ئیسلاح کردن ئامادە و سازن. زۆر زوو تەربییە دەکرێن و دێنە ژێر ئەحکامەوە. لە وەختی سوار بوونی فڕۆکەدا نەخشەیەکی چاکی شارەزوورم دروست کردبوو؛ چاپ کراوە.

مێجەرسۆن لەو چاخانەدا گەلێک کاری چاکی کردن لەنێو کورداندا پەسند دەکران. ئەوانە بوون بەمایەی خۆشەویستی سۆن لە کوردستاندا. لەگەڵ ئەوەش قەراری دا جەریدەیێکی هەفتەیی دەربکەوێ. ئەو ڕۆژنامەیان ناونا «پێشکەوتن». بەزمانی کوردی دەرئەچوو. ئەهالی ئەو جەریدەیان بە گەمە و ئەتک ناو دەبرد. مێجەرسۆن هەرەشەی لێ کردن و بەزۆر پێی دەدانە خوێندنەوە، هەتا چاویان لێ ڕاهات و فێری بوون.

زبانی کوردی هیچ قاقەزی تا ئەو ڕۆژە پێ نەنووسرابوو. زەبانی قسەکردنیشیان عەشیرەت بە عەشیرەت فەرقی دەکرد. قاقەز نووسینی کوردان بەئێرانی یان بەتورکی بوو. مەلا و شێخی کوردان گوتبوویان کە قسەی کوردی گرانە نایێتە نووسین. مێجەرسۆن لوغەتی کۆکردبوونەوە؛ قاقەز و دەفتەر و نویسراوی حکوومەت بەڕەسمی کرا بەکوردی. بەو جۆرە زبانی کوردی ڕووی لە فرەیی کرد؛ بەرەبەرە بەرز بۆوە. ئەو بزووتنەی سۆن و نووسینی کوردی و ڕۆژنامە دەرخستنە بناغەیێکی چاکی دامەزراند.

ئەمن لە ساڵی ١٩٢٠دا بە ئیزن لە هەڵەبجە دەرکەوتم؛ کاپیتان بیل چووە جێگای من لە هەڵەبجە دانیشت. ئەمن لە مانگی هەشتەمی ئینگلیزیدا لە سلێمانیەوە گەیشتمە بەغدا. کە لە سلێمانی دەرکەوتم و چوومە کەرکووک، عێراق کەوتبووە پشێوییەکی واوە کە هاتوچۆکردن هیچ نەدەبوو. تەماشام کرد، ڕۆیشتن هیچ نابێ، بەناچاری گەڕامەوە سلێمانی.

لە ١٨ی مانگی هەشتەمینی ئینگلیزی تلغرافێک لە مەندووبی سامییەوە هات کە

«باقووبه» کەوتە دەست میللەتی تات (عەرەب) وە نائیبی حاکم سیاسی خانەقین بەناچاری هەڵات و ماڵی ئەویشیان لە پاش تاڵان کردن سووتاند. «کاپیتان سلمان» لە «کفری» کوژرا. عەشیرەتی کەرکووک و هەولێر کەوتوونەتە شۆڕش و پشێوی وە بۆ هیچ لایەک کۆمەگی نانێردرێ. ئەگەر بتوانین کۆمەگیش بەرێکەین دەچن و نایەنەوە. ئەزیەت زۆر و مەسایل و موشکیلە.

عیراق زۆر پەشێو بوو، بەڵام بەردانی عیراقمان لە فیکردا نەبوو؛ دەستمان لێی بەرنەدەدا مێجەرسۆن بۆ ئەمەی کە نەهێڵێ مەیدان بەشەڕو شۆڕو پشێوی بدا لە کۆششدا بوو وەبۆ کوژاندنەوەی ئاوری فتنە گەلێک تەقەلای دا. بابەکر ئاغای پشدەری خواستە سلێمانی و بوو بەپشتیوانی لەشکری لیڤی. ئەمنیش بۆ کۆمەگی پەیداکردنی لە شکر و لابردنی شەڕو شۆڕی عەشیرەتانی دەڵۆو زەنگەنە، چوومە قەرەداغ. لە دێهاتی قەرەداغ سەدو پەنجا تفەنگچی ئازام کۆکردنەوە. تەمام بوو بچمە دۆڵی «سەنگاو»؛ لەو دەمەدا بیستم کە دوژمنی کۆنە یەک دوو ساڵەم - شێخ عەبدولقادر- چووبووە سەر مودیر ناحیەی سەنگاو. گرتبووی و هەموو ماڵ وئەسباب و تفەنگی لێ ئەستاندبوو. منیش بەناچاری ڕووم لە دێی «جافران» کرد کە ئەوە لەنێو دەرەیەکدایە. کەتامشام کرد «کاپیتان بۆرن» لەگەڵ دەستەیەک عەسکەری لیڤی گەیشتوونە گوندی جافران. لەوێ یەکترمان دی. گەلێک قسەمان کرد. کە تەماشا دەکەم پیاوێکی ئیلچی لەتەرەف شێخ عەبدولقادرەوە گەیشتە ئێمە. قاقەزێکی پێ بوو. شێخ عەبدولقادر زۆر بەسپاسی بۆ منی نووسیبوو؛ وەرم گرت. کە دەیخوێنمەوە ئەمەی تێدابوو «لە پاش گەلێک حەمد و سەنا و دۆعا گۆیی، ئەمنیش لێرە نزیک بە ئێوە دانیشتووم. کە تەماشام کرد پیاوەکانم تەمایی تاڵان کردنی ماڵی مدیری سەنگاویان کردبوو. ئەمنیش وام بەچاک زانی چەک و ئەسبابێکی لەو مودیرەیان ئەستاندوو ڕایگرم لەکن خۆم. ئێستا ئەو چتانە هەموو لەکن منن؛ هەرچی دەفەرموون، تا کوو وا بکەم». ئەو پیاوە فێڵباز و خەلەی پڕ مەکرە. بەچاکی زانیبووی کە شەڕو شۆڕ کەوتبووە عێراقەوە. بەڵام بەقستی خۆی وادەنواند کە نەیزانیوە؛ چونکو سێزدە مانگ بوو کەوتبووە کێوان و موهاجیر ببوو.

شێخ عەبدولقادر ئەودەمەی بەکەلێن زانی کە ماڵ و چەک و ئەسبابی مودیری دەست خستبو (ئەو خواهشمەند بوو کە ئینگلیز عێراقی بەردا ئەو پوولەو پارە و ئەسبابە کەوتبووە دەست، بۆی بێنیتەوە. وەیان کە ئینگلیز سەرکەوتن و عێراقیان لە دەستدا ماوە، ئەویش دەڵێ کە من دۆستی ئینگلیزم؛ دەبێ لە گوناهانم خۆش بن». ئەمنیش بەو

دۆستایەتییە زۆر مەمنوون بووم، چونکو لە ئەزییەت و پەرێشانی رزگار بووم. تەمای شەڕکردنم لەگەڵی نەبوو و نەمدەتوانی بەئاشکرا شەڕی لەگەڵ بکەم. لەمە دەترسام کە کوردستانی جنووبیمان لەدەست دەرچێ و لەو شەڕانەدا زەرەر بکەین و هەم خەیاڵم دەکرد ئەگەر لە شەڕی ئەودا سەریش کەوم، ناتوانم بیگرم. چونکو لە وڵاتی زەنگەنە بووم، ئەوانیش لە سەرکێشی و شەڕکردندا بوون. لە پاشان ئەمەم لە جوابیدا نووسییەوە:

حکوومەتی فەخیمەی بریتان گەلێک منەتدارو شوکرانە بژێرتە بۆ ئەوخزمەتەی کە کردووتە و بۆشم نووسی کە خواهیش دەکەم جێگایێک قەرار بدەن بێم چاوم پێت بکەویت.

پیاوەکە چوو و شەرایی یەکتر دیتن ئەمە بووکە هەریەک لە ئێمە بەشەش پیاوی بێ چەکەوە لە سەری دەرەیێک بێ کە سەعاتێک دوور بوو. من لەو شەوەدا پێم ڕاگەیشتەوە کە شەرتەکانی منی بۆ یەکتر دیتن قبووڵ کرد.

ئەو یەکتر دیتنە زۆر عەجایب بوو. ئێمە هەردوو لەشکری خۆمان لە جێگایەکی وادا نابوون کە لە وەختی پێویستدا بۆ شەڕکردن ئامادەبن و زوو بێنە پێشەوە پێڕابگەن. ئەویش لەولاوە لەشکری خۆی وا تێگەیاندبوو. بەڵام لەسەر ئەو شەرتانە چووینە جێگاهولگاه (موعود). هەریەک شەش پیاوی بێ چەکمان لەگەڵ خۆمان برد. گەیشتینە نزیک یەکتر دەستی یەکترمان کوشی. من لەباتی حکوومەتی بەریتانەوە مەمنوونیەت و شوکرانە بژێریم کرد بۆ خزمەتێکی کە کردبووی.

شێخ عەبدولقادر پیاوێکی کورتە باڵای توندو بەهێز و بەخۆوە بوو. خووی چاک و ڕەوشتی پیاوەتی لەنێو چاوانی دیار بوو. روو خۆش و نێو چاک و خاوێن و هەنیە گوشا بوو. بۆ خۆشی ڕەئیس و گەورەی عەشیرەت و سەردارێک بوو.

ئێمە کە دانیشتین، یەکێک لە پیاوەکانی قاوەو چای دروست دەکرد. کە لە چا خواردنەوە و قاوە دەست بەردار بووین، دەستمان بەگوتەی سیاسی کرد. ئەمن گوتم حکوومەتی بریتان چەند ڕۆژێکی دیکە عەشیرەتی «دەیلۆ» بەسەختی جەزا دەدا. بۆ ئەوە ئێمە دەمانەوێ میللەتی کورد کۆمەگیمان بکەن تا دەستی ئەو شەڕکەرانەی مایە فیتنایەی سەرکێشانە لە خراپی کورت بکرێنەوە.

لەبەر ئەوە کە سەرداری عەشیرەتێک بوو، هەموو کارێکی پێ دەکرا. ئەمن لەسەر ئەوە قەرار دار بووم و تکام لێ کرد کە مودیری ناحیەی سەنگاو بخاتە گەردەنی خۆیەوە. «من

له هەموو گوناهێکی کە لەزەمانی شێخ مەحموودیدا کردبوو، بیبەخشم. ئەویش دەست بەجێ قبوولّی کرد. تەماشام کرد نێو چاوانی گەش بۆوە و لێ خۆش هاتنی لێ دیار کرد. چونکو دلّخوازیشی ئەوە بوو. منیش گەلێک شادبووم؛ چونکو لەو زەحمەتەی تێدا بووم، رزگاربووم. لەو کارەدا دەمتوانی باوەڕ بەشێخ عەبدولقادر بکەم و ئیعتمادی پێ بکەم. لەو دەمەدا داوای لێ کردم قاقەزێکی ڕەسمی بدەمێ تاکو حوکمێکی ڕەسمی لە سلێمانیەوە بۆ دێنم. ئەمنیش زوو داوای قاقزەێکم کرد، دەستی بردە گیرفانییەوە قاقەزێکی بۆ دەرخستم. کە تەماشام کرد دەمانچەییێکی لە گیرفاندا بوو. تێگەیشت کە من چاوم پێ کەوت. بەدلّگیرەوە تەماشای کردم. ئەمنیش پێکەنیم. دەستم لەڕانم دا، گوتی لێیدە، ئەویش کە ئەوەی زانی، پێکەنی و گوتی کە من هیچ نامەوێ و پێویستم نییە کە تۆ بکوژم؛ چونکو چاخێکی لە گەلی و دەرەی دەربەندیخانی کە دەچوویە کفری، من لەسەری کێوی لە ئەشکەوتێکدا بووم و تفەنگ لە دەستمدا بوو. ئەگەر بمکوژتبایەی رزگارم نەدەکردی. بەلاّم خەیالّم کرد کە بەکوشتنی تۆ چم پێ نابڕێ. لە پاشان بەدۆستایەتی خودا حافیزیمان لێک کرد و سەنەدم دایە و لەو جێگا لک دوور کەوتینەوە».

من لە جافران گەڕامەوە قاقەزێک لە مێجەرسۆن نووسیی کە حوکمێک بۆ شێخ عەبدولقادر بنووسێ کە لەگەلّ ئەوم قەرار دابوو، بەلەز بۆم بنێرێت. جێگای جنووبی سلێمانی بوو. شێخ عەبدولقادر لەنێو عەشیرەتی زەنگەنە و دەلّو دا پیاوێکی بەئیقدام سابت و بەکار و قسە ڕەوا بوو. لەودەمەدا «کاپیتان هۆلّت» لە لابردنی شۆڕشی هەمەوەند بەدلّخواز گەیشتبوو.

من لە قەرەداغ بووم کە پێیان ڕاگەیاندم کە سۆمەلّە سوارێکی شەڕکەری هەورامانی لنگیان داوەتە سەر هەلّەبجە. چوونە سەر مالّی کاپیتان بیل و عەدلەخانم، شەوێ بەر گوللە بارانیان داون. چەند کەسێکیان بریندار کردبوو و چەندێکیشیان کوشتبوو. لەنێو کوژراوەکاندا کەریم بەگ کوڕی عەزیز بەگ کوژرا بوو. لەوە گەلێک ترسم لێ پەیدابوو. سواربووم؛ هەر لەو شەوەدا گەیشتمە سلێمانی. لەو ڕۆژەدا دوو فڕۆکە لە بەغداوە گەیشتبوونە جێ. ئەو فڕۆکانە منیان بەرەهبەر هەلّگرت لەگەلّ خۆیان سوار کردم. ئێمە دەستبەجێ کە سواربووین روو بەکێوی هەورامان مان لێ خوڕی. لە دەوروپشتی «دزەیی»و دێهاتی دیکە بۆمبەمان هاوێژت. لە پاش ئەوە چووینە سەر مەریوان. ئەویشمان ئاور باران کرد. لەوێوە گەڕاینەوە سەر هەلّەبجە؛ کەمێک گەڕاین؛ دابەزیم.

بەگزادە و ئەهالی هەڵەبجە پێشوازییان کردم. کە کاپیتان «بیل»م چاو پێ کەوت، لە ترسان و لە هەڵمەت بردنی کوردان و ئەزییەتدا لاواز ببوو. ئەوم ناردەوە سلێمانی. من لە جێگای ئەو دانیشتم. دەم هاوین و گەرمی بوو؛ نیوەیەکی هاوین ڕابرد بوو. عیراقیش بەچاکی کەوتبووە ژێر پەنچەوە. ئەو مەسئەلەیە چونکو قابیل بەتەئریخ بوو گێڕامەوە. ئەوەی شەڕی داخیلی بوو لە لابردنی خەریک بووین. ئێمەش لە حکوومەتی مەرکەزی گەلێک دوور کەوتبووین. مەیدانی ئەوەمان نەبوو کۆمەگیمان بگاتێ. لە هەر لایێکەوە حکوومەت کۆمەگی نەدەهات. لەگەڵ ئەوەش بەکۆمەگی ئەهالییەوە و سباتیان و بەئینتیزام و چاکەیەکی مێجەرسۆن لەکن ئەهالی هەبوو کۆششمان دەرکرد و یاریدە دەدراین.

«دوقتۆر ڤیگرم» لە نووسراوێکی خۆیدا دەڵێت کە مێجەرسۆن لەگەلێک دەماندا بەتەنها لە سلێمانیدا مابۆوە. لەبەر قابلییەتی زاتی و جەوهەری و ویجدانی و ئازایەتی خۆی، وە ئاگاداری لە مەزاجی ئەهالی بوونی - کە زۆر چاک لە خوو ڕەوشتیان گەیشتبوو- لە بزووتن و ئیشیان ئاگاداربوو، زۆر چاک دەیتوانی کوردستان بخاتە ژێر پەنجەی حکوومەتەوە وە کوردیش قابیل بوون باوەڕی پێ بکەن.

ئێمە تا ساڵی ١٩٢١دا لە هەڵەبجە ماینەوە. لە دوایەدا کۆشام کە بۆ دیتنی وڵات ئیزن بدرێم. ڕوخسەتم وەرگرت. «کاپیتان ئا. ژ. دەگلز» گەیشتە جێگای. منیش لە دۆست و برادەران پچڕامەوە و ڕۆیشتم. لەو دەمەوە کوردستانم بەردا.

مێجەر سۆن لە مانگی نیساندا گەڕاوە ئینگلیزستان. وەختێکی لە وەتەنی خۆی بوو، پێیان گوت کە حکوومەتی بریتانی جارێکی دیکە ناتخاتەوە سەرکارو پیشەی حکوومەتی لەبەر ئەمەیە «سەبەبی ئەوە ئەمە بوو کە دەبێ کوردستان بە تەنها حکوومەتێکی سەربەخۆ بێ لەگەڵ عەرەب نەکرێنە حکوومەتێکی ڕێککەوتوو». مەندووبی سامی (سێر پیرسی کەوکس) کە تەماشا دەکا کوردستان بەبێ مێجەرسۆن ڕاگرتنی دەبێ و ئیدارەکردنی مومکینە. ئەمنیش کە ئەوەم بیست لە مەئمووریەت ئیستیعفام کرد.

مێجەرسۆن گەلێک حەزی لە کوردستان دەکرد. کوردی زۆر خۆش دەویست. لەبەر جوێ بوونەوەی لە کوردستان، دووچاری نەخۆشی دیق و سل بوو. لە مانگی حوزەیرانی ساڵی ١٩٢٣دا بەدەردی فیراقی کوردستانەوە مرد.

ڕێگایێکی مێجەرسۆن بۆ ڕێکخستنی کوردستانی گرتبووە پێش، لەکن ئینگلیزەکان بە چاک نەدەزاندرا. لە کتێبی «سێر سیموێل هور» کە لە ناو هیندستاندا بە «هیندوستان بە هەوا» دەناسرێ، لەوێدا تەذکرەی مێجەرسۆن بەم جۆرە نوسراوە کە: «پیاوێکی زۆر

عەجایب بوو لە نێو کوردی سلێمانیدا پەیدا بوو. وەکو حوکمدارێکی پێشوو لەسەر ئەوانی حوکمداری دەکرد».

مێجەرسۆن چونکو لەنێو کوردستاندا گەلێک مابۆوە، تێگەیشتبوو و لێی ئاشکرا بوو حکوومەتێکی سەخت و حوکمدارێکی قون پانیپێ دەوێ. بەو جۆرە حکوومەت دەیتوانی بە مەقسەد بکا. بەڵام ئەو حوکمدارییە سەختە و حکوومەتە توند و تیژە بەکاری حکوومەتی ئێمە نەدەهات، و لەگەڵ گەڕانی مەملەکەتی ئێمە موافیق نەبوو. لەبەر ئەوانە بوو حکوومەت ئەوی لە حکوومەت جوێ کردەوە.

لەساڵی ۱۹۲۱دا سلێمانی ئەمین کراوە. ئەمە کەوتە بەر چاوان کە ڕێگاییێکی مێجەرسۆن گرتبوویە پێش و سەختی دەنواند غەڵەت بوو. چونکو پیاوانی سلێمانی بەخۆشی و نەرمی کەوتنە ژێر دەستەوە. ساڵێک ڕابرا. لە ساڵی ۱۹۲۲دا بەناشکوری نەبێ، زۆر تەئەسوف کە چوار زابت کە ناویان ۱ «کاپتان فیزگی»، ۲ «مکانت»، ۳ «بۆن»، ٤ «مۆت» بوو، کوژران. لە مانگی ئەیلوولی ۱۹۲۲دا کۆمەڵێکی کەم لە تورکان کەوتنە نێو عەشیرەتی پشدەرەوە. ئەوانیش لەپێشدا گەلێک دۆستی ئینگلیز بوون. لەشکری هیندی بەتەواوی ناردرابوونە پێش ئەوان. شکان و کوژران و زۆربشیان شگوم بوو. لەگەڵ ئەوەش شەڕ و شۆڕ و کوشتارێکی زۆر کەوتە نێو لیوای سلێمانییەوە. هەموو زابتانی ئینگلیز بەفڕۆکە دەرخران و ڕفاندیانن هەتا رزگاریان کردن. چوار سەدو پەنچا هەزار ڕوپیە و پێنج سەد تفەنگی ئینگلیزی و گەلێک ئەسبابێکی زۆری بێ ژماریان بەردان و هەڵاتن. حکوومەت گەلێک زەرەری لێ کەوت. لەو دەمەوە جارێک ئینگلیز و جارێک کوردەکان حوکمداریان دەکرد.

لەبەر چەند چتێکی نایێتە گوتن، شێخ مەحموودیان لە حەبسی هیندوستان رزگار کرد؛ بردیانەوە سلێمانی. بەڵام ئەویش زوو دەستی بە سەرکێشی کردەوە. هەموو سەعی و کۆششی ئێمە ئەوەبوو کە شێخ مەحموود بگرین، لەدەستمان نەدەهات. بەڵام لە ئاخردا قاقەزی لە ئێمە نویسی، ئەومان عەفو کرد. ئێستا کە کوردستان لە ئاسایش دایە. بەڵام نازانم تاکوو چەندێکی دیکە هەروا ڕادەوەستن. ئینتیزامی کوردستان لە ژێر نیگەرانی ئەهالیدایە. ئەوان بەسەرکار ڕادەگەن و لە ژێر فەرماندەی زابتانی ئینگلیزدان. عەسکەری لیڤی و عەسکەری شەریفیش لە سلێمانی هەیە. جارجار فڕۆکەیش لەو ئاسمانەدا دەگەڕێن. دۆستی ئێمە لەگەڵ تورک و ئێران مایەی ئەمنیەت و ئاسایشی مەملەکەتن.

بەڵام کەسێکی تاریخی کوردان دەزانی، تێدەگا و گومانی نامێنێت کە ئەو ئەمنیەتە

هەمیشە ڕاگیراو نابێ و زۆر خۆ ناگرێ. حەزلێک نەکردنی کوردان و نەفرەتیان لە تات «عرب» فیترەتییە. کە کورد تاتی بە هیچ نازانێ و تاتی کورد بە هێند ناگرێ ئەوەش لەبەر جێگاو زەوی جوغرافیایە. چونکوو کورد لە کێوان دان و تات لەنێو دەشت و ڕاستایە دادەنیشن و قەومیەت و ملیەت لەنێوان دایە. ڕەگەزیان دیارە کە لێک جوێ. کورد لە ڕەگەزی «ئاری»ن و «تات» لە ڕەگەزی «سامی» لەبەر ئەوانە باوەڕ ناکەم ئینتیزامی حکوومەتی کوردستانی لەگەڵ تاتی بەغدا ڕێک کەون و قوەت لە ژێر دەستی تاتییاندا ڕابگیرێت و ڕاگرتن و بەردەوامیشی ناکەوێتە خەیاڵی عاقڵانەوە. خەیاڵم وایە کە مەسئەلەی کوردستان قابیل بەمە نییەکە ئێمە لێی ئەمین بین و ئیعتماد بەوە بکەین؛ ئێتمینانی لێ بکەین.

ئەمن ناخوازم دەم لەمە بدەم کە ستاتی ناتوانن لە دەشتدا شەڕبکەن و ناتواندرێ بێتە گوتن کە لە چیاکانی کوردستاندا دیسان بۆ شەڕکردن نابزوونەوە. بەڵام بەڕاستی ئەمە بەخەیاڵدا دێنم و دەڵێم کە بوونی تاتیان لە کوردستاندا پیسترە لە فائیدەیان؛ وە زەرەر لە قازانج زیاتر ڕوودەدات. چونکو ئەهالی گەلێک ڕقیان لە تاتە و حەزیان لێی ناکەن.

جار جارە گەلێک نویسراوان لە دۆستانی خۆم لە هەڵەبجەوە وەردەگرم و گەلێک لەو جۆرە مەسئەلەیە دەدوێن. ئەوانە زۆر لە دەست عەسکەری شەریف شکایەت دەکەن. لە پیسی و بەدڕەوشتی و جەورو ئەزییەت و تەوەحوشیان دەدوێن. پۆستە نییە ئەو خەبەرانەم پێ نەگا. ئەمنیش ئیقرا دەکەم لە هاوەدەردی کوردان دەست هەڵناگرم و لە هەموو ئێش و ئەزیەتێکدا هاوڵیانم.

ئاگاداریێکی کە من بەسەر کوردستانمدا هەبوو، کۆن بووە. هەرچەند خۆشم لە مەسئەلەی کورداندا بەماهیر نازمێرم؛ بەڵام بەچاکی تێدەگەم ناو دڵی میللەتی کوردان ناگۆڕدرێ و نەگۆڕدراوە. هەر وەها ماون کە من چاوم پێ کەوتووە.

ئەگەر ئەهالی لەگەڵ ئێمە چاک نەبن و بەکردەوەی ئێمە دڵخۆش نەبن، ئێمە ناتوانین بە لەشکرێکی کەمەوە مەملەکەتێک بگرین و ئیجرای قانوونی خۆمانی تێدا بکەین. ئێمە لەبەر ئەوە کەمێک لە ئەخلاقی خۆمان و ذمەتی ویجدانی لەسەر خۆمان دادەنێین و فەریزەی ویجدان، لەوازمی ئەخلاق و ذمەتە کە دەڵێم لەسەر ئێمە فەرزە کە حەقی ئەو میللەتە لە دوژمنەکانیان بپارێزین. بەڵام زۆر تەئەسوف دەکەم کە لەو مەسئەلەدا ئێمە زۆر وە پاش کەوتووین. ئەمن دەتوانم کە گەلێک چت نیشان بدەم کە ئەو میللەتە چەندە بۆ ئێمەیان کۆمەگی کردووە و ئێستاش یاریدەمان دەدەن. لەگەڵ ئەوەش بەتەکالیفێکی زۆر

سەخت و گران گرفتارن و کەوتوونە ژێر بارێکی قورسەوە.

یەکێک لەوانە قسمی دێهاتی «جافران» کە لە قەرەداغدا هەن، ئەو میللەتەن کە بۆ شەڕی شێخ عەبدولقادر کۆمەگییان دەکردم وەخۆیان لە پێناوی من دەنا. لە پاش ئەوە عەشیرەتی هەمەوەند ئەو دێیەیان تالان کردو سووتاندیان لەسەر چی؟

لەبەر ئەمە بوو کە لە پێشدا کۆمەگی منیان کردبوو، لە وەختێکی تەنگی ئێمە دا لەشکریان بۆ کۆکردمەوە. مانگی ئەیلوولی ساڵی ١٩٢٢ سلێمانی لە دەست ئێمە دەرچوو. سلێمانیمان بەردابوو. من بەکاری خۆم نەک بەمەئموورییەتی سیاسەت لە بەغدا بووم. دوو پیاو لەلای مەندووب سامی ئینگلیزەوە هاتنە کنم کە بچمە کن مەندووبی سامی؛ چونکو خواستبووی. منیش کە چووم پێی گوتم کە ببمەوە موفەتیشێکی ئیداری و حاکمێکی سیاسی لە هەر جێگایەکی کوردستاندا کە پێم خۆش بێ رووی تێکەم؛ چونکو گەلێک ئاگادار و تەجروبەکار بووم و بەچاکی لە ڕۆحی کوردان گەیشتبووم و لەگەڵ هەموو سەرکۆمارو سەردارەکانی جافدا دۆست بووم، بچمە نێویانەوە کۆمەڵەیێکی تەواویان لێ خڕکەمەوە. بەیارمەتی ئەوان بتوانم سلێمانی بخەمەوە ژێر دەستمانەوە.

من بەجۆرێکی دیکە و لەوەزعییەتێکی دیکەدا ئەو وەزیفەیەم بەخۆشی قبووڵ کردبوو. بەڵام لەبەرئەمە کە وەعدەیێکی بەدۆستانم دابوو نەهاتە جێ و دیسان وەعدەیێکی بەمیللەتی کوردی بدەم ناتوانم بەجێی بێنم. کە لەوانە فکریم و بیرم کردەوە خەجاڵەت دەمێنمەوە، بەدرۆزن دەردەچم؛ لەبەر ئەوانە ئەو وەزیفەیەم قبووڵ نەکرد.

ئەمانەی کە دەیڵێم؛ زەرووری و واجیبە و فەرزیی ذمەت و ئەخلاق و ویجدانە. ئێمە هەرچەند خەیاڵ دەکەین و لێی ورد دەبینەوە، بەواجیبی دەزانین کە لەکوردستاندا ئەمنیەت و ئاسایش و ئینتیزام پەیدا بکرێ .

لەگەڵ ئەوەش لەسەرحەدی دەوڵەت تاتی (عەرەبی)و کوردیدا مەسئەلەیێکی تازە ڕووی داوە کە ئەویش ئەمەیە لە کەرکووک و کفریدا کانی نەفت لە نێوانی کفری و کەرکووکدا جێگاییێک هەیە کە سەرچاوەیێکی زۆر گەورەی نەفتی لێ دەرکەوتووە. لازمە ئەو جێگایانە لە دەسایسی دوژمنان بپارێزرێت و عەشیرەتی جاف عونسورێکی زۆر زەحمەت کێش و بەحسە و بەشدارن لە موڵکی کفریدا.

بەکۆمەگی فڕۆکە و نوقتەی پۆلیس و قشلەی عەسکەری لەنێو دۆڵ و دەرە و شیوو کێو و چیای بڵندی کوردستان دەتوانین کوردەکان بخەینە ژێر دەستی خۆمانەوە. بەڵام وانابی تەجروبە و ئاگاداری من وام لێ دیاردەکا بەخۆشی و ماقووڵی ئەگەر عەشیرەتە کوردەکان

فێر بکەین و ڕام بن، سلووکیان پێ بکێشین، پیاوەگەورەکان مەحکووم نابن؛ ئەو وەختە بەیەکجاری گەلێک کاری گران دەخرێتە دەستەوە. بۆ هەموو کارێک بەکاردێن و لە ژێر ئەزیەتیش دا خۆیان نابینن.

پیاوەکانی جاف زۆر پەسند و قابیل بە دیتن و ئازا و شایستەی پیاوەتین. لە زانینی پەسندی و قابیلیاندا زۆر زەحمەت ناکیشرێ. زۆر دێنە بەر چاوان. قابیل بە ئیسلاحن. بەڵام نەرمە نەرمە دەتواندرێ ئیسلاح بکرێن. عەسکەرو زابیت لەناو ئەواندا دانان فیکرێکی خراپە و چاک نییە. چونکو ئەوان بە ئاسانی دێنە دەست بە هاودەردی و پێکەوە ژیان دەتواندرێت بکرێنە یەک وجوود و کاری زۆر گەورەیان پێ دەکرێ و بە ئەهمییەتەوە خزمەت دەکەن. نوقتەی پۆلیس و فڕۆکە و زابت ناتوانن مەسئەلەی کوردان ڕێک بخەن. بەڵام بەسوورەت مەسئەلەی موڵک و ئیدارە و هەمدەردی و پێکەوە کۆشان زۆر بەئاسانی دێنە دەست و خزمەت دەکەن.

## قوماندانی فڕۆکە وایس مارشاڵ سێرجان هان هیگن

لە چلۆنی کوردستان و گوتەی دوقتور لیز و میجەرسۆن و نەزەریاتی خۆیدا ئەمە دەڵێت:

لە ساڵی ١٩٢٤دا کە چوومە عیراق، لەو وەختەدا شێخ مەحموود بەنماسندەی حکوومەتی ئینگلیز بەو جۆرە لە سلێمانیدا حوکمدار بوو. بەڵام چونکو مالیەی لیوای سلێمانی رووی لە زیادبوون کردبوو، شێخ مەحموود داوای خستە بەرچاوان ر بیری لێ کردەوە کە خۆی رزگار بکاو ئازاد بێ. ئەو دەوڵەتەو دراوە دەکەوێتە ژێر دەستی خۆیەوە. وەهای کەوتە خەیاڵەوە ئەگەر حکوومەتی ئینگلیز لە سلێمانیدا نەما، هەرچییەکی تەمای بی دەتوانێ بیکا. وە هەرچییەکی دڵخوازی بی بۆی دێتە جێ و لە هەموو چتێکدا مەنفەعەتی دەست دەکەوێ. بەو هەوایە جارێ ئازادی و حوکمداری کێشا و خۆی بە حاکمێکی سەربەخۆی کوردستان ناوناو دەستی بە رێکخستنی کاروبارکرد.

باغ و بێستانی بۆ خۆی بینا کرد. وای دەزانی کە هەمیشە ئەوەی بۆ ڕادەگیرێ و لە سلێمانیدا دەمێنێت. بەڵام ئەو پیاوانەی لەگەڵ ئێمە دۆست بوون، دوو جار بەئەزیەت و زەرەریان کردن لەهەموو لایێکەوە تێیان ڕوو دەهاتن بەهانەیان پێ دەگرتن. ئێمە چەند جارێک ئەومان هۆشیار کردەوە، وە ڕامان ئەسپارد کە دەست لە ئەزیەت و ئازاری «عەدلە خانم»و هاوەڵانی نەکێشێتەوە، لە پاشان گەلێک ئەزیەت تووشی خۆی دەکا. لەو بزووتنانەیەوە گەلێک جار ئاگادارمان کردەوە.

له مانگی تەمووزی ساڵی ١٩٢٦دا مەجبوور بوو کە لەگەڵ ئێمە سوڵح کاو ئاشت بێتەوە ئێمەش چەند خاک و زەوی خۆی هەبوو، پێمان داوە و پەیمانمان لەگەڵ بەست لەسەر حەدی ئێران، لە جێگاییێکی دانیشێت و زندەگی بکا؛ بەو پەیمانە ڕازی بوو.

ئێستا کە ئینتزامی حکوومەت لە سلێمانیدا چاک بووە، لە نێوان سلێمانی و چەمچەماڵ وە لە نێوان چەمچەماڵ و هەڵەبجەدا نوقتەی پۆلیس دروست کراون. لەو جێگایانەدا گەلێک پۆلیس هەنە، نایەڵن ڕێگری و دزی بکرێن. لە سلێمانی و پێنجوین و هەڵەبجەدا عەسکەری شەریف هەن. ئەو عەسکەری شەریفە، عەسکەرێکی وا نین کە دوقتور لیز دەڵێ: ئێستا هەموو فێرکراون و لە ژێر گەڕانی زابتانی ئینگلیزدان. لە کوردستاندا هیچ شەڕ و شۆڕ نەماوە، بێجگە لە «سابیر» کوڕی کەریم فەتاح بەگ «کەریم بەگ» جارێک چوو بووە سەر دێیەک و هەڵمەتی بردبووە سەریان؛ لەو شەڕەدا کوژرا. سابیر بەگ ناتوانێ زەرەرێکی قورس بدا، مەگەر کاروان و هات و چوو ڕووتکا. وا دەزانم کە سلێمانی زۆر لە ئەمنییەت و ئاسایش دایە.

لە دەوری تورکاندا هێندە ئەمنیەت و ئاسایش نەبووە کە ئەمڕۆ هەیە. چونکو میجەرسۆن بۆ خۆی گوتوویەتی کە لە ساڵی ١٩١٢دا چووبوومە سلێمانی، سێ چوار حەفتە لە سلێمانی چاوەڕوانی کاروانی کردبوو؛ لەبەر پڕ خەتەری و ترس و خراپی ڕیگا چوون مومکین نەبوو. بەڵام ئەمڕۆ هەموو ڕۆژێک کاروان دێت و دەچێ بەبێ ئەزیەت سەفەر دەکەن.

تەواو بوو بەئیز خوا لە شاری ڕواندز. ٢٢ جەمادی یەک ساڵی ١٣٤٧ی هیجری، موافیقی ٦ی تشرینی دووی ١٩٢٨ عیسایی.

بەدەست موتەرجیم و ڕێکخەر مودیری جەریدە و
چاپخانەی زاری کرمانجی
سەید حسێن حوزنی موکریانی.

بەندی دووەم

# چلۆنی سەربهوردی

# ئیسماعیل خان - سمکۆی شکاک

کردەوەی

**سەید حوسێن موکریانی**

خێوی کۆڤار و مەزرگەی زاری کرمانجی لە رواندز

کوردستان موکریانی

ئامادەی کردووە و هێناویەتە سەر رێنووسی

ئەمرۆی کوردی

# چەند وشەیەکی پێویست

ئەم بەسەرهاتە هەشتا ساڵێک لەمەوبەر لەلایەن بەهەشتی حوسێن حوزنی موکریانی مامم نووسراوەتەوە، وا دیارە مەبەست لە نووسینەوەیدا بۆ دانانی بەرهەمێکی مێژوویی بووە، بەڵام رووشە و گێچەڵی رۆژگار هەلی ئەوەی بۆ نەرەخساندووە، سەرلەنوێ دایبرێژێتەوە.

لەرووی ئەوەی ئەم دەستنووسە تیشک دەخاتە سەر زۆر لایەنی کەسیەتی سمکۆ و ئەو رووداوانەی رۆژانە رووبەرووی بوون لە داگیرکردنی شار و گوندی کوردستان و تالانکردن و کوشتن و سەرژێرکردنی دانیشتوانی لەلایەن دوژمنانی کوردەوە، هەوڵی چەکدارانەی سمکۆ لەپێناو ئازادکردنی کوردستاندا، پەنابردنی سمکۆ بۆ باشووری کوردستان و هەڵوێستی دانیشتوانی باشووری کوردستان بەرامبەری و جۆری پێوەندیکرنی بە ئینگلیز، چوونی بۆ سلێمانی و پێشوازی لێکردنی شاهانە لەلایەن مەلیک مەحموودەوە، یارمەتیدانی رادەبەدەر لەلایەن شێخ ئەحمەدی بارزانەوە، هەوڵدانی دەستگیرکردنی لەلایەن دەسەڵاتدارانی عیراقەوەو.. وام بە پێویست زانی ئەم پەڕاوانە سەرلەنوێ بە رێنووسی ئەمڕۆ بنووسمەوە و بیخەمە بەردەست ئێوەی هێژا، چونکە مێژووی سەردەمێکی گرنگی نەتەوەکەمان دەخاتەروو.

ئەم دەستنووسە لەسەری نووسراوە بەندی دووەم، کەچی زۆر لە بەندی یەکەمی گەڕام چنگ نەکەوت وادیارە لەنێوچووە.

هەر وشەیەکی نێو ئەم دەستنووسەم بۆ نەخوێندرابێتەوە چەند پنتێکم لە شوێنی داناوە، ئەوەی بۆم خوێندراوەتەوە، بەڵام لە راستی خوێندنەوەکە دڵنیا نەبووم هێمای ( ؟ ) لەپاڵێ داناوە.

کوردستان موکریانی

٢٠٠٧

## پێشدەستی

لەپێش هەموو چتێکدا هێندێک لە ئەحواڵ و خاک و زەوییەکی عەشیرەتی شکاکی نەشونما کردووە، عەشیرەتی شکاک بە ژمارە هەرچەند کەمن، بەڵام میللەتێکی ئازا و رەشید و جەنگاوەرن و دایمە لەکێوان مابەین خوی و وان و ورمێدا بە ئازادی ژیاون لەپێشدا بە چەند عەسرێک لەژێر حوکمی عەشیرەتی مەحمودیدا دەژیان و هێندێک جاران لە خۆیان پیاوی گەورە پەیدا دەبوو، سەربەخۆ دەژیان.

لەساڵی هەزار و سەد و دەدا دوو بەرە باب پێکەوە بەشەڕهاتن، بەرە بابێک سەد ماڵێکی هەڵگرت و چووە وانی بە بتلیس و دیاربەکر و ئورفەدا دوو ساڵ گەڕان دانەمەزران تا کەوتنە چیای، کە بە چیای کرمانج مەشهوورە لە غەربی رۆژاوای شاری حەلەب تاکو خەلیجی ئیسکەندەروونە .. ئەو سەد ماڵە چوونە چیای کرمانج. عەلی ئاغایەک حوکمداری ئەو جێگایە بوو، ناحییەکی بە بەخشیش دانێ، لەوێ ئەو عەشیرەتە ماونەوە ، لە تاریخدا بە ناحییەی شکاک مەشهوورە و زۆر دەوڵەمەند و بەکارن.

عەشیرەتی شکاک پارچەیەکی دیکەی لە زەمانی تەهماسبدا لێی جوێبوونەوە، کەوتنە دەشت و میان دواو مەزهەبی جەعفەرییان قەبوول کرد، ئەمڕۆکە بە شقایان( ؟) دەناسن بەڵام بەرەبابەکەی دیکە لە جێگای خۆیاندا دانیشتن، ئەغلەب بە سەرکێشی رایاندەبوارد و جێگاشیان چاک بوو، چونکو کەوتبوونە سنووری رۆم و ئێرانەوە، لە هەر لایەکەوە تەنگاو بوونایە پەنایان بۆ لایەکی دیکە دەبرد، جێگایان زۆر سەختە و بڵندە، هەمیشە لە سوخرە و باجی حکومەتان دووربوون و حکومەتی رۆم و عەجەم بۆ راگرتنی سنوور موراعاتیان دەکردن.

ئەو عەشیرەتە لە قەدیم مایل بە سواری رمبازی سلاحشۆری مەیدانداری بوون، عەشیرەتێکی زۆر متەهەور و ئازا و لە مردن نەترسن.

## چلۆنی سمکۆ و باب و باپیری

سمکۆ (ئیسماعیل) لەنێو کورداندا بە سمکۆ مەشهوور بوو. سمکۆ کوڕی حەمەد پاشا کوڕی عەلی خان شکەفتی لە قەبیلەی عەبدۆی لە عەشیرەتی شکاک لە سالّی ١٣٠٣ دا لەدایک بووە، پێنج برا بوون، یەکێک جەوهەر ئاغا بوو، لە سالّی هەزار و سێسەد و بیست و دوودا موزەفەرەددین شا _ پادشای عەجەم بانگی کردە تەورێز، جەوهەر ئاغا دوازدە سوارەی بژاردەی لەگەلّ خۆی بردە تەورێز، حەمە عەلی میرزای وەلیعەهد تەمای گرتنی کرد، بەلاّم جەسارەتی نەبوو بیگرێت، سێ چوار ئەوباشی نەعیینکرد فرسەتی لێ ببینن لە جێگایەک بیکوژن، تا رۆژێک لە گەڕەکی راستە بازاڕ لە قاوەخانەی چاپاردا نیوەڕۆ بوو لە پەنجەرانەوە شلنگیان کردێ و کوشتیان. نۆکەران لەنێو قاوەخانەدا گەلێکیان کوشت و جەسەدی جەوهەر ئاغایان هەلّگرت و بەشەڕکردن و کوشتار لە بازاڕی تەورێز دەرکەوتن، بەلەز جەستەکەیان بردەوە نێو شکاکان، حەمەد پاشا بۆ دادخواهی هەلّسا چوو بۆ ئیستانبول، ئەو حالّە و زولّمەی ئێرانی بە سولّتان عەبدولحەمید خانی دووەم گەیاند، کە لەسەر تەختی رۆم بوو عەرز کرد، بە روتبەی پاشای سەربلّندی کرد، بەلاّم لە ئیستانبولدا رایگرت و گەورەی کرد، چونکو محەمەد پاشا پیاوێکی زانا و کاربین بوو لەگەلّ هەموو کەس رێکدەکەوت، لەو دەمانەدا بەدرخان پاشایەکان لە ئیستانبول بوون، محەمەد پاشا هاتووچۆی دەکردن، چاخێک بوو، کە تورکی عوسمانی لە بەدرخانێکان رقیان هەستا دەستیان بە گرتن و بلاّوکردنیان کرد، ئەوی نێزیکی ئەوانیش بوون گرتنیانن، محەمەد پاشاش وەبەر ئەو ئەزیەتە کەوت و بە نەفی ناردیانە ئەزمیر لە قەلعە بەندیبان کرد، زۆری پێ نەچوو ژەهرخوارديان کرد و کوشتیان، محەمەد پاشا ئێستەش بێ سەروشوێن چوو.

لە سالّی ١٣٢٣ دا سمکۆ لە جێگای بابی دانیشت، بۆ تۆلّەی جەوهەر ئاغای برای ... گرێدا. برای سێیەم ئەحمەد ئاغایە ، چوارەم خورشید ئاغا ، پێنجەم عەلی ئاغا شەرحی حالّی هەریەکەیان لە جێگای خۆیدا بەیان دەکرێت.

## حکومەتی جیلۆ (ئاسووری) لە ورمێ

ئیسماعیل خان لە ساڵی ١٣٣٧ دا کە هودنەی عمومی دەست پێ کرا لە چاری بە گۆشەگیر دانیشت لە ورمێ حکومەتێکی ئەرمەنی(*) دامەزرا، میر شیمۆن ناوێکیان لەسەر تەخت دانا، دەربەدەرانی ئەرمەنی لە هەموو لایەکەوە لەسەری وەخڕبوون، دەستدرێژییان لەگەڵ کوردان دەست پێ کرد دۆڵی ورمێ و دەشتی سندووزیان بەجارێک تاڵان کرد لەشکریان، ئەرمەنییان بۆ تۆڵەکردنەوە لە ئیسلامان کوردیان کردە هەدەف بەری خۆیان دا تەواوی ئەرازی کوردان، میر شیمۆن رۆژبەرۆژ قوەتی پەیداکرد، هەر رۆژ گوند و ئاواییەکی کوردیان تاڵان دەکردو دەیانسووتاند، گەلێکیان ژن و کچ ئەتک کرد، میهرەبانییان بەکەس نەدەکرد، چ کورد و چ عەجەمیان دەستکەوتبا رزگاریان نەدەکرد، دەیانکوشت، بەڵام لەگەڵ ئیسماعیل خان بە میهرەبانی رایاندەبوارد و هەمیشە داوای کۆمەگییان لێ دەکرد، ئیسماعیل خان لەبەر جەور و ستەمێکی لە کوردیان دەکرد، دڵی بڕوای نەدەدا ئەوەند خۆیان تێکەڵ کا، لێشیان ئەندێشەناک بوو، کە تووشی بەڵایەکی بکەن ، هەمیشە بە ئیدارە لەگەڵیان رایدەبوارد. ئەو میللەتە بە جیلۆ دەناسرێن بۆ خۆیان کوردێکی دین عیساییان هەیە و ئەوروپا لەبەر مەحەبەتی دیانەتی مەسیحی دەستیان دەگرتن و قەراریان پێ دابوون لە خاکێکدا مەوجودییەت بنوێنن ، میللەتی خۆیان، کە لە زوڵمی تورکان پەرێشان و بڵاوبوون وەخڕیانکەن ئیستیقلالییەتیان بدەنێ، ئەوانیش لە هودنە ئیستیفادەیان کرد. حکومەتی ئێران لەژێر پێی عرووسدا کوترابوو، سەراسیماو پەرێشان کەوتبوو. حکومەتی رۆم پارچە کرا کەوتە بن ئیحتیلال، دەوڵەتانی رۆژاوا جیلۆیانی ورمێ و ئەتراف ورمێیان بە والا و بێ خاوەند زانی خۆیان تێ خزاند، ترسێکی، کە بیانبووایە میللەتی کورد بوون . ئەوانیش لەبەر برسێتی و رووتی پەنچەی رۆمیان حاڵی بەرابەریان پێوەنەدەدی، هەموویان بە مردوو حیساب کردبوون، گوتیان ئەگەر کەسێکی زیندووشیان لێ پەیدابێت دەیکوژین، بە کەم زەمانێک خۆمان بە ئەورووپاوە دەنێین و موستەقیلەن حکومەتێکی جیلۆیی دادەمەزرێنین. لەسەر ئەوە بە شەو و بە رۆژ دەکۆشان و لە هەموو ئەکنافی دنیادا پەرێشان و بڵاوانی خۆیان وەخڕدەکرد و ملیان لە ماڵ و موڵکی کوردەواری نابوو، گەلێکیان ئاوایی وێران کرد.

---

(*) لێرەدا مەبەست لە ئاسوورییە، بەڵام لەرووی ئەوەی ئاسووری و ئەرمەن لە رووی دینەوە مەسیحین، وەکو یەک تەماشایان دەکەن، بۆیە ئەم دوو نێوە لە بری یەکتر بەکار دەهێندرێن.

## سەبەبی کوشتاری ئەرمەنی

کچێکی کوردی شکاک بە ڕێگایەدا دەڕوات، خەیول ناوێکی ئەرمەنی بە چاردە نەفەر ئەرمەنەوە دەیگەنێ ، بەهەمووان ئەتکی دەکەن. کچەکە دەرپێی خوێناوی خۆی هەڵدەگرێت و دەچێتە کن سمکۆ و ئەو دەرپێیەی لەپێش دادەنێت. سمکۆ عەشیرەتی عەبدۆیان بانگ دەکات و دەڵێت: نامووسمان بەبادا چوو، نابێت خۆتان بە پیاو بزانن، تاکو خەیول نەکوژن. سێ نەفەر شکاک چوونە سەر ڕێگەی و کوشتیان.

میر شیمۆن لە خسرۆاوا لە جێگەی دانیشتنی خۆی جواب لە سمکۆ دەنێرێت، کە فەلە لێت قبوول ناکەن، چتی وا چاک نییە، کە کردت.

سمکۆ دەفەرمووێت خەیول چتێکی زۆر بێ قاعیدەیی و بێ قانوونی کردبوو، کە هیچ بەشەرێک ئەوە قبووڵ ناکا، بە پازدە کەس کچێکی چاردە ساڵی ئەتک بکەن، جەزای ئەو لە کوشتن زیاتر نەکەوتە بیرەوە.

ئەگەر مەیل دەکەن بۆ موزاکەرەی ئەوە تەشریف بێننە سەڵماس (کۆنەشار) لە ماڵی مەشهەدی حەسەن ئیتیفاقێک بکەین.

حکومەتی قاجاری ئێران زۆر لەوە دەترسا سرە بگاتە تەواوی ئاوربایگان بەدزییەوە قاقەزیان بۆ ئیسماعیل خان نووسی، کە تۆ بۆ لابردنی میر شیمۆن بکۆشە ئێمە کوردستان و ئاوربایگانتان دەدەینێ و حکومەتێکی کوردستانی تێدا دامەزرێنە.ئیسماعیل خان فەرمووی بەڵکو دەرەقەتی نەهاتم . ئێران وەعدەی دایە هەرچی بخوازێت پێی دەدرێت و ئیستیقلالیشت بۆ تەسدیق دەکەین. ئیسماعیل خان بەوە پشتی قایم بوو، لەگەڵ میر شیمۆن خۆی ڕێکخست، بوون بە دۆست یەکتریان میهمانی دەکرد، تاکو سمکۆ بەتەواوی میر شیمۆنی بە خۆیەوە رام کرد. ڕۆژێکی چل تفەنگچی دلێر و ئازای هەڵبژارد پێی فەرموون، کە میر شیمۆن لە کن من دانیشت و دەنگی سیلاح هات، هەر یەک لە هنگۆ پیاوێکی میر شیمۆن بکوژن. ئیسماعیل خان دەنێرێتە دوای میر شیمۆن بۆ سەڵماس میهمانی دەکات، ئەویش بە ١٦٠ سوارەوە هەڵدەستن دەچنە کۆنە شار(سەڵماس) . سمکۆ بە هەموو نۆکەر و دەستوپێوەند پێشوازی دەکات، بە عیزو شەرەف دەیبەنە ژوورەوە و سەرای بۆ دەڕازێننەوە، لە دیواندا ئیسماعیل خان و میر شیمۆن پێکەوە بەتەنها مشوەرەت دەکەن، کە چۆن خۆ دامەزرێنن و بەری عەجەم بگرن لەو بابەتەوە گەلێک دەدوێن. تا وەختی نان دێت، موجوعمە دێتە مەجلیس نان دەخۆن و چای

دەخۆنەوە. میر شیمۆن بۆ گەڕانەوە ئیزن وەردەگرێت. میر شیمۆن زۆر حورمەتی سمکۆی دەگرت وەپێشی نەدەکەوت، بەڵام ئەو ڕۆژە سمکۆ بەزۆر وەپێشی خۆی دەخا، لە پلەکانان دەچنە خوار سمکۆ بانگی دەکاتێ هەرچەند عادەتی کوردان نییە میوانی خۆیان بکوژن، بەڵام بۆ مەسلەحەتی میللەتی کورد ئەم دەمانچەیەم لێ وەرگرە، دەمانچێکی لێ دەدا هەتا میر شیمۆن هاوار دەکا گیانی پێ نایەڵن. نۆکەرانی سمکۆ هەر یەک پیاوێکی میر شیمۆن دەکوژن . لە پاش نۆ ڕۆژان دەفەرمووێت هەموو باردەکەن بۆ لای (خۆی) هەڵدێن.

لە چاریدا غەیری پیرێژنێک نەبێ نەمابوو، جیلۆکان، کە ئەمەیان بیست لە ورمێ بەر بە چاری بەڕێ کەوتن، هەموو سەراو خانووبەرەی سمکۆیان تاڵان کرد و سووتاندیان و پیرەژنێکی پیریان دەستکەوت، هەڵیان قڵاشت و گەڕانەوە ورمێ. ئەو دەنگە بە هەموو کوردستانی ئاوربایگاندا بڵاوبۆوە، عەشیرەتی مامەشی لەژێر فەرمانی قەرەنی ئاغای مامەشدا هجومیان کردە سەریان و لە دەشتی سندوزدا گەلێکیان لێ کوشتن، ئاغاواتی دیبوکری لە .. موکریانەوە لە بن ئەمری عەلی ئاغای حاجی ئیلخانیدا و بەگزادانی موکریان بە کۆمەڵە لنگیان دا سەر جیلۆیەکی داخل بە موکریان بوون هەموویان قەتل و عام کردن. لە شنۆوە ڕەزا خان زەرزا دیسان دەمی تێ نان شکاندنیان تا لە ورمێیان پەستاوتن، سمکۆ هەرچەند لە ئیرانێ کۆمەکی خواست کەسێک بە هاوارییەوە نەهات. لە ساڵی ١٣٣٨ سمکۆ بە قووەتەوە چووە سەر سەڵماس لەوێوە چووە سەر ورمێ، موکریانی لە تەرەف دۆڵێوە سمکۆ لە تەرەف سەڵماسەوە ورمێیان دەورە دا، دەستیان کرد بە کوشتاری جیلۆیان، دە ڕۆژی دەوام نەکرد ورمێ گیرا، حاکمێکی لە تەرەف خۆیەوە لەسەر ورمێ دانا، جەندار و پۆلیس لە تەرەف سمکۆوە تەعیین کرا و بۆخۆی گەڕاوە چاری. داوای وەعدێی ئێران پێیان دابوو کردی و چەند قاقەزی بۆ شا، کە ئەو وەختە ئەحمەد شای کوڕی حەمەد ئالی شا بوو نووسی جوابێکی وەرنەگرت وەعدە بەجێ نەهات.

## عەلی ئاغا برای سمکۆ و بۆمبا

سمکۆ لە چاری هەموو گەورە و سەردار عەشیرەتی کوردەواری وەخرکردەوە لە هێندێک مەسایلدا شوورەتیان دەکرد، وەلیعەهد میرزا حەسەن خان لە تەورێزەوە بۆمبایەکی خستە نێو سندوقێکەوە ناردیە (خۆی) کە بۆ سمکۆی ببەن ، شازادەیەکی نارد، ئەویش گەیشتە (خۆی) جەسارەتی نەکرد بۆ خۆی بچێت، پیاوێکیان بەکرێ گرت چەند بۆمبایەکیان دایە و ناردیان ، ئەو پیاوە بێ خەبەر بوو لەوە ، کە چی لە سندوق دایە، هەڵسا بەری خۆی دا

چاری . سمکۆ و تەواوی سەرکردان لە داوێنی سەرای باخچە بوون، سەماوەریان دانابوو، بە چاخواردنەوە خەریک بوون، نیزیک شەست کەس لە خزمەت دابوون، ئەو شوانە گەیشتە پێش، سندوقێک بەدەستەوە. سمکۆش خەسرۆی کوڕی لەسەر کۆشی دانیشتبوو، کە سندوقیان هێنا پێشەوە لێی پرسی کوڕە ئەمە چییە؟ عەرزی کرد پادشای ئێران بە دیاری بۆی ناردووی، نازانم چی تێدایە، بەڵام گۆشەی دەستمالێکی زەرد و سوری لێ دەرکەوتبوو، خەسرۆی کوڕی، کە ئەو سوڕ و زەردەی چاوپێکەوت، گورووی گرت بیکەنەوە، ئەمە شیرینیاتە. سمکۆ فەرمووی کوڕم بۆمبایە، خەسرۆ دەستی لێ بەرنەدا، سمکۆ لەبەر دڵی کوڕەکەی خەنجەرێکی لەبەر خەسرۆ دابوو دەری کێشا، دەسماڵێکی پێ پێچرابوو سەری نووکە خەنجەری گەیاندێ فیشەیەکی لێوەهات. سمکۆ زوو خەسرۆی گرت و لە زەویدا پان بۆوە بە لنگی فڕێی دا بانگی کرد کوڕە بۆمبایە، هەرکەس لە راستی خۆی پان بۆوە، شەقێکی تێ هەڵدا، ئەحمەد ئاغای برای سمکۆ فڕێی دا پێش عەلی ئاغای برای، چای تێکەر لنگی دا هەڵی گرێت، بۆمبا تەقا، عەلی ئاغای برای سمکۆ لە چەند جێگایان برینداربوو، چاردە کەسی دیکە لە نۆکەران برینداربوون سی و دوو کەس دەکوژرێن.

سمکۆ تەواوی جلی خوێناوی عەلی ئاغا دەگرێت هەر پارچەیەکی بۆ سەردار و گەورەیەکی کوردان دەنێرێت، غەیرەز رەزا خان هەموویان قبووڵیان کرد، سەید تەها، نوری بەگ و گەلێکی دیکە بەشدارییان لەگەڵ کرد، هەموو لەشکریان وەخڕکرد بۆ شەڕکردن ئامادەبوون. جوابیان بۆ وەلیعەهد نارد قاقەزێکیان بۆ پادشا نووسی، حکومەت ئینکاری کرد، کە چتی وا نەکراوە ، سمکۆ ئەو پیاوانەی لە حکومەتی ئێران خواست، کە بۆ فەسادی نێوانی ئەو جۆرە کارانەیان کردووە، سمکۆ لە دیلمانەوە لەشکری نارده سەر (خۆی) شازادەیەک و چەند کەسی بەدیل گرت، قاقەزێکی لە تەورێزەوە نووسی ئەو وەستایەی بۆمبای دروست کرد و ئەو ساحێب مەنسەبانەی بۆمبایان رەوانە کردوون ، دەبێ بماندەنێ، ئەگەر حکومەت نەیاندا چەند کەسێکی بە دیلمان گرتوون دەیانکوژین و تا ماوین لەگەڵ حکومەت شەڕ دەکەین.

حکومەتی ئێران، کە تەماشای کرد شۆڕش زیاد دەبێت و سمکۆش پیاوێکی ئازا و بەکارە ناتوانن بۆ لابردنی بەرابەرێتی بکەن، لەسەر ئەوە قەراریان دا ئەو کەسانە پەیدا بکەن و بیاندەنە دەستیان ئەوانیش بە ویجدانی خۆیان یا دەیانبەخشن و یا دەیانکوژن. حکومەت یازدە کەسی لەوانەی سەبەبی بۆمبە بوون ناردنیە شاری (خۆی) و لە وێوە

دایانن بە سمکۆ، بردیاننە چاری . عەلی ئاغا فەرمووی وەستا مەکوژن، چونکو سنعەتکارە، پیاوی کاسب هیچی لەسەر نییە، سێ ڕۆژ لەسەر هاتنی ئەوانە رابورد عەلی ئاغا وەفاتی فەرموو. ئەو وەختە سمکۆ دەرکەوتە بەر دەرگای سەرای عموومی بانگی کردە گەورە و کارداران وەرنە دیوان، هەموو لە دیواندا وەخڕبوون. سمکۆ فەرمووی عەلی برام وەفاتی کرد، ئێستا فیکری هنگۆ لەگەڵ ئەوانەی حکومەت تەسلیمی کردووین لەسەر چییە؟ هەموویان لەسەر ئەوە قەراریان دا، بانگ کرێن و لێیان سوئال بکرێت لەپاشان بە پاداشی خۆیان بگەن، تاکو لە هەموو کەس ئاشکرابێت لەسەر چی پاداشیان دراوەتێ لەو مەجلیسەدا دوو هەزار کەس مەوجوود بوون هەرکەس لە جێگایەکی شایستە دانیشتن.

سمکۆ فەرمووی ئەو یەخسیرانە بێننە دیوان تا بزانین کێ چی کردووە و لێیان بپرسین. نۆکەران دابەزینە بەندیخانە و هەر یازدە کەسیان دەرخست و لە حزووردا ڕایانگرتن. لەپێشدا لە وەستایان پرسی تۆ چی؟ گوتی: خاوەندی کارم . پێیان گوت ئەو بۆمبایە تۆ دروستت کرد؟ گوتی بەڵێ دوو هەزار تومەنیان دا بە من تا دروستم کرد؟ گوتیان کێ وای بە تۆ و ڕایئەسپاردی ، کە دروستی بکەیت؟ گوتی: ئەو شازادەیە، کە لەگەڵمان گیراوە. سمکۆ لە شازادەی پرسی کە کێ بە تۆی گوت، ئەو بۆمبەیە دروست کەیت، تا بمکوژێت؟ شازادە گوتی: حەسەن میرزای وەلیعەهدی ئێران. لەو وەختەدا ئەحمەد ئاغای برای هەڵسا سەرخۆی عەرزی کرد وەستا بێ گوناهە، هەموو گوناهێک لەسەر شازادەیە. سمکۆ فەرمووی ئێستا موحاکەمەیە، جارێ پاداشیان دیارناکا، تا بزانی کێ دەکوژرێت. لە پاشا سمکۆ لە ئەوانی دیکەی پرسی هنگۆ بۆچی هێناتان؟ گوتیان ئێمە سوپایین، گەورەمان ئەمرمان بە هەر چتێک پێ بفەرمووێت دەبێ بیکەین. لەپاش ئەو سوئال و جوابە ئیسماعیل خان کاری خستە موزاکەرە هەموو گەورە و سەرداران بە دووهەزار کەس یەک فکر قەراریان دا لە ( راز ) لەسەر چیایەکە هەڵدێر شاخ و ماهێکە بڵند بیان ئاوێژنە خوارەوە، بە فەرمایشی دووهەزار کەس و بە حوکمی سمکۆ هەموویان دەستوپی گرێ دان ملیان گرتن و بردیاننە سەر راز، شازادە گەلێک پاڕاوە و گوتی هەرچەندە دەخوازن بوودەمێ مەمکوژن، قبووڵیان نەکرد، لە پاشان گوتی دووهەزار تومەن و دەهەزار فیشەک و هەزار تفەنگ و دوو شێستتیر دەدەم و کچی خۆشم پێشکێش دەکەم مەمکوژن، سمکۆ تەمای بەردانی کرد، لەپێشدا ئەو دە کەسانەیان لە رازەوە بەریاندانەوە خوارێ و لە هەر چوار کەنارەوە شیلنگی تفەنگیان کردنێ هەموویان پارچە پارچەبوون، شازادە ماوە . ئەحمەد ئاغای برای سمکۆ هەڵسا سەرخۆی گوتی: عەلی برام وەسیەتی کرد وەستاکار

مەکوژن، بە قسەتان نەکرد، ئێستاکە شازادەیەکی مایەی فەساد، کە هەوێنی فیتنەییە بۆ تەماعی دراو بەردەدەن، قبووڵ ناکەم دەبێ هەر بکوژرێت. سمکۆ ناعیلاج بوو فەرمووی شازادەشیان دەستوپێ گرێ دا و هەڵیانداشتە خواری رازەوە ئەویشیان کوشت.

## چوینی سمکۆ بۆ سەر ورمێ

دوو رۆژ لە پاش ئەوە تەدبیر وا کرا هەڵمەت ببەنە سەر ورمێ، لە ورمێ سێ سەربازخانەی لەشکری هەبوو، بەڵام ئەو سێ سەربازخانانە نەگیرابوون، هەرچەند لەشکری ئێرانی لە ورمێدا کەم بوو، ئەهالی هەموو جەنگاوەربوون، تەرەفداری عەجەم بوون، حەزیان نەدەکرد سمکۆ بیگرێت، بەڵام لە ترسان خۆیان لە شەڕی سمکۆ دەپاراست. سمکۆ فەرمووی قووەتی کوردان بکرێنە سێ بەش، هەر بەشێک روو لە سەربازخانەیەک بکەن، بەجۆرێک بێت بیگرن، بەو شەرتە سێ قۆڵ لەشکری کوردان بە سێ جێگا روویان لە ورمێ کرد، شار بێ بەرابەر خۆیان خستە پێشەوە، پێشوازیان کردن و بە ئیحتیرام قبوڵیان کردن. کورد بەچوونە نێو شار دوو سەربازخانەیان خستە بەردەست. کوردەواری، کە داخل بە شار بوون دەستیان کرد بە تاڵانکردن و رووتاندنەوە، سەربازخانەی سێیوم، کە وایانزانی تاڵان دەکرێن، کەمەری بەرابەریکردنیان گرێ دا، هەموو لەنێو سەربازخانەدا خۆیان خستە مەتەرێزەوە، کوردیش بە لێشاو هەڵمەتیان برد، لەسەر ئەوە لە کووچەی ورمێدا کوشتار دەست پێ کرا، شێست و سێ کەس لە کورد بریندار و کوژراو پەیدابوون، لەشکری کورد مەجبوور بوون لە شار دەرکەون، چونکە کەمێک خۆیان بگرتبا، ژن و منداڵی شار بە بەردە گلەمت دەیانکوشتن، ماڵ شیرینە و بە دەستیانەوە نەدەدا، کوردیش لەبەر تاڵانکردن و راورووت لە ئەوەڵ چوونیاندا شەڕ و کوشتاریان لەبیرچوو، دوای نەتیجە بۆ دەرکەوتن لە شاریان مەجبوور کردن، هەموو شاریان بەردا، هەر چوار کەناری شاریان دەورەگرت، جۆگە و خەرەندان، کە ئاوی پێدا دەچووە نێو شارەوە بڕییان و ئاویان نەهێشت تنۆکێک بچێتە نێو شارەوە. ئەوە ئەهالی خستە تەنگانەوە، بەڵام هەموو ئەهالی ورمێ چەکیان هەڵگرتبوو شەڕیان دەکردو کوردیش مودەیەکی زۆر لە ئەتراف شاردا راوەستابوون و هەڵمەتیان دەبرد، عەجەم لە ئەسکەلەی پڕ سوپا قووەتێکی زۆری نارد بۆ ورمێ، کە کۆمەکی ورمێ بکات، کوردان لنگیان دانێ و ئەو قووەتەیان پەرشوبڵاوکرد و ئەسکەلەشیان گرت، شێخ عەبدوڵڵا کوری شێخ محەمەد بوو بە قوماندانی ئەو جێگایە، کورد لە برسان و لە سەرمان زۆر لە تەنگانیدابوون، چەکیان تەواو ببوو، هەموو نێزیک بە هەڵاتن بوون، خودای پەروەردگار

کەشتێکی لە تەورێزەوە نارد، ئەو کەشتییە گیرا، هەزار و سێسەد بار برنجی تێدابوو، ئەو برنجە بوو بە سەبەبی ژیانەوەی کوردان، شێخ عەبدوڵڵا بەسەر لەشکرانی دابەش کرد، کورد هێزێکیان هاتەوە بەر و پشتیان بە قووەت بوو.

لەپاش گرتنی ئەو برنجە کورد نەختێک کەوتنەوە غیرەت و بەتوندی شاریان دەورەدا و لە هەر چوارر کەنارەوە هەڵمەت دەست پێ کرا، تەواوی مولحەقات کەوتە دەست کوردان، شارستانییان ترساند، بە هەڕەشە و گوڕەشە و ترس وەبەرنان و بە دڵخۆشیدانەوە، ئەهالی شاریان کێشا لای خۆیان. ئەهالی مەیلیان بۆ کوردان دەست پێ کرد، پوروپۆگانەی کوردان کەوتە نێو شارەوە، هەر رۆژ بە رەنگێک شایعە دەکرا، ئەهالی زۆر ترسیان لەوە پەیداکرد، کە کورد شار دەگرن و و هەمووان قەتل و عام دەکەن و کەسێکیان لێ ناهێڵن. رێگای رزگاری لەگەڵ ئەوان یەکبوون و ئیتیفاقە. بۆ دڵ وەرگرتنی کوردان سەردار فاتح نێوێک، کە حاکم بوو لە ورمێ گرتیان و بە ئەنواعی ناشایستە ئەزیەتیان دا و گرفتاریان کرد، ئەویش لەبەر ئەهالی پاڕاوە، کە لەگەڵیان یەکبن لە شاریدا بە تەنگە لێدان گێڕایان و سەر و ژووریانک رد، پێیان گوت لەگەڵ ئێمە رێک نەکەویت و ببیە سەبەبی ماڵ وێرانیمان، پارچە پارچەت دەکەین، سەردار فاتح بە هەموو رەزالەتێکیان رازی بوو، هەر ئەوەندە لێی گەڕێن.

## شەڕی سمکۆ و سەردار ئەرشەد

لە مانگی مایسی ساڵی ١٣٣٩دا عەجەم لەژێر قوماندانی کۆلۆنێل لەندریک لەشکرێکی مونتەزەمی ناردە سەر چاری و دیلماندا، شەڕ دەست پێ کرا، سمکۆ و دوو هەزار شکاکەوە پێشی بۆ سەرداری عروسی گرتن شەش سەعات تەواو تفەنگ و تۆپ و شێستتیریان لێکدا، لەدواییدا سەرداری عروس شکان، لەشکرێکی عەجەم سێیەکی رزگار نەبوو، هەموویان کوژران و چەند کەسێک بە دیلگیران، سمکۆ گەلێکی قورخانە و تفەنگ و دوو شێستتیر و تۆپێکی لێ گرتن، زەخیرە و تالانێکی زۆریان دەستکەوت، عەجەمێکی لە شەڕی سمکۆ رزگاربوون بە پەرێشان و فەلاکەت خۆیان گەیاندەوە تەورێز. ئەو شەڕە مودەفەقە ئەوەندەی دیکە پشتی کوردانی قایم کرد، وەلێ عەجەمانی خستە لەرزەوە ئەهالی ورمێ، کە ئەوەیان بیست، کەیخودا و ریش سپییان و کاربەدەستان وەخڕبوون و گوتیان مادامە دەوڵەت بە هەموو قووەت و شەوکەتی خۆیەوە لەژێر فەرمانی سەردارێکی گەورەی عرووسدا نەیتوانی بەرابەری سمکۆ بکات و شکستی خوارد و

ئوردوویەکی وا مـونتـەزەم دووچاری ئەو فـەلاکـەتە بوون، دەبێ کـورد زۆربن و قـووەت و جبەخانە و چەک و سیلاحیان گەلێک بێت. وا چاکە تاکو ئێمەش بە دەردێکی گەورەتر گرفتار نەبووین و لانەوازی و پەرێشانیمان تووش نەبووە چارێک بۆ دەردمان پەیدا بکەین و بەهەرجۆرێک بێت لەگەڵـیان رێککەوتن چاکە، بۆ ئەو فکرە کەیخودا و سەرکارانی شاریان بانگ کردە جێگایەک و دەستیان کرد بەبیر و فکران، پیاوێکیان ناردە خزمەت سمکۆ تا چەند کەسێک بنێرن لە گوندی بندڵ موزاکەرەیەک لە خۆمان بکەین.

## گرتنی ورمێ

سمکۆ چەند کەسێکی لە تەرەف خۆیەوە بە مورەخەسی ناردە بندڵ و کەیخودایان و گەورە و سەرکارانی ورمێ چەند کەسێکیان ناردە ئەوێ، لە پاش گەلێک دانوستان قەراریان دا حاکمی ئێران لەنێو خۆیان دەرکەن و حکومەتی کوردان قبووڵ کەن، سمکۆ تەرەفداری ئەوە بوو بۆ ئەهالی زەرەرێک روونەدا و بەو جۆرە هەردوولا پێکهاتن.

ئەرشەدی ژنبرای سـمکۆ کرا بە حاکم، نێـو شاریان رێکخست . شێخ عـەبدوڵڵا بوو بە رەئیسی نەزمییە، خاڵ مستۆی شکاک بوو بە رەئیسی ئەمنییەت، ئەسکەلەی بەحر درا بە تەیار بەگ . چەندێکی پێ نەچوو ئێـران قـشـوونـێکی زۆری لەبن فـەرمـانی ئەرشـەدی شاسـەوان دا بە تۆپ و جـبـەخـانە و قـورخـانەیەکی زۆرەوەی ناردە (خۆی) لەپاش چەند رۆژێک لە شـەرەفـخـانـەوە بۆ گـرتـنی چاری بزووت و کـەوتە رێگا. سـمکۆ ئەوەی بیـست عـومەر خانی بە قووەتێکی تەواوەوە ناردە پێشی لە (سۆلاو) نێـو جێگایەکدا بەرەنگاری ئەرشەد بوو، تۆپ و تفەنگ کەوتەکار دەنگی شەقە و تەراقی تۆپ و هوور دەنگی گوێی ئاسـمـانی کـەڕ کردبوو، شـرنگەشرنگی تفـەنـگ و ویزەویزی فـیـشـەنگ و هاواری بگرە و بەردەی کـوردان و قیژە و ئامـانی عەجـەم عالەمی باڵای کردە سەیرکەر و هێنانییە رۆژنەی تەماشاوە ، ئەرشەد رێگای پێ تەنـگ بوو، مەیدانی شەڕی لێ تاریک بوو، کونێکی خۆی تێدا بشـارێتەوە پەیدانە دەکرد، بە مەجبووری غەیرەز بەرابەری چارەیەکی دەست نەکەوت، هەردوولا دەمیـان تێکنا، لەشکری کـورد وەکو شێری نێر لە هەمـوو لایەکەوە هەڵـمـەتیان دەبردە سـەر مـێـگەڵە رێوبییـان بەکـوشتن و دیل و برینداری شـپـرزەیان دەکـردن، لەشکری عەجەم وەکو رێوی هەریەک لە کونێکدا خۆیان دەشاردەوە، پاڵەوانی خون خوارانی کوردان چوار دەورەیان پێ دەگـرتن، ئەوانیش بە نـاعـیـلاجی روویان دەکـردە شـالاوبردن، هەر بەو جۆرە یازدە شەو و یازدە رۆژان کوشتـاربوو، رۆژی یازدەم نێزیـک ئێـوارە تەقـورەقی هەڵاتن

کەوتە نێو عەجەم، کوردانی پڵنگ هەڵمەتی شێری سەوڵەتی ئاژووها هەیبەت کەوتنەسەریان هەرچوار کەناری ڕێگایانیان لێ گرێدان و گرتیاننە نێوان خۆیان و هەڵمەتبردنیان دەست ی پێ کرد، کە ڕەوە نێچیری هەڵاتوویان دی کەللەیان گەرم بوو ئامان ئامانیان لە عەجەم پەیداکرد، نەکەوتە شێوان تەواوی لەشکری مابوون بەدیل گیران هەرچی کوژرابێ کوژران، ئەرشەدیش لەنێو کوژراواندا(*) بەکوژراوی کەوتە دەست، چوار شێست تیر و دوو تۆپ و چەند سەد سندوق فیشەنگ و موهیماتێکی زۆر و زەخیرە و چەک و سیلاحێکی بە ژمارە کەوتە دەست قەهرەمانانی کوردان هەموویان بردە خزمەت سمکۆ فەرمووی یەخسیران بەنەوازش ڕابگرن ، سێ چوار ڕۆژ بەخێویان کردن، تاکو هێندێک لە ماندووبوونی شەڕ حەسانەوە، هەموویان دا بە کوردان...

ئەو شەڕە بۆ کوردان زۆر بەکاربوو، لە لایەکەوە ئێرانی شکاند و لە لایەکەوە چاوی عەجەمانی ترساند و کوردەواری خستە سەر شەوق و پشتی قایم کردن. سمکۆ ناردی سەرۆکانی بانگ کردە دیوانی بۆ بەر بە شنۆ و سابلاخ بزووتن و تەدارەک گیرانیان مەشوەرەت کرد.

## شەڕی کورد و عەجەم لە شەرەفخانە

لەو وەختەدا عەجەم قووەتێکی شەش سەد نەفەری ناردە حەیدەراوا، تۆپ و تۆپخانەیەکی زۆری ناردە سنوور..، جێگای سەید تەها، ئەویش دووسەد نەفەر کوردی جەنگاوەری دلێری لە خزمەت خۆیدا هەڵگرت و چووە بەرابەر ئەو قووەتە بەرەنگاریان بوو، لەپاش چەند شەڕ و کوشتار لەشکری عەجەم پەرێشان بوو لەوێش گەلێکیان جبەخانە و سیلاح دەستکەوت، زەخیرە و قورخانەیەکی بێ ئەندازەیان لە عەجەم گرت، چەندێکیان لێ بەدیل گرتن و بەخۆشی گەڕانەوە مەوقعی (بەرئەندێز) و ئەسکەلەی حەیدەراوای تەسلیم بە عەبدوڵڵا بەگ شێخ جانگیر کرد، مانگێک لەو واقیعە تێپەڕی عەجەم لەناکاو لەشکرێکی مونتەزەمی بە دەریادا سواری کەشتی کردن لە گۆشەیەکی کەنارەوە دەری خستن بەناکاو لنگیان دا سەر عەبدوڵڵا بەگ ، عەبدوڵڵا بەگ لەبەر توندی سەرما و بێ تەدارەکی و کەمی لەشکر مەجبوور بوو حەیدەراوا بەردا، لەپاش دووجار شەڕکردن

---

(*) کە باسکی ئەرشەد گەران حەمایلێکی تێدابوو نێوی لەسەر نووسرابوو، ئەو حەمایلەیان بۆ سمکۆ برد، سمکۆ گوتی: ئێستە تۆڵەی خوێنی جەوەر ئاغام کردەوە و ئەو حەمایلەی بەدیاری بۆ گوڵێزار خانم کچی جەوەر ئاغا نارد.

بەرابەری دەرکەوت و گەڕاوە چووە شەیتاناوا. عەجەم حەیدەراوای دووبارە خستەوە دەست. لە چاری، کە سمکۆ بیستی ناردیە سەر شێخ عەبدوڵڵا سەرۆکی نەزمییەی ورمێ بە مردن یا بە ژیاوە بێت، دەبێت عەجەم لە حەیدەراوا دەرکەن و بە دیلیان بگرن. شێخ عەبدوڵڵا لەسەر ئەمری سمکۆ هەندێکی سواری دلاوەرانی کوردی هەڵگرت و بەشەو بەسەری دادان، لەپاش پەرێشانی و تالانیان گەلێکیان عەجەم بە دیل گرت و هێندێک بە شپرزەیی خۆیان کوتاوە دەریا، بەڵام تەواوی ئالەتی چەکیان بەرداو هەلاتن، لەوێش کوردان چەکێکی زۆر و تالانێکی بێ ژماریان گرت. دیسان حەیدەراوا کەوتەوە دەست کوردان.

لەدوای گێڕانەوەی حەیدەراوا سمکۆ ئەنجومەنی گرت. دووبارە سەرۆک و کاربەدەستانی بانگ کرد، کە دەبێ لەشکرێکی زۆر چاک وەخرکەین و بە موهیماتێکی گەورەوە بیاننێرینە سەر شاری (خۆی) و دەستەیەکی مونتەزەمیش بچنە سەر شنۆ و موکریان. بۆ (خۆی) قەراردرا لە دیلمانەوە بچن، لەشکرێکی زۆر لەژێر فەرمانی عومەر خاندا وەخربوون و گەلێک سەرداران لەگەڵی کەوتن لە دیلمان راوەستان چاوەڕێی ئەمریان دەکرد. سەید تەها لەگەڵ سمکۆ لە چاری مشوەرەتی چلۆنی شەڕیان دەکرد، پەیامی عومەر خان هات، کە شەش هەزار لەشکرێکم بۆ وەخرکرا، فەرمایشات بۆ چوونە سەر شاری (خۆی) چییە بفەرموون. سەید تەها لەبەر زستان و بەفر و سایقە نەهی لە چوون فەرموو، کە ئەمرۆکە ئەو لەشکرە بکەونە دەشتی خۆوە بە هیلاک دەچن، چونکو کێوێکی خۆیاتی تێدا رابگرن نزیک بە (خۆی) دەست ناکەوێت، هەموو دەکوژرێن و لەبەر تەڕوتووشی رزگار نابن و بۆ نەچوونیان گەلێک کۆشا.

لەو وەختەدا، کە لەشکر بۆ چوونی (خۆی) بەراو ببوون، سەید تەهاش مەنعی چوونی کردن. ئێران لە ئەسکەلەی (بەرەسپییان)ەوە شەش هەزار و پێنجسەد کەس لەشکری شەراری لە کەشتی دەرخست لەبن فەرمانی ئەسەدوڵڵا خاندا هەڵمەتیان بردە سەر کوردان، هەر لەو رۆژەدا کازم بەگی قەرە قشلاغی لە زومدەشتەوە بە قووەتێکی تەواوەوە هاتە پێش کوردان لە (قوتچی)دا دامەزران، لەشکری کورد، کە بۆ (خۆی) ئامادە ببوو، بوون بە دوو بەش، بەشێکی لەژێر فەرمانی عومەر خاندا لەگەڵ شێخ عەبدوڵڵا بۆ ئەسکەلەی (بەرەسپییان) تەعیین کران، قووەتی دیکە چوونە سەر (قوتچی) لەبەر سەرما و زستان و بەفر کورد لە قوتچی دەرکەوتن. عەجەم سێ کۆشکی داگیرکرد. ئەسەدوڵڵا خان لە ئەسکەلە جێگیر بوو، ئەهالی ورمێ، کە ئەوانەیان زانی کەوتنە بزووتن و بەدزییەوە لەگەڵ

ئەسەدوڵڵا خاندا ڕێککەوتن و سەریان لە کوردان پێچاوە.

لەشکری کوردێکی بۆ سەر ئەسکەلە تەعیین کران بوون بە دوو بەش، بەشێکی لە بن فەرمانی سەید شەمسەدین کوڕی شێخ حەمە سدیقدا بۆ موحافەزەی ورمێ چوون و بەشی دووەم لەژێر فەرمانی عومەر خان و شێخ عەبدوڵڵادا چوونە سەر ئەسکەلە، لەوێ ئەو لەشکرەیان کردە سێ بەش، بەشێک عومەر خان و بەشێک سەید موسلیح برای سەید تەها و بەشێک شێخ عەبدوڵڵا لە سێ لاوە لنگیان دا سەر ئەسکەلە.

ئەهالی ورمێ ئیتاعەتی کوردانیان نەخواستەوە، هەموو نانەواخانانیان گرێ دا، نان نەدەن بە لەشکری کورد. ئەرشەدی حاکمی ورمێ لەگەڵ سەید شەمسەددین بە قووەتی لەشکر هەموو شاریان کردە مەنتەقەی سپاهییان، هەموو دەروازانیان خستە دەست کوردان بۆ ئێوارە هەر سێ قۆنگرەیان گرت لەشکری کوردانی تێ خزا، ئەرشەد بەسەر زەخیرە ڕاگەیشت، لە حکومەتدا بۆ (خۆی) نان و خواردنی بە لەشکر دەدا، شاری ورمێ کەوتە ئاسایشەوە، ماوە ئەسکەلە بگیرێت و کێوێکی نزیک بە بەرەسپییان بوو، لە دەست ئێران بوو، سەید تەها هاتە سەر تەلەفۆن ئەمری فەرموو ئەمشەو دەبی ئەسکەلە بگرن، ئەگەر ئەمشەو نەیگرن دەستی هەمووتان دەبڕم، لەسەر ئەو فەرمایشتە نەیانتوانی خۆڕابگرن بەمەجبووری هەر ئەو سەعاتە شێخ عەبدوڵڵا و سەید موسلیح ئەمری هەڵمەتیان دا، شێری پاڵەوانانی کورد وەکو پڵنگی لە لان دەرکەوێت لە هەر چوار لاوە دەستیان کرد بەشەڕکردن، کەناری دەریایان لێ گرتن و ڕمیان تێ نان، تا نزیک بەیانی ئەسکەلەیان لە ئێران گرتەوە، سێ نەفەر کورد لەو شەڕەدا شەهید کران و لەشکرێکی لە کوشتن ڕزگاربوون بەر بە شەرەفخانە هەڵاتن، خۆیان خەلاس کرد و لەو شەشسەد نەفەرە چل نەفەری لێ ڕزگاربوو.

## موخابەرەی سمکۆ لەگەڵ موکریان

سمکۆ بە مەشوەرەتی سەید تەها قاقەزیان بۆ هەموو ئەترافی کوردەواری نووسی، بۆ بەگزادە و ئاغایانی موکریان و مامەش نووسی، کە ئێمە کوردین و ئەم خاکە ئیرسی ئێمەیە، لەگەڵمان ڕێککەون بەیەک دەستی خاکی خۆشەویستی وەتەن لەژێر پەنجەی دوژمن دەرخەین، بەسە ڕەزالەت و زوڵم و جەور، لە دەستی عەجەم خۆتان ڕزگارکەن، ئەمن لەگەڵتان خزمەت دەکەم، تا ڕزگار دەبین، لەپاشان مەیلتان بە کێ بوو بیکەن بە حوکمدار، لەمەدا مەقسەدی ڕزگاری میللەتی کوردە لەدەست بێگانە، بزانن لە شەڕی عرووسدا

عەجەم چی لێ کردن و چەندی بەکوشت دان و خستنیە ژێر پێی عرووسانەوە، پیاوبن بە پیاوەتی خۆتان رزگارکەن. بەو جۆرە چەند جار بەیاناتی بەنێو ئەهالیدا بڵاوکردەوە، لە موکریاندا هەموو ئاغا و بەگزادەکان لەگەڵی بوون بە هاودەنگ ( عەلی ئاغا کوڕی حاجی ئیلخانی دیبوکری) بوو بە سەبەبی تەشویقکردن ( کەریم ئاغای کۆسە کریزە) و (عەلی حوسێن ئاغا ) بوون بە پشتیوانی عەلی ئاغا. هەر ئەو زستانە ( ١٣٤٠ ) ئێران لە موکریان ترسا لەشکرێکی دووهەزار کەسی لەژێر فەرمانی (مەلیکزادە)دا ناردە سابڵاغ . ئەهالی سابڵاغ هەموو پێشوازییان کرد، مەلیکزادە دەبدەبە و سەڵتەنەتی شاهانەی نیشان بە سابڵاغییان دەدا، هەموو رۆژ تۆپ ئەندازی بەر بە کێوی قوڵقواغ دەکرد بۆ ترساندنی ئەهالی خۆی دەنواند، هەموو رۆژ سەر بە سبەی لە .. چۆمیدا ئەهالی و کەیخودایانی وەخڕدەکرد نوتقێکی دەدا، کە دەوڵەتی ئێران ئەوەندە زەمان لەسەر ئێوە حوکمداری دەکا، سمکۆ هیچە و رێگرێکە و بە قسەی هەڵمەخەڵەتێن، خۆتان لەبەرچاوی حکومەتتان ناحەز مەکەن، ئێوە ئەوەندە لەبەرچاوان خۆشەویستن، ئەهالیش بۆ دڵخۆشی ئەوان دەچوونە سەر مەنبەری خەتابەت، بەڵام هێندێک پوولپەرستان و معاشخۆران بەڕاستی لەنێو ئەهالیدا پروپۆگانەی عەجەمیان دەکرد، ئەهالییان هەڵدەخەڵەتاند، مودەتی مانگێک لەوە رابورد هێندێک ئەرزالانی کوردان بە گوێی مەلیکزادەیان دادا، کە عەلی ئاغای حاجی ئیلخانی و کەریم ئاغای کۆسە کریزە و عەلی حوسێن ئاغا لەگەڵ سمکۆ موخابەرەیان هەیە و پێکەوە رێککەوتوون . مەلیکزادە حیلەیەکی دامەزراند، کە بانگهێشتنیان بکا لە دەرەوە لەشکری عەجەم نۆکەرەکانیان چەک کەن و لێکیان بڵاوبکەنەوە، ئەوانیش بگرن و دەستەبەستە بیاننێرنە تەورێزێ.

قاقەزێکی بۆ ناردن و بانگی کردنە سابڵاغ، لە دەرەوە تەرکیباتی خۆی دامەزراند، ئاغایان چوونە ژوورەوە کن مەلیکزادە، نۆکەرانیان بەسەر دیوی لەشکراندا بڵاوکردەوە، ئەو سەعاتە ناردی بانگیان کرد لە شێوانەوە تا رۆژهەڵات کەس لە خانووی خۆی دەرکەوێت دەکوژرێت، ئەهالییان لە ماڵاندا مەنع کرد لە دەرکەوتن، کە سەئات بوو بە دووی شەو مەلیکزادە روو لە عەلی ئاغا و ئەوانی دی دەکا، کە هنگۆ لەگەڵ سمکۆ هاتووچووتان هەیە، لەو دەمەدا تەواوی سەربازانی ئێران شیلنگە تفەنگ بۆ ئاسمان دەکەن و دێنە ژوور بەجارێک لوولەی تفەنگ لە ئاغایان دەکەن و دەڵێن: مەبزوون. هەرسێکان دەستوپێ گرێ دەدەن، مەلیکزادە بە شەق و زللە بەردەبێتە عەلی ئاغا، بە پانییە کەوش لەسەری دەدا، عەلی ئاغا دەفەرمووێت: گوناهم چی بوو، کە وا پاداشم دەدەنەوە؟

مەلیکزادە جوێنی پێ دەدا و دەڵێت: لەگەڵ کوردان ڕێککەوتوون، تەماتان هەیە کوردستان لە عەجەم رزگارکەن، عەلی ئاغا دەفەرموویت: ئەوەبوو گوناه! دە لێم دەن لەسەر میللەتم، هەرچیم بەسەربێ فەخری پێوە دەکەم و بە خەلاتی دەزانم، گیان و ماڵ و موڵکێک لە ڕێگای میللەتدا فیدا نەکرێت بۆ هیچ نابێت، هەرچی دەتوانن کۆتایی مەکەن، نامەردبم هەموو هەست و نەستم نەکەمە فیدای میللەتم.

مەلیکزادە گەلێکی ئەزیەت دابوون لەپاش ئەو هەموو ئەزیەتە عەلی ئاغا گوتی: زۆر خۆم بە بەختەوەر دەزانم، کە ئەمڕۆکە لەسەر کورد ئەزیەت دەدرێم و شەڕەشەقم پێ دەکەن. مەلیکزادە ناردی ئوتومبیلیان هێنا ، هەرسێک ئاغایان بەدەست بەستراوی نارده تەورێز و خستیاننە بەندیخانەوە و زۆر بەتوندی حەپسیان کردن.

مەلیکزادە دەرگای زوڵم و جەور و ئەزیەت و ناپیاوی لەسەر ئەهالی سابلاغ کردەوە، لەلایەکەوە دڵخۆشی دەدانەوە شەڕیان لەگەڵ نەکەن و لەگەڵ سمکۆ ڕێک نەکەون، لەلایەکی دیکەوە دەستی بێدادی بەسەر هەمووواندا درێژکردبوو، هەر ڕۆژەی بە جۆرێک بەهانەی بە میللەت دەگرت، بەعزێ نانەجیب .. بووبوونە .. لە دەستیدا کاریان بۆ دەکرد و کوردیان بۆ ئەزیەت دەدا. جەوری ئەو غەدارە شەش مانگ لە سابلاغ دەوامی کرد. بە زۆر ئەو زستانە لەشکری بە جل و خواردن و پێخەفەوە بەسەر میللەت دابڕی، لەشکریان لەنێو عایلەی نەجیبدا بێ ئەدەبی و بێ شەرەفی نەما لەگەڵ ئەهالی نەکەن.

## چوونی سمکۆ بۆ سابلاغ و گرتنی سابلاغ

سمکۆ لەگەڵ سەید تەها ، کە تەماشایان کرد تەواوی موکریان و مامەش و مەنگوڕ لەگەڵیان بوون، بەهاودەنگ پیاویان نارده تەرەف زەردەشت و بانە ، ئەو زستانە بە پروپۆغانە و لەنێوانیشدا خۆیان وەخڕکرد تەدارەکیان گرت، لە بۆ بەهار بچنە سەر سابلاغ لە ورمێ و دیلماندا بە تەواوی بناغەیان قایم کردو لەشکرو سوپا و چەک و ئالاتی شەڕیان خستە سەریەک و ساز بوون بۆ چوون هەر ئەوەندە بەهاریان بەسەردابێت دەبزوون، کە دنیا ڕەشایی تێ کەوت سمکۆ تەواو سەرکۆماران و گەورە و کاردارانی وەخڕکرد، سەید تەهای کردە سپاسالار چوار تۆپ و هەشت شێستتیر لەگەڵ دە هەزار کەس لەشکری هەڵگرت لەژێر فەرمانی خۆیدا لە بیست و چواری زیلحەجەی ساڵی ١٣٤٠ دا لە ورمێ دەرکەوتن لە چەند جێگایان تووشی هێندێک پاسەوان و لەشکری عەجەم بوون بە هەڵمەتێک لەپێشیان هەڵگرتن، تاکو گەیشتنە پردی بەردە زەرد لە شەش سەعاتێک لە

شیمالی غەربی سابلاغ واقیعەن عەجەم لەشکری زۆری لەوێ دانابوو بە سوپای ئاهینی مەشهوور بوون لەژێر فەرمانی مەلیکزادەی لەپێشترێ ئەحوالی گوترا، لەسەر پردی بەردە زەرد پێشیان بە لەشکری کوردان گرت، پالەوانانی دلێرانی کورد بە ئەوەڵ هەلمەت زگی لەشکری عەجەمیان لەت کرد و پەڕینەوە ئەو بەری پرد، لەدەست تفەنگ و گوللەی کوردان سوپای ئاهینی بوو بە سوپای لۆکەیی دوو سەران بەرگەی هەلمەتیان نەبرد وەکو شەغال و ڕێوی کلک لەنێو کلکدا بە قوونە دزەیان دەست پێ کرد، چ قودرەتی کەروێشکە خۆ لەبەر چنگالی پلنگ رابگرێت، مەڕ و بزن چ تواناى بەرابەری شێری خوێنخواریان هەیە، هەمیشە پۆلا و خورد ئاهنی عەجەم لەبەر پەنجەی کورداندا تابی مێروولۆکەیان نەبووە، دایمە شێری عەجەم لە بەرابەر ڕێوی و چەقەلانی کوردستاندا دەمی ڕێویێتی نەتوانیوە لێدا، چ جێگای ئەوە، کە مەلیکزادە ناوێکی ڕێوی نەژاد لە بەرابەر قەهرەمانانی وەکو سمکۆ و سەید تەها بتوانێت نەفەسی منی لێدا؟ دوو سەعات پێ نەچوو ئاهنی عەجەم کونی مشکی دەست نەدەکەوت خۆی تێدا بپارێزێت ئەوەندەی پێ کرا پشتی دا بە کوردان رووی لە سابلاغ کرد هێندێکی زۆر کەمیان بەنیوە گیانی گەیشتنەوە سابلاغ، شێرانی کورد خۆیان هیچ ماندوو نەکرد لەدوویان کەون، هەر ئەوەندە لە ئەوەڵدا کوژران و بەدیل گیران باقی هەلاتن، سمکۆ لە دەشتی شارویراندا خستی، سەردارانی وەخرکرد هەر ئەو رۆژەی ئاهینی تێدا پەرێشان بوو، تەرتیبی دامەزراند، کە پیادە لە ئەوەلی شەودا بکەونە ڕێگا لەنیوە شەودا خۆ بگەیەننە سابلاغ لەپاشان سوار بکەوێتە پشتیانەوە، هەتا شار نەگرن رانەوەستن، لەسەر ئەوە قەراریان دا، هەموو بەجارێک چوونە کۆسەکریزە، هەشت سواری ئاغایانی دیبوکری بۆ پێشوازی سمکۆ چوونە شارویران لەبەر کۆسەکریزە پێگەیشتن، سمکۆ فەرمووی هەموانی چەک کرد و ئەسپی لێ ئەستاندن، لەپاش ئەوە لە کۆسەکریزە بزووتن کەوتنەبەر کاولۆکانی کۆنە دەریاز، لەوێ هەلیان دا، سمکۆ فەرمووی پیادە بەر بە سابلاغ ببزوون، هەر ئەو شەوە لە جومعە (١٥ ی مانگی سەفەر ١٣٤٠) بوو لەگەڵ سبەینێ بەیانی گەیشتنە کەناری شاری بەنێو کووچە و باغاندا مەتەرێزیانگرت، لە ڕێگادا تووشی لەشکری عەجەم بوون، گەلێکیان لێ کوشتن هێندێکیان خۆیان خستەوە نێو شاری بانگیان لە عەجەمان دەکرد، کە پیاون وەرنە دەرەوە، لە پێگایەکی دەنگی لێوە دەهات، بەجارێک دوو هەزار گوللەیان بۆ داوێتن، ئەوجار کوردەکان فێربوون لە جێگایەکدا کبریتیان دەسووتاند و خۆیان دەکێشاوە جێگایەکی دیکە، لەشکری عەجەم شیلینگی تفەنگیان دەکردە ئەو جێگا کبریتە، کورد لە لایەکی دیکەوە بانگیان لێ دەکردن، کورە

فیشەنگان ئاورمەکەن پێمان لازمە، بەخوا دەتانگرین فیشەنگێک کەم بووبێت دەتانکوژین بەخۆڕایی ئاوریان مەدەن، هەر بەو جۆرە ئەو شەوە گەمە و گاڵتەیان بە لەشکری ئاهنی دەکرد. عەجەم چەند تۆپێکی لەسەر داشا مەجید دابەستبوو، چەند سپاهێکیشی لەسەر دانابوو، بەڵام ئەو شەوە سپاهی عەجەم لە ژیانی خۆی بێزار ببوو، بەڵان چاری نەبوو، دەیانزانی لەدەست کوردان رزگار نابن.

سمکۆ لە دەریاز رێگای هەڵمەتبردنی سەر سابڵاغی نەقشە کێشا، ئەمری دا تەیار بەگ و بەگزادەی بەرەی سۆریان لەگەڵ سوارەی شوکاکان لە رێگای ئەندەر قاشەوە رێگا بگرن و هجوم کەنە سەر شاری، جەنابی سەید تەها لەگەڵ ئاغای مامەش و مەنگوڕان لە پردی سۆر بپەڕنەوە لنگدەنە سەر شار. سمکۆ بۆخۆی و دۆستگایەوە لە پشت باغانەوە لە چاکی مەحموودکانەوە لە چۆمی بپەڕێتەوە، بەو جۆرە لەهەر چوار کەنارەوە بەتیپ بزوون و کەناری شار دەورەبدەن، تا دەیگرن. تەیار بەگ سەعاتێک لەپێش بەیانیدا بزووت، لە دەریازەوە پەڕاوە ئەوبەری ئەندەرقاش و کەوتە رێگا، سمکۆ بەتەواوی قووەتەوە لەگەڵ سەید تەها لە رێگای وەسوکەندەوە لەپێش سپێدەدا بەنیو سەعات گەیشتنە سەر چاکی مەحموودکان، پیاوێکی لەپێشدا هاتبوون، کە ئەوەیان زانی، خشان لە گەلێک جێگایانەوە خۆیان خزاندە نێو کووچەی شارەوە، سەید تەها بەقووەتی خۆیەوە رووی لەسەر پردی سۆر کرد، لە داشا مەجیدەوە تۆپی عەجەم دەستی کرد بە ئاوێتن. سەید تەها تەواوی لەشکری خۆی کردە سێ قۆڵ، قۆڵێکی لە رێگای کریزەوە راگرتبوو لە چۆم پەڕانەوە و گەیشتنە نێو شار دووقۆڵی لە پردی سۆر دەربازکرد، قۆڵێکی ناردەسەر عەلی زەمانیان لەژێر فەرمانی شێخ عەبدوڵڵادا، قۆڵێکی بۆ خۆی لە رێگای پردییەوە بەر بەشار چوو، بەڵام تۆپی عەجەم لە هەر هەموو لایەکەوە وەکو بارانە دەهات. تەیار بەگ بەرەسۆری راستە رێگای گرت بەری خۆی دا شارەوە، تۆپچی و سوپاهی عەجەم لە بەرابەری سەید تەها و سمکۆ خەریک بوون، سمکۆ لەسەر مەحموودکان بارگە و خرگەی خۆی لێی سەراپاکرد، دەستەیەکی لەژێر رکابیدا بوون، تۆپ و شێستتیریان بەر بە مەتریزان گرێ دا لەهەر گۆشەیەکەوە عەجەمێکیان بەچاو یا بەدووربین بدیبایە گوللەیەکیان لێ زایع دەکرد، بەریان دەداوە.

سەید تەها، کە شێخ عەبدوڵڵای ناردە سەر عەلی زەمانییان، مولاحەزەی فەرموو تۆپی داشا مەجید نایەڵێت بجووڵێنەوە، ئاڵای خۆی، کە نیشانەی رەش بوو دا بە شێخ عەبدوڵڵا فەرمووی ئێستاکە دەبێ داشا مەجید بگرن، ئەو بەری کردە داشا مەجید، تەیار

بەگ لە تەکییەی خەلیفە مەحموودەوە لەشکری شکاکانی کردە سێ بەش ، بەشێک لە باغی سیەوە بۆ مزگەوتی سوور بەشێک لە راستە شەقامەوە بۆ گەڕەکی حاجی حوسەینان، بەشێک لەنێو قەبرانەوە بۆ نێو شار هجوم کەن. عەجەم لەسەر هەموو بانێکی بڵند تۆپ و شێستتیری دانابوو ، شەڕی دەکرد، پیادە کوردێکی بەشەو خۆیان خزاندبووە بندەستی شارەوە لە چۆمی پەڕینەوە، تەیار بەگ لە لایەکەوە و پیادەش لەلایەکی دیکەوە رژانە نێو شاری، سپاه ئاهنی، کە ئەوەیان زانی هەر ئەوەندەیان پێ کرا پەپاغ بشارنەوە و هەڵێن، کورد ئەو رۆژە فیشەکیان ناوێت وەکو راوەکەو بە تۆڕیان ئاهنی دەگرتن، سپاهی ئاهنی، کە کوردێکی دەدی دەیگوت: ئاغا بە حەزرەتی عەباس قەسەم فیشەکێکم ناوێتووە، تەماشای فیشەکدانم کە توخودا مەمکوژە، لەبەر ئەوە، کە سپاه لەنێو مالاندا بوو، ئەهالی سابلاغ پەنای دابوون، لە خانووەاندا عەجەمیان دەشاردەوە و جلی کوردییان لەبەردەکردن. کورد مەجبوور بوون دەستیان بە خانوو پشکنین کرد و ئەهالییان تالان کرد، رابوو تەیار بەگ بە نیو سەعات وەخت تەواوی ئەهالی شار و تەواوی عەجەمانی رووت کردەوە، مالیان نەهێشت تالانی نەکەن، پیاو نەما رووتوقووت نەکرێن، پیاوانی وەکو جەنابی موستەتاب حاجی مەلا محەمەد سەعید سەدرولعولەما و وەکو سەردار عەلی خان کوڕی سەردار حوسێن خان و .. پیری خۆشەویست حاجی ئیلخانی و جەنابی میرزا عەلی قازی .. رووتیان کردنەوە، هەموویان بەڕووتی بردنە حزووری سمکۆ.

تەیار بەگ بەو جۆرە کەوتە نێو شارەوە، شێخ عەبدوڵلا بە ئەمری جەنابی سەید تەها خۆی گەیاندە داشا مەجید تۆپێکی لەگەڵ بیست نەفەرێک عەجەم بەدیل گرت، ئالای سەید تەهای لەسەر تەپلەی سەری داشا مەجید چەقاند، یەخسیرانی لەگەڵ تۆپەکە هێنا خوارێ ، سەید تەها لەنزیک گراوان بە جەنگ مەشغوول بوو، کە شێخ عەبدوڵلا داشا مەجیدی گرت، سەید تەهاش رووبە شار بزووت، شێخ عەبدوڵلا لە دامانی داشا مەجیدەوە، کە گەیشتە نێو شار، سابلاغ گیرابوو ئەوانیش کەوتنە نێو شار بۆ عەجەم گرتن، ئەو رۆژە نەگەیشتە نیوەڕۆیی نەفەرێک عەجەم نەما بەردەست نەکرێت، هەموویان لەگەڵ مەلیکزادە بەرووتی و قووتی بردە پێش سمکۆ و رایانگرتن، ئەهالی سابلاغ و ئەعیان و ئاغاوات و بەگزادە کەس نەمابوو رووت رووت نەکرابێ بە پێخواس و دەستێک بەپاشەوە و دەستێک بەپێشەوە گرتنیان بردنە پێش، سمکۆ گەلێکی ئیلتیفات لەگەڵ مەلیکزادە نواند، ناردی عەبایەک و کەوایەکی چاکیان بۆ هێنا لەبەریان کرد لەلای خۆیەوە دانا ، مەلیکزادە پێی گوت: شارگرتن و حوکومداری و رەعیەت پەروەری وا نابێت. گوتی:

چونکو کۆمەکی ئێوەیان دەکرد ئەمەیان پاداش بێ. وایان لە شار کرد هەتا دەرپێی ژنانیان لەپێدا نەهێشتن لێیان ئەستاندن، زۆریان سابلاغ شپرزە کرد و گەلێکیان ئەتک و سووکی بەسەر ئەهالی و ئەشرافان هێنا، ئەوەندە بوو دەستیان بۆ ژن و نامووس درێژ نەکرد، لە ئەفعالی چاکەیەکی لەگەڵ سابلاغیانیان کرد، ئەوەبوو، وەلی خراپەیەکی لەنێو بەشەردا نەهی لێ کرابێ و وجدانی ئینسانی قبوولی نەکردبێ لە حەق سابلاغ ئیجرایان کرد، بەڵام کوشتاریشیان لە کوردان نەکرد، غەیرەز قازی لەتیف ناوێکی پیرەمێرد نەبێ کوشتیان، زاتێکی وەکو قازی عەلی، کە پیاوێکی عالم و فازڵ و قازی شاربوو، ئەوەندەیان بە قۆندرە لە تەپڵی سەری دابوو مێشکی لە سەریدا هاژابوو، لەپاشان خەرفا ئەویش نەیانناسیبوو دەنا دەیانکوشت، چونکە لەوەختی مەلیکزادەدا گەلێکی وەعز و نەسیحەتی ئەهالی دەکرد بۆ خۆشەویستی عەجەم و ئیکراهییەتی کوردان، هەموو رۆژێک نوتقێکی لەو بابەتە دەدا شکاکان، قازی لەتیفیان زانیبوو کوشتیان، ئەویش کە ئەوەی زانی هەڵات و خۆی شاردەوە.

حاجی ئیلخانی و سەردار چوونە کن سمکۆ رووتی بێ پەردە پێیان گوت: شورتەی کوردەواری نایە، ئێمەت وا لێ کرد، پیاوێکی مەشهوور و پیرم. سمکۆ لێی توندبوو فەرمووی ئەگەر پیاوی بەحەمییەت بوایەی عەجەم کوڕی بە شەق نەدەناردیە تەورێز حەپسی بکەن، تۆش قبووڵت نەدەکرد حاجی ئیلخانی لەگەڵ سەردار عەلی خان گەڕانەوە بەپێخواسی چوونەوە مەحالی موکریان.

سمکۆ شێخ عەبدوڵلای بە رەئیس ئەمنییەت تەعیین کرد، هەمزە ئاغای برای قەرەنی ئاغای مامەشی کردە حاکم، فەرمووی: ئەهالی رێکخەنەوە و ئەمنییەت دامەزرێننەوە، هەرکەسێکی ماڵێکی چووبێت بزاندرێت لە کن کێیە، بۆی وەرگرنەوە. شار دەست بە ئەمنییەت کراوە، سمکۆ بارەگای لە مەحموودکانەوە کێشا خوارەوەی سەر رێگای کریزە، ئەمری فەرموو عەجەمێکی گیراون حازریان کەن، هەموویان بەڕووتی حازرکرد. پیاوێکی سابلاغی چووە خزمەتی عەرزی کرد: ئەو ساحێب مەنسیبە عەجەمە بەزۆری دەستی بۆ ژنی درێژ کردووە، فەرموویان: کورە ئەو ساحێب مەنسیبە بدەن بەو پیاوە هەچییەکی لێ دەکا با بیکا. گرتیان دایان بەو پیاوە سابلاغییە. عەرزی کرد: قوربان نازانم چی لێ بکەم. سمکۆ توند بوو پێی گوت: سەباب ئەوەند بێ غیرەتی ناتوانی تۆڵەی خۆت لە بێ دەسەڵاتێکی وا بستێنیەوە! فیشەکی لە تفەنگ نا بە سنگی ساحێب مەنسیبەوە نا، فەرمووی ئاوای لێ بکە، دەستی لە بینە قاقای نا خنکاندی. لەپاشان سمکۆ

عەجەمەکانی کردە سێ بەش: بەشێک سێسەد و هەفتا کەس، بەشێک دووسەد و سی کەس ، بەشێ سەد و هەفتا کەس، هەمووی بەکۆمەڵە دانان، لەپاشان فەرمووی نەختێک مەشقی سەربازییان پێ کردن، نیو سەعاتێک پێیان پێکەنین لە پاشان ئەمری کرد هەر کۆمەڵەیەک لە جێگایەکدا مۆڵیان خوارد لەهەر چوار ئەترافیانەوە شێستتیر و سیلاح ئەندازی رەشید و ئازا شیلنگی فیشەکانیان کردنێ. لەو هەمووانە حەوت نەفەریان لێ رزگاربوو و بەرنەکەوتن. مەلیکزادە گەلێکی لەبەرپاڕاوە گوتی مەیانکوژە. سمکۆ فەرمووی: من هەموو رۆژێک ئەوەندە عەجەم بکوژم بەتنۆکەیەک خوێنی عەلی و جەفەر ئاغایانی برام تۆڵە ناکەمەوە. لەپاش کوشتنی ئەوانە ئەهالی، کە بەرووتی لەدەرەوەی راوەستابوون گێرانیەوە نێو شاری، فەرمووی: بە چاکی شار ئەمنییەت بدەن و لە کەسێک زوڵم مەکەن هەر ئەو رۆژە، کە ئەو هەموو راو و.. تێداکرا نزیک ئێوارە لە سمکۆ لەگەڵ سەید تەها سواربوون و بەر بە ورمێ گەڕانەوە.

شێخ عەبدوڵڵا رەئیسی شاری دەست بە ئاسایش کردەوە، خەلقی خستەوە سەر کار و کاسپی، دایرەی حکومەت تەرتیپ کرد. جوابیان دا بە شێخ عەبدوڵڵا، کە سەتوەتی ئەلسەلتەنە خۆی شاردۆتەوە. شێخ عەبدوڵڵا شەش نەفەر پۆلیسی لەگەڵ خۆی هەڵگرت و چوونە ئەو ماڵە و لەپشت کندوی ئاردیان دەرخست و بردیانە دایرەی نەزمییە و ئەمنییەت بە خواهیشی هەمزەی قادری سیمانی مامەش بە ئەسپێک و پێنجسەد تومان رزگاریان کرد، تەسلیم بە کاک هەمزە کرد، کاک هەمزە بە ئیحتیرامەوە ناردیە ماڵی خۆی لە لاجان. سمکۆ و سەید تەها ، کە گەیشتنە ورمێ مەلیکزادەیان لەگەڵ خۆیان بردبوو، لەوێش چەند کەسێکی گەورەی دیکەیان لە عەجەمان گرتبوو. قاقەزیان لە تەورێز نووسی: ئەگەر بە مودەی بیست و چوار سەعاتی دیکە ئەو گەورە ئاغایانەی لە تەورێز گیراون بەردەدەن و دەیاننێنەوە سابلاغ زۆر چاکە، وەئیللا ئەم عەجەمانە هەموو سەردەبڕین و قاقەزیان بەوانەش نووسی، کە قەرار وایە عەلی ئاغا و ئاوالانی بەرنەبن، ئێمە لێرە دەکوژرێین. عەجەم هەر ئەو دەقیقە بەریان دەدا و بە ئوتومبیل دەیاننێرنەوە سابلاغ ، بە تەلەفۆن خەبەردەدەنە سەید تەها، کە ئاغایان هاتنەوە سابلاغ، ئەوانیش مەلیکزادە و ئەو چەند کەسانەی دیکە دەنێرنەوە و دەیاندەنەوە بە عەجەم.

## تەئسیراتی تالانی سابلاخ لە هەموو کوردستان

بەگزادە و ئاغایانی موکریان لە رووتکردن و تالانکردن زۆر عاجزبوون، هەرچەند بەئاشکرا هیچیان نەدەگوت، بەلام دڵ و گیانیان رەنجیدە بوو، زۆر لە هەراسدابوون، گەلێک لەوە دلگیربوون، هەمیشە پێکەوە لە موزاکەرەی بزووتندا بوون، لە هەمووان زیاتر عەلی ئاغای حاجی ئیلخانی بەرووتکردنەوەی بابی زۆر پێ تێکچوو، چونکو پیاوێکی پیر و دنیادیدە و موحتەرەم بوو، لەباتی جێگایەکی بلندی بدەنێ، تووشی ئاوا رەزالەتیان کردبوون، شێخ عەبدوللا رەئیسی نەزمییە و ئەمنییەت، کە لە فکریان گەیشت هەلسا چووە سەردارئاباد لەگەل عەلی ئاغا زۆر کۆشا، عەلی ئاغا گوێی نەدایە پێی گوت: هنگۆ ئێمەتان بەناوی میللەت دەعوەت کرد لەدوایی تەماشامان کرد میللەت و وەتەن لەبیری کەس نەبوو، هەمووتان شرەخۆر و تالانگرن هەر نەبوایە رەحمێکتان بە ردێنی سپی بابمتان کردبایە، ئەوەندە ئەزیەتی و سووکی بەسەر گەورە و سەردارانتان نەهێنابایە، گەلێکی شێخ عەبدوللا سەرزەنش کرد. جەنابی حاجی ئیلخانی بلندبوو لە عەلی ئاغا فەوری گوتی: عەلی هەروەکو لەژێر دەستی مەلیکزادەدا دەتگوت لەسەر میللەتم هەرچی بەسەرم بێ ئیفتیخاری پێ دەکەم . ئێستاکە هەرچی بەسەرم هاتبێ باکت بە من نەبێ مادامە لە کوردانم بەسەرهات پێم لە خەلاتی بێگانە چاترە، لەگەل شێخ عەبدوللا رێککەوە، هەرچەند عەلی ئاغا بە زبان لەگەلی رێککەوت، بەلام رەزالەتێکی بەسەر کوردانیاندا هێنابوو برینی سارێژ نەدەکرد، بەدزییەوە لەگەل عەجەم موخابەرەیان هەبوو.

عەلی ئاغا حاجی ئیلخانی بەدزییەوە لەگەل عەجەم رێک کەوتبوون و هێندێک لە دیبوکریشی لەگەل ببوونە هاوەل لە مانگی زیلحەجەدا بە دەسایسی عەلی ئاغا قووەتێکی زۆری ناردە میاندواو، جەنابی سەید تەها بۆ راگرتنی موکریان و هێندێک تەرکیبات تەشریفیان چوونە سابلاغ بێ خەبەر لە هەموو چتێک لەناکاو لەشکری عەجەم بە کۆمەگی عەلی ئاغاوە بەشەو لە میاندواوەوە کەوتنە رێگە لەگەل تاوهەلاتدا دەورەی سابلاغیان گرت. سەید تەها نێزیک دوازدە سواری لە گەل بوو، ئەو رۆژە ئەگەر دیبوکری کۆمەگیان نەکردبا و چاویان لە سەید تەها نەقوچاندبا نە سەید تەها و نە کەسێک لە پیاوانی رزگار دەبوو، بەلام عەلی ئاغا حەزی نەکرد ئاسبێک ( ؟ ) بە سەیدتەها و نۆکەرانی بگات، سەید تەها و قەرەنی ئاغا بێ بەرابەرکردن لە شار دەرکەوتن، عەجەم داخل بە شار بوون، دەستی زولم و جەوریان درێژکرد، دە رۆژ دەوامی نەکرد، عەجەم لە تەورێزدا تەشوێشێکی تێ

کەوت، لاهووتی خان بە ئاشکرا ئالای سمکۆیان هەڵدا، تەمایان بوو حکومەتی عەجەم دەرکەن، سمکۆ قووەتێکی تەواوی دووبارە بەراوکرد و لەژێر فەرمانی سەید تەهادا قەراری دا بیاننێرێتە سەر سابلاغ، بەڵام عەجەم لەبەر پەشێوی تەورێز و مەسەلەی لاهووتی، کە لەپێشدا گوترا لەپاش ٤٠ ڕۆژان لە سابلاغ دەرکەوت، سەید تەها لەشکری خستە بن فەرمانی شێخ عەبدوڵلاوە و ناردیە سابلاغ و قاقەزی لە قەرەنی ئاغا نووسی و بەسوارەی مامەش کۆمەگی شێخ عەبدوڵلا بکەن، ئەو قووەتەی کوردان و ئەزیەتی چوونەوە سابلاغ شێخ عەبدوڵلا و قەرەنی ئاغا دەستیان کردەوە بە تەشکیلاتی حکومەت و لەشکرێکی زۆریان بە ئەترافاندا بڵاوکردەوە، هەموو مەحاڵ و نێو عەشایریان ئەمین کردەوە.

سەید تەها لە پاش مانگێک دامەزرانی سابلاغ کەوتنە ڕێگە و چوون، ئەهالی سابلاغ تەواوی لەشکر و ئاغایان بۆ پێشوازی دەرکەوتن بەکەیف و خۆشی هێنایانە نێو شارەوە، دەستە دەستە چوونە بەخێرهاتنی سەید تەها بۆ ڕێککەوتن و یەک وجودی و دەست پێکەوەگرتن و نەسیحەتکردن فەرمووی: گرتنی سابلاغ و ئەزیەتدانی ئێوە لە بێ ئەدەبی هێندێک شکاکانەوە رووی دا، نە سمکۆ و نە من بەوە رازی نەبووین و گەلێکی پێ عاجز و ڕەنجیدە بووین، بەڵام کار لەکار ترازابوو، ئەگرا دووبارە تۆڵەتان بۆ بکەینەوە و ئێستاش وەختی شەڕە جەنگ و جیدالمانە لەگەڵ عەجەم، ئەگەر خوا دەستی گرتین و هنگۆ بە پیاوەتی لەگەڵمان ڕاست و دڵپاک بن، هەموو کاروبار بەدڵخوازی ئێوە دەبێ، حکومەت و مەئموور لە خۆتان و نووسین و خوێندن بە زبانی خۆتان دەبێت، کەسێک لەسەر ئێوە حوکمرانی نابێ، ئێوە هەرکەسێکی بەچاکی بزانن بیکەنە حوکمداری خۆتان بەو جۆرە فرمایشتانە هێندێک دڵی خەڵقی بەخۆیەوە گرێ داوە و ئەهالی کەوتنەوە سەر شەوق و کەیفی شەڕ لەگەڵ عەجەم چەند ڕۆژێک بەو جۆرە ئەنجومەن دەگیرا و وەعز دەدرا و خوتبە دەخوێندرانەوە.

شێخ عەبدوڵلا لەگەڵ چەند سوارێک بە مەحالدا چوونە بۆکان لەنێو ئاغایاندا بۆ ڕێکەوتنیان و یەکبوونیان گەلێک کۆشا لەسەر فەرمایشاتی سەید تەها شێخ عەبدوڵلا چووە سەر سەقز، بی شەڕ و کوشتار سەقزیان گرت، میرزا مەناف ناوێکی پیاوی سەید تەهایان کردە حاکم و شێخ عەبدوڵلا بەنێو ئاغایاندا گەڕانەوە سابلاغ مانگێک میرزا مەناف بە حاکمیتی سەقز ڕایبوارد، عەجەم نێزیک هەزار کەسێکی لەژێر فەرمانی کۆلۆنێل ناوێکدا ناردە سەقز، میرزا مەناف بێ قووەت بوو، بە ناعیلاجی سەقزی بەردا و گەڕاوە سابلاغ.

لەو ئەسنایەدا عەجەم بەدزییەوە ناردیانە کن عەلی ئاغای دیبوکری، بە هێندێک چتی مەوهوومەوە دڵخۆشییان داوە، بەبێدەنگی هەڵسا چووە میاندواو، زەفرلدەولە هێندێکی عەسکەر دایە و ناردیە سەر سابلاغ، لە ئەوەڵ شەویدا عەلی ئاغا بەرکێف کەوت و گەیشتە سەر ئەترافی شار، سەید تەها ئەو وەختەش شازدە کەسێکی لەکن بوو، هیچ ئاگای لە چتێک نەبوو سبەی بەیانی تازە، کە هەڵدەستێت، یەکێک لە نۆکەرانی، کە ناوی (سەفەر) بوو بەبێدەنگی چووە بناگوێی سەید تەها و عەرزی کرد: لە چی راوەستاوی عەشیرەتانی کورد تەرەفداری عەجەم دەورەی شاریان گرت و کەوتنە نێو شارەوە. سەید تەها بڵندبۆوە سەر خۆی، شێخ عەبدوڵڵا بە تەنهای لە خزمەتی بوو عەرزی کرد: چ قەوما ؟ فەرمووی: گیراین، هەڵسنە سەر خۆتان، بەڵام ئەو شازدە کەسەش لەنێو ماڵاندانە بە بڵاوی و چەند کەسێکیان چووبوونە حەمام ، هەتا پێیان راگەیەندرا کووچە و گەڕەکی شار پڕ لە دوژمن بوو، لاکین عەلی ئاغا پیاوەتی خۆی نیشان دا چەند کەسێکی بە تایبەتی بۆ دەربازکردنی سەید تەها تەعیین کردبوو، لەنێو شاردا تۆپ و تفەنگ و شێستتیر وەکو برێشکە دەتەقا ، دەنگەدەنگی لەشکر و سیلاح گوێی عالەمی پڕکردبوو، شێخ عەبدوڵڵا شێستتیرێکی ئۆتۆماتیکی بەچەند رەختە فیشەکەوە هەڵگرت، ئەو رۆژە کورد بە حاڵێکی پەژموردەیی و پەرێشانێکی تەواو لەشار دەرکەوتن، ئەگەر دیبوکریان تەمای کوشتنی کوردانیان هەبوایە نەفەرێکی سەید تەها رزگار نەدەبوون، بەڵکو بەتایبەتی کەوتنە پێشیانەوە بەسەلامەتی لە شاریان دەرخستن، کە لە باغان تێپەڕبوون کەوتنە دۆڵی کریزەوە بۆ دەفعی واهیمە هێندێکیان فیشەگی هاوێت ، هەر بە هەڵاتن هەتا شنۆ بەند نەبوون، کە گەیشتنە شنۆ دەستیان کرد بە لەشکر بەراوکردن و سیلاح ئامادەیی بە بیست رۆژان دوو هەزار لەشکرێکی بەراوکردبوو، لە تەورێزەوە لاهووتی و قازاق لە حکومەت عسیانیان کرد عەجەم بەناچاری لە سابلاغ دەرکەوتەوە، گەڕانەوە میاندواو، لەژێر فەرمانی سەرتیپ حەبیبوڵڵا خان چوونە سەر تەورێز بۆ کوژاندنەوەی ئەو فیتنەیە دەکۆشان.

شێخ عەبدوڵڵا شەش مانگ بە ریاسەتی مەنزیمییە و ئەمنییەت رابوارد، لەپاشان ئەو وەزیفەی دا بە حاجی سەمەد خان - بەگزادەی بەرە سەدری لە ئەوەڵی شەعباندا لە مودەی ئەو شەش مانگانەدا حاکمی سابلاغ سێ جار گۆڕدرا هەمزە ئاغا، حەمەد ئاغای مامەش برای قەرەنی ئاغا دوو مانگ سەفەر و رەبیعولئەوەل لە پێنجی رەبیعولثانیدا کەریم ئاغای کۆسە کریزە دوو مانگ و چەند رۆژێک لە دەی جەمادی ثانیدا تا ئەوەلی شەعبان عەلی

بەگی سالار سەعید بوو بە حاکم، کە شێخ عەبدوڵلا وەزیفەی دا بە حاجی سەمەد خان قەرەنی ئاغای رەئیسی عەشایری مامەش بوو بە حاکم لەو نێوانەدا گەلێکیان قاقەز بۆ ئەتراف نووسی. دەسایسی کوردان گەیشتە سنە و کرمانشا و هەمەدان، هەمیشە جاسوسانی سمکۆ لەو جێگایانە پروپۆغانەی دەکرد، بەڵام کارێکی بەسەر سابلاغ هێنابوو چاوی هەمووانی ترساندبوو، ئەوەندە وەکو ئەوەڵ ئیعتیمادیان بە سمکۆ نەمابوو، هەرچەند هەموو کوردستان تاکو دەچێتە لورستان و لەک، ئامادەبوون لە عەجەم بڵندبن و ئاڵای سمکۆ هەڵکەن، بەڵام رووتکردن و تاڵانکردنی سابلاغییان سەکتەیەکی گەورەی خستە سیاسی سمکۆوە، هەرچەند گەورە و چکۆڵەی کوردان بەدڵ و گیان دروستکردنی کوردستانیان دەویست لەپێش ئەوەدا سابلاغ بگیرێت کەوتبوونە بزووتن، خێریان بۆ عەجەم نەمابوو، مەئموورانی عەجەمیان بە سووکی و پیسی رادەگرت، بەڵام بەختی عەجەم لەوەدا زیاتر یاری کرد، کە کورد لە سمکۆ رەنجیدە بن و سمکۆ بەچاوی سووک و حەقارەت سەردار و گەورەی موکریان و کەیخودایان بباتە حزووری خۆیەوە، ئەوە بۆ کوردان نەگبەت بوو.

## شەڕی سەید تەها لەگەڵ کۆڵۆنێل و شکانی کۆڵۆنێل

سەید تەها لەپاش تەدارەک گرتنی لەشکر و سوپای دووهەزار و سەد کەسێکی هەڵگرت و چوونە سەر سابلاغ، ئەو رۆژە بوو عەجەم لە سابلاغ دەرکەوتبوون و چووبوونە میاندواو، حاکمی لەسەر دانا و سەد نەفەرێکی لە سابلاغ بەجێهێشت نێزیک چوار رۆژ ماوە، بە لەشکرێکی زۆرەوە بۆ سەر نزمکردنی کۆڵۆنێل بەر بە بۆکان بزووتن، دوو سەعات لەپێش شێواندا لە سابلاغ دەرکەوتن لەگەڵ رۆژهەڵاتدا گەیشتنە بەر میراو، کۆڵۆنێل بە لەشکرییەوە هاتە بەرابەر سەید تەها لەگەڵ تاوهەڵات لێکیان دا، ئەو رۆژە بۆ ئێوارە سەید تەها لە پرد دەربازبووە ئالی بۆکانی، بەڵان شێرهاوێژانی کوردان، کە لە پرد پەڕینەوە، وەکو پڵنگی برسی هەڵمەتیان بردە سەریان، کۆڵۆنێل لەگەڵ چەند سوارێک لەسەر تەپەیەک تۆپیان گرێدابوو، سوارەی هەژبەر هەڵمەت لنگیان دا تەپەی کۆڵۆنێل چوار دەورەیان گرت، لەشکری کۆڵۆنێل، کە تەماشایان کرد سەرداریان دەوردرا، نائومێد بوون و لە دەشتی بۆکاندا پەرش و بڵاوبوونەوە، هەرکەس رێگای هەڵاتنی گرت و لەنێوانی دەرچوو، کۆڵۆنێل شەست سوار لەشکری لەگەڵ دوو تۆپ و شێستتیر و چەند تفەنگ و فیشەگ هەڵاتە ساین قەڵا. سەید تەها وەدووی شکستەی ئەو سوپایە کەوت، هەتا ساین

قەلا (سارم قەلا)ی خستە ژێر پێی ئەسپانەوە، گەلێکی ماڵ و ئەموال دەستکەوت، عەجەم، کە ئەوەی زانی خاڵە قوربانی، کە شەرحی حاڵی بەحس دەکرێت، ئەمری پێ دا بچێتە سەر سابڵاغ.

## چوینی خاڵە قوربانی بۆ سەر سابڵاغ

هێندێک لە ئەحوالی خاڵە قوربانی بەحس بکەین، تاکو خوێندەواران نەکەونە فیکرەوە، ئەو خاڵە قوربانییە چ کەس بوو و چ پیاوێک بوو، کەوا لەژێر پەنجەی شێران وا سووک نەبووبوو، تاکو بزاندرێت چ عەجەم و چ رۆم بوون ئاڵەت و شەڕ و کوشتار و مودافەعەیان کورد بوون، لەبۆ دوژمن یەکتریان بەبێ ترس دەکوشت، کەسێکی وریایان لێ دەرنەکەوت، یەکتر ئاگادار بکەن بۆ دوژمنان خۆخۆری نەکەن. خاڵە قوربانی پیاوێک بوو کەڵهوڕ لە عەشیرەتانی کرمانشا، لەپاش گەلێک خزمەتکردنی عەجەمان کەوتە گەیلاناتەوە لە حەرەکەی کوچکخاندا لە عەجەمان دڵگیر ببوو، لەگەڵ کوچکخان رێک کەوت بە سوپاهسالاری کوچکخان دامەزرا، گەلێک شەڕ و جەنگی لەگەڵ عەجەم کرد رشت و گەیلاناتی بەتەواوی بۆ کوچکخان گرت.

هەروەکو لە سەربەهوردی کوچکخاندا گوترا، رەزاخان پەهلەوی خاڵۆ قوربانی ئەمین کرد و هێندێک شەرت و قەراریان لەگەڵ کرد و ئەمینبوو، رشتی دا بەدەستەوە، بۆخۆی و قووەتەکەیەوە چوونە ئەنزلی، حکومەتی عەجەم گەلێکی ئیحتیرام گرت، خەلات و بەرات و دراو و ئیلتیفاتێکی زۆری لەگەڵ کرد، روتبەی جەنەرالیان دایە، نیشانەیان پێدا کرد، لەپاش چەند ئیسراحەتێک لەشکرێکی زۆریان پێ دا و ناردیانە سەر کوچکخان، لەپاش پەرێشانکردنی کوچکخان و گرتنی خاک(؟) کە لەدەستی کوچکخاندا بوو، چوونە رشت، عەجەم ئەوەندەی دیکە حورمەتی گرت و خەلات و بەخششی دایە و ئیکرامییەکی زۆری لەگەڵ کرد و بە سەردار موزەفەر ناونرا و بۆ سەر سمکۆی نەوازشدا، کە ئەویش لابەری ، کارت بە سەدارەت وەیا وەزیری جەنگی دەگا، بە ئومێد ئامادەی جەنگی سمکۆیان کرد، هەزار سوارێکی جەنگاوەریان دایە و تۆپچی و قازاقانی عروسێکی، کە لەگەڵ خۆی بوو دایانێ.

هەرچەند پیاوێکی جەسوور و ئازا و رەشید بوو، چونکو کورد بوو لەنێو عەجەمدا قیمەتی نەدەزاندرا، بەڵام نەیزانی ئافەرینی و دڵخۆشیدانەوەی بۆ چەند رۆژێکە، تا سەر عەجەم لەگەڵ کورد پەیمانی نەبردۆتەسەر، غافڵ لە هەموو دەسایسێک لەشکری خۆی

هەڵگرت بەبێ ئەندێشە و فکری پاشوپێش چووە میاندواو لەبەر زستان و تەڕوتووشی لە میاندواو دانیشت.

لە بەهاردا بوو، کە سەید تەها کەوتە سەر شکستەی لەشکری کۆڵۆنێل، ڕەزاخان پەهلەوی ئەمری پێ کرد بچێتە سەر سابڵاغ و ڕێگا بە سەید تەها بگرێت، هەر لە میاندواو دەرکەوت، کوردی کوشت گوند و ئاوایی سووتاند، هەتا گەیشتە سابڵاغ، قووەتی کوردان ئەوەندە نەبوو بەرابەری بکات، داخل بەشار بوو گرتی، بەلەز قاقەزێکی بۆ سمکۆ نووسی و چلۆنی ئەحواڵی خۆی شەڕکردنی لەگەڵ عەجەم و لەگەڵ کوچکخان و نەتیجەی هەروەکو کەمێکمان گوت، ئەو بەدرێژی بۆی نووسی، کە فایدە ناکا من بەو هەموو قووەتەمەوە نەمتوانی بەرابەری حکومەت بکەم، ئێستاکەش تۆ وەرە خۆت تەسلیم کە، خەڵات و بەراتت بۆ وەردەگرم و دەتکەمە جەنەراڵێکی سوپاهی شاه، ئەو قاقەزەی نارد و چوو هەر ئەو ڕۆژە گەلێکی لە ئەهالی گرت و لە.. چۆمی خوتبەیەکی دووردرێژی بۆ ئەهالی خوێندەوە، کە لەگەڵ عەجەم شەڕکردن زەحمەتە، سمکۆ چەند ڕۆژێکە و دەشکێت، پێ هەڵمەخەڵەتێن ، لەپاشان ئەمری کرد هەر لە میاندواوەوە تاکو دەگاتە حدودی عیراق تەواوی ڕێگایان بگرن، نەهێڵن سەید تەها بگەڕێتەوە و هەڵێت، بەهەموو ئەترافدا قووەتی بڵاوکردەوە، شاری بەتۆپ و شێستتیر قایم کرد، بۆخۆی ئێوارە گەڕاوە ئەندرقاش، ئوردوگاهی لە دەشتی شاروێراندا هەڵیدابوو.

ئەو ڕۆژەی خالە قوربانی لە میاندواوەوە بەر بە سابڵاغ بزووت خەبەریان دا بە جەنابی سەید تەها، کە هەموو ڕێگای گەڕانەوەت لێ گرێدراوە، بە قووەتێکی زۆرەوە داخل بە سابڵاغ بوو هەموو ئەترافانی پڕ لەشکر کرد، سەید تەها سەرکار و گەورانی بانگ کرد، قەرەنی ئاغای مامەش عەرزی کرد: چارە چییە هەموومان بەدیل دەگیرێین و دەمانکوژن و هیچ ئامانمان نادەن، چونکو خالە قوربانی ئەو ڕێگایەی گرت و کرمانشا و لە زەنگان و تەورێزەوە لەشکرمان دێتە سەر، ڕێگای هەڵاتنمان دەست ناکەوێت. سەید تەها فەرمووی:

هەر مردنە تەدبیری بەکار و لازمی ئەوەیە بۆیان بچین، ئەگەر لە مەیداندا کوژراین رووسپێتی ئێمەیە و ئەگەر رزگاریش بووین ئەوە چاترین ڕێگایەکە گرتوومانە. هەر ئەو سەعاتە نەیانهێشت دەقیقەیەک زایع بێت، خۆیان ئامادەکرد، سەید تەها دوو تۆپی گەورەی پێ بوو، ئەمری کرد لە ئێسترانیان بارکرد، هەموو ئاداتی ئەسلیحەیان ئامادەکرد، بەسازی و دڵێکی پڕ لە قەهرەوە کەوتنە ڕێگا، بەدڵخۆشی و توندی و هەڕەشەی سەید

تەهاوە دڵی پاڵەوانانی جەنگ بووبوو بە پۆلایەکی سیلاح لێی کار نەدەکرد، مردن لەبیر چۆوە، دەقیقە زوو بە دوژمن گەیشتنیان لە خەیاڵدا بوو، بەگوللەی جگەرسۆژ دڵی دوژمنی پێ بسووتێنێت، ئەو ڕۆژە خاڵە قوربانی گەیشتە ساباڵغ، سەید تەها لە (سارم قەڵا) دەرکەوت ڕێگای هەژدە سەعات مەسافەیان بە شەش سەعات بڕی، نە ئەسپ لە بازدان خۆی پێڕادەگیرا و نە پیاو هەموو تینووی خوێنی دوژمن و برسی کوشتنی عەجەم بوون. بۆ نێچیرگرتن لە هەموو لایەکەوە ڕکێفکوت خۆیان کوتا، تا بەشەو(شەوی جێژنی ڕەمەزان ٧ی مایی ١٣٠١) خۆیان گەیاندە (گوند - دێ) کە بە (دۆستالی) مەشهوورە، لە سەعات ڕێگایەکی شیمالی شەرقی ساباڵغ واقیعە لەوێ دابەزین، سەید تەها ئەمری دا لەشکر بەش بکرێت.

لەشکری لەسەر سەرگردان بەش کرد هەر یەک هێندێکی خستە ژێر فەرمانەوە لەپاش ئەو تەقسیماتە هەمووی کردنە سێ بەش بەشێکی لەژێر فەرمانی ئەحمەد خان کوڕی کەریم خان مەزنی عەشیرەتی (سەیدا) قەراری فەرموو حەسەن ئاغای مەنگوڕیشی بە عەشیرەتەوە خستە ژێر ئەمری ئەحمەد خان دووانی ناردە ئەندرقاش بۆ سەر خاڵە قوربانی، بەشی دووەم قەرەنی ئاغای مامەش بۆ (شکاک) و (حەسەن ئاغای عومەری میرزاد؟) عەشیرەتی (هەنارە) لەژێر ئەمری قەرەنی ئاغایدا ناردنیە سەر داشا مەجیدی و شەرقی ساباڵغ بەشی سێیەم بەگزادەی بەرەسۆری و بەگزادەی فەیزوڵڵا بەگی لەگەڵ عەلی ئاغای حاجی ئیلخانی و ئاغاواتی دیبوکری لەژێر فەرمانی سەید تەهادا بۆ خودی شاری ساباڵغ قەراریان دا. ئەحمەد خان لنگی دا سەر ئەندرقاش هەر چوار ئەترافی خاڵە قوربانییان گرت، لەهەر چوار ئەترافەوە تۆپ و تفەنگ دەست پێ کرا، دەشتی شارویران بوو بە ڕۆژی حەشر لە سەدای بگرە و بیکوژەی کوردان خاڵە قوربانی سەرگەردان بوو، سەری لێ شێوا نەیانهێشت دەست بکاتەوە بەدەستی سوارە ئەحمەد گولاوی - ئاغای مەنگوڕ قەهرەمان خاڵە قوربانی لە مەیدانی مردندا لنگەفڕەی دەست پێ کرد، فرسەتی نەدا گەیشتە سەری بە گوللە شپرزەی کرد، سەری گۆشاوگۆش بڕی، لە هەموو لایەکەوە گیرۆداریان لە لەشکری خان قوربانی پەیداکرد، چەند تۆپچێکی عرووسی، کە لەگەڵ بوو لەگەڵ تۆپانیان بەدیل گرتن ڕۆژی ٧ ی مایس.

سەید تەها، کە کەوتە بزووتن بۆ سەر شار هەڵمەتیان بردە ساباڵغ، لەگەڵ بەیانی شاریان دەورە دا، سەید تەها بۆخۆی لەسەر تۆپان ڕاوەستا، قەرەنی ئاغا لەگەڵ بەری بەیانی گەیشتە سەر داشا مەجید تۆپ و تفەنگ دەستی بە ناڵین کرد، دەنگی بگربگری

قارەمانی خونخوارانی کوردان لەسەر داشا مەجید لەشکری عەجەمی لەنێو شاردا بێ هۆش کرد لە سەد دوو نەفەری گیانی لەبەردا نەمابوو بەمەجبووری و بێ گیان بەرابەرییان دەکرد... لە دامێنی داشا مەجید وەکو ئاژۆری جەنگی بۆ سەرەوە دەخشان، عەجەم لەسەرەوە بە تۆپ و تفەنگ و شێستتیر، کورد لەژێرەوە بەزۆری بازووی ئازای تەهەورەوە، هەروەکو مەشهوورە پڵنگ لە سەرەوە بێ حەوت برین دەکا، ئەگەر لە ژێرەوە بێ حەفتا، پڵنگانی کورد هەرچەند لەژێر کێوەوە بوون بە حەفتا برین لە دوژمن رانەوەستان، بە کوشتار سەرکەوتنە سەر کێوی ئامان و داد و بێدادی دوژمن .. سابڵاغی هەراسان کرد دلێران بە ئامان و زەمان لە دوژمن خۆش نەبوون دەورەیان دان بە هەموو سەعاتێک دەوامی نەکرد سێ شێتتیر و تۆپێکی گەورەیان لێ گرتن و فیشەنگ و تفەنگ و جبەخانەیەکی زۆر ئەوجار بۆ بەرابەری شار تۆپیان سووڕاند.

سەید تەها، کە لێی مەعلووم بوو قەرەنی ئاغا و پاڵەوانان دامێنی داشا مەجیدیان گرت، ئەمری دا بەپێشکەوتنی لەشکر هەندێک لە باغانەوە پەڕینەوە بەری مەحموود کانی و هێندێک راست روویان لە شار کرد، سەید تەها لەگەڵ هێندێک گەورە و سەرداران لەسەر تۆپیان بوون لە بەرابەر دوژمن شەڕیان دەکرد، تاکو بەدووربین تەماشای فەرموو قەرەنی ئاغا لەسەر داشا مەجید تۆپی بەر بە شار کرد زاندرا داشا مەجید گیرا، ئەمری هەڵمەتی دا، لەهەر کەنارێکەوە هەڵمەتیان بردە سەر شاری، شەڕ لەنێو گەڕەک و کۆڵانان دەست پێ کرا، سابڵاغ بووبە دەریاچەی خوێن، کووچەی نێو شار هەر لاشەی دوژمن تێدا کەوتبوو، هەر خوێنی ئەوان بوو مەوجی دەدا، لە چوار سەعات یەک نەفەس شەڕو کوشتار و تۆپ و تفەنگ هاوێتن، عەجەم رووی لە هەڵاتن کرد، هەرچی لە شیر و تفەنگی کوردان رزگاربوو بەری خۆی دا باغ و باغچە و چیایان، کە خۆیان تێدا بشارنەوە، سەید تەها بەخۆشی و شادی داخل بە شار بوو، یەخسیرانی گیرابوون وەخڕیان کردن، ئەوەندەی پێ نەچوو ئەحمەد خان تۆپی لە ملی یەخسیری عەجەمان گرێدابوو، سەری خاڵە قوربانی بەداردا کردبوو، لاشەکەیان لەسەر پشتی بارگیرێک دادابوو، بە شادمانی تەپڵ لێدان وارد بوون سەری خاڵە قوربانییان بەدیاری لەبەر پێی سەید تەها ئاوێت، سەید تەها زۆری پی دڵشادبوو شادی و کەیفێکی زۆری بۆ رووودا، فەرمووی جەسەدی خاڵە قوربانی نەنێژن فڕێی دەنە بەر سەگان، فڕێیان دا هەموو سەگ خواردی ، خزمەتی بێگانەکردن ئەوەیە پاداشی.

سەید تەها بە تەلەفۆن مزگێنی دا بە سمکۆ، کە مەسئەلەی وا و سمکۆش فەرموویان

تەواوی شار و بازاڕان ژێر فەرمانی چراخان و شادمانی بکەن، سێ شەو و سێ ڕۆژ هەموو کوردستان بوو بەچراخان، سەید تەها بە سمکۆی گوت ئەم ئەسیرانە، کە ژمارەیان سەد کەسن چییان لێ بکەین؟ سمکۆ خواستییە حزووری خۆی، سەید تەها زانی دەیانکوژێت عوزری هێناوە بۆ نەناردنیان، چونکە هەمیشە حەزی لەوە دەکرد لەگەڵ ئەسیران بەئیلتیفات بی، ئەزیەت و ئازاری تووش نەکا بەچاکی بەخێویان بکا، سمکۆ تەرەفداری ئەوە نەبوو ئەمری دا هەمووان بکوژە، سەید تەها فەرمووی نایانکوژم، چونکە یەخسیر لەهیچ زاکۆنێکدا ناکوژرێن، سمکۆ دەفەرموێت بیانێرنە (چاری - چەهری) سەید تەها لەژێر ریاسەتی لەتیف چاوشدا بەرێیکردنە چاری، لەتیف چاوەش دەیانبەنە سەر دەریاچەی نێزیک ورمێ ، هەموویان بۆ نێو ئاوی دەریا داژۆن و شیلنگی تفەنگیان دەکەنێ ، بەڵام چەند کەسێکیان لێ رزگاربوو..

سەید تەها لەو شەڕە گەورەدا دوو تۆپی گەورە حەوت شێستتیری گەورەی لە عەجەم ئەستاند، قورخانە و جبەخانە و موهیماتێکی زۆری دەست کوردان خست، عەلی ئاغای حاجی ئیلخانی کردە حاکمی سابلاغ، لەشکرێکی زۆری بۆ دامەزراند، حکومەتی کوردییان دانا و شار و ئەتراف شاری ئەمین کردەوە، سەید تەها گەڕاوە کن سمکۆ، بەڵام بە هەموو ئەترافی کوردستاندا واعزی خسوسی بۆ تەشویقات بڵاوکردەوە، مەلا و شێخیان تەعیین کرد هێندێک بۆ هەورامان و سنە و کرماشان چوون، بەیاناتیان برد تەشویقی ئەهالییان دەکرد، حکومەتی کوردستان قبووڵ بکەن.

لە نیهایەتی هاویندا عەجەم لەشکرێکی زۆری لەژێر فەرمانی (ئامانوڵڵاخان میرزا) دا موهەیا کرد، نزیک هەژدە هەزار کەس بوون گەیشتنە خۆی، چەند ڕۆژێک ڕانەوەستان بەر بە دیلمان بزووتن، سمکۆ قووەتی بڵاوبوو نەیتوانی لەشکرێکی زۆر وەخرکا، بەڵام بۆخۆی هێندێکی سوار لەگەڵ خۆی هەڵگرت لە (چیای ڕەش - ئیلان داغ) پێشی بە سوپاهی شازادە گرت، لە هەردوو تەرەفان تۆپ و تفەنگ دەستی کرد بەناڵین و شرنگە، دوو ڕۆژان شەڕ دەوامی کرد، سمکۆ لە ڕووی مەسلەحەتەوە گەڕاوە (وەردان) عومەر خانی بە پێنجسەد سوارەوە ناردە دیلمان، کە شار موحافەزە بکا، ئەحمەد ئاغای برای بەهەزار سوارەوە گوندی (سۆڵاو) سمکۆ و سەید تەها لەگەڵ نوری بەگی بەرەسۆری و حاجی ئاغا لەگەڵ دوو هەزار زیادوکەم لەشکرەوە لە (وەردان) دانیشتن، تۆپیان دامەزراندن، هێندێک لەشکریان لەو وەختە ناسکەدا بۆ ماندوو حەسانەوە ئیزن دا، بەتەمای ئەوە نەبوو عەجەم قووەتی زۆرە، بەڵام حەقیقەت کازم چەرکەسێکی لە ئاتیدا موفەسەڵەن چلۆنی ئەحواڵی

دێتە نووسین پێی کردن ، بەڵکو نە ئەو تەواوی بزووتنی سمکۆی خستبووە ژێر ئەمری و ئەگەر بە سمکۆی بگوتبا ئەوە مەکە و ئەوە بکە ئەگەر مردن بووایە بەقسەی دەکرد ئەو بە دەسایسی تورکان ناردرابووە کنی، میزانی بزووتنی رابگرێت و چتی لە تورک خۆش نەهات نابێت ببکا ، سمکۆ غافڵ لەو دەسایسە بوو هەمیشە مەشوەرەتی پێ دەکرد.

سمکۆ قەراری دابوو لەپاش دوو رۆژی دیکە هەڵمەت بەرنە سەر عەجەم، سمکۆ ئەوەندەی زانی لە بەرەبەیانیدا گرمەژەنی تفەنگ هات، هەموو بەگورجی راپەڕین هەڵسانە سەرخۆیان بە تەحەیوری لێکیان پرسی: ئەوە چ بوو ؟ کە هەندێک تاریک و روونی پەیدابوو ، تەماشاکرا دەشت و سەحرا پڕ لە عەجەم بوو ، تۆپ و تفەنگ هاواریان لێ پەیدا بوو ، دەنگی هەورانی تۆپ ویزەی برووسکانی تفەنگ دنیای کردە چراخان شەڕ گەرم بوو ، پاڵەوان فێرە شەڕ و هەڵمەت کەوتنە جووڵانەوە و بزووتن، ئەحمەد ئاغای برای سمکۆ کەوتە مەیدانەوە، شەڕ و کوشتار دەستی پێ کرد کورد و عەجەم رمیان تێکنا شیری خوێنڕێژییان بەبێ ئەندێشە لێک کێشا ، تۆپ و تفەنگی ئاورفشان وەکو جەهەنەم زبانەی کێشا ، تەڕ و وشکی پێکەوە دەسووتاند، عەجەم لەشکری کردە دووبەش : هەندێک لە بەرابەری سمکۆ شەڕی دەکرد هەندێک چوونە سەر دیلمان. سمکۆ بە سەید تەهای گوت: کەوتمە بەر بەختی تۆ، خۆت بگەیەنە عومەر خانی کۆمەگی بکا ، تا لە شەڕی عەجەم دووربن. سەید تەها ئەمر بە غولام و لەشکری خۆی دەکا بەلەز تاڵۆکە بکەن بگەنە عومەر خان، سوێندی خوارد بەسەری بابی عومەر خان رزگار نەکەن بگەڕێنەوە پاش دەستی هەمووتان دەبڕم، ئەگەر لەنێو دیلماندا گەیشتنە عومەرخان خۆتان قایم بکەن تا کۆمەگیتان دەگاتێ، ئەگەر هەمووتان بەکوشت چوون گەڕانەوەتان نابێ ببێت.

ئەو قووەتە رۆیشتن لەپشت دیلمان گەیشتنە قووەتی عەجەم هەردوو بەرابەر یەک راوەستان نزیک نیو سەعات شەڕ دەوامی کرد، کوردان تەماشایان کرد عومەرخان دیلمانی بەردا و رووی لە هەڵاتن کرد، لەشکری عەجەم داخل بە دیلمان بوون، لەشکرەکەی سەید تەها لەگەڵ عومەرخان گەڕانەوە خزمەت سەید تەها و سمکۆ. لەلای سۆڵاو ئەحمەد ئاغا شکستەی تێ کەوت بەهەڵاتن گەڕاوە، هێندەی پێ نەچوو سمکۆ و سەید تەها دەورەگیران، کە تەماشایان کرد چارە نەما روویان لەیەک کرد چ بکەین چاکە، گوتیان لەشکر بەخۆڕایی بەکوشتدان چاک نییە، ئەو جێگایە بەردەن و روو بە چاری گەڕانەوەیان مەسڵەحەت دیت، لە گەڕانەوەیان بەر بە چاری لەشکری کوردان هێواش هێواش خۆیان دەدزییەوە لە سمکۆ دوور دەکەوتنەوە، بەری خۆیان داوە ماڵی خۆیان، خۆیان لە قوونی

ژنانیان کێشا و سمکۆیان بەتەنێ بەجێ هێشت، نەیان کرد دەست پێک بگرن و پشتی ئەمیری خۆیان بەرنەدەن، بێ مروەتی و نامەردییان کرد، هەموو خۆیان کێشاوە خانووان، هەرچەند سەید تەها و سمکۆ بانگیان کرد و پێیان گوتن چارەبەخش نەبوو، بەبەهانەی خێزان رزگارکردنەوە رۆیشتن، لەشکرێکی، کە دە هەزار کەس بوون چوارسەد کەسێکیان لە خزمەت سمکۆ و سەید تەهادا ماوە، ئەو چوار سەد کەسە لە (سێگرد) مەترێزیان گرت دوو رۆژ توانییان پێش بە لەشکری عەجەم بگرن، چونکو لەشکری عەجەم لە پازدە هەزار کەس زیاتر بوون، موهیمات و تۆپ و تۆپخانەیان لە ژمارە نەدەهات، لەبەر ئەوەی کە سێگر بێ ئاو بوو و دوور لە ئاو بوون لەتینووان نەیانتوانی بمێننەوە سێگریان بەردا، هاتنە نێو چاری و دەستیان کرد بەشەڕکردن و بەرابەری عەجەم، پاسەبانانی عەجەم لە دیلمانەوە تاکو شار هاتن سمکۆ ترسی لێ پەیدابوو، چونکو لەشکری خۆشی نائومێد بوو بەرابەری بۆ بکا و لەگەڵ عەجەم بۆی بەشەڕ بێن، چاریش بەردانیان خستەبەر چاوان، بەڵام لە سەران قەراریان دا جارێ چاری بەرنەدەن بنێرنە دوای بەگزادەی بەرە سۆرالن و حاجی ئاغا و عەبدوڵلا بەگ ئامۆزای سمکۆ پێنج سەد سوارێک هەڵگرن بگەنە چاری لەگەڵ سەید تەها بچنە کۆمەگی ورمێ و قیزقەڵا بخەنەوە دەست، هەرچەند قاقەزیان نووسی و پیاویان نارد لەبەر ئەوەی لە عەجەم بەدزییەوە هەموو ئیغفالکردە بوون و بەدیاری و خەڵات لەخشتەی بردبوون بەگەلێک وەعد و وەعید دڵخۆشی و نەوازشی کردبوون، هەموویان بەتەمای ئەوە لەگەڵ سمکۆ بێ پەیمانی و عەهدیان کرد و جوابی قاقەزانیان نەدانەوە، هەرکەس لە ماڵی خۆیدا گوێی خۆی بەست و دەرگای لەسەر خۆی داخست، چونکو عەجەم لەمێژ بوو بە قسە و گفتوگۆ هەمووانی کێشابووە کن خۆی و دڵی هەمووانی گرتبوو، هەر لەپاش گەڕانەوەی سەید تەها لە سابلاغەوە ئەو سەرۆکانە بەدزییەوە لەگەڵ عەجەم رێککەوتبوون، ئەویش تەشویقاتی کازم چەرکەسی، کە نەدیم و وەزیر و مودیری سمکۆ بوو، هەڵی دەخەڵتاندن، هەروەکو لەپاش ئەمە ئەحواڵی کازم دێتە پێشەوە، کە سەید تەها و سمکۆ زانییان کۆمەگییان بۆ نەهات بەتەنها مانەوە، بەنائومێدی چاریان بەتاڵ کرد، سمکۆ چووە گەلی (شەپیران) خێوەتی خۆی هەڵدا ، سەید تەها نۆکەرانی خۆی هەڵگرت و گەڕاوە (مەرگەور) باقی قووەتی سابلاغ و ورمێ و شنۆ و غەیر تەقەیان تێ کەوت، هەرکەس لەپێگەی خۆی کشاوە ماڵ و گوندی...

عەجەم، کە ئەو شکستەی لە کوردان چاو پێ کەوت گەڕاوە نێو کوردان و دەستی زوڵم و جەوری بەسەردا درێژکردن، نەچاک و نە خراپی پارازت، تەڕ و وشکی پێکەوە رەپێچک

دا، کارێکی ئەو جارە بەسەر کوردانی هێنا بەسەر کەس نەهاتبێ، عرووس لەپێشدا وەی بە کوردان نەکرد، کە تورکمانی ئاوربایگان بە کوردیان کردن، پیاوانی بەشەرەف و نامووس هەموو هەلاتن، پەنایان بۆ سلێمانی، بانە و هەورامان برد.

کازم چەرکەسی - یوزباشێکی تورکان بوو، کە بزووتنی سمکۆ بلاوبۆوە، مستەفا کەمال لەخۆی ترسا، کە نەبادا سمکۆ لە شەڕی عەجەمدا موەفەق بێت و بەری خۆی بداتە کوردستانی شیمالی، گرتی کازم چەرکەسی تەعیین کردە سەر سمکۆ بە سینعەتی هەلاتوو لەدەست تورکانی ناردە کن سمکۆ. گوتی: من مەسئولی حکومەتی کەمالییانم ، سمکۆ وا رێگای هێواش هێواش نێزیک کردو خۆی تێکەڵ کرد، سمکۆیێکی غافل لە ئەحوالی سیاسی تورکان رۆژبەڕۆژ ئەو پیاوەی لەخۆی نێزیک خستەوە، تا هەموو فکرێکی سمکۆ کەوتە ژێر ئەسراری کازمەوە، ئەویش رۆژبەڕۆژ راپۆرتی حەرەکاتی دەدا بە ئەنقەرە، کە خالە قوربانی کوژرا و کوردەواری قووەتی پەیداکرد دەستیان هاوێتە سنە و کرمانشا و لورستان و شەعشەعەی کوردان دنیای پڕکرد، پیاوانی گەورە و زانایانی تێگەیشتووان لە رێگای دوورەوە خۆیان گەیاندە خزمەتی زابت و ئەرکانانی حەرب، لەبن ئالایدا وەخڕبوون، ترسی پاشەرۆژی سووڕانەوەیانی کەوتە دڵی ئەوەندەی پێ نەچوو زاتێکی وەکو مستەفا پاشای مەشهوور، کە چەند سالان لە لەشکری عوسمانییاندا قوماندانی ئوردوو و رەئیسی دیوانی عروفی والی ویلایاتی کردبوو، پیاوێکی زۆر بە فیکر و زاناو مودەبرێکی وریا و قوماندانێکی موقتەدیر خۆی گەیاندە سابلاغ و دەستی بە نسیحەت و تەدبیرکردنی سمکۆ کرد، کەوا چاکە ئەم قووەتە بەخۆڕایی لەگەڵ عەجەم بەکارنەبەی روو لە ویلایەتی وان و دیاربەکر و عەرزەرۆم کە، ئەو کوردانە لە جەور و زوڵمی کەمالییان رزگارکە، زووتر حکومداریت بۆ سەردەگرێت، چونکو ئەو جێگایانە بۆ کوردستان قەراردراون، دەبێ ببنە حکومەتێکی کوردان، بەلام لە ئێراندا حکومەتی کورد دامەزران بە دشوار دەبینم، کازم چەرکەس لە مەنگوڕان یەکدەستیان کرد، چەند ئاغایانی پەیدا کرد، پێنج سەد لیرەی دانێ، کە مستەفا پاشا بکوژن، مەنگوڕ پارەیان وەرگرت و خواردییان و بە پاشایان گوت کە ئەوەندە دراویان دایانێن، کە تۆ بکوژین، بەلام غەم مەخۆ ئێمە نۆکەری تۆین. کازم چەرکەس ئەوە بوو لەنێو ئوردووی کوردستاندا جاسووسی تورکانی دەکرد و هەموو قووەتی کوردانی بە عەجەم دەگوت بۆ گەورانی عەجەم هەموو بزووتنی کوردانی دەنووسی، کە کورد قووەتی پەیداکرد، ئەوەبوو لەنێو ئاغاواتاندا تەشویشاتی تێ خستن، کە سمکۆ هەموو تالانی بۆ خۆی دەخوا و تەمای هەیە ببێتە حوکمدار، ئاغاواتی جاهل و غافل لە ئەحوالی

کـازم پێی هەڵدەخـەڵەتان، هەمـوو گـەورە و سـەردارانی لە سـمکۆ دڵگیـر کـردبوو، لە سابڵاغدا پیـاوێکی دانابوو (کوفـتـۆر حەکیم عـازف حیکمەت) ناوێک، کە لە دەسایسی غـافڵ نەبێت، ئەویش هەمـیشـە لە خزمەت سمکۆ دابوو، هەتا یەخسیر کوشتنی سمکۆ و تالانکردنی شاران بە دەسایسی ئەو ئیجرادەکرا، تاکو ئەهالی لێی دڵگیرنەبن، کە عـەجەم لە تەورێز دەرکەوت کـازمیش لە نەتیجە گەیشتبوو کوردەواری بڵاوکردبۆوە، بە سـمکۆی گەیاندبوو عـەجەم ئیـتـر ناتوانێت بەرابەریت بکا، ئەوی لەویّ غـافڵ کردبوو، بەدزییەوە بە سەردارانی گـوت: عـەجەم قـووەتی زۆر هێناوە، سـمکۆ ناتوانێت خـۆبگرێت، هنگۆ خۆ بە کوشت نەدەن چاکە و عەجەم، کە بزانێت دەستتان لە شەڕ کێشاوەتەوە عەفـووتان دەکات، ئەوەشی بە عـەجەمـان راگـەیاندبوو، عـەجەم بەدزییـەوە دڵخـۆشی دەداتەوە، تا سـمکۆی بەتەنها هێشتەوە.

کـە سـمکۆ چووە گەلی شـەپیـران کـازم هەڵات خـۆی گـەیاندە وان لەشکرێکی زۆر و موهیـمـاتێکی تەواوی لە تورک وەرگرت بەشەو هاتە سەری هەرچوار ئەترافی ئابلووقـەدا، بۆخـۆی بەتەنهـا لەپێـشـەوە عـەسکەر لەدوای بۆ چادری سـمکۆ چوون، تا نێـزیک بوون، سـمکۆ دەنگیـدا تۆ کێ؟ گـوتی: منم. سـمکۆ گـوتی: کـوڕۆ کـازم هاتیـەوە ، دە وەرە پێش بەخێرهاتی. کازم چووە پێش تفەنگی لیّ ڕاگرت گوتی: نەبزوو، دەتکوژم، سـمکۆ ئەوەندە هاواری کـرد: کـوڕۆ بارکـەن، لەشکری تـورک هات، بە هەزار کـێـشـە خـۆی رزگـارکـرد، خەسرەوی کوڕی بەدیل گیرا و ناردرا ئەنقەرە و ژنێکی کوژرا، هەشتا هەزار لیرەی تەڵای زەرد و شـەش تۆپی گـەورە چەند شێـسـتـتیـر و جبـەخـانەیەکی زۆری لیّ یەخـسیـرکـرا، بەزەحـمـەت رۆحی خـۆی رزگـارکـرد پەنای بردە خزمـەت سـەید تـەهاِ ئەو وەختـە حکومـەتی ئینگلیـز دڵخـۆشی جـەنابی سـەیدتەهایان دابۆوە وەعـدێکی زۆریان لەگـەڵ کـردبوو، کـە حکومەتی کوردسـتـانی بۆ تەشکیل بکەن، سـمکۆ لەپێش هەڵاتنیدا مانع بوو، کە هەڵات هاتە کن سـەید تەها لە (سیـدەکـان) لە ڕێگا قـاقـەزی لە سـەید تـەها نووسی، کـە فـریام نەکـەویت شکاکی عـەشیـرەتی خـۆم دەمکوژن، جەنابی سـەید تەها بەلەز چەند کەسێکی ئامۆزایانی خۆی لەگەڵ چەند نۆکەرێک ناردە کنیو هێنایانە چیای پشت سیدەکان. سەید تەها مـەجبوور بوو پەنا بۆ دەوڵەتی ئینگلیز ببا، لە تورکـان ئەمین نەبوو، بە دەسیسـەیەک ژن و منداڵ و خـێـزانی ناردە دەشـتی حەریر، بۆخـۆی تەمـای بوو لە رواندز پەنا ببـاتە بەر عـەلی شـەفـیـقـێکی لە تەرەف تورکـانەوە لە رواندزدا پوروپۆغـانەی دەکـرد، هزرێک لە کوردپەروەران عەرزیان کرد ئەگەر بچی رزگار نابی، بەهەر جۆرێک بێ دەربازی هەولێر بە.

سەید تەها و سمکۆ لەگەڵ پیاو خزمەتچییەکی لەگەڵیان بوون بەشەو لە رواندز تێپەڕین نەیانهێشت تورک پێ بزانێت، خۆیان گەیاندە دەشتی حەریر، ماڵ و منداڵیان بردە حەریر لە گوندی بەحرکەی دانان. سمکۆ لە دێری حەریر لەنێو قەڵای پاشای کۆردا دانیشت، موخابەرەیان لەگەڵ حکومەتی ئینگلیز کرد، هەردووکیان خواستنە بەغدایە سمکۆ چوونی نەخواست، سەید تەها تەشریفی بردە بەغدا نێزیک مانگێکی زیاتر پێچوو لەگەڵ دەوڵەتی بریتانی رێککەوت و بە موەفەقی سەید تەها گەڕاوە هەولێر، ئوتومبیلیان هەڵگرت و چوونە قەڵای دێری حەریر لەگەڵ سمکۆ گفتوگۆیان کرد و چلۆنی ئیتیفاقیان لەگەڵ دەوڵەتی بریتانی بۆ گێڕاوە و تەکلیفیان کرد سواربن و بچنە هەولێر پێکەوە سواربوون، نۆکەر و دەست و پێوەند بەسواری ئەسپ لەگەڵیان کەوت، نێزیک سەعاتێکیان مابوو بگەنە هەولێر سمکۆ بە مێجەر نوێل دەڵێ کە لەبەر دووکەڵی ئوتومبیل سەرم گێژبوو، ئێوە بچن ئەمن بەسواری ئەسپ دێم، مێجەر نوێل دڵخۆشی دەداتەوە، کە حکومەتی بریتانی هەموو کاروبارت بۆ رێک دەخا، فایدە ناکا، چونکو نۆکەرەکانی گەلێک فەسادییان کردبوو، دڵی لە سەید تەها پیس کردبوو، ترسی لێ پەیدابوو، دەستی دا دەمانچە بانگی لە ئوتومبیل ئاژۆ کرد، کە ئوتومبیل رانەگری دەتکوژم، ئەویش ئوتومبیلەکەی راگرت، سمکۆ دابەزی و سواری ئەسپ بوو بەری خۆی دا شەقلاوە.

کە سمکۆ و سەید تەها گەیشتنە دەشتی حەریر سمکۆ لەگەڵ شێخ مەحموود تەمای ئیرتیبات پەیداکردنی هەبوو، بە سەید تەهای گوت، کە ئێمە لەگەڵی هاتووچۆمان هەبێ، سەید تەها بە تەلەگراف سەلامی بۆ شێخ مەحموود نارد و پێی گوت واسیتەی موخابەرە سمکۆیە، شێخ مەحموود شەش سەد لیرە پارەی بۆ سمکۆ نارد و قاقەزی لێ نووسی و پیاوی ناردە کنی، لەوەدا دەوڵەتی بریتان پێی خۆش نەبوو، کە سمکۆ لەگەڵ شێخ مەحموود ناسراوی پەیدا بکەن، چونکو شێخ مەحموود لە خەیاڵی رزگاریدا بوو، موستەشارانی ئینگلیزی، کە لەکن بوون بە ئەنواعی رەزالەت تەحقیر دەکران، هەرچەند بە ئاشکرا مێجەر نوێل، کە هاتووچووی سمکۆی دەکرد بە چاوی دانەدەداوە، بەڵام بەپەنهانی پێیان خۆش نەبوو.

سەید تەهایان نامزەدی حوکمداری کرد، سمکۆ لەوە دڵگیربوو، چەند زابتێکی کوردی سلێمانی لەکن بوو، دڵیان پیس کرد، کە سمکۆ دەبێ ببێتە حوکمدار، لەسەر ئەوە هەستا چووە نێو عەشیرەتی سورچییان لەگەڵ گەورە و مەشایخی سورچی ئیتیفاقیان کرد و گەڕاوە بەحرکە مێجەر نوێل پێی گوت جەنابی سمکۆ ئەمڕۆکە رۆژی ئیتیفاقە لێک بڵاو

مەبنەوە و لێگەڕێ تاکو سەید تەها دەکرێتە حوکمدار، بۆتۆش کارێکی گەورە دەکەین، سمکۆ لەسەر ئەمە بوو، کە قووەتێک پەیدابکا و بچێتە سەر ئێران، چەند جارێک لەکن ئینگلیزەکان ئیزهاری ئەوەیکرد، مێجەر نوێل جارێکی بەم عیبارەتە کوردییە پێی گوت: جەنابی سمکۆ خان بە بەهانەی سەرگینێ دەچنە گوندی مەخینێ؟ ئەگەر سەبرکەن رێگایەکی واش بۆ تۆ پەیدادەکرێ .

ئینگلیزەکان هەموو رۆژێ لەکنی بوون و دڵخۆشییان دەداوە، سمکۆ لەوە زۆر دڵگیر بوو، کە هەمیشە تەیارە و ئوتومبیل بۆ سەید ساز کراوە سوار دەبێ و دەچێتە بەغدا و دەگەڕێتەوە هەولێر، چەند جارێکی بە مێجەر نوێلی دەگوت، کە دەوڵەتی بریتان ئەگەر لەگەڵ من چاک بوایە وەکو بۆ سەید تەهای کار دەکرد منیشەی بە هێند دەگرت. مێجەر نوێل پێی گوت ، کە سەید تەها لە مەرکەزاندا بەڵەدترە و چاتر ئاگادارە، تۆ هەمیشە نەفرەت لە مەرکەزان دەکەی، لەسەر ئەوە مێجەر نوێل سەعی دەکرد.

تشرینی یەک ١٩٢٢ گرتی قاقەزێکی لە مەلیک مەحموودی پادشای سلێمانی نووسی، کە ئەو وەختە مەلیکی کوردستانی عیراق بوو، مەلیک مەحموود قبووڵی کرد. ئەمری کرد لە سەرای ملوکانەوە تا دەرێی شاری سلێمانی هەموو کووچانی رازاندەوە، بە مافوورە و سەراندازی داپۆشی، حەوت تاق زەفەری لە دەرێی شار بۆ دروست کرد، هەموو لەشکری و ئەهالی شاری بۆ پێشوازی ناردنییە دوو سەعات دوور لە شار سوپاهسالاری خۆی بەچەند وەزیر و ئومەناوە نارده رۆژێک دوور وەلیعەهدی خۆی بە سێ سەعات دوور لە شار بە دەبدەبەیەکی شاهانەیان پێشوازی کرد، سەعاتێکی مابوو نێزیک بە شار بن بۆخۆشی بەدەست و پێوەندییەوە لە شار دەرچوو، نیو سەعات لە دووری شار بەیەکتر گەیشتن. مندالانی مەدرەسە و قوتابی و ئەهالی هەرکەس بەکاروکاسپی خۆی لەگەڵ هاوەڵانی پۆل پۆل و دەستەدەستە لەو رێگایەدا لەبەخێرهاتنیدا راوەستابوون، لەهەموو لایەکەوە گەلێک گوڵی بۆندار و گوڵاویان دەپرشاند، لە هەر سەرە رێگایەکدا سازو سەمتوور و دەهۆڵ و زورنا و مۆزیقە لێدان بوو، لە تەرەف سوپاهیانەوەش بەتایبەتی مۆزیقەی چاک و خۆشی بەدەستووری پادشایان لێدەدرا، هەر لەدەری شارەوە تا سەرای پادشای ئەم هەموو ئەسپ و ئوتومبیل و حەشاماتە بەسەر مافووراندا دەڕۆین بەهەزار کەیف و خۆشی چوونە سەرای، بەتایبەتییەوە مەلیک مەحموود زاکۆنێکی بۆ ئەهالی و ئیسراحەتی سمکۆ دانا، سەر لەسبەی بە دوو سەعات تا سەعاتێک پێش نیوەڕۆ مەئموران و وزەرا و ساحێب مەناسیبانی لەشکر و گەورە و سەرکاران بێنە زیارەت،

سەعاتێک لەپێش نیوەڕۆ تا دوو سەعات پاشی نوێژ بۆ ئاسوودەگی سمکۆ کەس نەچێتە خزمەتی لەوە بەولاوە تا سەعاتێک پێش شێوان ریش سپی و کەیخودا و ئاغا و مەلا و شێخانی شار و کەسەبە و توجار بچنە خزمەتی، لە سەعات یەکی پێش شێوانەوە تا سەعات یەکی پاش شێوان ئیستراحەت، لەوە بەولاوە تا خەوتنان بۆخۆی و دەستوپێوەندی مەلیک لەگەڵی دادەنیشتن، هەموو دەمێک هەرچی دڵ خوازبوایە لە خزمەتیدا ئامادەبوو، تەلەفۆنی لە دیوانی مەلیکەوە بۆ کێشابووە سەرایەکی بۆیان رازاندبۆوە، هەر وەختێکی لە مەلیک قسەی کردبایە و هەرچی پێویستبایە بەتەلەفۆن قسەیان لەگەڵ یەک دەکرد، مەلیک مەحموود تەواوی ئەهالی بانگ کرد نۆکەر و خزمەتکارانی سمکۆ لە لیرەیەکەوە تا هەزار زێڕ هەرچی بکڕن پوولیان لێ وەرمەگرن، لە دەفتەرتاندا هەموو رۆژی جومعە بۆم بێنن لە کیسەی خۆمتان دەدەمێ، نە لە چایخانە نە کن توجاران کەسێک پوولی لێ نەدەستاندن، خانووبەرەیەکی بەتایبەتی بۆ رازاندنەوە، مودەتی دوو مانگ بەجۆرێکی خزمەت کردن هیچ پادشایەک خزمەتی هیچ پادشای میوانی خۆی وا ناکا، جارێ بەگەیشتن هەر نۆکەرێکی سەد لیرەی دانێ و هەشت سەد لیرەشی دا بە سمکۆ، هەموو رۆژی جومعە هەشت سەد لیرە لە کیسەیەکدا لەسەر تەختەی مێزی سمکۆ دادەندرا و هەر نۆکەرێکی دە لیرەی دەدرایە.

کە لە سلێمانی گەڕاوە چووە حدودی وان جێگایەکیان دایە تێدا دانیشێت، لەگەڵ سەید تەها دڵگیرییان کەوتە نێوانی، لەگەڵ تورکان رێک کەوت، قەرار وابوو لە پوولێکی لێی ئەستێندرا هێندێکی بدەنەوە، ئەویش نەبوو، بەڵام تورک زۆریان ئیحتیرام گرت، چونکو مەسەلەی موسڵ نەبڕابۆوە، تورک لەگەڵ دەوڵەتی بریتانی لەسەر موسڵ لە هەلوگیڤدا بوون، خەیاڵیان هەبوو، سمکۆ بکەنە ئالەتی ئەو شەڕە و بیخەنە مەیدانەوە بە کوشتی بدەن، لەبەر ئەوە کەمالییان زۆر بەدەورەی هەڵدەهاتن. سلێمان سەبری ناوێکی کەمالی، کە قۆمیسیۆنی حدودی ئێران بوو بەحیلە و فڕوفێڵ بردیە شاری وان، سمکۆ لەوێدا بەیاناتێکی دا بە حکومەتی ئەنقەرە، کە ئیزنم بدەن موسڵ بە خوێن دەرەنگێنم، بەزۆری بازوو لەژێر پەنجەی ئینگلیزی دەردەخەم، لەو جۆرە قسە و گفتوگۆیانەی گەلێک کردبوو.

حکومەتی عەجەم دایمە لە شەڕی سمکۆ دەترسا، لەپاش ئەوە گەلێکی پیاو ناردە کنی، تاکو ئاشتیان کردەوە و حکومەت دەر عەهدە بۆ شەوکەتی پێشووی هەر بە.. و دەست رەسبێ لە جێگای خۆیدا دانیشێت و بە رەحەتی و لە تەرەف حکومەتەوە معاشێکی

تەواویان بۆ بڕییەوە، هەڵسا گەڕاوە چاری، قەسر و سەرایەکی، کە رووخابوو حکومەت ئەو خەسارەتە پارەی داوە، بە ئاسوودەگی لە جێگای خۆیدا ئیقراری گرتەوە، لە بزووتنی شێخ سەعیدا لە ساڵی ١٣٤٣ی هجریدا، کە شێخ سەعید شکا، شێخ عەلی رەزا و شێخ غیاسەدین و شێخ سەلاحەدین کوڕی شێخ سەعید و شێخ مەهدی برای شێخ سەعید لەگەڵ خالید بەگی حوسنی و عوسمان بەگی میللی و عەبدولباقی بەگ حوسنی و چەند سەد سوارێکیان لە تورکان هەڵاتن و پەنایان بۆ عەجەم برد، حکومەت گرتنی و بردنییە تەورێز حەپسی کردن. سمکۆ ، کە ئەوەی بیست کردیە سەر حکومەت ئەو پیاوانە بە ساغی و دڵخۆشییەوە دەیاننێرنە چاری، نابێ هیچ رەنجیدە ببن، حکومەت لەبەر دڵی سمکۆ هەمووی ناردنەوە خزمەت سمکۆ، بە ئیحتیرامەوە تەسلیمی کردەوە، غەیری ئەوانیش گەلێک موهاجیران و هەڵاتووانی کوردستانی شیمالی پەنایان بۆبرد، هەموو جێ کردن و بە هەموو زەحمەتێکیان رازی بوو، ئەوانە نەختێک جێگایان بە سمکۆ لێژکرد، چونکو بە ئاسوودەگی دانەنیشتن، هەر رۆژە نا رۆژێک دەچوونە سەر تورکان و دەشکان و دووبارە پەنایان بۆ سمکۆ دەبردەوە، ئەویش قبووڵی دەکردن ...بوو بە پشتیوان و لانەی هەڵاتووانی کوردستانی شیمالی، سمکۆ هێندێک لە نەزەری تورکاندا کەوتە جێگای ترس، چونکو ئاوری سۆزندە لەویەوە شەرارەی پەیدادەکرد، لەلایەکەوە عەجەمیش ئەندێشەیەکی تەواوی لێ دەکرد، سمکۆش رۆژبەڕۆژ قووەتی زیاد دەبوو، نێوانی هێز و پشتیوانی پەیدا دەکرد، حکومەتی بریتانی لە عیراقدا کەوتە تەشویشات لە سمکۆ، چونکو ئیحتیمالی بەوە دەکرد، کە سمکۆ لە بۆلشڤیکی عرووس قووەتی بوێ لەبەرئەوە لە پرسی حکومەتانەوە سمکۆیان خستە بەرچاوان و لێی دەترسان، بەڕاستی جێگای ترس بوو بۆ هەرسێ حکومەت، ئەگەر وەکو بەریتانی لێکی دەداوە، سمکۆ لەگەڵ بۆلشڤیک رێککەوتبێ عیراق و بریتانی تووشی زەرەرێکی تەواو دەبوون، ئەگەر بە دوژمنی تورکان ببزووتبایە و کوردستانی شیمالی، چونکو لەدەست تورک جگەر پڕ لە خوێن بوون، هەموویان پاڵیان بە پشتی سمکۆوە دەدا، بەکەم مودەتێک شەش وڵاتانی شیمالیان لەدەست کەمالییان دەردەخست، ئەگەر بەر بە ئێران ببزووتبێ، چونکو تەخت و تاجی ئێران لە کەشماکەشی رەزاخانی پەهلەوی و ئەحمەدشای قاجاردابوو نێوانی ئێران لە شۆڕشێکی تەواودا بوو قابل ئیستیفادەی کوردان و ئینقیرازی ئێران بوو.

بریتانی بۆ تەحقیقی ئەوە چەند کەسێکی ناردە کن سمکۆ بۆ جاسووسی نەگەیشتن، سمکۆ پێی زانی گەڕانەوە، بەڵام ئەوەندەیان دەستکەوت شێخ عەلی رەزای کوڕی شێخ

سەعیدیان فریودا و هێنایانە عیراق، کە گەیشتنە رواندز بە کۆمەگی سەید تەهاوە ئەوانەیان بە دەوڵەتی بریتانی دا بەناسین و ئومێدی ئەوەیان کرد، کە دەوڵەتی بریتانی کۆمەگییان بکا و بچنە سەر تورکان تۆڵەی بابیان بستێننەوە، سەید تەها گەلێکی حورمەت گرتن، ناردنییە بەغدا شێخ عەلی رەزایەکی ... ناشی لە ئومووری سیاسی، کە چوونە خزمەت مەندووبی سامی بریتانی لە بەغدا بە ئومێدی ئەوە ئەم قسە زۆر چاکە و بریتانی پێ دەترسێنم، بەڵکو کۆمەگیمان بکەن، بە مەندووبی سامی گوت: ئەمڕۆکە سمکۆ لەژێر ئەمری مندایە، ئەگەر لەگەڵمان رێک کەوی و پشتمان بگری بچین لەگەڵ تورکان شەڕ بکەین زۆر چاکە و ئەگەر وانەکەن لەگەڵ بۆلشڤیک رێک دەکەوین، دەچینە سەر تورکان. ئەو قسەی شێخ عەلی رەزا راپۆرتی کە درابوو بە دەوڵەتی بریتانی لە بابەت سمکۆ و بۆلشڤیکەوە وەراست گەڕا، ئەوەندەی دیکە حکومەتی بریتانی خستە فیکرەوە، هەرچەند وانەبوو، کە شێخ عەلی رەزا گوتی، چونکو سمکۆ لەبەر شوهرەتی لەنێو کورداندا پەیدای کردبوو لەهەموو لایەکەوە پەنایان بۆ دەبرد و ئەویش لەبەر نەجابەت و سەروەری خۆی قبوولی دەکردن و پوول و خەرجی رێگای دەدانێ، شێخ عەلی رەزا، کە حورمەتێکی لەوێ دیبوو نە لەبەر ئەوەبوو لەگەڵی یەک بێت و یاخود لەگەڵ بۆلشڤیک رێک کەوتبێ، بەڵام گوتنی شێخ عەلی رەزا هەر لەبەر هێندەبوو کاری خۆی پی جێبەجێبکات، بەڵکو بەو قسە زیاتری لەبەر دەپارێنەوە و حورمەتی چاکتر دەگرن، واش نەبوو بەتەواوی لەبەر چاوی ئینگلیزان سووک بوو، هەروەکو لە بەحسی ئەودا دێتە گۆتن.

لە خسووسی سمکۆوە سێ حکومەت بە غەڵەت چووبوون، هیچیان وانەبوون، کە تێی گەیشتبوون، جا لەبەر ئەوە عەجەم و تورک موعاهەدەنامەیەکیان دامەزراند بینابوو لەسەر پێنج قانوون، هەموو نەتیجەی ئەوەبوو سمکۆ لەپێش خۆیان لابەرن، سمکۆش لەوە گەیشتبوو، بەڵام خۆی وەخڕەکرد، عەجەم عومەرخانی، کە چەند جار ناوی گوترا، کە لەگەڵ سمکۆ بوو کێشایانە کن خۆیان، حادیسەیەکی عوسیان لە لورستان پشتکۆهـ پەیدابوو، ژنێکی کورد لەگەڵ عەجەم شەڕی دەکرد، عومەرخانیان نارده سەر ئەو ژنە، چوو بەخۆشی گەڕاوە، سمکۆ زۆری پێ ناخۆش هات، عومەرخانی گرت بیکوژێت و تەواوی هەست و نیستی تالان کرد، عومەرخان بەهەر فێڵێک بوو، خۆی گەیاندە تەورێز، لەوێوە عەجەم بردیانە تاران ، گەلێک دڵخۆشییان داوە، سمکۆ لە عەجەمی خواست، چەند جارێک داوای کرد تەسلیمی کەن، عەجەم عومەرخانی بەدەستەوە نەدا، سمکۆ هێندێک لەوە دڵگیرببوو.

مانگی زیلقەعدە ١٣٤٤ دا ئیحسان نوری ناوێکی زابتی تورکان، کە بۆ خزمەتکردنی تورک و تەشەوشاتی کوردستان لە بەغدا دا دەستبەسەر ئینگلیزان خستبوویانە بن کەفالەتەوە، هەڵات چووە کن سمکۆ گەلێک ئەمدیو و ئەودیوی لەگەڵ سمکۆ کرد، سمکۆ لەریزەی ئەدنا میوانێکیش ئیحتیرامی نەگرت، لەپاش چل رۆژێک شێخ عەلی رەزای بەبەهانەی چوونە عەجەم خۆی گەیاندە سمکۆ و ئیحسان نوری خستە بەرچاوی سمکۆ، بەباوبژ و فرۆفێڵ، کە بریتانی ئەوەندەمان قووەت دەداتێ، ئەمەندە لەشکری کوردان لە عیراق بۆ چووە، گەلێکیان لەو قسانە بە گوێی سمکۆدا دابرد بە تورکان ببزوێت، سمکۆ گوێی نەدایە، دووبارە ئیحسان و شێخ عەلی رەزا کەوتنە سەر ئەوەی سمکۆ بەگژ عەجەمدا بکەن، هەزار سوێند و هەزار عەهدییان لەگەڵ کرد، کە هەموو عەشیرەتی کوردان، کە لەگەڵ ئێمە هاوەڵ و هەمدەردن، هەرئەوەندە بزووتنی تۆ بزانن هەموو لەژێر ئالاتدا وەخرِدەبن، ئێران ئەمرۆکە ئێران بە شۆرِشی سەردارانی لەشکر لەگەڵ رەزاخان موخالیفن، سالاری دەولەی مام شاهی پێشوو لە سنە و کرماشان لە هەڵمەت دایە، هەموو میللەتی ئێران بە دوژمنایەتی رەزان لە حەرەکەدان، عەشیرەتی کوردان بەتەواوی لەژێر حوکمی تۆدایە، راوەستانت جایز نییە، بەسەد جۆر ئیغفالیان کرد، هەڵیانخەڵەتاند، کە ئەحواڵی ئەوان لەبن تەرجەمەی حاڵی شێخ عەلی رەزا بەخت دەکرێت، سەد جۆرە درۆ و باوبژیان بۆ رێکخست، عەشیرەتی هەرکییان بەناوی ئەوە دەخستە بزووتن بەبەهانەی کچە کوردێکی (شێخ لیسک) ناوێکی سەرهەنگی ئێران رایکێشاوە، چوونە سەر شنۆ شاریان سووتاند و تالانیان کرد، گەلێکیان کوشتارکرد، ئەویشیان بۆ سمکۆ کردە شاهدێک، سمکۆ باوەرِی پێ کردن فەرمووی قووەتێکی تەواویان وەخرکرد لە رەبیعی .. ساڵی ١٣٤٥ی هجریدا سەدو پەنجا سواری لەژێر فەرمانی (تەیار بەگ بەرەسۆری) و (عەبدولباقی بەگ حوسنی) و (فەیروزخانی هەناری) دا ناردە سەر دیلمان.

لە ئەوەلی رەبیعی دووەمدا خۆیان گەیاندە کەناری شاری دیلمان، تەماشایان کرد هەموو ئەترافی شار گیراوە، دەروازانی قەڵا، کە دەورەی شاری داوە داخراون دەورەی سووری قەڵا دەدەن، لەشکری عەجەم لەسەر کۆنگرانی دیوارەوە دەست دەکەنە تفەنگ و فیشەنگ هاویشتن، لەشکری کوردان لۆ چووین ناپرنگێنەوە دەرِۆن تا دەگەنە بن دیواری قەڵا، بەهەر جۆرێک بوو بن دیواریان کون کرد، ئەو سێ سەرداره گەورانە بەچەند نەفەرێک نۆکەرەوە بۆ موحافەزەی ئەو کونە لە دەری قەڵا رادەوەستن، سەد و پەنجا نەفەر لەشکرەکە خۆی لە شار خزاند بە شەرِوکوشتار کەوتە نێو کووچەی دیلمانەوە تەواوی

گەڕەکێکی شاریان گرت، مودەی چوار سەعات هەر لەنێو کووچاندا شەڕبوو، کە گەڕەکێکیان لە شار کەوتە دەست، لەشکری عەجەم بە تۆپ و بۆمبا دایانگرتن، بەڵان ئەوان جێگای خۆیان قایم گرتبوو، لە دەرەوە قووەتێکی دیکەی عەجەم لەگەڵ سێ سەرداری بێژراو دەستیان بەشەڕکرد، فەیرووزخان و تەیار بەگ و سەلیم بەگی برازای عەبدولباقی بەگی حوسنی شەهیدکران، عەجەم دەرکی کونەکەیان لەسەر ئەوانی لە ژووردان گرێ دا و دەستیان بەشەڕکرد، بۆمبەیان لەدەمی تفەنگ و تۆپ دەنا دەیانهاوێتە کوردان دەچوو لەنێویاندا دەتەقی، باڵاخانە و خانووی بڵندی ئەو گەڕەکەی کوردی تێدابوو هەموو بە تۆپ و بۆمبە وێران کرا، کورد لەژێر خانانداندا مەترێزیان گرتبوو، مودەتی دوو شەو و دوو رۆژان بێ بڕانەوە شەڕ و تفەنگ و تۆپ هاوێتن بۆ نیو سەعات لەسەریەک تۆپ داوێژرا، نیو سەعات شێستتیر و نیو سەعات بۆمبە و نیو سەعات دەستڕێژی تفەنگ دەکرا، موتەهەویر و قارەمانانی کورد وەکو شێری رق هەڵساو لانی گرتبوو، فیشەنگی بەخۆڕایی ناوێت بەهەر گوللەیەک چەند کەسی پێ نەکوشتبا زایەی نەدەکرد، ئەو خەبەرە بە سمکۆ گەیشت تەماشای فەرموو مەسئەلە مودهیشە، چونکو هێندێک گوتیان هەموو لەشکرەکە کوژران، هێندێک گوتیان، کە هەموو خۆیان دا بەدەستەوە، هێندێک گوتیان هەموویان بەدیل گرتوون، بەڵام راست ئەوەبوو، کە لەشکر کەوتە ژووری قەڵاوە دەنگی تۆپ و تفەنگ و بۆمبە دنیای هەراسان کردبوو، ئیتر کەس بەڕاستی کاری نەدەزانی، سمکۆ هەزار سواری نارد و سوێندی بە قەبری جەوەر ئاغا خوارد، یا ئێوەش هەموو دەکوژرێن، یاخود دیلمان دەگرن، ئەو لەشکرە بەقووەت و موهیماتی خۆیەوە رووی کردە دیلمان، دەورەی شاری گرت، دوو سەعاتی پێ نەچوو هەموو عەجەمیان بەدیل گرت، کە تەماشایان کرد، لەشکرێکی لەنێو شاردابوو، هەریەک پازدە فیشەنگیان پێ مابوو، ئەگەر چەند سەعاتێک کۆمەگیان نەگەیشتبایە هەموو یەخسیر دەکران، بەڵام ئەو مودەتە لە کەیف و خواردندا بەسەریان دەبرد، ئەو خانووانەی گرتبوویان خاوەندیان خستبوونە دەست، هەموو چتی خواردەمەنییان بوو، ئەگەر دوژمن نەختێک نێزیک دەبۆوە دوو سێ فیشەنگیان داوێت و دەگەڕانەوە جێگای خۆیان، ئەو هەزار کەسە، کە گەیشتنە کۆمەگی و شاریان گرت، دەستیان کرد بە ئەمنییەت و ئاسایش.

لەپاش گرتنی دیلمان لەشکریان بەر بە ورمێ کێشا لە (گەرە جوج) دووسێ جار لەگەڵ عەجەمان شەڕیان کرد عەجەم، کە زانی مەسئەلە وەکو ئەوەلی لێ دێتەوە، عومەرخانی بەلەز نارده ورمێ بەواستەی عومەرخانەوە قاقەزانی لە سەرۆک و گەورە و کاربەدەستان

نووسی، دەستی کرد بە تەشویقات لەلایەکی دیکەوە عەلی خان کوڕی حوسێن خان سەرداری موکریان، کە مودەیەک بوو لەدەست کەوتبوو، هێندێک موڵک و ئەملاکی، کە لە باب و باپیری دەست کەوتبوو فرۆشتبووی لە تەورێزدا لە کەیف و سەفاهەت خەرجی دەکرد.. کە پشتدەری و نورەدینی بۆ سەر سەردەشت جووڵانەوە، (کە ئەحواڵیان لە جێگەیەکی دیکەدا بەحس کرا) عەجەم عەلی خانی کردەوە سەرداری موکریان و هێندێک رووی دایە و گێڕایەوە سابلاغ، قەرەنی ئاغای مامەش و هێندێک لە ئاغایانی خستە ژێر فەرمانەوە، کە لە سەردەشت گەڕاوە بەو قووەتەی عەشایرەوە لە سابلاغدا دایگرت و کردیە ئالەتی هەموو عەشایری موکریان و لاجان و مەنگوڕانی پێوە خڕکرد ناردیانە دەشتی سوندسی و بەربە ورمێ لێخوڕین، سلێمان سەبری قوماندانی حدوودی کەمالییان لەلایەکەوە لەگەڵ عەجەم ڕێککەوت لەپشتەوە سمکۆی خستە تەنگایی بەدزییەوە عەشیرەتی لەسەر دەورکردەوە لەلایەکەوە عومەر خان و لەلایەکەوە عەلی خان سەرداری موکریان و لە پشتەوە سلێمان سەبری سمکۆیان وەتەنگ هێنا ، تا وەختی سمکۆ تەماشای کرد غەیرەز دووسەد کەسی حوسنی و میللی هەڵاتووی تورکانی لەدەست نەماوە، ئەویش لەبەر پەرێشانی و بێ جێگایی، کە لە زوڵمی کەمال پەنایان بۆ سمکۆ هێنابوو، پشتیان بەرنەدا تەواوی شکاک کەوتنە لای عومەرخانەوە.

سلێمان سەبری شەوی جومعە ١٤ی رەبیعی سانی سمکۆی بانگ کردە چادری خۆی، سمکۆ بە سەد نەفەر سوارەوە چوونە کنی، تا سەعات سێی شەو بەخواردن و کەنین رایانبوارد لەپاشان سمکۆ هەڵسا بڕواتەوە چاری سلێمان سەبری گوتی تۆ گیراوی نابێ بچی، سمکۆ بەدزییەوە جوابی نارد با ماڵ بارکەن و بڕۆن، لەوێ دەست بە ماڵ بارکردن کرا، هەر بەو شەوە ماڵ و منداڵ رادەگوێزن سبەی بەیانی لەگەڵ عەسکەر سواری دەکەن، دەفەرموێت بۆ کوێم دەبەن؟ دەڵێت دەبێ بچینە ئەنقەرە کن مستەفا کەمال، دووسێ دەقیقە دەڕۆن، سمکۆ چاو لە نۆکەرانی دادەگرێت لە عەسکەر دوور دەکەونەوە سوارە دێنە بزووتن، سمکۆ رکێف لە ئەسپ دەدات و لە عەسکەر دوور دەکەوێت، سوارەکانی خۆی دەگاتێ، تورک هیچ دەنگ ناکا ، تاکو سمکۆ هێندێک دوور دەکەوێت، قووەتێکی زۆر بۆ تورکان دێت دەکەونە سەر سمکۆ بە قوونە شەڕ و مودافەعە لە حدوودی ئێران تورکاندا دەخشێ لەپشت شنۆ لەشکری موکریانیان دەگاتێ، سمکۆ بانگ دەکا: موکریانینە سمکۆ ئەو مێرە نییە ژنی خۆی بدا بە دوژمن وەدووی چ کەوتوون !! هەر بەو جۆرە دێن تاکو دەگەنە حدوودی رواندز، جەلالەتمەئابی شاهی نووجا رەزاخان پەهلەوی بە تەلەغراف لەگەڵ

ئەمیری غەرب قسە دەکەن، کە سمکۆ هەرچی بفەرمویّت بۆ ئامادەیە، با لە حدوود دەرباز نەبیّ و لە ئیّران بەدلّگیری دەرنەکوزیّت، بەلەز ئەو تەلەغرافە بۆ سمکۆ دەنیّرن، ئەویش ئەمنییەت ناکاو روو بە رواندز دەجوولّیّت، پەنا بۆ جەنابی سەیە تەها دەبا لە ناحییەی سیدەکان دادەنیشیّت، لە رۆژی پیّنجشەممە ٢١ ی رەبیعی دووەمدا عەبدولباقی بەگ حوسنی بە ئیّلچیّتی دەنیّریّتە خزمەت سەید تەها، کە ئەو گەیشتە رواندز سەید تەها چووبوونە هەولیّر، گولّیزار خانم کچی جەوەر ئاغای برای سمکۆ، کە حەرەمی موحتەرەمی جەنابی سەید تەهایە بەتالۆکە لەسەر تەلەفۆن دانیشت خەبەری دا بە سەید تەها.

سەید تەها لەگەلّ دەولّەتی بریتانی موخابەرەی کرد، ئەحوالّی سمکۆی پیّ گوتن، دەولّەتی بریتانی بەواستەی موعتەمیدی خۆیانەوە لە بەغداوە لەگەلّ دەولّەتی ئیّران قسەی کرد، موعتەمیدی بریتانی دووبارە چووبووە خزمەت رەزا شا گفتوگۆ دەکەن، رەزاشا دەفەرمویّت سمکۆ خۆشەویستی منە، جواب و تەلەغرافم بۆ کردبوو، کە لە ئیّران دەرنەکەویّت، ئیّستاش هەرچۆنیّکی ئەو پیّی خۆش بیّت وا دەکەم و هەر جیّگایەکی لیّی دانیشت دەیدەمیّ، دەولّەتی بریتانی بە سەید تەها دەلّیّن چۆنی بەچاک دەزانیّ؟ سەید تەها دەفەرمیّت ئەگەر رەزاخان دەنگ نەکا سمکۆ بگەریّتەوە جیّگای خۆی، بەلاّم ئیّوە ئەمین کا هیچی پیّ نالّیّن.

کە سمکۆ وەتەنی بەردا عومەرخان چووە سەر جیّگای سمکۆ چەند رۆژان دەهۆلّ و زورنایان لیّدا ئەهالی و عەشیرەتانی خستە ژیّر حوکمەوە.

سمکۆ، کە گەیشتە سەر سیدەکان سەید تەها هەموو عەمباری زەخیرەی بۆ بەردا بە گەنم و جۆ و نان و خواردن و پیّویستە کۆمەگی کرد، شەوو رۆژ دەستە دەستە کاروانی سەید تەها بۆ سیدەکان خواردن و چتی لە مالّی سەید تەهاوە بۆ دەکیّشان. سەید تەها رۆژی شەممە یەکی جەمادی ئەوەل لە هەولیّرەوە گەراوە رواندز، دوو سیّ جاری دیکە تەلەغرافی بۆ مەندووبی سامی کرد لە بابەت سمکۆوە.

رۆژی ٣ شەنبە ٣٠ ی جەمادی ئەوەل تەلەغرافیّک لە تەرەف مەندووبی سامی بەغداوە هات، دەولّەتی بریتانی بوو بە زامنی ئیّران، کە لەگەلّ سمکۆ بەچاکە نەبیّ نەبزویّتەوە و بە دلّخواهی سمکۆ رەفتار بکا، سمکۆ هەر جیّگایەکی ئیّرانی پیّ خۆش بیّت بە سەربەستی دەتوانیّ تیّیدا بژی، حکومەتی بریتانی قسەی شەرەفی لە ئیّران وەرگرت و ئەویش بە شەرەفی بریتانی زەمانەتی ئیّران دەکا لە خزمەت سمکۆدا.

سمکۆ قبوولّی نەکرد، ئەحمەد ئاغـای برای لەباتی خۆی ناردە رواندز، کە سەید تەها لەگەڵ دەوڵەتی بریتانی موخابەرە بکا، سەید تەها رۆژی یەکشەممە هەشتی جەمادی یەک چوونە باتاس، موفەتیشی ئیداری بریتانییان دی، ئەحمەد ئاغا رۆژی چوارشەممە لەگەڵ هەشت سواران چوو بۆ باتاس، قەرار وا درا سمکۆ بۆخۆشی بچێتە باتاس لەگەڵ جەنەرالی بریتانی گفتوگۆ بکەن، شێخ عەبدوڵلا چووە کن سمکۆ رۆژی جومعەی سێزدەی جەمادی یەک سمکۆی هەڵگرت لە رێگای دەرگەڵە و ئاکۆیانەوە چوونە شەقڵاوە، چوار رۆژ لە شەقڵاوە مانەوە، لەگەڵ (مارشال)ی بریتانی یەکترییان دیت، رۆژی سێشەممە ٢٤ ی جەمادی یەک سەعات یەک لە شەو گەیشتە رواندز، دوو سەعات لە ماڵی سەید تەها دانیشت نانی خوارد و کەوتەوە رێگا چوونەوە سیدەکان.

ئەهالی سیدەکان بەگزادە و میرانی ئەتراف رواندز و دیانە بە بار و قەتار گەنم و جۆ و برنجیان بۆ دەبرد، هەریەک بە قاسی خۆی بە مەڕ و بە بزن و بە ئەسپ بە پارە کۆمەگییان کرد، لە هەموو لایەکەوە بۆ کۆمەگی رانەوەستان، رۆن، پەنیر، هەنگوین و غەیری ئەوانیشیان، چەند بار کە نایەتە حیساب بۆ برد، بە مێگەڵە مەڕ و کاوڕیان بۆ سەربڕین و گۆشت خواردنی.

ئێران لە ترسی سمکۆ، کە بەر بە ورمێ پڕبییەوە لە هەوەڵی رەبیعی دووەمدا لەشکری موکریان لەژێر ئەمری عەلی ئاغای دیبوکری و کەریم ئاغای کۆسەگریزە بەتەواوی لەشکری شارویرانەوە، بایزە سووری مەنگوڕ بەهەموو مەنگوڕانەوە، کاک عەزیز کوڕی قەرەنی ئاغای مامەش بە چەند سوارێکەوە، هەموو پێکەوە بەر بە ورمێ دەڕۆن، بەگزادە عوزری ئەوە دێنن، کە چەک و جل و فیشەکمان نییە، ئەگەر حکومەت نەماندا‌تێ ناتوانین بچین، ئەویش بە تاران رادەگەیەنن، تا جواب هاتەوە، کار رەنگێکی دیکەی گرت، لە سابڵاغدا حەوت قوللە لەکێوانی دەورەی شار دروست کرا، بە بێگار و شانی میللەتی کورد، بۆ ئەوەش لە هەموو ئاغایانیان دە تومەن وەرگرت، کە دیوارانی قولە دروست بکرێت، ئەو قوللانە هەریەک جێگای تۆپ و چەند نەفەری تێدا دەبێتەوە، یەکێک لەسەر داشا مەجید، دووەم لەسەر قوڵقولاغ، سێیەم لەسەر خەزایی، چوارەم لەسەر چاکی مەحموودکان، پێنجەم لەسەر رێگای پردی سۆرشەم لەسەر عەلی زەمانییان، حەوتەم لە کنی مام قەمبەران، هەموو داوێنی کێوانی رووبەشاری کردە خەرەند و سەنگەری تێدا بەست، لە کێوە چکۆڵەوە تا زاوا بووکانی هەموو دەری لە گراوانەوە تا پشت تەپە، هەموو قووڵ کردن و کردوونیە مەتریز، بۆ بەرابەری سمکۆ، قازاقخانەیەکی زۆر گەورەی لەبەری عەلی ئاباد

دا دروست کرد و هەموو ئەترافی مەحکەم کرد، زۆری ترس بوو، کە سمکۆ ئەو جێگایانە بگرێتەوە، بەڵام درۆ و هەڵخەڵەتاندنی هێندێک جاسووسان وەکو ئیحسان نوری و چەند کەسێکی دوژمنی میللەت و وەتەن سمکۆیان تووشی ئەو ئەزیەتەکرد و میللەتی مەزلومیان پێوە ماڵوێران کرد، هەروەکو لەنێو کوردستانی شیمالیدا بوون بە ئاوری فیتنە، خوێنی میللەتی بێکەسیان بەبێگوناهی دا بە رژاندن و لەنێو کوردی تێگەیشتووە بەغدا و موسڵ و سلێمانی و کەرکووک و هەولێردا تۆی نیفاق و بوغز و بەدئەخلاقی لەیەک دوان و فەسادی نێوانیان چاند و گەلێک کاردار و وریا و ئازایان لە دڵخوازیان بێ بەش کردن بەناوی میللەت خواهی و وەتەنپەروەرییەوە کیسەیان لە پارەی نەزانان و بێمێشکان پڕکرد، لەژێرەوە بە کوڵنگی شەیتانی بناغەی میللەت خواهی و وەتەنپەروەرییان دەڕووخاند.. کە پڕ چاوان بە هاوی ئومەتییان خۆ نیشان دەدا و وشک مەغزانی تێنەگەیشتووانی، کە خۆیان بە زاناترین کوردان دەزانی بە بوون بە ئالەتیان لەگەڵیان میللەتیان دەخنکاندن، دیسان تییان نەدەگەیشتن، کە چەند قەومێکی فەساد و بێ حەمییەت و شەیتانن، ئەو زاتە خەبیسانە لە مودەیەکی کەمدا ماڵ و لانەی هەزاران وەکو سمکۆیان وێران کرد و خانەدانزادە... گەورە ماڵی چەندان وایان دەست بە ئاژن دانان، دیسان میللەتی نەزان پێیان نەزانی و لە فڕوفێڵیان ئاگادار نەبوون.

هەر بەو جۆرە سمکۆ هەرچەند پیاوێکی موتەهەویر و ئازا و غەیور و پاڵەوان و دلێر و زەبردەست و قەهرەمان و جەنگاوەر و وریاش لەبەر ئیغفالی ئەو جۆرە کەسانە دەتواندرێت پێی بڵێم؟ لە هەموو بزووتنیدا خەتایەکی ئەوەندە گەورەی هەیە، کە تاریخی کوردان هەرگیز چاوی لێ نەقووچێنێت و گوناهی خۆی بە روویدا بداتەوە، بۆ خاتری جارێکی دیکە هیچ گەورە و کاربەدەستێکی کوردان دووچاری ئەو گوناهە نەبن، تاکو میللەتی مەزلووم لەژێر پێ و چنگی گوناهیاندا نەپلیخێتەوە و نەبێتە قوربانی نەزانین و تێنەگەیشتنی ئەوان، ئەو جۆرە بزووتنە بۆ چەند تومان و قران و لیرە نییە، کە بڵێت دەیکەم، یا چەند لیرە کار و چەند قران دەبینم، ئەوە مەیدانی گیانبازی و وەتەن و میللەتە، ئەگەر کەمێک لە تەدبیردا، کە چ رووی قەومێک مەحوو دەبێ، ئەگەر سەرکەوت میللەتێک دەژیەتەوە، بۆ کەسێکی هەوای گەورەیی لەسەردا بێت، ئەم چەند چتی دەبێژم پێی دەوێت یەکێک لەپێش هەموو چتێکدا مەنافعی عموومی نیشان دەین و ئاسوودەگی عمووم و لە هەر دڵگیرێک پارازتن (دووەم) عەدالەت و رەعییەتپەروەری بە داد و فریادی هەموو مەزلوومێک راگەیشتن و لە هەموو زوڵمێک رزگارکردن و هەموو زاڵمێک

لە زوڵم دەستی کوتاکردن. (سێیەم) دەبێ ئاگادار و وریا بێ و تێگەیشتوو لە دەسایس و بزووتن و جووڵانەوەی خۆی تاکو زوو پێڕابگا و بۆ چارەی بکۆشێت، ئەگەر چتێکی موخالیف ماوەیەک و دوو رووبدا. (چوارەم) دەبێ قەدری هەرکەسێک بە میقداری کە ئەو پیاوە شایستەیە بیگرێت و بە گوێرەی ئەو تەکلیفی لێ بکا و دەرەجەی بداتێ تا ئینتیزامی موڵکی لێ نەکەوێتە شۆڕشەوە، چونکو تەواوی ئینقیرازات و.. دەسایس و شۆڕش لەوە دەردەکەوێن و ئەوە سەبەبی هەموو فیتنەیەکی، کە رووبدا. (پێنجەم) دەبێ دایرەی ئیستیخباراتی جاسووسانیە زۆر چاک لەژێر دەستی پیاوانی بزانن و لە گەڕاندا بێ، تاکو هیچ کاروبارێکی ژێردەستی لێ گوم نەبێت و لە هەموو چتێک ئاگاداری بدەنێ. (شەشەم) لە بیستی مانگی زیلحەجەی ساڵی ١٣٤٥ دا بەحری بەگی ئامۆزای سمکۆ لەبەر چەند لێدانێکی، کە لە سمکۆی خواردبوو وەفاتی کرد لە نێزیک کێلەشین ناژتییان، ماڵ و منداڵی بە هەتیوی لەسەر سمکۆ ماوە. سمکۆ لە سیدەکان گەلێک دەستەنگی کێشا، لەپاش چەندێک لە مانەوە ئەهالی گەلێکیان کۆمەگی کرد، بەڵان بەشی نەدەکردن، چونکو زۆر بوون، میللەتیش لە کۆمەگیکردندا لەدەست کەوتن، نەیانتوانی زیاتر خزمەت بکەن، ئەوجا پیاوانی سمکۆ بەناچاری دەستدرێژییان دەست پێ کرد، لەهەموو لایەکەوە تاڵان و راووڕووتیان دەست پێ کرد، ئەهالی سیدەکان بە کۆمەڵە و یەک و.. چوونە خزمەت سەید تەها، کە بەهەر جۆرێک بێ یا ئێمە هیجرەت پێ بدەن و یان سمکۆ قبووڵ ناکەین لەنێو ئێمەدا بمێنێت.

سمکۆ ئەوەندەی دەستەنگی کێشا، کە بە دوو رۆژ جارێک نانیان بەتەواوی دەست نەدەکەوت. لە پازدەی رەبیعی یەکی ساڵی ١٣٤٦ دا سمکۆ لەخۆی بێزار بوو، هەموو ژن و منداڵانی گرد کردەوە، کە هەمووان بکوژێت و خۆی لە رەزالەت و برسێتی و تەنگانەیی رزگارکا، ژن و منداڵ هەموو سەری خۆیان لە قوڕنا بە شین و گریانەوە کەوتنە ژێر پێیانی و پێیان گوت، کە ئێمە لەگەڵت سواڵ بێ شوانی بێ دەکەین هەر ئەوەندە مەمانکوژە، خودا قبووڵ ناکا، دەچین خزمەت و شوانی دەکەین، بە هەزار پاڕانەوە خۆیان رزگارکرد و دەستیان کرد بە دڵخۆشیدانەوەی سمکۆ، تاکو کەمێک هێنایانەوە سەرەخۆ.

## چوینی سمکۆ لە ناحیەی سیدەکان بۆ شەمدینان

رۆژی شەممە یازدەی مایسی ١٩٢٨ بیست و دووەمی زی ئەلقەعدە ١٣٤٦ ئەحمەد بەگ گەردی، کە لە بیست و چواری رەمەزانی ساڵی هەزار و سێسەد و چل و پێنجدا لە رواندزەوە هەڵات چووە حدودی شەمدینان لەوێ تورک کردیانە مودیر ناحیە، ئەو ئەحمەد بەگە کەوتە نێوانی تورک و سمکۆ و هەتا رێکی خستن، لەپاشان ئەحمەد بەگ حەمەدەمین بەگ و میران بەگی گەردی لەگەڵ خۆی هەڵگرت و چەند سوارێکی گەردی لەگە چوو، لەولاشەوە ئەسعەد بەگ هارونە و فەتاح بەگ و رەشید بەگ چنارەی گەورەی عەشیرەتی برادۆست و چەند کەسێکی دیکەشی لەگەڵ چوو رۆیشتنە گوندی زۆراوا ، کە سمکۆ ئاوەدانی کردبۆوە، شێخ ئەحمەدی بارزانی پازدە ئەسپی بۆ ناردبوو، کە ماڵی پێ باربکا، سمکۆ لەولاشەوە پیاوانی خۆشی نارد لە گوندی باڵەکیان حەوت ئەسپ و ماینی چاکیان لە رەوەبەری و بردیان بۆ زۆراوا بەوەش بارنەکران ناردی لە برادۆست و گەردیانیشیان ئەسپ و بارگیرێکی زۆریان بۆ نارد و بە جارێک ماڵ و منداڵانی بارکرد، رۆژی پێشەممە شازدەی مایس لە گوندی ئارمووشە، کە لە ناحیەی برادۆستدا بە سەعات و نیوێک دوور لە تخووبی تورکان دابەزی، ماڵ و منداڵانی لەوێ دانابوو خۆشی لەگەڵ دەستوپێوەندی و بەگزادەکانی بێژراو روو بە خاکی شەمدینان چوونە نێو تورکانەوە، لەولاشەوە تورکەکان زابتێکی عەسکەری و پەنجا نەفەر عەسکەریان ناردنە سەر ئاوی حدودی نێوانی تورکیە و عیراق، بەشادی و کەیفەوەیان پێشوازی کرد، سمکۆ، کە لە حدود دەرباز دەبێ ژنێکی خۆی، کە لە زستاندا پەنای بردبووە کن شێخ عەبدوڵڵای پیاوی سەید تەها و لەوەختی چوونیدا ناردبوویان بردبوویانەوە دەیگرێت گوللەیەکی لەسەر سنگی دەدا و هەر بەو جۆرە لەسەر رێگا بەجێی دێڵێت.

سمکۆ، کە پەڕییەوە بەری شەمدینان تورکەکان بە ئیحتیرامەوە پێشوازییان کردن و دەستی حورمەت و عیزەتییان لێ نان، بردیانە مەحاڵی بازارجک لە گوندی (سیرۆ) لە حدودی ئێراندا دایانمەزراند، بەرەبەرە ئەهالی لەسەر کۆبوونەوە، شکاکی ورمێ و دەوروپشتی بەماڵەوە چوونە کنی، حکومەتی ئێران ترسی لێ پەیدابوو، شەش هەزار کەسی ناردە ورمێ، کە نەبادا شۆرش پەیداکرێ، عەبدوڵڵا بەگ شێخ جانگیر و چەند رەئیس عەشرەتێکی دیکەی ئەترافیان بەماڵەوە نەفی کردنە شووشەوانی.

عەبدوڵڵا بەگ لە شووشەوان ماوە هەتا ئەوەلی مانگی رەمەزانی ١٣٤٧ مەسەلەی مەلا

خەلیلی گەورەمەری مەنگوڕ لەسەر پۆشینی کڵاو و بەرگی پەهلەوی رووی دا، مەحاڵی موکریان و مەنگوڕو گەورگ لەدەست عەجەم دەرکەوت، عەبدوڵڵا بەگ عایلە و ماڵ و منداڵی هەڵگرت لە شووشەوانەوە چووە نێو مەنگوڕانەوە، مودەتێک لەگەڵ مەلا خەلیل رێککەوت لەدوای شکاوی مەلا خەلیل، عەبدوڵڵا بەگ روو بە رواندز ماڵ و منداڵی رزگارکرد چووە ناحیەی سیدەکان بۆخۆشی لە مانگی سەفەر ١٣٤٨ دا هاتە رواندز دەخالەتی بەحکومەت کرد چووە سیدەکان لە خاکورک دامەزرا.

## گەڕانەوەی سمکۆ بۆ کوردستانی عیراق

سمکۆ لەنێو کوردستانی تورکیادا بوو لە خراپەکردنی ئێران رانەدەوەستا، هەمیشە تەریدەی دەنارده نێو کوردەکانی شکاک و هەرکی تالانیان دێنا و ئەسبابیان دەبرد، دەوروپشتی ورمێ و شنۆ لە تەنگاویدابوون، حکومەتی ئێران چەند جارێک لە تورکەکانی گێڕاوە، کە سمکۆ زۆر بزۆزی دەکا، لەدوای گەلێک موخابەرە والی جۆلەمێرگ ناردیە لای سمکۆ دەبێ لە سنوور ئێران دوورکەوێتەوە. سمکۆ گوتی کە ئەمن پیاوێکی گەورە و بەدەست و پێوەند و خاوەند نۆکەرم ناتوانم بەدەست والی بچمە شاری وان، ئەگەر سەد ئەسپ و سەد تفەنگ و دە بار فیشەنگ و بیست هەزار لیرە پارەم دەدەنێ دەچمە وانی. حکومەتی تورک ئەو داوخوازەیان بۆ بەجێ هێنا و دایانێ. سمکۆ لەنەچوون بەهانەی گرت. حکومەتی تورک پێیان گوت مادامە وابێ لە خاکی ئێمە دەرکەوە. سمکۆ لەگەڵ حکومەتی ئێران موخابەرەی کرد، لە نەتیجەی موخابەرەیاندا هەردوولا بەمە پێکهاتن، کە حکومەتی عەجەم چەند ساحێب مەنسیب و پیاوە گەورەکانی کورد بنێرنە سنوور و سمکۆ بچێتە نێویان بۆچوونە ئێران گفتوگۆ بکەن، لەسەر ئەوە سمکۆ تەرتیباتێکی کرد و چوو لەولاشەوە عەجەم... ناردنیە لای سمکۆ، هەردوولا پێکەوە دانیشتن، سمکۆ هەمووانی کوشت.

سمکۆ رۆژی شەممە چواری ئاغستوسی ١٩٢٩ روو بە بارزان لە تورکیا جوێ بۆوە. جوابی لە شێخی بارزان نارد، کە دەخالەت بە حکومەتی فەخیمەی بەریتان دەکەم، شێخی بارزان یەک لە نۆکەرانی خۆی، کە ناوی شەریف بوو بە بیست تفەنگدارەوە ناردیە لای سمکۆ پێی گوت ئەمن بەهەموو جۆرێک کۆمەگی دەکەم، بەڵام هەتا لەگەڵ حکومەتی بریتان گفتوگۆ دەکرێ با لە خارجی بارزان لە گوندی سیرۆزەردان، کە سەعاتێک لە شیمالی کانیەڕەشە و نزیک بە حدوودی تورکانە دانیشێت. سمکۆ بە ئەمری شێخ چووە

سیرۆ دانیشت، شێخ بە دانەوێڵە و پووڵ و ڕۆن و برنج ناردن کۆمەگی کرد.

سمکۆ لە چاری ئاغستوسدا قاقەزێکی بۆ قایمقامی ڕواندز - کەریم بەگ نویسی، کە دەخالەتی بە حکومەتی فەخیمەی بریتان کرد، دەبێ دەخالەتی قبووڵ کەن، لەبەر ئەوە حکومەت کەوتە ئەندێشەوە، هەموو ڕۆژێ تەیارە دەستی بەگەڕان کرد، موفەتیشی ئیداری و زابت تەفتیشی پۆلیس کاپتان لە قەندیل و مودیری پۆلیس - عەلی سەروەت بەگ بە مەفرەزەیەک پۆلیسەوە بۆ لای کانیەڕەش چوون. دائیرەی ئیستیخباراتی بریتان لە هەولێرەوە نەقڵ بوو لە ڕواندز لەنێو مەکتەبدا دانیشتن، بەهەموو لایەکدا پیاویان بۆ پشکنینی ئەحوال دەنارد، کە نەبادا سمکۆ خراپی بکا و یا بە دەسیسە هاتبێ ڕەئیسی ئیستیخبارات - کاپتان هەریسن لە مەکتەبدا تەلەفۆنی دانا و پیاوی دەچوونە گەڕان.

حکومەتی بریتانی کەوتە تەقەلاوە لە هەموو لایەکەوە پیاوانی پەنهانیان دەناردە پشکنینی ئەحواڵی لەوەدا، چونکو پیاوێکی زانا نەکەوتە نێوانی جاسووسەکان بۆ ئافەرین وەرگرتنێک ڕاپۆرتی چاکیان لە هاتنی سمکۆ نەدەدا. فەرماندەی ئێران لە شنۆوە بە بابەت گرتنی سمکۆ موراجەعەی قوماندانی بریتانی، کە بۆ کوێستان چووبوونە مێرگەمیر؟ کردی جوابیان نەدراوە، لەدواییدا قوماندانی بریتانی بەمە جوابی داوە، کە لەگە من حەقی موخابەرەیان نییە، با موراجەعەی بەغدا بکەن.

سمکۆ لەوە ئاگاداربوو، کە حکومەتی بریتانییان بەواژی فکر تێگەیاندووە، قاقەزێکی لە موعاونی پۆلیسی ڕواندز - حەمزە بەگ نویسی، کە من دەخالەتم بە دەوڵەتی بریتانی گەورە کردووە، ئەگەر حەمزە بەگ بچێتە لای لەگەڵ ئەو هەڵدەستێ بچێتە ڕواندز و حکومەت لەهەرلایەک دایمەزرێنێ، کەچی حەمزە بەگ بۆ چوینی جوابی نەداوە.

لە تەرەف عیراقەوە قووەیەکی زۆر کۆکراوە بە مەناتقی بڵاودا دایانمەزراندن، موفەتیشی ئیداری لیوای هەولێر (میستەر لوید) لەگەڵ زابتی تەفتیش (کاپتان لەتەندیل) بەگەڕان چوونە کانیەڕەش و سیدەکان و گەڕانەوە، جاری دووەم دیسان موفەتیشی ئیداری و زابت تەفتیش و زابتی ئیستیخبارات (هەریسن) چوونە شێتنە و کانیەڕەش و گەڕانەوە.

لە سێی ئەیلولدا بەدزییەوە بە سمکۆ ڕاگەیشت سپاهی عیراق دەچێتە سەری لەشکری ئاسووری تابع میر شیمۆن، کە سمکۆ کوشتی، خۆیان کۆکردۆتەوە بچن بیگرن، سمکۆ بەشەو خۆی کۆکردەوە بەزۆر ئۆغز بەگ میری گەردی لەگەڵ خۆی هەڵگرت، هەتا سنووری قەزای ڕواندز دەربازبوو، هەتا چووە گوندی (ڕەزێ) کە لەسەر حەددا خاکی تورکە لەنێو

عەشیرەتی گەردییاندا . شێخ ئەحمەدی بارزانی دانەوێڵە و زەخیرەی زۆری بۆ سمکۆ نارد لە هەموو چتێک کۆمەکی کرد و چەند پیاوێکی خۆی ناردە پاسەوانی و پارازتنی.

کە سمکۆ چووە حدودی خاکی تورکان حکومەتی بریتان بە تورکی راگەیاند، کە سمکۆ لە خاکی عیراق دەرچوو، لەولاوە تورک قووەیەکی قورسی لە عەسکەری شەرکەری لەژێر قوماندەی رەشید بەگ تورکدا ناردە سەر سمکۆ، کە دەردەستی بکەن. شەوی پێنشەممە ۳۰ ئەیلول سمکۆ زانی، کە تورک هات، سمکۆ بەبێ ئەزیەت لە رەزێ باری کرد چووە گوندی (زێتێ) کە لە گوندانی عەشیرەتی گەردییە، ئێستە لەسەر مەحاڵی (مزووری)یە. لەشکری تورک لە حدودی خۆیدا تەعقیبی کرد و عیراقیش لە تەعقیبکردن پاش نەکەوت. لە موسڵەوە حکومەت لە شێخ ئەحمەد بارزانیان نویسی، کە سمکۆ بگرن و تەسلیمی کەن، شێخی بارزان گوتی کە لەلای من نییە، حکومەت دەتوانێ بیگرێت.

لە ۱۹ ی ئەیلولدا قایمقامی رواندز ـ کەریم بەگ کوردی رواندز لەگەڵ محەمەد عەلی ئاغا رەئیسی بەلەدییە و چەند سوارێک بۆ پشکنینی ئەحواڵی سمکۆ لە رواندزەوە چوونە شێتنە و کانیەرەش، هێندێک تەشویقاتی ئەهالی و تەرغیبیان کردن، کە بەقسەی سمکۆ نەخەڵەتێن.

حکومەتی ئێران کردییە سەر عیراق، کە بۆ دەردەستکردنی سمکۆ بکۆشن لەبەر ئەوە حکومەتی عیراق نمایشی کرد.

شێخ ئەحمەدی بارزان بەهەموو جۆرێک یاریدەی سمکۆی کرد، دەغڵ و دان و پێویستی بۆ دەنارد، چەند جاران سمکۆ خواستی لەگەڵ شێخ ئەحمەد یەکتر ببینن، شێخ نەیەویست گوتی: نایەوێت یەکتر ببینین.

موتەسەریفی موسڵ لە شێخ ئەحمەدی گێڕاوە، کە سمکۆ بگرێت و لەدەست حکومەتی نێت. شێخ گوتی: سمکۆ لای من نییە، حکومەت دەتوانێ لێی بسوورێتەوە و وەدەستی بێنێ.

لەسەری تشرینی دووەمدا لەجنەی حدودی تورکەکان چوونە موسڵێ لەگەڵ عیراق کەوتنە راو تەدبیری گرتنی سمکۆ . رۆژی ٤ شەممە ۱۳ی تشرینی یەک موعاون پۆلیسی رواندز ناردرا کانیەرەش، کە لەگەڵ قوماندانی بەیوکێ (هەورامار) یەکتر ببینن و بۆ گرتنی سمکۆ بنچینەیەک دامەزرێنن.

بەدبەختی میللەتی کورد لێرەدا دێتە بەرچاوان : موعاونی پۆلیس ـ حەمزە بەگ کوڕی

مستەفا بەگ رەئیسی عەشیرەتی ( دەلۆ ) لە کوردی ئەترافی خانەقین . قوماندانی تورکان ـ رەشید بەگ کوردی سلێمانی. یەکێک مەئموری عیراق و دووەم مەئموری تورکان بۆ دوو دوژمنی کوردان دوو پیاوی گەورەی کورد لە حدوددا یەکتر دەبینن بۆچی؟ بۆ گرتنی سمکۆ، کە گەورە و بەناوبانگ پشتیوانێکی کوردە. ئەو دوو کوردە لەسەر کیسەی دوو دوژمن داو و تەڵەیەک دادەنێنەوە، کە گەورەیەکی کورد بگرن و تەسلیم بە دوژمنی بکەن، لە میللەتی کورددا نەبێ لە چ میللەتی دیکەدا ئەو جەسارەتە کراوە!!!

بەڵام لە نەتیجەدا بۆ گرتنی موەفەق نەبوون، هەردوولا حدودی خۆیان قایم کرد و پیاوانی سپاهی پۆلیسیان تێدا دانان و گەڕانەوە جێگایانی خۆیان.

شێخ ئەحمەدی بارزان ئەمری دا بەهەموو ئەهالی و رەعییەتی لە هەر گوندێک سی روپیە پارە و دووبارە دەغڵ بەکۆمەگی کۆبکەنەوە ئەو هەموو دەغڵ و پارە کۆکرانەوە تەقدیم بە سمکۆ کران.

سمکۆ لە بیستی تشرینی دووەمی ئەم ساڵەدا دوو جاران پیاوانی ناردە نێو تورکان سەد ئەسپی سواریان بەتاڵان هێنا ، چەند ئەسپێکیان بەرەعییەتی شێخی بارزان فرۆت، شێخ ئەحمەد پێ یزانییەوە ئەمری دا بە رەعییەتی دێوانە ، کە پارەکی داوتاننێ بۆ ئێوە بێ، ئەسپەکانیان بدەنەوە، جارێکی دیکە کەس ئەسپیان لێ نەکڕن و نەهێڵن لەنێو دێواناندا وڵاغی تاڵان بفرۆشن. مەقسەدی شێخ ئەحمەد دەسایسی حکومەتی نەکەوێتە ناو، تووشی بەهانە پێگرتن نەبێ، چونکو لە هەموو حکومەتەکانی ئاشکرا کردبوو، کە سمکۆ لە خاکی بارزانییاندا نییە و لەگەڵ شێخ ئەحمەد بێ عیلاقەیە.

لە بیست و پێنجی تشرینی دوودا شێخ ئەحمەد ئەمری دا، کە سمکۆ سوار و لەشکرەکەی بەسەر گوندەکانی دێواناندا بڵاوکاتەوە، با ئەزیەت نەکێشن بەخۆشی ئەو زستانە رابوێرن سمکۆ قبووڵی نەکرد، شێخ ئەحمەد ئەمری بە رەعییەت دا، کە لە نزیک قەڵای (کەلکە) چەند خانوویەکی بۆ دروست کەن، با هەموو لە جێگایەکا بەئاسودەگی دامەزرێن، دێوانە لەهەموو لایەکەوە بەکۆمەڵە دەستوبردی خانوو دروستکردنیان کرد، هێندێک لە پیاوەکانی سمکۆ بەقسەی ناشایستە لەگەڵ دێوانەکان دوابوون و خراپەی شێخ ئەحمەدیان باس کردبوو، ئەو قسانە بە شێخ ئەحمەد گەیشتەوە کەمێک دڵگیربوو، ئەمری دا دەست لە دامەزراندنی ئەو خانووانە هەڵگرن. ئەمری دا لە گوندێکی بەناوی (قەڵای بێروخ) دەناسرێ جێگایان بۆ رێکخستن و دایانمەزراندن. لەسەرو بنی ئەو مانگەدا

دەستە پیاوێکی ناردەوە نێو تورکان، کە تالآن بگرن .

شێخ ئەحمەد لەپاش دانەوێڵە و ئەرزاقدانی پیاوەکانی لە گوندانی بێروخ. سیا. سەروکانی لەنێو عەشیرەتی بەرۆژ دامەزراندن لە چیایەکدا، کە جگە لە ڕێگایەک کەسێک ناتوانێ بچێتێ لەوێدا سمکۆ خۆی قایم کرد.

# پیشەکی

ئەم بابەتەی خوارەوە چەند لایەنێکی مێژوویی و ئابووری و کارگێڕی و رۆشنبیریی شاری سلێمانی دەخاتەڕوو کە لە ساڵی 1934دا مامۆستای نەمر حوسێن حوزنی موکریانی بەدەستنووسی خۆی لەنێو پەڕاوێکی تایبەتیدا تۆماری کردووە و ناوی لێناوە: «مێژووی شاری سلێمانی، وەیان چوار مانگ لە سلێمانی مانەوەم، لە رۆژی دووشەممەوە هەتا رۆژی پێنج شەممە؛ یاخود لە ٢٣ی تەمموزەوە هەتا یازدەی تشرینی دووەم ١٩٣٤»

منیش لەبەر گرنگی بابەتەکە وام بەباش زانی کە سەرلەنوێ ئامادەی بکەم بۆ چاپ و شێوەی نووسینی هەروەکو خۆی بپارێزم؛ ئەگەرچی وادیارە ئەو دەستنووسەی هەروەکو زانیارییەک و کەرەستەیەک بۆ خۆی نووسیوە، نەک بۆ بڵاوکردنەوە بەو نیازەی پاک نووسی بکات. لەگەڵ ئەوەشدا بەهیچ جۆر دەستکاری، نەک رستەکانی بەڵکو، هیچ وشەیەکیشم تێدا نەکرد؛ تەنیا بەڕێنووسی ئەمرۆم نووسییەوە و بابەتەکانیم بەرێکوپێکی رێکخست. بەو هیوایەی کەلێنێک لە شارستانێتی شاری سلێمانی ٥٤ساڵ لەمەوبەر پڕبکاتەوە. ئەوەی شایانی باسە هەر لەم پەڕاوەدا چەند بابەتێک هەن کە هەر ناونیشانەکانی نووسیون و چەند پەڕێکی بۆ تەرخان کردوون، کەچی هەروا بەسپێتی بەجێی هێشتوون؛ لەوانە «سلێمانی و مەوقعی جوگرافی» ، «مێژووی سلێمانی و مایەی بیناکردنی» ، «قاقەزەکانی حاجی توفیق بەگ بۆ من» ، «رۆژنامەی ژیان»

ئەوەی شایەنی باسە مامۆستا حوزنی لەم ماوەیەدا بۆیە رووی لە شاری سلێمانی کردووە، لەسەر خواستی مامۆستا پیرەمێرد بووە؛ چونکە چاپخانەکەی لە کار وەستاوە و نەیتوانیوە چاکی بکاتەوە، مامۆستا حوزنیش رەواندوز جێ دەهێڵێت فریای مامۆستا پیرەمێرد دەکەویت و چاپخانە پەککەوتۆکەی بۆ چاک دەکاتەوە و هاوکاریشی لەگەڵ دەکات بۆ دەرهێنانی رۆژنامەی ژیان، نەک هەر بەکارکردن، بەڵکو بەبڵاوکردنەوەی بابەتی مێژوویی و کۆمەڵایەتی و ئابووری. لە پاڵ ئەوەش خزمەتێکی گەورەی شاری سلێمانی دەکات ئەویش بەتۆمارکردنی ئەو بابەتەی بەردەستتان؛ کەچی بەرامبەر ئەم هەموو ئەرکەش مامۆستا پیرەمێرد دڵی مامۆستا حوزنی دەرەنجێنێت و بەدڵشکاوی بەرەو رەواندوز دەگەڕێتەوە کە لە نێو یادداشتەکانی مامۆستا حوزنی لە داهاتوودا ئەم هەلوێستەی مامۆستا پیرەمێرد بڵاودەکەمەوە.

د. کوردستانی موکریانی

## تەشكيلات

هەتا سالّی ١٩٢٤ تەشكيلاتی سلێمانی زۆر كەم بوو. بەهيمەت و كۆششی نەوابە حكومەت پەرستەكانەوە شاری سلێمانی رووی لە چاك و چۆن كرد.

دائيرەی تاپۆ، دائيرەی عەدلييە، كە مەحكەمەی سولّحی لێ دامەزراندران، موديريەتی ئەوقاف و مەئمورێتی نفووس لەو ليوايەدا تەشكيل كرا. قەرەداغ و بازيان لەبەر هێندێك چت خرابووە سەر ليوای كەركووك، گەڕاندراوە سەر ليوای سلێمانی.

## بەلەديەی سلێمانی

بەلەدييە لە مەيدانێكدا هەڵكەوتووە كە شيمالی قشلەی عەسكەرييە و شيمالی غەربی ئوتێلی فەرەحە و غەربی حەمامی نەقيبە. بينايەكی دوو نهۆمييە. ڕوو بەقيبلە و بەشيمالی هەيوانەو لەم هەيوانەوە بۆ ئەو هەيوان سالۆنێكی پان و خۆشە. لە هەيوانی قيبلەوە لەم سەرەو ئەو سەرييەوە دوو باڵەخانەی بچووكی زۆر جوان و دڵگوشادە. لە يەكێكيان موهەندسی بەلەديە و مەئموری كارەبايە و لە هی دووەميانا مەئموری سحەو مونەزيفات دادەنيشن و لەم بەرەوبەری سالۆنەكەدا شەش ژووری گەورە هەيە. لای ڕۆژهەڵاتيەوە يەكەمينی ژووری حرووفاتەو دائيرەی مەتبەعەيە و هی دووەم دائيرەی ئەوقافە و هی سێيەم عەمباری پێويستی ئەلەكتريكە و لەلای ڕۆژئاوايەوە سەرەتای ژووری مەئموری ئيستيهلاكە و دووەم هی رەئيسی بەلەديە و سێيەم باش كاتبی بەلەديە و سندووق ئەمين و كتێبەكانی بەلەديەی تێدايە. ژووری هەيوانی تەمامی ئەسپاپی بەلەديەی تێدايە. رەئيسی بەلەديە يەكتا بەگ، پياوێكی زۆر هێمن و لەسەرخۆ و خاوێن و بێ دەعيەيە. بەلەديە موهەنديس و سندوق ئەمين و باش كاتب و مەئمور و عەمەلەی هەيە. زۆر چاك لەگەڵ تەنزيفات خەريكن. ئێواران و سبەينان، لە هاوينا ئاوپرژێنی جادەكان دەكەن و سبەينان زبڵ لە مالآن وەردەگرن و فرێی دەدەن.

## بيمارخانە - تيمارخانە - خەستەخانە (مستشفى)

لە مەركەزی سلێمانی خەستەخانەيەك هەيە زۆر گەورەيە لە بەرامبەر سەرا لە تەنيشت مەدرەسەی ئيبتيدايی -كە لەوەپێش متەوەسيتە بوو- چەند ژوورێكی گەورەی بۆ نووسينی[1] نەخۆش و چەند ژوور بۆ دەرمانكردن و چەند ژوورێك بۆ مەئمووڕانی ئەو بيمارخانەيە لە دەوری عوسمانيدا بيناكراوە.

---

(١) دەبێ «نووستن» بێ .ف.

ئەمساڵ لەسەر تەرزی ئەوروپا بەدەستورێکی زۆر جووان لە گەڕەکی مەڵکەندی -کە شیمالی شاری سلێمانییە- بیمارخانەیەکی زۆر گەورەی بەتەرتیب. کە چوار حەمام و ئاودەستخانەی تایبەتی و ئەم بەرو ئەوبەر ژووری نەخۆش و لە قیبلەوە کۆشکێکی بەرز، کە دەرگای ژووری مەئموران و دکتۆران لەو کۆشکەدا دروستکراوە. لە شیمالی ئەو بینایەوە سێ بینای بچووک، یەک بۆ مردوو شۆری، دووەم بۆ جەنازەتی و سێیەم بۆ پاسەوانی ئەوانە دروستکراوە.

ئەو خەستەخانەیە بەچیمەنتۆ و شێلمانی ئاسن دروستکراوە. نزیکەی دوو - سێ پلە لە زەوی بەرزە.

هەر کەس بۆ دەرمانکردن و تیمارکردنی برین بچێتە ئەو بینایەوە، لە پێشا لە دەرگای ئەو کۆشکەوە -کە روو بەقیبلەیە - دەچێتە ژوور. لە کۆشکەکە چاوەنۆڕی دەکات، هەتا دوکتۆر بۆ تەماشاکردن دەیباتە ژووری.

## تەلەگراف و تەلیفون

لەمەوپێش هەر هەبوو، بەڵام لە دوایینی بەموناسەبەتی شەڕوشۆڕ و ئاوی بارانی سلێمانی تێکچوو. تێل لە نێوان کەرکووک و سلێمانیدا نەمابوو. بەڵام لەو شۆڕشەدا بەتێلی بێ تێل لە نیوانی سلێمانی و کەرکووکدا قسەدەکرا.

لە ساڵی ١٩٢٦دا دەست بەدامەزرانی تیلەگراف و تەلیفون کرا. خەتێکی باش پەیدابوو رێک خرا و ئێستە زۆر جوان لەگەڵ هەموو گۆشەیەکی عیراقدا کار دەکات.

لە ساڵی ١٩٢٨دا خەتێکی تێل لە سلێمانیوە بۆ هەڵەبجە و پێنجوین و بۆ چوارتا راکێشرا. خەتێکی تێل نێوان سلێمانی و کەرکووک نزیکەی چل هەزار روپیە مەسروفی لێکراوە.

پوستەخانە تێکچوو بوو. ساڵی ١٩٢٥ نەختێک رێکخرایەوە بەدەستوورێکی زۆر شپرزەیی هەتا ١٩٢٩ هاتوچوونی پۆستە دەکرا و لە پاش ١٩٤٧دا رووی لە چاکی کرد و ئەمنیەت پەیداکراوە و ئەوەڵ جار هەفتەی جارێک لە پاشان هەفتەی دووجار داندرا ئێستا هەموو رۆژێک سبەینە پۆستە دەروات و نیوەڕۆ بۆی دێت. لە ساڵی ١٩٢٨دا بوو لە هەڵەبجە و پێنجوین و چوارتاش دامەزرا.

## مەدرەسەی رەسمی

لە نێو شاری سلێمانیدا مەدرەسەی متەوەسیتە و چەند مەدرەسەی دیکەش هەیە. بەڵام بیست و هەشت مەدرەسە لە هەموو لیواکەدا هەیە. سێیانیان مەدرەسەی کچانن و یەک مەدرەسەی متەوەسیتە و بیست و سێ مەدرەسە ئیبتیدایییان پێ دەڵێن.

ئەم ساڵ لە مانگی ئەیلوولدا ناوی مەدرەسەکانی سلێمانییان گۆڕی بەناوی گەورەکانی عەرەبەوەیان ناونان.

ئەم ساڵ لە تەنیشت خەستەخانە تازەکەدا مەکتەبی متەوەسیتە لەسەر تەرزێکی زۆرجوان بەچیمەنتۆ و شێلمان دروستکراوە و لە مانگی تشرینی یەکەمدا بۆ یەکەم جار لە ڕۆژی جومعە ٢٩ی ئەیلول لەگەڵ پرۆفیسۆر مینۆرسکی بەناوبانگ، چاوم بەو مەدرەسەیە کەوت. زۆرجوان دامەزراندراوە. هەتا ساڵی ١٩٢٦ تەنیا مەدرەسەیەک لە هەموو لیوای سلێمانیدا هەبووە و ئەو مەکتەبەش ناقس بووە. مەکتەبی ئەوەڵ و دووەمی کوڕان مەکتەبی کچان و سانەوی (ئیعدادی) بەسنفێک کرایەوە و لە ساڵی ١٩٢٧دا سنفی دووەمی سانەوی کرایەوە. لەبەر نەبوونی کتێب ئەو سنفە شاگردی چوونە مەکتەبی سانەوی بەغدا خوێندیان. ئەوەش بۆ ئەوە دەهێندرایە پێشەوە کە شاگردانی کورد لەو مەکتەبەدا بەعەرەبی بخوێنن.

محەمەد ئەمین زەکی بەگ - وەزیری مەعاریف - لەلایەن حکومەتی عیراقەوە ناردرا سلێمانی کە دڵخۆشی خەلکەکە بداتەوە بەعەرەبی بخوێنن. ئەمین زەکی بەگ لە ئەسەرەکەی(موحاسبەی نیابەت، لاپەڕە - ١٠ )ی دا دەڵێت:

«د- بەواسیتەی عەرەبی فێربوونەوە بەعزێکیان دەتوانن لەمەولاوە ئیستیفادە لە مەئموریتی لیواکانی تر بکەن».

ئەمین زەکی بەگ تەقەلای دابوو کە قوتابخانەکان بکرێنە کۆمەڵەیک و لەسەر دەستووری مەعاریفی عراق دامەزرێندرێن. بەڵام نەکرا. بەڵکو بەپێچەوانەی تەقەلای ئەمین بەگە[illegible] لە نێوانی ئەو دوو ساڵەدا گەلێک کتێبی کوردی بۆ مەدرەسەکان داندرا و کەوتە چاپ[illegible].

مەدرەسە[illegible] کچان ئەم ساڵ یەک لە تەوێلە و یەک لە هەڵەبجە کرانەوە و مەدرەسەی کچانی سلێمانی لە مێژە هەبوون. ژمارەی هەموو تەلەبەکانی ئەو بیست و هەشت مەدرەسەیە ه[illegible]ر و [illegible]ەوسەد کەسن.

له دەوری [illegible]مداری شێخ مەحموودا چوار مەدرەسە له سلێمانی هەبوو، یەک ناوی مەدرەسەی [illegible]حمودییه» -٢- «قادریه» -٣- »رەئوفیه» -٤- «لطیفیه» و له پاش ئەو ناوانه گۆڕدران و کران بەمەدرەسەی سانەوی و ئیبتدایی و یەکەمین و دووەمین و [illegible]تییه دانرێن.

ئەم [illegible] ناوی ئەوانیش گۆردرا له دوامینی ئەیلوولدا ناوی یەکێکیان نا«فیصلیه» ، که له پێشا«مەحموودیه» بوو. دووەم «غازی» -٣- «خالدی» -٤- «صلاح الدين» و دوو مەکتەبی کچانیش ناویان بەم جۆره گۆڕدرا له مەرکەزی لیوا «عایشه الصدیقه»-٢- «فاطمه الزهراء» ، بەڵام ناوی مەکتەبەکانی درەوه هێشتا هەروەکو خۆیەتی.

## قوتابخانه:

له هەموو گەڕەکەکانی سلێمانیدا قوتابخانه کراونەوه. مەلایەک یان خوێندەوارێک دەرس بەمنداڵ دەڵێنەوه، دەرسی قورئان و کتێبی فارسییان پێ دەڵێن.

ئەو قوتابخانه نزیک چل دانەیەک دەبێت و هەریەک کەم کورت قوتابی تێدایه لەسەر دەستووری پێشوو مەیدان و فەلاقه و دارکاریان هەر ماوه. کەمێک کوردیش دەخوێنن.

هەر قوتابییەک مانگی چتێک دەدەن بەمامۆستا و مامۆستاکان له میلەت هێنده ئاگادارنین هەر لەسەر رەوشتی دەوری نەزانین دەرس دەڵێنەوه، لەسەر پارچه حەسیر و بەرەو زەوی منداڵەکان دادەنیشن.

## ڕێگا و جاده

ڕێگا و جادەیەکی له نێو شاردایه هەر ئەو ئاسارەیه که مێجەرسون له پێشا دایمەزراندوه. بەڵام بەلەدییه کەمێک خۆڵ و بەردی خستووه. ڕێگایەکی راست لەبەر دەرگای مزگەوتی گەورەوه هەتا دەری شاری بۆ سابونکەران و لەبەر دەرگای سەراوه بۆ گەڕەکی دەرگەزێن دەڕوات، هەتا نزیک گردی سەیوان چووه و ڕێگایەکی لەبەر دەرگای مزگەوتی گەورەوه بەناڕێکی پێچ دەخواتەوه بۆ چوارباغ. که ڕێگای کەرکووکی پێ دەڵێن. ئەو سێ ڕێگایەی بۆ کراوه، بەڵام ڕێگاکانی نێو شار بەکەم و کورتی ڕێکخراوه، ئوتومبیل بەهەموویاندا هاتوچۆ دەکات. له نیەت دایه نێو شار گەلێک ڕێگای دیکەی بۆ دروست بکرێ و قیرتاویشی بکەن.

ڕێگایەکی دیکه میجەرسون بەسەر تانجەرۆدا بۆ قەرەداغی بیناکرد، ئوتومبیل پێیدا

بڕوات. لەسەر چۆمی تانجەرۆ پردێکی دروستکرد. بە بەرد و قسڵ و گێج، کە پاش چەندیک ئەو پردە وێرانکرا: ئێستا کەمێک پایەی ماوە. ڕێگاکە تەواونەکرا بۆ هەڵەبجە. ڕێگایەک بۆ هەڵەبجە لە دێی سەید سادقەوە ڕێکخرابوو بەبناری شاخی هەوراماندا دەچووە هەڵەبجە. ئەم ساڵە کە لە دێی سەید سادقەوە ڕاست بەنێو دەشتی شارەزووردا بریویانە و چۆتە هەڵەبجە.

لە نزیک دێی سەید سادقەوە ڕێگایەک بۆ پێنجوین جوێ کراوەتەوە، ئوتومبیل پێیدا دەڕوات. لەسەر هەموو ئاویک پرد دروستکراوە.

ڕێگایەکی دیکە لە هەموان موهیمترە، ڕێگای کەرکوکە بەسەر پردی قلیاساندا دەڕوات و دەچێتە تەنگی نال لە مەرکەزی ناحیەی بازیانەوە ڕووی وە دەربەندی بازیانەوە دەچێت. لە چەمچەماڵەوە بەقەرەهەنجیرەوە دەڕواتە کەرکووک. ئەو ڕێگایە زۆرجوان و ڕاست و خۆشە بەقیلەتاوە ڕێکخراوە. ڕێگایەکی لە شەرقی دەربەندی بازیانەوە ڕوو بەشیمال بۆ ناحیەی چەمچەماڵەوە جوێ کراوە و ڕێگایەکی دیکەش لە نزیک پردی قلیاسانەوە بۆ مەرکەزی ناحیەی سورداش ڕاستە و ڕاست ڕوو بەشیمالی دەڕوات و ڕێگایەکیش لە بەری سلێمانی پردی قلیاسانەوە بۆ مەرکەزی ناحیەی سەر چنار دەڕوات.

پردی قلیاسان بەبەرد و قسڵ و گێج دروستکراوە. لە توجاڕانی (وەیا نەجاڕانی) سلێمانی حاجی مەلا عەزیزی قەرەنی لە سالانی ١٩١٨کراوە.

## باغ و باخچە

شاری سلێمانی لە پێشا باغ و باخچەی زۆر بووە، بەلام لە جەنگی جیهانا هەمووی بەتەورو تەشۆیی تورک تێکدراوە، چی وای نەماوە. بەڵکو دارە وشکە، یان کۆلکەدار تەک و لەک دێنە بەرچاو. لە جنووبی شارەوە چەند بێستانێکی سەوزایی هەیە و لە نێوانی شاخی گوێژە و شارا نزیک کەناری شاری چەند زەوییەک کراون بەشینایی.

بەلام لە دامێنی گوێژە لە وەختی خۆیا شێخ مەحموود ساڵی ١٣٤٢ھ. باغێکی زۆر گەورەی شاهانەی دامەزراند بوو. لە شیمالی سەرێکی گەیشتبووە ڕێگایەکی ئەزمەر و لە جنووبەوە سەرێکی گەیشتبووە ڕێگایەکی بۆ شاربازێر و پێنجوین کە پێی دەڵێن ڕێگای گۆیژە (دوو ڕیگان) و لە نێوەڕاستا قەسرێکی بۆ خۆی لێ دروستکرد بوو، کانی و حەوزێکی گەورەشی بۆ دانابوو. لە پاشان وێرانکراوە.

مودەتێکی زۆر لەشکری لیڤی بەریتانی، کە لە ئاسوری گیرابوون خانووی پادە بۆ

زابتـانی ئاسوری و بەریتـانی دروست کردبوو. ئەو باغە ئێسـتـا زۆر کەمی مـاوە. نزیک قەسرە کە هێندێک داری لە نێودایە، دیارە کە لە ساڵی ١٩٣٣دا شێخ لەتیف کوڕی شێخ مەحموود دەستی بەدار چەقاندنەوەی کردبۆوە.

ساڵح پاشا کوڕی مەحموود پاشای کوڕی سەعـید پاشای دەوڵەت -کە سکرتێری مالیە بو- ساڵی ١٩٢٥م. ڕووخاندی.

**میوە و دارانی بەبەر و چتی لیوای سلێمانی**

میوەی کەوی:

ترێ، هەنجیر، قۆخ، قەیسی، هەڵووژە، بادام، بەهێ، گێلاس، سێو، هەنار، هەرمێ و ناسکە هەرمێ لە شاربازێر و قەراغ و ماوەت دێ. گوێز لە هەورامان و سیوەیل.

میوەی کێوی

بەڕوو، بەلاڵۆک، قـەزوان، هەرمێ کـێـویلە، هەنجـیـری کـێـویلە، گـوێز، گـەزۆ، مـازو و بنێشت، گزگل، جەوت، کەتیرە.

حەیوانە کێوی:

مـەڕی کـێـوی، بزن، کـەروێشـک، ڕێوی، چوالو (چوالکە) سـیـخـور(سـیـجـر) سـمـۆرە، دەڵەک. پلنگ، ورچ، بەراز، گـورگ، چەقـەڵ، زرەشێـر، کەمـتـیـار، بزن مژ، کیـسـەڵ، ڕەقـە، جورج، مشـک، مشکە کوێرە، مار، دووپشـک (دووپشـکی عەربەت بەناوبانگە).

باڵندە:

کەو، کۆتر، سـوێسکە، پۆڕ، چیـرگ، قـاژوو، قـازوقـولـنـگ، مراوی، شـاهۆ، قـەلەبازە لە قژەقەرە، قەل، ماسیگرە، لەگ لەگ، هەڵۆ، باز، واشە، باڵەبان، کۆلارە، داڵ، سیسارک، خەرتەل.

تیجارەت:

خەڵکی سلێمانی زۆرتریان تووتن، مازوو، خوری، کەتیرە، ڕۆن، گەزۆ، پێستی ڕێوی و دەڵەک، گەنم، جۆو برنج تیجارەت دەکەن.

کاری دەست:

بەرماڵ، جـاو، جاجم، پۆیەشـمـین، خاولی پەشتـەمـاڵی حەمام، بەڕە، مـافـور (جاف)،

هەگبەی سواری، دەوار، پەستەک، فەرەنجی، لباد، شەبقە و سیدارەی لباد، قەندشکێن، چۆ، خەنجەر، تفەنگی چاک، دەمانچە، تەشوێ، تەورداس، کەوشی یەمەنی، کڵاش، قوندەرە، پانیە بەرز، کاڵە.

نەجارِی تەختە و دەرگا و پەنجەرەی زۆر چاک دروست دەکەن، کورسی تەختە، ئەسکەملە، مێز و چتی وردەکاری زۆر جوانیان هەیە.

دەستوری بینایان لەسەر تەرزی پێشووی سابڵاغە بەتەواوی.

کێو و شاخە ناودارەکانی سلێمانی:

پیرەمەگروون: کێوێکی زۆرجوان و بەئەندام و سەختە و کێوێکی زۆر پیرۆزبووە و کوردەکان پەرستشیان دەکرد و ئەمرۆکەش بەموقەدەسی دەزانرێت. هەروەکو لە شیعری شاعیرەکانی ئەمرۆکەی سلێمانیدا پێیدا هەڵگوتراوە کە دەڵێن: «پیرەمەگروون موقەدەسی، دۆستی دایمی کوردی». باوەڕناکەم ئەو شاعیرە لەوە ئاگادار بوو بێت کە لەوەپێش کورد پیرەمەگرونی پەرستووە. بەڵام ڕوحی پاکی کوردی ئەوەی بەزبانی ئەو شاعیرە دڵپاکە داهێناوە کە کەموقەدەسە.

کوردی پێشوو لەبەر ئەوە پەرستیشی ئەو کێوە موقەدەسیان کردووە کە ئاورفشان بووە، هەروەکو باباگورگور. ئەو کێوە، یان ئەو خاکەی بابا گورگور بۆچی پەرستراوە، چونکە ئاوری لێ دەرکەوتووە. جا نەیان گوتوو، کە لەبەر ئاورەکەیە، گوتوویانە پیاوێکی گەورە کە ناوی باباگورگور بووە، لەم جێگەیەدا مەدفوونە.

خەڵکی سلێمانیساڵی چەند جاران نان و خواردەمەنی هەڵدەگرن و دەچنە شاخی پیرەمەگروون و لەسەر شاخەکە گوایە پیاوێکی گەورە و خوایی ناژراوە دەچنە زیارەتی و بەو بۆنەیەوە سێ - چوار ڕۆژ بەکەیف و شایی و خۆشخوانی دەیبەنەسەر.

هەتا شاخی کوڕە کاژاویش بەموقەدەس دەزاندرێت. ملەکەوە و شاخی دی سەید سادقیش دیسان موقەدەسە.

شاخی هەورامان: شاخێکی لە هەموان گەورەتر و بەناوبانگترە کە ئەو هەزار ساڵەیە کوردی بەخێوکردووە و پۆشین و چەک و بەرگی کوردیان هەر لە خۆیانەو خەڵکەکەی بەنیسبەت زۆر مەدەنی و تێگەیشتوون و کاریگەر و ئیش زانن و خاوەن دەستکردی خۆیانن. زبانەکەیان کە لە لای ئێمە کەمێک لە زانین دوورە، بەڵام زبانێکی زۆر خاوێن و پاکە و زبانی ئاوێستای کتێبی موقەدەسی کوردی پێشووە کە هەتا ئەمڕۆکە ڕاگیراوە و

تێکەڵ بەزبانانی دیکە نەبووە. لەو کێوەدا پیاوانی زۆر گەورە هەڵکەوتوون و لە دونیادا ناوبانگیان دەرکردوە. بەعیلم و عیرفان و بەتێگەیشتوو و زانین و زرنگی گرەویان لە هاوالانی خۆیان بردۆتەوە. چەند کەسێکی کە ناویان و ئاساریان لە ئێمە ئاشکرابووە ئەمانەن: مەلا خدری رواری و مەلا مستەفای بێسارانی و خانەی قوبادی و مستتەفا بەگ و مەولەوی. گەلیک شوعەرا و عولەمای دیکەش لەو خاکەدا هەڵکەوتوون کە تاکو ئێستە ئاسار و ناویان لەبەر بێکەسی لەبیرچۆتەوە.

شاخی قەرەداغ: شاخێکی زۆر گەورەیە. بەفەڕە بۆ کورد، چونکە ئاساری کوردی تێدایە.

## چۆم و جۆگاوەکانی سلێمانی

١- **تانجەرۆ، (ئاوبارە و سەرچنار بەکرەجۆ)** سەرچاوەی تانجەرۆ لە سەرچنارەوە هەڵدەستێ و دەچێتە خوارەوە، لە پردی قلیاسان کە ڕێگەی چوونە چەمچەماڵ و کەرکووکە، لە چۆمەوە هەتا دەشتی شارەزوور پێی دەڵێن تانجەرۆ. ئەو چۆمەش لە شیماڵی غەربی سلێمانییەوە ڕوو بەغەرب و لەوێوە بەغەربی سلێمانیدا و ڕوو بەجنوبی غەرب ولە جنووبەوە ژێردەبێتەوە و دەچێتە دەشتی شارەزوور. لە گەلێک جێگایان بەندیان بۆ هەڵبەستووە مەرەزە و شینایی و بیستانی لەبەر دەکەن.

ئاوبارە بە بەکرەجۆش لە سەرچنارەوە هەڵبەستراوە. بەکرەجۆ لە دەوری بەکرە سووری کوڕی سلێمان پاشای گەورەی نەوەی فەقێ ئەحمەدی دارەشمانە هەڵی بەستووە. بەڵام ئەو جۆگە گەورەیە بۆ خەڵکی سلێمانی سوودێکی نییە؛ چونکو حکومەت ئەوە دوو ساڵە ماکینە و ئالەتی عەسری هێناوەتە سەر ئەو خاکەی کە بەو ئاوە ئاودەدرێ. لە پێشا نییەتی حکومەت ئەوەبوو کە ماکینە بێنێتە سەر ئەو خاکە، تاکو ئەهالی سلێمانی ئیستیفادەی لێبکەن و فێری ماکینە بەکاربردن بن. بەڵام مەئموور و جووت بەندە و کارگەری ئەو خاکەیان لە بەسرە و لیواکانی جنووبەوە هێناوە و ناویان ناوە «مەزرەعەی بەکرەجۆ» و هەموو حاسیلات و دانەوێڵەیان لە شاری سلێمانی دەفرۆشن. ئەگەرچی نەدەبوو وابوایە، ئەو مودەتەی لە سلێمانی بووم لەبەر دەرگای دائیرەی بەلەدییە هەموو سبەینان چاوم بەچەند لۆری حاسیلاتی بەکرەجۆ دەکەوت؛ دەیان هێنا سلێمانی دەیان فرۆشت و کاو جۆ و دانەوێڵەشیان بەئەرزان دەدا.

بەوە تەنگەیان بەجووت بەندە و خاوەن کرداری سلێمانی هەڵچنیبوو، هەتا پیاوێکی

خەلکی سلێمانی لە نێو عەمەلەکانی بەکرەجۆدا پەیدا نەدەبوو، هەموو لە جنووبەوە هێنرابوون.

٢- **زەلّم**: لە ژوور خورماڵەوە و لەبەر مزگەوتەکە دەردەکەوێت و سەری سپیان ئاغا دەردەکەوێت بەسەر دەشتی شارەزووردا بلاودەبێتەوە. زۆر کەمی بەکاردەبرێ، ئەگەرچی ئاو زۆر و زەبەندە بەخوڕایی دەڕوات. دەشتی شارەزوور ئەگەر ئاوەدان بوایە نەی دەهێشت ئەو ئاوە زۆرەی کە بۆ هەموو گۆشە و قوژبنی دەشت هەڵدەگیرێت بەخوڕایی بڕواتە خوارەوە، بەڵام لە بەدبەختانە لە باتی ئیستیفادە لێکردنی پڕە لە بەراز. تەنها لە هێندێک جێگایانی ڕۆژهەلاتی دەشت ڕوو بەهەڵەبجە کەمێک شینایی و کەمێک مەرەزەی حکومەتی لەبەر دەکرێت و ئەو ئاوە جوانە بەکەڵکە بەبێ سوود ڕوو بەخاکی...... سەری خۆی هەڵدەگرێ و دەڕوات. تەرکی دار و دیاردەکات، لە داخی گەورەکانی کورد دەست لە نیشتمان بەردەدات، وێڵی چۆڵ و دەشتی غوربەت، لە خوارەوە خەڵکی ئیستیفادەی لێدەکەن.

## چایخانە و ئوتێل و موسافرخانە

چایخانەکان سەد و بیست دانەن. لەوانە نزیکی پەنجا دانەی زۆر چاک و خۆشن و هی دیکە نێوەنجی و لەسەر دەستووری کۆنن.

**ئوتێل**: چوار ئوتێلن، یەکەمینی ئوتێلی سەعادە هی حاجی ئیبراهیم ئاغا و ئەحمەد بەگی موتەصەڕیف. هی دووەم ئوتێلی ساڵح زەریفە. هی سێیەم ئوتێلی فەرەح هی حاجی توفیقی تازە دەوڵەمەند و سەعدی مارف. هی چوارەم موسافرخانەی کوردستان زنوبە (**موزمانیکی**؟) سوریەی بەکرێی گرتووە. لەسەر جادەی سابوونکەرانە.

## قەیسەری

١- **قەیسەری وەسمان پاشا**: وەسمان پاشای گەورەی جاف دروستی کردووە.

٢- **قەیسەری نەقیب**: نەقیب شێخ مستەفا دروستی کردووە.

٣- **قەیسەری غەفوور ئاغا**: غەفوور ئاغا دروستی کردووە. ئێستە لە دەست وەرەسەکەی دایە.

٤- **قەیسەری حاجی برایم ئاغا**: حاجی برایم دروستی کردووە. لە دوای ئەو فرۆشراوە و ئێستەش ئاوەدانە.

زۆرترین دوکان و بازاڕ هی حاجی مەلا موحیەددین و حاجی سەعید ئاغاو حاجی عەلی ئاغایە هەر سێک برای یەکن.

## مزگەوت لە سلێمانی

١- **مزگەوتی گەورە:** ئەورەحمان پاشای بەبە بینای کردووە.

٢- **مزگەوتی بچکۆلە:** شێخ حەفیدی کاک ئەحمەد بینای کردووە. عرفان ئەفەندی مودەڕڕسی بووە و لەلایەن شێخ سەعیدەوەیە.

٣- **مزگەوتی قامیشەکان:** شێخ مستەفای گولانی بەمعاوەنەتی.

٤- **مزگەوتی سەرچاوەی کانی ئاسکان:** لە لایەن بابانەکانەوە دروست کراوە.

٥- **مزگەوتی شێخ سەلام:** شێخ مستەفا فەوزی ئەفەندی مودەڕڕسی ئەم مزگەوتەیە.

٦- **مزگەوتی حاجی ئەحان:** ئەو پیاوە خەلکی سلێمانی و بازرگان بوو؛ ئەو مزگەوتەی دروستکردووە.

٧- **مزگەوتی مەلکەندی:** (؟) ناو موتەسەڕف بەگی سلێمانی دروست کراوە.

٨- **مزگەوتی عەبدولرەحمان پاشا:** عەبدولرەحمان پاشای بابان بۆ مەلا عەبدوللا رەشی دروستکردووە. کە ئەو مەلایە خەلکی سنەیە. لە دوای ئەو عەلامەوە، بەناوبانگ مەلا ئەحمەدی چاومار بوو بەمودەڕڕسی. لە دوای ئەو شێخ مستەفا بابە ڕەسول -کە موفتی بوو -لە دوای ئەو سەید حەسەن برازای موفتی، لە دوای ئەو مەلا مستەفای کوردی شارەزووری و ئێستە مەلا محەمەد کوڕی مەلا مستەفا مودەڕڕسە.

٩- **مزگەوتی حاجی شێخ ئەمین:**

١٠- **تەکیە رووتە:** شێخ عەلی کوری شێخ عەبدولڕەحمان تالەبانی دروستیکرد؛ تەکیەیەکی قادریە. لە پاشان حەفسە خان کچی حاجی عەبدولڕەحمان مەجروم، ئاوای کردەوە.

١١- **تەکیەی شێخ مارف:** بەمزگەوتی حاجی بەگ مەشهوور بووە؛ ئێستەش ئەو مزگەوتە لە نێو ئەو تەکیەدایە. مودەڕڕسی مەلا ئەحمەد ئابلاخیە.

١٢- **مزگەوتی باش چاوش:** باش چاوش باوکی ئەحمەد (؟) ناوی یەکێکی خەلکی سلێمانییە.

١٣- **مزگەوتی شێخ بابا عەلی:** عەبدولڕەحمانی پاشای بابان بۆ شێخ عەبدولڕەحمان شێخ ئەبوبکر دروستی کردووە.

١٤- **مزگەوتی هەمزە ئاغای مصرف:** بۆ مەلا ئەحمد سایب کە قازی بووە، دروستی کردووە. ئەمڕۆکە مەلا مەعرووف ئەفەندی قازییە.

١٥- **مزگەوتی حاجی عەزیز خەیات:** پیاوێکی توجار دروستی کردووە.

١٦- **مزگەوتی عەبدولکەریم:** شێخ قادر سنەیی دروستی کردووە کە خاوەندی کتێبی «تهذیب»ە. ئەمڕۆکە نەوەی ئەو، شێخ لەتیف مودەڕڕسە.

١٧- **مزگەوتی مەلا مەحموودی حاجی عەلی:** مەلا عەلی نیزامی، خەڵکی سلێمانییە و بەکۆمەکی خەڵکەکە دروستی کردووە.

١٨- **خانەقای خالدییە:** مەحموود پاشای بابان بۆ مەولانا خالید دروستی کردووە. ئێستە مەدرەسە و خانەقایە. لە پاشان لە لایەن ئەهالی شارەزوورەوە ئاواکراوە و ئێستاش ئاوەدانە.

١٩- **خانەقای مەلا عەلی وەسمان:** بۆ خۆی دروستی کردووە، خانەقای نەقشبەندییە.

٢٠- **مزگەوتی شێخ یوسف.**

٢١- **مزگەوتی شێخ حەسەنی قازی:** ئەم شێخ حەسەنە خەڵکی سلێمانییە، لە ساداتی بەرزنجەیە. لە دوای حوکمدرانی باباندا ڕۆمەکان ئەویان کردە قازی.

٢٢- **مزگەوتی مەلا محەمەد ئەمین:** بەکۆمەکی خەڵکی ئەو مزگەوتەی بۆ دروست کراوە.

٢٣- **مزگەوتی مەلا حوسێنی پیس کەندی:** خەڵکەکە بۆیان دروست کردووە و ئەمڕۆ بۆ خۆشی هەر لەسەر ئەو مزگەوتە مودەڕڕسە و یەکەمین عولەمایە.

٢٤- **مزگەوتی مەلا عەبدولڕەحمان رەسول ئاغا:** لە لایەن خەڵکەوە بۆی دروست کراوە.

٢٥- **مزگەوتی مەلا غەفوور:** ئاغا تەها بەتوجارانی سلیمانی دروستی کردووە. نزیک بیست ساڵێک لەمەوپێش ڕووخابوو کە حاجی فەرەج حاجی حامد دروستی کردبوو.

٢٦- **دووەمین تەکیە رووتە:** لەلایەن شێخ مستەفا نەقیب دروست کراوە.

٢٧- **مزگەوتی شێخەڵلای هەولێر:** بەکۆمەکی خەڵکەکە بۆ شێخەڵلا ناوێک کە خەلیفەی شێخ عوسمانی تەوێلە بوو دروست کراوە. ئەو شێخەڵلایە لە هەولێر تەکییەی هەیە لەوێ مەدفوونە.

٢٨- **مزگەوتی خم خانە:** حاجی عەبدولڕحمان بەگ بۆ مەلا ئەحمەدی دێ لێژەیی دروستی کردووە. ئێستە مەلا محەمەد سەعید کوڕی مەلا ئەحمەد مودەڕسە.

٢٩- **مزگەوتی عەبدولڕەحمانی عازەبان:** خەڵکەکە بۆ شێخ عەبدولڕەحمان ناوێکیان دروست کردووە.

٣٠- **مزگەوتی موفتی:** مەلا ئەحمەد چاومار کە خەڵکی دێ لێژەی قەرەداغ بوو، لە سلێمانی ئەو جێگا مزگەوتەی کڕی و ئەو وەخت موفتی شار و مودەڕس بووە و کردوویەتە مزگەوت. مەلا ئەحمەد و مەلا ئەمینی کوڕی تەئلیفاتیان هەیە، بێخود شاعیری مەشهور کوڕی مەلا ئەمینە.

٣١- **مزگەوتی مەلا ئەمین مام ڕۆستەم:** ئەهالی سلێمانی بۆ مەلا ئەمینیان دروست کردووە.

٣٢- **مزگەوتی شێخ محەمەدی ئالەکی:** لە لایەن عەبدوڵلا ئاغای عەزیز ئاغا، کە لە گەورە پیاوانی سلێمانی بوو، بۆ ئەو شێخ محەمەد ناوە دروست کراوە.

٣٣- **مزگەوتی بن تەبەق:** لە لایەن ئەهالیەوە بۆ مەلا صالحی هەرمەتی کراوە.

٣٤- **مزگەوتی شێخ محەمەدی بەرزنجی:** بەکۆمەگی سەیدەکانی سلێمانی دروست کراوە. ئێستە سەید عەلی لە سەریەتی.

٣٥- **مزگەوتی نەقیب میرەسوورە:** لە لایەن ئەورەحمان پاشاوە دروست کراوە.

٣٦- **خانەقای مەحوی:** سوڵتان عەبدولحەمیدی عوسمانی بۆ مەحوی دروستکردووە. مەحوی لە ریزەی شوعەرایان ناوی دەبرێت.

## کلیساو کەنیشتە:

کەنیشتەی جولەکان دوون، یەکیان لە گەڕەکی جوولەکانەو ئەوی دیکەش قەرەداخی. چونکە جوولەکەکانی قەرەداخ کردوویانەو بەو ناوە ناوی دەرکردووە. ئیدارەی ئەو دوو کەنیشتانە لە لایەن خەلکەکەی گەڕەکەکەوە دەکرێت، هەموو ماڵەکانی جووی سلێمانی بەدەرگاوە سەد و سێزدە دەرگایە.

## حەمام

لە سلێمانیدا هەشت حەمام هەیە کە ئاوەدان بێت. یەکێکیان وێرانە.

١- **حەمامی موفتی:** لە لایەن مەلا ئەحمەدی چاومارەوە دروستکراوە و ئێستاش دوو بەشی لە دەست ئەو فازڵەدایە و بەشی دووەمی هی حاجی ئیبراهیم ئاغای توجار و کەریم ئەلەکەیە.

٢- **حەمامی فاتمەخان**: لە نزیک سەرایە. ئەورەحمان پاشای بابان دروستی کردووە، وەقفی هەموو مەدرەسە و مزگەوتەکانی سلێمانییە. ئەو فاتمە خانە دایکی ئەورەحمان پاشا بووە.

٣- **حەمامی قشلە**: لە دەوری بابانەکان بیناکراوە. ئێستا موڵکی مەی( ؟) ئەورەحمان ئاغایە. نزیک مزگەوتی گەورەیە.

٤- **حەمامی نەقیب**: شێخ مەعروفی نەقیب بینای کردووە.

٥- **حەمامی سورەت**: ئێستا موڵکی کەریمی ئەلەکەیە.

٦- **حەمامی حاجی سەعید ئاغا**: خۆی دروستی کردووە، ئێستا لە دەست خۆیانە. حاجی سەعید ئاغا کوڕی مەعروف ئاغا تەنهایە کە یەکە توجاری ئەشرافی شاربووە و زۆر لە ئیستەنبول بووە و ئەعیان بووە.

٧- **حەمامی غەفور ئاغا**: زۆر بچووکە لە ئاخیری بازاڕە و لە قیبلەی بازار هەڵکەوتووە. غەفوور ئاغا توجار و ئەشراف بووە دروستی کردووە.

٨- **حەمامی حاجی غەنی**: حاجی غەنی نێوی گەورەیەکی شارە و ئەو دروستی کردووە. ئێستا موڵکی کوڕانی حاجی ساڵحی حەمە کەرکووکییە.

٩- **حەمامی حاجی عەبدوڵلا**: حاجی عەبدوڵلا کوڕی ئاغا تەها دروستی کردووە.

١٠- **حەمامی گازێ**: وێرانە و لە گەڕەکی گوێژەیە.

## ئاش لەنێو شاردا

ئاشی ئاو هەژدەیە، چواردەی ئێستا کار دەکات. سێ ئاشی ئاگری هەیە.

ئاشی ئاگر:

١- حاجی ئیبراهیم ئاغا و حاجی رەشید، حاجی سەید قادر ئاغایە.

٢- هی مجید ئەفەندی ئەلەکە.

٣- هی «صبغ الله» ئەفەندی و واقیفی.

ئەو ئاشانەی بەئاوی کاریزەوە دەگەڕێن زۆر چاک ئیش دەکەن. ئاشە تازەکە کە نزیک دەباغ خانەکەیە، بەئاشی مارف بەگ مەشوورە. ئەوانی تر هەموو لە دەوری بابانەکاندا هەبووە.

## ماكینەی ئەلەكتریك (كەهرەبا)

سالّی ١٩٢٨ هێنایانە و لە لایەن بەلەدیەوە كڕراوە و هەموو كووچە و ماڵەكانی پێ ڕووناك كراوەتەوە. مەركەزی ماكینەكان لە گەڕەكی گوێژەی ئەمڕۆ سابوونكەرانی دوێنێكە، كە لە باغچەی باغی پوورە بەگی(؟) دامەزراندراوە. بەڵام جێگای ماكینەكە تەنگە و كافی نییە.

ماشینەی ئاو نییە. ئاوی كە بەگونج بەسەر شاردا دابەشكراوە ئەمەیە، كارێزی حاجی بەگ لەسەر جادەكەی حەوزی بۆ دروست كراوە بەگونجی گەورە دەرخراوە، لە دوایی هەر مالێك بەگونجی بچووك بەش كراوەتە سەریان.

كارێز:

١- كارێزی حاجی بەگ ( كە بەسەر شاردا دابەش كراوە).

٢- كارێزی عەزیز ئاغا.

٣- كارێزی ئەحمەد زەنگەنە.

٤- كارێزی حاجی حەسەن.

٥- كارێزی سەید ئەحمەد بابا رەسول.

٦- كارێزی حاجی خان.

٧- كارێزی سەید حەسەن. **وەقفی ئەورەحمان پاشای بابانە.**

٨- كارێزی دایكی پاشا. وەقفی فاتمە خان دایكی ئەورەحمان پاشای بابانە.

٩- كارێزی گونجی «حن» بەغدایی.

١٠- كارێزی كانی ئاسكان.

١١- كارێزی حەمامی موفتی.

١٢- كارێزی بن تەبەق.

١٣- كارێزی حەمامی قشلە.

١٤- كارێزی عوسمان پاشا (**جاف خەلكی هەڵەبجە**).

١٥- كارێزی حاجی مەلا عەلی ( **كەوتۆتە نزیك گردی سەیوانەوە**).

١٦- لە ڕۆژئاوای شار نزیك بەتەیارەخانەوە كارێزێكی دیكەش هەیە كە بۆ زەوی و زاری شاری بەكاری دەبەن. كارێزی موشیر ئاوایە و لە بەهاراندا دەبێتە سەیرانگەهی شارێ.

## خان و کاروان سەرا

١- خانی حاجی عەبدوڵلای درێژ( ؟ ).

٢- خانی حاجی سەعید ئاغا: خۆی دروستی کردووە و موڵکی خۆی و دوو برایەتی.

٣- خانی غەفوور ئاغا: خۆی دروستی کردووە.

٤- خانە سووتاو: قادر کەریم لاین دروستی کردووە. نیوەی وەقفی عەبدولرەحمان پاشایە بۆ هەموو مزگەوتەکانی سلێمانی؛ نیوەشی هی حاجی رەشید حاجی سەید قادر ئاغایە.

٥- خانی گومرک: حاجی سەعید ئاغا و دوو برای دروستیان کردووە. ئێستە دائیرەی گومرگی تێدایە.

٦- خانی رسومات: موڵکی حاجی حەمە ئاغای برای حاجی سەعید ئاغایە.

٧- خان و کاروان: سەرای حکومەتی لە دەوروپشتە.

## نفوسی سلێمانی

ژمارەی نفوسی سلێمانی بەپێی قەیدی تاپۆ ٣٥٠٠ (سێ هەزار و پێنج سەد) ماڵە.

## عەشایر و قەبیلەکانی سلێمانی

عەشیرەتی پشدەر، جاف، هەمەوەند، هەورامی، مەمی (مەمنی)، کافرۆش ، شوان، شێخ بزێنی.

**عەشیرەتی پشدەر**

تایفەی بابەکر ئاغای، تایفەی مەحموود ئاغای، تایفەی ئەحمەد ئاغای، تایفەی رەسول ئاغای، تایفەی بەگ زادە، تایفەی عەلی ئاغای، تایفەی ئومەر ئاغای، تایفەی هەباس ئاغا.

١- بابەکر ئاغا کوڕی سەلیم ئاغا: بابەکر ئاغا رەیسی هەموویانە.

تایفەی مەحموودئاغا. ئەمرۆکە هەباس مەحموود ئاغا گەورەیانە، کە بەوانە دەڵێن «برا گەورە».

٣- تایفەی ئەحمەد ئاغا: ئەمرۆکە صالح ئاغا برا گەورەیانە.

٤- رەسول ئاغا: رەشید ئەولا ئاغا برا گەورەیە رەشید کوڕی عەبدوڵلا کوڕی رەسول

ئاغایە لە دێی سوورە قەڵات دادەنیشێت.

٥- تایفەی بەگ زادە: ئەحمەد مستەفا ئاغا برا گەورەیانە لە دێی کانی توو دادەنیشێت.

٧- تایفەی ئۆمەر ئاغا: هەباسی ئۆمەر ئاغا گەورەیانە لە دێی دەقناوە دادەنیشێت.

٨- تایفەی هەباس ئاغا: بایز ئاغا کوڕی هەباس ئاغا گەورەیانە لە دێی دەسوێنە دادەنیشێت.

ئەم هەشت تایفەیە لە کوڕانی حەمە ئاغای گەورەن، حەمە ئاغا بیست و چوار ژنی هەبووە و لە هەر ژنێک کوڕێک. بەو جۆرە هەر کوڕێک لەسەر دێ و قەبیلەیەک دانیشتبوون و بوون بەگەورە. دەنا هەموویان «میر ئاودەلین»و میرئاودەلی بنەچەکەی گەورە و سەردار عەشیرەتەکەن و «نورالدین» رەعیەت ورەنجبەرن.

هێندێک جار ئەو عەشیرەتە بەپشدەری و هێندێک جار بەمیرئاودەلی و هێندێک جار بەنورالدینی ناودەبرێن. بەڵام براگەورەکانیان بەمیرئاودەلی ناوبانگیان دەرکردووە.

حەمە ئاغای گەورە لە دەشتیو -کە دێیەکی پشدەرە- دانیشتووە. دەشتیو لە نزیک حدودی ئالان و قەڵادزەیە. هەر لەو دێیەش وەفاتی کردووە و قەبری ئێستا لەوێیە.

## شەرەکانی عەشیرەتی پشدەر

١- شەری رووس

شەڕی رووس لەگەڵ پشدەر پولنیک ئەلسکاندەر لە سەردەشتەوە قاقەزێکی بۆ گەورەکانی پشدەر نووسی کە شەڕیان لەگەڵ نەکەن. ئەوانیش بەهۆی دینەوە جوابیان داوە. دووبارە ئەلسکاندەر بۆی نوسینەوە کە دەست لە شەڕ بەردەن. لە دوامینا شەڕ دەست پێکرا. نزیکەی شەش شەڕ کوژتاریان لێککردن. لە پشدەری ئەمانە کوژران:

بابەکر ئاغای حەمە ئاغا، حاجی سەید گول، توفیق بەگ، حاجی ساڵح بابەکر ئاغا. لە تایفەی ئەحمەد ئاغانی باپیرانی نزیک سێ سەد کەس کوژران. ئەوانە لە یەکە شەوابوو، کە نزیک بۆکانە و سەعاتێک لە بۆکان دوورە.

یەکەمین شەریان لە دوو شەنبەبوو کە رووس گەیشتە سەردەشت. لەوێش شەڕێکیان کرد. لەو شەڕەدا رووس تەنگەیان بەکورد هەڵچنی. شەری سێیەم و چوارەم و شەشەم میر ئاودەلی سەرکەوتن و سەردەشتیان لە دەست رووس دەرخست.

٢- شەری گەل گەورک

لە پاش شەڕی رووس لە گەل گەورک شەڕیان کرد. گەورک چەند دێهاتێکی پشدەریان گرتبوو؛ پشدەریانیش داوایان کردەوە. جیهانگیر ئاغای گەورک جوابی دان لەسەر ئەوە پشدەری لەشکرکێشیان کرد و لنگیاندا سەر خاکی گەورک. لە «رەبەت» و لە شندرەو.

لەوەپێش میرئاودەلیەکان پیاوێکی خۆیان ناردووە، پاشان هەباسی هەباس ئاغا چووە سەر ئەو دێهاتە کە بزانێ دەیاندەنەوە. گەورەکیش چوون ئەو ئاغایەیان کوژت.

لە پاش ئەوە میرئاودەلی بۆ خوێن ئەستاندنەوەی هەباس ئاغا لەشکریان کێشاو چوونە سەر عەشیرەتی گەورک و لە دوای چەند شەڕ جیهانگیر ئاغا و پێنج کوڕیان کوشت و عەشیرەتەکەیان لە دەست خست و پووچیان کردەوە.

٣- شەڕی دەربەند

لە شەڕی دەربەندی بازیاندا کۆمەگی شێخ مەحموودیان کرد و زۆر مەردانە تێوەچوون. هەر وەختێک پشدەری لەگەڵ شێخ مەحموود رێککەوتبایە، باوی شێخ مەحموود دەبوو، کە ڕووی وەرگێرابایە، کورد تووشی شکستە دەبوو.

عەشیرەتی پشدەر عەشیرەتێکی زۆر بەهێز و تێگەیشتوو و دەوڵەمەند و پڕ چەک و ئازاو رێک و یەک دڵن. لە بەرامبەر دوژمن هەموویان دەبن بەیەک. کە نەیارێک لە نێواندا هەبێت هەموو بەیەک دەست و یەک زبان و یەک قسە و یەک وجودی پێشی پێ دەگرن. ئەو یەکێتیە سەرفرازی کردوون و تاکو ئەمڕۆکە رایگرتوون و بەو سایەیەوە زۆر چاک دەژین و کەسێک دەرەقەتیان نایەت.

لە سلێمانی چاوم بەگەلێک ئاغایان و گەورەی پشدەریان کەوت، لە بەرگ و سەرپۆش و رەوشت و گوتە و داب و دەستووریان عەشیرەتێکی خاوەند شەرەف و تێگەیشتوو و زانا و زرنگم کەوتە بەرچاو و بەسەر عەشایری دیکەی کورددا زۆر سەرهاتووە.

بەبەرگ و سەر و پێچ و رۆین و دانیشتن و شێوەی قسە و رەوشت و خووی بزووتنەوە و دەستوور و باویان، لە عەشیرەتی (بەگزادە، دی بوکری موکریان)م جوێ نەکردنەوە. کەسێک لە پێش بەرگی پەهلەویدا بەگزادەکانی موکریان و ئاغاکانی دی بوکری موکریانی چاو پێیکەوتبێ و ئەمرۆکە ئاغا و گەورەکانی پشدەر ببینێت، ناتوانێت بەهیچ کلۆجێک لێکیان جوێ بکاتەوە.

هەرچەندە زبانی شارەزوور بەتەواوی شێوەی موکرییە، بەڵام عەشیرەتی پشدەر زۆر بەچاکی ئەو شێوە و رەوشتە و دەستوور و دابەی بەخێوکردوە و لە دەستی نەداوە.

## عەشیرەتی جاف

ئەو عەشیرەتە زۆر بەهێزن. لە ساڵانی ١٢٠٤دا لە کرماشان دانیشتبوون. بەئیلی «مرادی» دەناسران. کورد زبانن، لەهجەیان کەمیک لە لوڕ دەچێت.

**ئومەرای جاف:** میرە بەگ ناو و زایر بەگ ناو چونەتە شارەزوور. حاکمی بابان ئەورەحمان پاشا ئەوانەی دامەزراندووە.

لە دوای میرە بەگ کەیخوسرەو بەگ کوڕی زایر بەگ بووە بەگەورەی جاف. لە دوای ئەو قادر بەگ بووە بەسەرکردەی جاف. لە دوای ئەو حەمە پاشای کوڕی کەیخوسرەو بەگ و بەهرام بەگ بەیەکیەتی بوون بەگەورەی جاف. دوو ساڵیان بەتەبایی رابوارد. حەمە پاشا بوو بەوالی کرماشان (١٣٠٥). سەرکۆماری جاف بۆ بەهرام بەگ مایەوە. لە دوای ئەو مەحموودیان کوڕی حەمە پاشا بوو بەسەرکۆمار. عوسمان پاشا و مەحموود پاشا کوڕانی حەمە پاشا بەتەبایی گەورەییان کرد، لە ساڵی ١٣٤١دا عوسمان پاشا مرد.

تیرەی جاف ١٧ن ناویان ئەمانەن لە خوارەوە:

١- روخ زایی،

٢- تەرخانی،

٣- گەلالی،

٤- شاتری،

٥- یوسووجانی،

٦- سدانی،

٧- وردەشاتری،

٨- مکایلی،

٩- بوداغی،

١٠- عەمەڵە،

١١- پشت ماڵە،

١٢- کەمالەیی،

١٣- باشكی،

١٤- میروەیسی،

١٥- هارونی،

١٦- قارەمانی،

١٧- شێخ سمایلی.

ئەو تیرانەی عەشیرەی جاف لەژێر ئیدارەی گەورەکانی خۆیاندا دەگەڕێن، بەرەئیسی عەشیرەتەکانیان دەڵێن سەر «کۆمار». عوسمان پاشای جاف تایر بەگ شاعیری بەناوبانگ و ئەحمەد موختار بەگ شاعیرێکی غەراو بەقیمەت بوو دیوانێکی زۆر قیمەتداری هەیە. ئەحمەد موختار شاعیرێکی زۆر باشە. کە من لەسلێمانی بووم لەبەر هێندێک مەسایل روو بەشاخی هەورامان هەڵات و پەنای بۆ حکومەتی ئێران برد. عزەت بەگ لە سلێمانی دانیشتووە.

## قەزاو ناحیەکانی لیوای سلێمانی

ناوچەی لیوای شاری سلێمانیە و ئەولیوایە دوو قەزاو دە ناحیەیە. قەزای هەڵەبجە و قەزای شارباژێرە. ناحیەکان ئەمانەن: پێنجوین، وارماوا، تانجەرۆ، قەرەداغ، بازیان، سروچک، سورداش، ماوەت، خومبار، خورماڵ.

لە ناوچە و قەزاکانی لیوای سلێمانی لەبەدبەختیمە جگە لە قەزای هەڵەبجە و ناحیەی خورماڵ و بازیان نەبێت نەمدیوە کە بتوانم لێیان بدوێم و بتوانم لەم پەراویەدا ناویان بەدرێژی بێنم.

**هەڵەبجە**: رۆژی پێنج شەممە بۆ زیارەتی قایمقام ناجی بەگ هورمزی، ئامادە بووم. بەواسیتەی جەلال ئەفەندی ساحیب(*) مدیری تەحریرات، بەناجی بەگمان راگەیاند. لە پێشدا گەیشتمە سەرای سپیان ئاغا کە ئاوێکی زۆر زەوەند لە بن گردێک دەردەکەوێت، دوو بەندەیی هەڵبەستراوە بەراست و چەپدا؛ لەوێ تێپەرین چووینە خورماڵ. بازارچەیەکی بچووک و چەند دوکانێکی تێدایە و لەگەڵ چاخانەیەک. بەڵام مەنزەرەی ئاوی کە لە ژێر خانووبەرە و حەوشی کوڕی شێخ حوسامەددین دەردەکەوێت، شایانی حیرەتە و نەدڵێک هەزار دڵ مەفتوون و سەرگەردانی دەبێت.

---

(*) راستتر (سائیب)ە. ع. زەنگەنە

## پەیمانی نێوان شێخ مەحموود و ئەحمەد تەوفیق بەگ - موتەصەڕیفی سلێمانی

لە پاش ئەوەی تەوفیق بەگ لە شەڕی روسیە لە ناوچەی موکریانی بەشەش سەد کەسەوە کوژرا و لەشکرەکەی کورد گەڕانەوە پاش، ئەحمەد بەگ کوڕی تەوفیق بەگ لە تەمەنی هەژدە ساڵانەدا بوو؛ خەریک بوو خۆی بنوێنێت و لەگەڵ مەئمورانی تورکا گەلێک نزیکی و تێکەڵی دەکرد و لە تەقەلادابوو کە جێگایەک وە دەست خات.

شێخ مەحموود لەوە گەیشتبوو کە ئەحمەد بەگ لە کۆشش دایە و خەریکە؛ رۆژێک لەگەڵ ئەحمەد بەگ پەیمانیان کرد پێکەوە دانیشن و قسەیەکی چاک بۆ هاتووی خۆیان بکەن و لەو وەختە تەنگەی تورک کەلێن دەستخەن. دوای نیوەڕۆ لە ماڵی ئەحمەد بەگ دانیشتن. تەنها شێخ مەحموود و ئەحمەد بەگ پەیمانیان گرێدا. ئەمە چەند قسەیەکی شێخ مەحمووده لەگەڵ ئەحمەد بەگ وهی ئەحمەد بەگ لەگەڵ شێخ مەحموود. شێخ مەحموود رووی لە ئەحمەد بەگ کرد، گوتی: چەند قسەیەکم هەیە، ئەگەر سوێندم بۆ بخۆی کەس نەیزانێت و بەکەس نەڵێیت.

**ئەحمەد بەگ:** کەسێکی پیاوبێ پەیمان و عەهد بەسیەتی؛ بەڵام پیاوی ناپیاو هەزار سوێندیش بخوات بەسەری نابات من پەیمانت لەگەڵ دەکەم هەتا زەمانە بۆ خۆی حەلی نەکات من ئاشکرای نەکەم.

**شێخ مەحموود:** بەڵێ پەیمان و شەرت دەکەین، بەڵام سوێندم بۆ بخۆ جگە لە من و لە تۆ کەس لەم شتە بەنهانیە ئاگادار نەبێت.

**ئەحمەد بەگ:** بەهەموو موقەدەساتی دین سوێندبێت ئەو فەرمایشانەی کە تۆ لەگەڵ منیا دەکەیت، هەتا زەمانە ئاشکرای نەکات من بەکەس نەڵێم.

**شێخ مەحموود:** ئەحمەد بەگ من بەهۆی تۆوە دەتوانم کارێکی زۆر گەورە بکەم بەشەرتێک لەو کارەدا هەردووکمان شەریک بین. ئەگەر ئەستێرەی بەخت و خۆشی رووی لەهەر کامێک لەم دووانەمان کرد، یەکتر لە بیرنەکەین و شەریکی خۆشی و ناخۆشی و رەنج و سوودبین. ئەگەر من بۆم لوا بەئاشکرا کەمن بووم بەپەنهانیش تۆ وجودێکی نەبووەی من بی، کە تۆش بۆت لوا هەروها.

**ئەحمەد بەگ:** دووبارە سوێندبێ، هەتا تۆ لە من جویێ نەبیتەوە، من لە تۆ نەبمەوە و دەست بەردارت نەبم، بەشەرتی مەنافعی کۆمەڵایەتی.

**شێخ مەحموود:** من لە دەوری باوکمدا مامم و باوکم کە دوژمنی باوکی تۆ بوون و لە

حەقی یەکترا دەکۆشان، من پەنهانی ئەوان، بەتاریکی شەو خۆم دەگەیاندە باوکت و کۆمەگیم دەکرد؛ دەست بەدەست ئیشم بۆ دەکردن وە نەبێ مەحەبەت و خۆشەویستی من لەگەڵ ئێوە هەر ئەمرۆکە بێ. ئێستاش وا هاتوومە لات کە بۆ ئەم ئیشە کە بەدەستمەوە لە تەکی رێککەوی و ببی بەشەریکی سوود و زیانم و لە یەکتر جوێ نەبینەوە و پێکەوە کاربکەین.

**ئەحمەد بەگ**: چی بەدەستەوەیە؟ چی دەتوانین بکەین.

**شێخ مەحموود**: ئەوا تورک دەڕوات و حکومەتی تورک ناچارە. ئەم ئیدارەیەی تورکە دەدرێتە دەست ئێمە، بۆ هەر کامێکمان هەڵسوورا ئەوی دیکەمان لە بیر نەکەین.

لەسەر ئەوە شێخ مەحموود و ئەحمەد بەگ شەرت و پەیمانیان گرێدا و بۆ یەکتر سوێندیان خوارد، کە بەبێ یەکتر هیچ نەکەن.

## مینۆرسکی پرۆفیسۆری بەناوبانگ ١٩٣٤

ڕۆژی جومعە ٢٩ی ئەیلول هاتە سلێمانی. لە پێشا چووە ئوتێل لە پاشان سیادەتی موتەصەرِیف ئەحمەد بەگ بردیەماڵی خۆی زۆر بەحورمەت خزمەتی کرد.

شەوی شەممە گەلێک لە دوای من گەڕابوون بچمە لای، نەیان دۆزیمەوە. وەختی خەو ناصح ئەفەندی حەیدەری پێی گوتم کە لیم گەڕابوون. سبەینە زوو چوومە ماڵی موتەصەرِیف. ئەحمەد ئاغای پشدەری لەوێ بوو. چاوەڕێم کرد هەتا ئەو پرۆفیسورە بەناوبانگە لە خەو هەستا. بەدڵێکی زۆر خۆش و میهرەبان پێشوازی کردم و دەستی گوشیم و لە دوای چای سبەینە خواردنەوە، بەیەکەوە چووینە مەکتەبی ئیبتدائی بەسەر پێی گەڕاینەوە. چووینە مەکتەبی متەوەسیتە، ئەحواڵی ریز و مەکتەب و قوتابی پرسی. رەشید کابان زۆر زۆر بەلوتفەوە خزمەتی کرد. لە پاشان فوتوغرافێکی من و رەشید کابان و مستەفا بەگ برای متەسەرِفی گرت لە بەردەرگای مەکتەب. لەوێوە چووینە لای مدیری مەعارف، لیستەی مەکتەب و خوێندن و منداڵەکانی وەرگرت و گەڕاینەوە مەتبەعە. فایق بێکەس و مەحموود جەودەت، حاجی توفیق بەگ و شێخ سەلام کۆبوونەوە، هەریەک غەزەلێکی لێ پرسین بەلاتینی نووسییەوە. لە پاشان من و حاجی توفیق و فایق و مەحموود جەودەت و شێخ سەلام و منداڵەکانی شاگردی مەتبەعەی ریزکرد، لەبەر هەیوانی بەلەدیەی سلێمانی فۆتۆغرافی گرتین.

## شاعیرانی سلێمانی

### ١- گۆران - عەبدوڵلا کاتب

ناوی عەبدوڵلا بەگ کوڕی سلێمانی بەگ شاعرێکی زۆر بەرزە.

### ٢- حشمەت

ناوی شێخ قادری کوڕی شێخ عەبدولڕەحمان خەلکی گوندی[...] کە دوو سەعات لە شیمالی ڕۆژهەلاتی سلێمانیوە دوورە و لە پشت شاخی گۆیژە دایە. ئەو پیاوە شیعری زۆرن و بۆ خۆشی کاسب و پیشەگەر بووە و ئێستەش عەتاری دەکات.

### ٣- ناتیق

خەڵکی سلێمانییە، گەڕەکی کانی ئاسکان. کاسب بووە. ئێستە قۆلچی ئیستیهلاکە لە تەمەنی چل و پێنجساڵیدایە، شیعری بەکوردییە. ئەمەش نموونەیەکی شیعرەکانیەتی:

شەو بەدەردی داخی تۆوە تا سەحەر ئەتلێمەوە
هەر ئەڵێی خاری سەفا بەخشە بەسەفحەی جێمەوە

### ٤- میهری

مەرسیەکی ئیسماعیل حەقی بەگی بابان بەهەژدە شیعر، ساڵی ١٣٣٢ گوتوویەتی:

زمانی پیرەمەرد ئەمرۆ حەزینە ئیشی گریانە
شەو و ڕۆژ ئاهوو ناڵەی ڕەعدە ئەشکی چاوی بارانە

### ٥- بیمار

غەزەلێکی شەش شیعری ئەوم چاو پێکەوتووە، ئەمە سەرەتای غەزەلەکەیەتی:

وەک دوڕ و عەقیق نەخشە دوندان و لەبی ئاڵت
مسلی بەڕەزا پەخشە ئەگریجە لەسەر خاڵت

### ٦- شێخ ئیبراهیم حەفید

شیعری زۆرن.........

### ٧- شێخ نوری شێخ سالح

شێخ سالح کوڕی شێخ عەلی یەکەمین وەزیفەی باش کاتبی بەلەدیە بووە و لە پاشان چووە مالییە و ئێستە وەزیفەی کاتبی سێیەمی مەسرەفە لە قەلەم موحاسب.

### ٨- فكرى

شاعرێک بوو، بەڵام دوو غەزەلی ئەوم دیووە، ئەمە دوامینی شیعرێکین:

سـەد هەزار دەفـعـە بنازم بەم خـەیاڵی نازکـەت
ئافـەرین فکری لەگەڵ فکرت حـەقـیـقـەت ئافـەرین

ئەمەی دیکەش دوایی غەزەلەکەیەتی:

فـکری کـە تۆ روحت بکەیە پێـشکەشی سـاقی
فـەرقی چییـە بەو بەخـتـە لەگـەڵ حـاتمەکـەی تەی

### ٩- رەمزی

شاعیرێکی زۆر بەرزبووە، تەنها غەزەلێکی ئەوم دی و سەرەتای غەزەلەکەی ئەمەیە:

بەسـەر خـۆشی کـە بێـتـە سـەر نەخـۆشی
نـەخـــۆشی ڕەنـگە روحی چێ لـە خـــۆشی

ئەو غەزەلە شەش شیعرە.

### ١٠- فەتحی

غەزەلێکی ئەوم چاو پێکەوتووە، ئەمەش سەرەتای شیعرێکێتی:

دڵ لەبەر تەعـنەی رەقـیـبـان خـوێن دەبارێنێ بەتاو
چونکو مەعلوومە کە مەی راناگرێ شووشەی شکاو

### ١١- حەمدون

کوێر بوو، کە لە دایک بووە کوێر بووە. بەزرنگی و رەشیدی ناوبانگی بووە. دەنگخۆش بووە، شیعری گەلێک تەڕ و ئاوداری هەبووە. ڕۆژێک لە مەجلسێکا دانیشتووە، کوڕێکی چاکیش لەو مەجلسەدا بوو. کە دادەنیشێت بەئیدراک دەڵێت:

هەرچەندە کـە چاوم نییـە تەعـریفی قـەمـەر کـەم
ئەمما بەزەکـا مـومـکینە سـەمـعم بە بەسـەر کـەم

حـەمدون لە شیـعـرا زۆر بەبیـر و خەیاڵ بەرز بووە. بۆ کـوردستـان لە جـەنگی دووەمـدا قەسیدەیەکی زۆر باڵای هەیە، ئەمە یەکەمین شعیرێکێتی، کە گوتوویە:

ئـەم ڕۆژە چ ڕۆژێـکە کـە عـالـەم شـڵـەژاوە
هەر کـەس بە چ خـارێ جگەری قـیـمـەکـراوە

### ١٢- سەید ئەحمەد نەقیب

سەید ئەحمەد نەقیب لە ساداتی کانی کەوێ بووە. شیعرێکی بەمەرسیە بۆ شێخ سەعید حەفید کە لە موسڵ شەهیدکرا گوتوویەتی:

تاریخی وەفاتی ئەو شەهیدە کە پرسم لە حالی زار

جوابی منی مەلوولی بەمغفور (١٣٢٦ھ) ئەدایەوە

لە (مەلا نجم الدین)ەوە

### ١٣- محرم ئەفەندی

شاعیرێکی بەناوبانگ بووە. بەفارسی و تورکی شیعری هەیە کەمتر بەکوردی. هەموو وەزیفەی بەمەئموری تەلگراف بووە. بەمندالی تەحسیلی عیلم تەواو دەکات و لە پاشان دەچێتە سیاحەتی بۆخارا و هیندستان و دەگەڕێتەوە و ئەو سیاحەتەی بەمۆرچی و سەعات سازی بەرێی بردووە. لە پاشان هاتۆتەوە تەوێڵە لە لای شێخ عوسمانی سراجەدین تەریقەتی نەقشبەندی وەرگرتووە و بەسنعەت رای دەبوێرێت و لە تەمەنی شەست ساڵیدا دەبێتە مەئمووری تیل و لە تەمەنی سەد و بیست ساڵیدا، لە ساڵی ١٩٢٠دا وەفاتی کردووە.

.............................................................

* ئەم بابەتەی «حوزنی موکریانی» لە لایەن د. کوردستان موکریانی ئامادەکراوە و لە ژمارە (١٢٠)ی گۆڤاری «ڕۆشنبیری نوێ»ی ڕێکەوتی ساڵی ١٩٨٩دا بڵاوکراوەتەوە.

(ع. زەنگەنە)

**پاشکۆ ٢**

# شاری کۆیە

لە پاییزی ساڵی ١٩٣٥دا(*)

(*) ئەم بابەتە لە لایەن د. کوردستان موکریانی ئامادە کراوە و لە ژمارە ١٢١(گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ)دا بڵاوکراوەتەوە.

ع. زەنگەنە

# پێشەکی

لە ژمارە (١٢٠)ی کۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ)ی خۆشەویستدا بابەتێکی گرنگی مامۆستا حوزنی موکریانیم بڵاوکردەوە، کە سەبارەت بەشاری سلێمانی بوو لە ساڵی ١٩٣٤دا. بابەتی ئەم جارە دەربارەی شاری خنجیلانەی کۆیەیە کە مامۆستا حوزنی لە سەرەتای پایزی ساڵی ١٩٣٥دا ڕووی تێ کردووە و گەلێک باسی جۆراوجۆر و بەپێزی لە بارەی هونەری بیناکاری، باخ و کارێز و کانی و ڕێگاوبان و تەکیە و مزگەوتی ئەوسای کۆیەی تێدا تۆمار کردووە. هەروا چەشنی هەڵسوکەوت و جلوبەرگ و چەند بارێکی دی کۆمەڵایەتی خستۆتە ڕوو.

لەو شاعیرە ناودارانەی ئەوسا، کە لە کۆیەدا مامۆستا حوزنی چاوی پێ کەوتوون و گفتوگۆی لەگەڵدا کردوون. مامۆستا مەلا مستەفا عاسی بووە کە لە کۆتایی ئەم بابەتەدا بەسەرهات و چەند نموونەیەک لە هۆنراوەکانی، کە مامۆستا حوزنی لە خۆی وەرگرتووە نووسیومەتەوە.

ئەو پەڕاوەی ئەم باسانەی کویێی تێدا تۆمار کراوە پەڕپەڕ بووە و زەرد هەڵگەڕاوە و بەزەحمەت توانیم بابەتەکانی ڕێک بخەم. دەستنووسەکە لە نووسینی مامۆستا حوزنی نەمرە و وا دیارە هەر وەکو کەرەستەیەک بووە بۆ پرۆژەیەکی گەورەتر، بەڵام باری ناهەمواری مامۆستا حوزنی هیچ کاتێک یارمەتیدەر نەبووە، بۆ ئەوەی پێیدا بچێتەوە و چاپی بکات. بابەتەکە بەمەرەکەبی شین نووسراوەتەوە، بۆیە زۆر وشەی بەجۆرێک کاڵ بۆتەوە ناخوێندرێتەوە و هەر وشەیەکی بۆم ساخ نەبۆتەوە نیشانەی (؟) بۆ داناوە.

لەبەر گرنگی باسەکانی بابەتەکە نەمەویست ئەم دەستنووسە تەمەن پەنجا و چوار ساڵە کۆنتر بێت و زیاتر نەخوێندرێتەوە، بۆیە بەبێ دەسکاری بەرێنووسی ئەمڕۆم نووسیوە و باسەکانیم ڕێکخست و ئامادەی بڵاوکردنەوەم کرد بەو هیوایەی کەلێنێک لە هێندێک لایەنی بواری ڕۆشنبیری کۆیەی خۆشەویست پڕ بکاتەوە.

ئامادەکردنی: د. کوردستان موکریانی

## كۆی سنجاق

شاری كۆیێ شارێكی زۆر كۆنە و بەناوبانگە. جێگەیێكی زۆر خۆشە و بەئاو و باخچە و میوەیە لە نێوانی كێوی هەیبەت سوڵتان و كێوی باواجیدا هەڵكەوتووە. پێشی ڕوو بەدەشتە و زۆر خۆشە و كووچە و كۆڵانی باشی هەیە و دیواری خانووەكانی پتر بەبەرد و گەچ لە سەر دەستووری جوان دامەزراندراوە. لە تەرزی دیوار و خانوویدا زۆر وە كەركووك دەچێت. نیومال و حەوش و دەرگاوبانیان و ڕەوشتی ناوخۆ و دەستووری ژوور و دیوەكانیان گەلێك لە سابلاغی موكری دەكەوێتە بەرچاوان.

خانووبەرەكانی گەلێك خۆشن. حەوش و بانیان زۆر جوان و دەروازەیان بەرز و ناو دەرگانەیان پان و درێژ و بەسەكوێ دانیشتن و ڕاخەر لە سەر سەكۆكانی ناو دەرگانەكانیان وە ڕەوشتی سلێمانی دەچێت.

شكلی خواردن و سفرەدانان و بزووتنەوەی مەجلسیان لە سلێمانی نزیكە. ئەگەر چتێكی وێ نەچووی هەبێ، بێ دەنگی و ورد قسەكردنیانە لەسەر خواردن.

ماڵە گەورەكانیان پتری دوو حەوشەیان بەسەر یەكترەوە هەیە، یەك بۆ میوانان و دووەمیان بۆ ماڵ و منداڵیان. لە حەوشی دەرەوەدا كە هی میوانداریيە جێگەی ئەسپی سواری و ئاخووڕی لێیە.

ئەهالی كۆیێ زۆر میوان پەزێر و بەنان و خوانن. پتر میوانیان ڕەعییەت و ڕەنجبەر و كارپەزێرەكانی خۆیان، كەم و كورتێك لە عەشایرانی دیش میوانیان دەبێت.

ماڵە گەورەی كۆیێ دوو بنەماڵەی زۆر ناوداریان هەیە: یەكەمیان حەوێزی و دووەمیان غەفوورین. لەو هەردوو بنەماڵە زلە پیاوی زۆر گەورەیان لێ پەیدابوون. كە لە هاتوودا لێیان دەدوێم. بەتەرزێكی خۆم دیومە و بنەماڵەی ئەوانم پرسیار كردووە باسیان دەكەم.

كۆیێ پازدە مزگەوتی ئاوەدان و سێ مزگەوتی وێران و سێ تەكیەی ئاوەدان و سێی وێرانی ئەمڕۆكە تێدایە كە لە هاتوودا باسیان دەكەم. سێ حەمام و دوو قەیسەری زۆر گەورە و گەلێك دووكان و چایخانە و نادییێك و مەكتەبێك و سەرایەكی جوانی حكوومەت و پۆستە و تەلەگراف خانەیەك و دایرەی گومرگ و قشلەیەكی زۆر زلی لێیە.

كە من چوومە كۆیێ لە ئاوی حەمامۆكەوە ئاوێكی زۆر خاوێن لە لایەن قایمقام كەریم بەگ ڕەواندزی دەست پێ كرا و لە زەمانی ساڵح زەكی بەگ ساحێبقڕانزادەوە كێشراوەتە نێو شار و بەسەر ماڵاندا بڵاوكراوەتەوە. لە كەنار شار حەوزێكی زلی چەمەنتۆ بۆ ئاوی

بۆرییەکان کراوەتە ئەنبارەوە. ڕێگاییێکی ڕاست بۆ ئۆتۆمبیل دروست کراوە.

لە دەرێی شار چاوم بەگەلێک ئاش کەوت کە بەئاوی حەمامۆک دەگەڕا و لە کاردابوون و لەو ئاوەش گەلێک لە باخچەکان ئاودێری دەکران.

شاری کۆیێ لەپێشدا شوورەیەکی گەورە دەورەی شاری دابوو. ئێستە جگە لە بنچینەکەی نەماوە. بۆ شار چوار دەروازە هەبووە، یەکەمین دەروازەی «گەروە سۆرک» کەوتبووە قیبلەی شار ڕوو بەکەرکووک بووە؛ دووەم دەروازەی (ئاشان)، کە بۆ دۆڵی سماقلوو چووە؛ سێیەم خۆشناو کە بۆ خۆشناو و بتوێن چووە؛، چوارەم دەروازەی قەسابخانە ڕوو بەسلێمانی بووە.

بەچاوێکی یەکیەتی لێیان وردبینەوە بەئاوی دەستوور و خووی هەستان و دانیشتن و کردەوەیان کوردێکی خاوێن و دڵپاک و گیاندار و زیندوون، بەڵام لە بەدبەختی میللەت ئەگەرچی زۆر حەز لە ئازادی و میللەتپەروەری و وەتەنخواهی دەکەن، لە تەک یەکدیدا بەقین و ڕق و ناقۆڵان. ئەویش لە غیرەت و نەکێشانە، هەرچەند نەدەبوو وابن و بۆ یەکبوون کورتی و کەمییە.

بەرگی پیاوانی کۆیێ دوو تەرزن، پیاوە گەورەکانیان هەروەکو پیاوەکانی سابلاغ و سلێمانی کەوای درێژی سێ ئاتەگ و سەڵتە و عەبایە. پیاوە تازەپێگەیشتووەکانیان و لاوەکانیان، کە سەر بەدەستووری موکری پشتێنی زل و کەوا و کورتەک و مورداخانی و سەر و شەدەی زل و خەنجەر بەپشت و «سۆرانی» بەردراوەوەن.

بەرگی ژنیان لە بەرگی ژنی موکریان نەگۆڕدراوە، تەنها ئەمە نەبێ کە ژنەکانی موکری پشتێندی زل دەبەستن و کەوێی بچووک بەبەراوەژووی ژنانی سلێمانی و ڕەواندزن بەتەواوی شێوە و دەستووریان موکرییە و بڵباس.

کۆیێ چوار گەڕەکە: ١- بایز ئاغا، ٢- قەڵات، ٣- بەفر قەندیل، ٤- هەواو.

ژمارەی نفوسی ئەمڕۆ کە ٢٨ی مانگی ئەیلوول ١٩٣٥، ئەمەیە:

| | کوڕ | کچ | هەمووی |
|---|---|---|---|
| قەزای کۆیێ | ٢٦٥٩ | ٢٧٤٥ | ٥٧٩٧ |
| عەشایر | ٥٧٩٧ | ٥٤٧٩ | ١١٢٧٦ |

قایمقامی کۆیێ محەمەد ڕامز بەگ کوڕی عەبدوڵڵا سافی بەگ یەعقووبی کەرکووکییە، لە ماڵی ئەو میوان بووم، گەلێک بەنەوازش و موحتەرەم و زرینگ و زبان خۆش و کردەوە چاک و بێ زەرەر و مەنافعپەروەرم دیت. لەگەڵ خەڵکی کۆیێ زۆر هێمن و لەسەرخۆ و ڕەوشت چاک و بەئیدارەم بهیستەوە. چوار شەوی لێ میوان بووم هەرچەندە لە کردەوەی وردبوومەوە عەیبێک وەیا بەدخوویی و ناشایستییێکم لێ نەدیبوو.

ئەگەرچی لە پێش ئەودا کوردێکی خەڵکی سلێمانی کە ناوی عەبدولڕەحمان زەردەواڵە بووە لە کۆیێ وەکیلی قایمقام بووە لە حەقی کورداندا زۆر بەدڕەفتاری و ناپەسەندی کردووە و ئەزیەتی کوردپەرست و ورياکانی داوە، کوردەکانی تووشی چەند موشکیلات کردووە.

بەڵام محەمەد رامز بەگ لەگەڵ کورد خواهەکاندا بەچاکی و بەسەربەستی ئیدارە دەکات کوردەکانی لە هەموو چینێک ئازاد کردووە.

## مزگەوت و تەکیە و خانەقاکانی کۆیێ

سال

١٢٦٠ مزگەوتی گەورە کە حاجی بەکر ئاغا حەوێزی کردوویەتی.

١٢٨٠ مزگەوتی حاجی مەلا عومەر - کوڕی جەرجیس داروغە دروستی کردووە.

مزگەوتی پەلک - فەقێ جەرجیس.

مزگەوتی خادم - مەلا ئەسعەد خاد مولسجادە دروستی کردووە.

مزگەوتی حاجی مەحموود ئاغای غەفووری.

مزگەوتی جامی.

مزگەوتی منارە.

مزگەوتی بایزئاغا.

مزگەوتی موفتی.

مزگەوتی قەمیش.

مزگەوتی ڕەشە.

مزگەوتی حەتک.

مزگەوتی گەرموک.

مزگەوتی کونە جومعە.

مزگەوتی حاجی مەلا ئەسعەد، ئەوڕەحمان پاشای بابان دروستی کردووە.

ئەوانە ئەمڕۆکە هەموو ئاوەدانن و ئەمانەش هەموو وێرانن:

مزگەوتی بیرۆکە.

مزگەوتی قوشخانە.

مزگەوتی مەلا عومەر چاوشین.

مزگەوتی یاسین ئاغا.

**تەکیەی ئاوەدان:**

تەکیەی شێخ غەفوور تاڵەبانی.

تەکیەی شێخ کەریم بەرزنجی.

تەکیەی عەودەلان.

تەکیەی حەسەن ئاغا کوڕی مەحموود ئاغای غەفووری.

ئەمانە وێرانن:

تەکیەی ئیرانی.

تەکیەی رووتە.

خانەقای شێخ نەبی باویلی.

**مزگەوتی گەورە**

ساڵی ١٢٦٠ لەلایەن مەلا بەکر ئاغای کوڕی مەحموود ئاغای کوڕی حەوێز ئاغا دروست کراوە. بۆ خۆم کە چووم و چاوم پێیکەوت حەوشێکی زۆر گەورە و لە نێوەڕاستی حەوشەکەدا حەوزێکی ئاو لە شیمالی حەوش ریزە حوجرەیەکی فەقێیان و ئەیوانێکی درێژ و لە رۆژئاوایی حەوشەوە دەستە حوجرەیەک و ژوورێکی هەیە و هەیوانی مزگەوتەکە بەحەوت کەمەرە هاتۆتەوە. حەوشی مزگەوت دوو دەروازەی هەیە، یەک لە رۆژهەڵات، دووەم لە رۆژئاواوە.

لەسەر دەروازەی رۆژئاوایەوە لە بەردێکی مەڕمەڕی زل نووسراوە «باني هذا الجامع الشريف ملا أبوبكر بن محمد بن حويز آغا سنة ١٢٦٠».

لەسەر میحرابی لای رۆژئاوای هەیوانی مزگەوت نووسراوە:

تا گنبد این جامع اعلا شده برپا
صد نازکند کوی برین قبەی خضرا

لە دوای پێنج شیعری دیکەی فارسی ئەمەی خوارەوە نووسراوە:

طابع بشمر مهمل این بیت ویکی فرد
تأریخ وی نیست برین گنبد مینا

از همت ملا ابو بکر این مسجد ممتاز
در سال هزار و دوصد و شست شد انشا

لە میحرابی دووەم لای ڕۆژهەڵاتییەوە نووسراوە: «قد عمر هذا المسجد فی سنه ١٢٦٠ ابو بکر ابن محمد بن حویز رحمه الله».

لە دەروازەی ڕۆژهەڵاتی مزگەوت بەدەرەوە خانووێکی زۆر گەورە هەیە. سەرا و خانووبەرەی حاجی بەکر ئاغا کە لە مزگەوتەکەیەوە ئەمڕۆکە وێرانە و هەر دیوار و بەردەکانی ماون، ئەو وەتاخەی کە خۆی تێدا دانیشتووە چاوم پێکەوت. ژوورەوەی هەموو بەبەردی مەرمەڕی شین دامەزراوە و گومبەزە بەردەکە هەموو بەگوڵ و کەندەکاری ڕازاندراوەتەوە، لە سەر دەرگانەی دەرگاکەی لە بەردێکی زلی هەڵکەندووە و تائریخی ١٢٥٤ لێداوە، بەڵام گەلێک دووردرێژ نووسراوە. پێویستم نەدیت لێی بدوێم، بەڵام بەڕاستی ئەو بینایە شایانی پێداهەڵگوتن و جێگەی عیبرەتە.

لە حەوشی دەرەوەی کۆلەکە بەردی مەڕەمەڕەکانی هەیوانی قەسر و ژوورێکی قەسرەکەی ماوە. بەدڵێکی پڕ خوێن و چاوێکی گریانەوە تەماشای ژووری لای ڕۆژئاوای هەیوانەکەم کرد. ئەم شیعرە فارسیانەم کەوتە بەرچاو کە لە سەر بەردی دەرگانەیەکی بەخەتی فارسی زۆر قەشەنگ هەڵکەندراوە و نووسراوە و خوێندمەوە:

مبارک باددیاری قصر انور
که دهر از وی شده پر زینت و فر
بحر هر مصرع تأریخش اینست
که صدقی را گرد این قصر
بناه محمد أمین حویز زاده ١٢٧٣

وا دەردەکەوێت، کە ئەمین ئاغای ئەختەر لە دوای بابی ئەو قەسرەی ئاوەدان کردووە. بەڵام تاقی ئەیوانی سەرای حاجی بەکر ئاغا، کە بەمەرمەڕی شین و پەلەدار دروست کراوە

هەروەها لە هەوا ماوەتەوە.

حاجی بەکر ئاغا کوڕی محەمەد ئاغا کوڕی حەویز ئاغا شاعیرێکی زۆر گەورە بووە، تەخەلوسی شیعری «قاصد» بووە؛ دیوانێکی زۆر گەورەی فارسی هەیە.

## کێوەکانی کۆیێ

لە ڕۆژهەڵاتەوە هەڵکەوتووە، لە شیماڵەوە بەرۆژهەڵاتی شاردا ڕوو بەشەرقی جنووبی چیای هەیبەسوڵتان درێژەی بەستووە لە سەر زێی دەبڕێتەوە.

ڕۆژئاوای شار کێوی «باواجی»یە. ڕاستەوڕاست لە شیماڵەوە ڕوو بەڕۆژئاوا و ڕۆژئاوای جنووبی لە گرد و تەپە و شاخ(؟).

لە نزیک شارەوە گردی مامۆستا کەرەم و گردی کەکۆنە کە قەبرستانە و قەڵای لە سەرە.

## باغ و باخچە

لە سەرچاوەی کانی حەمامۆکەوە ڕوو بەجنووبی شەرقی و شەرق دێتە خوارێ کە بەدۆڵی ڕەزان ناوبانگی کردووە. هەموو باخ و باخچە و دار و درەختە. نزیک دوو سەعات ڕێگا دەکێشێت. هەموو بەئاوی ڕووباری کۆیێ ئاو دەدرێن.

داری هەنار و سێو و خۆخ و هەنجیر و بادام و زەیتوون و ڕەزی ترێی زۆر چاکی هەنە.

## کانیی حەمامۆک و کارێزی حاجی ئاغا

لە شیمالی شارەوە نزیک نیو سەعات دوور کانییەکە لەنێو باغ و باخچەیێکی زۆر دێتە دەرێ و بەکەڵکە. لە سەرچاوەی کانییەکە بۆڕی ئاوی تێگیراوە، بۆ شار دەبرێ.

جگە لەو کانییە و کارێزە ڕووبارێکی بچووکیش لەنێو باغەکاندا دەچێتە خوارێ. باخ و باخچەی کۆیێ پێ ئاودەدرێ و ئەهالی شار دەیخۆنەوە.

لەبەر ئەو کانی و ئاوە یەک لە دوای یەک هەتا دەگاتە کەنار شاری کۆیێ، نۆ ئاشی ئاو بەگێچ دامەزراوە.

ئاوی کارێز لە بن شاخێک دەردەکەوێت ڕوو بەجنووبی شەرقی دەچێتە خوار لە پاشان بەو ئاوە گەلێک ئەرازی و شینایی ئاو دەدرێت و بیستان و شیناوەرێکی قورسی لەبەر کراوە. لەو ئاوە ئیستیفادە گەلێکە. سەرچاوەی ئاوی حەمامۆک لە شارەوە تەخمینەن سەد فووت پتر بەرز دەبێت.

ئاوی کانی حەمامۆک لە پێشدا هەموو ئەهالی شار بۆ خواردنەوە بەکاریان دەبرد؛

ئەمڕۆکە کەمێکی خەڵکی شار لە ئاوی بۆڕی ئیستفادە دەکەن و گەڕەکێکی زلی هەروەکو جاران هەر ئاوی جۆگە دەخۆنەوە.

بۆڕی ئاو لە ساڵی ١٩٣٠دا کەریم بەگ ڕەواندزی قایمقام بوو دایمەزراند، لە دواییدا ساڵح زەکی بەگ ساحێبقران زادە تەواوی کرد.

لە دەری شار لە شیمالی ڕۆژئاواییەوە حەوزێکی زلی لە چیمەنتۆ بۆ ئاوی بۆڕی دامەزراندووە و لەو حەوزەوە بەبۆڕی بچووک بەسەر شاردا بڵاوکراوەتەوە.

## ڕێگا

ساڵح زەکی بەگ ساحێبقران زادە، لە ڕۆژئاوای شارەوە لە جنووب ڕوو بەشیمال ڕێگاییێکی جوانی بۆ ئۆتۆمبیل کێشا. بەپشت گەڕەکی کۆنە قەڵا بۆ نێو باخچەکانی بردووە کە بیباتە سەرچاوەی گەرمو؛ بەڵام تەواوی نەکردووە. لە دوایی لە کەنار ئەو ڕێگایەدا ئەم بەرەو بەر داری گرانبەها و کالیبتۆسی لێ چەقاندبوو. لە پاش چوونی ساڵح زەکی بەگ مدیری تەق تەق عەبدولڕەحمان زەردەواڵە، خەڵکی سلێمانی بووە بەوەکیلی قایمقام. هەموو دارەکانی وشک کرد و خەڵکەکەی هان دابوو کە شکایەت بکەن و ڕێگاکە تێک بدەن. ئەو ڕێگایە ئێستاش هەر بەناتەواوی ماوە.

کووچە و کۆڵانەکانی کۆیێ هەرچەند تەنگە، بەڵام زۆر خۆشە و دڵگوشایە، ئەگەر تەماشا بکرێ.

## مایەی کوژتاری ئاغایانی غەفووری
## لە کۆیێ و تێکچوونی بەبە لە کۆیێ

عوسمان بەگ کوڕی مەحموود پاشای بەبە لە کۆیێ حاکم بوو، ژنی ئەو چووبووە حەمام، ئاوڕەحمان ئاغای غەفووری لەسەر ڕێی ڕادەوەستێ و بەژنەکە دەڵێت: «ئەم شەوە نۆبەتی جێی منە». ژنەکە چووە لای عوسمان بەگ پێی گوت یان تۆ مێردم بە، یان ئاوڕەحمان ئاغا.

لەسەر ئەوە عوسمان بەگ ڕکی هەستا و ئاغاکان چوون لە قەڵا پەستاوتران. ئەحمەد زەنگەنە چۆلەکەیەکی لە باغەڵی ناو و چوو بۆ ئاغاکان سوێندی خوارد کە هەتا گییان لەو بەدەنەدا بێت، ئێوە تووشی هیچ نابن. ئاغاکان بەوە لە قەڵا دەرکەوتن لە گردی سیوکە هەموویان کوژتن.

ئەوانە بوونە مایەی تێکدانی حکوومەتی بەبە لە کۆیێ و لە ئاغایانی غەفووری جگە لە منداڵی بچووک کەسێکیان لێ دەرنەچوو. ئەوانەی رزگاربوون، هەڵاتن پەنایان بردە لای میری رەواندز میر محەمەد بەگی گەورە کە ئەو دەمە لە هەولێر بوو. هانیان دا کە بچێتە سەر کۆیێ و بیگرێت. مایەی مەزبەتەی کۆیەکان بۆ بردنی میر بۆ کۆیێ ئەوان بوون.

تەئریخی مەوتی کچی حاجی بەکر ئاغا ژنی حاجی مەلا عەبدوڵلا. کەلامی حاجی مەلا عەبدوڵلا.

هەست تاریخ مەوت این دلدار

بی کەم و بیش قەول یا غەفار

١٢٨١

## بەیازێکی قەدیم

لە بەیازێکی قەدیمی حاجی ئەمین ئاغای حەویزی زادەی کۆیێ وەرگیراوە:

| | ساڵ (کۆچی) |
|---|---|
| شکانی سلێمان پاشای بابان......... | ١١١٠ |
| شکانی بەکر بەگی بابان (بەکرەسوور)......... | ١١٢٧ |
| تالانی بانە بەدەستی حەسەن بەگی بابان......... | ١١٤٦ |
| هەڵاتنی حەسەن عەلی خان لە مەریوان......... | ١١٦٤ |
| کوشتنی حەسەن عەلی خان لە مەریوان......... | ١١٦٤ |
| کوشتنی محەمەد خان......... | ١١٦٤ |
| کوشتنی عوسمان پاشای بابان......... | ١١٦٤ |
| کوشتنی سەلیم پاشای بابان......... | ١١٧١ |
| کوشتنی سەعید بەگ برای سەلیم پاشا......... | ١١٧٢ |
| کوشتنی سلێمان پاشای بابان......... | ١١٧٨ |
| سوتانی قەسەبەی بانە......... | ١١٧٦ |
| هاتنی شێخ عەلی خان زەندی موکری......... | ١١٧٢ |
| شکانی محەمەد پاشای بابان و عەلی مورادخان......... | ١١٨٨ |

هاتنی نەسروڵلای میرزا......... ١١٥٨

مردنی ئەحمەد پاشای بابان......... ١١٩٢

کوشتنی محەمەد پاشا و عومەر پاشای والی بەغدا......... ١١٩٤

بەندکردن و گرفتاری ئەحمەد پاشای بابان بەدەست محەمەد پاشای بابان...... ١١٨٧

هاتنی سلێمان پاشای وەزیر بۆ مەحموود پاشای بابان ......... ١١٩٦

کوشتنی مەحموود پاشای بابان......... ١١٩٧

کوشتنی عەباسی قولی خان بەدەستی عوسمان پاشا کوڕی مەحموود پاشای بابان............ ١١٩٨

مردنی خالید پاشای بابان لە مووسڵ......... ١١٥٦

شکانی عەلی موراد خانی زەند......... ١١٨٥

هاتنی تەقیّ خانی زەند بۆ کۆیێ......... ١١٨١

چوونی سلێمان پاشای والی بەغدا بۆ سەر تەیموور پاشای مللی......... ١٢٠٥

کوشتنی محەمەد خان......... ١٢١١

لەسەر تەخت دانیشتنی عەبدولڕەحمان پاشای بابان......... ١٢٠٤

## حەمە ئاغای بەناوبانگی کۆیێ

ساڵی ١٢٧٢ لە دەربەند حاکم بوو. لە دوای ئەوە مایەوە، هەتا کێشەیان بەسەرهات. شەڕەکەی لەگەڵ هەیتەکاندا ساڵی ١٢٧٧ بوو کە لەشکری هەیتەی بەبە کەوتنە سەری و برینداریان کرد. ئیسماعیل ئاغای برای حەمە ئاغا و ئیسماعیل ئاغای هەیتەباشی کوژران. حەمە ئاغا پازدە ساڵ لە بەغدا حەپس بوو، لە پێشدا بەئیعدام حوکم درا، لە پاشان کرا بەموئەبەد، لە دواییدا پازدە ساڵ.

لەو شەڕەدا ڕەسووڵ ئاغا و مەعروف ئاغای حاکمی دەربەند گیران. بیست و پێنج ساڵ لە بەندا مانەوە. هەر یەکێ پێنج ساڵ مانەوە، بەڵام حەمە ئاغا پازدە ساڵ ماوە. لە دوای ئەوە، کە لە بەند رزگار بوو، ساڵی ١٣٠٧ لە (؟) قایمقام بوو.

لە حەربی ڕووسدا، بەغدا و بەسرە کەوتبووە دەست ئینگلیز. حکوومەتی تورک زۆریان لە حەمە ئاغا کرد کە بچێتە کۆمەگی تورکان و بچێتە سەر ڕووس و بچێتە ڕەواندز. چۆن لە نەتیجەی شەڕدا لە بڕی چاکەی حەمە ئاغا تورک ناردیان لە کۆیێ تاهیر ئاغای کوڕی

حاجی مستەفا ئاغا لە «شیوان شوک» سدیق بەگ کوژتی و ئەنباری حەمە ئاغاشی تالآن کرد.

مانگی کانوونی دووەم حەمە ئاغا لە ساڵی ۱۹۱۸ و هەتا ۱۹۲۰ حاکمی کۆیێ بوو. مەلا حەویز ئاغای برازای بۆوە مدیری ناحیەی تەق تەق هەتا ساڵی ۱۹۲۰. حەمە ئاغا لە ساڵی ۱۹۲۰دا مرد (۱۳۳۸ه).

مردووەکانی ئاغایانی غەفووری لە «من» (قەبرستانی خۆیان)، کە لە دامێنی قەڵا لە سەر گردێکە ناژراون. قەبری حەمە ئاغاش لەوێیە.

## مەلا مستەفا عاسی

سەربهوردی خۆی، کە لە خوارەوە لە خۆیم پرسیوە، نووسیمەوە:

لە ساڵی ۱۳۱۵ هیجری لە دێی «تەلان» لە ناحییەی سورداش لە دایک بووە. لە لای حاجی مەلا رەسوولی باوکی لە پاشان لە «سەرگەڵوو» لە لای حاجی مەلا ئەحمەد سەرگەڵووی خوێندووە. لە سلێمانی لە مزگەوتی حاجی ئەحان خوێندوویەتی. لە دوای ئەوە دەستی لە خوێندن هەڵگرت، چووە دێی تەلان کە نیشتمان و زێدی بوو، بەمەلایەتی ئاوایی دانیشت و خەریکی مەلایەتی بوو. لە پاشان چووە «سارتکە»ی ناحیەی خەزران بوو بەمەلا چووە کۆیێ لەگەڵ کاسبی و بازرگانی خەریک بووە، لە پاشان چۆتە بانە گولان بوو بەمەلا لەوێوە لە شیواشۆک مەلایەتی کردووە لەوێ چووەتەوە کۆیێ بۆتە کاسب، دوکانی دانا و ئێستە خەریکی کاسبییە کە چاوم پێی کەوت.

ئەمە غەزەلێکی نیشتمانییەتی کە دەڵێت:

بەسیەتی ئەی قەومی کوردان با وەتەن نەبڕێتەوە
ئاگری ئاساری میللەت چاک وەیە نەکوژێتەوە
بۆ خەزێنەی عیلم و عیرفان جەهلە ڕێگای گرتووە
دەرکی دیوانی سیناعەت بۆ لە کورد نەکرێتەوە؟
روحی دونیا خاکی ئێمە باعسی ژینی هەموو
چاکە ماددەی عیلم و عیرفان با لەوێش بکرێتەوە
خۆڵەمێشی خاکی ئێمە بۆتە ئکسیری زەمین
حەیفە با ئەو مەعدەنانە قەت لە کورد نەشرێتەوە

با چوغەی شمشێری غیرەت وا بەدەستی ئێمەوە
سەد ئەمان ئەی قەوم و میللەت با لە دەست نەکرێتەوە
خاکی ئێمە ئەی رەفیقان دار و بەردی جەوهەرە
جێی ژیانە وەک بەهەشتە با بەکەس نەدرێتەوە
هەر دوعا گۆتانە «عاصی» بۆ وەتەن وەک جان فیدا
شیعری خۆشتان بۆ دەنووسێ لاوەکان دەکرێتەوە

عاسی شیعری عیشقبازی و وەتەنی زۆرە. دیوانێکی باشی هەیە بەدەستی خۆی نووسیوەتەوە کە من لێم وەرگرت ئەم چەند شیعرەم لەبەر نووسیوە.

شاری کۆیە

فەخری مولکی کورد و رومە تاجی سەرشانە کۆ
بێ شکە ئیمڕۆ نموونەی جەنەتی عەدنانە کۆ
بای نەسیمی سوبح و چەهچەهەی بولبول کەوی
دڵ دەبێتە شاهیدی ئەو عەینی هەر رزوانە کۆ
کێوەکانی دەوری شاری وەک بەهەشت رازانەوە
تێ بگە ئەو نامەقامی وەک جەبەل لوبنانە کۆ
چونکە سایەی سوبح کێوی هەیبەت سوڵتانی هەیە
بۆ ئێواران مەقامی شەوکەتی شاهانە کۆ
جەنەتێکە هاتە دونیا (؟) گەری لێ بکەی
ساحێبی قەسر و قسوورە و حور و هەم غیلمانە کۆ
بەم سەراپەردە و عرووسی و دیوەخانەی شێرەکان
سوێند ئەخۆی خوبایی تەختی دەوڵەتی یۆنانە کۆ
چونکە هەم ناوی جەنابی فەخری عالەم لێرەیە
مەرکەزی زانین و عیرفان و هەموو دەرمانە کۆ
بۆ سەخاوەت حاتەمی تەی بۆتە شاگردی ئەوێ
بۆ شەجاعەت دیارە «عاصی» جێگەیی شێرانە کۆ

# پاشکۆ ٣

# چوونە هەولێرم و مەتبەعە دامەزراندنم و جەریدەی ڕووناکی دەرخستنم لە هەولێر(*)

(*) ئەم بابەتە لە لایەن د. کوردستان موکریانی ئامادە کراوە و لە ل١٧-٢٩ی گۆڤاری هەولێر لە ڕێکەوتی زستانی ٢٠٠١دا بەناونیشانی: (چۆنیەتی دامەزراندنی چاپخانەی کوردستان لە هەولێر) بڵاوکراوەتەوە.

ع. زەنگنە

## پێشەکییەکی کورت

وەنەبێ دامەزراندنی چاپخانەی کوردستان (١٩٣٥/١٠/٨) لە هەولێردا کە ئەوسا بەهەشتی مامم نێوی «زاری کرمانجی» لێنابوو کارێکی وا سانا بووبێت. هەروەکو لە بیرەوەرییەکانی بەردەستدا دیارە، داماو (حوسێن حوزنی)ی موکریانی لەنێو ئەم بیرەوەرییانەدا زۆر لایەنی کۆمەڵایەتی، ڕامیاری، مێژوویی، ڕۆشنبیری و... سەردەمی خۆی کە بەندیواری ڕاستەوخۆی بەجڤاتی کورد و بەچارەنووسێوەی هەیە خستۆتە ڕوو. هەروا ڕۆڵی ڕاستەوخۆ و تیانی کارگێڕانی دەستڕۆیشتووی کوردی هەفتا ساڵێک لەمەوبەر و هەڵوێستیان بەرامبەر بەڕۆشنبیری کوردی لە ناوچەی سۆراندا -کە ئەوسا ئاڵاکەی بەدەست حوزنی موکریانییەوە بووە -ڕاستگۆیانە، بابەتانە و زانایانە بەرجەستە کردووە.

ئەگەر لە دونیادا نووسینەوەی بیرەوەری و بڵاوکردنەوەی ببێتە ئامرازی بەیەکەوە گەیاندنی نەوەی یەک لە دوای یەکدا، ئەوا بۆ ئێمەی کورد، هێژ گەلێک لەوە پێویستتر و بەنرخترە؛ چونکە زۆرجار ڕووداوانی کۆمەڵایەتی و مێژوویی و... لە لامان دووپات دەبێتەوە. دووبارەبوونەوەشی هەر لە لایەن ئەو کەسانەوە ڕوودەدات، کە ئاگاداری ڕابردوومان نین و مێژوومان ناخوێننەوە.

ئەگەرچی ماوەیەکە ئەم بیرەوەرییانەی مامم ئامادەی چاپ کردووە، بەڵام نەمدەویست بەم جۆرەی بەردەست بڵاویان بکەمەوە؛ چونکە هەندێک ڕووداو و کەس هەن، پێویستیان بەڕوونکردنەوە هەیە و ئەمەش لە دەرەوەی وڵاتدا بۆم نەدەکرا. ئەو ماوە کورتەی کە بۆ وڵات گەڕاومەتەوە و پڕ کاریم و پەلەکردنی گۆڤاری هەولێر بۆ بڵاوکردنەوەی، بوونە هۆی خستنە بەردەستی ئێوەی هێژا بەبێ پەراوێز.

ئامادەکردنی: د. کوردستان موکریانی

لە ڕواندزدا گۆشەی تەنهاییم گرتبوو، لەماڵی خۆم دانیشتبووم. لەگەڵ تەماشاکردنی کتێب و تەئلیفات خەریک بووم. دەستی بێتەمایم لەسەر دڵی قەناعەت و سەبات دانابوو، چاوم لە دەرگای خودا بڕیبوو؛ چونکە ساڵی پێشتر لە حوزەیرانەوە هەتا کانوون لە سلێمانی خەریکی لابردنی توهمەت و بەڵا و دامەزراندنی مەتبەعەی بەلەدیە و دەرهێنانی ڕۆژنامەی «ژیان»ی کوردی بووم. ڕووت [و] پەرێشان گەڕابوومەوە ڕواندز و زستانی ساردم بەئاه وناڵەوە ڕابوارد. هەناسە سارد و بێ دەسەڵات کەوتبوومەوە. چاوەنواڕی

دەردی بێ سامانێکی دیکەم دەکرد کە دەستی نەیاران هەموو دەمێ خەریکی بەڵا بۆ سازکردنم بوو.

زستان بەهەر جۆرێک بوو چوو، بەهار پەیدابوو. گەورەکانی کورسی پەرستی میللەتفرۆش، بەهۆی هاندانی یاسین هاشمی ڕەئیس وزەرای عیراق و ڕەشید عالی بەگ گەیلانی و وەزیری داخلیەی عیراق هاتبوونە کوردستان کە میللەت بخەڵەتێنن (وەکو درێژە بەسەربهوردیان درا) داوی خۆیان داناوە، تەنها منیان پێ نەگیرا و گەڕانەوە هەولێر. چونکو من زۆ چاک شارەزای یاسین هاشمی و ڕەشید عالی بووم، کە چەندە ناحەزی میللەتی کورد بوون و چەند لەقەیان لە ئیشوکاری کوردایەتی دابوو و بۆ ژێرکەوتنی میللەتی کورد لە چی تەقەلایەکدا بوون. لەبەر ئەوە هیچ باوەڕم بەو گەورە کوردانە نەهێنا و کەنارگیر مامەوە هەروەکو لێی دوام.

ئەحمەد بەگ کوڕی تەوفیق بەگ کوردی سلێمانی، کە بەلاوێکی میللەتپەرست، کورد و نیشتمانخواهێکی غیرەتمەندی نواندبوو، لە کوردپەرستیدا زۆر بەرز نیشاندرابوو. یەکێک لە نموونەی میللەتپەرستی و نیشتمانخواهی و بەرزکردنی زانین و فێربوونی کوردایەتی ئەمە بوو کە لە سلێمانییەوە گەڕامەوە ڕواندز، وەکو گوتمان دەست لەسەر دەست و کیسە بەتاڵ و پەرێشان زستانم بەزستانێکی سەخت لەسەر دەڕۆیی. دەستەنگی و نەبوونی گەیشتبووە پایەکی وا، ئاواتەخوازی مەرگی کردبووم. ڕۆژێک لە وێرانە زاری خانووە کاولەکەمدا نەخۆش و پڕدەرد و خەم لەسەر ڕاخەری بێماری کەوتووم و سەرینی دەرد و کەدەرم ناوەتە ژێر سەرم، لێفەی عەیب و عارپۆشم لە پێش چاوی نەیاران بەسەر خۆمدا داداوە، لە ژێر باری نەبوونی و پەرێشانیدا دەناڵم و دووکەڵی هەناسەم چووەتە ئاسمان. لە ماڵمدا جگە لە دووکەڵی ئاخوداخ دووکەڵێک بڵند نابێت و لە چزەی جەرگی برژاوم بۆ چرووکێک دەرناکەوێ. لە پڕێکدا شورتەیەکی عیراقی هاتە پێش دەرگاکە و خوازتمیە دەرەوە. گوتم نەخۆشم و کەوتووم، ناتوانم بجووڵێمەوە، با بێتە ژوور بزانم چی دەوێت.

بەتکا و خواهشت و پاڕانەوەی خزمەتکارەکەم شورتە هاتە ژوور، چاوی پێمکەوت نەخۆشم زۆر دڵگیر بوو. داماو ڕاوەستا و وردبۆوە، کە بەو زستانە چروسکەی ئاگر نییە ژوورێکی سڕ و سارد و تاریک، لە ژێر لێفەدا کەوتووم، لە ڕەنگ و ڕووم تێگەیشت و باوەڕی هێنا کە نەخۆشم.

ئەوجا لێم پرسی: خێربێت و چی دەفەرموویت؟ گوتی: مەئمووری مەرکەزی شورتەی ڕواندز تۆی ویستووە و دەبێت بچیت و بیبینیت. گوتم: باشە با بێمەوە سەرەخۆم، دێمە

لای. کابرا بەشەرمێکەوە لێوی بزاوت و ڕاوەستا، زانیم دەبێت هەر بچم، بەڵام بێ هێزم و توانای بزووتنەوەم نییە، چۆکم دەلەرزێت و سەرم گرانە ناچار دەستیان گرتم و هەستامە سەرخۆم و بەرگم پۆشی و گۆچانێکم بەدەستەوە گرت و لەسەرخۆ و هێواش چوومە سەراو. پۆلیس لە پشتەوەمە چاوەدێریم دەکات.

بەدڵەکوتە دەڕۆم و کەوتوومە ئەندێشەوە: دەبێت گوناهم چی بێت؟ بەم نەخۆشی و ناسازییە چییان لێم دەوێت؟ دەبێت بەئەزیەت و ئازاردانم چ گەورەیەک بەرز بکەن؟ یان معاشی کام گەورەم پێ زیاد دەکەن وەیان کێ سەردەخەن؟ بەم [لێک] دانەوەیە دەڕۆم، هەتا گەیمە سەرا. نزیک چەند جارێک بۆی دانیشتم، ئەوجا توانیومە بگەمێ. چوومە لای مەئمووری مەرکەزی شورتە، دانیشتم. کەمێک هاتمەوە سەرەخۆ، هەناسەیەکم هاتەوەبەر. ئەوجا مەئمووری مەرکەز ئەمرێکی وەزارەتی داخلییەی نیشاندام، کە دەڵێت:

«بینا لەسەر تەحریری ڕەسمی ئەحمەد بەگ تەوفیق بەگ موتەسەڕیفی لیوای سلێمانی. حوسێن حوزنی، کە لە سلێمانی خەریکی نەشری ڕۆژنامەی ژیان بوو، شیعر و غەزەلیاتی ئەحمەد بەگ کوڕی فەتاح بەگ ساحێبقران زادەی کۆکردۆتەوە و کردوویەتە دیوان و کتێب و لەگەڵ خۆی بردوویەتەوە ڕواندز کە نەشری بکات. لێی وەردەگرن و بۆ ئەم وەزارەتە (وەزارەتی داخلیە)ی دەنێرن؛ چونکە ئەو دیوانە موخالیفی قانوونی عیراقیە و نابێت نەشر بکرێت. لە هەر جێگایەک بەدەست هەر کەسێکەوە بدیترێت موسادەرە دەکرێت».

بەم جۆرە ئەمرێکی دوورودرێژ نووسراوە و منیان پێ تەنگەتاو کرد. گوتم: ئەمە ڕاست نییە و نەبووە؛ هەتا سوێندیان دام و سەنەدیان لێ ئەستاندم کە چتی وانەبووە و نابێت گەلێک ئەزیەت و ئازاردرام. ئەگەرچی لە سلێمانی ئەو دیوانە نزیک شازدە نوسخەی خەتی و دەستنووسم چاوپێکەوت، هیچ پرسیاریان لێ نەکرا تەنها من نەبێت.

کە لە سلێمانی بووم، هەمیشە هاتوچوونی ئەحمەد بەگم دەکرد و زۆرم خۆش دەویست و پێی سەربەرزبووم کە کوردێکی وا مێشک ڕوون و گەورە لە سلێمانی موتەسەڕیفە. بەڵام کە لێی وردبوومەوە کەوتمە ئەندێشە و هەروەکو لە کتێبی «بۆچی چوومە سلێمانی» بەدرێژی لێی دواوم، دووبارەکردنەوەی لێرەدا بەپێویستم نەزانی. بەڵام کە ئەمرەکەی وەزارەتی داخلیەم چاوپێکەوت لە دایرەی شورتە، کە گەڕامەوە قاقەزێکی دوورودرێژم بۆ ئەحمەد بەگ نووسی و ئەم دوو کەلیمەیەی تێدا نووسرا بوو دووبارەی دەکەمەوە، کە گوتبووم:

*«من وەکو بولبولەکەم بەسەرهات کە لە سەرەتای بەهارەوە هەتا نزیک زستان لەم چڵە*

و چڵەدا بەئاواز خوانیو بەگوڵ هەڵگرتندا بەسەری برد. کە بەفر داروەدەوەن و کێو و دەشتی پڕ کرد، بولبول لە برسان گێژبوو، بەبیری هاتەوە کە لە هاویندا مێروستانێک لە ژێر ئەم دارەدا کوشەوەی دەکرد؛ پەنای بۆ ببەم بەڵکم دانەیەکم بداتێ لە مەرگ ڕزگارم بکات. کە چووە ژێر دارەکە بانگی لە دراوسێیە پڕ کوشەوەکەی کرد. مێروو دەرکەوت، بولبول سکاڵای دڵی خۆی خستە پێش. مێروو بەسەرزەنشتەوە دەنکە گەنمێکی دایە و گوتی: ئەگەر وەکو من ڕۆژێکی دانەیەکت پێکەوەنابایە» ، ئەمڕۆ دەستی نەبوونیت بۆ من درێژ نەدەکرد بولبول بەدڵشکاوی و هەناسە ساردییەوە فڕی و چووە سەرچڵەکە، باشوویەک هاتوو تێی ڕۆهات و خواردی. منیش وام بەسەر هات؛ بەئاه و ناڵەوە دەژیام و خۆم دڵخۆشی خۆم دەداوە و بەئومێد ڕامدەبوارد. کە شورتەیەکی وەکو باشوو تێم ڕۆهات. بەو جۆرە دڵشکاو و بریندار ببووم».

کە بیستم ئەحمەد بەگ بوو بەموتەسەڕیفی هەولێر و دەستی بەفەرمانڕوایی کرد لە لیوادا. هەر کەس بەنووسین و تەلەگراف بەخێرهاتنیان دەکرد و چوونە پێشوازی بۆ بەخێرهاتنکردنی. من وەکو کەسێک نەناس و نەشارەزا بێ، بێدەنگی و گۆشەگیریم کردە پیشە.

چەندێک بەسەرچوو خۆم لە ماڵ پەستاوت و دەرنەچووم. قایمقامی ڕواندز دوو سێ جار پێی گوتم، کە ئەحمەد بەگ هاتووە؛ خۆم ناشی کرد، هەتا ڕۆژێک هاتە ڕواندز لە ماڵی قایمقام موراد بەگ مێوان بوو. ناردیە دووم. کە چووم زەینەلعابدین ناو مەنسووبێکی سەید تەها لە لای بوو، دانیشتبوون. موتەسەڕیف گوتی: ئێستە باسی ئێوەم دەکرد، ئەمە چەند مانگە هاتوومە لیواکەتان هیچ ئێوەم نەدیوە. گوتم: من ئێستەش هەر نەخۆشی سلێمانیم چاک نەبوومەوە کە بتوانم ئاواتمەندی خۆمتان پێشکەش بکەم، لەبەرئەوە ببەخشن.

تومەز لە پێش چووندا گفتوگۆ کرابوو. مەرج بەسترابوو کە دەبێت ڕۆژنامەیەک دەرخەم و زەینەلعابدین ئەفەندی کوڕی خاکی ئەفەندی ببێتە مودیر مەسئوولم گوتم: ئەمەش وەکو چووینە سلێمانیمە، بەوە... نەدا. زۆریان لێ کردم؛ ئەمنێکی ستەمزەدەی گێژی دەستی ئیستیبداد، هیچ هێزی چەپۆڵکەیەکی دیکەم نییە، ئازار و ئەزیەتێکی لە سلێمانی بەسەرم هات و پەرێشانی و نەبوونێکی تووشم بوو، بۆ گۆڕەوشارم بەسە. ئەحمەد بەگ بەزۆر و خواهیشت لەگەڵ خۆی بردمیە هەولێر. لەگەڵ زەینەلعابدین ئەفەندی چەند ڕۆژێک مابنەوە.

ڕۆژی دووشەممە ٢٥ی مایسی ١٩٣٥ (٢١ی سەفەری ١٣٥٣) عەریزە و ئیستیدعامان پێکەوە ساز کرد، بۆ ئیمتیازی ڕۆژنامەیەکی هەفتەی دووجار بەناوی «سۆران» خوازی دامانە موتەسەریف. ئەوراق کەوتە موعامەلەوە، بەڵام یاری و گەمەیەکم لە ئیشەکەدا دەهاتە پێش چاو، بۆم ئاشکرا نەدەکراو مەبەس چی بوو تێ نەدەگەیشتم.

ئەوراق خوازتنی ئیمتیازی ڕۆژنامەکە هاتبووە پایان، سێ چوار مەئموورانی هەولێر کە خەڵکی سلێمانی و مەنسووبی موتەسەریف بوون، بەوەرەقە ئاگاداریان کردم کە زەینەلعابدین نەبێتە مودیری ئەم ڕۆژنامەیە باشە. مەبەس؟ نازانم. بۆچی لەوەپێش ئەحمەد بەگ بەزۆر کردمیە هاوەڵی و ئێستە چی ڕووی داوە؟ نازانم. بەڵێ هەرچەندە مەبەس و ئامانجی موتەسەریف و مەئموورەکانم لێ ئاشکرا نەبوو، بەڵام هێندە تێگەیشتم کە ئەو کارە سەرناگرێت.

ئەگەرچی یەک دوو مانگ بێ هوودە لە هەولێر تووشی مەسرەف و ئەزیەت بووم، لە ڕواندز عایلەم بەپەرێشانی بەجێهێشتبوو. ڕۆژێک لە دایرە چوومە لای موتەسەریف کە مەبەس لە هاتنم و نەگەیشتنە ئارەزووم دەبێت مایەی چتێکی قانوونی بێت، وە یان سەعادەت مەئابتان لەوە پەشیمان بوونەوە. فەرموویان کە بەدڵ حەز دەکەم و وەزارەتی داخلیەش دەیەوێت ئیمتیازتان بداتێ، بەڵام شرووتی قانوونی لە ئێوەدا کافی نییە. گوتم چۆن؟ گوتی: دامەزراندنی مەتبەعە دەبێت خاوەنەکەی لە مەدارسی عالیە مەئزوون بێت.

ناچار گەڕامەوە تێکۆشام قانوونی مەتابع کە لە دەوری عوسمانییەوە مابوو لە عیراقدا بەکار دەبرا، پەیدام کرد و بردمە لای کە نووسراوە بۆ ئەو کەسە دەیەوێت مەتبەعەیەک لە جێگایەک دامەزرێنێت، پێویستە بەیانی دامەزراندن و ناوی مەتبەعەکە بداتە مەئمووری ئیدارەی مەرکەزی ئەو جێگایە؛ لەوە پتر چیدیکە نەبوو.

ئەوجا گوتی: ئێوە لەگەڵ زەینەلعابدین پێکهاتوون. گوتم: بەڵێ، ئێوە منتان لەگەڵ ڕێکخست. بەڵام ئەحمەد خواجە ئەفەندی و حیکمەت ئەمین پێیان گوتم وا بەچاک دەزانین کە زەینەلعابدین نەکەی بەهاوەڵی خۆت. منیش قسەکانی ئەوانم بەهی ئێوە زانی، دەمەویست عەرزتان بکەم. گوتی: منیش بەباشی نازانم. بۆچی؟ بێ ئەسباب مایەوە.

لە دوای گەلێک گفتوگۆ لە دایرە دەرکەوتم. گوتم کە بگەڕێمەوە ڕواندز دەست لەم کێشە و سەرئێشە بەردەم. کەوتمە ئەندێشەی خەیاڵەوە؛ یەک دوو ڕۆژ وەک گێژ مامەوە؛ دەسووڕامەوە. یەکێک لە بنەماڵە بەناوبانگەکانی هەولێر، لاوێکی تازە پێگەیشتووی لە حقووق مەئزوون تەقەلای دابوو ئیمتیازی ڕۆژنامەیەک وەرگرێت مابۆوە. هاتە لام پێی

گوتم: ئەگەر لەگەڵ من ڕێککەویت، دەبمە مودیری مەسئوولی ئێوە. بەمەرجی ئەوە پێکهاتین کە ئەو تەنها هەر ناوی مودیری مەسئوولی لەسەر بێت، تێکەڵ بەهیچ ئیشوکارێکی موجەلە و مەتبەعە نەبێت. لەسەر ئەو پەیمانە چوومە لای موتەسەڕیف و پەسندی کرد، بەمەرجی ئەوە کە مەتبەعەکەی ڕواندز بێنمە هەولێر. منیش نە لە دڵ بەزمان قبووڵم کرد.

سەرەتای حوزەیرانی ١٩٣٥ عەرز و حاڵی ئیمتیازی موجەلەی «ڕووناکی»م دا. ڕۆژی ١٨ی حوزەیران ڕەقەم ٤٤١٥ تەئکیدی موتەسەڕیفی هەولێر بۆ وەزارەتی داخلیە لە خسووس موجەلەی «ڕووناکی»یەوە درا بەوەزارەت. وەختێک ناوی مەتبەعە هێنان بۆ هەولێر کرا، وایانزانی کە لەبیرم چۆتەوە. زۆرباش و بنجوبناوان دوامینی مەبەسیان کەوتم کە لە سلێمانیش ئەو تەکلیفەم بەتوند لێ کرابوو. ئەمە داوێک بوو لەوەپێش داندرابۆوە، دەویسترا ئەو مەتبەعە لە ڕواندز هەڵقەندرێت، بەڵام زۆر بەنەرمی و لەسەرخۆیی؛ من ناچار بکەن بەئارەزووی خۆم بیگوێزمەوە. لەوە زۆر چاک ئاگادار ببووم. لەسەر ئەوە پەیمانی دا کە بەهەموو هێزییەوە یارمەتی خۆم و مەتبەعە و موجەلەکەم بدات.

لەسەر ئەو پەیمانە من و شیت مستەفای موحامی خەڵکی هەولێر ڕێککەوتین بەمەرجی ئەمە ئەو تەنها مودیری مەسئوول بێت و تێکەڵ بەهیچ ئیشوکارێکی موجەلە و مەتبەعە نەبێت و لەواریدات ئەوەی لە مەسرەفی مورتیب و قاقەز و پێویستی بەمەتبەعە بمێنێتەوە بۆ خۆم بێت. سەرنووسەر و مودیری ئیدارە خۆم بم. هەموو ئیشوکاری مەتبەعە لەسەر خۆم بێت. بەو جۆرە، کە پێکهاتین عەریزەیەکمان پێکەوە دا بەناوی «ڕووناکی» موجەلەیەکی هەفتەیی ئەدەبی -ئیجتیماعی- تاریخی کوردی لە هەولێر دەرخەین و مودیری مەسئوول موحامی شیت مستەفا بێت و مودیری ئیدارە و سەرنووسەر حوسێن حوزنی موکریانی. ئیستیدعا بەموتەسەڕیف درا. زۆری پێنەچوو ئیمتیازمان لە وەزارەتی داخلیەوە بۆ هات. نوسخەی یەکەم و دووەمی موجەلەی (ڕووناکی)م لە مووسڵ لە مەتبەعەی «موصل الحدیث» چاپ کرد و هێنامەوە هەولێر، بڵاوم کردەوە و چەند نوسخەیەکم لە مەتبەعەی زاری کرمانجی ڕواندز چاپ کرد. موتەسەڕیف ئەحمەد بەگ کە ئیمتیازم بۆ هات پێی گوتم: مەتبەعەی ڕواندزت بێنە هەولێر. پێم گوت کە مەسرەف و پارەی گەرەکە؛ با کەمێک ئیشتراکی موجەلەکەم دەستکەوێت، پێویستی مەتبەعەی ڕواندز چی بێت پێکی دێنم؛ جێگایەک لە هەولێر بەکرێ دەگرم، ئەوجا دەچم مەتبەعەکەم دێنمە هەولێر.

هێشتا هیچ یارمەتیم نەکرابوو. دوو نوسخەش لە موجەلەکەم بڵاو کردبۆوە، پارەی

مەسرەفم لە یەکێک لە بازرگانەکانی هەولێر کە بەناوبانگن ئەسعەد جەلەبی کوڕی حاجی مەلا شەریف دەباغ کوڕی حاجی قادر دە دینارم لێ قەرزکردبوو، دابووم. لەوەدەمەدا موتەسەریف ئەحمەد بەگ بۆ تورکیا دەچووە سیاحەت. ڕۆژی پێنج شەممە ۲۲ی ئاغستوسی ۱۹۳۵ (۲۲ی جەمادی یەکەم) شەوێ پێکەوە بووین. سبەینێ ڕۆژی پێنج شەممە، کە ئوتومبیلی بۆ ساز کرا پێی گوتم: وا دەچم، دەتەوێت چی بکەیت هەتا دێمەوە؟ پێم گوت منیش دەگەڕێمەوە ڕواندز، چونکو پارەیەکم دەست نەکەوت کە بتوانم موجەلەکەمی پێ بژیەنم. چووە ژووری خۆی بەتەلەفۆن بەیەحیا بەگ کوڕی عەبدوللا موخلیس بەگ برازای پاشا کۆرەی ڕواندزی گوت -کە وەکیلی موتەسەڕیف بوو- حوسێن حوزنی یارمەتی لە ئێوە دەوێت بۆ موجەلەکەی یاریدەی بدەن. لە دوای ئەوە سواربوو چوو؛ دوو مانگی ڕەبەق لە تورکیا مایەوە.

منیش دەستبەجێ چوومە دایرە چاوم بەیەحیا بەگ کەوت و پرسیارم کرد، کە لە دایرەیەکی قانوونیدا چم بۆ دەکەیت؟ گوتی: ئیشتراکی موجەلەی لە لای کێ بێت یارمەتیت دەکەم بچۆ بیئەستێنە. بۆ قایمقامی مەخموور و بۆ قایمقامی کۆیسنجەق و ڕانیە و بۆ قایمقامی ڕواندز هەریەک بەجودا تەوسییەی دامێ.

عەبدولقادر ڕەشید وەکیلی قایمقامی مەخموور و عەلی سەروەت بەگ مودیری ناحیەی گوێڕ و ڕامز بەگ کوڕی عەبدولا سافی بەگ یەعقوبی قایمقامی کۆیسنجەق زۆر پیاوانە و بەغیرەت تێکۆشان و بەدەلی ئیشتراکیان بۆ وەرگرتم و دایانمێ. لە ڕانیەوە دیسان بۆیان ناردم. بەلام لە ڕواندز قایمقام موراد بەگ ناو کوردی عەشیرەتی گێیژ، جگە لە ئیشتراکێک پارەی پێ نەدام. لە سلێمانی و قەزاکانی لیوای مووسڵ دیسان بوونە موشتەری موجەلەکەم. نزیک پەنجا دینارێکم بۆ کۆکرایەوە. پتری لە قەزای مەخموور کۆکرایەوە.

ڕۆژی پێنج شەمە ۱۹ی ئەیلوولی ۱۹۳۵ چوومە مووسڵ لەگەڵ عیسا مەحفووز ناو گفتوگۆی کڕینی مەتبەعەیەکم کرد. پاشی ٦ی تشرینی یەکەم هەستام لەگەڵ مودیری مەسئوول موحامی شیت چووینە مووسڵ لە مەتبەعەی «موصل الحدیثە» ماکینەیەکی گەورەی مەتبەعە و هێندێک حروفاتم کڕی و چل دینارم پێشەکی دا و شەست دینار بەکومپیالە مایەوە، کە بەسەد دینارم کڕی بوو. دە دیناریش هێندێک حروفاتم پێ کڕی. ڕۆژی سێ شەممە ٨ی تشرینی یەکەم ماکینەکەم هەڵگرت بەلۆری و هێنامە هەولێر لە لایەکی موسافیرخانەی «دار الضیف»ی بەلەدییە ژوورێک بەرامبەر بەدایرەی بەرق و

بەریدی هەولێر بوو، ماکینەم دامەزراند.

بەڵام چونکو پێویستی نەبوو حروفات کەمبوو، نەمتوانی جارێ کاری پێ بکەم. ناچار دوو نوسخە لە مووسڵ و نوسخەی «ڕووناکی» دیکەم دەنارده ڕواندز لە چاپخانەکەی خۆم لە ڕواندز چاپم دەکرد و دەمهێنا هەولێر بڵاوم دەکردەوە.

ئەحمەد بەگ ڕۆژی یەک شەممە ۱۲ی تشرینی یەکەم ۱۹۳۵ لە تورکیاوە گەڕاوە چاوی پێکەوت، مەتبەعەیەکی زۆر زەلامم کڕیوە و لە مووسڵەوە هێناومەتە هەولێر و بەناویمەتبەعەی زاری کرمانجی دامەزراندووە. ئەوە لە ئارەزووی ئەو دووربوو لەگەڵ یەحیا بەگ بەدەمەقاڵە هاتن و گوتی: من ئەمە لە تۆم ئومێد نەدەکرد کە بەم پایەیە یارمەتی حوسێن حوزنی بدەیت کە بتوانێت مەتبەعەیەکی دیکەش بکڕێت. من هەر دەمویست هێندە یارمەتی بدرێت بتوانێت مەتبەعەکەی ڕواندزی پێ بێنێتە هەولێر.

یەحیا بەگ کە کوردێکی خوێن پاک و لە بنەماڵەیەکی حوکمڕانانی کوردستان بوو، خزمەتێکی وای لە خودا دەویست کە پێی بکرێت. زۆر باش جوابی ئەحمەد بەگی داوە و ئەهمیەتی پێ نەدا و ئیفتیخاری بەوەوە کرد کە توانی یارمەتیم بدات.

ئەحمەد بەگ بانگی منی کرد و گوتی: مەرجی ئێمە ئەوە نەبوو کە یارمەتی بدرێیت و مەتبەعەکەی ڕواندز بێنییە هەولێر؟ گوتم وایە؛ بەڵام من کە وردبوومەوە و ئیشەکەم خستە بەرچاوان، تێگەیشتم کە بۆ دەنگ و ناوی ئێوە وا چاکترە کە مەتبەعەیەکی سەرلەنوێ لە هەولێر دامەزرێنم و دەست لە مەتبەعەکەی ڕواندز نەدەم. چونکو لە تەئریخدا دێتە گوتن و دەبێژرێ لە ڕۆژی هەرامەدا ئەحمەد بەگ موتەسەڕیفی هەولێر، چونکو دەیەویست خزمەتی میللەتی خۆی بکات، مەتبەعەیەکی لە هەولێر دامەزراند و مجەلەیەکی کوردی بەناوی (ڕووناکی)یەوە نەشر کرد و بۆ مەعاریف و سەرکەوتنی کوردان تەقەلای دا. ئەمەش ڕاستە و ڕاست ناو دڵمە و مەبەس و ئارەزووم لەم مەتبەعەیە ئەوە نەبێت، هیچی دیکە نەبووە. وا بزانم بۆ ئێوەش و بۆ لاپەڕەیەکی تاریخی هەولێر ئەمە چاکترە؛ نەک بڵێن ئەحمەد بەگ خۆی بەکورد و کوردپەرست دەزانی لەگەڵ ئەوەشدا ناردی مەتبەعەیەکی کەنەفتی کوردی لە ڕواندز بوو بەفێڵ هێنایە هەولێر و پووچی کردەوە، تاکو ترووسکەیەکی نەشریات کە لە ڕواندز مابوو، بیکوژێنێتەوە.

ئەحمەد بەگ کەمێک خۆی هەڵکرد و گرژبوو. لە پاشان گوتی: تۆ چۆن مجەلەت بۆ کەس نەناردووە و پارەی مجەلەی ساڵێکت کۆکردۆتەوە؟

گوتم بەپەیڕەوی ڕۆژنامەدارەکان هەرکەسێک نوسخەیەک لە مجەلە یان ڕۆژنامە

وەرگـرێت بەئیـشـتـراکی سـاڵێک دەژمـێـردرێت و دەخـرێـتـە دەفـتـەری بنەچەکـەی ئیـدارەخانەکـەیانەوە و بەسـەنەد پارەی لێ وەردەگـیرێت. هەتا ئەو ڕۆژنامـە یان مجـەلەیە دەرچێت بۆی دەنێرێت. کە قەزا و قەدەرێک بەسەر بێت و یان لەبەر چتێک گرێ بدرێت و لە نەشر بکەوێت، خاوەنەکەی مەسئوولی قبووڵ ناکات. من تاکو ئێستە چوار نوسخەشم بۆ ناردوون، ئەوجا چووم بەدەل ئیشتـراکم لێ خـوازتوون و ئەو پارەیە کە لە مـەخـمـوور و گوێر و کەندێناوەم کۆکردوونەوە، تەنها ئیشتراکی مجەلەی ڕووناکی نییە.

یەحـیـا بەگ لە ڕوویی گـەورەییـەوە نزیک دووسـەد دانە کـتـێبی تاریخی «مـیـرانی سـۆران»ی بۆ فـرۆتووم و داویەتە گـەورەکـانی دزەیی و هی دیکە و لە کـۆیسنجق حـاکم ئەورەحـمان سەعـیدم لەگەڵ بووە. کە ڕامز بەگ یەعقـوبی پتر بەفـرۆتنی کـتـێبی میرانی سۆران یارمـەتیـداوم. ئەگەرچی بەدەلی ئیـشـتـراکی سـاڵێکی مـوجـەلەکەم کـە وەرگـرتووە قانوونییە، خیلاف قانوونم وەرنەگرتووە.

کە وردبوومـەوە ئەحـمـەد بەگ بیانووم پێ دەگـرێت و مـەبەسی ڕاستـییـەکەی ئەمـە بوو مـەتبـەعـەی ڕواندز ببەمە هەولێـر و ئەو مـەتبـەعـەیەم نەدەبوو بکڕیبا، دیسـان وەکـو لە سلێـمـانی بیـانووی پێ دەگـرتم و پێی لێ دەچەقـاندم، ئەڵبـەتە دەبێت مەتبـەعـەی ڕواندز ببەمە هەولێر و ئەو مەتبەعەیەی کڕیومە بیدەمەوە بەخاوەندی. لەسەر ئەوەش چەندێک تووشی دڵـساردی و ناگوزیری بووم و دەسـتم نەدەچووە ئیـشـوکـار و مـەتبـووعـات. بەهەر جـۆرێـک و بەهەر ڕێـگایەکی بمتـوانیـبـایە بۆی دەچووم دەپاڕامـەوە و تێم دەگـەیاند کـە تێکدانی مـەتبـەعـەی ڕواندز، مـایەی بەدنامـییـە و ئەم مـەتبـەعـەیە لە هەولێـر بۆ ئێـوە سەربەرزی دەبەخشێت، بێ سوود بوو.

بەڵام تێگەیشتم کە ڕۆژی ١٤ی کانوونی یەکەم ئەو ساڵە وەزیری داخلیە ڕەشید عـالی هاتە هەولێـر و مـواجەهەم بوو لـەگەڵی و سـبەینێ هەتا گـوێر لەگەڵی چووم. ئەو ئەحـمـەد بەگی مـوتەسەڕیفی هاندابوو کە ئەزیەتم بدات و مـەتبـەعەکانم لێ تێک بدات. ئەحـمەد بەگ کەوتبووە تەقەلادانی بیانوو پێگرتنم.

مـەتبـەعـەکـەم پێ ڕێـک نەکـەوت و پێـویـست و حـروفـاتـی تەواوم بۆ نەکـردرا، یەک دوو کۆمـپیـالەشم بۆ خـاوەندەکەی پڕ کـردەوە و هێـندێک حروفاتم بۆ کـڕی. ناچار هەستـام چوومە بەغـدا کە پێویستی مەتبـەعـەکە پێکبێنم و بەڵکم لەوێ هێـندێـک کـتـێب بفـرۆشم و چەند ئیشتـراکێ لە نایبە کـوردەکان وەرگـرم، مـەتبـەعـەکە بکەمە مـەتبـەعـەیەکی ڕێکوپێک. کە گـەیشـتـمـە بەغـدا کـوردەکـانی بەغـدا لە ژێر گـەڕانی عـەلی کـەمال بـەگ کـوردی سلێـمـانی

بەهۆی ڕەشید عالی وەزیری داخلیەوە لە کۆشەوەیەکی گەورەدا بوو و لە ژێر دەستوورێکی داپۆشراودا داوای چوار پێنج مادەیان گۆیا بۆ کورد دەکرد، بەلام لێرەدا تەنها بەجێهێنانی ئارەزووی ڕەشید عالی نەبێ چیدیکە نەبوو:

١- داوای کۆمەڵەیەکی کوردیان دەکرد لە بەغدا دامەزرێت.

٢- نادییێکی کوردی بەناوی سەلاحەددین لە بەغدا.

٣- لیوای دهۆک لە مووسڵ بکرێتەوە و ببێتە لیوایەکی کوردی.

٤- خانەقین لە لیوای دیالە لە بەعقوبە بکرێتەوە و بکرێت بەلیوایەکی کوردی.

٥- مەدارسی لیواکانی کورد و ئیدارەی حکوومەت بەکوردی بن.

بۆ ئەوە هەموو کۆببوونەوە و تەقەلایان دەدا. بەلام لە لای من وەکو کۆمەڵەیەک لە گەورەکانی کوردی بوون کە باسیان کرا و هاتبوونە ڕواندز. ڕەشید عالی و یاسین هاشمی مەبەستێکی شەخسی خۆیان تێدابوو، نەک بۆ کورد. بەلام شکلی بزووتنەوە گۆڕدرا و لە ڕیزی دەستووری ڕەشید عالی دەرچوو. بەڕاستەقینە بوو بەمەسەلەیەکی کوردستان و لە مەجلیسی نەوابدا هەرا پەیدابوو. بوو بەمایەی پشێوی نێوانی نایبی کورد و عەرەب.

لە دوامیندا ئەمین زەکی بەگ کوردی سلێمانی کە لەو دەمەدا وەزیری ئەشغال بوو، بۆ خۆپێشخستن لە لای حکوومەت و عەرەبان، بەفرۆفێڵ مەسەلەکەی کوردی خستە دەست و نایبە کوردەکانی یەک و دوو لێککردن و بردنیەوە لای ڕەشید عالی و تەنها لەوانە دوو کەس مان یەکێک عەلی کەمال بەگ، دووەم مەلا حەوێز ئاغای غەفووری کۆیی. هەریەکە لەوانی دیکە بەپەنهانی یەکدی چوون و خۆیان هاوێژتەوە لای ڕەشید عالی. ناویان لە دەفتەری بەتایبەتی هەیە.

منیش هێندێک حروفاتی باشم لە مەتبەعەی «الدلیل» کڕی و هێندێکی دیکەشم لە مەتبەعەی «عزرا ئەلیاهو» کڕی و ناردمەوە هەولێر. لە پاشان بۆ خۆشم گەڕامەوە هەولێر.

هەرکە گەیشتمە هەولێر لە ئوتومبیل دانەبەزیم، مستەفا بەگ برای ئەحمەد بەگ موتەسەڕیف و ئاغایەکی ڕانیەشم لەگەڵ بوو، چوومە قەسری موتەسەڕیف لەوێ میوان بووم. سبەینێ ڕۆژی عارەفەی جەژنی قوربان سواری ئوتومبیل بووم چوومەوە ڕواندز، جێژنم لەوێ کرد و ڕۆژی پێنجەمی جێژن گەڕامەوە هەولێر. لە پێش چار ڕێگانەی خانزاد و سەلاحەدین و موزەفەرەددین، کە کەوتۆتە پێش دەرگای قەلاوە، کۆشکێکی بەرزم بۆ مەتبەعەکەم لە ڕۆستەم چەلەبی بازرگانێکی هەولێری گرت و ناردم لە مووسڵەوە

شاگردێکی زۆر زرنگم بۆ هات و مەتبەعەکەم گوێزتەوە ئەو جێگایە.
ئەو ڕۆژەی مەتبەعەم گوێزتبووەوە و دامدەمەزراند، چوومە پۆستە هێندێک پارەم حەواڵە بۆ هاتبوو وەریگرم، قاقەزێکی داخلیم بۆ هاتبوو، دایانە دەستم. کە کردمەوە بەیاننامەیەک بوو بەکوردی نووسرابوو: هەی کوردان چیدیکە خۆ بێ دەنگ مەکەن و بخرۆشێن و دوو شیعری حاجی قادری کۆیی لێ نووسرابوو. لە سەرەوەی بەیاننامەکە دوو خەنجەری سووری لێ ڕەسم کرابوو. زانیم، کە موتەسەڕیف بەبیانووە و منیش بەم بەیاننامەیە تووشی ئەزیەت دەکات. بەپۆستەچیم گوت: ئەمە زۆرن؟
هەستام چوومە لای موتەسەریف و بەیاننامەکەم دایە و پێیم گوت تکام ئەمەیە و باوەڕم پێ بکە من شتی وا پڕوپووچ و قوڕ ناکەم، منیش تێوەرمەدە و بەقسەی نەیارانم لەگەڵ مەکە. لەمە کە بەیاننامەیە ئاگادارنیم؛ چونکو ئەگەر بمەوێت شتێکی زۆر لەمە گەورەتر و گیاندارتر بنووسم و لە مجەلەکەمدا نەشر دەکەم. بۆچی بەپەنهانی چتی وێنەچووی بێ گیان و بێ کاری وەکو ئەو بەیاننامانە دەنووسمەوە و بڵاویان دەکەمەوە. بەڵێ قسەکانی من لە لای موتەسەڕیف جێگیر نەبوو. وا تێگەیشتم کە ئەمە بوو کە چەند ساڵێک لەوەپێش یانی ساڵی ١٩٣١ لە هەولێر «حزب الاخاء» کە حزبی یاسین هاشمی و ڕەشید عالی بوو دامەزراندرابوو. منیان لە ڕواندزەوە خوازتە هەولێر.
شێخ عەبدولقادر نەوەی مەرحوم شێخ ئەبوبەکر -کە عزوی حزب بوو- کەوتە نێوانی من و ڕەیسی حزب. کە شێخ محەمەد کوڕی شێخ ئەسعەد بوو. من نەمەویست و داخلی حزب نەبووم و گەلێک پەیمان و مەرجیان نیشاندام و بۆ مەتبەعە و جەریدە و مەتبوعاتەکانم یارمەتیم بدەن و سێ ڕۆژ ڕایانگرتم و دڵخۆشیان دامەوە و تەمایان وەبەر نام، پێوە نەبووم و گوێم نەدایە. لە دواییدا، کە تێگەیشتن مل نادەم و خۆتێکەڵ بەو حزبە ناکەم کە کوردی نەبێت، تکایان لێ کردم کە خەڵکی هەولێر و کوردەکانی دەرەوە هان نەدەم بۆ ئەمە نەیاری ئەم حزبە بکەن. بێ دەنگ مامەوە نە گوتم «ئا» و نە «نا» هەستام چوومە ڕواندز.
بەڕاستی لە ڕواندز نە بەچاک و نە بەخراپ لەو حزبە نەدوام، بەگۆشەگیری ڕامبوارد. مانگێک لەوە بەسەر نەچوو زانیم کە سلێمان بەگ کوڕی عەلی بەگ سەلاحشۆڕ، کە لە بەگزادەکانی سۆران و لە تیرەی ئۆغۆز بەگیان بوو، چووە بەغدا بەهۆی عەلی حەیدەر بەگی کوڕییەوە -کە لە بەغدا وەزیفەی گەورەی هەبوو- داخلی «حزبی الاخاء» ببوو و گەڕابۆوە هەولێر. ڕەیس حزبی الاخاءی هەولێری دیبوو، دەستووری حزبەکەی لەگەڵ خۆی هێنابوو، نیشانی دابوونو گەڕابۆوە ڕواندز لەگەڵ مەرحوم شێخ کاکەمین سەلان کە دۆست و

خۆشەویست و یارێکی بەڕاستی من بوو یەکدیان دیتبوو. شێخ کاکەمینیان کردبوو بەرەیسی «حزبی الاخاء»ی ڕواندز و بەهاندانی ڕەشید عالی و یاسین هاشمی، شێخ عەلائەدین کوڕی شێخ عومەری بیارە کە مورشیدی نەقشبەندی و یاسین هاشمی خۆی بەموریدی ئەو دەزانی، قاقەزیان بۆ شێخ کاکەمین سەلان ناردبوو کە ڕیاسەتی حزبی الاخاءی ڕواندز قبووڵ بکات.

سلێمان بەگ دیسان چووبووە لای لەبەرئەوە کە شێخ کاکەمین لە خەلیفانی بیارە بوو و شێخ عەلائەدین تەوەسوتی کرد بۆ ئەو ڕیاسەتەی قبووڵ کرد و ئەحمەد کەمال کوڕی عەبدولکەریم خەتی کرابوو بەسکرتێر و حزب لە ڕواندز دامەزراندرابوو.

لە نێوان ئەهالی و سەپان و جووتیار و شوان و گاوان و دارکێش و کەردار و ڕەنجبەرانی ڕواندزدا بەم جۆرە چاوڕاو کرابوو کە «*هەرکەسێ مەنسوب بەم حزبە بێت، ئەگەر قەرزدار بێت و ماڵی خەڵکی خواردبێت، پیاوی کوژتبێت و هەرچییەکی بیەوێت و ویستبێتی و کردبێتی و بیکات، حکوومەت ناتوانێت چی پێ بڵێت و شورتە ناتوانێت بیگرێت و مەحکەمە گوناهکاری ناکات و هەرچییەکی ئارەزووی بێ بەئازادی و بێ پرسیار دەتوانێ بەجێی بێنێ*».

دەبێت ئەو فێرکردن و چاوڕاوەی لە ڕواندز کرا لە هەولێر و جێگاکانی دیکەش کرابێت. دیارە میللەت نەزان و نەدیتەیە؛ چتی وای لە پیاوانی گەورە کە بیست بەڕەحمەتی دەزانن و هەریەک لەوانەش گوناهێکی هەر لێ ڕووداوە؛ یان دزی کردووە، یان قەرزدارە، یان دەیەوێت ماڵی خەڵک بخوات، یان خوێنداره؛ یان خوێناوییە بۆ ڕزگاری و پەرەی کاری خۆی بەپۆل و دەستە دەستە داخلی حزب دەبوون هەتا لە ڕواندز هیچ دارکێش و سەپان و ماست فرۆشەکانی دێهاتانیش نەما هاتبوونە ڕواندز و داخل بەحزب ببوون. بەڵام تێگەیشتوو و ئاغا و گەورە پیاوەکان بەگۆشەگیری چاوەنواڕی دوامینی ئەم کارە بوون کە نەیاندەزانی چۆنە و چۆن بەپایان دەگات. تێکەڵ نەبوونیان جارێ پەسەند کردبوو.

من گۆشەگیر لە ماڵی خۆم دەرنەدەکەوتم و دەم بەدەم و دەقیقە بەدەقیقە پێم ڕادەگەیەندرا کە فولان و فولان چوونە حزبەوە و ئەمە و ئەوەیان پێ گوتوون، هەتا ڕۆژێک ئێوارە نزیک ڕۆژئاوا بەسەعاتێک ڕەیسی جەیشی عیراقی ئەمین ڕواندزی کە کوردێکی پەتی و برایەکی ڕاست و دۆستێکی بێ قرێژم بوو، هاتە ڕواندز. کە فەوجەکەیان لەودەمەدا لە دیانان دەبوون. ئەحمەد کەمال خەتی سکرتێری حزبی لەگەڵ خۆی هەڵگرتبوو هاتنە لام بۆ ماڵەوە. بەڵام هاتنێکی زۆر دڵگیرانەی هەم و خەمهێنەرێکی دڵسۆزانە.

هەرکە گەیشتە پێش گوتی: هەستە ڕامەوەستە لەگەڵ ئەحمەد کەماڵ بچوو بۆ تەکیەی شێخ کاکەمین داخلی حزب ببە، ئەگەر ئێستا نەچی کۆمەڵەی حزب لە تەکیە کۆبوونەوە، دێنە سەرتان تالانت دەکەن و بەجارێک مەتبەعە و ماڵ و ئەشیات دەبەن و خۆشت دەکوژن؛ ئیدی وەختی ڕاوەستان و خۆڕاگرتن نییە.

من بەبێ خۆڕاگرتن پێکەنینم بەو قسە و هەڕەشانە هات و گوتم کاکی من لە هەولێر ویستمیان پەسەندم نەکرد و گەڕامەوە و ئێستا چۆن دەمەوێت خۆم بخەمە حزبێکەوە کە بەنەیاری و ناحەزی میللەت و نیشتمانی من دامەزراندرابێ ئەمە چی تێگەیشتنێکە کە تۆ تێگەیشتووی؟ من ئەگەر پارچە بکرێم و تۆزم نەمێنێت، داخلی ئەو حزبە نەبووم و نابم. ئەوەش کە گوتوویانە باوەڕی پێ مەکەن؛ چونکو شێخ کاکەمین دۆست و هەمڕازی منە، سلێمان بەگ خۆشەویست و دۆستمە؛ باوەڕ ناکەم چتێکی بۆ من خراپ بێت بەزیان و بیری خۆیاندا بێن؛ بەتایبەتی ئەحمەد کەماڵ چۆن مەیدان بەوە دەدات کە هەڵمەت بێتە سەر من. ئەو قسانەی من و ڕەیس ئەمین ڕواندزی چەندبارە کرانەوە لە دوامیندا ناچاریان کردم لەگەڵ ئەحمەد کەماڵ بچمە تەکیە و چاوم بەشێخ کاکەمین و سلێمان بەگ بکەوێت.

هەستام لەگەڵ ئەحمەد کەماڵدا کەوتمە ڕێ و ڕەیس ئەمین گەڕاوە دیانان. کە نزیک تەکیە بوومەوە، کوچە و کۆڵان و دەو بان و حەوشەی تەکیە و ژوور پڕن لەو فەقیر و هەژارانەی بێ زیان و بێ هۆشانەی شار و دێهات و شوان و گاوان و دارکێش و کەردار چارۆداری ناحیە و شار. بەهەر جۆرێک بوو برمان پێدان و ڕێگای چوونمان کردەوە. بەشانەسوو گەیشتینە تەکیە. کە چوومە ژوور، هەموو بەپێوە ڕاوەستابوون، جێی دانیشتن نەمابوو، تەنها شێخ کاکەمین و سلێمان بەگ لەبەر میحرابی مزگەوت دانیشتبوون. من لە دوورەوە بەدەنگێکی بەرز سڵاوم کرد و چوومە پێش، لە نێوانی هەردووکیاندا دانیشتم. جوابی سڵاویان نەدامەوە، هەموو بێ دەنگ تەماشای یەکدیان دەکرد.

تێگەیشتم ئیش لە ئیش ترازاوە و لەگەڵ ئەمانە تێگەیشتن و گفتوگۆ بێ سوودە. هەستامە سەرخۆم، دووروودرێژ خوتبەیەکی دینی و وەعزێکی پڕ مەعنای بەگیانم بۆ گوتن و هاوارم کرد، کە مادامە ئێوە موسڵمانن و باوەڕتان بەخودا و پێغەمبەر و قورئانی هەیە دەبێ پەیڕەومان بکەن. خودا لە قورئاندا هەموو موسڵمانێکی کردۆتە برای یەکدی؛ بەناوی ئیسلامییەتەوە لەم مزگەوتەدا کوردێک و تورکێک و هیندێک و فارسێک و چەرکەس و جاوەیەک و عەرەب و زەنگییەک دەتوانن کۆببنەوە و لە پشت ئیمامێکدا نوێژ بکەن و وەکو برایان یەکدیان خۆش بووێت؛ کەوابوو «حزب الاخاء» بۆچییە؟ دینی ئیسلام

هیچ پێویستی بەم حزبە نییە. لە قورئاندا هەموو ئەحکامێک لە خودا بەئێمە ڕاگەیەندراوە. شتێکی تێنەگەیشتبێن فوقەها بەدرێژی و بەئاشکرا بۆ مەیان دیاری کردووە و تاکو ئێستاش لەنێو حکوومەتێکدا حکوومەتێکی دیکە دانەمەزراوە. قانوونی حکوومەتی عیراقی چی وای تێدا نییە کە هەرکەس داخلی «حزبی الاخاء» بوو لە هەموو گوناه و قەرزداری و خوێنڕێژێک چاوی لێ دەپۆشرێ و هەرچییەکی بیکا دەبەخشرێ. باوەڕ بکەن و ئەمە ڕاستییەکەیەتی کە پێتان دەڵێم. هەرکەسێک گوناهێکی -کە ئێوەی پێ فریوراون -لێتان ڕوویدات، حکوومەت بەپێی قانوونی عقووباتی بەغدادی بەجەزاتان دەگەیەنێت و ڕزگار نابن و «حزب الاخاء» ناتوانێت خیلافی قانوون کەسێک لە جورم ڕزگار بکات. قانوون لەسەر هەموو چتێکە و فەرمانی بەسەر هەموو کەسێکی عێراقی و غەیرە عیراقیدا ڕەوایە.

بەو جۆرە دوورودرێژ پێم گوتن و بێ دەنگبووم. چەند کەسێکی سەرهاتی کۆمەڵەکە پێیان گوتن: ئێستە دەبێ چی بکەین؟ گوتم: ئێوە کە موسڵمانن دەچنەوە سەر ئیشوکاری خۆتان و پشتگەرم دەبن. هەرکە بانگدەر بانگی دا، وەرنە مزگەوت دەستنوێژی خۆتان بشۆن و نوێژی خۆتان بەجەماعەت بکەن و بگەڕێنەوە سەر کار و پیشەتان و خیلافی ئەمری خودا و پێغەمبەر و ئەمری حکوومەت نەبزوونەوە. خودا لە قورئاندا فەرموویەتی ئیتاعەی خودا و ئیتاعەی پێغەمبەر بکەن؛ لە هیچ ترستان نەبێت. پیاوانی خودای لە خوداپەرستیدا کڕین و فرۆتن و بازرگانی پەکیان ناخات. ئیدی کەوابوو ئەم «حزبی الاخاء» بۆچییە و ئێوە مادام بارگرانی دین و ئەمری حکوومەت هەر هەڵدەگرن، باری حزبێکی بەکاری دین و دونیاتان نەیە بۆچی دەخەنە سەرشانی خۆتان و خۆتان بەدناو و ڕەزیل و ڕسوا دەکەن. تاکو چەند کەسێکی دیکە بەئێوە خۆ بەرز دەکا و هاتی ئێوە دەخوا. ئێوە بۆ خۆتان بیخۆن و ئیتاعەتی حکوومەتی خۆتان بکەن و بەئەدەب و ویقارەوە لەگەڵ کاروباری خۆتان خەریک بن.

چونکو میللەت دڵپاک و خاوێن بوو، قسە ڕاستەکانی منیان بەگیان و بەدڵ پەسەند کرد و بەدەنگێکی بەرز گوتیان بەخودا قسە قسەی تۆیە. لە گۆتەی تۆ دەرناچین و تەقەیان تێکەوت بڵاوبوونەوە. یەکێک لە تەکیەدا نەما. منیش لەگەڵیاندا دەرچووم. سلێمان بەگ هەر هێندەی گوت: «هەی لە بابی منت کەوتبێ، چاکت تەفروتووناکردن». منیش بێ دەنگ لە تەکیە دەرکەوتم و گەڕامەوە ماڵی خۆم.

لە دوای من شێخ کاکەمین بەبێ ڕاوەستان هەڵدەستێ و سوار دەبێ بۆ سەلان

دەگەڕێتەوە. لە سەعات سێی شەودا ڕەزا بەگ کە قایمقامی ڕواندز بوو، دەنێریتە دووی سلێمان بەگ و سەنەدی زەمانی پێنج سەد دیناری لێ دەستێنێ، کە جارێکی دیکە تێکەڵ بەو جۆرە کۆمەڵەیە نەبێ.

ئەوەی کە گوترا ئەسبابێکی بەهێز بوو بۆ ئەوەی شێخ محەمەد کە ئێستە قازی شاری هەولێرە، هان بدات بەنەیاریم تێبکۆشێت و کەلێن دەستخات بۆ ئەمە تووشی ئازار و ئەزیەت ببم و عومەر و حوسێنی کوڕانی خۆشی هان بدات لە موحاکەمەدا شاهێدیم لەسەر بدەن بەدرۆ و ئەو سەربهوردانەی «حزبی الاخاء»یش بەڕەشید عالی و یاسین هاشمی ڕاگەیەنێت و لەم دەمەدا وەبیرمان بێنێتەوە. ڕەشید عالی و یاسین هاشمی بەتەلەفۆن تەنگەتاو بکەن کە بیسانووم پێ بگرێت و تووشی سەتمەیەکم بکەن و چووینە بەغدا و مەسەلەی «نادی سەلاحەدین» دامەزراندنیش هەر لەو ئەسبابانە بوو.

شێخ محەمەد شەو و ڕۆژ موتەسەرپفی لێ هاندەدام و موتەسەرپف تێنەگەیشتبوو مەبەس چییە. کە شێخ هێندە خراپەی منی لەکن دەڵێت و منیش لەبەرئەوەی دەبوو بەمایەی فەسادی، نەمدەویست ڕۆژێ لە ڕۆژان موتەسەریف لەو سەربهوردەیە ئاگادار بکەم کە لە «حزبی الاخاء» تووشم ببوو.

موتەسەرپف بەبێ لێکدانەوە و بیستنی قسەکانم، لوتفێکی لەگەڵمیدا هەبوو، فڕێی دا و بەمودیری شورتەی ئەمر دا و حوکمی مەحکەمەی سادر کرد. هەر ئەو ڕۆژە مەتبەعەکەم دادەمەزراند و کاری تێدا دەکرا، شورتە و موختاری گەڕەک هاتنە مەتبەعە و سەرتاپایان پشکنی. دیارە هیچ نەبوو و هیچ نییە کە بیدۆزنەوە. ئەوە ڕۆژێکی سەرەتایە کە ئەحمەد بەگ بوو بەمایەی پشکنینی جێگا و مەتبەعەم و بەمایەی ڕێکردنەوە بۆ چەپۆڵکە خواردنم و حەبس و زیندانی و موحاکەمە و ئەزیەت و کێشە و ئازار و شپرزەیەکی هەتا ئەمڕۆکە لێی ڕزگار نەبووم و بوو بەمایەی بەدناوی و لەکەدار و ڕەخنەداریم لەنێو کورداندا و بۆ دەرگەوانی بەلاّ و موسیبەت و ماڵوێرانی و خانەلانی و ڕووتی و برسییەتی و دەست تەنگی و نەبوونیم.

بەتایبەتی پێم گوت سەعادەتی مەئاب، من لە ڕواندز بەگۆشەگیری سەرم بەدەردی خۆمەوە نابوو؛ بەبوونی و نەبوونی دڵنیابووم؛ منت بۆچی هێنا هەولێر و بۆچی لەم ئازار و زیللەتەت گرێدام. من لەوەپێش هیچ بێ فەرمانی ئێوەم کردبوو کە سزام ئەمە بێت و لە سلێمانیش لە فەرمانی ئێوە دەرنەچوو بووم و بێ قانوونی لە من ڕووینەدابوو کە بەوبۆنەیەوە تۆڵەم لێ بکرێتەوە. لە هەولێر و چی لە سلێمانی جگە لەمە کە لە دایرەیەکی

مەعقول و شەرەفدا کوردم و لە ژێر فەرمانی قانوونی مەتبوعاتدا کتێب و تەئلیفاتی خۆم و مجەلەکانم نەشر کردووە و تەنها خاوەند مەتبەعەیەکی کوردم، گوناهێک وە یان تەرکی ئەدەبێک وە یان چتێکی بەر ئاوەژووی دەستوور و ڕەوشتی هەمووەتی و قانوون لە من ڕوویدابێت. دیسان دەڵێم شایانی ئەزیەت و ئازاردانم بیانوو پێگرتنم؟

لەو هەموو قسانە ئەوەی جواب دامەوە و گوتی: تاکو ئەم دەمە تۆم خوازتبێ، وە یان بۆ خۆت هاتبیە لای من، لەم دەمە بەولاوە ناتبینم و دەبێ لە هاتوویەکی زۆر دوورودرێژدا نەتبینم و نەتوانم قسەت لەگەڵ بکەم.

گوتم کەوابێ ئەمە لە منی ئاشکرا کرد کە یان بۆ خۆت یەکسەر تووڕە بوویت و لەمەپێش ویستووتە تووشی گۆنگەلێکم بکەی و بۆت ڕێک نەکەوتووە، ئێستە ئەمەتان کردە بەهانە و تووشی ئازارم دەکەن، وە یان لەلایەکەوە هاندراون، وە یان لە وەزارەتەوە فەرمانت پێ دراوە کە بەهەر بۆنەیەکەوە بێت ئەزیەتم بدەی. جا نازانم لەوانە کامیانە و ئەسبابی ئەم تووڕەبوون و بیانووانە چییە بەمنی دەگرن.

خۆی نەگرت و گوتی: لەمە پتر بکەی کە چوویتە بەغدا لەگەڵ عەلی کەمال کۆمەڵەتان بەستووە کە من لە موتەسەریفی بخەن و کە گەڕایەوە، هەولێر لەگەڵ کوردەکان ڕێککەوی و بەعەزلکردنم بدەی و بەرامبەر بەو خزمەتە کە بیکەی و ڕانەوەستی عەلی کەمال و جەماعەتی ئەو حروفاتەیان بۆ کڕیون و یارمەتییان داوی ئەم حروفاتانە کە کڕدراون بەپارەی ئەوان کڕدراوە.

لەوە زۆر دڵگیر بووم خۆم توند کرد و گوتم: تەلیفۆن هەڵگرە و موخابەرە لەگەڵ مەهدی حوسێن خاوەندی مەتبەعەی دەلیل بکە و بزانە ئەم حروفاتانە کە من لەوم کڕیوە و ئێستاش چل و چوار دیناری پێ قەرزدارم، کێ کڕیویەتی و کێ بۆتە کەفیلی و بەواستەی دۆستەکانی بەغداوە بپرسە و لەگەڵ سکرتێری بانگ عوسمان سەلیم ناو جوولەکەیەکە موخابەرە بکە کە بۆتە کەفیلم؛ بزانە ئەم حروفاتانە لە کێ کڕاون و پارەم لە کوێ پێ دراوە. زۆر موتەئەسیفم کە بەقسەی نەیاران ئیغفال دەبی و پیاوێکی ڕاست و خۆشەویستێکی وەکو من تووش دەکەن و بەخەتا دەچن. لە پاشان پەشیمان دەبنەوە و تێدەگەن کە من ڕاست دەڵێم و ڕاستم و ئەوانەی بۆیان گێڕاوتەوە فەسادیان کرد و درۆ دەکەن. بەڵام بێ سوودە؛ چونکە ئەزیەتێکی تووشی منی دەکەن و بەدنامیێکی بەسەر منیدا دێنن ناگەڕێتەوە و پەشیمانیش پارە ناکات. جارێ یەکسەرە من خراپ نیم و خراپە ناکەم و بێ قانوونی نابزوومەوە و چتێکی ئەتک و سووکی و بەدنامی خۆم و دۆست و

میللەتەکەی منی تێدابێ، نەمکردووە و نایکەم و چتی وێنەچووی لە دەست نەهاتووم بەخۆم و هاوزبانەکانم ڕەوا نەدیوە بۆی بچم. بەتایبەتی کە ئێوە بوونە مایەی هاتنم بۆ هەولێر و چاک و خراپی ئەم لیوایە وا تێگەیشتوون لە حەقی من و مەتبوعاتی کوردیدا لوتفتان هەیە و حەز بەبەرزبوونەوەم دەکەن و لە ژێر سێبەری میهرەبانی ئێوەدا ئەم مەتبەعە نیوەچڵەم پێکەوەناوە، هێشتا پێنەگەیشتووە دانەمەزراوە. من کە خۆم بەکوردێکی ڕاست و بێ قرێژ زانیوە و باوەڕم بەمە هەیە و دڵنیام ئەمڕۆ لە خزمەتی تەئریخ و ئەدەبیات هەر بزووتنەوەیەک بکرێ، بەقوڕداچوونی میللەتەکە و مایەی وێرانی نیشتمانە خۆشەویستەکەمانە و ئێوەش بەوە باوەڕتان کردووە کە من لەوە بەولاوە نیم کە گوترا. کەوابوو چۆن باوەڕ دەکەن من لەقە لەو پیت و پێزە هەڵکەوتووە بدەم لە ژێر سێبەری ئێوەدا، کە یارمەتی ئارەزووی مەتبەعە و مەتبووعاتم بکەن؟ من بۆ خراپ بچم و چتی منداڵانەی وەکو ئەم بەیاننامە بڵاو بکەمەوە کە بایی پوولێکی سوود نە بۆ من و نە بۆ میللەت و نیشتمانی تێدایە؟ وابزانم ئەمە بیانوویەکی قانوونییە پێم دەگیرێ. لە نێوانی میهرەبانیدا دەتانتوانی زۆر بەئاشکرا ئەمرم پێ بدەن کە ئێوە دەبێ مەتبەعەی ڕواندز بفرۆشن و ئەم مەتبەعەی کە لە هەولێر دای دەمەزرێنن تێکی بدەن، وە یان بیبەنە جێگایەکی دیکەی دەرەوەی لیوای هەولێر بێت. ئیدی ئەم کێشە و هەرا و بیانووانە پێویست نەبوو. بەبێ خۆگرتن ئیتاعەم دەکرد و هەرچییەکی ئارەزووی ئێوە بوایە وام دەکرد و لە فەرمانتان دەرنەدەچووم.

گوتی: بیانوو نییە پێت دەڵێم ئەوەی توندی و تیژی بێت دەینوێنم و لە کردەوەش پەشیمانی ناکێشم. ئەمە دوو جارە لە قسەی من دەردەچی، یەک لە سلێمانی پێم گوتی کە مەتبەعەی ڕواندز بێنیە سلێمانی، نەتکرد و ئەم جارەش کە تۆم لەگەڵ خۆم هەڵگرت و هێنامیە هەولێر، پێم گوتی بەم مەرجە یارمەتی تۆ و مەتبوعاتت دەکەم کە مەتبەعەی ڕواندز بێنیە هەولێر. چووی لە مووسڵ مەتبەعەت کڕی و هێناتە هەولێر و چوویتە بەغدا حروفاتت هێناوە، دەستت لە مەتبەعەی ڕواندز نەدا.

هەڵمدایە و عەرزم کرد ئەمە ڕاستە منیش لەوەپێش سەبەب چی بوو پێم گوتن ئێوە بێ دەنگتان کرد و ڕۆژی، کە مەتبەعەیە هەولێرم دادەمەزراند، ئەحمەد فەرەج لاوێکی تازەپێگەیشتووی سلێمانی کە تەحسیلی ئەمریکای هەیە و لە دایەرەی تووتندا موەزەفە هاتە لام و چاوی بەمەتبەعە کەوت گوتی: خۆزگە ئەم مەتبەعە لە سلێمانی بوایە نەک لە هەولێر. ڕۆژێکی دیکە دوو سێ مەئموورانی خەڵکی سلێمانی کە لە هەولێر مەئموورن

گوتیان: کە تۆ بۆچی ئەم مەتبەعەیە نابەیە سلێمانی، هەروا سەرزەنشت کرام. لەو قسانە و فەرمایشی ئێوە تا ئێستا زۆرباش تێگەیشتم و زانیم کە نەدەبوو بەمیهرەبانی و لوتفی ئێوە بخەڵەتێم و بێم بۆ هەولێر. مادامە لە سلێمانیش بەم لوتفە خەڵەتەندرابووم و پەشیمان بوومەوە و قسە و لوتفەکانتان بۆ نەهێنا هەولێر دەبێ ئامادەی ئەزیەتکێشان و ئازاردان و نەگبەت بم. مەبەس تێکدانی مەتبەعەی ڕواندزە، بەیاننامە و قسە، بیانوویەکن دروستکراون. ئەوا منیش دەرکەوتم سنگی خۆم کردە سوپەری بەڵا و موسیبەت و جارێکی دیکە چاوت بەمن ناکەوێت مەگەر بەئەمری ڕەسمی نەبێ کە بمخوازیە حزوور.

ئەوەم گوت و لە دایرە دەرکەوتم و چوومەوە مەتبەعە. دوو پۆلیس هاتن گوتیان وەرە مودیری شورتە تۆی دەوێت، کە چووم حەواڵەی مەحکەمەی کردم گوتیان یا کەفیلی سەد دینار تا نیهایەتی مەحکەمە، وە یان حەبس دەکرێیت هەستام چوومە بازاڕ دوو شورتەیان وەدووخستم سەید قاسم خەیات ناو دوکاندارێکی بەرگدروو بوو بەکەفیل و ئەوراق گیرا و سەوقی مەحکەمە کرا.

لەوە بێ خەبەربووم کە لاوەکانی تازەپێگەیشتووی هەولێر پێنج و لە کۆیە یەک ئیتیهام کرابوون و لە حەبس خرابوون و خەریکی شەهادەتی زوور پێکهێنان و ڕێکخستنی بیانوو و توهمەت و ئیفتیرای دیکە بوون. لە تەلەبەکانی ڕەواندز و کۆیە لە ڕواندز و کۆیە ماڵیان پشکندرابوو و یەکێک لە ڕواندز ئیتیهام کرابوو.

سبەینێ خەریکبوو موحامی بگرم زیا عەلی موحامی عەرەب و خەڵکی مووسڵ لە هەولێر بوو، گرتم و کردمە وەکیلی خۆم کە مودافەعەم بۆ بکات. ئەم پیاوە زۆر بەمەردانە گوتی: مەسەلەی تۆ مەسەلەیەکی میللەتی و کوردییە. منیش عەرەبێکی ساغ و ڕاستم. چۆن باوەڕ بەمن دەکەیت و موقەدەراتی خۆت دەدەیە دەست من و باوەڕ بە موحامی شیت مستەفا ناکەی کە مودیری مەسئوولی موجەلەکەتە؟ گوتم: ئەمە کە تۆ دەکەمە وەکیل و موقەدەراتی خۆم و تەلەبەکان دەدەمە دەست تۆ، مەسەلەیەکی ویجدانی و ئوجرەتە. لە ئێوە دڵنیام خیانەت لەگەڵ ئیمانتان نەکەن؛ چونکو ڕاستی دەڵێن کە عەرەبێکی ڕاست و میللەتپەرستن، لەگەڵ منیشدا درۆ ناکەن و ڕاست دەبن. بەڵام موقەدەراتی بزنێک چییە نادەمە دەست شیت مستەفا؛ چونکو پێی باوەڕ ناکەم کە کوردێکی ڕاست و دروست بێت.

زیا عەلی موحامیم کردە وەکیل. یاسین عرێبی موحامی مووسڵ و مەکی جەمیل موحامی بەغدای کە لە بەغدا بووو دوو موحامی دیکەی بەغدا و کەرکووکم کردنە وەکیل و وەکالەتنامەم بۆ ناردن، کە ڕۆژی موحاکەمە حازربن و مودافەعەم بۆ بکەن.

# پێڕست